# شەرحی سوننەی بەربەهاری

نووسینی

پێشەوای ئەهلی سوننەو جەماعە لە سەردەمی خۆیدا

أبو محمد الحسن بن علي بن خلف البربهاري

ڕاڤەکردنی

زانای پایەدار صالح بن فوزان بن عبدالله الفوزان

وەرگێڕانی

عبدالمجید عبدالحمید



# پێشەکی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله وكفى والصلاة والسلام على نبيه المصطفى وصحبه المجتبى.

أما بعد:-

هەروەکو ئاشکرایە لە پاش کۆچی دوایی پێغەمبەری نازدار (ﷺ) ئوممەتی ئیسلامی بوون بە چەند گرووپ و کۆمەڵێکەوە بە تایبەتی لە پاش شەهید کردنی ئیمامی عوسمان، هەر گرووپەو خۆی بە حەق دەزانی و ئەوانیتری بە گومڕا دەزانی، کێشەکە قووڵتر و زیاتر بوو کاتێ لە سەردەمی خەلیفەی عەبباسی مەئموندا کتێبە فەلسەفییە یۆنانی و بیانییەکان وەرگێردرانە سەر زمانی عەرەبی، جا لەو تاقم گرووپانە کە لەو سەردەمەدا پەیدا بوون گرووپی خەواریج و موعتەزیلە و شیعة و المرجئة و القدرية و المعطلة و الروافض و المفوضة و المشبهة و الجبرية و.... هتد.

ڕەنگە تۆ بڵێی ئەو مەزهەب و تاقمانە ئێستا نەماون، ڕاستە.. ڕەنگە هەندێ لەو تاقمانە وەکو کۆمەڵێکی سەربەخۆ نەمابن بەڵام هەندێ لە بیرۆکە و بۆچوونەکانیان زۆر بڵاوە، جا ئەگەر تۆ بیرۆکەی ئەوان بزانی ئەو کاتە دەزانی کێ فیکری خەواریج و مورجیئە و صوفی.. هتد هەیە، هەروەها لە بوارە فیقهێکاندا چەندین مەزهەب و تاقم پەیدا بوون کە هەر یەکە دەمارگیری بۆ مەزهەبەکەی خۆی هەبوو، تاکو وای لێهاتبوو کەسی عەوامو سادە نەیدەزانی کێ حەقەو شوێنی کێ بکەوێ؟

ئەمەش پشت راستکردنەوەی ئەو فەرموودانەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) کە باسی جیاوازی و دووبەرەکی ئوممەتی (محمد) دەکات، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێ باسی ئەو نەخۆشییەی کردوە چارەسەرەکەشی لە گەڵدا باس کردووە، تا لەو کاتە ناسکەدا کە خەڵکی تینووی زانین و فێربوونی حەق بوون ئیمامی بەربەهاری ئەم کتێبەی نوسییەوە (کتێبی: شرح السنة) تێیدا مەزهەبی ئەهلی سوننەو جەماعەی روون کردەوەو راو بۆچوونی گرووپە گومڕاکانی دیاری کرد، هەروەکو دەڵێن: خاڵی خستە سەر پیتەکان، لە هەموو جیاوازیەکاندا مەزهەبی ئەهلی سوننەی دیاری کردو روونی کردەوە.

ئەمرۆش دەبینین ئەو جیاوازیو دووبەرەکیانە پەیدا بووەو لە ناو موسڵماناندا بوونی هەیە، دەبینین هەر گرووپو تاقمە خۆی بە حەق دەزانێ و ئەوانیتر بە گومڕا دەزانێ، جا چۆن لە ناو ئەم گێژاوە دەرچین؟

وەڵامی ئەم پرسیارە بە جوانیو بە ڕوونی لەم کتێبەدا باسکراوە و ڕێگا راستەکەی روون کردوەتەوە بۆیە حەقی خۆیەتی بە گوێرەی خۆی بایەخی پێ بدرێت و بخوێنرێتەوە ودەمارگیریمان نەبێت بۆ ئەو رایەی لە سەرین بە تایبەتی کاتێ بەڵگەی ڕوونو ئاشکرا هەبوو، هەرگیز مەڵێ: ئەمڕۆ زەمانێکی ترەو ئەو سەردەمە زەمانێکی تر بووە، چونکە دڵنیابە کەوا ئەم ئیسلامە، ئەم قورئانە، ئەم فەرموودە جوانانە بۆ هەموو سەردەمێك و هەموو شوێنێكو هەموو ئوممەتێك دەگونجێت، ئەگەر باوەڕت وا نەبێت ئەوا گومانت لە ئیمانەکەت هەبێت.

چەندین زانا ئەم کتێبەیان راڤە کردوە و شی کراوەتەوە، ئەم کتێبەی بەردەستت یەکێکە لەو راڤانە زانای پایەبەرز شەیخ (صالح الفوزان) بە جوانی راڤەی کردوە و بەڵگەی بۆ قسەکانی ئیمامی بەربەهاری هێناوەتەوە ئەگەر بەڵگە هەبێت لە سەری.

لە کۆتاییدا داواکارم لە بەڕێزتان هەر کەموکوورییەك هەبوو لەم کتێبەدا ئاگادارم بکەنەوە (بێ گومان کەمو کووڕی تێدایە) بە رەخنەکانتان کتێبەکە دەوڵەمەنتر بکەن و خوای گەورە پاداشتان بداتەوە.

داواکارم لە خوای گەورە و بە بەزەیی ئەم کارە بچووکەم لێ وەرگرێ و ئێوەش لە دوعای خەیر بێ بەشم مەکەن، خوای گەورە ماڵو منداڵو کەسو کارمان بپارێزێ و لە تاوانەکانی من و ئێوەش خۆش بێت.

(رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ)

وەرگێڕ: عبدالمجید عبدالحمید / کفری

Kfree_١٩٧٥@yahoo.com

# تەنها بە ناوی خوا

## ژیاننامەی ئیمامی بەربەهاری[1]

**ناوو نەسەبو لە دایکبوونی:**

ناوی ئەم پێشەوا بەڕێزە (أبو محمد الحسن بن علی بن خلف البربهاری)یە.

بەربەهاری لە وشەی (بەربەهار)ەوە هاتوە کە ئەویش بریتییە لەو دەواو دەرمانو چارەسەرانەی لەوڵاتی هیندەوە دەهێنرا و ئەوانەی دەیانهێنا پێیان دەگوت: (بەربەهاری).

پێشەنگو گەورەو شەیخی حەنبەلییەکانی سەردەمی خۆی بووە، لە دەورووبەری ساڵی (٢٥٢)ی کۆچی لە دایك بووە، وا دەردەکەوێت لە شاری بەغدا لە دایك بووەو هەر لەوێیش ژیاوە، سەرەتا لە ڕۆژئاوای بەغدا بووەو ئەمجار خۆی شاردوەتەوەو ڕۆیشتوە بۆ ڕۆژهەڵاتی بەغدا.

لە گەڵ کۆمەڵێك لە قوتابیانی ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل هاوڕێتی کردوەو لەوانەوە زانستی وەرگرتوەو قوتابی ئەوان بوە، ئەمەش بەڵگەیە کە هەر لە منداڵییەوە لە ناو کۆمەڵێك زانا و قوتابی زانستی ئەهلی سوننەدا ژیاوە کە زۆر کاریگەری لە سەر کەسایەتی هەبووە.

---

١ / لە نوسینی ئەم ژیاننامەیەدا سوودم لە کتێبی (اتحاف القاری بالتعلیقات علی شرح السنه للبربهاری)ی بەربەهاری بە راڤەکردنی شەیخ صالح الفوزان و کتێبی (عون الباري ببيان ما تضمنه شرح السنة للامام البربهاري) نوسینی شەیخ رەبیع بن هادی المدخلی وەرگرتوە، بۆ زانیاری زیاتر تەماشای ئەم کتێبانە بکە : (طبقات الحنابلة)ی ابن ابي يعلى، (المنتظم) ی ابن الجوزي، (الكامل)ی ابن اثير، (تاريخ الاسلام) و (سير اعلام النبلاء)و (العبر في خبر من غبر) ی ئیمامي الذهبي، (الوافي بالوفيات )ی الصفدي،(البداية والنهاية ) ی ابن كثير، (المقصد الارشد)ی ابن مفلح، (شذرات الذهب )ی ابن عماد .

ماموستاکانی:

لە کۆمەڵێك لە قوتابیانی ئیمامی ئەحمەدەوە زانستی وەرگرتوە لەوانە:

١/ أحمد بن محمد بن الحجاج بن عبدالعزيز ابو بكر المروذي.

٢/ سهل بن عبدالله بن يونس بن عيسى ابو محمد التستري.

هـەروەها فـەرموودەی لـە (الفـتح بـن أبـي الفـتح شـخرف بـن داود ابـو نـصر)ەوە وەرگرتوە.

پێگەی زانستی:

ئیمامی بەربەهاری پێشەوایەکی ناسراو بووە، هەردەم حەق وێژ بووەو بانگەوازی بۆ سـوننەو شـوێنکەوتنی فـەرموودە کـردوە، لای دەسـەڵاتداران نـاو بـانگی هـەبووەو مەجلیسەکەی هەردەم ئاوەدان بووە بە فەرمودە و زانست و فیقهـی ئیـسلامی، زۆرێـك لە زانایانی فیقه و فەرموودە ئامادەی ئەو مەجلیسە دەبون.

وتەی زانایان دەربارەی ئیمامی بەربەهاری:

ابن بطة دەفەرموێت: (ئەگەر کەسێکی بەغدادیت بینی (أبو الحسن بن بـشار) و (ابـو محمد البربهاري) خۆشدەویست بزانە ئەوە کەسێکی ئەهلی سوننەیە).

ابـن کـثیر دەفـەرموێت: (زانـا و زاهیـد و فـەقیهی حەنبەلییـەکان و ئامۆژگاریکـار... کەسێکی زۆر توند بووە بەرانبەر بە بیدعـەکاران و سەرپێـچیکاران، رێـزو حورمـەتێکی زۆری هەبووە لای خەڵکی تایبەتو عەوام و بە مەزنیان دەزانی).

ابن ابی یعلی دەڵێت: شەیخی کۆمـەڵی (حەنبەلییـەکان) لـە سـەردەمی خۆیـدا و لـە پێشی هەموویانەوە بووە لە ئینکاری کردن لە ئەهلی بیدعە....)

ئیمامی (الخطیب البغدادي) بە (رئیس الحنبلیة) ناوی بردوە.

ابن الجوزی دەڵێت: عیلم و زوهدی کۆکردبوەوە.

ئیمامی (الذهبي) دەڵێت: (شەیخی حەنبەلییەکان، پێشەنگ، پێشەوا).

دەستگرتنی بە سوننەتەوەو دژایەتی کردنی ئەهلی بیدعە:

ئەم پیاوە بەرێزە زۆر هەوڵی دەدا دەست بە سوننەتەوە بگرێو هانی خەڵکی دەداو دژایەتی بیدعەو بیدعەکارانی دەکرد، بە تایبەتی لەو سەردەمەدا کۆمەڵێك کۆمەڵو گرووپ پەیدا بوون وەکو شیعە و خەواریج و موعتەزیلە و جەهمەیو ئەشعەریو صوفی...هتد، جا ئەم پیاوە هەرچەندە زانایان دەڵێن: کەسێکی زاهیدو خاوەنی وەرعو لە خواترس بووە کەچی زۆر توند بووە بەرانبەر بیدعەکاران دژایەتی ئەوانی کردووە ئەمەش بەڵگەیە کە دژایەتی کردنی بیدعەکاران و توندی نواندن بەرانبەریان بەشێکە لە وەرعو زوهد و لە خواترسی، بۆیە بە جوانی تێفکرە.

ابن الجوزي دەڵێت: کەسێکی زۆر توند بووە بەرانبەر بە بیدعەکاران.

ئیمامی (الذهبي) دەڵێت: کەسێکی حەق وێژ بووەو بانگەوازی بۆ ئەسەر دەکرد و لە پێناوی خوادا لە لۆمەی لۆمەکاران ترسی نەبوو.

هەروەها دەڵێت: کەسێکی زۆر توند بووە بەرانبەر بە بیدعەکاران.

قوتابیانی:

ئەم پیاوە زۆرێك قوتابی ناوداری هەبووە کە زۆربەیان بوونەتە پێشەوا و زانا و ناوبانگیان دەرکردوە، لە دیارترینیان:

١. الحسین بن عبدالله أبو علی النجاد.

٢. عبدالعزیز بن جعفر بن أحمد ین یزداد أبو بکر ناسراو بە (غلام الخلال).

٣. عبيد الله بن محمد بن بطة أبو عبدالله العكبری ناسراو بە (ابن بطة) کە يەکێکە لە زانا بە ناوبانگەکان لە ساڵی (٣٨٧) ك کۆچی دوايی کردوە.

٤. محمد بن أحمد بن اسمعيل ابو الحسن ناسراو بە (ابن سمعون) زانا و ئامۆژگاريکار لە ساڵی (٣٨٧) ك کۆچی دوايی کردوە.

٥. محمد بن محمد بن عثمان ابو بكر المغربی.

<u>کێشەو ميحنەتەکەی:</u>

لەبەر ئەوەی ئەم پێشەوا بەڕێزە لە ناو خەڵکيدا و لای سوڵتان رۆڵێکی باڵای هەبوو بۆيە بيدعەکاران هەردەم لە دژايەتی ئەودا بوون بۆيە هەوڵيان دەدا وا لە سوڵتان بکەن بەرانبەر بەربەهاری پەست بێت بۆيە خەليفەی موسڵمانان (القاهر بالله) لە ساڵی (٣٢١ك) فەرمانی دا بە (ابن مقلە)ی وەزيری بە دەستگير کردنی بەربەهاریو هاورێکانی بۆيە ئەويش خۆی شاردەوە، بەڵام کۆمەڵێك لە گەورە هاورێکانی دەستگير کران و بران بۆ بەصرە، خوای گەورە سزای ابن مقلەی دا بەوەی کە خەليفە لێی پەست بوو لە وەزارتەکەی دەرکرا ئەويش هەڵات و ئاگر لە ماڵەکەی بەردرا، هەروەها لە ساڵی (٣٢٢ك) القاهر بالله خۆی دەستگير کراو هەردوو چاوی دەرهێنرا.

جارێکيتر فەزڵی خوای گەورە رژا بە سەر بەربەهاريدا و هاتەوە جێگاو ڕێگای خۆیو خەڵکی زۆرتری لە دەور کۆ بونەوە، تەنانەت کاتێ (نفطويە) کۆچی دوايی کرد لە ساڵی (٣٢٣ك) خەڵکێکی زۆر ئامادە بوو لە زانايان و ناودارانی دينو دونيا ئيمامی بەربەهاری پێشيان کەوتو پێش نوێژی بۆ کردن.

لەم ساڵەدا حيشمەتی بەربەهاری زياتر بوو، هاوەڵانی دەرکەوتن و بڵاوبوونەوەو ئينکاريان لە بيدعەکاران دەکرد و دژايەتی ئەوانيان دەکرد، بۆيە بيدعەکاران جارێکيتر

لە خەلیفە نزیك بوونەوە بۆ دژایەتی کردنی بەربەهاری، توانیان دڵی خەلیفە (الراضي) ڕازی بکەن، ئەویش فەرمانی کردە (بدر الخرشني) بەرپرسی پۆلیس کە بە ناو بەغدادا بانگ بکرێتو بڵاو بکرێتەوە کەوا نابێت بە هیچ شێوەیەك دوو کەس لە هاوەڵانی بەربەرهاری بە یەکەوە کۆببنەوە.

بۆیە ئەویش جارێکیتر خۆی شاردەوە و ڕۆیشت بۆ بەشی ڕۆژهەڵاتی بەغدا و هەر لەوێش –واتە: بە شاراوەیی لە ساڵی (٣٢٩ك)– کۆچی دوایی کرد، ڕەحمەتی خوای لێ بێت و لە تاوانەکانی خۆش بێت و بە بەهەشتی بەرین شادی بکات.

سبحان الله.. ئەم پیاوە دەسەڵاتداران بەو شێوە مامەڵەیان لە گەڵدا کردووە کەچی لە ناو کتێبەکەیدا دەڵێت: (ئەگەر کابرایەکت بینی دوعای لەسوڵتان دەکرد بزانە ئەوە خاوەن ئارەزووە، بەڵام ئەگەر کەسێکت بینی دوعا بۆ سوڵتان دەکات بەچاکسازی ئەوا بزانە خاوەنی سوننەتە (ان شاء الله) بە ڕاستی ئەو زانایانە قسەیان بۆ خوا کردووە نەك بۆ سەرخستنی خۆیان. ئایە ئەم هەڵویستە پێویستی بە تێفکرین و تێڕامان نییە؟؟

محمد ی کوڕی مەهدی دەڵێت: لە ساڵی بیست و سێ (مەبەستی ٣٢٣ ك) کەوتنە دەستگیر کردنی هاورێکانی بەربەهاری ئەویش خۆی شاردەوە، بە دوای هاورێکانییەوە دەگەران و ماڵەکانیان تاڵان کرا.

ڕەحمەتی خوای لێ بێت جار بە جارێ توشی ئیبتلا دەهات، هەرگیز سەلامەت نەبوو لە دەستو دەمی بیدعەکاران کەچی ئەویش هەردەم دامەزراو بوو.

ابو یعلی لە ابن بطة وە دەگێرێتەوە دەڵێت: یەکێك لەوانەی (بەربەهاری)یان خۆشدەویست کە هەندێ جار لە مەجلیسەکانی بەربەهاریدا ئامادە دەبوو کەسێکی

عەوام بوو رۆژێك – لە كاتێكدا سەرخۆش بوو– بە تەنیشت كەسێكی بیدعەچییەوە تێدەپەڕێ گوێی لێ بوو كابرای بیدعەچی دەڵێت: ئەو حەنبەلییانە.... (قسەی بە حەنبەلیەكان گوت). ئەویش گەڕایەوە پێی گوت: حەنبەلییەكان سێ بەشن:

بەشێكیان زاهیدن: رۆژوو دەگرن و نوێژ دەكەن.

بەشێكی تریان: دەنووسن و خەریكی فیقهن.

بەشەكەی تریان: دەدەن لەو كەسانەی جیاوازە لە گەڵیاندا نمونەی تۆ، بۆیە زللەیەكی بە بنا گوێیدا دا ئازاری پێ گەیاند.

رەحمەتی خوا لە بەربەهاری، بە ڕاستی كەسێكی زانا و لە خواترس بوو، هەردەم ژیانی لە گەیاندنی دینی خوادا بەسەر بردووە و هەرگیز كەمتەرخەم نەبووە لە دژایەتی كردنی بیدعە و بیدعەكاران، داوا لە خوا دەكەین نمونەی ئەو پیاوانە زۆر بێت.

## بەناوی خوای گەورە و میهرەبان

# چمکێك لە ژیانی شەیخ (صالح الفوزان)

ناوی تەواوی: شەیخ (صالح بن فوزان بن عبدالله آل الفوزان) لە قەبیلەی (الدواسر)ـە.

لە (١ ی مانگی رەجەب) ی ساڵی (١٣٥٤)ك بەرانبەر (٢٨/٩ /١٩٣٥) لە پارێزگای (القصیم) و لە شاری (الشماسیه) لە دایك بووە، لە تەمەنی منداڵیدا باوكی كۆچی دوایی دەكات، هەر لە منداڵیەوە فێری قورئانی پیرۆز بووە و فێری بنەماكانی خوێندنەوە و نوسین بووە لە سەر دەستی پێشەوای مزگەوتی شارەكەی خۆی، كە پێشەوایەكی زۆر زیرەكو لێهاتوو بوو لە خوێندنەوەی قورئاندا ئەویش شەیخ (حمود بن سلیمان التلال)ە رەحمەتی خوای لێ بێت، كە لە شاری (ضریة)ی ناوچەی (القصیم) قازی بووە.

لە سەرەتای ژیانیداو لە ساڵی (١٣٦٩)ك چووەتە قوتابخانە نیزامێكان و قۆناغەكانی خوێندنی بڕیوە تاكو گەیشتوەتە زانكۆ و لەوێ كۆلێژی شەریعەی لە شاری (ریاض) تەواو كردوەو بڕوانامەی (بكالۆریوس)ی بە دەست هێناوە پاشان بڕوانامەی ماستەری بە دەست هێناوە لە سەر (كتاب المواریث) لە زانستی میراتدا بووە بە ناوی (التحقیقات المرضیة في المباحث الفرضیة) پلەی نایاب (الامتیاز)ی بە دەست هێناوە، هەمان كۆلێژ هەستا بە چاپكردنی ریسالەكەی و وەكو سەرچاوەیەك، تاكو ئێستا لەبەر دەستی قوتابیاندایەو لە كۆلێژەكانی شەریعەدا دەخوێنرێت و ئەمجار بڕوانامەی دكتۆرای بە دەست هێناوە لە هەمان كۆلێژ لەسەر بابەتی (خواردنە حەڵاڵو

حەرامەكان بە بەڵگەوە) بە ناوی (أحكام الأطعمة في الشريعة الإسلامية)، لیژنەی گفتوگۆكوش بریتی بوون لە هەر یەك لە زانای پایەدار (عبدالله بن محمد بن حميد) رەحمەتی خوای لیّ بێت و زانای پایەدار (د.عبدالله بن عبدالمحسن التركی) تێیدا ئەندام بوون رێزدار (شەیخ عبدالرزاق عفيفی) سەرپەرشتیار بووە و پلەی (شرف)ی بە دەست هێناوە.

مامۆستاكانی:

لە سەر دەستی كۆمەڵێك مامۆستا و زانای ناودار دەرسی خوێندوە لەوانە:

١. سماحة الشيخ محمد الأمين الشنقيطي – رحمه الله
٢. سماحة الشيخ عبدالرحمن السعدي – رحمه الله
٣. سماحة الشيخ ابراهيم بن عبيد العبد المحسن – رحمه الله
٤. سماحة الشيخ عبدالعزيز بن باز – رحمه الله
٥. سماحة الشيخ عبدالله بن حميد – رحمه الله
٦. فضيلة الشيخ عبدالرزاق عفيفي – رحمه الله
٧. فضيلة الشيخ صالح السكيتي – رحمه الله
٨. فضيلة الشيخ صالح البليهي – رحمه الله
٩. فضيلة الشيخ محمد السبيل – حفظه الله
١٠. فضيلة الشيخ عبدالله بن صالح الخليفي – رحمه الله
١١. فضيلة الشيخ إبراهيم بن عقلاء الشعيبي – رحمه الله
١٢. فضيلة الشيخ محمد بن صالح المنصور – رحمه الله
١٣. فضيلة الشيخ صالح العلى الناصر – رحمه الله

جگە لەوانە لە سەر دەستی چەندین زانا لە زانایانی ئەزهەر وانەی فەرمووده و تەفسیر و زمانی عەرەبی خوێندوە.

کارە فەرمیەکانی:

لە پاش دەرچونی لە کۆلێژی شەریعە وەکو مامۆستایەك لە پەیمانگای زانستی لە ریاض دادەمزرێت،ئەمجار دەگوازرێتەوە بۆ کۆلێژی شەریعە بە مەبەستی وانە وتنەوە، ئەمجار بۆ (الدراسات العليا) لە کۆلێژی (أصول الدين) ئەمجار لە (المعهد العالي القضائي)

ئەمجار بووەتە ئەندام لە (اللجنة الدائمة للافتاء والبحوث العلمية) و ئەندام لە (هيئة كبار العلماء) هەروەها ئەندامە لە (المجمع الفقهي) لە مەککەی پیرۆز و ئەندامە لە لیژنەی سەرپەرشتی بانگخوازان لە حەجدا و پێشەواو وتاربێژە لە مزگەوتی (الأمير متعب بن عبدالعزيز) و ئەندامە لە زانکۆی (الإمام محمد بن سعود الإسلامية).

هەروەها بەشداری دەکات لە وڵامدانەوە لە بەرنامەی (نور على الدرب) و بەشداری دەکات لە گۆڤارە زانستییەکاندا و سەرپەرشتی قوتابیانی ماستەر و دکتۆرا دەکات، سەدان قوتابی لە ژێر دەستی پەروەدە بوون.

نوسینەکانی:

نوسینەکانی شەیخ دەگاتە نزیکەی (٥٨) بەرهەم و ئێستاش بەردەوامە لە نوسین، لە دیارترینیان:

١. (التحقيقات المرضية في المباحث الفرضية) لە زانستی میراتدا، هەر ئەویش ریسالەی ماستەرەکەیەتی.

٢. (أحكام الأطعمة في الشريعة الإسلامية) کە ریسالەی دکتۆراکەیەتی.

٣. (الإرشاد إلى صحيح الاعتقاد) بەرگێکی بچووکە.

٤. (شرح العقيدة الواسطية) بەرگێکی بچووکە.

٥. (البيان فيما أخطأ فيه بعض الكتاب) بەرگێکی گەورەیە.

٦. (مجموع محاضرات في العقيدة والدعوة) دوو بەرگە.

٧. (الخطب المنبرية في المناسبات العصرية) چوار بەرگە.

٨. (رسائل في مواضيع مختلفة).

٩. (مجموع فتاوى في العقيدة والفقه) لە بەرنامەكانی (نور على الدرب) وەڵامی داوەتەوە چوار بەرگی لێ نوسراوەتەوە.

١٠. (نقد كتاب الحلال والحرام في الإسلام).

١١. (شرح كتاب التوحيد– للشيخ محمد بن عبد الوهاب)

١٢. (التعقيب على ما ذكره الخطيب في حق الشيخ محمد بن عبد الوهاب).

١٣. (الملخص الفقهي)

١٤. (إتحاف أهل الإيمان بدروس شهر رمضان).

١٥. (الضياء اللامع من الأحاديث القدسية الجوامع).

١٦. (بيان ما يفعله الحاج والمعتمر).

١٧. (كتاب التوحيد) دوو بەشە لە قۆناغی ئامادەیی وەكو مەنهەج دەخوێنرێت.

١٨. (فتاوى ومقالات نشرت في مجلة الدعوة).

١٩. (البدع والمحدثات وما لا أصل له).

٢٠. (مجالس شهر رمضان المبارك).

٢١. (عقيدة التوحيد).

٢٢. (أضواء من فتاوى ابن تيمية).

٢٣. (بحوث فقهية في قضايا عصرية).

٢٤. (محاضرات في العقيدة والدعوة).

٢٥. (شرح كتاب كشف الشبهات).

٢٦. (فقه وفتاوى البيوع).

٢٧. (دروس من القران الكريم).

٢٨. (زاد المستقنع).

٢٩. (الملخص في شرح كتاب التوحيد).

٣٠. (إعانة المستفيد بشرح كتاب التوحيد).

٣١. (شرح مسائل الجاهلية).

٣٢. (حكم الاحتفال بذكرى المولد النبوي).

٣٣. (المنتقى).

٣٤. (لمحة عن الفرق).

٣٥. (الإيمان بالملائكة وأثره في حياة الأمة).

٣٦. (مجمل عقيدة السلف الصالح).

٣٧. (البيان بالدليل لما في نصيحة الرفاعي ومقدمة البوطي من الكذب الواضح والتضليل).

٣٨. (حقيقة التصوف).

٣٩. (من مشكلات الشباب).

٤٠. (وجوب التحاكم إلى ما أنزله الله).

٤١. (الفرق بين البيع والربا).

٤٢. (مسائل في الإيمان).

٤٣. (التعليقات المختصرة على متن العقيدة الطحاوية).

٤٤. (تدبر القرآن).

٤٥. (من أعلام المجددين في الإسلام).

٤٦. (وجوب التثبت في الأخبار واحترام العلماء).

٤٧. (من أصول عقيدة أهل السنة والجماعة).

٤٨. (دور المرأة في تربية الأسرة).

٤٩. (معنى لا إله إلا الله).

٥٠. (شرح كتاب شرح السنه للإمام البربهاري).

٥١. (شرح نواقض الإسلام).

٥٢. (التوحيد في القران).

٥٣. (التحذير من الفوضى والفتن والمظاهرات).

٥٤. (كتاب مناسك الحج والعمرة).

٥٥. (مختصر أحكام الجنائز).

٥٦. (أسئلة وأجوبة في مسائل الإيمان والكفر).

تەزکیەکردنی لە لایەن زانایانەوە:

١/ کاتێك پرسیار کرا لە (شەیخ عبدالعزیز بن بان): لە پاش تۆ پرسیار لە کێ بکەین؟ فەرمووی: شەیخ صالح الفوزان، وتیان: ئایە پرسیار لە فلان بکەین؟ فەرمووی: فلان فەقیهە، پرسیار لە شەیخ صالح بکەن.

هەروەها شەیخ (بن بان) فەرموویەتی: شەیخ (صالح الفوزان) و شەیخ (صالح بن غصون) لە باشترین زاناکانن و خاوەنی عەقیدەیەکی پاکو چاکن و لە ئەهلی فەزڵن و لە فەقیهەکانی ئەم دینەن.

٢/ هەروەها شەیخ (محمد المنجد) پرسیاری لە (محمد العثیمین) کرد –لە کاتێ ئەو نەخۆشییەی کە کۆچی دوایی کرد–: ئامۆژگاریم دەکەیت پرسیار لە کێ بکەم لە پاش تۆ؟ شەیخ ابن العثیمین هەندێ بیری کردەوە و ئەمجار فەرمووی: پرسیار بکە لە شەیخ صالح الفوزان چونکە ئەو کەسێکی فەقیهە و خاوەنی دینە.

٣/زانای پایەدار (ابن غدیان) ی تەزکیەی کردوە بە خاوەن زانست ناوی بردوە.

٤/ شەیخ رەبیع بن هادی المدخلی دەڵێت: (سوێند بە خوا خۆزگە دەخوازم پێش شەیخ صالح الفوزان و شەیخ صالح اللحیدان بمرم، سوێند بە خوا ئەگەر سەرپشك بکرایەم ئەوا مردنی پێش ئەوانم هەڵدەبژارد، جا نازانم دونیا چی بە سەر دێت ئەگەر ئەوان بمرن.

## بە ناوی خوای گەورەو میهرەبان

**ئیمـامی (بەربـەهاری) دەفـەرموێت:** (الحمد لله الذي هدانا للإسلام، ومَنَّ علينا به، وأخرجنا في خير أمة، فنسأله التوفيق لما يُحِبُّ ويرضى، والحفظ مما يكره ويسخط).

**واتە: سوپاس‌و ستایش بۆ ئەو خوایەی ڕێنمویی کردووین بۆ ئیسلام‌و بەو ئیسلامە منەت‌و فەزڵی خۆی ڕژاندوە بەسەرماندا‌و لە باشترین ئوممەت دەریچواندووین، بۆیە داوای لێ دەکەین تەوفیقمان بدات بۆ ئەوەی پێی خۆشە‌و پێی ڕازییە‌و بمانپارێزێ لەوەی پێی ناخۆشە‌و پێی تووڕە دەبێ).**

**ڕاڤـە:**

**ئەم چەند وشانەی سەرەوە دەستپێك‌و پێشەكی كتێبەكەیە، سەرەتا بە** (الحمد لله) **دەستی پێكردوە، وەكو كاركردنێك بە سوننەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، چونكە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە نووسین‌و وتارەكانیدا بە سوپاس‌و ستایشی خوا دەستی پێ دەكرد، بەم شێوەش سەلەفی صاڵح‌و زانایان لەنوسین‌و وتارەكانیاندا دەستیان پێ دەكرد، كتێبەكانیان بە** (بسم الله الرحمن الرحيم) **دەست پێ دەكەن، وەكو شوێنكەوتنی قورئانی پیرۆز، هەروەها بە**(الحمد الله رب العالمين) **دەستی پێ كردوە وەكو شوێنكەوتنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چونكە ئەو ئەگەر بیویستایە وتارێك بدات یان قسەیەك بكات یان لەشتێ خەڵكی ئاگادار بكردایەتەوە ئەوا سوپاس‌و ستایشی خوای دەكرد[٢]و ئەمجار ئەوەی بیویستایە ڕوونی بكاتەوە ڕوونی دەكردەوە، جا نوسەری ئەم**

---

٢ / تەماشای : مسلم (٥٩٣/٢ )ژمارە (٨٦٨) بكە .

کتێبە ئەم بەرنامەی گرتوەتە بەر وەکو شوێنکەوتنی پێشینی خۆی ئەویش دەست پێکردنە بە (الحمد لله).

مانای (الحمد لله) واتا: هەموو جۆرە سوپاس‌و ستایشێك تەنها بۆ خوایە، (الحمد): بریتییە لە مەدح و سەنا بۆ ئەو کەسەی مەدح دەکرێت، جا خوای گەورە سوپاس‌و ستایشی دەکرێت لەبەر زاتی خۆی، سوپاس‌و ستایش دەکرێت لە بەر ناوو سیفەتەکانی، سوپاس‌و ستایش دەکرێت لە بەر کارەکانی، بۆیە هەموو جۆرە سوپاس‌و ستایشێك بۆ ئەوە، چونکە هەموو نیعمەتەکان لە ئەوەوەیە، جگە لە خوا ستایش دەکرێت بەگوێرەی ئەو چاکەی کردوویەتی، بەڵام ستایشی ڕەهاو بێ کەم‌و کووڕی‌و گشتگیر تەنها بۆ خوایە، بۆیە دروست نییە بڵێیت: (الحمد لفلان) بە مانای (الاستغراق) ئەمە دروست نییە بۆ هیچ کەسێك تەنها بۆ خوا نەبێ، هەروەکو لە قورئاندا هاتوە: (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (٢) الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ (٣) الفاتحة) واتە: (تەواوی جۆرەکانی سوپاس‌و ستایش تەنها هەر بۆ خوایە پەروەردگاری ئادەمی‌و فریشتەو گشت ئاسمانەکان‌و زەویی‌و بوونەوەرە، پەروەردگاری تەواوی جیهانەکانە (٢) بەخشندەی بەبەزەیی میهرەبانە، بەزەییەکەی ئێجگار فراوانە، میهرەبانییەکەیشی بەردەوام و نەبڕاوەیە (٣)[٣].

خوای گەورە دەفەرموێت: (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالآرْضَ وَجَعَلَ الظُّلُمَاتِ وَالنُّورَ (١)الأنعام) واتە: هەموو جۆرە سوپاس‌و ستایشێك تەنهاو تەنها بۆ ئەو خوایەیە ئاسمانەکان‌و زەوی بەدیهێناو تاریکاییەکان‌و ڕووناکیشی داهێنا).

---

٣ / لە تەفسیر کردنی ئایەتەکاندا پشتم بە تەفسیری (رامان )بەستووە لە دانانی رێزدار (ئەحمەد کاکە مەحمود) خوا لە تاوانەکانی ئێمەو ئەویش خۆش بێت، بۆیە تەفسیر کردنی هەموو ئایەتەکانی ناو ئەم کتێبە لەو تەفسیرەوە وەرگیراوە .

دەفـــەرموێت: (الْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ (١)فـاطر) واتـــە: (ســـوپاس‌و ستاییش‌و شوكرانە هەر بۆ خوای بەدیهێنەری ئاسمانەكان‌و زەوی).

بەڵام بڵێیت: (أشكر فلان)(سوپاسی فلان كەس دەكەم) یان (أحمدُ فلانا علـى كـذا وكـذا) (سوپاســی فـلان كـەس دەكـەم لەســەر ئـەو شـتەو ئـەو شـتە) بـە مانـای تایبەتمەندكردن ودیاریكردنی ئـەو شـتەی بـە هۆیـەوە سـوپاس‌و ستایـشی كەسـەكەت كـردوە ئـەوا ئاسـاییە بـەڵام ئەگـەر بڵێیـت: (الحمـد لفـلان) ئـەوا دروسـت نییـە، تـەنها لەحەقی خوادا نەبێت.

(الله): ناوێكە لەناوەكانی خوای گـەورەو ماناكـەی (پەرسـتراو) دەگرێتـەوە، چـونكە (الالوهیة) مانای پەرستنە.

ئەمەش ناوێكە تەنها بە خوای گەورە دەگوترێـت، هـەرگیز هـیچ كەسـێكی تـر ئـەو ناوەی لە خۆی نەناوە، تەنانەت زۆردارەكان‌و كافرە بێ‌ بڕواكانیش، هیچ یـەكێك لـەوان ناوی خۆی نەناوە (الله)، فیرعەون نـەیگوت: (انـا الله) بـەڵكو گـوتی:– (أَنَا رَبُّكُمُ الأَعْلَى (٢٤)النازعات) (واتە: مـن پـەروەردگاری بـەرزو بڵنـدی ئێـوەم) جـا ئـەم نـاوە تایبەتـە بەخوداوە.

(رب العالمین): (الرب) مانـای:خـاوەن‌و فـەرمانڕەواو سـەردار دێـت، (العالمین) كـۆی وشەی (عا لم)ـە،ئەویش بریتییە لە هەموو دروستكراوەكان، خوای گەورەش پەروردگارو دروستكارو بەڕێوەبەرو پەرستراو و خوای ئەوانە.

مەبەست لە: (الحمد لله الذي هدانا للإسلام):

ئیسلام گەورەترین نیعمەتە، خوای گەورە دەفەرموێت: (الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا (٣)المائدة) واتە: وا لە ئەمڕۆوە بەرنامەو ئاینەکەتانم بەپایان گەیاندوە نیعمەت و بەخششی خۆم بۆ تەواو کردن، ئیسلامیشم بەبەرنامەو ئایین بۆ هەڵبژاردن).

جا بە ئیسلام نیعمەتەکان تەواو بوو بۆ موسڵمانان، خوای گەورە دەفەرموێت: (قُلْ بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَلِكَ فَلْيَفْرَحُوا (٥٨)یونس) واتە: (بڵێ: دەبێ تەنها بە بەهرەو میهرەبانی خوا _ واتە بەقورئان و ئیسلامی پیرۆز _خۆشحاڵ و دڵشاد بن).

(فضل الله): بریتییە لە ئیسلام، (الرحمة): بریتییە لەقورئان، بۆیە با دڵخۆش و بەختەوەر بن بە ئیسلام و قورئان.

ئەمەش دانپێدانانێکە لەتۆوە کەوا تەنها فەزڵی خوایە لە هیدایەت دانت بۆ ئیسلامو بە ڕێنمویی کردنت بۆی‌و دامەزراو بوونت لەسەری، ئەمە فەزڵێکە لە خوداوە، نەك بە تواناو هێزی خۆت، بەڵکو ئەوە تەوفیقێکە لەخوداوە، هەر ئەوە هیدایەتی تۆی داوە، بۆیە ئەهلی بەهەشت کاتێ دەچنە بەهەشتەوە لەڕۆژی قیامەتدا دەڵێن: (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي هَدَانَا لِهَذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِيَ لَوْلَا أَنْ هَدَانَا اللَّهُ (٤٣) الأعراف) واتە: سوپاس تەنها بۆ ئەو خوایە لە دونیادا ئێمەی خستە سەر ئەم ڕێگەیەو ڕێنمایی کردین بۆ کارو کردەوەی باش‌و لێرەیش پاداشی ئاوای داینەوە، خۆ ئەگەر خۆی ڕێنمایی نەکردباین هەرگیز ڕێمان دەرنەدەکردو بەختیار نەدەبوین).

مەبەست لە: (ومنَّ علينا به):

ئیسلام منەتێکە لەخوداوە، ئەگەر نا خوای گەورە پێویست نییە لەسەری هیچ شتێك بۆ هیچ کەسێك بکات، بەڵکو ئەو فەزڵی خۆی داوە بە سەر بەندەکانی بە ئیسلامو نیعمەتەکانو لەش ساغیو تەندروستیو ڕزق و ڕۆزی.

مەبەست لە: (واخرجنا في خير امة).

لەو ئایەتەوە وەریگرتوە کە دەفەرموێت: (كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ (١١٠) آل عمران) واتە: ئێوە چاکترین ئوممەت و کۆمەڵن، هێنراونەتە ئەم سەر زەوییە بۆ کەڵك گەیاندن بە مەردم و ڕێنمایی کردنیان).

جا مەبەست لە: (كُنْتُمْ) ئەمە بە موسڵمانان دەڵێت: (خَيْرَ أُمَّةٍ) واتە: باشترین ئوممەتەکانو (الامة) مەبەستی کۆمەڵ و جەماعەتە، (خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ) تێفکرەو لەو وشەیە: (لِلنَّاسِ) چاکەو خەیری ئەم ئوممەتە تەنها بۆ خۆی نییە، بەڵکو تێدەپەڕێ بۆ خەڵکی تر لە بانگەواز و جیهادو فێرکردنو ڕێنموییی، تەنها بەس نییە بۆ موسڵمان فێرببێتو کاربکات بۆ خۆیو واز لە خەڵکی بهێنێ، بەڵکو دەبێ ئەم بانگەوازە بڵاوبکاتەوە، زانستو زانیاری بڵاوبکاتەوە، خەیرو چاکە بڵاو بکاتەوە، بانگەواز بکات بۆ خواو فەرمان بەچاکەو نەهی بکات لە خراپە، ئەو کاتە دەبێتە ئەندامێکی کارا لە کۆمەڵگای موسڵماناندا، ئەو ئایەتەی دەفەرموێت: (أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ) واتە: تەنها بۆ خۆیان دەرنەچوون، بەڵکو خوای گەورە ئەوانی بۆ خەڵکی دەرکردووە (ناردووە).

مەبەست لە: (فنسأله التوفيق لما يحب ويرضى):

موسڵمان داوای دامەزراوی لەخوا دەکات، هەرچەندە حەق بناسێتو کاری پێ بکاتو باوەڕی پێی هەبێت، هەرگیز دڵنیا نییە دەترسێت دڵی لەسەری لاربببێتەوە و

لاچێت و توشی فیتنە ببێت، بەوەی بەرەو فیتنە بڕوات و بیەوێ لێی تێپەڕ بێت و لەڕێگای خوای گەورە گومڕا بێت، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: (یامقلب القلوب ثبت قلبي على دينك)[٤] واتە: ئەی ئەو کەسەی دڵەکان ئەمدیو ئەودیو دەکەیت دڵم لەسەر دینەکەت دامەزراو بکە) خۆشەویستی خوا ئیبراهیم (علیە الصلاة والسلام) لەدوعاکەیدا دەیفەرموو: (وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَنْ نَعْبُدَ الآصْنَامَ (٣٥) رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ (٣٦)ابراهيم) واتە: خوایە ! خۆم و کوڕەکانم لە بتپەرستی وەدوورخە (٣٥) ئەی پەروەردگارم! بە ڕاستی ئەو بتانە خەڵکێکی زۆریان سەرلێشێواو و گومڕا کردووە (٣٦).

لەخۆی ترسا، ئا بەم شێوەیە هەرکاتێك کەسێك ئیمانی بەهێزتر بێت بەخوا ئەوا دەترسێتو دڵنیا نابێت لەفیتنە، هەرگیز تەزکیەی خۆی ناکات، بەڵکو داوا لەخوای گەورە دەکات دامەزراوی بکات، هەموو کاتێك داوای ئاخر خەیری لێ دەکاتو لەئاخر شەڕی دەترسێتو لەفیتنەکان دەترسێتو لەڕێ لادانو گومڕابوونو بانگەوازکارانی خراپە دەترسێت.

مەبەست لە: (والحفظ مما يكره ويسخط):

خوای گەورە تەوفیقمان بدات بۆ ئەوەی پێی خۆشەو پێی ڕازییە لەکردەوەکانو قسەکانو بیروباوەڕەکانو دوورمان بخاتەوە لەوەی تووڕەی دەکات لەقسەکانو کردەوەکانو بیروباوەڕەکان، هەرخۆی ڕێنمویی کارەو هەر ئەو تەوفیقمان دەداتو هەرخۆی ڕێنیشاندەرو ڕابەرە.

---

٤ / صحيح : أخرجه الترمذي (٢١٤٠)، وابن ماجه (٣٨٣٤)، وأحمد (٣/١١٢، ٢٥٧) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع ) (٧٩٨٧).

**﴿١﴾ نوسـەر دەڵێـت: (اعلمـوا أن الإسـلام هـو الـسنة والـسنة هـي الإسـلام، ولا يقـوم أحدهما إلا بالآخر).**

**واتـە: بـزانن ئیـسلام بریتییـە لـە سـوننەتو سـوننەتیش بریتییـە لەئیـسلامو هـیچ یەکێکیان بە بێ ئەویتر راست نابێتەوە).**

**ڕاڤە:**

**مەبەست لە:** (اعلم).

**ئەم وشەیە بۆ بایەخدانە، مانای** (إعلم) **واتە: بزانە، فێربـە، چـۆن دەزانیـت ئیـسلام سوننەتە؟ ئەگەر فێر بویت ئەو کاتە ئەوە دەزانیت.**

**جا** (اعلم) **وشەیەکە دەیهێنن بۆ ئەوەی بزانرێت ئەوەی لەپاش ئەو دێت بایەخـدارە، هەروەکو خـوای گـەورە دەفـەرموێت:** (فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ (١٩) محمد) **واتە: بزانە بێ گومان جگە لە (الله) هیچ پەرستراوێکی هەق نییە مافی پەرستنی ببێ، دەسا تۆش لە سەر ئەو بیروباوەڕە سابت بەو هـەرگیز نـەگۆڕێیت، بۆ خۆت و ئیمانداران لە پیاوان و ژنان داوای لێبووردنی گوناهان بکە).**

**واتە: مانای** (لااله الا الله) **فێربەو بزانە و کاری پێ بکـە،** (اعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ وَأَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ (٩٨) المائدة) **واتە: دەبێ ئەوەش بزانن بەڕاستی خوا لە سزاداندا زۆر توندو سەختگیرە بۆ کەسێ لەبڕیارەکانی سەرپێچی بکات بـێ گومانیـشبن هـەر خوایـە تاوان پۆشە، دلۆڤان و میهرەبانە).**

**جا وشەی** (اعلم) **یان** (اعلموا) **دەهێنن بۆ بایەخدان بەوەی پاش خۆی دێت.**

**مەبەست لە:** (الاسلام هو السنة والسنة هي الاسلام).

**واتە: ئیسلام ئەو ڕێگایەیە پێغەمبەران هێناویانە (علیهم الصلاة والسلام)، هەموو پێغەمبەرانش (علیهم الصلاة والسلام) ئیسلامیان هێناوە، جا هەموو پێغەمبەرێك بانگەوازی بۆ خوا کردوە، لەلایەن خوداوە شەریعەتێکی هێناوە، ئەوەش ئیسلامە، کەواتە ئیسلام بریتییە لە پەرستنی خوا بەتاكو تەنهایی لە هەموو کاتێکدا بە پێی ئەو شەریعەتەی خۆی داڕێژاوە، خوای گەورە بۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) شەرعێکی داناوە بۆ کاتێکی (ماوەیەکی) دیاریکراوە پاشان نەسخی دەکاتەوە، جا ئەگەر هەر شەریعەتێك نەسخ کرایەوە ئەوا کارکردن بە (ناسخ)ەکە (واتە ئەوەی لەپاشدا هاتوەو پێشی خۆی نەسخ کردوەتەوە) بریتییە لەئیسلام، تاکو خوای گەورە (محمد)ی (ﷺ) ڕەوانە کردو بە شەریعەتەکەی هەموو شەریعەتەکانی پێش خۆی نەسخ کردەوە، خوای گەورە دەفەرموێت:** (لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ (٣٨) يَمْحُو اللَّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ وَعِنْدَهُ أُمُّ الْكِتَابِ (٣٩)الرعد) **واتە: بۆ هەموو سەردەم و بۆ هەموو کارێك بڕیارو نامەیەکی تایبەتی هەیە (٣٨) خوا هەر کامێکیانی ویستبێ لای بدا ئەوا لایداوەو سڕیویەتییەوە هەر شتێکیشی ویستبێ دەیهێڵێتەوەو دایك و سەرچاوەی هەموو کتێبە ئاسمانییەکان لای خوای گەورەیە (٣٩).**

**جا ئیسلام بریتییە لەوەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هێناویانە لە بانگەوازو کارکردن لە هەموو سەردەمێکدا بە گوێرەی خۆی، تاکو خوای گەورە (محمد)ی (ﷺ) ڕەوانە کرد، چیتر ئیسلام بریتییە تەنها لەو شەرعەی ئەو هێناویەتی، جا هەر کەسێك لەسەر دینەکانی پێشوو بمێنێتەوەو باوەڕ بە(محمد) (ﷺ) نەکات ئەوا موسڵمان نییە، چونکە ملکەچی خوا نەبووەو گوێڕایەڵی ئەم پێغەمبەرە (ﷺ) نەبوە،**

چونکە ئەوەی ئەو لەسەری بوە تەواو بوەو نەسخ کرایەوە، مانەوە لەسەر دینە نەسخکراوەکە دینی خوا نییە بەڵکو کارکردن بە دینە (ناسخ)ەکە دینە.

**مەبەست لە:** (والسنة هی الاسلام).

جیاوازی لەنێوانیاندا نییە، ئەگەر (سوننەت)مان بە ڕێگا ڕاڤە کرد ئەوا هیچ جیاوازییەك لەنێوان ئەو و ئیسلامدا نییە.

**مەبەست لە:** (ولا یقوم احدهما الا بالآخر).

ئیسلام ڕاست نابێتەوەو دروست نابێت تەنها بە سوننەت نەبێت، سوننەتیش ڕاست نابێتەوە تەنها بە ئیسلام نەبێت، جا ئەو کەسەی بانگەشەی ئیسلام دەکات و کار بەسوننەت ناکات _واتا ڕێگاکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) _ئەوە موسڵمان نییە، ئەو کەسەش فێری سوننەت دەبێت و تەسلیمی خوا نابێت ئەوە موسڵمان نییە هەرچەندە سوننەتیش بناسێت، بۆیە پێویستە هەردوکیان لە کەسەکەدا هەبێت.

**﴿٢﴾ نوسەر دەڵێت: (فمن السنة لزوم الجماعة، فمن رغب غير الجماعة وفارقها فقد خلع ربقة الإسلام من عنقه وكان ضالا مضلا).**

واتە: هەر لەسوننەتدایە دەست گرتن بەجەماعەتەوە، جا هەرکەسێ حەزی لەجەماعە نەکردوو لێی جیا بوەوە ئەوا گرێی ئیسلامی لەملی خۆی داماڵییەو دەبێتە کەسێکی گومڕاو گومڕاکەر).

ڕاڤە:

مەبەست لە: (فمن السنة لزوم الجماعة).

کەوابوو لەبەر ئەوەی ئیسلام بریتییە لەسوننەتو سوننەتیش بریتییە لەئیسلام، ئەوا سوننەت چەند جۆرێکە، (فمن السنة لزوم الجماعة) واتە: دەستگرتن بە جەماعەتی موسڵمانانەوە، مەبەست لەجەماعەت لێرەدا: جەماعەتی موسڵمانانە ئەوانەی لەسەر حەقن.

بەڵام ئەو کۆمەڵانەی لەسەر حەق نین ئەوا لەڕاستیدا پێیان ناگوترێت جەماعەت، هەر جەماعەتێك لەسەر گومڕایی کۆبوونەوە یان لەسەر بەرنامەیەك جیاواز لە ئیسلام یان لەسەر ڕێگایەك جیاواز لە ئیسلام ئەوا لەڕاستیدا پێی ناگوترێت ئەو جەماعەتەی پێویستو خوازراوەو مەدحکراوە.

جا ئەو جەماعەتەی لێرەدا مەبەستێتی: ئەوانەن لەسەر حەقن، پێویستو مەرج نییە ئەو جەماعەتە زۆربن، بەڵکو ئەگەر تەنها یەك کەسیش لەسەر حەق بوو ئەوە بریتییە لە جەماعەت، کەواتە جەماعەت: ئەوانەن لە سەر حەقن، جا ئەگەر کەم بن یان زۆر، پێویستە دەست بگرین بەو کەسانەوە لەسەر حەقن، جیاوازو ناکۆك نەبیت لەگەڵ ئەو جەماعەتەی لەسەر حەقن، بەڵکو دەبێ تۆیش لەگەڵ ئەواندا لەسەر حەق بیت، جا هەر کەسێك جیابوەوە لەجەماعەت ئەوا لە پاشاندا ڕوونی دەکەینەوە (إن شاء الله).

دەستگرتن بە جەماعەتەوە، واتە: دەرنەچیت دژی ئەوانو جیاواز نەبیت لەگەڵیاندا.

**مەبەست لە:** (فمن رغب غير الجماعة وفارقها فقد خلع ربقة الاسلام من عنقه).

ئەمە دەقی ئەو فەرموودەیە کە دەفەرموێت: (من فارق الجماعة قيد شبر فقد خلع ربقة الإسلام من عنقه)[٥] واتە:-هەرکەسێك لەجەماعەت جیابووەوە بە ئەندازەی بستێك ئەوا گرێی ئیسلامی لەملی خۆی داماڵیوە).

بەڕاستی ئەمە هەڕەشەیەکی توندە، جا ئەگەر جیاوازییەکە لە عەقیدەدا بوو، بە شێوەیەك جگە لەخوا بپەرستێت ئەوە کوفرە، ئەگەر هاتوو جیاوازییەکە شتێکی تر بێت ئەوە گومڕاییە، جا جیاوازی کردن لەگەڵ جەماعەتدا (لەجەماعەت جیابونەوە) هیچ خەیرێکی تێدا نییە، لەفەرموودەیەکدا هاتوە: (عليكم بالجماعة فان يد الله على جماعة)[٦] واتە: دەست بگرن بەجەماعەتەوە چونکە دەستی خوا لە گەڵ جەماعەتدایە).

کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی دا بە (حذيفة ی کوڕی یەمان) دەربارەی ڕوودانی فیتنەو جیاوازییەکان، (حذيفة) پێی فەرموو: چی فەرمانێکم پێ دەکەیت ئەگەر گەیشتمە ئەو ڕۆژە؟ فەرمووی (ﷺ): (أن تلزم جماعة المسلمين وإمامهم)[٧] واتە:

---

٥ / صحيح : أخرجه الترمذي (٢٨٦٣) وأحمد (٤/١٣٠، ٢٠٢) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (١٧٢٤).

٦ /رواه أحمد والحميدي والترمذي والنسائي وابن حبان والحاكم قال الترمذي : (حسن صحيح غريب من هذا الوجه ) وصححه ابن حبان و الحاكم ووافقه الذهبي.

٧ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٣٤١١، ٦٦٧٣) ومسلم (١٨٤٧) .

دەست بە جەماعەت و پێشەوای موسڵمانانەوە بگرە) کەواتە: جەماعەت دروست نابێت و نییە بەبێ دوو مەرج:-

یەکەم: دەبێ بەرنامەیان قورئان و سوننەت بێت، بەرنامەیان مەزهەبی فلان و قسەی فلان نەبێت بەڵکو تەنها قورئان و سوننەت بێت.

دووەم: دەبێ پێشەوایەکی موسڵمانی هەبێت سەرکردایەتی بکات و بگەڕێتەوە بۆ لای، ناکرێت جەماعەت کۆ ببێتەوە بە بێ پێشەوا، دەبێ پێشەوایەك هەبێت و ببێتە سەرچاوەیان، بۆیە بە (حذیفة)ی فەرموو: دەست بەجەماعەت و پێشەوای موسڵمانانەوە بگرە) حذیفة فەرمووی: (فإن لم يكن لهم جماعة ولا إمام؟) واتە: ئەگەر موسڵمانان جەماعەتێك و پێشەوایەکیان نەبوو؟) پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (تعتزل تلك الفرق) واتە: دووربکەوە لەو کۆمەڵانە) فەرمانی پێکرد دووربکەوێتەوە لەو کۆمەڵانەو تەنها دەبێت لەگەڵ جەماعەتی موسڵماناندا بیت، لەگەڵ هیچ جەماعەتێکدا نەبیت جگە لە جەماعەتی موسڵمانان، بەڵکو تەنها خۆی بمێنێتەوە لەسەر حەق تاکو مردن یەخەی پێ دەگرێ ئەو هێشتا بەو شێوەیە بێ.

لەمەدا ئەوە دەردەکەوێت دەبێ موسڵمان لەگەڵ ئەو کۆمەڵانەدا نەبێت جیاوازن لە بەرنامەی حەق، جەماعەتیش نابێت بەبێ دوو مەرج:- دەبێ بەرنامەیان قورئان و سوننەت و مەنهەجی سەلەفی صالح بێت، دەبێ پێشەوایەکی موسڵمانیان هەبێت سەرکردایەتیان بکات و بگەڕێنەوە بۆ لای، جا دین نابێت و نییە بەبێ جەماعەت، جەماعەتیش نابێت و نییە بەبێ پێشەوا، پێشەواش نابێت و نییە بەبێ گوێڕایەڵی، ئەمە بەرنامەی موسڵمانانە، ئەمەش ئەو سوننەتەیە ڕاڤەی دەکات _ڕەحمەتی خوای لێبێت_.

ئەمەش ئەوەی تێدا بەدی دەکرێت نەهی لێکراوە لە ناوازەیی (الشذوذ) لە بۆچوونو جیاوازییەکاندا، دەبێ موسڵمان دەست بەجەماعەتەوە بگرێت چونکە ئەوان لەسەر گومرایی نین.

**مەبەست لە:** (خلع ربقة الاسلام من عنقة).

لە نەریتی عەرەبدا ئەوە هەبوو پەتێکیان (گوریسێکیان) دەکردە ملی مەڕەکانەوە بۆ ئەوەی جیاواز نەبن و بزر نەبن و گورگ نەیانخوات، ئەم پەتانە (گوریسانە) هەموویان بەسترابوونە پەتێکەوە هەموویان کۆدەکاتەوە بەمەبەستی پاراستنیان، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستگرتنی بەجەماعەتەوە بەو کارەی شوبهاندوە، بۆیە جەماعەت پارێزەرە لەو شتانەی بەهەلاکەتدا دەتبەن، وەکو ئەو پەتەی دەکرێتە ملی مەڕەکانەوەو لە گورگ دەیپارێزێت و لەبزربوون دەیپارێزێت.

**مەبەست لە:** (وكان ضالاً مضلاً).

خودی خۆی گومرایە لەسەر ڕێگا، گومراکەری جگە لەخۆیەتی، گومرایە لەخودی خۆیدا، گومراکەرە بۆ ئەو کەسانەی چاوی لێ دەکەن و شوێنی دەکەون، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَنْ يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَى وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّى وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ وَسَاءَتْ مَصِيرًا (١١٥) النساء) واتە: هەرکەسێك پاش ئەوەی ڕێگەی هەقو ڕاستی بۆ دەرکەوتو شارەزای دینی خوا بوو دژایەتی پێغەمبەر (ﷺ) بکاو ڕێگاو ڕێبازێ بگرێتە بەر، ڕێگای ڕاستی باوەڕداران نەبێت، ئێمەیش ڕووی ئەکەینە ئەو بەرنامەو ڕێگایە بە ئارەزوی خۆی لەدونیادا هەڵیبژاردووە، ئای کەدۆزەخ جێ و ڕێیەکی زۆر سامناك و خراپەو بۆیان ئامادەکراوە).

بۆیە پێویستە لەسەر موسڵمان شوێنی ڕێگای ئیمانداران بکەوێت و جیاواز نەبێت لەگەڵیاندا و لەوان نامۆ (شاذ) نەبێت.

**﴿٣﴾ نوسەر دەڵێت: (والأساس الذي تبنى عليه الجماعة: هم أصحاب محمد (ﷺ) ورحمهم الله أجمعين، وهم أهل السنة والجماعة، فمن لم يأخذ عنهم فقد ضل وابتدع، وكل بدعة ضلالة والضلالة وأهلها في النار)[٨].**

واتە: ئەو بنەمایەی جەماعەتی لەسەر بنیات دەنرێت بریتییە لە: هاوەڵانی (محمد) (ﷺ) رەزاو رەحمەتی خوا لەهەموویان بێت، ئەوانیش ئەهلی سوننەو جەماعەتن، جا هەر کەسێك لەوانەوە وەرنەگرێت ئەوا گومڕابووەو بیدعەی کردوە، هەموو بیدعەیەکیش گومڕاییەو گومڕایی و ئەهلەکەیشی لەئاگردان.

**ڕاڤە:**

**مەبەست لە:** (والاساس الذى تبنى عليه الجماعة).

ئەو جەماعەتە کامەیە ئەمە ئاکارو سیفاتیانە؟ ئەوانە هاوڕێو هاوەڵی (محمد)ن و (ﷺ) ئەوانەی لە پاش ئەوان هاتن لە شوێنکەوتوان و شوێنکەوتەی شوێنکەوتووان و سێ سەدە چاکەکە، ئەوانە بریتین لە جەماعەت، ئەو کەسانەی شوێنی ئەوان دەکەون و لەوانەی پاش ئەوان هاتن، ئەوانە ئەو جەماعەتەن کە (واجب)ـەو پێویستە لەسەر موسڵمان لەگەڵیاندا بێت، هەرچەندە تووش ئەو ئازارە بێت کە تووشی دەبێت، تووشی هەڕەشە بێت، تووشی تانە لێدان و هێرش کردنەسەر بێت لەلایەن ئەوانەوە، کەچی ئارام دەگرێت، بەرگە دەگرێت، چونکە ئەو لەسەر حەقە، بۆیە هەرگیز لانادات لەحەق، بەڵکو ئارام دەگرێت لەسەر ئەوەی تووشی دەبێت، ئەگەر نا ئەوە دەبێتە ئامانجێك بۆ نەیاران و بانگەوازکارانی خراپەکاری و بانگەوازکارانی گومڕایی.

---

٨ / هەروەکو لە فەرموودەی : (كل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار ) أخرجه النسائي (١٥٧٨) وابن خزيمة (١٧٨٥) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (١٣٥٣) .

خوای گەورە دەفەرموێت: (وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ بِإِحْسَانٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ (١٠٠)التوبة) واتە: – لەدەستەی یەکەمی پێشەنگی کۆچەران و پشتیوانان و چاك پەیڕەوانی ئەوانیش خوا ڕازی بوو لێیان و ئەوانیش لەخوا ڕازی بوون).

خوای گەورە کاتێ باسی کۆچەران و پشتیوانان دەکات لە سورەتی (الحشر) دەفەرموێت: (وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ (١٠) الحشر) واتە: ئەوانەش لەدوای ئەوانەوە هاتوون دەڵێن: ئەی پەروەردگارەکەمان! لە ئێمەو لەو برایانەمان پێش ئێمە باوەڕیان هێناوە خۆش ببەو هیچ بوغزو قینێك مەخە دڵمانەوە بەرامبەر بەو کەسانەی باوەڕیان هێناوە ئەی پەروەردگاری ئێمە! بەڕاستی تەنها ئەتۆی بەسۆزی میهرەبان).

جا پاشینەکان شوێنی پێشینەکان دەکەون لەئەهلی حەق و ئەهلی خەیرو چاکە هەرچەندە لەنێوانیاندا سەردەمو زەمانێکی دوورو درێژ هەبێت، پێویستە لەسەری دەستی پێوە بگرێت هەرچەندە لەو پێناوەدا تووشی هەرچی ببێت، ئەو بەردەوام ئارام دەگرێت.

مەبەست لە: (أصحاب محمد(ﷺ)).

لە کۆچەران و پشتیوانان، چونکە ئەوانەن هاوەڵی پێغەمبەری خوایان کرد (ﷺ)، جیهادیان لەگەڵدا کرد، سەریان خست و پشتیوانی بوون، ئەم دینەیان وەرگرتوو گەیاندیانە ئێمە، ئەوانە هۆکارو واسیتەن لە نێوان ئێمەو پێغەمبەری خوادا (ﷺ) جا ئەوانەی جوێن بە هاوەڵان دەدەن یان بە کەمیان دەزانن و لە ئاستیان کەم دەکەنەوە

ئەوانە دەیانەوێت ئیسلام بڕوخێنن، بەڵام ئەوان ئەم فێڵەیان بە کارهێناوە، چونکە ئەگەر قسەیان بە هاوەڵان کردو نرخیان کەم کردەوە ئەوا ئەو کاتە چی هۆکارو واسیتەیەك لەنێوان ئێمەو پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دەمێنێ؟ ئەوان مەبەستیان بچڕاندنی ئەو پەیوەندیەیە لە نێوان پێشینان لە کۆچەران و پشتیوانان و ئێمەدایە، تاوەکو ئەم ئوممەتە گومڕا بێت، ئەگەر نا چی شتێك وایان لێ دەکات جوێن بەهاوەڵان بدەن؟

ئایە لەنێوان ئەوان و هاوەڵاندا هیچ دەمەقاڵێ و دژایەتییەك هەیە لەسەر سەروەت و سامان یان لەو شێوە؟

ئایە هاوەڵان ئازاری ئەوانیان داوە لەکاتێکدا لە نێوان ئەوان و هاوەڵاندا چەند سەدەیەکی دوورو درێژ هەیە؟

ئەوەی پاڵی بەوانەوە ناوە ئەو کارە بکەن ڕق و کینەی دڵەکانە، چونکە هاوەڵان ئەم دینەیان هەڵگرتوە جا ئەوان دەیانەوێت ئەو پەیوەندییە ببچڕێنن لە نێوان پێغەمبەری خواو(ﷺ) ئوممەتەکەیدا بۆ ئەوەی ئەم دینە بڕوخێت (بکەوێت) ئەمە مەبەستی ئەوانە.

مەبەست لە: (وهم اهل السنة والجماعة).

هاوەڵانی پێغەمبەرو (ﷺ) ئەوانەی لەپاش ئەوان دێن، ئەوانەی بەچاکە شوێنی ئەوان کەوتن، ئەوانە ئەهلی سوننەن، واتە ئەهلی ڕێگای ڕاستن، ئەویش بریتییە لەو سوننەتەی لەم کیتابەدا ڕاڤە کراوە.

ئەوانەش جەماعەتی ڕاستن، بەڵام کۆبوونەوەی جگە لەوان لەسەر ناڕەواییە، ئەوانە پێیان ناگوترێت جەماعەت هەرچەندە ژمارەیان زۆر بێت، خوای گەورە دەفەرموێت:

(تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّى (١٤)الحشر) واتــە: وادەزانیــت هــەموو پێکــەوەن و کــۆن لەکاتێکدا دڵەکانیان لێك جیان و یەك ناگرن).

جا جەماعەت ئەوانەن لە سەر حەقن، ئەو کەسەی دەڵێت:- من لەگەڵ فلان حزبم و ئــەم حزبــە جەماعەتــەو ئێــوەش دەڵــێن: دەســت بەجەماعەتــەوە بگــرن و ئەوانــە جەماعەتن، ئەوا پێیان دەڵێین: کێ بەئێوەی گوتـوە ئەوانـە جەماعـەتن؟ جەماعـەت بریتییە لەوانەی لەسەر حەقن، ئەوانەی لەسەر سوننەتن، بەڕاستی ئەوانە جەماعەتن.

مەبەست لە: (فمن لم يأخذ عنهم فقد ضل و ابتدع).

هەر کەسێ دینەکەی لەهاوەڵانەوە وەرنـەگرێت، ئەوانـەی قورئـان و سـوننەتیان بـۆ گواسـتوینەتەوە، ئــەوە لەســەر حــەق نییــە، جـا ئەگــەر تانــە لــەوان بـدرێت ئــەوا گواسـتنەوەکەیان پووچــەڵ دەبێتــەوە -پــەنا بــەخوا-، مەبەسـتی دوژمنـانی خـواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) پووچەڵ کردنەوەی ئیسلامە، بەڵام ئەم فێڵە پیسەیان هێنـاوە، بـۆ ئــەوەی پێــشینان و پاشــینانی موســڵمانان لــە یــەك ببــچڕێنن، تــاکو بەئاســانی پاشینەکان قووت بدەن، بە ئاسانی بیانخۆن، بەڵام ئەگەر لە گەڵ جەماعـەتی یەکەمـدا پەیوەست بوون، پەیوەست بوون بە قورئـان و سـوننەتەوە ئـەوا ئاسـان نابێـت بـەڵکو ئەستەمە بتوانن بیانخۆن بەئیزنی خوا.

مەبەست لە: (فقد ضل) واتە: لەحەق بزر دەبێت.

(وابتدع):

(البدعة): بریتییــە لــە پەرســتن و بیروبـاوەڕو قـسەکان هـیچ بەڵگـەی لەسـەر نـەبێت لەقورئان و سوننەتدا، پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) دەفــەرموێت: (من عمل عملا ليس عليه

أمرنا فهو رد)[٩] واتە: هەرکەسێك کارێك بکات فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت ئەوا ڕەد دەکرێتەوە) لەڕیوایەتێکی تردا هاتوە: (من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه فهو رد)[١٠] واتە: هەرکەسێك لەم کارەی ئێمەدا شتێکی نوێ دابهێنێت و تێیدا نەبێت ئەوا ڕەد دەکرێتەوە) هەروەها دەفەرموێت: (وإياكم و محدثات الأمور فإن كل محدثة بدعة و كل بدعة ضلالة)[١١] واتە: دوور بکەونەوە لەکارە نوێیەکان، چونکە هەموو کارێکی نوێ بیدعەیەو هەموو بیدعەیەکش گومڕاییە).

جا بیدعە: ئەوەیە لەدیندا داهێنراو بێتو لە کاتێکدا بەشێك نەبێت لەو، چۆن دەزانرێت بەشێك نییە لەو؟

ئەگەر بەڵگەیەك لەسەری نەبێت ئەوە بەشێك نییە لە دینەکە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: (ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ (٣) المائدة) جا دینەکە کاملەو بێ کەمو کوڕییە _سوپاس بۆ خوا_ هیچ زیادەیەك وەرناگرێت، بۆیە تەنها پێویستمان بەوە هەیە ئەو دینە بناسین خوای گەورە کامل و تەواوی کردوەو دەستی پێوە بگرین، واز لەجگە لەو بهێنین لە زیادەکانو لە بەچاك زانین وخستنەسەر و جگە لەوانە، چونکە لەخوا دوورت دەکاتەوەو لەپاشدا ئەوە ڕووندکرێتەوە کە (هیچ کاتێك قەومێك بیدعەیەك داناهێنن ئیللا وەکو ئەوە سوننەتیان لێ دەسەنرێتەوە)[١٢] جا ئەمە ڕێگا ڕاست و تەواوەکەیە، دەستگرتن بەجەماعەت و دەستگرتن بەسوننەت و وازهێنان لە بیدعە.

---

٩ / أخرجه مسلم (١٧١٨) .

١٠ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٢٥٥٠)، ومسلم (١٧١٨) .

١١ / صحيح : أخرجه أبو داود (٤٦٠٧) والترمذي (٢٦٧٦) وصححه الشيخ الألباني في (المشكاة) (١٦٥) .

١٢ / قال حسان بن عطية – رحمه الله–: (ما ابتدع قوم بدعة في دينهم إلا نزع الله من سنتهم مثلها ثم لا يعيدها إليهم الى يوم القيامة ) رواه الدارمي وابو نعيم واللالكائي .

مەبەست لە: (وكل بدعة ضلالة).

بە هیچ شێوەیەك بیدعـەی حەسـەنە نییـە هـەروەكو هەنـدێ كـەس دەڵێـت، بـەڵكو بیدعــە هــەمووی گومڕاییــە بــەدەقی فــەرموودەی پێغەمبــەری خــوا(ﷺ)، لــە فەرموودەیەكــدا دەڵێــت: (فإن كل محدثة بدعة و كل بدعة ضلالة)[١٣] واتــە: هــەموو داهێنراوێك بیدعەیەو هەموو بیدعەیەكش گومڕاییە).

جا بیدعـە لەدینـدا بـەهیچ شـێوەیەك چـاكی تێـدا نییـە، بـەڵكو هـەمووی گومڕاییـە ئەمەش قسەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) كە هەرگیز هیچ قسەیەك لە خۆوە ناكات.

مەبەست لە: (والضلالة واهلها فى النار).

گومڕایی و گومڕاكاران لەئاگردان یـان لەبـەر كـوفر كردنیـان، یـان لەبـەر سەرپێـچی كردنیان، بیدعەكان هەموو وەكو یەك نین، تیایاندا هەیـە كـوفرە، خاوەنەكـەی بەهـەتا هەتایی لـەئاگردا دەمێنێتـەوە وەكـو هـاواركردن بـەمردووەكان و داواكـردن و پاڕانـەوە لەمردووەكان و سەربڕین بـۆ جگـە لـەخواو نزركـردن بـۆ جگـە لـەخوا، ئـا ئـەم بیدعانـە كوفرن، هەروەها نكۆڵی كردن و نەفیكردنی نـاوو سـیفەتەكانی خـوا هـەروەكو كۆمـەڵی (جهمیة) دەیڵێن ئەوانەی نكۆڵی لە ناوو سیفەتەكانی خوا دەكەن، جا ئەمە كوفرە پەنا بە خوا، چونكە وەسفی خوای گـەورەیان كـردوە بـەوەی هـیچ نـاوو سـیفەتێكی نییـە، كەواتە خوای گەورە نەبووە (معدوم)ـە، چونكە ئەوەی هەبێت دەبـێ سـیفاتی هـەبێت، ئەوەی سیفاتی نەبێت نەبووە (مەعدومە)، بۆیە پێشەوایان حوكمیان داوە بەكافربوونی (جهمیة) ئەوانەی دەڵێن: قورئان دروستكراوە. ئەوان ئەو قورئانەی – كە قسەی خوای

---

١٣ / صحيح : سبق تخريجه .

گەورەیەو سرووش و دابەزێنراوی ئەوە – کردوویانەتە دروستکراوێك وەکو دروستکراوەکانی تر، دەڵێن: خوا قسە ناکات، بۆیە بە(جماد)ێك دەیشوبهێنن، ئەوەی قسە ناکات نابێتە خوا، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَاتَّخَذَ قَوْمُ مُوسَى مِنْ بَعْدِهِ مِنْ حُلِيِّهِمْ عِجْلًا جَسَدًا لَهُ خُوَارٌ أَلَمْ يَرَوْا أَنَّهُ لَا يُكَلِّمُهُمْ وَلَا يَهْدِيهِمْ سَبِيلًا (١٤٨) الاعراف) واتە: پاش چوونەکەی مووسا بۆ کێوی (توور) گەلەکەی _لەخشڵ و زێڕەکەیان_ گوێرەکەیەکی بە بۆڕەیان بۆ خۆیان سازداو پەرستیان! مەگەر نەیاندی ئەو گوێرەکەیە قسەیان لەگەڵ ناکات و بۆ ڕێی ڕاستیش ڕێنماییان ناکات).

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت ئەوەی قسە ناکات نابێتە خوا، (الجهمية) دەڵێن:_خوا قسە ناکات، کەواتە ئەو خودا نییە، بەرزی و پیرۆزی بۆ خودای گەورە لە قسەی ئەوانە کە دەیکەن، لەسورەتی (طه)دا هاتووە: (أَفَلَا يَرَوْنَ أَلَّا يَرْجِعُ إِلَيْهِمْ قَوْلًا وَلَا يَمْلِكُ لَهُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا (٨٩)طه) واتە: ئاخۆ ئەوانەی ئەو گوێلکە ئەپەرستن نابینن ئەو گوێلکەیە نە وەڵامیان دەداتەوە ئەگەر داوایەکی لێ بکەن و نەدەسەڵاتی زیانێکی بۆیان هەیەو نەدەتوانرێ هیچ جۆرە کەڵکێکی لێ وەربگیرێ).

واتە گۆلکەکە، ئەگەر قسەی لەگەڵدا بکەن ئەوا وەڵامیان بۆ نەدەگێڕایەوە، ئایە ئەمە بەکەڵکی ئەوە دێت ببێتە خودا؟

ئیبراهیم بە بت پەرستانی گوت: (فَاسْأَلُوهُمْ إِنْ كَانُوا يَنْطِقُونَ (٦٣)) واتە: دە ئەوەتانێ لێیان بپرسن ئەگەر قسە ئەکەن)

ئەوان پێیان گوت: (لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَؤُلَاءِ يَنْطِقُونَ (٦٥))واتە: ئەی ئیبراهیم، بێ گومان بۆ خۆت دەزانیت ئەوانە گۆیاو قسەکەر نین، ئیتر چۆن دەڵێی لەوان بپرسن؟).

ئەویش بەوانی گوت: (أَفَتَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنْفَعُكُمْ شَيْئًا وَلَا يَضُرُّكُمْ (٦٦) أُفٍّ لَكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ (٦٧)الانبياء) واته: وتی: ئاخۆ _غەیره خوا_ شتێ ئەپەرستن نەهیچ کەڵکتان پێ دەگەیەنێ و نەهیچ زیانیشتان لێ دەدا؟!(٦٦) بێزاری و تۆف لەئێوەو لەو شتانەش لەجێی خوا ئەی پەرستن ئایا ئاوەز ناخەنە کار؟(٦٧).

خوای گەورە دەفەرموێت: (وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ (٦٠) غافر) واتە: پەروەردگارتان فەرمووی: داوا لە من بکەن و لە من بپارێنەوە،منیش وەڵامتان دەدەمەوە).

خوای گەورە وەصفی خۆی کردووە بەوەی قسە دەکات و دەڵێت، جا ئەوەی قسە ناکات خوا نییە، بۆیە زۆربەی پێشەوایان پێشەوایانی (الجهمیة)یان بەکافر داناوە، نەك چاولێکەرانو شوێنکەوتوانیان ئەوانەی حەقیان بۆ ڕوون نەبۆتەوە، بەڵکو بە نەفامی چاویان لێکردوون، ئەوانە قسەی تریان لەسەرە، چونکە دەبێ بۆیان ڕوون بکرێتەوە، جا ئەگەر سوور بوون لەسەری ئەوە حوکم کوفری ئەوانیش دەدرێت.

**﴿٤﴾ نوسەر دەڵێت: (قال عمر بن الخطاب رضي الله عنه: (لا عذر لأحد في ضلاله ركبها حسبها هدى ولا في هدى تركه حسبه ضلاله فقد بينت الأمور وثبتت الحجة وانقطع العذر))[١٤].**

**واتـە: عومـمـەری کـوڕی خـەتتاب فەرموویـەتی: (هـیچ کەسـێك بیـانووی نییـە لەگومڕاییەك ئەگەر سواری بوو (شوێنی کەوت)و بەهیدایەتی بزانێتو لە هیدایەتدا وازی لێبهێنێتو بە گومڕایی بزانێت،چونکە هـەموو کارەکـان ڕوون کراوەتـەوەو حوججـەکان دامەزراوەو جێگیربوون و بیانوو نەماوەو بچڕاوە).**

**ڕاڤە:**

**مەبەست لەو قسەیەی عومەر دەڵێت:** (لا عذر لأحد...).

**چـونکە خـوای گـەورە حـەقی ڕوونکردووەتـەوەو لـەقورئان و سـوننەتدا ئاشـکرای کردووە، بۆیە هیچ کەسێك ئەو کاتە بیانووی گومڕابـوونی نییـە، چـونکە کەمتەرخـەمی لەلایەن خۆیەوە ڕوویـداوە، چـونکە بـەدوای حەقـدا نەگـەڕاوەو پرسـیاری نـەکردوە لـە زانایان، جا گومڕایی لەلایەن خۆیەوە هاتووە چونکە ئەو کەمتەرخەم بووە.**

**مەبەست لە:** (حسبها هدى).

**ڕوونکردنەوەی ئـەوەی تێدایـە گومـان هـیچ سـوودێك ناگەیـەنێت (هـیچ حـەقێکی لێ دەرناچێت) لەکاتێکدا خوای گەورە دەفـەرموێت:** (وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ السَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ

---

**١٤ /رواه ابو يوسف وابن شبة وابن بطة والخطيب البغدادي وابن حزم وابن الجوزي وابو نعيم .**

أَنَّهُمْ مُهْتَدُونَ (٣٧) الزخرف) واتــە: بەڕاسـتی ئـەو شـەیتانانە پێـشگیریان دەکـەن لـە ڕێچکە وایش ئەزانن بۆ ڕاستەڕێ ڕێنموونی کراون! !).

جـا ئـەوەی کـە خۆیـان وادەزانـن هـیچ شـەفاعەتیان بـۆ ناکـات، چـونکە هـیچ بیانوویەکیان نییەو نەگەڕاونەتەوە بۆ قورئان و سوننەت تاکو حەقو ناحەق لەیەك جیا بکەنەوە، بەڵکو ئەوان شـوێن ئارەزووەکـانی خۆیـان کـەوتوون، (وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ مُهْتَدُونَ (٣٧) الزخرف) لەگـەڵ ئەمەیـشدا خـوای گـەورە حـوکمی بەسـەریاندا داوە بـەکوفرو گومڕایی، بەتەنها کەسەکە وابزانێت لەسەر حەقە ئەوە نابێتە بیانوو بۆی، ئیللا مەگـەر سرووشێکی خـوایی پـێ نەگەیـشتبێت لـەخوداوە بـۆ سـەر پێغەمبـەرانی دایبەزانـدبێت چونکە پێویستە لەسەری ئەوەیە بگەڕێتەوە بـۆ قورئـان و سـوننەت، لەسـەر گومـان و بۆچوونی خۆی نەمێنێ، لەسەر ئەوەی کەسانی تر پێی بڵێن ئەوە حەقە، ئـەوە بیـانوو نییە.

لـە ئایـەتێکی تـردا هـاتوە: (إِنَّهُمُ اتَّخَذُوا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ اللَّهِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ مُهْتَدُونَ (٣٠) الاعراف) واتـە: چـونکە ئـەوان لـەباتی خـوا شـەیتانیان کـردە یاریـدەرو دۆستی خۆیان و وایشیان ئەزانی لەسەر ڕێی هەقن و ڕێنمان).

تەماشاکە چۆن شـەیتانەکان لەجنۆکـەو مرۆڤیـان کردۆتـە دۆسـت و خۆشەویـستی خۆیـان جگـە لـەخوا، شـوێنیان دەکـەون و کەچـی وادەزانـن هیدایـەت دراون؟! ئایـە شەیتانەکان خەیرو چاکەیان بۆیان دەوێ؟ خـوای گـەورە دەفـەرموێت: (وَمَنْ يَعْشُ عَنْ ذِكْرِ الرَّحْمَنِ نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطَانًا فَهُوَ لَهُ قَرِينٌ (٣٦)الزخرف) واتە: هەرکەسێك لـە ڕاسـت یـادی خوا ڕوو وەرگێڕێ ئەوا ئێمە شەیتانێکی بۆ دەسازێنین هـەردەم هـاوڕێی دەبێـتو لێـی جیانابێتەوە).

تەماشای ئـەو ئایەتـە بکـە بـە جـوانی: (وَمَنْ يَعْشُ عَنْ ذِكْرِ الرَّحْمَنِ نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطَانًا) ئەمـە سـزاکەیەتی (فَهُوَ لَهُ قَرِينٌ (٣٦) وَإِنَّهُمْ) واتـە شـەیتانەکان (لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ السَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ مُهْتَدُونَ (٣٧) الزخرف)واتە: بەڕاستی ئـەو شـەیتانانە پێشگیریان دەکـەن لەڕێچکە وایش ئەزانن کەبۆ ڕاستەڕێ ڕێنموونی کراون! !).

شـوێنکەوتوەکان وادەزانـن هیدایــەت دراون، کەچــی ئــەوە هــیچ ســودێکی پــێ نەگەیاندوون، هیچ بیانوویەکیان نییە، چونکە ئەوانە بانگـەوازی پێغەمبـەرانیان (عليهم الصلاة والسلام) پێگەیشت کەچی وەریان نەگرت.

بەڵکو بیانوو بۆ مەسـەلە ئیجتیهادیـەکان دەبـێ کـە جێگـەو ڕێگـە ئیجتیهـادی تێـدا دەبێتەوە، بۆیە کەسەکە ئیجتیهاد دەکات، ئـەوەی لەتوانایـدا هەیـە هـەوڵی بـۆ دەدات لەگەڕان تاکو گومانی ئەوە دەبات ئەمە حەقە، ئەم کەسـە بیـانووی هەیـەو (معـذور)ە، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کـە دەفـەرموێت: (إذا اجتهد الحاكم فأصاب فله أجران وإذا اجتهد فأخطأ فله أجر واحد)[١٥] واتـە: ئەگـەر حاکمێـك ئیجتیهـادی کردو پێکای ئەوە دوو پاداشتی هەیەو ئەگەر ئیجتیهادی کـردو نـەیپێکا (هەڵـەی کـرد) ئەوە یەك پاداشتی هەیە).

ئەمە لەمەسەلە ئیجتیهادیەکانـدا، بـەڵام مەسـەلە (تەوقیفییـەکان) ئـەویش بریتییـە لەبابەتەکانی عەقیدە ئەوا هیچ کەسێك بۆی نییە ئیجتیهادی تێدا بکـات، بـەڵکو واجـب (پێویست) ئەوەیە شوێنی بەڵگە بکەوێت، هیچ دەرفەتێکی ئیجتیهادی تێدا نییە.

مەبەست لە: (ولا في هدىً تركه حسبه ضلالة).

کارەکە لەسەر وادانان و گومان بردن نییـە، گـومڕایی وەرگرێـت وابزانێـت هیدایەتـە یان واز لەحەقێك بهێنێت وابزانێت گومڕاییە، ئـەو گومانـە دادی نـادات (شـەفاعەتی بـۆ

١٥ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٦٩١٩)، ومسلم (١٧١٦) .

ناکـات) چـونکە هیدایـەت و گـومڕایی خـوای گـەورە لـە قورئانـدا ڕوونـی کردۆتـەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسوننەتدا ڕوونی کردوەتەوەو سـەلەف لـەژیان و عەقیدەیانـدا ڕوونیـان کردوەتـەوە،جا حـەق ڕوون و ئاشـکرایە سـوپاس بـۆ خـوا، هـەر لەڕەحمـەتی خوایە حەق ڕوون و ئاشکرایە لـەقورئان و سـوننەت و هیدایـەتی سـەلەفی صـاڵح، هـیچ شاراوەو ناڕوونییەکی تێدا نییە، هەروەکو چۆن لەئوممەتەکانی پێـشوودا ڕوویـدا کـاتێ ماوەیەکی زۆر تێپەڕیو حەقیان لێ شێواو تێکەڵ بوو، کتێبەکانیان تەحریف کـراو لێـی گۆڕدرا، بەڵام ئەم ئوممەتە ئەوا بەئاشکرایی دەمێنێتەوە، قورئان و سـوننەت پـارێزراو دەبێت لەتەحریف و گۆڕان بۆیە هیچ کەسێك ئەو کاتە بیانووی نییە.

مەبەست لە: (فقد بينت الامور).

بـەڵێ کارەکـان ڕوون کراونەتـەوە، بـەڵام پێویـستی بەگـەڕان و داواکردنـە، بـەوەی مرۆڤەکان فێری بن و لێی تێبگەن و زانست و زانیاری لەزانایانەوە وەرگرن، لەخۆیـەوە زانست وەرنەگرێت یـان لەهاوشـێوەی خـۆی لەنەفامـەکان یـان ئەوانـەی خۆیـان بـەزانا دەزانن یان لەکتێبەکانەوە، بەڵکو زانست و زانیاری دەبێ لەخاوەنـەکانیان وەرگریـت- لـە زانایانـەوە- چـونکە ئـەم زانـستە لەزانایانـەوە وەردەگیرێـت، زانـست بەوەرگرتنـە (التلقي)یە نەك بە وەرگرتنە لـە کتێبەکانـەوە، کتێبـەکان تـەنها ئـامرازێکن بـۆ گـەڕان، زانایـان ڕاڤـەی دەکـەن، بـەڵام گەیـشتن بـۆ حـەق ئەمـە لـە زانایانـەوە وەردەگیرێـت و لەوانەوە ڕیوایەت دەکرێت، پاشینان لە پێشینانەوە.

مەبەست لە: (وثبت الحجة وانقطع العذر).

هیچ کەسێك بیانووی نییە، ئەم دینە خوای گەورە پاراسـتی لـە تـەحریف و گـۆڕان، حەق ڕوون و ئاشکرابوەو هیچ شاراوەیەکی تێدا نییە، بـە جیـاواز لەگـەڵ ئوممەتـەکانی

پێشودا، ئەوان کاتێك ماوەیەکی زۆر بەسەریاندا تێپەڕی کیتابەکانیان تەحریف کردو دەستیان بەگۆڕان کرد، بۆیە حەقیان لێ شارایەوەو تێکەڵ بوو.

**نوسەر دەڵێت:** (وذلك أن السنة والجماعة قد أحكما أمر الدين كله وتبين للناس فعلى الناس الاتباع).

واتە: چونکە ئەهلی سوننەو جەماعەت هەموو کاروباری دینەکەیان مەحکەم کردوەو بۆ خەڵکی ڕوون بوەتەوە، بۆیە پێویستە لەسەر خەڵکی شوێنی بکەون).

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (وذلك أن السنة والجماعة قد أحكما أمر الدين كله).

(ذلك): ئاماژەیە بۆ ئەوەی لەپێشدا باسکرا لەهاندان بە دەستگرتن بەڕێگای ئەهلی سوننەو جەماعەتەوە.

لە پێشدا باسکرا مەبەست لە ئەهلی سوننە ئەو کەسانەن دەستیان بەسوننەتو ڕێگاکەی پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) گرتووە، بەڕاستی ئەوانە ئەهلی سوننەن.

جەماعەت: بریتییە لەو کەسانەی لە سەر حەق کۆبونەتەوەو جیاوازو پارچە پارچە نین هەروەکو خوای گەورە فەرموویەتی: (وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا) آل عمران/١٠٣) واتە: بەتێکڕا گشتتان دەست بەڕشتەی ئایینی خواو قورئانەکەیەوە بگرنو قەت لێی نەترازێن).

لەسەر حەق کۆبونەتەوەو جیاواز نین و پارچە پارچە نین، بەڕاستی ئەوانە ئەهلی سوننەو جەماعەتن بەڵام: (الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعًا) واتە: بێگومان ئەو کەسانەی دینی خۆیانیان پەرت و بڵاوکردو بوونە چەند دەستەو بەستەیەکی جیاوازو لێکترازاو).

جا خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەفەرموێت: (لَسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ إِنَّمَا أَمْرُهُمْ إِلَى اللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُمْ بِمَا كَانُوا يَفْعَلُونَ (١٥٩)الأنعام) واتە: تۆ کارێکت بەوان نییە، بەڕاستی بڕیاری چارەنوسیان هەر لای خوایە پاشانیش بەهەر کارێ کردوویانە ئاگاداریان دەکات).

مەبەست لە: (وذلك أن السنة والجماعة قد أحكما).

واتە: قایمکردنو تۆکمەکردن، جا (الإحكام) مانای (قایمکردنو تۆکمەکردنو چەسپاندنە)، کاروباری ئەم دینە بەجوانی قایم کراوەو تۆکمەکراوە، چونکە دین هەمووی لەسوننەو جەماعەت کۆکراوەتەوە، هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (فإنه من يعش منكم فسيرى اختلافاً كثيراً، فعليكم بسنتي)[١٦] واتە: هەرکەس لەئێوە _لەپاش من_ بژێت ئەوا جیاوازی و دووبەرەکی زۆر دەبینێ، جا دەست بەسوننەتەکەی منەوە بگرن).

هیچ شتێك لەم دووبەرەکیو جیاوازییە ناتپارێزێ تەنها دەست گرتن بەسوننەتی پێغەمبەرەوە (ﷺ) نەبێت، ئەویش بریتییە لەو ڕێگەیەی پێغەمبەری خواو(ﷺ) هاوەڵانی لەسەر بوون لەعەقیدەو پەرستنو مامەڵەو ڕەوشتو ئادابەکان، هەر ئەوانیش کۆمەڵی ڕزگاربوون لە نێو حەفتا و سێ کۆمەڵەکەدا کە هەر هەمووی لە ئاگردان تەنها

---

١٦/ صحيح : سبق تخريجه .

یەکێکیان نەبێت، وتیان: ئەو کۆمەڵە _ڕزگار بووە_ کێ یە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ ئەو کۆمەڵەی لە نێو ئەو کۆمەلآنە جیاتکردەوە کێیە؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ڕوونکردنەوەی ئەو کۆمەڵەدا فەرمووی: (من كان على مثل ما انا عليه وأصحابي)[17] واتە: ئەو کەسەی لە سەر ئەو ڕێگایەیە من و هاوەڵانم لە سەرین) ئەوەی پێغەمبەری خواو (ﷺ) هاوەڵان لەسەری بوون بریتییە لەسوننەت، هەر کەسێك دەستی پێوە گرت ڕزگاری دەبێت، بۆیە پێیان دەگوترێت (الفرقة الناجية) واتە: کۆمەڵی ڕزگاربوو.

مەبەست لە: (وتبين للناس، فعلى الناس الاتباع).

واتە: بۆ خەڵکی ڕوون بوەتەوە کاروباری ئەم دینە هەمووی لەدەستگرتنە بە سوننەت و جەماعەتەوە، بۆیە هیچ کەسێك جیاواز نییە لەوەی ئەهلی سوننەو جەماعەت لەسەرین ئیللا ئەهلی گومڕایی نەبێت: (فَمَاذَا بَعْدَ الْحَقِّ إِلَّا الضَّلَالُ (٣٢) يونس) واتە: جا ئیتر بەدەر لەگومڕایی _پاش هەق و ڕاستی، کەهەر لەپەرستنی خوادایە_چی تر هەیە؟).

هەر کەسێك واز لەحەق بهێنێ دەکەوێتە ناو گومڕاییەوە، حەقیش بریتییە لەوەی ئەهلی سوننەو جەماعەی لەسەرە نەك هیچ کەسێکی تر.

---

١٧ / صحيح : أخرجه أبو داود (٤٥٩٦) والترمذي (٢٦٤٠) وابن ماجه (٣٩٩١) وأحمد (٢/٣٣٢) وصححه الشيخ الألباني في (الصحيحة) (٢٠٣) .

﴿٥﴾ نوسەر دەڵێت: (واعلم -رحمك الله- أن الدين إنما جاء من قبل الله - تبارك وتعالى- لم يوضع على عقول الرجال وآرائهم وعلمه عند الله وعند رسوله (ﷺ) فلا تتبع شيئا بهواك فتمرق من الدين فتخرج من الإسلام فإنه لا حجة لك فقد بين رسول الله (ﷺ) لأمته السنة وأوضحها لأصحابه وهم الجماعة وهم السواد الأعظم، والسواد الأعظم الحق وأهله فمن خالف أصحاب رسول الله (ﷺ) في شيء من أمر الدين فقد كفر).

واتە: بزانە –ڕەحمەتی خوات لێ بێت– ئەم دینە لە لایەن خودای گەورەوە هاتوە، لەسەر عەقڵ و بۆچوونی مرۆڤەکان دانەنراوەو زانستەکەی لای خواو پێغەمبەرەکەیەتی (ﷺ)، بۆیە شوێنی هیچ شتێك مەکەوە بەحەزو ئارەزووی خۆت لەئاین یاخی ببیتو لە ئیسلام دەرچیت، چونکە هیچ حوججەیەکت نییە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوننەتی بۆ ئوممەتەکەی ڕوونکردوەتەوەو بۆ هاوەڵانی ڕوونکردوەتەوە ئەوانیش جەماعەتن ئەوانیش زۆربەی خەڵکن و زۆربەی خەڵك: بریتییە لەحەق و ئەهلی حەق، هەر کەسێك جیاواز بێت لەگەڵ هاوەڵانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) لەشتێکدا لە کاروباری ئەم دینە ئەوا کوفری کردوە).

ڕاڤە/

ئەم دینە لەلایەن خوداوە هاتوە، هەر ئەوە ئەم دینەی داڕێژاوە، هیچ کەسێك بۆی نییە دینێك داڕێژێت خوای گەورە ئیزنی پێ نەدابێ، خوای گەورە دەفەرموێت: (أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُمْ مِنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنْ بِهِ اللَّهُ (٢١) الشورى) واتە: ئاخۆ ئەوانە ڕێگەی خواناسین دەگرن یا خۆ چەند هاوبەشێك بۆ خوا دادەنێن چەند یاساو بەرنامەیەکیان بۆ داهێنابن لەئاین بە هیچ شێوەیە خوا مۆڵەتی نەدابن).

ئەمە ناڕەزایی‌و وریاکردنەوەیە، جا دین ئەوەیە خوا دایڕێژاوەو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) گەیاندی، ئەمە ئەو دینەیە خوای گەورە دەربارەی دەفەرموێت: (شَرَعَ لَكُمْ مِنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا (١٣) شوری) واتە: هەر ئەو دین و ئایینەی بە (نوح وئیبراهیم و مووساو عیسا)ی (ئولولعەزم) (علیهم الصلاة والسلام) و لێبڕاوو نەبەزاومان سپارد کردمانە دین‌و ئایین بۆ ئێوەیش کە پەرتەوازەو کۆمەڵ کۆمەڵ مەبن تێیدا).

ئەمە شەریعەتی پێغەمبەرانە(علیهم الصلاة والسلام) بەتایبەتی ئەو پێنجەی پێیان دەگوترێت (اولو العزم) ئەمە دینەکەی ئەوانە، جا هەر کەسێك لێی لادا یان لێی جیاواز بوو ئەوە بەهەلاکەتدا دەچێت و گومڕا دەبێت، ئەویش بنیات نراوە لەسەر یەکتاپەرستی خوداو وازهێنان لەپەرستنی جگە لەئەو و پابەندبوون بەو شەرعەی خوای گەورە داینازەو دوورکەوتنەوە لەوەی خوا حەرامی کردوە، بەڕاستی ئەمە دینە.

مەبەست لە: (لم یوضع علی عقول الرجال وآرائهم).

دین ئەوە نییە پیاوان (خەڵکی) بە چاکیان زانیوە یان وا بینیانە چاکە، چونکە ئەمە دینی خوا نییە، ئەمە دینی ئەو خەڵکەیە دایانهێناوە، بەڵام دینی خوا ئەوەیە خۆی شەرعەکەی داڕێژاوە، بەڵام ئەوەی پیاوان (خەڵکی) بە بۆچوونی خۆیان دایاننناوە ئەوە دینی خوا نییە، بەڵکو ئەوە دینی ئەو کەسەیە خۆی بەچاکی داناوە، بۆیە دەبێ ئەو دینە نەدرێتە پاڵ خوای گەورە ئیللا ئەوە نەبێت لە سەر زاری پێغەمبەرەکەی (ﷺ) هاتووە، بەڵام ئەوەی جگە لە ئەو دایڕێژاوە ئەوە نابێت بدرێتە پاڵ خوا، بەڵکو دەدرێتە پاڵ ئەو کەسەی دایڕێژاوەو خوای گەورە لێی بەرییە، خوای گەورە دەفەرموێت: (أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُمْ مِنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنْ بِهِ اللَّهُ (٢١) شوری).

مەبەست لە: (وعلمه عند الله وعند رسوله (ﷺ)).

بابەتەکانی ئەم دینە تەوقیفییە، پێویستە لەبابەتی دیندا بەڵگە هەبێت لەخوداو پێغەمبەرەکەیەوە (ﷺ)، دەبێ پابەندبین بەوەی لە قورئان و سوننەتدا هاتوە لەبابەتەکانی دینداو واز لەداهێنراوەکان و بیدعەکان بهێنین کە خوای گەورە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر دانەبەزاندوە، هەرچەندە خاوەنەکەی (ئەهلەکەی) بەدینی بزانێ، خۆیان لەخودا پێی نزیك دەکەنەوە، ئێمە ئاوڕی لێ نادەینەوەو باوەڕمان پێی نییە، چونکە دینی خوا ئەوەیە خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دایانڕێژاوە.

چونکە دین بنیات نراوە لەسەر ئەو زانستەی لەلایەن خوداو پێغەمبەرەکەیەوە (ﷺ) هاتوە، شوێنی حەزو ئارەزووی خەڵکی مەکەوە، شوێنی بۆچونی خەڵکی و ئەوەی ئەوان بەباشی دەزانن و شوێنی دەکەون مەکەوە، چونکە ئەوە هیچ بنەمایەکی لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەیدا (ﷺ) نییە، هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه فهو رد)[18] واتە: هەرکەسێك لەم کارەی ئێمەدا شتێکی نوێ دابهێنێت و تێیدا نەبێت ئەوا ڕەد دەکرێتەوە) لەڕیوایەتێکی تردا هاتوە: (من عمل عملا ليس عليه أمرنا فهو رد)[19] واتە: هەرکەسێك کارێك بکات فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت ئەوا ڕەد دەکرێتەوە).

جا هەر کەسێك دەیەوێت کارەکەی چاك و سوود بەخش بێت ئەوا پێویستە لەسەری بەئەنجامدانی دوو کار:-

١٨ / صحيح : سبق تخريجه .

١٩ / صحيح : سبق تخريجه .

کاری یەکەم: (الاخلاص) دڵسۆزیو نیازپاکی دینەکەی بۆ خـواو دووربکەوێتـەوە لـە شیرك.

کاری دووەم: (الاتباع) شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەرەکـەی (ﷺ) بێـت و پـاکی بکاتەوە لەبیدعەو داهێنراوەکان.

موسڵمان جیاوازی لەعەقیدەو جیاوازی لـە پەرسـتندا زۆر دەبینێـت، خـەڵکی حـەزو ئارەزوو بۆچوون و ڕێگایان هەیە، ئێمە شوێنی خەڵکی ناکەوین بـەڵکو ئـەوەی خـەڵکی لەسـەرە بـەراوردی دەکـەین لەگـەڵ قورئـان و سـوننەتدا، ئـەوەی لەگـەڵ قورئـان و سوننەتدا گونجا ئەوە حەقـەو ئـەوەی جیـاوازبوو لەگەڵیانـداو نـەگونجا ئـەوە (باطـل)و ناحەقە.

مەبەست لە: (فلا تتبع شيئاً بهواك).

شوێنی هیچ شتێك مەکەوە بەحەزو ئـارەزووی خـۆت، بـەڵام دەبـێ حـەزو ئـارەزوت شوێنی ئەوە بکەوێت لە لایەن خوداو پێغەمبەرەکەیەوە (ﷺ) هاتوون، بۆیە ئارەزووی هیچ شتێك مەکە ئیللا لەوەی لەخوداو پێغەمبەرەکەیـەوە (ﷺ) هـاتوە، ئەمـە ڕێگـای ڕزگاربوونە.

ئەگـەر شـوێنی ئـارەزووی خـۆت کـەوتیت ئـەوا دەبیتـە یـەکێك لەوانـەی شـوێنی ئارەزووەکانیان دەکەون و شوێنی ئەو سرووشە نەکەوتوون لە لایەن خوداوە دابەزیوە، خوای گەورە دەفـەرموێت: (فَإِنْ لَمْ يَسْتَجِيبُوا لَكَ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءَهُمْ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِنَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ (٥٠) القصص) واتـە: خـۆ ئەگـەر وەڵامیـان نەدایتـەوە، ئـەوە بزانـە ئەوانـە هـەر پـەیڕەوی لـە ئـارەزووی خۆیـان ئەکەن، چ کەسێ گومڕاترە لەو کەسەی پەیڕەوی هەواو ئـارەزووی خـۆی کـردووە، بـێ

ئەوەی هیچ ڕێنوێنیێکی لەخواوە هەبێ..؟ بەڕاستی خواش ڕێنوێنی گەلی ستەمکار ناکات).

خوای گەورە دەفەرموێت: (فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ عَمَّا جَاءَكَ مِنَ الْحَقِّ (٤٨) المائدة) واتە: دەسا تۆش لەنێوان گشت خەڵکاندا هەر بەپێی ئەو بەرنامەیە کاربکەو بڕیار بدە خوا ناردوویەتی و لەو هەق و ڕاستییە لەخواوە بۆت هاتووە لامەدەو مەکەوە شوێنی هەواو ئارەزوویان).

خوای گەورە دەفەرموێت: (ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ (١٨) إِنَّهُمْ لَنْ يُغْنُوا عَنْكَ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا وَإِنَّ الظَّالِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُتَّقِينَ (١٩) الجاثية) واتە: لەپاشدا ئێمە ئەتۆمان خستە سەر بەرنامەو شەریعەتێك لەئایین، جا تۆیش شوێنی بکەوەو بە پوختی پەیڕەوی بکەو شوێن هەواو هەوەس و ئارەزووی ئەو نەزانانە مەکەوە (١٨) بێ گومان ئەوانە هیچ شتێك لەخواوە لە تۆ دوور ناخەنەوە بێ گومان ستەمکاران یارو یاوەری یەکترن لەدونیاداو (الله) یارو دۆستی پارێزکارانە (١٩)).

جا تۆ لەنێوان دوو مەسەلەدای: یان دەبێ شوێن دینە ڕاستەکە بکەویت، یان دەبێ شوێن ئارەزوو بکەویت کاری سێیەم نییە.

مەبەست لە: (فتمرق من الدين فتخرج من الاسلام).

هەرکەسێك شوێنی ئارەزوەکەی کەوت ئەوا لەدینەکەی یاخی دەبێت، هەرچەندە بۆ ماوەیەکی دووربێت، یەکەم شت ئەوەیە نەرمونیان دەبێ لەجیاوازی و ئارەزوودا، ئەمجار شوێنکەوتنی ئارەزووی لامەزن دەبێتەوە تاکو لەدین دەردەچێت، ئەمجار

**دینەکەی دەبێتە ئارەزووەکەی، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت:** (أَفَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُ هَوَاهُ وَأَضَلَّهُ اللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِ وَقَلْبِهِ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِ غِشَاوَةً (٢٣) الجاثية) **واتە: ئایا تۆ ئەو کەسەت دیتووە هەواو ئارەزووی خۆی دەکردە خواو دەیپەرست؟! خوا _لەسەر زانینێك کە بەرامبەر ئەو کەسە بوویەتی، پێش ئەوە دروستی بکات _ گومڕای کردووە وەمۆریشی بەسەر گوێ و دڵیدا ناوە و پەردەیەکیشی بەسەر چاویدا هێناوە).**

**جا ئارەزوو خودایەکی ترە، ئەوەش بزانە شیرك تایبەت نییە بەپەرستنی بتو پەیکەر، بەڵکو لێرەدا شتێکی تر هەیە ئەویش ئارەزووە، مرۆڤەکان تەنها بت ناپەرستنو دارو بەردو گۆڕەکان ناپەرستن، بەڵام شوێنی ئارەزوو دەکەوێت، ئەم کەسە بەندەی ئارەزووەکەیەتی بۆیە پێویستە مرۆڤ لێی ئاگاداربێتو شوێنی هیچ نەکەوێت تەنها ئەوەی لەگەڵ قورئان و سوننەتدا دەگونجێت.**

**مەبەست لە:** (فإنه لا حجة لك فقد بين رسول الله (ﷺ) لأمته السنة وأوضحها لأصحابه).

**هیچ حوججەیەك نییە بۆ کەسێك جیاوازبێتو شوێنی ئارەزووی بکەوێت، چونکە ئەو گومڕا بووە لەپاش ڕوونکردنەوە، لە پاش زانست و زانیاری:** (أَفَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُ هَوَاهُ وَأَضَلَّهُ اللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ (٢٣) الجاثية) **ئەو نەفام نییە، بەڵکو قورئانو سوننەت دەناسێت، قسەی زانایان دەزانێت، بەڵام لەگەڵ ئارەزووی ئەودا ناگونجێت، وازی لێ دەهێنێ و ئەوە وەردەگرێت کە لەگەڵ ئارەزوویدا دەگونجێ، بەڕاستی ئەمە گومڕاییە –پەنا بەخوا– چونکە شوێنکەوتنی ئارەزوو زۆر ترسناکە، بۆیە پێویستە لەسەر مرۆڤەکان ئاگاداری شوێنکەوتنی ئارەزوو بن، خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی (داود) –علیه الصلاةو السلام– دەفەرموێت:** (وَلَا تَتَّبِعِ الْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ إِنَّ الَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن

سَبِيلِ اللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَا نَسُوا يَوْمَ الْحِسَابِ (٢٦) ص) واتــە: شـوێن هــەواو ئـارەزوو مەکەوە لە حوکم کردندا تا بەو هۆیەوە لە ڕێگـای خـوا گـومڕات بکـات بـێ گومـان ئـەو کەسانەی لە ڕێی خوا لادەدەن‌و گومڕا ئەبن سزاو جەزرەبەی توندو سەختیان بۆ هەیـە بە هۆی ئەوەی ڕۆژی حیسابو پاداشت و تۆڵەیان لە بیرکردووە).

(ابن الجـوزی) کتێبێکـی هەیـە لەبـەرگێکی گەورەدایـە نـاوی (ذم الهوى) یـە، تێیـدا چەندین بەڵگەو قـسەی زانایـان و حیکمـەتی هێنـاوە هـەموو ئاگادارمـان دەکاتـەوە لـە دوورکەوتنەوە لەشوێنکەوتنی ئارەزوو.

بۆیە پێویستە لەسەر مرۆڤ ئاگاداری ئارەزووەکانی بێت، چونکە ئەو ڕەنگە پـارێزراو بێت لەپەرستنی بت و بەردو دارو گۆڕو بـە جـوانی یەکتاپەرسـتیو سـوننەت بناسـێت، بەڵام خـۆی نەپاراسـتوە لەشـوێنکەوتنی ئارەزوەکـەی، بەڕاسـتی ئەمـە موصـیبەتێکی گەورەو مەزنە، بۆیە پێویستە لەسەر موسـڵمان ئاگـاداری شـوێنکەوتنی ئارەزووەکـەی بێت، دەبێ ئارەزووەکەی شوێنکەوتەی ئەوە بێت پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) هێناویـەتی هــەروەکو لەفەرموودویــەکی پێغەمبــەردا (ﷺ) هــاتوە، پێغەمبــەری خـــوا (ﷺ) دەفەرموێت: (لا يؤمن أحدكم حتى يكون هواه تبعا لما جئت به)[٢٠].

پێغەمبەری ئەکرەم (ﷺ) هیچ شـتێکی بـەجێ نەهێـشتوە ئـیللا بـۆ ئوممەتەکـەی ڕوون کردوەتەوە، تەنانەت هەنـدێ لـە هـاوەڵان دەفـەرموون: (ما توفي رسول الله (ﷺ) وطائر يقلب جناحيه في الهواء إلا وذكر لنا منه علما)[٢١] واتــە: (پێغەمبــەری خـــوا (ﷺ)

---

٢٠ / ضعيف : أخرجه ابن أبي عاصم في (السنة) وضعفه الشيخ الألباني في (ظلال الجنة) (١٥) .

٢١ / رواه وكيع واحمد وابن سعد والبزار والطبراني والصيداوي وابن حبان والدار قطني وغيرهم (اسناده جيد) .

کۆچی دوایی نەکردو هیچ باڵندەیەك بە ئاسماندا نەدەفڕی ئیللا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەربارەی ئەو باسی شتێکی بۆ کردووین).

هیچ شتێکی بەجێ نەهێشتوە لەوەی مرۆڤایەتی پێویستیان پێی هەبێت، ئەوەی لەخوا نزیکیان بکاتەوەو لەکوفرو گومڕایی دووریان بکاتەوە ئیللا ڕوونی کردوەتەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (إني تارك فيكم ما إن تمسكتم به لن تضلوا بعدي: كتاب الله وسنتي)[22] واتە: (من لەناوتاندا بەجێم هێشتوە ئەگەر دەستی پێوە بگرن ئەوا هەرگیز گومڕا نابن لەپاش من:- کیتابەکەی خواو سوننەتەکەی من).

ئوممەتەکەی لەسەر ڕێگایەکی سپی بەجێ هێشتوە شەوەکەشی وەکو ڕۆژە، کاتێك خوای گەورە دینەکەی پێ کامڵ کردوو نیعمەتەکەی خۆی تەواو کرد گەڕایەوە بۆلای پەروەردگارەکەی، پاش ئەوەی ڕاگەیاندراوە ڕوونەکەی ڕاگەیاند، سوننەتەکەی بۆ هاوەڵەکانی ئاشکرا کرد، لە وتاری حەجیماڵئاوایدا فەرمووی: (ألا هل بلغت؟ قالوا: نشهد أنك قد بلَّغت ونصحت، فقال: اللهم اشهد)[23] واتە: ئایە دینەکەم گەیاند؟ فەرموویان: شایەتی دەدەین گەیاندت و ئامۆژگاریت کرد، ئەویش فەرمووی: ئەی خودایە بە شایەت بە).

مەبەست لە: (وهم الجماعة، وهم السواد الاعظم).

هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) جەماعەتن، واتە: ئەوان بنەمای جەماعەتن، ئەمجار ئەوانەی پاش ئەوان دێن، ئەمجار ئەوانەی پاش ئەوان دێن، هەروەکو پێغەمبەری خوا

---

٢٢ / حسن : حسنه الشيخ الألباني في (منزلة السنة في الاسلام ) ص (١٨) وعزاه للحاكم .

٢٣ / متفق عليه : أخرجه البخاري (١٦٥٤) ومسلم (١٦٧٩) .

(ﷺ) فەرموویەتی: (خيركم قرني ثم الذين يلونهم ثم الذين يلونهم)[٢٤] واتە: (باشترینی ئێوە ئەوانەی ئەم سەدەیەن، پاشان ئەوانەی پاش ئەوان دێن، پاشان ئەوانەی پاش ئەوان دێن) هاوەڵان (الصحابة)و شوێنکەوتووان (التابعين) و شوێنکەوتەی شوێنکەوتووان (أتباع التابعين) ئەوانەش سێ سەدە چاکەکەن، ئەوانە بەڕاستی جەماعەتن، ئەوانەی پاش ئەوان دێن ئەوە شوێنکەوتەی ئەوانن، شوێنی بنەماکە (ئەصلەکە) دەکەون ئەوەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەری بوون، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ بِإِحْسَانٍ (١٠٠) التوبة) واتە: لەدەستەی یەکەمی پێشەنگی کۆچکەران و پشتیوانانو چاك پەیڕەوانی ئەوانیش).

ئەوانە ئەو جەماعەتەن خوای گەورە فەرمانی پێ کردووین لەگەڵ ئەواندا بین، پێغەمبەری خواش(ﷺ) فەرمانی پێ کردووین لەگەڵ ئەواندا بینو نەهی لێ کردووین لێیان جیا ببینەوەو جیاوازبین، ئەوانیش زۆرینەی خەڵکن کە لەسەر حەقن، لەسەر هیدایەتن، ئەوانەی وا سەلەف بە نەفام دەزانن‌و لەپایەی ئەوان کەم دەکەنەوەو دەڵێن:- ئەوانە پیاو بوون و ئێمەیش پیاوین، دەڵێن:- هیچ ڕێگرێك نییە شتی نوێ دابهێنین‌و پێویست نییە لەسەرمان شوێنی سەلەفو قسەی سەلەف بکەوین، بەڕاستی ئەوە گومڕاییە پەنا بەخوا، ئەمە بچڕاندنی کۆتایی ئەم ئوممەتەیە بەسەرەتاکەیەوە، جا ئەگەر کۆتاییەکەی لەگەڵ سەرەتاکەیدا بچڕا ئەوا بەهەلاکەتدا دەچێت، ئەوانش دەیانەوێت ئەم ئوممەتە بە هەلاکەتدا ببەن، بۆیە ئەم فێڵەیان هێنایە کایەوە: ئەویش بریتییە لەبچڕاندنی دواینی ئەم ئوممەتە لەگەڵ سەرەتاکەیدا.

---

٢٤ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٢٥٠٨) ومسلم (٢٥٣٥) .

خەڵكانێك هەن ئێستا ئاگاداری خەڵكی دەكاتەوە لەمەزهەبی سەلەف، ئاگاداری خەڵكی دەكاتەوە لەگەڕانەوە بۆ قسەكانیان‌و دەڵێت: ئەو سەردەمە بەسەرچوو، بۆیە ئاگاداری خەڵكی دەكاتەوە لەوەی سەلەف لەسەری بوون، هانی خەڵكی دەدات بۆ دروستكردن و داهێنان لە دیندا.

دین تەوقیفییە، ئەویش شوێنكەوتنە، داهێنان‌و دروست كردن نییە، داهێنان لەپیشەسازی و شتە سوود بەخشەكانی دونیادا دەبێت، بەڵام دین هیچ شتێكی تازەی تێدا داناهێنرێت لەپاش كۆچی دوایی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، چونكە شەرع دانان تەواو بوو بە مردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆیە ئەوەی لەسەرمانە تەنها شوێنكەوتنەو شتی تازە لە خۆمانەوە نەهێنین، دەڵێین: ئەمە ئەو مەنهەجەیە بە كەڵكی ئەم سەردەمە دێت.

ئیمامی مالیك دەفەرموێت: (لا يصلح آخر هذه الأمة إلا ما صلح أولها)[٢٥] واتە: (كۆتایی ئەم ئوممەتە چاك نابێت ئیللا بەوەی سەرەتاكەی چاك كردوە) ئەوەی سەرەتاكەی ئەم ئوممەتەی چاك كردوە كیتاب و سوننەتە، بۆیە هیچ شتێك كۆتایی ئەم ئوممەتە چاك ناكاتەوە ئیللا كیتاب و سوننەت و شوێنكەوتنی ڕێگەو هیدایەتی سەلەفی صالح نەبێت.

مەبەست لە: (والسواد الاعظم:الحق واهله).

(السواد): بریتین لە ئەهلی حەق، ئەهلی حەق ئەوانەن دەستیان پێوە گرتوە، مەبەست لە (السواد الاعظم) تەنها زۆرینە نییە، مانای (السواد الاعظم) ئەوانەن لەسەر

---

٢٥ / نقله عنه الشاطبي وابن عبدالهادي وغيرهما .

حەقن، هەرچەندە کەمیش بن، ئا ئەوانە (السواد الاعظم)ن، هەرچەندە تەنها ئەگەر یەك پیاو بێت، هەر کەسێ لەسەر حەق بێت ئەوە (السواد الاعظم)ـە، تەماشای زۆری ناکەین، بەڵکو تەماشای ئەوە دەکەین ئەوان وان لەسەری، چونکە ڕەنگە زۆرەکە لەسەر گومڕایی بن، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِنْ تُطِعْ أَكْثَرَ مَنْ فِي الْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ (١١٦)الانعام) واتە: ئەگەر لە زۆربەی خەڵکانی ئەم سەر زەوییە– کە بێ باوەڕن – پەیڕەوی بکەیت لە ڕێگەی خوا لات ئەدەن و چەواشەو سەر لێشێواوت ئەکەن).

خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَا أَكْثَرُ النَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ (١٠٣) يوسف) واتە: زۆربەی ئەو مەردمە، هەرچەندە تۆ زۆریش سووربی و تێکۆشی بۆ باوەڕ هێنانیان، ئەوان باوەڕ ناهێنن).

خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَا وَجَدْنَا لِأَكْثَرِهِمْ مِنْ عَهْدٍ وَإِنْ وَجَدْنَا أَكْثَرَهُمْ لَفَاسِقِينَ (١٠٢)الاعراف) واتە: خۆ زۆربەی ئەوانەشمان بە وەفادارو بەئەمەك نەدی بێ گومان زۆربەشیانمان بەفاسق و سنور بەزێن دیت).

خوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِنَّ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ لَفَاسِقُونَ (٤٩)المائدة) واتە: بێ گومان زۆرینەی خەڵك لەڕێ دەرچوون و لایانداوە).

کەواتە زۆری ژمارە پێی هەڵناخەڵەتێین، شوێنی ناکەوین ئیللا ئەگەر لەسەر حەق بێت، هەرکەسیش لەسەر حەق بێت ئەوە جەماعەتە جا ئەگەر هاتوو زۆربوون یان کەم، مەرج ئەوەیە لەسەرین، ئایە ئەوە حەقە یان ناحەقە، جا ئەگەر حەق بوو ئەوا

جەماعەتن هەرچەندە تەنها یەك كەس لەسەری بوو، ئەگەر ناحەق بوو ئـەوە گومڕاییـە هەرچەندە ئەگەر زۆرینەی خەڵكی لەسەر بێت.

**مەبەست لە:** (فمن خالف أصحاب رسول الله (ﷺ) في شيء من أمر الدين فقد كفر).

(كفر) ڕەنگە كوفری گەورە بێتو ڕەنگە كوفری بچووك بێت، بـەپێی جیاوازییەكـە، جا مەبەست لە (فقد كفر) مەبەستی ئەوە نییە كوفرێكی كـردوە بـە ڕەهـایی لەئیـسلام دەریكردوە، ڕەنگە ئەمە بێت و ڕەنگـە كـوفری بـچووك بێـت، گـرنگ ئەوەیـە جیـاوازی لەگەڵ سەلەفدا كوفرە، ڕەنگە گەورە بێتو ڕەنگە بچووك بێت بەپێی جیاوازییەكە.

یـان ڕەنگـە مەبەسـتی ئـەوە بێـت ئەگـەر لەسـەرەتادا جیـاوازی لەگەڵیانـدا كـرد بەشتێكی كەم پاشان كەم كەم دەبیات بەرەو ئـەوەی بەگـشتی لـەدین دەری دەكـات، كارەكە بەرەو كوفر دەبات، ئەگەر جیاوازییەكەی بەردەوام بـوو ئـەوا كارەكـەی بـەرەو كوفری گەورە دەبیاتو بەگشتی لە ئیسلام دەردەچێت، شەیتان و ئارەزوو نەفسەكەی فەرمانی پێ دەكات بە خراپە دەیبەن تاوەكو بەگشتی لە ئیسلام دەری دەكەن.

**﴿٦﴾ نوسەر دەڵێت: (واعلم أن الناس لم يبتدعوا بدعة قط حتى تركوا من السنة مثلها فاحذر المحرمات من الأمور فإن كل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة والضلالة وأهلها في النار).**

**واتە: بزانە خەڵکی هەرگیز هیچ بیدعەیەکیان دانەهێناوە تاوەکو سوننەتێکیان وەکو ئەوە بەجێ نەهێشتبێت، بۆیە ئاگاداری حەرامکراوەکان بە لەدینەکەتدا، چونکە هەموو داهێنراوێك بیدعەیەو هەموو بیدعەیەکش گومڕاییەو هەموو گومڕاییەکش لە ئاگردایە).**

**ڕاڤە/**

**ئەمە حیکمەت و داناییەکی مەزنە، ئەمەش لەسەلەفەوە هاتوە:** (ان الناس ما أحدثوا بدعة إلا فقدوا مثلها من السنة) **واتە: خەڵکی هیچ بیدعەیەکیان دانەهێناوە ئیللا بە ئەندازەی ئەوە سوننەت بزر دەکەن) چونکە هەرگیز سوننەت و بیدعەت کۆ نابنەوە ئیللا یەکێکیان ئەویتریان دەردەکات، بۆیە موسڵمان نابێت لەهەمان کاتدا سوننی و بیدعەچی بێت، بەڵکو یان دەبێ بیدعەچی بێت یان دەبێ سوننی بێت، هەرگیز کۆنابنەوە، بۆیە دەبێ یەکێکیان ئەویتر دەرکات، ئەمەش لەزەرەرو زیانەکانی بیدعەیە.**

**ئەم حیکمەتەش هاتووە وجێگیرە بەئەزموون، بەڵگەو شایەتی ئەم قسەیە ئەوەیە: دەبینی بیدعەچییەکان ڕقیان لەفەرمووده (صحیح)ـەکان دەبێتەوەو ڕقیان لەسوننەتەکانەو دوژمنترین شتە بەلایانەوە، ناخۆشترین شت دەیبیسن ئەوەیە بڵێن:-**

فـلآن فـەرمووده نـەهی لەمـە دەكـات یـان ئـەوە حـەرام دەكـات، نایانـەوێ گوێیـان لەفەرموودەو سوننەتەكان بێت كە ناگونجێ لەگەڵ ئەوەی ئەوان لەسەرین، جا ئەمەش نیشانەیەكە هەرگیز سوننەت و بیدعەت یەكناگرن، بەڵام ئەو كەسەی لەسـەر سـوننەتە ئەگەر فەرموودەیەكی بیست لەپێغەمبەری خـوداوە (ﷺ) ئـەوە دڵخـۆش دەبێـت بـەو فەرموودەیە خەیرو چاكە دەخاتە سەر خـەیرەكانی و زانـست و زانیـاری دەخاتـە سـەر زانیاریـەكانی، كەسـێ لەسـەر سـوننەت بێـت خۆشـحاڵ و بەختـەوەر دەبێـت بەفـەرموودەكانی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بـەڵام كەسـێ لەسـەر بیدعـە بێـت لەفەرموودەكانی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) هەڵدێ، ئەمـە شـتێكی ڕوونو ئاشـكرایە لـە بیدعەچییەكانەوە كەوا ئەوان دژایەتی سوننەت دەكەن چونكە زاڵ دەبێت بەسـەر ئـەو بیدعەیەی ئەوان لەسەرین و نایهێڵێ.

ئەم بابەتەیش دووركەوتنەوەو هەڵاتنی تێدایە لەبیدعە، ئەویش دەبێتە هۆی ئەوەی خۆشویستی سوننەتەكان لەدڵەكاندا باربكەن و نەمێنێ.

مەبەست لە: (فاحذر المحرمات من الامور).

چونكە حەرامكراوەكان هیچ خەیرو چاكەیان تێدا نییـە جـا ئەگـەر حـەرامكراوەكان شیرك بێت یان كوفر یـان سەرپێـچی چـونكە خـوای گـەورە هـیچ شـتێك حـەرام ناكـات خەیری تێدابێت، بەڵكو شتێك حەرام دەكات شـەڕو خراپـەی تێـدابێت، یـان خراپەیـەك زیاترو زاڵ بێت بەسەر خەیردا یان خراپەیەكی یەكسان بێت لە گەڵ خەیردا، جا ئەگـەر لەشتێكدا خەیرو شەڕی تێدا كۆبووەوە ئەوا ئەگەر خراپەكە زیاتر بوو یان یەكسان بـوو

ئـەوا لێـی دووربکـەوە، بـەڵام ئەگـەر خەیرەکـە زیـاتر بـوو ئـەوا هـیچ ڕێگرێـك نییـە وەریبگریتو خوای گەورە لەو خراپە کەمە دەبورێت لەگەڵ خەیرێکی زۆردا.

**مەبەست لە:** (فإن كل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة).

**ئەمە دەقی فەرموودەکەی (العرباض)[26]ی کوری (سـاریة)یـە، دەڵێـت:** (وعظنا رسول الله (ﷺ) موعظة وجلت منها القلوب، وذرفت منها العيون،، فقلنا: يا رسول الله (ﷺ)، كأنها موعظة مودع فأوصنا. قال: أوصيكم بتقوى الله و السمع و الطاعة، و إن تأمر عليكم عبدٌ —وفي رواية: عبد حبشي كأن رأسه زبيبة - فإنه من يعش منكم فسيرى اختلافا كثيرا، فعليكم بسنتي و سنة الخلفاء الراشدين المهديين من بعدي، تمسكوا بها، و عضوا عليها بالنواجذ، و إياكم و محدثات الأمور، فإن كل محدثة بدعة، و كل بدعة ضلالة) **واتـــە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئامۆژگارییەکی کردین دڵـەکانی پـێ ڕاچـڵەکینو چـاوەکانی پـێ فرمێـسکاوی بـوون، وتمـان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دەڵێـی ئەمـە ئامۆژگـاری ماڵئاواییە (دوائامۆژگارییە)؟ بۆیە ئامۆژگاریمان بکە. ئـەویش فـەرمووی: ئامۆژگاریتـان دەکەم بـەوەی لـە خـوا بترسـن و تـەقوای خواتـان بێـت و گوێبیـست و گوێڕایـەڵ بـن، هەرچەندە ئەگـەر کۆیلەیـەك بـوو بـە ئـەمیرتان — لـە ڕیوایەتێکدا هـاتوە: کۆیلەیـەکی حەبەشی سەری وەکو مێوژ بێت— چونکە هەرکەس لەئێوە _لـەپاش مـن_ بـژێت ئـەوا جیـاوازی و دووبـەرەکی زۆر دەبینـێ، جـا ئامۆژگاریتـان دەکـەم دەسـت بەسـوننەت ڕێگاکەی منەوە بگرن و دەست بە سـوننەتو ڕێگـای جێنـشینە ڕێنمـویی کراوەکانـەوە**

---

٢٦ / صحيح : سبق تخريجه .

بگرن، توند دەستی پێوە بگرن، بە ددانەکانتان توند بیگرن، ئاگاداری کارە نوێیەکان بن، چونکە هەموو داهێنراوێك گومڕاییەو هەموو گومڕاییەك لە ئاگردایە).

هەموو شتێکی تازەو داهێنراو بیدعەیە، مەبەست لەتازەو داهێنراو لەدیندا، بەڵام شتە تازەو داهێنراوەکان لەکاروبارو نەریتەکان و سوودبەخش و خواردن و خواردنەوەو جل و بەرگدا ئەوە بیدعەی زمانەوانییەو بیدعەی شەرعی نییە، بەڵام شتە تازە داهێنراوەکان لەدیندا بیدعەیەکی حەرامە، ئەمەش وەڵامێکە بۆ ئەو کەسانەی بیدعە دابەش دەکەنە بیدعەی حەسەنەو بیدعەی (سیئە) و بیدعەی (مباح)و دەڵێن پێنج حوکمەکە دەیگرێتەوە، ئەمە هەڵەیە، چونکە بیدعە لەدیندا هەمووی گومڕاییە بەدەقی فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دەفەرموێت: (فان کل محدثة بدعة وکل بدعة ضلالة)، من گومان وادەبەم ئەوانە بیدعەی زمانەوانیان تێکەڵ کردوەو ناویان ناوە بیدعەی حەسەنە، بیدعەی زمانەوانی حەڵاڵە وەکو دروستکردنی قوتابخانەو دروستکردنی ڕێکخراو بۆ قوتابیانی زانست و زانیاری هەروەها وەکو خاڵ دانان بۆ قورئان و نمونەی ئەوانە، ئەوان ناویان لێناوە بیدعەی حەسەنە کەچی ئەوانە بیدعە نین، چونکە ئەوانە پاشکۆی سوننەتن و زیندووکردنەوەی سوننەتن جا دروستکردنی قوتابخانەو ڕێکخراو بۆ قوتابیانی زانست و زانیاری، چاپکردنی قورئان و خاڵدانان بۆی، ئەمانە هەموو یارمەتیدەرن بۆ زانست و زانیاری، جا ئەوانە چاکن ئەوانەش سوننەتن، جا ئەوان یان سوننەتە چاکەکانیان بردوەو ناویان لێ ناوە بیدعە، یان کاروبارە ئاساییەکانیان ناوناوە بیدعە، بە هیچ شێوەیەك بەشێك لەدین نییە، چونکە ئەوانە کاروباری دونیان و پەیوەندیان بەدینەوە نییە.

مەبەست لە: (والضلالة واهلها فى النار).

هەروەکو لەفەرموودەکەدا هاتووە: (وكل ضلالة في النار)[٢٧] هەروەکو لەفەرمودەی (الفِرَق)دا هاتووە: (وستفترق هذه الأمة على ثلاث وسبعين فرقة كلها في النار إلا واحدة)[٢٨] واتە: ئەم ئوممەتە دابەش دەبێتە حەفتاو سێ بەشەوە هەر هەمووی لە ئاگردایە تەنها یەکێکیان نەبێت).

ئەمە بەڵگەیە ئەهلی بیدعە لەئاگردان و جیاوازن، تیایاندا هەیە لەئاگردایە لەبەر کوفرەکەی، تیایاندا هەیە لە ئاگردایە لەبەر سەرپێچییەکەی، تیایاندا هەیە بەتاهەتایی لەئاگردا دەمێنێتەوەو تیایاندا هەیە بەتاهەتایی نامێنێتەوەو حوکمەکەی وەکو حوکمی ئەو کەسانەیە تاوانە گەورەکانیان ئەنجام داوە.

٢٧ / سبق تخريجه .

٢٨ / صحيح : سبق تخريجه .

**﴿٧﴾ نوسەر دەڵێت: (واحذر صغار المحدثات من الأمور فإن صغار البدع تعود حتى تصير كبارا وكذلك كل بدعة أحدثت في هذه الأمة كان أولها صغيرا يشبه الحق، فاغتر بذلك من دخل فيها، ثم لم يستطع الخروج منها فعظمت وصارت دينا يدان بها، فخالف الصراط المستقيم فخرج من الإسلام).**

واتە: ئاگاداری شتە تازە داهێنراوە بچووکەکان بە، چونکە بیدعە بچووکەکان ڕادێیت لەسەری تاوەکو گەورە دەبێ، هەروەها هەموو بیدعەیەك لەم ئوممەتەدا داهێنراوە لەسەرەتاوە بچووك بووەو بەحەق دەکات (دەشوبهێت) ئەوانەی تووشی دەبن پێی هەڵدەخەڵەتێن، ئەمجار ناتوانێ لێی دەرباز بێتو پاشان گەورە بووەو بوەتە دینێك و خەڵکی دینداری پێوە دەکەن، بۆیە لەڕێگا ڕاستەکە جیاواز بوو ئەمجار لەئیسلام دەرچوو).

ڕاڤە/

مەبەست لە: (واحذر صغار المحدثات من الأمور).

دەڵێت: هەرگیز نەرمونیان مەبە لەگەڵ بیدعەدا هەرچەندە بچووکیش بێت، چونکە ئەوە گەورە دەبێت، شتی تری بۆ زیاد دەکرێت، ئەمەش لە خراپەو مەفسەدەی بیدعەیە، چونکە ئەگەر دەرگای بیدعە بکرێتەوە ئەوا زیاد دەکات، بۆیە نابێت نەرم و نیان بیت لەگەڵیدا، دەڵێن: ئەم بیدعەیە بچووکەو زیانی نییە، بیدعە وەکو سکڵ (پشکۆ) وایە هەرچەندە بچوکیش بێت ئەوا گەورە دەبێت تاوەکوماڵێك دەسوتێنێ یان دوکانێك یان شارێك بە تەواوی دەسوتێنێ:

(ومعظم النار من مستصغر الشرر) واتــە: زۆربــەی ئاگرەکــان لەبروســکەی ئــاگری بچووکەوە پەیدا بووە (لە پریشکەوە پەیدا دەبێت).

بۆیە نابێت لەگەڵیدا کەمتەرخەم بیت، بەڵکو بە یەکجاری دەرگای بیدعـەکان دەبـێ بگیردرێت، لەکاتێکدا پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دەفـەرموێت: (اياكم ومحدثات الامور)[29]، (اياكم): ئاگادارکردنــەوەو وریاکردنەوەیــە لەهــەموو بیدعەیــەکی داهێنــراو بەگــشتی و بەڕەهایی، جا هەرچەندە ئەو داهێنراوانە بچووك بێت یـان داهێنراوەکـان گـەورە بێـت، پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) هــیچ بیدعەیــەکی بەدەرنــەکردووە، جــا نــەهی کردنەکــەی گشتگیرەو هەموو بیدعەیەك دەگرێتەوە، فەرموویەتی: (وشر الامور محدثاتها)[30].

مەبەست لـە: (وكذلك كل بدعة أحدثت في هذه الأمة كان أولها صغيرا يشبه الحق فاغتر بذلك من دخل فيها ثم لم يستطع الخروج منها).

فیتنەکان بۆ جاری یەکەم ڕوویاندا لـەم ئوممەتـە هۆکارەکـەی کەمتەرخـەمی بـووە لەگەڵ ئەهلی خراپەکاریـدا، تـاکو لەسـەر زەویـدا خراپـەکارییان بڵاوکـردەوەو مێـشکی گەنجان و خەڵکی عەوامیان شۆردەوەو پڕیـان کـردوە لەشـەڕ و خراپـەکاری تـاکو ئـەو هەموو فیتنەیە لەئیسلامدا ڕوویانداوەو لەنێوان موسڵمانانـدا هەروەکو ئاشکراو دیارە.

ئەمە هەرهەموو بەهۆی چاوپۆشـی کردنـە لەئـەهلی شـەڕو خراپـەکاری و وازهێنانـە لێیان تاکو کارەکان بڵاوبوەوە، بۆیە پێویستمان بە بریاری یـەکلایی هەیـەو داخـستنی دەرگایـە لـەو بـارەوە، هـیچ شـتێك لـەپاش خـوای گـەورە ناتپـارێزێ لـە بیدعـە ئـیللا زانستێکی سوودبەخش نەبێت، بەڵام ئەو کەسەی عیلمی پێ نییە ئەوە لەگەڵ بیدعـەدا

---

٢٩ / سبق تخريجه .

٣٠ / سبق تخريجه .

تێکەڵ دەبێتو وادەزانێت شتێکی باشە، چونکە دەربارەی بیدعە نازانێت، بۆیە هیچ شتێك ڕزگارت ناکات لە بیدعە ئیللا ئەوە نەبێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێکردووە لەو فەرموودەیەی کە دەفەرموێت: (فعليكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين المهديين)[٣١] ئەمە ئەو شتەیە لەبیدعە دەتپارێزێ، ئەمەش پێویستی بەفێربوون و تێگەیشتنە لەدینەکەی خوای گەورە، لەبەر ئەوەی پێشینی ئەم ئوممەتە لەهەموو کەس تێگەیشتوتر بوونە بۆیە لەهەموو کەس زیاتر خۆیان لەبیدعە پاراستووە، لە هەموو کەسێك زیاتر خەڵکیان وریا کردوەتەوە لەبیدعە، چونکە دەزانن بیدعە خەڵکی بەرەو کوێ دەبات.

فیتنە ئەگەر گڕ بگرێت ئەوا تەڕو وشك پێکەوە دەسوتێنێ، گەورەو بچوك پێکەوە دەسوتێنێ، تووشی زانایان و جگە لەزانایان دەبێ، هەموو خەڵکی دەگرێتەوە، ناتوانن خۆیانی لێ دەرباز بکەن، ئەگەر خۆیانیان لێ دەربازکرد ئەوا منداڵو کەسو کارو ئەوانەی دەورو بەریان ڕزگاریان نابێ، چونکە وەکو ئاگرە ئەگەر گڕ بگرێت لە دارو چیلکەیەکی وشکدا، چیتر کوژاندنەوەی گرانە، بەڵام زاڵ بوون بەسەریدا و نەهێشتنی لەسەرەتاوە ئەوا کارێکی ئاسانە، کەچی زاڵ بوون بەسەریداو نەهێشتنی لەپاش ئەوەی گەورەو مەزن دەبێت ئەوا گرانە، بۆیە دەبێ بە توندیو بە یەکلا کردنەوە لەگەڵیدا بجوڵێیتەوەو هەرگیز نەرم و نییان نەبی لەگەڵیدا.

لەبەر ئەوەی سەلەف لەسێ سەدە چاکەکەدا توانیبویان بیدعە ئابڵووقە بدەن و ڕێگایان بەهیچ بیدعەیەك نەدەدا، ئەوا ئەو سێ سەدە چاکە پاکترین سەردەم و سەدەکانی ئەم ئوممەتە بوون، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ستایشی ئەو سێ

---

٣١ / صحيح : سبق تخريجه .

سەدەیەی کردووەو فەرمویەتی: (خیرکم قرني ثم الذین یلونهم ثم الذین یلونهم)[٣٢] چونکە ئەوان نەرم و نیان نەبوون لەگەڵ بیدعەدا، ئەوان ئابڵوقەیان دەداو نەیاندەهێشت بڵاوە بکات، ئەهلی بیدعە لەو سەردەمەدا خۆیان دەشاردەوە لەبەر بەهێزی ئەهلی حەق، کاتێ ئەو سەردەمە چاکە بەسەرچوو بیدعەو بیدعەکاران و خراپەکاران گورج بوونەوەو چست و چالاك بوونو فیتنە لەنێوان موسڵماناندا گڕی سەندو هەڵگیرسا،بەڵام خوای گەورە خۆی پاراستنی ئەم دینەی گرتوەتە ئەستۆ، جا ئەم دینە پارێزراوە _سوپاس بۆ خوا_ بەڵام ئەوانەی بە هەلاکەتدا دەچن ئەهلی ئەم دینەن، ئەوان بەهەلاکەتدا دەچن، بەڵام دینەکە پارێزراوە بەپاراستنی خوای گەورە، خوای گەورە خۆی کەسانێکی بۆ دیاری دەکات سەری بخەن و جێ بەجێی بکەن، خوای گەورە دەفەرموێت:– (وَإِنْ تَتَوَلَّوْا يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوا أَمْثَالَكُمْ (٣٨) محمد) واتە: ئەگەر لەم دینە پشت هەڵکەن خوای گەورە ئێوە دەگۆڕێ بەقەوم و گەلێکی تر ئەوسا ئەوانیش وەك ئێوە نابن).

دەفەرموێت: (فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ) المائدة/٥٤) واتە: جا خوا لەمەولا کەسانێك دێنێت خۆشی دەوێن و ئەوانیش ئەویان خۆش دەوێ).

خوای گەورە دینەکەی خۆی بزر ناکات، بەڵام ئەوە ئێمەین بزر دەبین ئەگەر دینەکەمان بزر کرد، لەگەڵ ئەهلی بیدعەدا نەرمو نیان بووین، لە گەڵ خاوەن شتە داهێنراوەکاندا، نەرم و نیان بوین لەگەڵیاندا ئەوا ئێمە بزر دەبین، ڕەنگە فیتنەو کوشتار بەرپابێت و خوێن بڕێژرێت بە هۆیەوە، نەتوانین خۆمانی لێ دەرباز بکەین.

---

٣٢ / صحیح : سبق تخریجه .

مەبەست لە: (فعظمت وصارت دينا يدان بها).

واتە: ئەگەر بیدعە وازی لێ بهێنی ئەوا ئەو لەپاشاندا دەبێتە دین، لە پێشدا باسی ئەو قسەیەی نوسەرمان کرد: (ما أحدث الناس بدعة إلا رُفع مثلها من السنة) تاکو بیدعەکان دەبنە دین، سوننەتەکان نامێنن و بیدعەکان لەم کۆمەڵگایەدا دەبێتە دین، مانای ئەوە نییە هەموو ئەم ئوممەتە وای بەسەر دێت، بەڵام ئەو کۆمەڵگەیەی ڕێگا بە بیدعە دەدەن بڵاو بێتەوە تیایدا ئەوە بیدعەکە دەبێتە دین تیایدا، مانای ئەوە نییە دین نەماوەو لەناوچوە، بەڵکو کەسانێکی تر هەن لەجێگایەکی تردا یان لەوڵاتێکی تردا پێی هەڵدەستن، خوای گەورە خۆی کەسانێکی بۆ تەرخان دەکات سەری بخات و بیپارێزێ و پارێزگاری لێ بکات.

لەفەرموودەیەکدا هاتوە[٣٣] لەکۆتا زەماندا سوننەتەکان دەکرێنە بیدعەو بیدعەکانیش دەکرێنە سوننەت، تاکو کاتێك بگۆڕدرێت دەڵێن: دینەکەیان گۆڕی، ئەگەر نکوڵی لێ بکەیت پێت دەڵێن: نکوڵی لەدین دەکەیت !

مەبەست لە: (فخالف الصراط المستقيم فخرج من الاسلام).

واتە خاونی بیدعە وای لێ دێت کارەکە جورئەتی پێ دەکات تاوەکو دینەکە هەمووی دەبێتە بیدعەو لەئیسلام دەردەچێت کاتێ لەدینەکەیدا هیچ شتێك لەسوننەتەکان نەما.

---

٣٣ / رواه الدارمي والحاكم وابن عبدالبر والبيهقي .

**﴿٨﴾ نوسەر دەڵێت: (فانظر -رحمك الله- كل من سمعت كلامه من أهل زمانك خاصة فلا تعجلن ولا تدخلن في شيء منه حتى تسأل وتنظر: هل تكلم فيه أحد من أصحاب النبي (ﷺ) أو أحد من العلماء؟ فإن أصبت فيه أثرا عنهم فتمسك به، ولا تجاوزه لشيء، ولا تختر عليه شيئا فتسقط في النار).**

واتە: تەماشاکە _ڕەحمەتی خوات لێبێت_ ئەگەر گوێت لەقسەی هەرکەسێك بوو بەتایبەتی لەو سەردەمەی تۆی تێدای ئەوا هەرگیز پەلە مەکەو مەچۆ ناو هیچ مەسەلەیەکەوە تاکو تەماشا نەکەیتو پرسیار نەکەیت: ئایە هیچ کەسێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەربارەی قسەیان کردوە؟ یان یەکێك لەزانایان؟ جا ئەگەر لەوانەوە شتێکت دەستکەوت ئەوا دەستی پێوە بگرە، لەبەر هیچ شتێك وازی لێ مەهێنە، هیچ شتێك هەڵمەبژێرە بەسەریداو بکەویتە ناو ئاگرەوە).

ڕاڤە:

پەلە مەکە لەوەی دەیبیسی لەخەڵکییەوە بە تایبەتی لەم سەردەمە دواییەکانداو زۆری ئەوانەی قسە دەکاتو فەتوا دەداتو خۆی دەکاتە خاوەن عیلم و قسە، بەتایبەتی کاتێك هۆکارەکانی ڕاگەیاندن زۆربوون، وای لێهاتووە هەرکەسە لە خۆیەوە قسە دەکات بەناو عیلم و بەناو دینەوە، تەنانەت گومڕاکان و کۆمەڵە گومڕاکان و ئەوانەی لەڕێ لایانداوە وایان لێ هاتووە ئێستا بەناو دینەوە قسە دەکەن لەکەناڵە ئاسمانیەکاندا، جا ترسەکە زۆر گەورەیە، بۆیە ئەوەی لەسەرتە _بەتایبەتی برای موسڵمان و قوتابی زانست و زانیاری_ پەلە نەکەیت و بەدواداچوون بکەیت لەگەڵ هەر شتێکدا دەیبیسی، لەسەرتە دڵنیا بیت لەوەی دەیبیسی...

بزانیت کێ ئەو قسەیەی کردوە؟

ئەم بیرۆکەیە لەکوێوە هاتوە؟

ئەمجار بەڵگەو پشت بەستنی بە چییە لەقورئان و سوننەتدا؟

ئەمجار خاوەنەکەی لەکوێ فێربوو؟

لە چ کەسێکەوە عیلمی وەرگرتوە؟

جا ئەم بابەتانە پێویستی بەدڵنیابوونە بەتایبەتی لەم سەردەمەدا، چونکە هەرکەسە قسەدەکات تەنانەت ئەگەر زمان پاراوو ڕەوانبێژو قسەزانو وابێت خەڵکی گوێی لێبگرێت، پێی هەڵمەخەڵەتێ، تاکو نەیبینی تا چەند عیلم و فیقهی پێیە، چونکە ڕەنگە کەسێك قسەی کەم بێت بەڵام (فەقیە) بێت، ڕەنگە کەسێك قسەکانی زۆربێت بەڵام نەفام بێت هیچ تێگەیشتنێکی نەبێ، بەڵکو سیحری قسەکردنی پێ بێ تاوەکو خەڵکی هەڵخەڵەتێنێ، بەشێوەیەك خۆی دەردەخات زانایە، ئەو تێگەیشتووەو ئەو بیرمەندە، ئا لەو جۆرە شتانە، تاکو خەڵکی پێی هەڵدەخەڵەتێ و لە حەق دەریان دەکات، جا عیبرەت بە قسە زۆری و قسەی بریقەدار (چەنەبازی) نییە، بەڵکو عیبرەت بەوەیە چەند عیلمی پێیە، تا چەند قسەکان بەبنەمان، ڕەنگە قسەیەکی کەمی بە بنەما زۆر سوودبەخشتر بێت لەقسەی زۆری بریقەدار هیچ سودێکی لێ وەرناگری کەمێکی نەبێ، بەڕاستی ئەمە واقیعی سەردەمی ئێمەیە قسەی زۆر دەکرێ و عیلم کەم بووە، خوێنەران (قورئان خوێنان) زۆربوەو فەقیهەکان کەم بوونە، فیقهیش بەزۆری قسەکردن نییە یان زۆری خوێندنەوەو جوانی قسەو ڕەوانبێژی نییە، شاعیر دەڵێت:_

| | |
|---|---|
| فی زخرف القول تزيين لباطله | والحق قد يعتريه سوء تعبير |
| تقول هذا مجاج النحل تمدحه | وإن تشأ قلت ذا قيء الزنابير |

ئەگەر بتەوێت مەدحی هەنگوین بکەیت ئەوا دەڵێیت: ئەمە (مجاج النحل) واتە: هەنگوینی مێشهەنگە، ئەگەر بتەوێت بەخراپە باسی بکەیت دەڵێیت: (قیء) وە لە جێی (النحل) دەڵێی: (الزنابیر) واتە: رشانەوەی زەنگەزۆرەیە، کەسی ڕەوانبێژ حەق دەکاتە ناحەق و ناحەق دەکاتە حەق بەڕەوانبێژی خۆی، جا وریای ئەو کەسانەبە، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاگاداری کردینەتەوە لەزمان پاراو بەزمانی دەمو لێوی پاك دەکاتەوە هەروەکو چۆن مانگا بەزمانی پاکی دەکاتەوە[٣٤]، ئاگاداری کردینەتەوە لەو جۆرەو فەرموویەتی: (إن من البيان لسحرا)[٣٥] واتە: لە ڕەوانبێژیدا سیحر هەیە، بیستنەکان سیحراوی دەکات.

مەبەست لە: (فانظر -رحمك الله -كل من سمعت كلامه من أهل زمانك خاصة فلا تعجلنَّ ولا تدخلن في شيء منه).

ئەمە لەسەردەمی نوسەردا، نوسەر نزیکە لەوەی هاوسەردەمی ئیمامی ئەحمەد بێت، چونکە ئەو قوتابی قوتابییەکانێتی هێشتا ئەو دەڵێت: پەلە مەکە لە وەرگرتنی قسەی ئەهلی سەردەمی خۆت تاکو دڵنیا نەبیت لێی، ئەی ئەو چی دەڵێت دەربارەی سەردەمی ئێمە؟! سەردەمی ئارەزوو، سەردەمی نەفامی، سەردەمی تێکەڵ بوونی جیهان لەگەڵ یەکتردا، تاوەکو وای لێهاتووە فیتنەو خراپەکاری و بیرۆکەکان زۆربوونە، دوژمنیش ئێستا دەیەوێت دینەکەمان ئەمدیو ئەودیو بکات، دەیانەوێ ئێمە شوێنکەوتەی ئەوان بین، بیرۆکەکانی خۆیان بەسەرماندا بسەپێنن، سیاسەتی خۆی بەسەرماندا بسەپێنێ، بۆیە دەبێ ئێمەیش دڵنیا بین لەم بابەتانەدا، لەزۆربەی ئەو

٣٤ / رواه احمد وابن ابي شيبة وابو داود والترمذي والطبراني والبزار وغيرهم .

٣٥ / أخرجه البخاري (٤٨٥١) .

کارانەدا بوەستین، ڕوو بکەینە تێگەیشتنی قسەکانی خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ)، لەدینی خوادا باش تێبگەینو شارەزا بین.

تێگەیشتن لەدینەکە پاراستن لە فیتنەکانی تێدایە، (الفقه) بریتییە لەتێگەیشتن، ڕەنگە کەسێك لەبەرکردنی زۆر بێت بەڵام تێگەیشتنی نەبێت، بۆیە ئەو و کەسێکی عەوام وەکو یەکن، بەڵکو ڕەنگە کەسە عەوامەکە باشتر بێت لەو چونکە ڕادەوەستێت و قسەناکات، چونکە دەزانێ نەفامە، بەڵام ئەویتر نازانێ نەفامە، مەسەلەکە لە سەر زۆری لە بەرکردن و قسەی زۆری نییە، مەسەلەکە مەسەلەی تێگەیشتنە، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (رُبَّ مُبَلَّغٍ أوعى من سامع)[٣٦] ڕەنگە کەسێك لەبەر بکات و بگوازێتەوەو ڕیوایەت بکات، بەڵام کەسێك هەبێ لەو تێگەیشتوتر بێت (رُب حامل فقهٍ ليس بفقيه)[٣٧] ئەو تەنها هەڵگرەو دەگوازێتەوە بەڵام تێگەیشتوو(فەقیه) نییە، جا تێگەیشتن بەخششێکە لەخواوە، خوای گەورە بیەوێت دەیداتە هەربەندەیەکی بیەوێت، بەڵام ئەگەر بایەخی پێ بدات و گەشەی پێ بدات ئەوا سوودی لێ وەردەگرێ، ئەگەر فەرامۆشی کرد ئەوا بزر دەبێ.

مەبەست لە: (فلا تعجلن ولا تدخلن في شيء منه حتى تسأل وتنظر: هل تكلم فيه أحد من أصحاب النبي (ﷺ)).

ئەمە ئامۆژگارییەکی زۆر مەزنە، ئەگەر قسەی کەسێکت بەدڵ بوو لەدیندا – بەڵام ئەو قسانەی لەکاروباری دونیادایە ئەوە بابەتی باسەکەی ئێمە نییە – بەڵام ئەگەر لەدیندا قسەیەکت بەدڵ بوو ئەوا پەلە مەکە تاکو بەجوانی تەماشای نەکەی، ئایە ئەو قسەیە لەسەر حەقو بەڵگە بنیات نراوە، یان لەسەر بیرۆکەو مێشکەکان بنیات نراوە

٣٦ / متفق عليه : أخرجه البخاري (١٦٥٤) ومسلم (١٦٧٩) .

٣٧ / السلسلة الصحيحة للألباني : صحيح (٤٠٤) .

ئەوە کەڤ سەرئاوی لافاوەکانە وازی لێ بهێنە، بەڵام ئەگەر بنیات نرابوو لەسەر قورئان و سوننەت ئەوە حەقە، بۆیە پەلەمەکە لەوەرگرتنی قسە لە نەفامانەوە، هەر چەندە بەزمان پاراوی‌و ڕەوانبێژی وهێزو زۆری قسەکانی سەرسام بیت، پەلە مەکە تاکو تەماشای نەکەیت و بەراوردی نەکەیت لەگەڵ قورئان و فەرموودەدا، تەماشای بکەیت ئەو کەسەی قسەی تێدا کردوە فەقیهە یان نا؟ تاکو پرسیار نەکەیت لەزانایان دەربارەی، تەماشا بکەیت ئایە یەکێك لەزانایانی سەلەف وتویانە یان نەیانگوتوە؟ ئەمەیە چەندین جار ئاگادارم کردونەتەوە، دەڵێم:- ئیجتیهادو بۆچوون و قسەو دەستەواژەی تازە دامەهێنن لە پێش ئێوە کەس نەیگوتبێت، پێشەنگی خۆتان لە سەلەف و لە قسەی سەلەفەوە وەرگرن، چونکە ئەگەر شتێکت هێنا هیچ کەس پێشت نەکەوتبێت ئەوا دەبێتە شتیکی نامۆ و زیانەکەی لە سوودەکەی زیاتر دەبێت.

جا قسەی هاوەڵان تەرازوە، چونکە ئەوان قوتابی پێغەمبەری خوان (ﷺ)، تەماشای قسەی ئەوان دەکەین لەئایەتەکەدا، بەچی تەفسیریان کردووە، لە فەرموودەکاندا چۆن ڕاڤەیان کردووە، قسەو تەفسیری ئەوان وەردەگرین چونکە ئەوان لەحەقەوە نزیکترن لەوانەی پاش ئەوان هاتوون چونکە ئەوان قوتابی پێغەمبەری خوان(ﷺ) و تەفسیرو ڕاڤەیان لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) بیستووەو لە ئەوەوە وەریانگرتوە، ئەوان نزیکترین کەسن لە حەقەوە، عیبرەت لەو قسانەدا نییە دەڵێن: لە هاوەڵانەوە عیبرەت وەرناگرین، ئەوان تەنها پیاون وبیرۆکەی خۆیان هەیەو ئێمەیش پیاوین و بیرۆکەی خۆمان هەیە، زەمانەیش گۆڕانی بەسەردا هاتوە.

دینەکە ماوە تاکو هەستانی قیامەت‌و ناگۆڕێت بەگۆڕینی زەمانە، چونکە ئەو گشتگیرە بۆ هەموو کات و شوێنێك، بەڵکو ئەوەی دەگۆڕدرێت ئەو ئیجتیهادانەیە لە مرۆڤەوەیە کە هەڵەو ڕاستی تێدایە، بەڵام خوودی دینەکە ئەوا ناگۆڕدرێت چونکە ئەو

بەکەڵکی هەموو سەردەم و جێگایەك دێت، چونکە ئەو لەلایەن خودای داناو دلۆڤانەوە دابەزیوە، بۆیە ئامۆژگاری دەکەن و دەڵێن:- دەست بگرن بەقورئان و سوننەتەوە بەتێگەیشتنی سەلەفی صالح، تێگەیشتنێکی نوێ دامەهێنە لەخودی خۆتەوە یان لەپاشینەکانەوە.

مەبەست لە: (أو أحدٌ من العلماء).

واتە یەکێك لەزانا موعتەبەرەکان (باوەڕ پێکراوەکان) وتبێتی، لەو پێشەوایانەی لەسەر بەرنامەی هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) دەڕۆن چونکە ئەوان ئەم دینەیان لەهاوەڵانەوە وەرگرتووەو هاوەڵانیش لەپێغەمبەری خوداوە (ﷺ) ریوایەتیان کردوە.

مەبەست لە: (فان اصبت فيه أثراً عنهم فتمسك به).

ئەگەر بینیت لەگەڵ قسەی ئەواندا کۆك بوو ئەوا دەستی پێوە بگرە.

مەبەست لە: (ولا تجاوزه لشيء).

واز لە قسەی سەلەف مەهێنە لەبەر بۆچوونی فلان و فلان، ئەوانەی لە پاش ئەوان هاتوون.

مەبەست لە: (ولاتختر عليه شيئاً فتسقط في النار).

قسەی ئەوانەی لەپاش سەلەف هاتوون پێشی مەخە بەسەر قسەی سەلەفداو ببێتە هۆی ئەوەی بکەویتە ئاگرەوە،چونکە تۆ لەڕێگای بەهەشت لاتداوە، ڕێگای بەهەشت ئەو ڕێگایەیە ئەوان لەسەری بوون: (الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَئِكَ رَفِيقًا (٦٩) النساء) واتە: ئەو کەسانە خوا چاکەو بەهرەی خۆی

بەسەرا ڕشتوون لەپەیامبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدانی ڕێگەی خواو صالحان و کارچاکان دیارە ئەمانە چ هاودەم و هاوڕێیەکی چاك و بێ وێنەن).

ئەمە ڕێگای بەهەشتە، ئەوەی لەگەڵ ئەو ڕێگەدا ناکۆك بێت ئەوە ڕێگەی ئاگرە، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَأَنَّ هَـٰذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ (١٥٣) الانعام) واتە: ئەم هێڵە شاستەیە بەرنامەو ڕێبازەکەی منە، دەسا ئێوەیش ئەی ئیمانداران! هەمیشە شوێنی بکەون و هەر بەودا بچن مەکەونە شوێنی ڕێچکەکانی تر، ئەوسا لەشاڕێگەکەی خوا بترازێن و پەڕاگەندە ببن).

ڕێگای خودا یەك ڕێگایە، بەڵام جگە لەو ڕێچکەی زۆرن، هەر شەیتانێك ڕێگایەکی خۆی هەیەو شەیتانی مرۆڤ و جنۆکە ڕێگایان هەیە، ئەوانە ڕێچکەی زۆرن، ئەوەی دەچێتە سەری دەکەوێتە دڵە ڕاوکێوە، بەڵام ڕێگا ڕاستەکە (الصراط المستقیم) یەك ڕێگایەو هیچ ناکۆکیەکی تێدا نییە، هەرگیز بزر نابێت ئەگەر بیگریتە بەر.

**﴿٩﴾ نوسەر دەڵێت: (واعلم أن الخروج عن الطريق على وجهين: أما أحدهما فرجل قد زلّ عن الطريق وهو لا يريد إلا الخير فلا يُقتدى بزلته فإنه هالك ورجل عاند الحق وخالف من كان قبله من المتقين، فهو ضال مضل، شيطان مريد في هذه الأمة، حقيق على من عرفه أن يُحذر الناس منه ويُبيّن للناس قصته لئلا يقع في بدعته أحد فيهلك).**

واتە: بزانە دەرچوون لەڕێگا دوو شێوەیە:-

یەکێکیان کابرایەکە لەڕێگاکە هەڵخلیسکاوە، لەکاتێکدا ئەو تەنها خەیر و چاکەی دەوێ، بۆیە ناکرێتە پێشەنگ لەخلیسکانەکەی چونکە ئەوە بەهەلاکەتدا چوە، کابرایەك بەرهەڵستی لەگەڵ حەقدا دەکات و لەگەڵ لەخواترساوانی پێش خۆی ناکۆکە، ئەوە گومڕایەکی گومڕاکەرە، شەیتانێکی سەرکەشی یاخییە لەم ئوممەتەدا، پێویستە لەسەر هەرکەسێك ناسییەوە خەڵکی لێ ئاگادار بکاتەوەو خەڵکی لە چیرۆکەکەی ئاگادار بکاتەوە، بۆ ئەوەی هیچ کەسێك نەکەوێتە بیدعەکەیەوەو بەهەلاکەتدا بچێت).

ڕاڤە/

کاتێك شەیخ -ڕەحمەتی خوای لێبێت- لەقسەکانی پێشوویدا ئەو ڕێگا ڕاستەی ڕوون کردەوە کە پێویستە موسڵمان لەسەری بێت لەعەقیدەو دینەکەیدا:- ئەمجار باسی ئەوەی کرد کەوا ئەو کەسەی لەسەر ئەو ڕێگایە لادەدات یەکێکە لەو دوو کەسە:-

- پیاوی یەکەم:- کەسێك دەرچووە بەبێ ئەنقەست، بەڵکو خەیرو چاکەی دەوێت بەڵام ڕێگایەکی گرتوەتە بەر خەیرو چاکە نییە، ئیجتیهاد تەنها بەس نییە،

هەرچەندە نییەتی خاوەنەکەی چاك بێت، مەبەستی چاك بێت، دەبێ لەگەڵ ئەو نیەت چاکەیدا لەسەر ڕێگای ڕاست بێت، ئەمە بەکەسێکی هەڵەکار دەژمێردرێت، هەر کەسێك کۆك بوو لەگەڵیدا لەو هەڵەیەی کردویەتی‌و لەگەڵیدا لەسەر ڕێگا هەڵەکە دەڕوات‌و لەکاتێکدا بە هەڵەکەی دەزانێ ئەوا بەهەلاکەتدا چووە، چونکە ئەو ڕێگایە ڕێگای بەهەلاکەت چوونە هەرچەندە خاوەنەکەی بە ئەنقەست لەڕێگا دەرنەچووبێ بەڵکو بەدوای خەیرو چاکەدا گەڕابێت.

ئەمەش حاڵی زۆرێك لەو کەسانەیە لەخۆیانەوە داهێنانی تازە دادەهێنن لەزانستی عەقیدەدا، ئەوا ئەم کارە دروست نییە، نابێت کەس شوێنیان بکەوێت، خاوەنەکەشی لەسەر ڕێگای ڕاست نییە، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ (١٥٣) الانعام) واتە: ئەم هێڵە شاستەیە بەرنامەو ڕێبازەکەی منە، دەسا ئێوەیش ئەی ئیمانداران! هەمیشە شوێنی بکەون و هەر بەودا بچن مەکەونە شوێنی ڕێچکەکانی تر، ئەوسا لەشارێگەکەی خوا بترازێن و پەڕاگەندە بین).

جا هەر ڕێگایەك لەڕێگا ڕاستەکە (الصراط المستقيم) دەرمان بکات، ئەوا ئێمە ڕەدی دەکەینەوە، هەرچەندە خاوەنەکەی مەبەستی چاك بێت‌و نییەتی باش بێت، ئەوا ئێمە لەوەدا شوێنی ناکەوین، ئەویش ئەگەر لەسەر هەڵەکەی بەردەوام بێت ئەوا بەرەو هەلاکەت دەیبات، چونکە هەرکەسێك لەسەفەرەکەیدا وازی لەڕێگا ڕاستەکە هێناوە ڕێگایەکی تری گرتە بەر ئەوا بەهەلاکەتدا دەچێت.

● بەڵام پیاوەکەی تر: بە ئەنقەست لەڕێگا دەرچوە، ئەو حەق دەناسێت، دەزانێت ئەوەی بۆی دەرچوە ناحەقە بەڵام بە ئەنقەست لەسەر ڕێگای حەق دەردەچێت، بەمەبەستی گومڕاکردنی خەڵکی.

یەکەم کەس مەبەستی چاککردنی خەڵکییە بەڵام ڕێگای ڕاستی نەگرتوەتە بەر، کەسی دووەم مەبەستی گومڕاکردنی خەڵکییەو لادانیانە لەسەر ڕێگای ڕاست، ئەوە شەیتانە، چونکە شەیتانەکان خەڵکی لەڕێگای ڕاست دەردەکەن، ئیبلیس بە پەروەردگارەکەی خۆی دەڵێت: (لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَاطَكَ الْمُسْتَقِيمَ (١٦)الأعراف) واتە: شەرت بێ ڕێ ڕاستەکەی تۆیان لێ بگرم).

ئیبلیس دەیەوێ خەڵکی لەڕێگا ڕاستەکە لادات بەرەو ڕێگا چەوت بیانبات، پێغەمبەری خواش (ﷺ) نمونەیەکی بۆ ئەم مەسەلەیە هێناوەتەوە کاتێك خەتێکی ڕاستی کێشا، چەند خەتێکی تری لە دەورو بەری کێشا، بەخەتە ڕاستەکەی فەرموو: (هذا صراط الله) واتە: ئەمە ڕێگاکەی خوایە، بە خەتەکانی تری گووت: (وهذه سبل، على كل سبيل منها شيطان يدعو الناس إليها)[38] واتە: ئەمە ڕێچکەکانە، لەسەر هەر ڕێچکەیەك شەیتانێك هەیە خەڵکی بۆ بانگ دەکات) ئەمە نمونەیەکی ڕوون و ئاشکرایە، دەگونجێ لەگەڵ ئەوەی لێرەدا شەیخ باسی کردوە، چونکە ئەو کەسەی خەڵکی لەڕێگای ڕاست (الصراط المستقيم) دەردەکاتو بەرەو ڕێگا تازە داهێنراوەکان، خێرو چاکەی بۆیان ناوێ بەڵکو هەلاکەتی بۆیان دەوێو ئەوەش شەیتانە، جا هەرچەندە لەشەیتانە جنۆکەکان بێت یان لەشەیتانە مرۆڤییەکان (الإنس)، بۆیە پێویستە لەسەرمان لەم کەسە زیاتر وریا و ئاگاداربین لە کەسی یەکەم، چونکە ئەم کەسە بە ئەنقەست دەیەوێ خەڵکی گومڕا بکات.

مەبەست لە: (فهو ضال مضل، شيطان مريد).

واتە: ئەو لەخودی خۆیدا گومڕایەو گومڕاکەرە بۆ جگە لەخۆی، ئەو کەسە شەیتانێکی سەرکەشی یاخییە، دەیەوێ خەڵکی لەسەر ڕێگای ڕاست لابدات.

---

٣٨ / حسن : أخرجه النسائي في (الكبرى) (٦/٣٤٣) وأحمد (١/٤٣٥) والدارمي (٢٠٢) وابن حبان (٦، ٧) وحسنه الشيخ الألباني في (المشكاة) (١٦٦) .

مەبەست لە: (حقيق على من عرفه أن يحذر الناس منه ويبين لهم قصته لئلا يقع في بدعته أحد فيهلك).

واتە: ئەو کەسە لەسەر ڕێگا ڕاستەکە بە ئەنقەست دەرچووە، دروست نییە لێی بێ دەنگ بیت، بەڵکو دەبێ باسەکەی ئاشکرا بکرێت، شەرمەزارییەکەی ئابڕو ببرێت تاکو خەڵکی لێی ئاگادار بن، نابێت بگوترێت: خەڵکی ئازادن لەبیر و بۆچووندا، ئازادی لەقسەکردندا، ڕێزگرتن لەبۆچوونی بەرانبەر، هەروەکو چۆن ئێستا باسی دەکەن، ڕێزگرتن لەبۆچوونی بەرانبەر، ئەم مەسەلەیە مەسەلەی بیرو بۆچوون نییە، بەڵکو مەسەلەکە مەسەلەی شوێنکەوتنە، ئێمە خوای گەورە ڕێگایەکی ڕوون و ئاشکرای بۆ کێشاوین، بە ئێمەی فەرمووە لەسەر ئەم ڕێگایە بڕۆن کاتێ فەرمووی: (وَأَنَّ هَٰذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ) الانعام ١٥٣) جا هەرکەسێك بێت بۆ لامان بیەوێ ئێمە لەسەر ئەم ڕێگا ڕاستە دەرکات ئەوا ئێمە:_

یەکەم: قسەکەی ڕەتدەکەینەوەو ڕەفزی دەکەین.

دووەم: ڕوونی دەکەینەوەو خەڵکی لێ ئاگادار دەکەینەوە، نابێت لێی بێدەنگ بین چونکە ئەگەر ئێمە لێی بێدەنگ بین ئەوا خەڵکی پێ هەڵدەخەڵەتێ، بەتایبەتی ئەگەر کەسەکە خاوەن زمانێکی پاراوو ڕۆشنبیری و قەڵەم بوو، ئەوا خەڵکی پێی هەڵدەخەڵەتێن و دەڵێن: ئەم کەسە لێهاتوە، ئەمە کەسێکی بیرمەندە، هەروەکو ئێستا ڕوودەدات، بۆیە مەسەلەکە زۆر ترسناکە.

ئەمەش بەڵگەی (واجب) بوونی ڕەدی کەسی بەرانبەرو جیاوازی تێدایە، بەپێچەوانەی ئەو کەسانەی دەڵێن: واز لەڕەدو ڕەدکاری بهێنن، واز لەخەڵکی بهێنن هەرکەسەو بۆچوونی خۆی و ڕێزی خۆی هەیە، ئازادی قسەو ئازادی بۆچوون هەیە، بەم شێوەیە ئەم ئوممەتە بەهەلاکەتدا دەچێت، چونکە سەلەف دەربارەی ئەو جۆرە کەسانە هەرگیز بێ دەنگ نەبوون، بەڵکو ئابڕوویانیان بردوەو ڕەدیان داوەتەوە، چونکە

دەزانن ترسیان چەندە زۆرە لەسەر ئەم ئوممەتە،ئێمەش بۆمان نییە بێ دەنگ بین لە خراپەی ئەوان، بەڵکو دەبێ ئەوەی خوای گەورە دایبەزاندوە ڕوون بکرێتەوە، ئەگەر نا ئەوا ئێمە دەبینە ئەو کەسانەی زانستیان شاردۆتەوە، ئەوانەی خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت: (إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنْزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى مِنْ بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ أُولَئِكَ يَلْعَنُهُمُ اللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ (١٥٩)البقرة) واتە: بەڕاستی ئەوانەی ئەو بەرنامەو ڕێنماییە دەشارنەوە لەو کتێبەدا هەیە بۆ شارەزایی خەڵك دوای ئەوەی ڕوونمان کردۆتەوە خوا نەفرینیان لێ دەکاو تەواوی نەفرینکەرانیش نفرینیان لێ دەکەن).

ئەمە تەنها کەسی بیدعەکار (المبتدع) ناگرێتەوە بەڵکو ئەو کەسانەش دەگرێتەوە کەوا لێیان بێ دەنگ دەبن، ئەوا ئەو زەم و سزایە دەیگرێتەوە، چونکە پێویستە بۆ خەڵکی ڕوون بکرێتەوەو ئاشکرا بکرێت، ئەمەش کار و پیشەی ئەو ڕەددە زانستیانەیە ئێستا لەکتێبخانەکانی موسڵماناندا بەزۆری هەیە هەمووی ڕێگا ڕاستەکە پاك دەکاتەوەو خەڵکی ئاگادار دەکاتەوە لەو جۆرە کەسانە، بۆیە ئەو بیرۆکەیە ڕەواجی پێ نادات –بیرۆکەی ئازادی بۆچوون و ئازادی قسەو ڕێزگرتن لە بۆچوونی بەرانبەر– ئیللا کەسێکی گومڕاکەری شاردەرەوەی حەق نەبێ.

ئێمە مەبەستمان حەقە، مەبەستمان بریندارکردنی خەڵکی نییە یان قسە بەخەڵکی بکەین، مەبەست لێی ڕوونکردنەوەی حەقە، ئەم ئەمانەتە خوای گەورە داویەتی بە کۆڵی زانایاندا، بۆیە نابێت لەو جۆرە کەسانە بێ دەنگ بین، بەڵام بەداخەوە ئەگەر یەکێك لەزانایان هاتوو ڕەدی ئەو جۆرە کەسانەی دایەوە ئەوا پێی دەڵێن:– ئەمە پەلە دەکات...جگە لە چەندین وەسوەسەی تر، ئەمە زیانی نییە بۆ زانایان (ساردیان ناکاتەوە) ئەگەر هاتوو بۆ خەڵکیان ڕوون کردەوە لەخراپەی بانگەوازکارانی گومڕایی، هەرگیز زیانی نییەو ساردیان ناکاتەوە.

**﴿١٠﴾ نوسەر دەڵێت: (واعلم -رحمك الله- أنه لا يتم إسلام عبد حتى يكون متبعا مصدقا مسلما، فمن زعم أنه قد بقي شيء من أمر الإسلام لم يكفناه أصحاب رسول الله (ﷺ) فقد كذبهم، وكفى بهذا فرقةً وطعناً عليهم، فهو مبتدع ضال مضل، محدث في الإسلام ما ليس منه).**

واتە: بزانە _ڕەحمەتی خوات لێبێت_ئیسلامی بەندەیەك تەواو نابێت تاوەكو شوێنكەوتەو بەڕاستزانو تەسلیم نەبێت، هەركەسێك وابزانێت دەربارەی ئیسلام شتێك ماوە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەیانگەیاندووە ئەوا ئەوانی بەدرۆخستوەتەوە، بەسە بۆ ئەو قسەیە ناكۆكبوون و تانەدان لەوان، ئەوە كەسێكی بیدعەكاری گومڕای گومڕاكەرە، شتی تازەی لەئیسلامدا داهێناوە تێیدا نەبووە).

ڕاڤە/

**ئەمە تەواوكردنی قسەكەی پێشووە، مەبەست لە:** (لا يتم إسلام عبد حتى يكون متبعا مصدقا مسلما).

**شوێنكەوتە بێت و داهێنەر نەبێت، بەڕاستی بزانێت و گومان و دوو دڵ نەبێت،** (مسلما) **واتە تەسلیمی كیتاب و سوننەت بێت، چونكە ئەم كارانە جێگای تەسلیم بوونە، جێگای مشتو مڕ نییە، تەسلیمی خواو پێغەمبەرەكەی (ﷺ) دەبین، لەم كارەدا مشتومڕ (موجادەلە) ناكەین یان بۆچوونی خۆمان باس بكەین_هەروەكو دەڵێن_لەگەڵ قسەی خوا و پێغەمبەری خوادا (ﷺ).**

**مەبەست لە:** (فمن زعم أنه قد بقي شيء من أمر الإسلام لم يكفناه أصحاب رسول الله (ﷺ) فقد كذبهم).

**واتە: هەركەسێك وابزانێت هاوەڵان كەمتەرخەم بوونە لەڕوونكردنەوەو شیكردنەوەی حەقداو هەڵگرتنی ئەو ئەمانەتە لەپێغەمبەری خوداوە(ﷺ) بۆ خەڵكی، وابزانێت ئەویش بۆی هەیە قسەبكات یان شتیك زیاد بكات، ئەوا ئەو كەسە شەڕو خراپەی بۆ**

خەڵکی دەوێت، چونکە هاوەڵان هیچ شتێکیان بەجێ نەهێشتوە لەوەی لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) بیستویانە، یان شتێکیان بینیوە، ئیللا بەئەمانەتەوە گەیاندویانەتە ئەم ئوممەتە، بۆ ئەم ئوممەتەیان ڕوونکردۆتەوە، بۆیە لەتەفسیردا تەفسیری ئەوان پێش تەفسیری جگە لەوان دەکەوێت، چونکە ئەوان قوتابی پێغەمبەری خوان(ﷺ)، قورئانیان لە ئەوەوە بیستوە، فەرموودەیان لەئەوەوە بیستوە، ڕوون کردنەوەی قورئانیان لەئەوەوە بیستوەو کردەوەی پێغەمبەریان (ﷺ) بینیوەو ئەوەیان بەئەمانەتەوە گواستۆتەوە، ئەوان هیچ شتێکیان بەجێ نەهێشتوە.

جا هەرکەسێك وابزانێت ئەوان کەمتەرخەم بوونە یان شتێکیان بەجێ هێشتوەو نەیانگەیاندووە ئەوە کەسێکی درۆزنەو بوختانی بۆیان کردوە(مفتری)، گومڕاو گومڕاکەرە، گومان دەخاتە دڵی خەڵکییەوە لەدینی خواداو لەهەڵگرانی دینی خوادا لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەو هاوەڵانی بەخیانەتکار تۆمەتبارکردوە، هەروەکو چۆن لە ڕێگای بیدعەکاراندا هەیە، هاوەڵان بە ناپاك (خائین)دەزانن و تۆمەتباریان دەکەن، بەمەبەستی ئەوەی ئەو هۆکارەی لەنێوان ئێمەو پێغەمبەری خوادایە(ﷺ) بپچڕێنن و نەیهێڵن، بۆیە دەبێ ئاگاداری ئەو جۆرە کەسانە بین و دەبێ ڕێزو پلەو پایەی هاوەڵان بزانین.

ئەم قورئانە لەکوێوە پێمان گەیشت؟

ئەم فەرموودانە؟

ئەم فیقهـ و تێگەیشتنە؟

ئیللا لەوەرگرتنی هاوەڵانەوە نەبێ ئەوانیش لەپێغەمبەری خوداوە(ﷺ)، ئەوان بوون هەڵیانگرت بۆ ئێمە، بەتەواوی بۆ ئێمەیان ڕیوایەت کرد، هەریەکەو بەگوێرەی ئەوەی خوای گەورە پێی بەخشیوە، هەریەکەو بەگوێرەی توانای خۆی، هیچ شتێکیان بەجێ نەهێشتوە لەدینی خوادا ئیللا گەیاندوویانە بەو شێوەیەی لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) وەریانگرتوە، ئەوانیش جێی متمانەن، چونکە خوای گەورە خۆی

ئـەوانی هەڵبـژارد بـۆ هـاوڕێتی پێغەمبەرەکـەی(ﷺ) و وەرگـرتن لەئـەوەوەو ڕیوایـەت کـردن لەئـەوەوە، خـوای گـەورە بـۆ ئـەوە هەڵیبـژاردوون، ئـەمجار کەسـێك دێـتو بـە کەمتەرخەم تۆمەتباریان دەکات! یان بەکەمو کوڕی تۆمەتباریان دەکات! ئەم قـسەیە هیچ کەسێك نایکات مەگەر کەسێکی گومڕای گومڕاکەر، دەیەوێ پەیوەندی نێـوان ئـەم ئوممەتەو هاوەڵان بپچڕێت، بەم شێوەیە پەیوەندی نیوانیانو پێغەمبەری خـودا (ﷺ) دەبچڕیێ، ئێمـە ئامـادەی مەجلیـسەکانی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) نـەبوین و گوێمـان لێ نـەبوە، لـەنێوان ئێمـەو ئـەودا چـەندین سـەدە هەیـە، جـا ئـەو هاوەڵـە بەڕێزانـە بـوون دەربارەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ ئێمەیان گەیاند، پلەو پایەی هاوەڵان لەدیندا پلەو پایەیەکی مەزنە، هـەرگیز تۆمـەتبار نـاکرێن بـەوەی ئـەوان شـتێکیان شـاردۆتەوە یـان شتێکیان شاردۆتەوەو ڕوونیان نەکردۆتەوە.

مەبەست لە: (فهو مبتدع ضال مضل محدث في الإسلام ما ليس منه).

ئەمـە مەبەسـتیەتی، شـتێکی نـوێ لەئیـسلامدا دروسـت بکـات لەئیـسلامدا نـەبێت، بەوەش ناتوانێت ئیللا مەگەر تانە بدات لەهاوەڵان و بەخیانەت کارو درۆزن بیانـژمێرێ، لەو کاتەدا ئەو لەخۆیەوە شتی نـوێ دادەهـێنێو دەڵێـت: ئەمـە ئـەو دینەیـە پێویـستە لەسـەرمان لەسـەری بـڕۆین، ئەمـە ئامـانجی ئەوانـە لـە بەدرۆخـستنەوەی هـاوەڵان و بەخیانەت ژماردن و بەکـەمزانینیان، هەرکـە هـەلێکیان بـۆ ڕەخـسا ئـەوا دینێکـی نـوێ لەخۆیانەوە دادەنـێن بـۆ خـەڵکی، بـەگوێرەی عـەقڵ و بۆچـوونی خۆیـان و لـە شـەیخە گومڕاکان و پێشەوا گومڕاکانەوە وەرگرین، ئەوانەی سـوننەتەکەی پێغەمبـەری خوایـان (ﷺ) گۆڕیوە بەدرۆ، چەندین شەیخ و سەنەدیان ساختە کـردوەو لـەخۆوە دروسـتیان کردووە بۆ سەرچاوەکانی ئیسلام، ئەم شتەش ئاشکرایەو لەکەلتورو بیرەکانیاندا هەیە.

بەڵام _سوپاس بۆ خـوا _ ئـەوە گومڕاییـەی بەدەسـتیانەوە مـاوە ئابڵوقـە دراوە، ڕونـاکی حـەق و ڕۆشـنایی وەحـی هـەموو ئاشـکرا دەکـات، ئـەو هـەموو درۆ زۆرەی لەکتێبەکانیاندا تۆمارکراوە هەموو ئاشکرا دەبێت.

**﴿١١﴾ واعلم -رحمك الله- أنه ليس في السنة قياس ولا تضرب لها الأمثال ولا تتبع فيها الأهواء بل هو التصديق بآثار رسول الله (ﷺ) بلا كيف ولا شرح، ولا يقال: لم؟ ولا كيف؟).**

واتە: بزانە _ڕەحمەتی خوات لێبێت_ هیچ (قیاس)ێك لەسوننەتدا نییە، نمونەشی بۆ ناهێنرێتەوەو شوێنی ئارەزووەکان ناکەوین، بەڵکو ئەوە تەنها باوەڕکردن و بەڕاست زانینی شوێنەواری پێغەمبەری خودایە (ﷺ) (فەرموودەکانی)، بە بێ چۆنیەتی و بەبێ ڕاڤە، هەرگیز ناگوترێت: بۆ؟ چۆن؟

ڕاڤە:

مەبەست لەسوننەت لێرەدا: عەقیدەیە، چونکە ئەم کتێبە دەربارەی عەقیدەیە، عەقیدەش سوننەتە، ئەم کتێبەش ناوی (شەرحی سوننە)یە، ناوی لێ نراوە سوننەت چونکە سوننەت بریتییە لە ڕێگا، عەقیدەش تەوقیفییە، هەرگیز جێگای زیادەی تێدا نابێتەوە، هەموو تەوەری باسەکە بریتییە لەوەی لەلایەن خوداو پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) هاتوە، هەرشتێك ناکۆك بوو لەگەڵ ئەوەی لە خوداو پێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتبوو ئەوە ناهەق و گومڕاییە، ئەمە مانای قسەی زانایانە کە دەفەرموون: (إن العقيدة توقيفية)، هەرگیز (قیاس)ی تێدا بەشدار نییە، چونکە (قیاس) لە بابەتە فیقهێکاندا هەیە، ئەوە (قیاس)ی تێدایە، ئەویش لەحوکمەکانی حەڵاڵ و حەرامدا، بەڵام مەسەلەکانی عەقیدە (قیاس) یان تێدا نییە، بەڵکو ئەوە بریتییە لەتەسلیم بوون و ملکەچ بوون بۆ ئەوانەی لە لایەن خوداو پێغەمبەرەکەیەوە (ﷺ) هاتووە بەبێ خۆتێهەڵقورتاندن.

مەبەست لە: (ولا تتبع فيها الأهواء).

واتە لەعەقیدەدا ناگوترێت ئەوەی لەگەڵ ئارەزوودا گونجاو وەردەگیرێ‌و ئەوەی لەگەڵ ئارەزوودا نەگونجا وەرناگیرێ، هەرروەکو ڕێگای گومڕاکاران، بۆیە پێیان دەگوترێت (أهل الاهواء)، خوای گەورە دەفەرموێت: (فَإِنْ لَّمْ يَسْتَجِيبُوا لَكَ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءَهُمْ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِنَ اللَّهِ (٥٠) القصص) واتە: خۆ ئەگەر وەڵامیان نەدایتەوە، ئەوە بزانە ئەوانە هەر پەیڕەوی لە ئارەزووی خۆیان ئەکەن، چ کەسێ گومڕاترە لەو کەسەی پەیڕەوی هەواو ئارەزووی خۆی کردووە، بێ ئەوەی هیچ ڕێنوێنێکی لەخواوە هەبێ؟).

جا هەر کەسێك تەسلیمی عەقیدە جێگرو سابتەکە نەبێت کە لە کیتاب و سوننەتدا هاتوە ئەوا ئەو کەسە شوێنی ئارەزووی خۆی کەوتوە، بۆیە بە بیدعەکاران لەعەقیدەدا دەگوترێت: (أهل الاهواء) چونکە ئەوانە شوێن ئارەزووەکانیان کەوتوون هەروەکو لەئایەتەکەدا هاتووە: (وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِنَ اللَّهِ (٥٠)القصص).

مەبەست لە: (بل هو التصديق بآثار رسول الله (ﷺ) بلا كيف ولا شرح ولا يقال لم ولا كيف).

واتە: تەسلیم بوون بۆ قسەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەناوو سیفەتەکانی خواداو لەبابەتەکانی عەقیدەدا.

(بلا شرح) واتە بەبێ ڕاڤەیەك لەگەڵ مانا تەواوەکەیدا ناکۆك بێت، ئەویش ڕاڤەیەکە لەگەڵ مەبەستی دەقەکاندا جیاواز بێت، ئەمەش لای (الجهمية) و(المعتزلة) و(الاشاعرة) بڵاوە، وەکو ئەوەی دەڵێن: مەبەست لە دەست (اليد): توانایە، مەبەست لە ڕوو (الوجه): زاتە، مەبەست لە (الاستواء): دەست بەسەرا گرتنە، ئەمە ڕاڤەیەکی ناڕەوایە، ئەمە مەبەست و مانای ئەو دەقانە نییە، مەبەست لە: (بلا شرح) واتە: بە بێ ڕاڤەیەکی ناڕەواو ناحەق، بەڵام ڕاڤەکردنی بە مانای ڕوونکردنەوەی مانا تەواوەکەی ئەوا حەقە.

**﴿١٢﴾ فالكلام والخصومة والجدال والمراء محدث يقدح الشك في القلب، وإن أصاب صاحبه الحق والسنة).**

واتـە: جـا قـسەو وتـن (الكـلام) و نـاكۆكی و دوژمنايـەتی (الخـصومه) وگفـتو گۆو(الجدال)مشتومڕ و(المـراء) هـەموو داهێنـراون گومـان دەخەنـە دڵـەوە، هەرچـەندە خاوەنەكەی حەق و سوننەت بپێكێ.

ڕاڤە:

ئـەم كارانـە: قـسەو وتـن (الكـلام) و نـاكۆكی و دوژمنايـەتی (الخـصومه) وگفـتو گۆو(الجدال) كە لـەنێوان گـروپ و كۆمەڵەكانـدا ڕوويانـداوه هـەموو داهێنـراون، ئـەوەی بوەتە هۆكاری _پـەیدابوونی _ شوێنكەوتنی ئارەزووەكانە، هەركەسەی ئارەزووەكـەی شوێنكەوتەی ئەوە بێت پێغەمبەری خودا (ﷺ) هێناویەتی ئەوە هەرگیز هیچ گومان و مشتومڕ (میرا) و ناكۆكی و دوژمنایەتی (الخصومه) وگفتو گۆو(الجدال) ی بۆ دروست نابێت، چونكە ئەو تەسلیم بووەو گوێڕایەڵە،خوای گەورە دەفەرموێت: (فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ مِنِّي هُدًى فَمَنْ تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ (٣٨) البقرة) واتـە: ئەوسـا هەركـە لەلايەن منەوە ڕێ نیشاندەرێكتان بۆ هات دەبـێ پـەیڕەوەی لێ بكـەن جـا هەركەسـێك پەیڕەوی لەهیدایەتو ڕێ نیشاندەری منی كرد ئیتر نە هیچ تـرس و بیمێكیـان دەبـێ و نەچاو لەدوایش دەبن و خەفەت بخۆن بۆ پاشە ڕۆژیان).

دەفەرموێت: (فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَى (١٢٣)طه) واتە: ئەوەی پـەیڕەوی لەڕێنمایی منی كرد ئیتر نە لە دونیادا گومڕا ئەبێ و نـە لەقیامەتیشدا بەدبـەخت ئـەبێ بەسزا).

مەسەلەکە مەسەلەی شوێنکەوتن‌و ملکەچ بوون‌و تەسلیم بوونە بۆ فەرمانەکانی خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بەبێ ناکۆکی و دوژمنایەتی (الخصومه) وگفتوگۆ(الجدال).

گومڕاکاران نەکەوتونەتە ناو (الخصومات) و(الجدال)ەوە تەنها هۆکاری ئەوەیە تەسلیمی فەرمانەکانی خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) نەبوون، هەروەکو چۆن ئەهلی سوننەو جەماعەت تەسلیمی بوون، بۆیە دەبینی ئەهلی سوننەو جەماعەت _سوپاس بۆ خوا_ یەکگرتوون‌و لەنێوانیاندا هیچ ناکۆکیەکیان نییە لەبابەتەکانی عەقیدەدا، بەڵکو جیاوازی‌و ناکۆکی لە ناو گروپە گومڕاکاندا بوونی هەیە، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللَّهُ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ (١٣٧)البقرة) واتە: خۆ هەر لە هەق پشتیان هەڵکردوو باوەڕیان نەهێنا، دیارە لە هەق و ڕاستی لایانداوە لە دژایەتیدان ئەوسا تۆش ئەی موحەمەد (ﷺ)! هەر خوات بەسەو، لە ئازارو بێزاریان دەتپارێزێت و زاڵت دەکات بە سەریاندا، زۆریش بیسەرو فرە زانە، واتە بە هەموو سرپەو چرپەیەکیان ئاگادارە.

پشت ڕاستکەرەوەی ئەمە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێت: (وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ (١٥٣) الانعام) واتە: مەکەونە شوێنی ڕێچکەکانی تر، ئەوسا لەشاڕێگەکەی خوا بترازێن و پەراگەندە ببن ئەوانە گشت وەسیەت و ڕاسپاردەو ئامۆژگاری خوان، دەسا بەڵکو ئێوەیش بیانپارێزن‌و سنوور شکێنی نەکەن).

مەبەست لە:(وإن أصاب صاحبه الحق والسنة).

واتە: ئەو هەڵەی کردوە، چونکە ڕاستەکەی پێکا بە ڕێگایەك جگە لەڕێگا ڕاستەکە، چونکە ڕێگای ڕاست بریتییە لە: تەسلیم بوون‌و نەچوونە نێو (الجدال و المراء)ەوە کە

دڵەكان ڕەق دەكەن و ڕق و كینە دروست دەكەن، شتی تر دروست دەكات لە هەموو ئەوانە توندترە ئەویش بریتییە لە: (بەكافردانانی یەكتر)، چونكە گروپە گومڕاكان یەكتر كافر دەكەن و یەكتر گومڕا دەكەن (كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ (٣٢)الروم) واتە: هەر پارت و گروپێك بەبەرنامەو بیرو باوەڕی خۆیان دڵخۆشن).

هەر یەكە لەوانە وادەزانێت تەنها ئەوەی ئەو لە سەریەتی ڕاستە، بەڵام ئەهلی سوننەت و جەماعەت ئەوانەی تەسلیم بوونەو ملكەچ بوون ئەوانە _سوپاس بۆ خوا_ دووبەرەكی و ناكۆكی لەنێوانیاندا ڕووی نەداوەو یەكتر بەكافر نازانن و یەكتر گومڕا ناكەن، بەڵكو ستایشی یەكتر دەكەن، چاو لە یەكتر دەكەن، چونكە ئەوان لەسەر ڕێگای ڕاستن، ئەو هەموو ڕق و كینەو بەكافر دانانی یەكترو بەگومڕا زانین یەكتر دروست بوە بە هۆی جیاوازییانە لەگەڵ حەقداو شوێن كەوتنی بۆچوون و بیرۆكەكانە، گومانی تێدا نییە هەریەكە دەیەوێت بۆچوونەكەی خۆی سەربخاتو ڕازی نییە بەوەی پێی بڵێی: تۆ هەڵەی، ئەگەر وا بڵێیت ئەوە مانای ئەوەیە تۆمەتباری عەقڵی ئەوت كردووە بەكەم وكووڕی، ئەویش بەمە ڕازی نابێت، بەڵام ئەگەر بە خاوەن حەقێك گوتت _ئەگەر هەڵەیەكی كرد_: تۆ بە هەڵە لە بەڵگەكە تێگەیشتوی، بە هەڵە لەسوننەت تێگەیشتوی، ئەوا ئەو ڕازی دەبێت، چونكە مەبەستی ئەو تەنها حەقە، مەبەستی سەرخستنی ڕاو بۆچوونی خۆی نییە، ئەگەر گوتت: ئەی فلان تۆ هەڵەت كردوە لەسوننەتدا، هەڵەت كردوە لە بەڵگەكەدا، ئەوا ئەو ڕازی دەبێت و لەقسەی خۆی دەگەڕێتەوە، بەڵام ئەگەر بە خاوەن ئارەزووت گوت: تۆ هەڵەت كرد، ئەوا ئەو تووڕە دەبێت و پەست دەبێت، ئەمەش نیشانەی ئەهلی ئارەزووەكانە، هەریەكە لەوانە دەیەوێ ئارەزووەكەی خۆی سەربخات، بەڵام شوێنكەوتەی حەق دەیەوێت حەق سەربخات و بەدوای حەقدا دەگەڕێت، حیكمەتیش شتە بزرەكەی ئیماندارە هەركاتێك دۆزییەوە دەیبات.

**﴿١٣﴾ نوسەر دەڵێت: (واعلم -رحمك الله- أن الكلام في الرب تعالى محدث، وهو بدعة وضلالة، ولا يتكلم في الرب إلا بما وصف به نفسه -عز و جل- في القرآن وما بيَن رسول الله (ﷺ) لأصحابه فهو -جل ثناؤه- واحد (لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ (١١) الشورى).**

واتە: بزانە _ڕەحمەتی خوات لێبێت _ کەوا قسەکردن دەربارەی پەروەردگار باسێکی نوێیە، ئەویش داهێنراوو گومڕاییە، نابێت دەربارەی پەروەردگار قسە بکرێت ئیللا بەو شێوە نەبێت خۆی وەصفی خۆی کردووە لە قورئانداو پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ هاوەڵانی ڕوونی کردوەتەوە، ئەو_ ستایشی بەرزو پیرۆز بێت_ تەنهایە (لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ (١١) الشورى).

**﴿١٤﴾ ربنا أول بلا متى، وآخر بلا منتهى، يعلم السر وأخفى، وهو على عرشه استوى، وعلمه بكل مكان، ولا يخلو من علمه مكان.**

**واتــە: پــەروەردگارمان یەکەمینــە، بــەبێ کــەی؟ دواییینــەو بــەبێ کۆتــایی، نهێنــی و ئاشکراکان دەزانێ، ئەو لەسەر عەرشەکەی خۆی ئیستوای کرووەو ئاگادارە بەهــەموو جێگایەكو هیچ جێگایەك نییە لەعیلمی ئەودا نەبێت).**

**ڕاڤە:**

**مەبەست لە:** (أن الكلام في الرب تعالى محدث، وهو بدعة وضلالة).

**واتــە: قــسەکردن دەربــارەی زاتــی خــوای گــەورە لــەناوو ســیفەتەکانیدا کــارێکی داهێنراوە، گومڕاکان دایانهێناوە ئەوانەی تەسلیمی دەقەکان نەبوون و لەخوا ناترسـن، ئەوانە قسە دەکەن دەربارەی زاتی پەروەردگارو دەربارەی ناوو سیفەتەکانی، نکۆڵی و نەفی ئەوە دەکەن خوای گەورە بۆ خــۆی ســەلماندویەتی یــان ئــەوەی پێغەمبەرەکــەی (ﷺ) بۆی سەلماندوە، لەخۆیانەوە ڕاوبۆچوون دەهێـنن و دەڵێن: ئەمــە ڕاستــەکەیە، دەربــارەی تەفــسیری دەقــەکان قــسەدەکەن بــەبێ تەفــسیرەکەی خــۆی، یــان ئــەوان دەڵێن:_ ئێمە لێـی تێناگـەین و دەیگێڕینــەوە بـۆلای خــوا، واتــە قــسەی خــواو قــسەی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) وای لێ دێت وەکو قسەی کەسێکی عەجەم کە کەسێکی عــەرەب لێی تێ ناگەن، جا پێویستە لەســەر موسـڵمانان بــەردەوام بـن لەســەر ڕێگــا ڕاستــەکە، لەسەر ڕێگای سەلەف، ڕوو نەکەنە ئەو گومڕاکەرانە، ئەوانەی موجادەلە دەربارەی خوا دەکەن بەبێ هیچ زانستێك هەیانبێت، موجادەلە دەکەن دەربارەی قورئـان، موجادەلــە دەکەن دەربارەی سوننەت، ئیش و کاریان تەنها موجادەلەیە، ئەوانــە پێویــستە لێیــان بە ئاگابین، ئەوانە شـوێنکەوتە نـین، بــەڵکو ئــەوان داهێنــەرنو شــوێنی ئارەزوەکانیــان کەوتوون.**

مەبەست لە: (ولا يُتكلم في الرب إلا بما وصف به نفسه عز و جل في القرآن).

کاتێ نەهی کرد لە موجادەلە کردن دەربارەی خوای گەورەو مشتومڕ کردن لەناوەکانی خواو سیفەتەکانی، ئەمجار ئەوەی پێویست بێت ڕوونی کردەوە، ئەویش بریتییە لە:- دان بەوەدا بنێین لە قورئان و سوننەتدا هاتوە، بەو مانایەی لە زمانەوانییەوە وەرگیراوە ئەو زمانەی قورئانو سوننەتی پێ دابەزیوە، جا (عیلم) ماناکەی لەزماندا دیارە، هەروەها مانای (الوجه) ڕوون و ئاشکرایە، چاوو دەست و ئیستوا و بەرزی، هەموو ئەمانەو هاوشێوەکانیان ماناکانیان دیارە لەزمانی عەرەبیدا، ئەو زمانەی قورئانی پێ دابەزیوە، بەڵام گومڕاکاران دەڵێن: مانای ئەم قسانە بەڕواڵەتەکەی نییە، بوون بەدوو بەشەوە:

- بەشێکیان وتیان: ڕادەوەستینو دەڵێین: مەبەستی ڕواڵەتی ماناکەی نییە، مەبەستی تێناگەین، جا ئەوانە پێیان دەگوترێ (المفَوِّضة).
- بەشێکی تر (المؤَوِّلة)ن _ ئەوانەش زۆرترن_ مانا ڕاستەکەی تەئویل دەکەن بە مانایەکی ناراست.

بۆیە خۆیان گومڕابوون و خەڵکیشیان گومڕا کرد و خەڵکیان سەرقاڵ کردوە، کتێبەکانیان پڕ کردووە لەو چەلەحانێ و تێڕوانینانە بەبێ هیچ سوودێك.

بۆیە پێویستە تەسلیمی ئەوە بین لەقورئان و سوننەتدا هاتوە لەناوو سیفەتەکانی خوا، بەپێی مەبەستی خوا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ)، چونکە خوای گەورە خۆی لەهەموو کەس زیاتر دەربارەی خۆی دەزانێ، لە هەموو کەس زیاتر دەربارەی جگە لەخۆیشی دەزانێ، هەروەها شارەزاترین دروستکراو دەربارەی خوای گەورە بزانێ پێغەمبەری خوایە (ﷺ)، بەڵام ئێمە زانستەکەمان کەم و نوقصانە، ئێمە تەنانەت زۆر

نازانین دەربارەی خۆمان لەو دەمارو هەست و وردەکاریانە، شتی زۆر هەیە ئێمە نایزانین، ئایە دەزانی (ڕوح) چییە؟ عەقڵ چییە؟ ئەگەر دەربارەی جەستەی خۆت و نەفسی خۆت نەزانی، چۆن قسە دەکەیت دەربارەی زاتی خوا؟ کە هیچ کەسێك دەربارەی نازانێت تەنها خۆی نەبێت: (يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِ عِلْمًا (١١٠) طه) واتە: خوا بەهەموو ئەو شتانە دەزانێت ئەوان پێشیان خستووەو کردویانە لەدونیادا، هەروەها بەو شتانەش چاك دەزانێت لەڕۆژی دوایدا چاوەڕێیانە ئەوان بەزانین و عیلم ناتوانن دەورە بدەن بە بەڕێوەبردنو حیکمەتی خوا).

ئەمە لەدەرەوەی زانیاری و بۆچوونی ئەوانە، خوای گەورە بەدروستکراوەکانی (قیاس) ناکرێت، ئەمە لەکەمکردنەوەی ڕێزو شکۆمەندیو قەدری خوای گەورەیە، جا ئەو لەهەموو کەس شارەزاترە دەربارەی خۆی و جگە لەخۆی، لە هەموو کەس ڕاستگۆترە، قسەکانی لەهەموو دروستکراوەکانی چاکترە، هەروەکو (شیخ الاسلام) لە کتێبی(الواسطیة)دا فەرموویەتی.[٣٩]

مەبەست لە: (وما بيَّن رسول الله (ﷺ) لأصحابه).

تەوەری باسکردنی ناوو سیفەتەکان تەنها قورئان و سوننەتە، تەفسیری ناوو سیفەتەکان تەنها لەقورئان و سوننەتدا هەیەو لە زمانی عەرەبیدا کە قورئانی پێ دابەزیوە، ئێمە ناڕۆین بۆ لای مەنتیقی ئەرستۆو ئەفلاتۆن و فلان و عەلان، چونکە ئەمە جۆرێکە لە تاوانکردن بەرانبەر شەریعەتەکەی خوای گەورە.

لە گۆڕینی وەحی بەمەنتیق و عیلمی کەلام، عیلمی کەلامو مشتومڕ چی بەرهەمێکی هەبوو بۆ ئەوانە جگە لەگومڕایی و خەسارەتمەندی؟ کەچی نەگەیشتنە ئەنجام، ئەمەش بەپێی دان پێدانانی خۆیان.

---

٣٩ / العقيدة الواسطية : (ص ٧) .

هەموو تەمەنی خۆیان بەسەربرد بەمشتومڕو دژایەتی و لە کۆتایی باسەکەیاندا دانیان بەوەدانا بەئەنجام نەگەیشتوون، جا ئەگەر ئەوان تەسلیمی خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بن ئەوا دەرباز دەبوون.

بۆیە یەکێکیان دەڵێت کە (الفخر الرازی)[٤٠] یە:-

| | |
|---|---|
| نهاية إقــدام العقول عقــال | وأغلب سعي العالمين ضلال |
| وأرواحنا في وحشة من جسومنا | وحــاصل دنيانا أذىً ووبال |
| ولم نستفد من بحثنا طول عمرنا | إلا أن جمعنا فيه قيل وقالوا |

ئەوان هەر لە دوودڵیو گوماندا مانەوە، بەڵام ئەوانەی تەسلیمی خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بوون ئەوا لەوە دەرباز بوون.

هەروەها یەکێکی تر لە گومڕاکان دەڵێت:-

| | |
|---|---|
| لعمري لقد طفتُ المعاهد كلها | وسيّرت طرفي بين تلك المعالم |
| فلم أرَ إلا واضعاً كف حــائر | على ذقت أو قارعاً سن نادم[٤١] |

هەموو پەیمانگاکان گەڕاوە، پەیمانگای کەلام و مەنتیق و جیدال، چاوی بڕیوەتە نێوانی و کەچی شتێکی نەدۆزیوەتەوە دەروونی ئارام بکاتەوە (وەڵامی پرسیارەکانی بداتەوە) دەڵێت[٤٢]:- زۆر بەڕێگاکانی کەلام و بەرنامە فەلسەفییەکاندا تێڕوانیم،

---

٤٠ / منهاج السنه : (٥/ ٢٧١) .

٤١ / ئەم دوو بەیتە هی شەهرستانییە تەماشای منهاج السنه بکە : (٥/ ٢٧٠) .

٤٢ / قسەی فخر الرازی یە تەماشای کتێبی (النبوات) بکە لە دانانی شیخ الاسلام (ص / ١١٧) .

نەمبینی چارەسەری نەخۆشی بکات و تێنووێتی بشکێنێ، بینیم نزیکترین ڕێگا ڕێگای قورئانە.

دەربارەی سەلماندن ئەو ئایەتە بخوێنەوە:

(إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ (١٠) فاطر) واتە: هەموو وشەیەکی پیرۆزو پاك بۆ لای خوا سەر ئەکەوێ).

(الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى (٥) طه) واتە: ئەو خوا بەخشندەیە چوویە سەر عەرشی خۆی).

دەربارەی نەفی ئەو ئایەتە بخوێنەوە:

(لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ (١١) شورى) واتە: هیچ شتێك نییە لەوێنەی ئەو (خوا)یە)

(وَلَا يُحِيطُونَ بِهِ عِلْمًا (١١٠) طه) واتە: ئەوان بەزانین و عیلم ناتوانن دەورە بدەن بەبەڕێوەبردن و حیکمەتی خوا).

مەبەست لە: (فهو _جل ثناؤه_واحدٌ ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ (١١)﴾.

ئەو _ پاك و بێ گەردی بۆ ئەو_ تاك و تەنهایە، هیچ کەسێك بەشداری ئەو ناکات لەزات و ناوو سیفاتیدا، نەلەدروستکردن و کارەکانیشیدا، نەلە پەرستنیدا، ئەو هیچ شەریکێکی نییە، چیتر بۆ خۆت ماندوو دەکەیت؟ تۆ دروستکراوی و ئەویش دروستکارە؟ ئایە چۆن دروستکراو پەی بە دروستکارەکەی دەبات؟ بواری تۆ تەنها ئەوەیە تەسلیمی خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بیت، چیتر موجادەلەو دەمەقالێ مەکە، خۆت و خەڵکی تر ماندوو مەکە، ئەمە (واجب) پێویست و فەرزە، بۆیە هاوەڵانی

پێغەمبەر (ﷺ) ئەم تەکلیفەیان لە خۆیان نەدەکرد، لەبەرانبەر هیچ ئایەت و فەرموودەیەکدا نەدەوەستان، بەڵکو دانیان پێدا دەناو تەسلیمی دەبوون و باوەڕیان بەوە هەبوو تێیدایە، هەرگیز کێشەیان نەبوو چونکە بوارەکە بواری ملکەچی و تەسلیمبوونە، ناچینە نێو ئەو بیروباوەڕانەی ئەهلی جیدال و کەلام و مەنتیق، ئەنجامەکەی _ هەروەکو خۆیان دانیان پێدا نا_ دوودڵی و سەرسام بوونەو نەگەیشتنە بە ئەنجام هەروەکو یەکێکیان دەڵێت:-

(لە لێکۆڵینەوەکانماندا هیچ سوودمان وەرنەگرت بەدرێژایی تەمەنمان تەنها ئەوەمان کۆکردەوە: وتیو وتیان، فلان وتی و فلان وتی، ئەگەر وایگووت ئەوا وەڵامەکەی بەم شێوەیە).

مەبەست لە: (ربُّنا أول بلا متى، وآخر بلا منتهى).

خوای گەورە یەکەمینەو بەبێ سەرەتاو دواینەو بەبێ کۆتایی، خوای گەورە دەفەرموێت: - (هُوَ الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ (٣) الحديد) واتە: هەر ئەویشە یەکەم کە هیچ شتێك لەپێشییەوە نییە، دوا هەمینیش هەر ئەوە کەهیچ لەدوایەوە نییەو بوونی ئاشکرا بەبەڵگەکانی هەر ئەوە، واتە لەژوور ئەوەوە ئاشکراتر نییەو پەنهان بەهەقیقەت و کونهی لەدروستکراوەکانی،ئەوە کەلەو پەنهانتر نییە).

چەند ناوێکی بەرانبەر بەیەك، (الاول) بەرانبەرەکەی (الاخر)ـە، (الظاهر) بەرانبەرەکەی (الباطن)ـە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو ئایەتەی تەفسیرکردوە لە فەرموودەیەکداو دەفەرموێت: (أنت الأول فليس قبلك شيءٌ، وأنت الآخر فليس بعدك

شيءٌ، وأنت الظاهر فليس فوقك شيءٌ، وأنت الباطن فليس دونك شيءٌ)[٤٣] واتـە: تـۆ یەکـەم کەسێکیتو هیچ کەسێك لە پێش تۆ نەبووەو تـۆ دوایـین کەسـێکیتو هـیچ کەسـێك لـە پاش تۆ نییە، تۆ خاوەن دەسەڵاتو شکۆمەندیو هیچ کەسێك لە سەرووی تۆوە نییـە، هەر تۆ پەنهانیو جگە لە تۆ کەس لە وردەکارییەکان ئاگادار نییە).

ئەمە تەفسیری پێغەمبـەری خودایـە (ﷺ) پاشـان کەسـێکی تـر دێت بەشـێوەیەك تەفسیری دەکات جیاواز لەتەفسیرەکەی پێغەمبەری خوداو (ﷺ) دەڵێـت:– مەبەسـت لە (الظاهر) ئەوەیە بۆ عەقڵەکان دەرکەوت و بەبەڵگەکان دەرکەوت، مانـای ئـەوە نییـە ئـەو لەسـەرووی دروسـتکراوەکانییەتی یـان ئـەو بـەرزە بەسـەر عەرشـدا، ئـەم قـسەیە قـسەیەکی پووچـەڵە، جیـاوازە لەگـەڵ تەفـسیرەکەی پێغەمبـەری خـوادا (ﷺ)، شـارەزاترین کـەس دەربـارەی خـوا پێغەمبـەری خودایـە (ﷺ)، ئـەم ئایەتـەی بەتەفـسیرێکی ڕوون تەفـسیر کـردووە، (الاول) ئـەو کەسـەیە هـیچ شـتێك پێـشی ئـەو نەبوە، (أول بلا بداية). (الاخر) ئـەو کەسـەیە هـیچ شـتێك لـەپاش ئـەو نییـە، (آخر بلا نهاية). (الظاهر) ئـەو کەسـەیە هـیچ شـتێك لەسـەرەوەی ئـەو نییـە، لەسـەرووی دروستکراوەکانییەتی، (وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ وَهُوَ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ (١٨) الانعام) واتـە: هـەر خۆشیەتی زاڵو دەسـت ڕۆیـشتوو بەسـەر هـەموو عەبدەکانیـدا هەرئەویـشە لـەکارزانو کارجوانو بەئاگایە).

(وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ وَيُرْسِلُ عَلَيْكُمْ حَفَظَةً) الانعام/٦١) واتـە: هـەر خۆیـەتی زاڵ و دەسەڵاتدار بەسەر بەندەکانیدا فریشتەی چاودێرو پارێزەریشتان لەسەر دائەنێ).

خاونی زاتێکی بـەرزەو قـەدرێکی بـەرزەو زاڵ بـوونێکی بـەرزە، (وأنت الباطن فليس دونك شيءٌ) واتە: ئەو هەموو شتێك دەزانێ، هیچ شتێکی لێ ناشاردرێتەوە، ئەو لەگـەڵ

---

٤٣ / أخرجه مسلم (٢٧١٣) .

ئەوەی بەرزە بەسەر دروستکراوەکانیدا هیچ شتێکی لێ ناشـاردرێتەوە ئـەوەی لـەناخ و لەسنگەکانیاندا دەیشارنەوە، (إِنَّ اللَّهَ لَا يَخْفَى عَلَيْهِ شَيْءٌ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ (٥) ال عمران) واتە: نە لە زەوی نە لە ئاسمان هیچ شتیك لە خوا شاراوە نییە ئاگاداری هەموو دەغدەغەو خەتەراتی دڵەکانیشە).

ئەمجار کەسێك دێت و دەڵێت: — خوای گەورە نە لەسەرەوەیەو نـە لەخوارەوەیـە، نە لای ڕاستو نە لای چەپە، نە لەناوەوەی جیهانەو نە لەدەرەوەی جیهانـە، جـا ئەمـە مانای وایە ئەو بوونی نییە، هەروەکو لەکتێبی زانایانی ئەهلی کەلامدا هاتوە.

مەبەست لە: (يعلم السر وأخفى، وهو على عرشه استوى).

مانای ئەوەیە زاناو شارەزایە بـەوەی لەزەویـدا هەیـەو بـەوەی لـەژێر زەویـدا هەیـەو لەژێر خاكو خۆڵدایە، ئەمەش جیاواز نییە لەگەڵ ئەوەی لەسەرەوەی عەرشـە، چـونکە خوای گەورە شارەزایە بە وردەکارییەکانی هەموو شتێكو هیچ شتێك شارەزاو ئیحاتەی زاتی ئەو ناکات، هـەموو دروسـتکراوەکان بەنیـسبەت ئـەوەوە بـچووکە هـەروەکو هـیچ شتێك نـەبووبێت، ئـەو مەزنـە، گەورەیـە، بـەرزو بڵنـد، شـکۆمەندە، لـە گـەڵ خۆمانـدا بـەراوردی ناکـەین، (وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ (٦٧) الزمر) واتـە: ئەوانـە وەکـو پێویـست خوایـان نەناسـی و ڕێزیـان لـێ نـەگرت، ئـەگینا چۆن هاوەڵیـان بـۆ دادەنـا؟ لـە ڕۆژی قیامەتدا زەوی هەموو لە ناودەستی ئەودایەو ئاسمانەکانیش پێچراونەتەوەو بە دەستی ڕاستیەوەن، خوا پاك و بڵندە لەو شتانە ئەوان ئەیکەنە هاوبەشی).

دروستکراوەکان بەنیسبەت ئەوەوە وەکو نەبوونە، هەرچەندە لەچاو خەڵکیدا مـەزن بێت بەڵام بەنیسبەت ئەوەوە وایە هیچ شتێك نەبێت بەرانبەر مەزنی ئەو، بـەڵام ئەوانـە

وەکو پێویست خوایان نەناسی و ڕێزیان لێ نەگرت کاتێ نکۆڵییان لەدەسەڵات وتواناو مەزنی ئەو کرد، (يَا أَيُّهَا النَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَاسْتَمِعُوا لَهُ إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ لَنْ يَخْلُقُوا ذُبَابًا وَلَوِ اجْتَمَعُوا لَهُ وَإِنْ يَسْلُبْهُمُ الذُّبَابُ شَيْئًا لَا يَسْتَنْقِذُوهُ مِنْهُ ضَعُفَ الطَّالِبُ وَالْمَطْلُوبُ (٧٣) مَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ (٧٤) الحج) واتە: ئەی خەڵکینە! نموونەیەك هێنراوەتەوە دەسا ئێوەیش چاك گوێی بدەنێ بەڕاستی لەخوا بەدەر ئەوانەی ئێوە ئەیان پەرستن و هاواریان بۆ دەبەن هەرگیز ناتوانن تەنها مێشێکیش بەدی بێنن، ئەگەر چی هەموویشیان کۆببنەوە نەك هەر ئەوەندە ناتوانن وە ئەگەر ئەو مێشە لاوازەش شتێك لەخۆیان و خواکانیان بت، گروپ، مرۆ بفڕێنێ ناتوانن پێی بزانن و لێی بسێننەوە لەڕاستیدا هەم داواکارو هەم داوا لێکراو زۆر لاوازو بێ توانان (٧٣) ئای بێ بڕوایان چەندە سپڵەن چونکە بەو جۆرەی کەدەبێ خوا بناسن و ڕێزی لێ بگرن نەیان ناسیوە، بەڕاستی خوا زۆر بەهێزەو زاڵە (٧٤).

مەزنی و تواناو شکۆمەندی خوایان نەناسی، چونکە ئەوانە بەراوردی ئەو دەکەن لە گەڵ خۆیاندا، بۆیە لە قەدری خوای گەورەیان کەم کردەوە.

ئەگەر ئێوە هەر هەمووتان لەیەکەم کەستانەوە تاکو دوایین کەس، جنۆکەو مرۆڤەکانتان، ئەگەر کۆبوونەوە بۆ ئەوە تەنها مێشولەیەك دروست بکەن_ کە لە هەموو شت کەمترە_ ئەوا ناتوانن، بەتایبەتی ئەوانەی داوایان لێ دەکەن و بانگیان دەکەن جگە لەخودا لەخواکان و پەروەردگارەکانتان، (لَنْ يَخْلُقُوا ذُبَابًا وَلَوِ اجْتَمَعُوا لَهُ) ئەگەر زیرەکترین پزیشکەکان و شارەزاکانی جیهان و پیشەوەرەکان و داهێنەرەکان کۆ بکەیتەوەو پێیان بڵێیت:- تەنها مێشێکمان بۆ دروست بکەن ئەوا ناتوانن، هەرچەندە ئەوان دەتوانن پاپۆڕی زۆر گەورە دروست بکەن، فڕۆکەخانەی تێدایەو فڕۆکە هەڵدەگرێ، فڕۆکەی گەورە دروست دەکەن، ئەوان دەتوانن ئەو شتانە دروست بکەن،

بەلام دروستکردنی مێشێك و ڕوحی پێدا بکەن، ئەوا هەرگیز ناتوانن، ئەوا وێنەی مێشێك دەکێشن و وێنەی مرۆڤ، شێر، لەنمونەی ئەوانە، بەلام ناتوانن وای لێ بکەن ڕێ بکات و قسەبکات، ئەوان تەنها پلان دادەنێن بەلام ڕوح پێداکردن ئەوە کاری خودایە، ئیتر چۆن دروستکراو بەدروستکار بەراورد دەکرێت؟ عەقڵەکان و خەیاڵەکان پێی ناگەن و بیرو فکرەکان نازانن چۆنە.

مەبەست لە: (يعلم السر وأخفى، وهو على عرشه استوى).

هیچ جیاوازو دژ یەك نین خوای گەورە ئیستوای کردوە لەسەر عەرشی خۆی لەگەڵ ئەوەی نهێنی و ئاشکراکان دەزانیٚ، بۆیە ناگوترێت: ئەگەر ئەو ئیستیوای کرد لەسەر عەرشەکەی خۆی ئەوا دوورە لەخەڵکیەوە، نابیسێ و نابینێ ئەوە لە یەکچواندنە لەنێوان پەروەردگارو دروستکراوەکاندا.

جاخوای گەورە شتەکان لای ئەو وەك یەکە، هیچ شتێکی لێ ناشاردرێتەوە، نزیك و دوور، یەکەمین دروستکراوەکان و دواییەنەکەی، دونیاو دواڕۆژ، هەموو شتێك لەعیلمی خوادایە، بۆیە ئەم گەردوونە مەزنە تەنها ئەو بەرێوەی دەبات بەتواناو ویست و دەسەلاتی خۆی: (إِنَّ اللَّهَ يُمْسِكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ أَنْ تَزُولَا وَلَئِنْ زَالَتَا إِنْ أَمْسَكَهُمَا مِنْ أَحَدٍ مِنْ بَعْدِهِ إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا (٤١) فاطر) واتە: بەڕاستی خوا ئاسمانەکان و زەویی ڕاگرتووە تا لەگێرەژنە دەر نەچن وەئەگەر بترازابان لەیەك، لەپاش ئەو کەسێکی تر نەبوو ڕاگیریان بکا. بەڕاستی ئەو زۆر لەسەر خۆیە،پەلە ناکات بۆ سزادان، زۆریش خەتا پۆش و لێبوردەیە).

جووڵەو ڕۆیشتنی بوونەوەر و خۆرو مانگ، بەپێی ئەو ژماردنە وردەیە هەرگیز دوا ناکەوێت، هەڵە ناکات، ئەمە کێ بەو شێوە جوانە ڕێکی خستوە؟ ئەوە تەنها خودایە.

مانگو ئەستێرەکان بەو شێوە ڕێکە دێنو دەچن، تاکو ئەو کاتەی خوای گەورە خۆی ویستی لەسەر بێت و کۆتایی ئەم دونیا دێتو گواستنەوە بۆ دواڕۆژ، خوای داناو زانا ڕێکی خستوە.

خەڵکی کاتێ ئامێرێکی ورد دەبینن سەرسام دەبن بەو ئامێرە دروستکراوەو دروستکارەکەی، لەکاتێکدا ئەو شتە پارچەیەکی بچووکە...

ئەی چۆنە دروستکردنی هەموو ئەم گەردوونە گەورە کە هەرگیز دوا ناکەوێت؟

کێ یە ئەو کەسە فراوانی دەکات؟

کێ یە ئەو کەسەی دەیپارێزێ؟

کێ یە هەموو ئەو گەردوونە دەپارێزێ و نایگۆڕێتو دواناکەوێتو هەرگیز هیچ شتێکی لێ کەم ناکات؟

ئەوە تەنها خوای گەورەیە.

ئەم دروستکراوانە بە بچووك و گەورەوە، کێ ڕزق و ڕۆزی بۆ دابین دەکات؟

دروستکراوێکی زۆر، کێ ڕزق و ڕۆزی بۆ دروست دەکاتو هەریەکەو بەپێی پێویستو حاڵی خۆی؟

ئەوە تەنها خوای گەورەو دلۆڤانە.

بۆیە پێویستە تەسلیمی ئەوە بین کە لە خوداوە هاتوە، چونکە ئەو لەهەموو کەسێك زیاتر خۆی دەناسێ، هەروەها تەسلیمی ئەوە بین لە پێغەمبەری خوداوە

(ﷺ) هـاتوە، چـونکە پێغەمبـەر (ﷺ) شـارەزاترین کەسـە بەپەروەردگارەکـەی، بەرانبەریان ناوەستین و بەعەقڵ و بیر و فکرمانو ناچینە ئەو باسەوە.

کەواتە هیچ جیاوازییەك نییە لەنێوان ئەوەی نهێنی و ئاشکراکان بزانێت و لەسەر عەرشی خۆی ئیستیوای کردوە.

مەبەست لە: (وعلمه بكل مكان، ولا يخلو من علمه مكان).

عیلمو ئاگای لەهەموو جێگایەك هەیە...

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: (إِنَّ اللَّهَ لَا يَخْفَى عَلَيْهِ شَيْءٌ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ (٥) آل عمران) واتە: نە زەوی نە لە ئاسمان هیچ شتیك لە خوا شاراوە نییە).

خوای گەورە دەفـەرموێت: (وَيَعْلَمُ مَا فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَمَا تَسْقُطُ مِنْ وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُبِينٍ (٥٩) الانعام) واتە: هەرچـیش لە وشکانیو دەریادایە ئەو ئەیزانێ، هـیچ گـەڵا دارێکـیش بـێ ئاگـاداری ئـەو ناوەرێت، هەردانەیە کە لـە نـاو تاریکـایی زەویـدا بـێ و هەرچـی تـەڕو وشکیـشە، گـشتی لـە نـاو کتێبێکی ئاشکرادایە وەکو (اللوح المحفوظ) واتە: خوای کاربزان بە گشت بوونەوەر — بە گیاندارو بێ گیانییەوە— زانست و زانیاری هەیە).

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: (وَهُوَ الَّذِي يَتَوَفَّاكُمْ بِاللَّيْلِ) واتـە: بەخـەوتن (وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُمْ) واتە: ئەوەی ئەنجامی دەدەن(بِالنَّهَارِ ثُمَّ يَبْعَثُكُمْ فِيهِ) الانعام/٦٠) واتە: هەر ئـەو خوایە کە بە شەودا دەتانخەوێنێ و هەستان لێ دەسێنێ و وەك مردووتان لێ دێت و بە ڕۆژیـشدا هـەر تـاوانێ بکـەن پێـی دەزانـێ ئەوسـا بـە ڕۆژ راتـان دەپـەرێنێ و هـەڵتان دەسێنێ).

لەخەو هەڵدەستن، کێ ئێوەی خەواند؟

کێ بەئاگای هێنانەوە؟

ئەوە تەنها خوایە.

ئەگەر بیر بکەیتەوە لەم گەردوونە، ئەوا مەزنی و گەورەیی خوات نیشان دەدات، تەسلیمی خوا دەبووی، ئەگەر بیر لەقسەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکەیتەوەو ئەوەی هەواڵی پێداوین لەڕووداوەکانی ڕابردوو داهاتوو، هەروەکو ئەوەی باسی کرد ڕوو دەدەن.

کێ ئەو هەواڵانەی پێ گووت؟

ئەوە تەنها خودایە.

ئەو وەحی بۆ پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ناردوە، ئەوە لەخودی خۆیەوە نییە، بەڵکو ئەوە لەخوداوەیە، ئەگەر فەرموودەکانی دابەزێنیتە سەر روداوەکان ئەوە سەرسام دەبیت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی پێغەمبەران دەکات (علیهم الصلاة والسلام)، باسی ئوممەتەکانی تر دەکات شتی زۆر دەربارەیان دەڵێت، هەرچەندە سەردەمەکەی دوای سەردەمی ئەوانە.

کێ ئەو هەموو باس و هەواڵەی پێ ڕاگەیاند؟

ئەوە تەنها خودایە.

ئەوەش بەڵگەیە ئەو پێغەمبەرو نێردراوە لەلایەن خوداوە، ئەم قورئانە پیرۆزو مەزنە هەرگیز ناکرێت لەلایەن جگە لەخوداوە هاتبێت: (قُلْ لَئِنِ اجْتَمَعَتِ الْإِنْسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَنْ يَأْتُوا بِمِثْلِ هَذَا الْقُرْآنِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا (٨٨) الإسراء) واتە: بڵێ: ئەگەر هەموو مرۆڤ و جنۆکە کۆببنەوە بۆ ئەوەی وێنەی ئەم قورئانە بهێنن هەرگیز ناتوانن وێنەی ئەو بهێنن ئەگەر چی هەندێکیان پاڵپشت و هاوکاری هەندێکیان بن بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە).

ئەم قورئانە قسەی خودایە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەنها لەئەوەوە گەیاندوویەتی: (وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَذَا الْقُرْآنُ لِأُنْذِرَكُمْ بِهِ وَمَنْ بَلَغَ) الانعام/١٩) واتە: بۆیە ئەم قورئانەشم بۆ وەحی کراوە کە ئێوەو هەرکەسێکی تریش دەنگی ئەم قورئانەشم دەگاتێ پێ بترسێنمو ئاگادار کەمەوە).

ئەو تەنها لەخوداوە گەیاندوویەتی.

**﴿١٥﴾ نوسەر دەڵێت: (ولا يقول في صفات الرب تعالى: كيف؟ ولمَ؟ إلا شاك في الله تبارك وتعالى).**

واتە: هیچ کەسێك دەربارەی سیفاتی خوای گەورە ناڵێت: چۆن؟ بۆ؟ ئیللا کەسێکی بەگومان نەبێت لەخودای گەورە.

ڕاڤە:

پرسیاری لێ ناکرێت دەربارەی چۆنیەتی، پرسیاری لێ ناکرێت دەربارەی هۆکارەکەی، بۆ ئەوەی فەرمووە؟ بەڵکو دەبێ تەسلیمی خودا بین، چونکە هیچ کەسێك دەربارەی چۆنیەتییەکەی نازانێت تەنها خوا نەبێت.

**﴿١٦﴾نوسەر دەڵێت: (والقرآن كلام الله وتنزيله ونوره، وليس مخلوقا، لأن القرآن من الله، وما كان من الله فليس بمخلوق، وهكذا قال مالك بن أنس، وأحمد بن حنبل، ومن قبلهما من الفقهاء ومن بعدهما، والمراء فيه كفر).**

واتە: قورئان کەلامی خودایەو لەلایەن ئەوەوە دابەزیوەو نووری ڕوناکی ئەوە، دروستکراو نییە، چونکە قورئان لەلایەن خوداوە هاتوە، هەرشتێك لەلایەن خوداوە هاتبێت دروستکراو نییە، (مالیك ی کوڕی ئەنەس)و (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل) و ئەوانەی پێش ئەوانو ئەوانەی پاش ئەوان هاتوون لەفەقیهەکان وایان گوتوە، مشتومڕ کردن تێیدا کوفرە.

ڕاڤە:

مەبەست لە: (والقرآن كلام الله وتنزيله ونوره، وليس مخلوقا).

لەبیرو باوەڕی ئەهلی سوننەو جەماعە ئەوەیە: قورئان کەلامی خودایە، بەحەقیقەت قسەی پێکردوە، جبریل لەئەوەوە بیستی و دابیەزاندە سەر (محمد) (ﷺ)، ئەم عەقیدەیە هیچ کەسێك لێی جیاواز نەبوە لەوانەی لەسەر سوننەتەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆیشتوون، بەڵکو گومڕاکان لێی جیاوازن لەگرووی (الجهمية) شوێنکەوتوانی (جەهمی کوڕی سەفوان) و بێچووەکانی (الجهمية) لە (المعتزلة)و (الزيدية)و (الشيعة) هەموو ئەوانە ئەو مەسەلەیان لە (الجهمية)وە وەرگرتوە، هەروەها گرووی (الاباضية) هەموویان لەسەر ئەو بەرنامەیە دەڕۆن کە بەرنامەیەکی جیاوازە لە بەرنامەی ئەهلی سوننەو جەماعە، ئەوان_ واتە گرووپە گومڕاکان_ وادەبینن قورئان دروستکراوە، چونکە خوای گەورە لای ئەوان وەسف ناکرێت بەوەی قسەدەکات.

هەروەها وەسف ناكرێت بەبیستن و بینین و عیلمو ویست (الارادە)و جگە لەوانە، لای ئەوان وەصف ناكرێت بەوەی خوای گەورە ڕووی هەیە، یان دوو دەستی هەیە، جگە لەوانەش، مەبەستیان بەم قسانە فەسادكردنی عەقیدەیە، هەرچەندە بەڕواڵەت وانیشانی دەدەن ئەوان مەبەستیان پاك ڕاگرتنی خودایە بەوەی بەدروستكراوەكانی بچوێنن، ئەمەش قسەیەك و مەبەستێكی پووچەڵە، چونكە سیفاتی پەروەردگار لەسیفاتی دروستكراوەكانی ناچێت، پەروەردگار چەند ناوو سیفاتێكی هەیە شایستەو لایەقی گەورەیی و مەزنی ئەوە، دروستكراوەكانیش چەند ناوو سیفاتێكیان هەیە لایەقی ئەوانەو لایەقی مرۆڤایەتی ئەوانە، هیچ لەیەك چوونێك نییە لەنێوان ئەو دوو جۆرەدا چ لەڕووی حەقیقەتەوەو چی لەڕووی چۆنیەتییەوە، هەرچەندە هەردوو بەشدارن لەماناو بێژەدا (اللفظ) ئەمەش پێی دەگوترێت: (المتواطیء) بەڵام بەشدار نین لە حەقیقەت و چۆنیەتیدا، ئەمە مەزهەبی ئەهلی سوننەو جەماعەیە، بەڵگەشیان لەسەر ئەوە لەقورئاندا ئەوەیە كە دەفەرموێت: (وَإِنْ أَحَدٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ (٦) التوبة) واتە: ئەگەر یەكێك لەو موشریكانە پەنای پێ هێنایت، پەنای بدە، داڵدەی بدە هەتا بەباشی فەرمایشتی خوا دەبیسێ و لێی حاڵی دەبێ).

كەلامی داوە پاڵ خۆی، دەربارەی دووڕووەكان دەفەرموێت: (يُرِيدُونَ أَنْ يُبَدِّلُوا كَلَامَ اللَّهِ) الفتح/١٥) واتە: دەیانەوێت كە فەرمایشتی - كەلامی - خوا بگۆڕن).

هەروەها دایەوە پاڵ خۆی، بەڵگەش لەسەر ئەم مەسەلەیە لەسوننەت و ئیجماعی ئەم ئوممەتەدا زۆرە، ئەم مەسەلەیە مەسەلەیەكی دڵنیایی و یەقینیە هیچ گومانی تێدا نییە، جیاوازی گومڕاكاران هیچ كاریگەری لەسەر ناكات، بەوەی قورئان كەلامی خودایە، ئەویش یەكێكە لەقسەكانی خوای گەورە، خوای گەورە قسە دەكات و بەردەوام قسە دەكات هەر كاتێ بیەوێت، ئەگەر ویستی، بەوەی ویستی لێ بێت،

وەصف دەكرێت بەوەی قسە دەكات، ئەم قورئانەش یەكێكە لەكەلامی خوا، بەتەورات قسەی كرد، بەئینجیل قسەی كرد، بەزەبوور، بەفەرمان و نەهی قسەدەكات، بەشتێك دەڵێت: (كُن) واتە: ببە، ئەویش دەبێت: (إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ (٨٢) يس) واتە: بەڕاستی هەركاتێ ویستی شتێ بەدی بهێنێ هەر ئەوەیە كە پێی بفەرمێ ببە! ئەویش دەست بە جێ دەبێت).

ئەوەتا ئیسپاتی قسەی بۆخۆی كرد، (إِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى) آل عمران/ ٥٥) واتە: ئەوەبوو فەرمووی: ئەی عیسا !) خوای گەورە لەگەڵ (موسا) دا قسەی كرد بەقسەیەك (موسا) بیستی كاتێ ڕەوانەی لای فیرعەونی كرد، جا خوای گەورە بە كەلام وەصف دەكرێت، قورئانی پیرۆزیش لە كەلامی خوای گەورەیە.

بەڵام قسەی گومڕاكاران: قورئان دانە پاڵ خوای گەورە لەنمونەی دانە پاڵی دروستكراوەكان بۆ دروستكارەكەی وەكو: (ناقە الله) و (بیت الله) دەڵێین: ئەم قسانە درۆ و دەلەسەیە، چونكە ئەوانەی دەدرێتە پاڵ خوای گەورە دوو بەشە:-

یەكەم: (اضافة معان) دانە پاڵی ماناكان.

ئەویتر: (إضافة اعیان) دانە پاڵی شتەكان.

(المعانی) ماناكان: دانە پاڵی ماناكان بۆ خوای گەورە، دانە پاڵی سیفەتە بۆ وەصفكراوەكە، ئەویش دانە پاڵێكی حەقیقیە، ئەویش لەصیفەتەكانییەتی، وەكو: كەلام و بیستن و بینین.

دانە پاڵی (الاعیان) شتەكان: وەكو حوشترەكەو ماڵەكە، ئەمیش دانە پاڵی دروستكراوە بۆ دروستكارەكەی، ئەمیش دانە پاڵێكی ڕێزە، جا ئەوان ئەو دوو

جۆرەیـان تێکـەڵ کـردوەو جیاوازییـان نـەکردووە لـەنێوان ئـەم و ئـەودا، بۆیـە ئـەهلی سوننەو جەماعە باسی ئەو مەسەلەیان کردوە لەکتێبەکانی عەقیدەدا بۆ ئەوەی وەڵامی گومڕاکاران بدەنەوە، جا ئەگەر خوای گەورە قسە نەکات هـەروەکو ئـەوان دەڵـێن ئـەوا ئیتر چۆن فەرمان دەکات و نەهی دەکات؟ ئەمەش مانای ئەوەیە حوکمە شـەرعییەکان هەموو پوچەڵ دەبێتەوەو لەکار دەکەون و بنەمای بنەماکان کە قورئانە دەڕوخێت، جا ئەگەر ئەم بنەمایە بڕوخێت ئەوا ئیسلامیش دەڕوخێت، بەڵام ئەوان خۆیان داوەتە پـاڵ بـەپاك ڕاگـرتن، ئەمــەش لەڕاسـتیدا پـاك ڕاگـرتن نییــە، بـەڵکو ئـەوە لەکارخـستنە (تعطیل)ـە، جیاوازیش زۆرە لەنێوان پاك ڕاگرتن و لەکارخستندا، (التنزیە)پـاك ڕاگـرتن ئەوەیە خوای گەورە خۆی باسی کردوەو دەفەرموێت: (لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ) الشوری)، (هَلْ تَعْلَمُ لَهُ سَمِيًّا (٦٥)مریم) واتە: ئایا ئاگات لێیە هاوناوێکی هەبێ؟).

ئـەم تەنزیهـە خـوای گـەورە باسـی کـردووە، ئـەویش ئەوەیـە دروسـتکراوەکان بـە دروستکارەکە نەچوێنرێت یان یەکسانی لەگەڵدا نەکرێت، ئەمە ئەوەیە تـەنزیهی خـوای لێ دەکرێت، بەڵام نەفی سیفاتی خوا ئەوە لەکارخستنە کە لـە لەیەکچوونەوە هـاتووە، ئەوان لەپێشدا شوبهاندیان ئەمجار لەکاریان خستن، تەنزیهیش نییە، جا جیاوازی زۆرە لەنێوان (التنزیە) و(التعطیل)دا.

ئەشعەرییەکان شتێکی سەیریان هێناوە لـە قـسەی (الجهمیـة) سەرسـام تـرە، بۆیـە گوتیـان: کـەلامی خـوای گـەورە دەکرێـت بـەدووو بەشـەوە: (معـان) ماناکـان و(الفـاظ) گفتەکان (گوتەکان).

ماناکان ئەوە کەلامی خوایە، خوای گەورە وەصف دەکرێت بەوەی کـەلامی هەیـەو ئەو مانایە کۆنەو هی خۆیەتی، بەڵام خوای گەورە قسە بکـات بـەپیت و بـەدەنگ ئـەوە

لای ئـەوان ناکرێـت بدرێتـە پـاڵ خـوای گـەورە، بـەڵام (اللفـظ) ئـەوە کـەلامی دروستکراوەکانە، واتە: ئەوە لەقسەی (جبريل)ـە یان لەقسەی (محمد)ـە (ﷺ).

جا ئەوانە قورئانیان کردە ئـەوەی لـەدوو شـت پێك هاتبێـت: دروسـتکراوو دروسـت نەکراو، جا ئەوان نە لەگەڵ ئەهلی سوننەدا بوون و بڵێن: قورئان دروسـتکراو نییـە، نـە لە گەڵ (الجهمية)دا بـوون و بڵـێن قورئـان هـەمووی دروسـتکراوە، بـەڵام ئەوانـە دوودڵ بوون هەروەکو قـسەی گاورەکـان دەربـارەی (المـسيح)! کـە لـەدوو شـت پێکهـاتوە ! لە(لاهوت) و (ناسوت) وەدەڵێن: (لاهوت و ناسوت) یەکیان گرتوە.

دەرئـەنجام: ئـەم مەسـەلەیە مەسـەلەیەکی زۆر گەورەیـە، قـسەی ڕیـسواکان لەخشتەتان نـەبات، ئەوانـەی بانگەشـەی ئـەوە دەکـەن گوایـە ئـەوان ئـەهلی سـوننەو جەماعەن، دەڵێن: ئەم مەسەلەیە ئەو هەموو مشتو مڕە هەڵناگرێت، ئیمـامی ئەحمـەد زیـادەڕەوی کـردوە لـەوەی بڵێـت قورئـان دروسـتکراوە، ئـەم مەسـەلە ئـەم هـەموە هـەڵناگرێت، ئەمـە لەکتێبـەکانی هەنـدێ لەوانـەدا هەیـە خۆیـان داوەتـە پـاڵ زانـست، هەندێکیان دەڵێن: ئەوەی لەنێوان ئەحمەد و نەیارانیدا ڕوویدا ناکۆکی سیاسی بوو ! !

جا ئەگەر بەوردی بیر لەمەسەلەکە بکەیتەوە دەبینیت مەسـەلەیەکی ئاسـان نییـە، ئەگەر نەفی ئەوە کرا قورئان کەلامی خودایە ئیتر چی شـتێکمان پـێ دەمێنـێ؟ ئەگـەر پەروەردگار لەسیفەتی کەلام لـەکارخرا ئـەوە کەمکردنەوەیـە لەقـەدری خـوای گـەورە، چونکە ئەوەی قسەناکات خوا نییە، خـوای گـەورە کاتێـك جولەکـەکان گوێرەکەکـەیان (گۆلکەکـەیان) پەرسـت بـەوە عەیبـداری کـردن کـەوا: ﴿أَلَمْ يَرَوْا أَنَّهُ لَا يُكَلِّمُهُمْ﴾ الأعراف (١٤٨) واتە: (مەگەر نەیاندی ئەو گوێرەکەیە قسەیان لەگەڵ ناکات).

بۆیە پەروەردگار دەبێ قسەبکات، بەڕێوە ببات، فەرمان بکات و نەهی بکات، جا خوای گەورە ئەگەر نەفی کەلامی لێکرا ئەوا بەکەڵکی خوایەتی نایەت، پاکی و بێ گەردی بۆ خوای گەورە لەقسەی ئەوانەی دەیکەن، جا ئەم مەسەلەیە زۆر مەزنە، بۆیە ئیمامی ئەحمەد[٤٤] وەکو چیا بڵندەکان بەڕوویاندا ڕاوەستاو هەرگیز پەشیمان نەبووەوە، تەئویلی نەکردو ئارامی گرت لەسەر کێشەکە، ئارامی گرت لەسەر بەندیخانەو لەسەر لێدان، ئارامی گرت لەسەر سووکایەتی کردنی لەلایەن سێ خەلیفەوە: (المأمون) و (المعتصم) و(الواثق) هەموویان بەدوای یەکدا ئازاریان دا، تەنها ئەوەیان لێ دەویست لەقسەی خۆی پەشیمان ببێتەوە، کەچی ئەو ڕازی نەبوو، لەسەر قسەی خۆی دامەزراو بوو، دەڵێن لەکۆتای سەردەمی (واثق)دا، (واثق) گەڕایەوە بەهۆی تێڕوانینێکەوە لەنێوان زانایەکی ئەهلی سوننەو (بشر المريسي) دا لە پێشی روویدا، لەوێدا (المريسي) شکستی هێنا، بۆیە لەو کاتەدا (الواثق) گەڕایەوە [٤٥].

دەرئەنجام: ئەم مەسەلەیە زۆر مەزنە، هەروەها زۆر گرنگەو نابێت بەسووك تەماشا بکرێت، نابێت بگوترێت: هەروەکو هەندێ نەفام و نوسەرو ڕۆشنبیر یان ئەشعەرییەکانو نمونەی ئەوان دەیڵێن: ئەم مەسەلەیە ئەو هەموو بایەخە هەڵناگرێت، ئەم هەموو وەڵامدانەوەی ناوێت.

جا ئیمامی ئەحمەد لەو بەڵگانەی هێنایەوە بۆیان ئەو ئایەتەیە کە دەفەرمویت: (حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ) التوبة/ ٦) واتە: هەتا بەباشی کەلامی خوا دەبیسێ و لێی حاڵی دەبێ).

---

٤٤ / أنظر : (البدعة الكبرى) في محنة الإمام أحمد في صفة الكلام للدكتور / محمود عبدالرزاق الرضواني .

٤٥ / تەماشای (سير اعلام النبلاء) بکە لە نوسینی ئیمامی (الذهبي) (١٠/ ٣٠٧ –٣٠٩) .

(كَذَلِكُمْ قَالَ اللَّهُ مِنْ قَبْلُ) الفتح/ ١٥) (قَالَ اللَّهُ) (خـوای گـەورە فـەرمووی) كەواتـە وتن‌و قسەكردنی بۆخۆی سەلماند.

مەبەست لە: (وتنزيله).

واتە: قورئان، خوای گەورە دابەزاندە سەر پێغەمبەرەكەی (محمد) (ﷺ) بە هـۆی (جبريل)ەوە، خوای گەورە دەفـەرموێت: (نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ (١٩٣) عَلَى قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنْذِرِينَ (١٩٤) بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُبِينٍ (١٩٥)الشعراء) واتە: جوبرەئیلی دەستپاك‌و ئەمین هێنایە خوارێ (١٩٣) بۆ سـەر دڵـی تـۆ، تـا ببیتـە یـەكێ لـە ترسـێنەران وخـەڵكی پـێ بترسێنی (١٩٤) بەزمانێكی عەرەبی ڕوون و ئاشكرا دابەزێنراوە (١٩٥).

ئەمـە ڕوونـەو ئاشـكرایە، لەگـەڵ ئەمەشـدا كەسـێك دێـت و دەڵێـت: قورئـان دروستكراوەو دابەزیو نییە، خوای گـەورە قـسەی پـێ نـەكردوە، خـوا گـەورە بەكـەلام وەصف ناكرێت، پاكی و بێ گەردی بۆ خوای گەورە.

مەبەست لە: (ونوره).

قورئان وەصف دەكرێت بەوەی نوورو ڕووناكییە، خوای گەورە دەفـەرموێت: (وَلَكِنْ جَعَلْنَاهُ نُورًا نَهْدِي بِهِ مَنْ نَشَاءُ مِنْ عِبَادِنَا وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ (٥٢) الشورى) واتە: بەڵام ئێمە ئەو قورئانـەمان كـردە نـوور و ڕووناكییـەك تـا بـە هـۆی ئـەوەوە هـەر كەسێكمان بوێت لە بەندەكانمان ڕێنمایی بكەین).

پێـی دەگوترێـت (روح)، (أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِنْ أَمْرِنَا) الشورى/ ٥٢) روح، چـونكە دڵەكانی پێ زیندوو دەبنەوە، جا ئەوە ڕوحی دڵەكانە، ئـەو ڕوحـە ناسـراوە بریتیـە لـە

ڕوحی جەستەکان، جا ئـەم قورئانـە، ڕووناکییـە، ڕوحـە، هیدایەتـە، یـاد خـستنەوەیە، ئامۆژگارییە، چەندین ناوی هەیە دەلالەت دەکەن بۆ مەزنی ئەم قورئانە.

مەبەست لە: (لأن القرآن من الله، وما كان من الله فليس بمخلوق).

خوای گەورە بـەناوو سـیفەتەکانی یـەوە دروسـتکراو نییـە، ئـەو دروسـتکارەو جگـە لەئەو دروستکراوە، بۆیە ناگوترێت:- ناوو سیفەتەکانی خـوا دروسـتکراوە، چـونکە لـە خواوەیە، ئەوەی لەخوداوە بێت دروستکراو نییە، بەمانای ئـەوەی خـوای گـەورە پێـی وەصف دەکرێت، جا خوای گـەورە بـەناوو سـیفەتەکانییەوە دروسـتکارە، جگـە لەئـەو دروستکراوە.

مەبەست لە: (وهكذا قال مالك بن أنس وأحمد بن حنبل رحمهم الله).

ئەمە قسەی پێشەوایانە نموونەی ئەوانە ئیمامی مالیـك پێـشەوای مەدینـەو ئیمـامی ئەحمەد کە لەو پێناوەدا سزادرا و ئازار دراو ئارامی گرت و جگە لـەوان لـە پێـشەوایانی ئەهلی سوننە، هەموویان ئەمە قسەیان بووە.

مەبەست لە: (ومن قبلهما من الفقهاء ومن بعدهما).

واتـە ئـەم بابەتـە تـەنها بـاوەڕی ئیمـامی ئەحمـەد و ئیمـامی مالیـك نـەبوە بـەڵکو کەسـانێکی زۆر پـێش ئـەوان کـەوتون لـەهاوەڵان و شـوێنکەوتوان و شـوێنکەوتەی شوێنکەوتووان و ئەوانەی پاش ئەوان هاتون لەپێشەوایانی موسڵمانان.

مەبەست لە: (والمراء فيه كفر).

مشتومڕ لە قورئاندا، ئایە دروستکراوە یان دروستکراو نییە؟ یان مرۆڤەکە گومـانی هەیەو دەڵێت: نازانم، مەسەلەکە جیاوازی تێدایە هەروەکو ئێستا هەندێ کەس دەڵێن.

لەم دواییەدا دیاردەیەك پەیدا بووە، دەڵێن: مەسەلەكە جیاوازی تێدایە، ئێمەیش دەڵێین: لەكاتی جیاوازیدا شوێنی بەڵگە دەكەوین، ئێمە بەجیاوازی خەڵكی و قسەی خەڵكی پەرستن ناكەین، بەڵكو بەبەڵگە پەرستن دەكەین، هەر جیاوازییەك هەبوو بەراوردی دەكەین لە گەڵ بەڵگەدا، هەرلایەك بەڵگەی هەبوو ئەوە حەقەو هەر كام جیاوازبوو لەگەڵ بەڵگەدا ئەوە ناحەقەو پووچەڵە، خوای گەورە ئێمەی جێنەهێشتوە بۆ ڕاو بۆچوون و قسەو جیاوازی بەڵكو فەرموویەتی: (فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ (٥٩) النساء) واتە: ئینجا ئەگەر لە شتێكدا كێشەو ناكۆكیتان بوو جا بیگێڕنەوە بۆ لای خوا و پەیامبەر واتە: با تەنها قورئان و سوننەت داوەر و حەكەمتان بن).

دەفەرموێت: (وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِنْ شَيْءٍ فَحُكْمُهُ إِلَى اللَّهِ ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبِّي عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ (١٠)الشورى) واتە: ئەوەی كێشەو جیاوازیتان تێدا بوو لەبارەی باوەڕو بێ باوەڕییەوە حوكمەكەی بگێڕدرێتەوە بۆلای خوا ئا ئەو حوكمو بڕیاردەرەیە خوای پەروەردگارم هەر بەو پشت دەبەستم و هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێمەوە).

بۆیە پێویستە بگێڕدرێتەوە بۆ كیتابەكەی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەكەی (ﷺ)، جا ئەوەی بەڵگەی هەبوو وەردەگیرێ و ئەوەی لەگەڵ بەڵگەدا جیاواز بوو ئەوا وازی لێ دەهێنرێت، بەڵام ئەو كەسەی ئەو قسەیە وەردەگرێت لەگەڵ شەهوەتو ئارەزوویدا دەگونجێ هەرچەندە لەگەڵ بەڵگەكانیشدا جیاواز بێت ئەوە كەسێكی گومڕایە، ئەم كەسە ئارەزوو پەرستە، بەڵام ئەو كەسەی خوا پەرستە ئەوە هەرشتێك بەڵگەی هەبێت لەقورئان و سوننەتی پێغەمبەردا (ﷺ) ئەوە وەردەگرێت.

**﴿١٧﴾نوسەر دەڵێت: (والإيمان بالرؤية يوم القيامة يرون الله عز و جل بأعين رؤوسهم وهو يحاسبهم بلا حاجب ولا ترجمان)**

واتە: باوەڕ بەبینینی خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا، خوای گەورە دەبینن بەچاوی سەریان، ئەویش لێپێچینەوە لەگەڵیاندا دەکات بەبێ پەردەو بەبێ وەرگێڕ.

ڕاڤە:

هەر لەو بابەتە بیروباوەرە گرنگو مەزنە ئەوەیە! سەلماندنی ئەوەی کەوا ئیمانداران پەروەردگاری خۆیان دەبینن لە ڕۆژی قیامەتدا بەچاوی خۆیان و بەئاشکرا، هەروەکو چۆن مانگ دەبینن لەشەوی چواردەدا، هەروەها وەکو چۆن ڕۆژ دەبینن لەڕۆژێکی ڕووندا کاتێك ئاسمان هەوری نەبێ، هەروەکو لەفەرموودە ڕاست و دروستەکان هەیەو بە(متواتر)ی هاتووە لە سەلماندنی ئەوەی ئیمانداران خوای خۆیان دەبینن، پێشەوا (ابن القيم) لەکتێبی (حادی الارواح)[٤٦] دا ئەو فەرموودانەی هێناوەتەوە لەم بارەیەوە، باسێکی فراوانی سەنەدەکانی کردووەو ئەویش (متواتر)ە لە سەلماندنی ئەوەی ئیمانداران بەئاشکراو بەچاوی خۆیان خوای خۆیان دەبینن.

هەندێ گروپی گومڕا لەمەدا جیاوازن وەك (المعتزلة)و ئەوانەی ڕێچکەی ئەوانیان گرتوە، بۆیە نکۆڵی لەبینینی خوا دەکەن، لەکاتێکدا لە قورئاندا باس کراوە، خوای گەورە دەفەرموێت: (لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ (٢٦) يونس) واتە: بۆ ئەوانەش چاکە دەکەن پاداشی زۆر چاك و بەهەشت هەیە و زیاد لەوەش).

---

٤٦ / حادي الأرواح الى بلاد الأفراح (١/ ١٩٦) .

لـە (صـحيح مـسلم)[٤٧]دا هـاتوە مانـای (الزيـادة) واتـە: تەماشـاكردنی ڕووی خـوای گـەورە، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: (لَهُمْ مَا يَشَاءُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ (٣٥)ق) (المزيـد) بريتييە لە تەماشا كردنی ڕووی پەروەردگار[٤٨].

لەسورەتی (القيامة)دا هـاتووە: (وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ (٢٢) إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ (٢٣)) واتـە: لـەڕۆژی قيامەتـدا دەم و چـاوو ڕوخـسار گـەلێ گەشـاوەو پـاراوو پرشـنگدارە (٢٢) بـۆ پەروەردگاری خۆيان دەڕوانن(٢٣))

وشەی (ناضرة) بەپيتی (ضاد) لە(النضرة)وە هاتووە، ئەويش بريتييە لە(البهـا) واتـە: جـــوانیو قەشـــەنگیو ڕازاوەيـــی، دەفـــەرموێت: (تَعْرِفُ فِي وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ النَّعِيمِ (٢٤) المطففين) واتە: لەڕوخسارياندا ڕوو گەشی و خۆشی بەهەشت دەبينـی و دەزانيـت)، (إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ (٢٣)) بە (ظاء) واتـە: بەچـاوی خۆيـان تەماشـای خـوا دەكـەن، لەنيعمەتـدا دەبن بـەو بينينـە لـە هـەموو نيعمەتـەكانی بەهەشـت زيـاتر، ئەمـە لـەقورئانی پـيرۆزدا هاتوە.

لەسورەتی (المطففين) دا دەربارەی بـێ بـاوەڕان هـاتوە: (كَلَّا إِنَّهُمْ عَنْ رَبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَمَحْجُوبُونَ (١٥) المطففين) پەردەپۆش دەكـرێن لـە بينينـی خـوا، ئەگـەر بـێ بـاوەڕان پـەردەپۆش بـن لـەبينينی خـوا ئەمـە بەڵگەيـە لەسـەر ئـەوەی ئيمانـدار پـەروەردگاری خۆيان دەبينن، چونكە ئيمانداران ئيمانيان پێ هێناوە لەدونياداو كەچـی نـەيانبينيوە، بەڵكو پشتيان بەبەڵگەكان بەستووەو ئيمانيان پێ هێناوە، باوەڕيـان بـە پێغەمبـەرانی هێناوە، ئيمانيان پێ هێناوەو نەيانبينيوە لەدونيادا، بۆيـە خـوای گـەورە ڕێـزی لـەوان گرتووەو پەردەی لەسەر ڕووی خۆی لاداوەو بەچاوی خۆيان بينيـان، كاتێـك لـەدونيادا

---

٤٧ / أخرجه مسلم (١٨١) .

٤٨ / رواه الشافعي والبزار وابن جرير وغيرهم وصححه الضياء المقدسي .

باوەڕیان پێ هێناو نەیانبینی بوو، بەڵام بێ باوەڕان کاتێ لەدونیادا بێ باوەڕ بوون، ئەوا خوای گەورە بینینی خۆی لێیان داپۆشیوە لە ڕۆژی قیامەتدا وەکو سزایەك بۆ ئەوان، (جَزَاءً وِفَاقًا (٢٦) النبأ) واتە: پاداشتێکی پڕاو پڕە بەرامبەر بە کردەوەکانیان).

لەو گومانانەی (معتزلة) و ئەوانەی وەکو ئەوانن پشتیان پێ بەستوە ئەوەیە: خوای گەورە بەمووسای فەرموو: (لَنْ تَرَانِي) لەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: (وَلَمَّا جَاءَ مُوسَى لِمِيقَاتِنَا وَكَلَّمَهُ رَبُّهُ قَالَ رَبِّ أَرِنِي أَنْظُرْ إِلَيْكَ قَالَ لَنْ تَرَانِي وَلَكِنِ انْظُرْ إِلَى الْجَبَلِ فَإِنِ اسْتَقَرَّ مَكَانَهُ فَسَوْفَ تَرَانِي)الاعراف/ ١٤٣) واتە: ئەوسا موسا هات بۆ شوێنی موناجاتەکە لەگەڵمان و پەروەردگاری کەوتە قسەو گفتوگۆ لەگەڵی، مووسا ووتی: پەروەردگارم خۆتم پێ نیشان بدە زۆر ئارەزوومە بتبینم خوا فەرمووی: مووسا هەرگیز لەم دونیایە ناتوانی بمبینی بەڵام لەم کێوە بڕوانە من خۆمی نیشان دەدەم جا ئەگەر ئەو لەجێی خۆی ماو، نەبزووت، ئەوساش تۆ دەتوانی بمبینی).

وتیان: ئەمە بەڵگەیە کەوا خوای گەورە نابینرێت، دەڵێین: بەڵێ ئەمە لەدونیادا، چونکە ئەو ڕووداوە لەدونیادا ڕوویداوەو ئێمەش هاودەنگین خوای گەورە لەدونیادا نابینرێت، جا (موسا) داوای لەخوا کرد لەدونیادا بیبینێ، خوای گەورە فەرمووی: (قَالَ لَنْ تَرَانِي) واتە لەدونیادا، نەفی کردن بە(لن) بۆ هەتا هەتایی نییە، بەڵکو نەفییەکی کاتییە، جا مەبەست لە: (قَالَ لَنْ تَرَانِي) واتە: لەدونیادا نامبینی، لەزمانی عەرەبیدا نەفی بە (لن) بۆ هەتا هەتایی نییە بۆیە(ابن مالك) لە (الكافية الشافية)[٤٩]ی عیلمی نەحودا دەڵێت:-

ومن يرى النفي ب(لن) مؤبداً فقوله أردد وسواه فاعضدا

واتە نەفی بە (لن) نەفی هەتا هەتایی ناگرێتەوە، بەڵگەش لەسەری ئەوەیە:-خوای گەورە دەربارەی جوولەکە دەفەرموێت: (فَتَمَنَّوُا الْمَوْتَ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ (٩٤) وَلَنْ يَتَمَنَّوْهُ

---

٤٩ / (٣/ ١٥٣١).

أَبَدًا) البقرة) واتە: جا ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن، دەسا داوای مردن بکەن (٩٤) بەهۆی ئەو کارو کردەوە نادروستەیانەوە، پێشی خۆیانیان خستوون، هەرگیز داواو ئارەزووی مردن ناکەن).

لەگەڵ ئەوەشدا دەربارەی ئەوان هاتوە خۆزگە بەمردن دەخوازن بۆ ئەوەی دەربازیان بێت لەسزای خوا، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَنَادَوْا يَا مَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ (٧٧)الزخرف) واتە: ئەوجا هانا دەبەن بۆ دەرگاوانی دۆزەخ و بانگ دەکەن: ئەی مالیك! باپەروەردگارت بڕیار بدات بۆمان بەمردن).

داوای مردنیان کرد، بۆیە ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی (لن) بۆ نەفی هەتا هەتایی نییە، ئەمە مەبەست و ماناکەیەتی لەزمانی عەرەبیدا، ئەویش مەبەستی ئەوەیە قورئان دەلالەتی بۆ دەکات.

هەروەها دەڵێن: بەڵگە لەسەر ئەوەی خوای گەورە نابینرێت ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموێت: (لَا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الْأَبْصَارَ (١٠٣) الانعام) واتە: هیچ چاوێك دەرکی ناکاو بۆی نابینرێ لەکاتێکدا ئەو هەموو چاوەکان دەرك دەکاو دەبینێ).

پێیان دەڵێین:- ئەمە مانای ئەوە نییە نەفی (بینین) بکات، بەڵکو ئەوە نەفی (ئیدراك)ە، نەیفەرموو چاوەکان نایبینن بەڵکو فەرمووی (لا تدرکە) وەنەفی (ئیدراك) نەفی (بینین) نییە، جا چاوەکان دەیبینن بەڵام ئیدراکی ناکەن، واتە ئیحاتەی ناکەن، جا ئیدراك واتە: ئیحاتەکردنی خوای گەورەیە، ئەوان هەرچەندە لەبەهەشتدا دەیبینن بەڵام ئیحاتەی ناکەن، جا نەفی کردنەکە ئیدراکە، مانای ئیحاتە دەگرێتەوە، کەواتە دەبینرێت بەڵام ئیدراك ناکرێت، دەبینرێت بەپێی ئەو هەموو بەڵگەیە، کۆکردنەوە لەنێوان دەقەکاندا پێویستە، چونکە ئەگەر هەر جیاوازییەك ڕوویدات لەنێوان دەقەکاندا ئەوا تا دەتوانرێت جەمع لەنێوانیاندا دەکرێت، ئەمەش ڕوون و ئاشکرایە سوپاس بۆ خوا، قسەی خوای گەورە هەرگیز دژ بەیەك نین، بەڵکو هەندێکیان هەندێکی تر تەفسیر

دەكات، بەڵام ئەو كەسەی ئایەتێك وەرگرێت و واز لە ئایەتێكی تر بهێنێ ئەوە لەڕێ لادەرە، خوای گەورە دەفەرموێت: (فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ) آل عمران/٧) واتە: ئینجا ئەوانەی لەدڵیاندا لادان و چەوتی هەیە هەر لەموتەشابیهەكان دەگەڕێن و هەر لەوان پەیڕەوی دەكەن بەمەبەستی گێرە شێوێنی و لادانی خەڵكی لەڕێگای ڕاست و خولْقاندنی گومان بۆیان وەیان هەر چۆنێك دڵیان حەز بكا مانایان بكەن و تەفسیری بۆ بكەن).

جا قورئان هەمووی دەكرێتە بەڵگە: (كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا) آل عمران/٧) واتە: ئێمە باوەڕمان بە (متشابە) هەیە هەردوو بەشەكەی قورئان (محكم و متشابە) لەلایەن پەروەردگارمانەوەیە).

هەروەكو زاناكان دەڵێن، جا قورئان بەهەندێكی هەندێكی تر تەفسیر دەكرێت، هەرگیز جیاواز نین، چونكە خوای گەورە خۆی نەفی جیاوازی لەم قورئانەدا كردوە، خوای گەورە دەفەرمویت: (أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلَافًا كَثِيرًا (٨٢)النساء) واتە: ئاخۆ ئەو دووڕوانە بۆچی لەماناو مەبەستی قورئان ورد نابنەوە كە چەندە وردو پڕ حیكمەتە خۆ ئەگەر لەغەیری خوا بووبا بێ گومان شێواوی و دژایەتییەكی زۆریان تیا بەدی ئەكرد).

جا ئەگەر ئایەتێك لەئایەتەكان تێنەگەیشتی (ئاڵۆز بوو بەلاتەوە) ئەوە لەقورئاندا دەگەڕێیت بۆ ئەوەی ئایەتەكە تەفسیری بكات، جا ئەگەر نەتدۆزییەوە ئەوا دەڕۆیت بۆ سوننەت، لەسوننەتدا بەڵگەیەك دەدۆزیتەوە بۆ تەفسیری ئایەتەكە، ئەگەر لەسوننەتدا نەتدۆزییەوە ئەوا دەڕۆیت بۆلای قسەی هاوەڵان ئەوانەی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) ڕیوایەتیان كردوە شتێك دەدۆزیتەوە لەقسەی ئەوان تەفسیری ئایەتەكە بكات كەلای تۆ ئاڵۆز بوو، جا قورئان _سوپاس بۆ خوا _ پارێزراوە بە (لفظ) و مانایەوەو دژ یەك نابن و پێچەوانەی یەك نابن، بەڵكو دژیەك لەتێگەیشتنی خەڵكیدایە.

هـەروەها ئەوانـەی خۆیـان بـەزانا دەزانـن و عیلمیـان نەخوێنـدووەو بنـەماکانی وەرگرتنی بەڵگەو فەرمانەکان، ئەحکام دەردەهێنن بە بێ تێگەیشتن (الفقـە)، شـتی وا دەسەلمێنن هیچ کەسێك پێش ئەوان لەزانایان نەیانسەلماندوە، بـەهۆی نـەفامی و خـۆ بەزانا زانینیان، ئەم مەسـەلانە زۆر گـەورەن پێویـستیان بـە فێـر بوونـە، پێویـستی بـە وردبینی یە، پێویستی بە لەسەرخۆیی یـە، بـە سـەلماندنە، چـونکە بەڕاسـتی عەقیـدە بنەمایە، هەر خەوش‌و شێواندنێك لەعەقیـدەدا ئـەوە خـەوش‌و شـێواندنە لەبنەماکـەدا، ئەمەش جیاوازییە لای خـەڵکی لـەبینینی خـوای گـەورە لـەڕۆژی قیامەتـدا، جـا خـوای گەورە لەدونیادا نابینرێت بەڵکو ئیمانداران لەدوا ڕۆژدا دەیبینن، پـەردەپۆش دەکرێـت بەرانبەر بێ باوەڕان.

مەبەست لە: (والإيمان بالرؤية يوم القيامة).

بۆ فەرمووی:- ڕۆژی قیامەت؟ چونکە ئەو لەدونیادا نابینرێت.

مەبەست لە: (يرون الله عز و جل بأعين رؤوسهم).

دەڵێت: بەچاوی سـەریان بـۆ ئـەوەی نـەفی تـەئویلی ئـەو کەسـانە بکـات دەڵـێن:- مەبەست لە: (يرون ربهم) واتە: بەدڵیان دەیبینن نەك بەچاویان.

مەبەست لە: (وهو يحاسبهم بلا حاجب ولا ترجمان).

واتە:- لەڕۆژی قیامەتدا لەکاتی لێپرسینەوەدا بەندەکان دوو بەدوو دەبنەوە لەگـەڵ خواکەی خۆیاندا و خوای گەورە لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکات لەسەر کردەوەکانی بـەو زمانەی بەندەکە لێی تێبگات، لەنێوان ئەوو بەندەکەدا هیچ وەرگێڕێك نییـە، (وەرگێـڕ) ئەو کەسـەیە مانایـەك لـە زمانێکـەوە دەگۆڕێـت بـۆ زمـانێکی تـر، وەکـو ئـەو کەسـەی مانایـەك لـەزمانی ئینگلیزییـەوە دەگۆڕێتـە سـەر زمـانی عـەرەبی یـان بەپێـچەوانەوە، چونکە زمانەکان زۆرن.

**﴿١٨﴾ نوسەر دەڵێت: (والإيمان بالميزان يوم القيامة يوزن فيه الخير والشر له كفتان وله لسان).**

**واتە: باوەڕهێنان بەتەرازوو لە ڕۆژی قیامەتدا کەچاکەو خراپەی پێ دەپێورێتو دوو (تا)و زمانێکی هەیە.**

**ڕاڤە:**

**لەمەسەلەکانی عەقیدە باوەڕ هێنانە بەتەرازوو، کردەوەی بەندەکانی پێ دەپێورێت لە ڕۆژی قیامەتدا، خوای گەورە دەفەرموێت:** (وَالْوَزْنُ يَوْمَئِذٍ الْحَقُّ فَمَنْ ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (٨) وَمَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ فَأُولَئِكَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنْفُسَهُمْ بِمَا كَانُوا بِآيَاتِنَا يَظْلِمُونَ (٩) الاعراف) **واتە: کێشانەو لێکدانەوەی کارو کردەوەی گشت ئەو خەڵکانە لەڕۆژی قیامەتدا بەڕاستیو دادگەرانە ئینجا هەر کەسێك تای تەرازووی کردەوەکانی گران و قورس بێت دیارە هەر ئەوانە بەختیار و سەرکەوتوو سەرفرازن (٨) کەسێکیش کە تای تەرازووی کارو کرداری سووك و بێ بەهابوو ئەوانەش ئەوانەن کەزیانیان بەخۆ گەیاندو خۆیان فەوتاند چونکە لەبەرامبەر ئایەت و نیشانەکانی ئێمەوەو ستەمیان کرد ڕوویان وەرگێڕا (٩).**

**لە ئایەتێکی تردا هاتوە:** (وَمَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ فَأُولَئِكَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنْفُسَهُمْ فِي جَهَنَّمَ خَالِدُونَ (١٠٣) مؤمنون) **واتە: هەر کەسێکیش تەرازووی چاکەی سووك بێ ئەمانە ئەو کەسانەن زیانیان بەخۆیان گەیاندووەو خۆیان لەکیس چوە بە هەتاهەتایش لەدۆزەخدا ئەمێننەوەو هەرگیز ڕزگاریان نابێت).**

ئەگەر تـەرازووی چـاکەکان قـورس بـوو ئـەوە بەندەکـە بەختـەوەر دەبێـتو ئەگـەر پێچەوانە بوو خراپەکانی قورس بوو ئەوا بەندەکە بەهەلاکەتدا دەچێت: (فَأَمَّا مَنْ ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ (٦) فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَاضِيَةٍ (٧) وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ (٨) فَأُمُّهُ هَاوِيَةٌ (٩) وَمَا أَدْرَاكَ مَا هِيَهْ (١٠) نَارٌ حَامِيَةٌ (١١) القارعة) واتـه: ئینجـا ئـەو کەسـە لـەو ڕۆژەدا تـای کێشانەی کردەوەکانی قورس بوو(٦) ئەوە لە نێو گوزەران و خۆشییەکی وادا دەبێت، خۆی پێی ڕازییە (٧) بەڵام ئـەو کەسـەش کـەتای کێشانەی کردەوەکـانی سـووك بـوو (٨) ئـەوە دایکی ئەو دۆزەخەو باوەشی بۆ گرتۆتەوە (٩) جـا تـۆ چـوزانیت (هاویـە) چـییە؟ (١٠) ئاگرێکی زۆر گەرمە(١١).

ئەمەش لە دادپەروەری خوایـە، چـاکەو خراپـە بەتـەرازوو دەپێـوێ لـەپێش چـاوی خۆیـان، تەرازووەکـە هەسـت پێکـراوە، دوو تـای هەیـە، زمـانێکی هەیـە، چـاکەکان دەخرێنە تایەك و خراپەکان دەخرێنە تایەکەی تـری، هـەروەکو لـەقورئان و سـوننەتدا هاتوە، بـەجیاواز لەگـەڵ (المعتزلـة)دا کـەدەڵێن مەبەسـت لەتـەرازوو:- بەرقـەراربوونی دادپەروەرییـە، ئەگـەر نـا تەرازوویـەکی هەسـت پێکـراو نییـە بـەپێی مەزهەبـە پوچەڵەکەیان، چونکە ئەوان پـشت بـە عـەقڵی خۆیـان دەبەسـتن، پـشت بـە دەقـەکان نابەستن، جا دڵنیابە تەرازوو حەقیقییەو دوو تای هەیە، هەروەکو لەفەرموودە ڕاسـت و دروستەکاندا هاتوە[٥٠].

مەبەست لە: (يوزن فيه الخير والشر). واتە: چاکەکان و خراپەکان.

مەبەست لە: (له كفتان وله لسان).

٥٠ / تەماشای مقالات الاسلامیین بکە : (١/ ٤٧٢) .

دوو تـای هەیـە هـەروەکو لەفەرموودەکانـدا هـاتوە، چـاکەکان دەخرێنـە تایـەکی و خراپەکانی دەخرێنە سەر تایەکـەی تـر، هـەروەکو لەفـەرموودەی (البطاقة)[٥١]دا هـاتوە، لەباسـی ئـەو کەسـەی نـەوەت و نـۆ دەفتـەری تۆمـار هەیـە، هـەر دەفتـەرێکی تۆمـار بەئەندازەی چاو بـڕ دەکـات گەورەیـە، پـڕە لـە خراپـە، پێـی دەگوترێـت:- ئایـە هـیچ چاکەیەکت هەیە؟ دەڵێت: نەخێر ئەی پەروەردگار، ئەم کتێبانە لەبەر چـاوی گـەورەتر دەبێت و دەڵێت:- نەخێر ئەی پەروەردگارا، پێی دەگوترێت: بەڵێ، تۆ لای ئێمـە هـیچ ستەمێکت لێ ناکرێت، چاکەیەکت هەیە، ئەمجار کارتێك دەهێنن کـە شـایەتی (لا اله الا الله محمد رسول الله) ی تێدایـە، دەخرێتـە سـەر تـای تەرازووەکـەو هـەموو دەفتـەری تۆمارەکـان دەخرێنـە سـەر تایـەکی تـر ئـەو کـات کارتەکـە بـەرز دەبێتـەوەو هـەموو دەفتەری تۆمارەکـان فـڕێ دەداتو دەچێتە بەهەشتەوە[٥٢]، ئەمـە بەڵگەیـە کـەوا ئـەم تەرازووە دوو تای هەیەو چاکەکانی دەخریتە سەر لە ڕۆژی قیامەتدا.

مەبەست لە: (وله لسان).

زمانی تەرازوو ئاشکرایە لای خەڵکی پێی دەڵێن دڵی تەرازوو بـەلای ڕاسـت و چـەپدا لار دەبێتەوە، جا ئەگەر هەردوو تای تەرازووەکە وەکو یەك بوو ئـەوا دڵـی تەرازووەکـە یەکسان دەبێت، ئەگەر تایەکی قورستر بوو ئەوە لار دەبێتەوە.

---

٥١ / صحيح : أخرجه الترمذي (٢٦٣٩) وابن ماجه (٤٣٠٠) وأحمد (٢/٢١٣) وابـن حبـان (٢٢٥) وصـححه الـشيخ الألباني في (صحيح الجامع ) (١٧٧٦) .

٥٢ / رواه ابن المبارك واحمد والترمذي وابن ماجه وابن حبان والحاكم والبغوي .

## ﴿١٩﴾ نوسەر دەڵێت: (والإيمان بعذاب القبر، ومنكر ونكير).

واتە: باوەڕبوون بەسزای ناوگۆڕ و مونکەرو نەکیر.

ڕاڤە:

هەروەها لەعەقیدەی ئەهلی سوننەو جەماعە: باوەڕبوونە بەسزای ناو گۆڕ و خۆشی ناوگۆڕ، جا مردوو یان لەناو گۆڕەکەیدا سزا دەدرێتو یان لەخۆشیدا دەبێت، تاکو لەڕۆژی قیامەتدا زیندوو دەکرێتەوە.

گۆڕ: جێگایەکە لەنێوان دونیاو دوا ڕۆژدا، بۆیە پێی دەگوترێت (البرزخ)، چونکە (البرزخ): بریتییە لە بەربەستێك لەنێوان دوو شتدا، خوای گەورە دەفەرموێت: (مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ (١٩) بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَا يَبْغِيَانِ (٢٠) الرحمن) واتە: دوو دەریای یەکێ شیرین و یەکێ سوێر لەپاڵ یەکتردا بەردانەوە پێك دەگەن (١٩) لەنێوانیاندا بەربەستێك هەیە، بەهۆی ئەوەوە تێکەڵ نابن بەیەکتر (٢٠).

ئاوە شۆرەکە تێکەڵ بەسازگارەکە نابێتو سازگارەکەش تێکەڵ بە ئاوە شۆرەکە نابێت، چونکە خوای گەورە پەرژینێکی لەنێوانیاندا دروستکردوە، تێکەڵ یەکتر نابن، جا (البرزخ) ئەو نێوەندەیە لەنێوان دوو شتدا، چونکە ماڵەکان سێ ماڵن:—

- ماڵی دونیا.
- ماڵی بەرزەخ.
- ماڵی جێگیربوون.

ئەم سێ ماڵە بەندەی تێدا تێدەپەڕێ، ماڵی دونیا جێگای کارکردنە، ماڵی (البرزخ) جێگای چاوەڕوانییە، ماڵی جێگیربوون ماڵی پاداشت وەرگرتنە، خوای گەورە

دەفەرموێت: (حَتَّى زُرْتُمُ الْمَقَابِرَ (٢) التكاثر) واتە: تا ئەو کاتەی ئەمرن و دەنێژرێن لەگۆڕستانەکاندا).

بەڵگەیە لەسەر ئەوەی گۆڕستان جێگای مانەوە نییە، بەڵکو مرۆڤەکان وەکو کەسێکە سەردانی جێگایەك دەکات و پاشان دەڕوات و کۆچ دەکات، مانەوە لەگۆڕستان ناوی لێناوە (الزيارة) سەردان، چونکە ماوەیەك تێیدا دەمێنێتەوەو پاشان کۆچ دەکاتو دەڕوات.

بەڵام لەماوەی مانەوەی لەگۆڕدا یەکەمجار دەخرێتە ناو گۆڕ و گڵەکە دەکەن بەسەریداو خەڵکی دەگەڕێنەوەو جێی دەهێڵن، (وانه ليسمع قرع نعالهم)[٥٣] واتە: ئەو گوێبیستی تەقەی نەعلەکانیان دەبێت) دوو فریشتە لەگۆڕەکەدا دێن بۆلای و دایدەنیشێنن و ڕوحەکەی دەگەڕێتەوە جەستەکەی، ئەمجار ژیانێکی (بەرزەخی) دەباتە سەر، شێوەی ئەو ژیانە وەکو ئەم ژیانەی دونیا نییە، ئەمجار پرسیاری لێ دەکەن:

پەروەردگارت کێ یە؟

دینەکەت چییە؟

پێغەمبەرت کێ یە؟

جا ئەگەر وەڵامی ئەم پرسیارانەی بەتەواوی دایەوە ئەوا ڕزگاری دەبێ، بە شێوەیەك بەختەوەر دەبێت هەرگیز بەدبەختی بە دواوە نییە، بە ئەندازەی ئەوەی چاو بڕیکات گۆڕەکەی بۆ فراوان دەکرێتەوەو دەرگایەکی لە بەهەشت بۆ دەکرێتەوە، لەخۆشییەکان و بۆنی بەهەشتی بۆ دێت، فەرمانی پێ دەکرێت ڕاخەرێکی بۆ ڕاخەن

---

٥٣ / رواه البخاري ومسلم .

لەبەهەشتەوە [٥٤]، بەردەوام لەو خۆشییەدا دەبێت لەگۆڕەکەیدا، ئەمەش کارێکی غەیبیە ئێمە شێوەکەی نازانین، ئەگەر گۆڕەکە بکەینەوە تەماشای بکەین ئەوا ئەو شتانە نابینین، چونکە ئەوە لەجیهانێکەو ئێمەیش لەجیهانێکین.

بەڵام کەسی دووڕوو بەگومان ئەوا دەڵێت: (ئەگەر پێی وترا:

کێ پەروەردگاری تۆیە؟ ئەوا دەڵێت: نازانم.

کێ پێغەمبەری تۆیە؟ نازانم.

دینەکەت چی یە؟ نازانم.

هەرچەندە لەم دونیایە فێر بووبێ و دەقەکان و ڕاڤەکانی لەبەر کردبێت، زمانی (اللغە)ی لەبەر کردبێت، وتاربێژێکی دەنگ گەورە بێت، قسەزانێکی زیرەکە، بەڵام ئەگەر ئیمانی نەبوو، ئەوا لەگۆڕەکەیدا دەمی دەچێت بەیەکداو ناتوانێ وەڵام بداتەوە، ئەگەر پرسیاری لێ بکرێت دەربارەی ئەم مەسەلانە ئەوا دەمی بەیەکدا دەچێت و دەڵێت: (ها.. ها.. لا أدری، سمعت الناس یقولون شیئاً فقلته، فیفتح له بابٌ الی النار، ویضیق علیه قبره حتی تختلف فیه أضلاعه، ویأتیه من سمومها وحرها ویفرش له فراش من النار)[٥٥] واتە: هاه.. هاه.. نازانم، گوێم لێ بوو خەڵکی شتێکیان دەگوت و منیش دەمگوت، جا دەرگایەکی لە دۆزەخەوە بۆ دەکرێتەوە، گۆڕەکەی لەسەر تەنگ دەبێتەوەو دێتە یەك تا پەراسوکانی تێك دەچن و دەچن بە ناو یەکدا، لە گەرمیو ناخۆشی دۆزەخی بۆ دێت و ڕاخەرێکی لە ئاگر بۆ رادەخرێت).

---

٥٤ / رواه الطیالسي واحمد وابو داود والحاكم .

٥٥ / صحیح : أخرجه أبو داود (٤٧٥٣) وأحمد (٤/٢٨٧) والحاكم (١٠٧) وصححه الشیخ الألباني في (صحیح الجامع ) (١٦٧٦) .

جا سزای ناو گۆڕ یان خۆشییەکەی دوو بابەتی جێگیرن، لەقورئان و سوننەتدا سەلمێندراون، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (تعوذوا بالله من أربع: من عذاب جهنم ومن عذاب القبر ومن فتنة المحيا والممات ومن فتنة المسيح الدجال)[٥٦] واتە:- پەنا بگرن بە خوا لە چوار شت: - لە سزای دۆزەخ و لە سزای ناو گۆڕ و لە فیتنەی ژیان و مردن و لە فیتنەی مەسیحی دەججال).

جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) پەنای بەخوا دەگرت لەسزای ناو گۆڕ.

لە قورئاندا چەند ئاماژەیەك هەیە بۆ سزای ناو گۆڕ، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَلَنُذِيقَنَّهُمْ مِنَ الْعَذَابِ الْأَدْنَىٰ دُونَ الْعَذَابِ الْأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ (٢١) السجدة) واتە: دەبێ لەدونیادا سزایان پێ بچێژین پێش سزا گەورەکەی ڕۆژی قیامەت، بەشکوم بگەڕێنەوە لەلادان و لەکوفرو بێ باوەڕی).

دەڵێن: ئەمە سزای ناو گۆڕەو دەڵێن سزای دونیایە.

لەو ئایەتەی دەربارەی فیرعەون و قەومەکەی خوای گەورە دەفەرموێت: (النَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ (٤٦) غافر) واتە: لە سەر ئاگر رادەنوێنرێن بە بەیانی و نیوەڕۆ بە دواوە ئەمەش هەر لە گۆڕەوە تا قیامەت، ڕۆژێکیش قیامەت بەرپا دەبێت خوا بە فریشتەکان دەفەرموێ: ئال و شوێنکەوتوانی فیرعەون بخەنە ناو سەختترین سزاوە).

بەیانیان و ئێواران دەیچێژن ئەمە لەناو گۆڕدا، کاتێ مردن بەیانیان وئێواران بەو ئاگرە سزا دەدرێن جا ئەگەر قیامەت هات پێیان دەگوترێت: (أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ).

---

٥٦ / متفق عليه : أخرجه البخاري (١٣١١) ومسلم (٥٨٨) .

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنْكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى (١٢٤)﴾طه) واتە: وە هەرکەسێکیش لەو قورئانەیەم روو وەرگێڕێ ئەوە بێ گومان ژیانێکی سەختی دەبیّ، هەرچەندە خـاوەنی دونیـایش بیّ بـەڵی مـرۆڤ هەرکە پەیوەندی لە خوا بچڕا دڵـی تەنگـە بـچووکە بـیّ ئارامـە هـەرگیز تێرنـابیّ وە لـە رۆژی قیامەتیشدا بە کوێری حەشرو دادگایی ئەکەین).

دەڵێت: ژیانێکی سەخت لە گۆڕدایە[٥٧]، پەنا بەخوا.

جا بەڵگەکان لەسەر سزای ناو گۆڕ (متواترە) جا هەر کەسیّ بـاوەڕ بـە سـزای نـاو گۆڕ نەکات لە (المعتزلـە) و هاوشـێوەکانیان ئـەوا جیـاوازو ناکۆکـە لەگـەڵ ئـەو هـەموو بەڵگە (متواتر)ـەداو عەقیدەکەی ناتەواو دەبێت_ پەنا بەخوا _ بنەمایەك لەبنەماکانی عەقیدەی لەدەست داوە، ئەویش باوەڕ هێنانە بەسزای ناوگۆڕ، جا ئەگەر بە ئەنقەسـت نکۆڵی لیّ بکات و دەقەکان بزانێت بەڵام خۆی بـەزل دەزانـیّ و نکـۆڵی لیّ دەکـات ئـەوە کافرە، بەڵام ئەگەر تەئویلی دەکرد یان چاولێکەر بوو یان نەفام بـوو ئـەوا کـافر نـابیّ، بەڵام گومڕا دەبێت و کافر نابێت.

مەبەست لە: (ومنكر ونكير).

نـاوی دوو فریـشتەن دێـن بـۆ لای مـردوو بەشـێوەیەکی زۆر ترسـناك بـە یـەکێکیان دەگوترێ (المنكر) و بەئەویتر دەگوترێ (النكير) هەروەکو لەفەرموودەکاندا هاتوە[٥٨].

---

٥٧ / ابن كثير لە تەفسیرەکەیدا (٣/ ١٧٠) .

٥٨ / رواه الترمذي وابن ابي عاصم والحارث بن ابي اسامة وابن حبان .

**﴿٢٠﴾ نوسەر دەڵێت: (والإيمان بحوض رسول الله (ﷺ) ولكل نبي حوض[٥٩] إلا صالح (عليه السلام) فإن حوضه ضرع ناقته)**

واتە: باوەڕ بەحەوزەکەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) و هەموو پێغەمبەرێك حەوزێکی هەیە تەنها (صالح) نەبێت چونکە حەوزەکەی ئەو گوانی حوشترەکەی بوو.

ڕاڤە/

هەروەها لەبنەماکانی ئەهلی سوننەو جەماعە:- باوەڕبوونە بە حەوز، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) حەوزێکی هەیە، هەر پێغەمبەرێك حەوزێکی هەیەو ئوممەتەکەی دێنە سەری، چونکە خەڵکی تووشی تێنوێتییەکی توند دەبن، پێویستیان بەئاوە، حەوزەکەی پێغەمبەری خۆمان (ﷺ) گەورەترین حەوزە، درێژییەکەی مانگێکەو پانییەکەی مانگێکە، ئاوەکەی لەشیر سپی ترەو لەهەنگوین شیرین ترەو ژمارەی پەرداخەکانی بەئەندازەی ئەستێرەکانی ئاسمانە، هەرکەسێ لێی بخواتەوە هەرگیز تێنووی نابێت[٦٠]، ئەوانەی لەپاش پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەڵگەڕانەوە ئەوانە دوور دەخرێنەوە، هەروەها ئەوانەی باوەڕیان پێ نەکردوە لێی دوور دەخرێنەوە لەبیدعەکاران.

مەبەست لە: (ولكل نبي حوض إلا صالح (عليه السلام) فإن حوضه ضرع ناقته).

ئەم بەدەرخستنەی (صالح) جێگیر نییە[٦١] ئەوەی من بزانم، ڕاستەکەی ئەوەیە هەموو پێغەمبەرێك حەوزێکی هەیە هەروەکو لەفەرموودەکەدا هاتوە[٦٢].

---

٥٩ / وصح ذلك من حديث سمرة قال : قال رسول الله : (إن لكل نبي حوضاً وإنهم يتباهون أيهم أكثر واردة، لأرجو أن أكون أكثرهم واردة ) أخرجه الترمذي (٢٤٤٣) والطبراني في (الكبير) (٢١٢/٧) وفي (مسند الشاميين) (٤/ ٣٠) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٢١٥٦) .

٦٠ / رواه مسلم (١٧٩٣/٤) رقم (٢٢٩٢) .

٦١ / وهومعنى لحديث موضوع أخرجه العقيلي في (الضعفاء) (٣/٦٤-٦٥) وعنه ابن الجوزي في (الموضوعات)(٢٤٤/٣) وقال : (حديث موضوع لا أصل له) .

٦٢ / رواه البخاري في التاريخ الكبير والترمذي وابن ابي عاصم والطبراني وصححه الحافظ المزي .

**﴿٢١﴾ نوسـەر دەڵێـت: (والإيمـان بـشفاعة رسـول الله (ﷺ) للمـذنبين الخاطئين يوم القيامة، وعلى الصراط، ويخرجهم من جوف جهنم، وما من نبي إلا وله شفاعة، وكذلك الصديقون والشهداء والصالحون، ولله بعد ذلك تفضُّلٌ كثير على من يشاء، والخروج من النار بعدما احترقوا وصاروا فحما).**

واتە: باوەڕ بەشەفاعەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ تاوانبارە هەڵەکارەکان لەڕۆژی قیامەتداو لەسەر سیڕات و لەناوەڕاستی جەهەننەم دەردەکرێن، هیچ پێغەمبەرێك نییە ئیللا شەفاعەتی خۆی هەیە، هەروەها (صديق)ەکانو شەهیدەکان و پیاوچاکان، خوای گەورە لەپاش ئەوە فەزڵێکی زۆری هەیە بۆ هەرکەسێك خۆی بیەوێ، هەروەها دەرچوون لەئاگر لەپاش ئەوەی سوتان و بوون بەخەڵوز.

ڕاڤە/

لەبنەماکانی ئەهلی سوننەو جەماعە: باوەڕهێنانە بە شەفاعەت، بەو مەرجانەی خوای گەورە باسی کردوە ئەویش بەئیزنی ئەو دەبێتو ئەوەی شەفاعەتی بۆ دەکرێت لەئەهلی ئیمان بێت، بەڵام ئەگەر ئەوەی شەفاعەتی بۆ دەکرێت لە ئەهلی کوفر بێت ئەوا شەفاعەتەکەی وەرناگیرێت، خوای گەورە دەفەرموێت: (فَمَا تَنْفَعُهُمْ شَفَاعَةُ الشَّافِعِينَ (٤٨) المدثر) واتە: ئیتر تکای تکاکاران – ئەگەر بشبێت– کەڵکی بەوان ناگەیەنێ).

خوای گەورە دەفەرموێت: (مَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ يُطَاعُ (١٨) غافر) واتە: ستەمکاران هیچ پشتیوانو دۆستێکیان نییە، بتوانێ کەڵکیان پێ بگەیەنێو هیچ تکاکارێکیشیان نییە، تکای وەربگیردرێ).

جا کافر هەرگیز شەفاعەتی بۆ ناکرێت، بەڵام ئیماندار ئەوا شەفاعەت لەحەقی ئەوا هاتووەو ئیسپات کراوە ئەگەر خوای گەورە ئیزنی لێ بێت، مەزنترین شەفاعەتکارەکان و گەورەی شەفاعەتکارەکان پێغەمبەرمان (محمد)ە(ﷺ)، ئەو خاوەنی چەند شەفاعەتێکی تایبەتە بەخۆی، چەند شەفاعەتێکی تر هەیە ئەو و جگە لەو تێیدا بەشدارن.

مەبەست لە: (بشفاعة رسول الله (ﷺ) للمذنبين الخاطئين يوم القيامة وعلى الصراط).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) مەزنترین کەسە شەفاعەت دەکات لەڕۆژی قیامەتدا، بەڵکو ئەو شەفاعەت دەکات بۆ هەموو خەڵك لە (ئەهلی مەوقیف)، خوای گەورە ڕزگاریان دەکات لەو وەستانە (مەوقیفە)و لێپرسینەویان لەگەڵدا دەکات، چونکە مەوقیفەکە (وەستانەکە) زۆر دەخایەنێ، لەگەڵ ناخۆشییەکی زۆرو گەرمایەکی توندو تێنویەتییەکی سەختو ترسێکی زۆردا، مەوقیفەکە درێژە دەخایەنێ، مەوقیفی ڕۆژی حەشر، لەپێشدا دەچن بۆلای (اولوالعزم) لەپێغەمبەران، داوایان لێ دەکەن داوا لە خوا بکەن لەو مەوقیفو وەستانە رزگاریان کات، یان بۆ بەهەشت و یاخود بە جەهەننەم، لەپێشدا دەچن بۆ لای (ئادەم) (عليه السلام) کەچی داوای لێبوردن دەکات.....

دەچن بۆ لای (نوح) (عليه السلام) داوای لێبوردن دەکات....

دەچن بۆ لای (ئیبراهیم) (عليه السلام) داوای لێبوردن دەکات.....

دەچن بۆ لای (موسا) (عليه السلام) داوای لێبوردن دەکات....

دەچن بۆ لای (عیسا) (عليه السلام) داوای لێبوردن دەکات....

ئەمجار دێن بۆ لای (محمد) (ﷺ) و ئەویش دەڵێت: (أنا لها، ثم يأتي ويخر ساجدا تحت العرش) واتە: من بۆ ئەو کارە، ئەمجار دێتو لە ژێر عەرشی خوادا سوژدە دەبات) چونکە بۆ هیچ کەسێك شەفاعەت ناکات ئیللا بە ئیزنی خوا نەبێت، ئەو دەچێتە

سوژدە، داوا لەخواکەی دەکات تاکو پێی دەگوترێت: (يا محمد (ﷺ)، ارفع رأسك، وسل تعط، واشفع تشفع، فيأذن الله له بالشفاعة، فيشفع في أهل المحشر)[٦٣] واتە: ئەی (محمد) (ﷺ) سەرت بەرز بکەرەوە، داوابکە دەتدرێتێ، تکا بکە لێت وەردەگیرێت، جا خوای گەورە ئیزنی پێ دەدات شەفاعەت بکات، ئەویش شەفاعەت دەکات بۆ ئەهلی مەحشەر) لەوەی لەو مەوقیفە (لە مەحشەرەوە) بگوێزرێتەوە بۆ لێپرسینەوە، ئەمەش ئەو شەفاعەتە گەورەیە خوای گەورە فەزڵی ئەوی داوە بەسەر هەموو خەڵکیدا، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمِنَ اللَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِ نَافِلَةً لَكَ عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا (٧٩)الاسراء) واتە: لەبەشێکی شەویشدا خۆت ماندوو بکە بەشەونوێژەوەو قورئانی زۆری تیا بخوێنە ئەمەش بەهرەیەکی تایبەتەو دراوە بەتۆو زیادە لەفەرزەکان،بەئومێد بە پەروەردگارت بتنێرێتە شوێن و جێگایەکی پەسەندو بەڕێزەوە).

المقام المحمود: بریتییە لە شەفاعەتە گەورەکە، لەدوعاشدا هاتوە لەپاش بانگ دەگوترێت: (آت محمداً الوسيلة والفضيلة، وأبعثه مقاماً محموداً الذي وعدته)[٦٤] واتە: ببەخشە بە پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) پلەوپایەی بەرزی (الوسيلة)و پلەوپایەی زیادە بەسەر دروستکراوەکان (الفضيلة)و بیبەرە ئەو شوێنە سوپاسکراوەی بەڵێنت پێداوە).

ئەمە شەفاعەتە مەزنەکەیە.

هەروەها شەفاعەت دەکات بۆ خاوەن تاوانە گەورەکانی ئەم ئوممەتە، شەفاعەتیان بۆ دەکات، یان بەوەی نەچنە ئاگرەوەو یان لێی دەرچن ئەگەر چوونە ئاگرەکەوە، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) شەفاعەتیان بۆ دەکات، ئەم شەفاعەتەش تایبەت نییە بەپێغەمبەری خۆمانەوە (ﷺ)، بەڵکو ئەو شەفاعەت دەکات و هەموو

---

٦٣ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٧٠٧٢) ومسلم (١٩٣) .

٦٤ / أخرجه البخاري (٥٨٩) .

پێغەمبەران شەفاعەت دەکەن، ئەولیاکان شەفاعەت دەکەن، (الافراط)یش شەفاعەت دەکەن -(الافراط): ئەو کەسانەن بە منداڵی مردوون- شەفاعەت دەکەن بۆ خاوەن تاوانە گەورەکان، بە جیاواز لەگەڵ (الجهمیة) و(المعتزلة) و (الخوارج) دا، (الخوارج): ئەوانەن دەردەچن بەڕووی پێشەوایاندا (پێشەوایانی موسڵمان) بەشمشێرو لە گوێڕایەڵی دەردەچن، هەروەها ئەوانەی بەتاوانە گەورەکان موسڵمان کافر دەکەن جگە لەشیرك، ئەوانە خەواریجن، پێیان دەگوترێ خەواریج چونکە لەشتی دروست(مشروع) دەرچوون، لە گوێڕایەڵی دەسەڵاتداری موسڵمان دەرچوون، ئەوانە نەفی شەفاعەت دەکەن و دەڵێن:- هەرکەسێك بچێتە ئاگرەوە چیتر دەرناچێت و بۆ بەڵگەش ئەو ئایەتە دەهێننەوە کە دەفەرموێت: (وَمَا هُمْ بِخَارِجِينَ مِنَ النَّارِ (١٦٧) البقرة) واتە: هەرگیزیش لەو ئاگری دۆزەخە دەرنایێن و ڕزگار نابن).

دەڵێین:- ئەو ئایەتە دەربارەی بێ باوەڕان هاتوە، چونکە بێ باوەڕان لەئاگر دەرناچن، بەڵام ئەو شەفاعەتەی لێرەدا مەبەستمانە ئەو شەفاعەتەیە بۆ ئەو ئیماندارانە تووشی تاوانە گەورەکان بوونە، ئەمەش جێگیرو سابتە، خوای گەورە دەفەرموێت: (مَنْ ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلَّا بِإِذْنِهِ) البقرة) واتە: کێ بێت - لە ڕۆژی دواییدا- بتوانێ شەفاعەت بکات لای ئەو هەتا ئەو خۆی مۆڵەتی نەدا؟).

بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەگەر ئیزن بدات ئەوا شەفاعەت دەکرێت.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: (وَكَمْ مِنْ مَلَكٍ فِي السَّمَاوَاتِ لَا تُغْنِي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئًا إِلَّا مِنْ بَعْدِ أَنْ يَأْذَنَ اللَّهُ لِمَنْ يَشَاءُ وَيَرْضَى (٢٦) النجم) واتە:فریشتەیەکی زۆر لە ئاسمانەکاندا هەن تکایان هیچ کەڵك نابەخشێ بۆ پەرستیارەکانیان مەگەر ئەو بتانەی ئێوە چۆن تکایان وەرئەگیرێ بۆتان؟! مەگەر پاش ئەوەی بۆ هەرکەسێك خوا خۆی بیەوێ‌و ڕازی بێ مۆڵەت بدات فریشتە تکای بۆ بکات، ئەوەش بۆ پیاوە راساڵ‌و صاڵحان دەبێت).

ئەم ئایەتە هەردوو مەرجەکەی شەفاعەتی تێدایە:–

● بەئیزنی خوا بێت، ئەمە مەرجی یەکەمە.

● پێی ڕازی بێت، ئەمیش مەرجی دووەمە، ڕازی بێت لەو کەسەی شەفاعەتی بۆ دەکرێت، ئەویش تەنها لەکەسی ئیماندار ڕازی دەبێت، بەڵام کەسی بێ باوەڕ هەرگیز لێی ڕازی نابێت.

ئەوانەی لەگەڵ ئەهلی سوننەدا ناکۆکن لەمەسەلەی شەفاعەتدا لەسەر دوو لای جیاوازن:–

هەندێکیان نکۆڵی لەشەفاعەت دەکەن، ئەوانەش خەواریج و موعتەزیلەن، ئەوانەی بەتاوانی گەورە خەڵکی کافر دەکەن کە لەشیرك کەمترە.

لایەنی دووەم: ئەوانەی زیادەڕەوی دەکەن لەئیسپاتی شەفاعەتدا، ئەوانیش سۆفییەکان و گۆڕپەرستانن، ئەوانەی پشت بەشەفاعەت دەبەستن و پەنا بۆ گۆڕەکان دەبەن و هاوار دەکەنە مردووەکانو داوای شەفاعەتیان لێ دەکەن، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: (وَيَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنْفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَؤُلَاءِ شُفَعَاؤُنَا عِنْدَ اللَّهِ) يونس/ ١٨) واتە: لە باتی خوایش چەند شتێکی وائەپەرستن کە: نە دەتوانن زیانێکیان پێ بگەیەنن و نە سودێکیان پێ ببەخشن دەشڵێن ئەوانە لای خوا تکاکارمان دەبن).

دەیانپەرستن بەمەبەستی ئەوەی شەفاعەتیان بۆ بکەن لای خوای گەورە.

بەڵام ناوەند:– ئەهلی سوننەو جەماعەن، بەڕەهایی نکۆڵییان لەشەفاعەت نەکردوەو بەڕەهایی ئیسپاتیان نەکردوە، بەڵکو ئیسپاتیان کردوە بەو دوو مەرجەی لەقورئان وسوننەتدا هاتوە، ئەمە کورتەو دەرئەنجامی لێکۆڵینەوەی باسی شەفاعەتە.

مەبەست لە: (المذنبين الخاطئين).

واتە شەفاعەت بۆ ئیماندارە تاوانبارەکان دەبێت، ئەوانەی نەگەیشتونەتە رادەی کوفر.

مەبەست لە: (وعلى الصراط).

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) شەفاعەت بۆ ئیمانداران دەکات لەو کاتەی بەسەر سیراتدا تێدەپەڕن، شەفاعەت دەکات بۆ ئەوانەی دەچنە ئاگرەوە بەدەرهێنانیان لەئاگر ئەگەر کەسەکە یەکتاپەرست بێت، جا شەفاعەت دەکات لەسەر سیرات کاتێ خەڵکی بەسەردا تێدەپەڕێت، سیراتیش بریتییە لە پردێك لەسەر دۆزەخ دانراوە، خەڵکی بەسەریدا تێدەپەڕن بەئەندازەی کردەوەکانیان، تیایاندا هەیە تێدەپەڕێ وەکو چاو پروکانێك، تیایاندا هەیە وەکو بروسکە تێدەپەڕێ، تیایاندا هەیە وەکو (با) تێدەپەڕێ، تیایاندا هەیە وەکو سوارێك تێدەپەڕێ و هەیە وەکو سواری حوشتر تێدەپەڕێ، هەیە ڕادەکات، هەیە بەڕێ کردن ڕێ دەکات، هەیە بەخشان دەخشێت، تیایاندا هەیە فڕێ دەدرێتە ناو ئاگرەکەوە (جەهەنمەوە)، هەموو خەڵکی بەسەر ئەو پردەدا تێدەپەڕن، ئیمانداران و بێ باوەڕان، هیچ شتێك دەربازیان ناکات تەنها کردەوەی خۆیان نەبێت خوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِنْ مِنْكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا (٧١) مريم) واتە: بە سەر سیراتدا، (كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْمًا مَقْضِيًّا (٧١) ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوْا وَنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا (٧٢) مريم) واتە: ئەی خەڵکینە دەبێ هەموو بەسەر دۆزەخدا تێپەڕن ئەمەش بڕیارێکە لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆ ئەوە دراوە و بڕاوەتەو شتێکی حەتمییە (٧١) پاش تێپەڕبوونی هەمووان بەسەر ئاگری دۆزەخدا ئەوجا ئەوانەی وا پارێزکارو خواناس بوون لەئاگرەکە ڕزگاریان ئەکەین و ستەمکارانیش لەناو دۆزەخدا دەستە ئەژنۆ دیڵێینەوە (٧٢).

تەنها ئەوانەی لە خوا دەترسن ڕزگاریان دەبێ، بەلاّم بێ باوەڕان لە جەهەنەمدا بە هەلاکەتدا دەچن _ پەنا بەخوا _ ئەمە سیراتە.

مەبەست لە: (وﷲ بعد ذلك تفضل كثير على من يشاء).

ڕەنگە خوای گەورە هەندێ ئیماندار لەئاگر دەرکات بەبێ شەفاعەتی شەفاعەتکاران بەڵکو بەفەزڵی خۆی، خوای گەورە خەڵکانێك لەئاگر دەردەکات بەبێ شەفاعەتی هیچ کەسێك بەڵکو بەفەزڵی خۆی.

مەبەست لە: (والخروج من النار بعدما احترقوا وصاروا فحما).

خوای گەورە هەواڵی پێداوین ئەوانەی بەتا هەتایی لەئاگردا دەمێننەوە نامرن و نازێنەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: (فَذَكِّرْ إِنْ نَفَعَتِ الذِّكْرَى (٩) سَيَذَّكَّرُ مَنْ يَخْشَى (١٠) وَيَتَجَنَّبُهَا الْأَشْقَى (١١) الَّذِي يَصْلَى النَّارَ الْكُبْرَى (١٢) ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَى (١٣) الأعلى) واتە: ئینجا ئەگەر پەندو بیرخستنەوە کەڵکی هەبێ، پەند بدە بەقورئان‌و ئامۆژگاری مەردوم بکە(٩) ئەو کەسەی لەخوا بترسێ بێ گومان پەندو سوود وەرئەگرێ (١٠) وە بەدبەخت و کافر خۆی لائەدا لەئامۆژگاری و ناچێ بەگوێیدا (١١) ئەوەی دەچێتە ناو ئاگرە گەورەکەوە (١٢) لەپاشا نەئەمرێ بۆ ئەوەی ڕزگاری ببێ‌و نەئەیشژێ بەژیانێکی خۆش (١٣).

ئەو کەسەی ئامۆژگاری وەرناگرێت‌و بەردەوام دەبێت لەلارێتی خۆی ئەوە دەچێتە دۆزەخەوە، دەمێنێتەوە تێیدا نەژیانێکی خۆش دەباتە سەرو نەمردنێکی باش دەمرێت، بەڵکو لە سزاو نارەحەتیدا دەمێنێتەوە، بەلاّم هەرکەسێك بچێتە دۆزەخەوە لەسەرپێچی کارانی یەکتاپەرستان ئەوە دەسوتێت و دەبێتە خەڵوز، ئەمجار لەئاگر دەردەکرێت، دەخرێتە ناو ڕوبارێکەوە پێی دەگوترێت ڕووباری (حەیات) جا جەستەکانیان شین دەبێتەوە (سەوز دەبێتەوە) کە جەستەیان تەواو و کامل بوو ئیزنیان پێ دەدرێت بڕۆنە بەهەشتەوە.

**﴿٢٢﴾ نوسەر دەڵێت: (والإيمان بالصراط على جهنم يأخذ الصراط من شاء الله، ويجوز من شاء الله ويسقط في جهنم من شاء الله ولهم أنوار على قدر إيمانهم).**

واتە: باوەڕهێنان بەسیڕات لەسەر دۆزەخ، هەرکەسێك خوای گەورە بیەوێت سیڕات دەیبات و ویستی لەکێ بێت تێدەپەڕێت، هەرکەسێك خوای گەورە بیەوێ دەکەوێتە ناو دۆزەخەوە، ڕوناکییان هەیە هەرکەسەو بەپێی ئیمانەکەی)

ڕاڤە/

ئەوەی لەقیامەتدا ڕوو دەدات: تێپەڕبوونە بەسەر سیراتدا هەروەکو لەپێشدا باسکرا.

(الصراط) لەزمانەوانیدا: بریتییە لەڕێگا، مەبەستی لێرەدا ئەو پردەیە لەسەرپشتی دۆزەخ دانراوە، ئەویش زۆر وردو باریکە، باریکتر لەمووی سەرو تیژتر لەشمشێرو گەرمترە لە سکڵ، خەڵکی بەسەریدا تێدەپەڕن بەئەندازەی کردەوەکانیان کارەکانیان دەیانجوڵێنێ و ڕێیان پێ دەکات، هەرکەسە نەجاتی بوو ئەو سەرکەوتوو بوە، هەرکەسێك ڕزگاری نەبێت ئەوە بەهەلاکەتدا چوە، تێپەڕبوونی خەڵکی بەسەریدا بەپێی کردەوەکانیانە، تیایاندا هەیە تێدەپەڕێ وەکو چاو پروکانێك، تیایاندا هەیە وەکو بروسکە تێدەپەڕێ، تیایاندا هەیە وەکو (با) تێدەپەڕێ، تیایاندا هەیە وەکو سوارێك تێدەپەڕێو هەیە وەکو سواری حوشتر تێدەپەڕێ، هەیە ڕادەکات، هەیە بەڕێ کردن ڕێ دەکات، هەیە بەخشان دەخشێت، تیایاندا هەیە فڕێ دەدرێنە ناو ئاگرەکەوە (جەهەنمەوە)، ئەمە لەقورئاندا هاتوەو باسکراوەو لەسوننەتیشدا هاتوەو باسکراوە، خوای گەورە دەفەرموێت: (فَوَرَبِّكَ لَنَحْشُرَنَّهُمْ وَالشَّيَاطِينَ ثُمَّ لَنُحْضِرَنَّهُمْ حَوْلَ جَهَنَّمَ جِثِيًّا

(٦٨) ثُمَّ لَنَنْزِعَنَّ مِنْ كُلِّ شِيعَةٍ أَيُّهُمْ أَشَدُّ عَلَى الرَّحْمَنِ عِتِيًّا (٦٩) ثُمَّ لَنَحْنُ أَعْلَمُ بِالَّذِينَ هُمْ أَوْلَى بِهَا صِلِيًّا (٧٠) وَإِنْ مِنْكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْمًا مَقْضِيًّا (٧١) مريم) **واتە: سوێند بە پەروەردگارەکەت ئەی موحەممەد (ﷺ) هەموو ئەوانە لەگەڵ ئەو شەیاتینانەدا ئەمانیان فریودا، کۆدەکەینەوە واتە پێکەوە حەشریان دەکەین لەپاشا دەوران دەور هەموو لە دۆزەخدا بەچۆکدا دێنین و دەیان خەینە ناوی (٦٨) لە پاشا لەناو هەر کۆمەڵ و تاقمێك کەسانێ دەردەکێشین کە لەهەمووان دژی خوای بەخشەر سەرکەشترو سەرسەخت تر بوون (٦٩) لەپاشا هەر خۆمان زۆر چاك ئاگادارتر و زاناترین بەو کەسانەی کە بۆ سووتان و سزا چێشتن لەناو دۆزەخدا شیاوترن (٧٠) ئەی خەڵکینە دەبێ هەموو بەسەر دۆزەخدا تێپەڕن ئەمەش بڕیارێکە لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆ ئەوە دراوەو بڕاوەتەو شتێکی حەتمییە (٧١).**

**واتە: دۆزەخ و ئەم تێپەڕبوونە (الورود)ە بریتییە لەتێپەڕبوون بەسەر سیڕاتدا، ئەمە مانای ئەو (ورود)ەیە لەقورئاندا باسکراوە، دواندنەکە لەگەڵ ئیمانداران و جگە لەوانە** (وَإِنْ مِنْكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا) **ئیمانداران و بێ باوەڕان و دووڕووەکان بەسەر ئەم سیڕاتەدا تێدەپەڕن، هەموو خەڵکی بەسەر ئەم سیڕاتەدا تێدەپەڕێت، هەرکەسێك لێی ڕزگاری بێت ئەوا دەچێتە بەهەشتەوەو هەرکەسێك بکەوێت ئەوا بەهەلاکەتدا دەچێت** (ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوْا (٧٢)مريم) **واتە: پاش تێپەڕبوونی هەمووان بەسەر ئاگری دۆزەخدا ئەوجا ئەوانەی وا پارێزکارو خواناس بوون لەئاگرەکە ڕزگاریان ئەکەین).**

**هیچ شتێك کەس دەرباز ناکات تەنها تەقوا نەبێت، هێزی جەستەکان ڕزگار ناکەن، زۆری سەروەت و سامان ڕزگار ناکەن، ڕێزو حورمەتی لای خەڵکی ڕزگاری ناکەن، هیچ شتێك ڕزگاری ناکات تەنها تەقوا نەبێت، ئەمە دەقی قورئانی پیرۆزە.**

لەسوننەتیشدا چەند فەرمودەیەك هاتوە دەربارەی باسی قیامەت لەوانە: تێپەڕبوونە بەسەر سیراتدا، بۆیە باوەڕبوون بەسیرات و تێپەڕبوون بەسەریدا پێویستە، تەنها باوەڕبوون پێی بەس نییە بەڵکو پێویستی بەکارکردنە، دەبێ مرۆڤەکان خۆیان ئامادە بکەن بەتێپەڕبوون بەسەریدا بەتەقوا ئەویش کردەوەی چاکە.

مەبەست لە: (يأخذ الصراط من شاء الله ويجوز من شاء الله).

هەروەکو خوای گەورە فەرموویەتی: (ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوْا وَنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا (٧٢) مريم) واتە: پاش تێپەڕبوونی هەمووان بەسەر ئاگری دۆزەخدا ئەوجا ئەوانەی وا پارێزکارو خواناس بوون لەئاگرەکە ڕزگاریان ئەکەین و ستەمکارانیش لەناو دۆزەخدا دەستە ئەژنۆ دێڵینەوە).

چونکە سیرات درك‌و چنگی لەسەرە ئەو کەسەی فەرمانی پێ کرابێت دەیگرێت‌و دەیفڕێنێت.

(ويجوز) واتە: بەسەریدا تێدەپەڕێت.

مەبەست لە: (ولهم أنوار على قدر إيمانهم).

لەڕۆژی قیامەتدا ئیماندار ڕوناکییان هەیە بەهۆیەوە ڕێ دەکەن، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: (نُورُهُمْ يَسْعَى بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَانِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَاغْفِرْ لَنَا إِنَّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (٨) التحريم) واتە: لە بەردەمیانەوەو لە لای ڕاستیانەوە بە سەر پردی (صراط)دا پێی دەڕۆن و دەڵێن: پەروەردگاری ئێمە! نوور و ڕوناکییەکەمان بۆ تەواو بکە و بەردەوام بێت و لێمان خۆش ببە بە ڕاستی تۆ بە سەر هەموو شتێکدا بە توانایت).

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: (يَوْمَ تَرَى الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ يَسْعَى نُورُهُمْ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَانِهِمْ بُشْرَاكُمُ الْيَوْمَ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ (١٢)الحديد) واتـە: ڕۆژی قیامـەت پیـاوان و ژنـانی بـڕوادار دەبینـی ڕووناکییەکـەیان لەبەردەم و لـەلای ڕاستیانەوە دەدرەوشـێتەوە فریشتە پێیـان دەڵـێن: دەسـا ئـەمڕۆ مژدەبێ لێتان بەباخانێك جۆگەو ڕووبار بەژێر درەخـتو كۆشـكەكانیدا دەڕوات بەهـەتا هەتایش تێیدا دەمێننەوە ئا ئەوەیە سەركەوتن و سەرفرازی گەورە).

دووڕووەكان لەسەرەتاوە ڕووناكییان پێ دەدرێـت چـونكە هاتنـە نـاو ئیـسلامەوەو خۆیان بەموسڵمان نیشاندا بۆیە بەوەی خۆیان دەریان دەبڕی مامەڵەیان لەگەڵ دەكرێ لەپێشدا ڕووناكییان پێ دەدرێت وەكو خەڵەتاندن، هەروەكو چۆن بەموسڵمان بوونیـان خـەڵكیان دەخەڵەتانـد، ڕووناكیـەكیان پـێ دەدرێـت وەكـو خەڵەتانـدنیان ئـەمجار ڕووناكیەكیان دەكوژێتەوە لەتاریكیدا دەمێننـەوە (يَوْمَ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ لِلَّذِينَ آمَنُوا انْظُرُونَا) واتـە: چـاوەڕوانبن، چـونكە ئـەوان لـە پـشت ئیماندارانـەوە ڕێ دەكـەن (انْظُرُونَا) واتە: چاوەڕوانمان بـن (نَقْتَبِسْ مِنْ نُورِكُمْ قِيلَ ارْجِعُوا وَرَاءَكُمْ فَالْتَمِسُوا نُورًا فَضُرِبَ بَيْنَهُمْ بِسُورٍ لَهُ بَابٌ بَاطِنُهُ فِيهِ الرَّحْمَةُ وَظَاهِرُهُ مِنْ قِبَلِهِ الْعَذَابُ (١٣) يُنَادُونَهُمْ أَلَمْ نَكُنْ مَعَكُمْ) واتە: لە دونیادا (يُنَادُونَهُمْ أَلَمْ نَكُنْ مَعَكُمْ قَالُوا بَلَى وَلَكِنَّكُمْ فَتَنْتُمْ أَنْفُسَكُمْ وَتَرَبَّصْتُمْ وَارْتَبْتُمْ وَغَرَّتْكُمُ الْأَمَانِيُّ حَتَّى جَاءَ أَمْرُ اللَّهِ وَغَرَّكُمْ بِاللَّهِ الْغَرُورُ (١٤) فَالْيَوْمَ لَا يُؤْخَذُ مِنْكُمْ فِدْيَةٌ وَلَا مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا مَأْوَاكُمُ النَّارُ هِيَ مَوْلَاكُمْ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ (١٥) الحديد) واتە: لەم ڕۆژەدا پیـاوانی دووڕوو و ژنانی دووڕوو دەڵێن بەوانـەی باوەڕیـان هێنـاوە: چـاوەڕوانیمان بكـەن بـا لـە ڕوناكییەكەتان وەرگرین، بە گاڵتەوە پێیان دەگـوترێ: بگەڕێنـەوە بـۆ دواوەتـان – بـۆ دونیـا– لـەوێ ڕوناكییـەك بخـوازن، دەسـتبەجێ شـوورەیەك دەخرێتـە نێـوان ئیماندارەكانو مونافیقەكان دەرگایەكی تیایە دیوی ناوەوەی ڕەحمـەتی تێدایـە، واتـە:

ئـەوەی لـە ئیماندارەکانـەوە دیـارە لـە دیـوی دەرەوەشـی سـزایە، واتـە: ئـەوەی لـە مونافیقەکانەوە دیارە (١٣) جا دووڕووەکان بانگی بەهەشتییەکان دەکەن ئەڵێن: باشە ئێمە لەگەڵ ئێوە نەبووین؟ موسڵمانەکان دەڵێن: بەڵێ بەڕواڵەت لەگەڵمان بوون، بـەڵام ئێـوە خۆتانتـان تووشـی دوو ڕوویـی کـرد چـاوەڕوانیتان دەکـرد تووشـی بـەڵا بـێن و هەمیـشە لـەدوو دڵـی گومانـدا دەژیـان بەرامبـەر بەئاینەکـەی خـوا و هیـواو ئـارەزووی نەشیاو فریوی دان تا فەرمانی خوا هات شەیتانی خراپکاریش سەبارەت بـەبڕیارەکانی خوا فریوی دان (١٤) ئەمڕۆش فیدیەیەك لەئێوەو لەوانـەش بـێ بـڕوا بـوون وەرنـاگیرێ جێگـاو ماواتـان ئـاگری دۆزەخـە ئـەو شایـستە تـرە پێتـان، ئـاگریش خـراپ جێگـای گەڕانەوەیە (١٥).

جـا ئیمـان دەبێتـە ڕونـاکی لـەڕۆژی قیامەتـدا خاوەنەکـەی بەهۆیـەوە ڕێ دەکـات، لەکاتێکدا بێ باوەڕو دوو ڕووەکان لەتاریکیدان _پەنا بەخوا _ نازانن بۆ کوێ بڕۆن.

**﴿٢٣﴾نوسەر دەڵێت: (والإيمان بالأنبياء والملائكة).**

**واتە: باوەڕهێنان بە پێغەمبەران و فریشتەکان.**

**ڕاڤە/**

**لەبنەماو پایەکانی ئیمان: باوەڕبوونە بەفریشتەو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ئەمەش هەروەکو لە فەرموودەکەی (جبریل) دا هاتوە کاتێ بەپێغەمبەری (ﷺ) گوت:** (أخبرني عن الإيمان؟، قال: الايمان: أن تؤمن بالله، وملائكته، وكتبه، ورسله، واليوم الآخر، وتؤمن بالقدر خيره وشره)[٦٥] **واتە: فەرمووی: ئەی پێم بڵێ ئیمان چییە؟ ئەویش فەرمووی: ئیمان ئەوەیە باوەڕی تەواو بهێنیت بە خوای گەورەو فریشتەکانی و کتێبە ئاسمانییەکان و هەموو پێغەمبەران و ڕۆژی دوایی و باوەڕیش بە قەزاو قەدەر بهێنیت چ خەیر بێت یان خراپ).**

**لە قورئانیشدا هاتوە:** (لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ (١٧٧)البقرة) **واتە: چاکەو چاکەکاری هەر ئەوە نییە ئێوە ڕوو لەخۆرهەڵات بکەن یان خۆرئاوا بەڵکو چاکەی ڕاست و دروست ئەمەیە کە باوەڕی ڕاستەقینەی بەخوا و بەڕۆژی دوایی و بەفریشتەو بەکتێبی ئاسمانی بە پەیامبەرانی خوا).**

**لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت:** (آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلِهِ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ (٢٨٥) البقرة) **واتە: ئەم پەیامبەرەو ئەو ئیماندارانەی لەگەڵیان باوەڕیان هێناوەو لێیان ڕوونە ئەو بەرنامەیە لەلای پەروەردگاریانەو هاتوتە خوارێ ڕاستەو**

---

٦٥ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٥٠) ومسلم (٩، ١٠) من حديث أبي هريرة وأخرجه مسلم (٨) من حديث عمر بن الخطاب .

دروست و هەموشیان بڕوایان هێناوە بەتاك و تـەنیایی خـواو فریـشتەكانی‌و كتێبـەكانی وپەیامبەرەكانی هیچ فەرق و جیاوازیـەك لـەنێوان پێغەمبـەرانی خـودا ناكـەین بڕوامـان هەیە هەموو خوا ناردوونی و هەریەكەشیان بەبەرنامەی خۆیەوە هـاتووەو ئـەڵێن وتـەی خوامان بیست و گوێڕایەڵی فەرموودەكانی خواین ساتۆش ئەی پەروەردگارمان هەرچی بفـەرمووی ئامـادەین داوای لیبوردنـت لێدەكـەین دەسـا تـۆش لێمـان خـۆش ببـە ئـەی پەروەردگارمان چاكیش دەزانین سەرەنجام گەڕانەوەشمان تەنها بۆ تۆیە).

هەروەها خوای گەورە دەفـەرموێت: (قُولُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنْزِلَ إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى وَمَا أُوتِيَ النَّبِيُّونَ مِنْ رَبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ (١٣٦)البقرة) واتـە: ئـەی بـڕواداران بڵـێن: ئێمـە باوەڕمان بەخواو بەو (قورئانە)ی بۆمان دابەزیوە هەیەو بەو بەرنامەیـە بـۆ (ئیـبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب و نـەوەكانیان) نێـردراوەو بـەو كتێبـەش بـە مووسـاو عیسا دراوە و بەو پەیامەش بەهەموو پەیامبەرانی تر دراوە لەلایـەن پەروەردگاریانـەوە هیچ فەرق و جیاوازییـەكیش ناخەینـە نێـوان هـیچ كامێكیانـەوە، بەتـەنیایش ملكەچـی فەرمانەكانی ئەوین).

بۆیە پێویستە بـاوەڕ بەفریـشتەكان بهێنرێـت، هـەمویان، ئـەوەی خـوای گـەورە نـاوی هێنـاوەو ئـەوەی نـاوی نـەهێناوە، (الملائكـة) كـۆی وشـەی (مَلَـك)ـە ئـەوانیش جیهانێكن لەجیهانەكانی غەیب، خوای گەورە ئەوانی لـەڕوناكی دروسـت كـردوە، بـەڵام جنۆكە خوای گەورە لەئاگر دروستی كردوون، هەروەها (الانس) مرۆڤەكان خوای گەورە لەقوڕ ئەمجار لەئاوێكی لاوازو بێ هێز دروستی كردون، هـەروەكو خـوای گـەورە باسـی ئەوەی كردوە، جا باوەڕبوون بەفریشتەكان ئەوانەی خوای گەورە ناوی هێناوەو باسـی بۆ كردووین و ئەوانـەی نـاوی نـەهێناون ئێمـە بـاوەڕ بەهـەموویان دەكـەین، بـەڵام ئـەو كەسەی باوەڕ بەهەنـدێكیان بكـات و بـاوەڕ بـە هەنـدێكیان نـەكات ئـەوە كـافرە و بـێ

باوەڕە بەهەموویان خوای گەورە دەفەرموێت: (قُلْ مَنْ كَانَ عَدُوًّا لِجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَى قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللَّهِ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ (٩٧) مَنْ كَانَ عَدُوًّا لِلَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَرُسُلِهِ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَالَ فَإِنَّ اللَّهَ عَدُوٌّ لِلْكَافِرِينَ (٩٨)البقرة) واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) پێیان بڵێ: هەر کەسێك خۆی بەدوژمنی جوبرەئیل دەزانێ، دەبا لەخەم و خەفەتدا بمرێ، چونكە بێ گومان ئەو بەفەرمانی خوا ئەم قورئانەی دابەزاندووە بۆ سەر دڵ و دەروونی تۆ، ئەو قورئانەش ئەو دەیهێنێ، پشتگیری لەكتێبەكانی بەردەستی دەكا، وەڕێنمایی و موژدەیشە بۆ بڕواداران (٩٧) هەركەسێك دوژمنی خواو فریشتەو پەیامبەرەكانی ئەوو جوبریلو میكائیل بێت لەبەرامبەر ئەوەیشەوە بێ گومان خوا ناحەزو دوژمنی بێ باوەڕانە (٩٨).

جا هەركەسێك باوەڕ بەتەنها یەك فریشتە نەكات لەفریشتەكان ئەوە بێ باوەڕە بەهەموو فریشتەكان، وەكو جولەكەكان كە دەڵێن[٦٦]: جبریل دوژمنی ئێمەیە، ئەگەر ئەو كەسەی دابەزیوەتە سەر (محمد) (ﷺ) جگە لە جبریل بوایە ئەوا ئێمە گوێڕایەڵی دەبوین، بەڵام جبریل دابەزیوەتە سەری و ئەویش دوژمنی ئێمەیە بۆیە باوەڕی پێ ناكەین، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (قُلْ مَنْ كَانَ عَدُوًّا لِجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَى قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللَّهِ (٩٧) البقرة) ئەوە لەجبریلەوە نییە بەڵكو لە خواوەیە، جبریل نێردراوی خوایە وەحی لە ئەستۆدایە.

هەندێ گرووی گومڕا هەن كەخۆیان داوەتە پاڵ ئیسلام دەڵێن:– جبریل خیانەتی لەسپاردەكەی كردووە، چونكە ئەم پەیامە بۆ (عەلی) بوو بەڵام جبریل خیانەتی لەسپاردەكە كردو دای بە (محمد) (ﷺ)!

یەكێ لەشاعیرەكانیان دەڵێت: (خان الامين فصدها عن حيدر) واتە: لە عەلی.

---

٦٦ / رواه البخاري .

**نوسەر دەڵێت:** (ونؤمن باالرسل والانبياء).

النبي: **ئەو کەسەیە وەحی بۆ کراوە بەشەرعێك و فەرمانی پێ نەکراوە بەگەیاندنی.**

الرسول: **ئەو کەسەیە وەحی بۆکراوە بەشەرعێك و فەرمانی پێکراوە بەگەیاندنی.**

**هەروەها جیاوازی لەنێوان** (النبي والرسول) **ئەوەیە کە** (الرسول) **ڕەوانەکراوە بەشەریعەتێکی نوێ دابەزیوەتە سەر خۆی، بەجیاواز لەگەڵ** (النبي)**دا چونکە ئەو ڕەوانە کراوە بەشەریعەتێك دابەزیوەتە سەر پێغەمبەرێکی پێش خۆی، وەکو پێغەمبەرانی (بەنی ئیسرائیل) جا ئەوانە بە پەیامەکەی (موسا) —بەتەورات— ڕەوانەکران،** (إِنَّا أَنْزَلْنَا التَّوْرَاةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ يَحْكُمُ بِهَا النَّبِيُّونَ الَّذِينَ أَسْلَمُوا لِلَّذِينَ هَادُوا وَالرَّبَّانِيُّونَ وَالْأَحْبَارُ **(٤٤)** المائدة) **واتە: ئێمە تەوراتمان ناردە خوارێ، بێ شك بۆ هەموو خێر و چاکەیەك،ڕێنمایی و ڕووناکایی تێدایە هەموو ئەو پەیامبەرانەی (بەنی اسرائیل)_کەبەرفەرمان و ملکەچی بڕیاری خوا بوون_هەر بەو تەوراتە داوەری (موسایی) یەکانیان دەکردو زانا خواناس و شەرع زانەکانیشیان).**

**ئەو پێغەمبەرانە بەتەورات حوکمیان دەکرد کە دابەزیوەتە سەر موسی و بەشەریعەتێکی سەربەخۆ نەهاتوون، بەجیاواز لەگەڵ** (الرسول) **دا چونکە بەشەریعەتێکی سەربەخۆوە دێت و فەرمانی پێ دەکرێت بەگەیاندنی، بەڵام** (النبي) **فەرمانی پێ دەکرێت بە گەیاندنی پەیامەکەی پێش خۆی، ڕەنگە بۆ باسێکی تایبەت وەحی بۆ بکرێت، ئەمە جیاوازییەکەیە، جا هەرکەسێك بەتەنها یەك پێغەمبەر بێ باوەڕ بێت ئەوا بێ باوەڕە بەهەموویان، تەنانەت ئەو بێ باوەڕە بەو پێغەمبەرەی بانگەشەی ئەوە دەکات باوەڕی پێی هەیە، چونکە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بران، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت:** (الأنبياء إخوة لعلات)[٦٧] **واتە: پێغەمبەران بران)**

٦٧ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٣٢٥٨) ومسلم (٢٣٦٥) .

(علات) واته: چەند برایەك یەك باوكیان هەبێو دایكیان جیاواز بێت) یەك زنجیرەن، ڕێگاكەیان یەك ڕێگایە، جا هەركەسێك یەكێكیان بەدرۆ بخاتەوەو باوەڕی پێ نەكات ئەوا هەمووی بەدرۆ خستۆتەوە، چونكە ئەوەی ئەم پێیەتی ئەویتریش پێیەتی، هەموویان پێغەمبەری خوان، جا ئەو كەسەی بانگەشەی ئەوە دەكات باوەڕی بە(موسا) یە (علیه الصلاة والسلام) وەكو جولەكەكان و بێ باوەڕن بە (عیسا و محمد) (علیهما الصلاة والسلام) ئەوە بێ باوەڕن بەهەموو پێغەمبەران، تەنانەت بێ باوەڕن بەو پێغەمبەرەی بانگەشەی ئەوە دەكەن باوەڕیان پێی هەیە ئەویش (موسا) یە، چونكە ئەو كیتابەی موسا هێناویەتی باسی (محمد) (ﷺ) دەكات، خوای گەورە دەفەرموێت: (الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالْأَغْلَالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنْزِلَ مَعَهُ أُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (١٥٧) الاعراف) واته: ئەوانەن شوێنی ئەو پەیامدارو هەواڵدەری خوایە كە نەخوێندەیە (مەبەست لەئوممی) كەسێكە هیچی نەخوێندبێ و نەنوسیبی. ئەو پێغەمبەرەی ناوو سیفەتەكانی لەتەورات و لەئینجیلدا نوسراوەو لای خۆیان دەستیان دەكەوێ فەرمانیان بەچاكە پێ دەكا و لەشتی خراپ و ناپەسەند ڕێیان لێ دەگرێت هەموو شتێكی پاك و خاوێنیان بۆ حەڵاڵ دەكا هەموو شتێكی پیس و زیانبەخشیان لێ یاساغ ئەكاتو بارو تەكلیفی قورس و كۆت و زنجیری لەسەریان شەتەك درابوو لای دەبا، ئینجا ئەوانەی بڕوایان بەو پەیامبەرە هێناو بەڕێزو حورمەتەوە ڕایان گرت و هاوكاری و پشتگیریان لێ كردو دوای ئەو ڕووناكیەش كەوتن لەگەڵیا نێردراوە ئەوانە بەختیارو سەرفرازن).

بەڵام حەسودی وای لێكردوون بێ باوەڕ بن بە (محمد) (ﷺ) چونكە ئەوان دەیانەوێت پێغەمبەرایەتی لەبەنی ئیسرائیل نەچێتە دەر ئەوان دەیانەوەی فەزڵی خوا

قـۆرخ بکـەن، (أَمْ يَحْسُدُونَ النَّاسَ عَلَى مَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ (٥٤)النساء)واتـە: یـان ئیرەیی‌و حەسادەت بە پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی ئەبەن لەبەر ئەوە کەخوا ئەو پلەو دەسەڵاتەی _لەفەزڵ و میهرەبانی خۆی_ پێ داون؟).

ئەوەی وای لێکردوون حەسودی و خراپەکارییە، ئەگەر نا ئـەوان بـاش دەزانـن ئـەو پێغەمبـەری خوایـە(ﷺ)، چـونکە باسـی ئـەم پێغەمبـەرە لەتـەورات و ئینجیلـدا دەبیننـەوە، هـەروەها عیـسا مـوژدەی بـەهاتنی (محمـد) (ﷺ) داوە خـوای گـەورە دەفـەرموێت: (وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنْ بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ (٦) الصف) واتـە: بیریـان بێنـە کاتێ عیسای کوڕی مەریەم وتی: ئەی نەوەکانی یەعقوب ! بێ گومـان مـن پێغەمبـەرو نێرراوی خوام بۆلای ئێـوە ددانـیش بـەو تەوراتـەدا دەنـێم لەبەردەستمدایە مـزگێنیش بەهاتنی پەیامبەرێك دەدەم _پاش خۆم دێ_ ناوی (ئەحمەد)ە(ﷺ)).

ئایە ئەو پێغەمبەرە کێ یە لە پاش عیسا هـاتوە؟ هـیچ پێغەمبـەرێك لـەپاش عیـسا نـەهاتوە تـەنها (محمـد) (ﷺ) نـەبێت و ناویـشی (ئەحمـەد)ەو ناویـشی (محمـد)ە، خاوەنی چەندین ناوە، جا هەرکەسێك بێ باوەڕ بێ بە (عیسا) (علیـه الـصلاة والـسلام) ئەوا بێ باوەڕ بووە بەهەموو پێغەمبەران و هەرکەسێك بێ باوەڕ بێت بە (محمد) (ﷺ) ئەوا بێ باوەڕە بەهەموو پێغەمبەران، بۆیە خوای گەورە دەفـەرموێت: (كَذَّبَتْ قَوْمُ نُوحٍ الْمُرْسَلِينَ (١٠٥) الشعراء) واتـە: هـۆزی (نـووح)یـش، پەیامبـەرانیان بـەدرۆ خـستەوەو بڕوایان پێ نەهێنان).

لەگەڵ ئەوەی یەکەم پێغەمبەر نوح بووەو ئەوانیش (نوح)یان بەدرۆخستەوە، بـەڵام دەڵێـت پێغەمبـەرانیان بەدرۆخـستەوە واتـە ئەوانـەی لـەپاش ئـەو هـاتن، چـونکە هەرکەسێك یەك پێغەمبەر بەدرۆ بخاتـەوەو بـاوەڕی پێـی نـەبێت ئـەوا هـەمووی بـەدرۆ خـستۆتەوەو بـاوەڕ بـە هـەمووی نـەهێناوە، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: (كَذَّبَتْ ثَمُودُ

الْمُرْسَلِينَ (١٤١) الشعراء) واتــە: هــۆزی (ثمــود)یــش، پەیامبــەرانیان بــەدرۆ خــستەوەو بڕوایان پیێ نەهێنان).

خوای گــەورە دەفــەرموێت: (كَذَّبَ أَصْحَابُ الْأَيْكَةِ الْمُرْسَلِينَ (١٧٦)الـشعراء) واتــە: خاوەنـانی باخــە چــڕو پڕەكــە هــەموویان پەیامبــەرانیان بــەدرۆزن دانـا و بڕوایــان پــێ نەهێنا).

كەواتە هەركەسێك بیێ باوەڕ بێت بەیەكێكیان بیێ باوەڕە بە هەمووی، خـوای گـەورە دەفەرموێت: (إِنَّ الَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ وَيُرِيدُونَ أَنْ يُفَرِّقُوا بَيْنَ اللَّهِ وَرُسُلِهِ وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَنْ يَتَّخِذُوا بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلًا (١٥٠) أُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ حَقًّا.. (١٥١) النساء) واتــە: بــێ گومــان ئەوانــەی وادڵیــان دژی خــواو پێغەمبــەرەكانێتی وەدەشیانەوێ لەنێوان خـواو پێغەمبەرەكانیـدا فـەرق و جیـاوازی دانـێنو دەڵێن ئێمـە باوەڕ بەهەندێكیان دەكەین و هەندێكیشیان بـەجێی بـاوەڕ نـازانین و دەشیانەوێ لـەو نێوانــەدا ڕێگەیــەك بــۆ خۆیــان دیــاری بكــەن(١٥٠) بــێ دوو دڵــی ئەمانــە كــافرو خوانەناسن.... (١٥١).).

هەرچەندە ئەوان باوەڕیان بەهەندێكیان بوە بەڵام باوەڕ هێنـان بەهەنـدێكیان بـەس نییە، بەڵكو پێویستە باوەڕ بەهەموویان بهێنرێت چونكە هەموویان پێغەمبـەری خـوان، هەموویان لەلایەن خوداوە هاتوون یەكەمەكەیان موژدە دەدات بەهاتنی دوایینەكـەیان، دوایینەكـەیان بـاوەڕی بەیەكەمەكـەیان هێنـاوە، ئەمــە مەزهــەبی موسـڵمانان و ئــەهلی سوننەو جەماعەیە.

**﴿٢٤﴾ نوسەر دەڵێت: (والإيمان بأن الجنة حق والنار حق، وأنهما مخلوقتان، الجنة في السماء السابعة، وسقفها العرش، والنار تحت الأرض السابعة السفلى، وهما مخلوقتان، قد علم الله تعالى عدد أهل الجنة ومن يدخلها، وعدد أهل النار ومن يدخلها، لا تفنيان أبدا، بقاؤهما مع بقاء الله أبد الآبدين، ودهر الداهرين، وآدم عليه السلام كان في الجنة الباقية المخلوقة، فأخرج منها بعدما عصى الله عز و جل).**

واتە: باوەڕ بەوەی بەهەشت حەقەو ئاگر حەقە، هەردوكیان ئێستا دروستكراون، بەهەشت لەئاسمانی حەوتەمەو سەقفەكەی عەرشی پەروەردگارە، ئاگریش لەژێرەوەی حەوت چینی زەوییە، هەردووكیان دروستكراون، خوای گەورە ژمارەی ئەهلی بەهەشت دەزانێ وژمارەی ئەوانەی دەچنە بەهەشتەوەو ژمارەی ئەهلی ئاگرو ژمارەی ئەوانەی دەچنە ئاگرەوە دەزانێ، هەرگیز لەناو ناچن‌و مانەوەیان هەتا هەتایە، مانەوەیان لە گەڵ مانەوەی خوای گەورەیە تا هەتایە و ئادەم لەم بەهەشتە دروستكراوەكە بوو، لەپاش ئەوەی سەرپێچی خوای كرد دەركرا.

ڕاڤە/

لەپایەكانی ئیمان: باوەڕهێنانە بەڕۆژی دوایی و هەموو ئەوەی تێیدایە، ئەوەی لەڕۆژی دواییدا هەیە: بەهەشت و دۆزەخە، ئەو دوو جێگایە ماڵ و جێگای پاداشتن، جا ئیمانداران لەبەهەشتدان، بۆ خۆپارێزان ئامادەكراوە، بێ باوەڕان لە ئاگردان، بۆ بێ باوەڕان ئامادەكراوە، ئەو دوو جێگایە ماڵی پاداشتن، دونیایش ماڵی كاركردنەو پاداشتی تێدا نییە، دوا ڕۆژیش ماڵی پاداشتەو كاری تێدا نییە، جا هەركەسێك باوەڕ بەبەهەشت‌و دۆزەخ نەكات ئەوە بێ باوەڕە، چونكە پێویستە لەباوەڕهێنان بەڕۆژی دوایی باوەڕهێنانە بە هەموو ئەوەی بە (صحیح)ی دەربارەی ڕۆژی دوایی هاتوە،

ئەوەی لەڕۆژی دواییدا هەیە بەهەشت و دۆزەخە، ئەمە لەقورئاندا لەچەندین شوێن باسکراوە، جا هەرکەسێك باوەڕی پێیان نەبێ و یان تەئویلیان بکات وەکو (القرامطة) و(الباطنية) چونکە ئەوان تەئویلیان دەکەن، جا ئەوانە بێ باوەڕن بەخوا، بۆیە دەبێ باوەڕ بەبەهەشت و دۆزەخ ببێ، ئەو دووماڵە دوومالّی حەقیقین، جێگایەکی بۆ بڕوادارانەو جێگایەکی بۆ بێ باوەڕانە، هەردوو دەمێننەوەو ئێستا هەن، ئێستا دروستکراون، دەمێننەوەو هەرگیز لەناو ناچن، خوای گەورە دەربارەی بەهەشت دەفەرموێت: (أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ (١٣٣) آل عمران) واتە: ئامادەکراوە بۆ پارێزکاران).

دەربارەی ئاگر دەفەرموێت: (أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ (١٣١) آل عمران) واتە: ئامادەکراوە بۆ بێ باوەڕان).

وشەی (أُعِدَّتْ): بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئێستا هەن و ئامادەکراون، مانای ئەوە نییە لەپاشدا دروست دەکرێن، بەبەڵگەی ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی چەند شتێکی کردوە بەڵگەن لەسەر بوونی بەهەشت و دۆزەخ لە ئێستادا، لەو بەڵگانە ئەو فەرموودەیە کە دەفەرموێت: (إن شدة الحر من فيح جهنم)[68] واتە: سەختیو توندی گەرمایی لە گڕو گەرمی جەهەنەمە).

دەربارەی توندی ساردییەکەی فەرمویەتی: (جعل الله لجهنم نفسين: نفساً في الصيف، وذلك أحرُّ ما تجدون، ونفساً في الشتاء، وذلك شدة البرد فهو من زمهرير جهنم)[69] واتە: خوای گەورە دوو هەناسەی بۆ جەهەنەم داناوە: هەناسەیەکی لە هاویندا، ئەویش سەخترین گەرماییە کە دەیبینین وە هەناسەیەکی لە زستاندا، ئەویش سەخترین ساردییە هەر ئەویش لە زەمهەریری جەهەنەمە).

---

٦٨ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٥١١) ومسلم (٦١٦) .

٦٩ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٥١٢) ومسلم (٦١٧،٦١٥) .

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئێستا هەن، هەروەها بەهەشتیش ئێستا هەیە خوای گەورە بۆ خۆپارێزان ئامادەی کردووە، چەند فریشتەیەکی بۆ دیاری کردووە، لە فەرموودەکەی (عبادە)ی کوڕی (الصامت)دا هاتوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (من شهد أن لا اله الا الله، وأن محمداً رسول الله، وأن عيسى عبدالله ورسوله، وكلمته ألقاها الى مريم، وروح منه، وأن الجنة حق و النار حق، أدخله الله الجنة على ما كان من العمل)[٧٠]. واتە: هەرکەسێ شایەتی بدات کەوا هیچ خوایەك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت و محمد (ﷺ) پێغەمبەری‌و نێردراوی ئەوەو عیسا بەندەو پێغەمبەری ئەوە، وشەیەکی پیرۆزی ئەو هەڵی داوە بۆ مریەم و بەخشییە ئەو و ڕۆحێکە لە لایەن خوداوە دروستکراوە، بەهەشت حەقەو دۆزەخ حەقە، ئەوا خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە ئەگەر لەسەر هەر کارێك بێت).

بەڵگە لەم فەرموودەدا ئەوەیە کە دەفەرموێت: (وأن الجنة حق و النار حق). هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) شەوانە نوێژەکانی بەو دوعایە دەست پێ دەکرد: (لقاؤك حق ووعدك الحق والجنة حق والنار حق)[٧١] واتە: (گەیشتن بە تۆ ڕاستو ڕەوایە، بەڵێنەکانت ڕاستو ڕەوان، بەهەشت ڕاستو ڕەوایەو ئاگر ڕاستو ڕەوایە).

مەبەست لە: (وأنهما مخلوقتان) واتە: ئێستا دروستکراون.

مەبەست لە: (الجنة في السماء السابعة وسقفها العرش).

ئەمە لە فەرموودەیەکی (صحیح)دا هاتوە: (إن في الجنة مائة درجة، أعدها الله للمجاهدين في سبيل الله، ما بين الدرجتين كما بين السماء والأرض، فإذا سألتم الله فأسلوه

---

٧٠ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٣٢٥٢) ومسلم (٢٨) .

٧١ / متفق عليه : أخرجه البخاري (١٠٦٩) ومسلم (٧٦٩) .

الفردوس، فإنه أوسط الجنة، وأعلى الجنة و فوقه عرش الرحمن، ومنه تفجر أنهار الجنة)[٧٢] **واتە: لە بەهەشتدا سەد پلە هەیە، خوای گەورە ئامادەی کردوە بۆ تێکۆشەران ئەوانەی لە پێناو ئەودا تێدەکۆشن، لە نێوان دوو پلەیدا هەروەکو نێوان ئاسمان و زەوییە، جا هەر کاتێك داواتان لە خوا کرد ئەوا داوای فیردەوس بکەن، چونکە ئەوە ناوەراستی بەهەشتەو بەرزترین جێگەی بەهەشتەو عەرشی خودا لەسەرەوەی ئەوە، هەر لەوێوە روبارەکانی بەهەشت دەردەچێت).**

**بەڵگەیە بەهەشت لەئاسمانە لە (علیین) خوای گەورە دەفەرموێت:** (كَلَّا إِنَّ كِتَابَ الْأَبْرَارِ لَفِي عِلِّيِّينَ (١٨)المطففين) **واتە: ئاگادارین! کارنامەی چاکان لەجێگایەکی زۆر بەرزو بڵنددایە لەبەهەشتدا) سەرەوەی هەر شتێك.**

**ئاگریش لەخواری خوارەوەیە:** (كَلَّا إِنَّ كِتَابَ الْفُجَّارِ لَفِي سِجِّينٍ (٧) وَمَا أَدْرَاكَ مَا سِجِّينٌ (٨)المطففين) **واتە: دەست لەیاریکردن بەپێوانەو تەرازوو هەڵگرن بەڕاستی کارنامەی بەدکاران لەجێگایەکی زۆر تەنگ و قوڵی دۆزەخ دایە پێی دەڵێن (سجين) (٧) چی تۆی شارەزا کرد (سجين) چییە؟ (٨).**

**مەبەست لە:** (قد علم الله تعالى عدد أهل الجنة ومن يدخلها).

**خوای گەورە بەعیلمی ئەزەلی خۆی هەموو شتێك دەزانێ، لەوانە:- ئەهلی بەهەشت دەزانێ و دەزانێ کێ دەچێتە ناوی و ئەهلی دۆزەخ دەزانێ و دەزانێ کێ دەچێتە ناوی، هیچ شتێك لای ئەو شاراوە نییە هەموو شتێکی زانیوەو لە** (اللوح المحفوظ)**دا نوسیویەتی.**

**مەبەست لە:** (لاتفنيان أبداً).

---

٧٢ / قال الألباني في "السلسلة الصحيحة" ٢ / ٦٢٦ : أخرجه البخاري (٤ / ١٤، ٩ / ١٠١ ) و أحمد (٢ / ٣٣٥، ٣٣٩ ) و البيهقي في " الأسماء " (٣٩٨ ) .

بەهەشتو دۆزەخ دەمێننەوەو هەرگیز لەناو ناچن، ئەمەش وەڵامی ئەو کەسانەی تێدایە کەوا دەڵێن بەهەشت و دۆزەخ لەناو دەچن و نامێنن، دەڵێن: بۆ ئەوەی بەشداری نەکەن لەگەڵ خوادا لەمانەوەیاندا، ئەوانە ڕێگرن لەبوونی زنجیرەیی لە ڕابوردوودا و زنجیرەیی لەئایندەدا، ئەمەش نەفامی ئەوانە. ئێمەیش دەڵێین:- جیاوازی هەیە لەئەبەدییەتی خوا و ئەبەدییەتی بەهەشت و دۆزەخدا، ئەبەدییەتی خوا لایەقی خۆیەتی، سیفەتێکە لەسیفەتەکانی بەڵام ئەبەدییەتی بەهەشتو دۆزەخ بە مانەوەی خودایەو دروستکراوی خوایە، کەواتە ئەبەدییەتێکی دەستکەوتە، خوای گەورە خۆی ئەبەدییەتی پێ بەخشیوە، بەڵام ئەزەلییەتو ئەبەدییەتی خوا سیفەتێکە لەسیفەتەکانی، واتە سیفەتێکی زاتی خۆیەتی.

مەبەست لە: (بقاؤهما مع بقاء الله أبد الآبدين).

مانەوەیان لەگەڵ مانەوەی خودایە، مانەوەی خوا کۆتایی نییە هەروەها مانەوەی بەهەشت و دۆزەخ کۆتایی نییە، هیچ لە یەکچوونێك لەنێوان ئەو دوو مانەوەو ئەو دوو ئەبەدییەتەدا نییە وەکو سیفەتەکانی تر.

مەبەست لە: (ودهر الداهرين) بۆ دڵنیابوونە.

مەبەست لە: (وآدم عليه السلام كان في الجنة الباقية المخلوقة).

کاتێ خوای گەورە (ئادەم)ی دروست کردو ئەو ڕێزەی لێنرا لە لایەن خوداوە، فەزڵی ئەو دەرکەوت بەسەر فریشتەکاندا، ئیبلیس حەسوودی برد لەسەر ئەوەو سوژدەی بۆ نەبرد، سەرپێچی خوای گەورەی کرد لە ڕووی حەسادەتو خۆ بەزلزانینەوە. خوای گەورە بەئادەمی فەرموو: (اسْكُنْ أَنْتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا (٣٥) البقرة) واتە: خۆتو هاوسەرەکەت (حەوا) لەبەهەشتدا نیشتەجێ بن‌و لەهەرکوێی حەز دەکەن ڕزق و ڕۆزی بەرفراوان بخۆن).

بۆیــە دابەزینــە ســەر زەوی، خــوای گــەورە لــەئادەم خــۆش بــوو چــونکە خــۆی و خێزانەکــەی تەوبــەیان کــردو گەڕانــەوە، (قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنْفُسَنَا وَإِنْ لَمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ (٢٣) الاعراف) واتە: وتیان: پەروەردگارمان! تـاوانی خۆمـان بـوو، هەر خۆشمان بووین ستەممان لەخۆمان کـرد، ئێستایش ئەگـەر لێمـان خـۆش نـەبی و میهرەبانیمان لەگەڵ نەکەیت دەچینە ڕیزی زیانمەندانەوە).

(وَعَصَى آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَى (١٢١) ثُمَّ اجْتَبَاهُ رَبُّهُ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَى (١٢٢) طه) واتــە: لەبەری درەختەکەیان خوارد ئیتر جلو بەرگی بەهەشتیان لەبـەرا نـەماو ڕووت و قـووت مانـەوەو شـەرمی خۆیـان بـۆ دەرکـەوت بەپەلـە خـەریك بـوون و هـەوڵیان دا بەگـەڵای درەختەکانی بەهەشت عـەورەتیان داپۆشـن (١٢١) ئـا بـەم شـێوەیە ئـادەم سەرپێـچی لەپــەروەردگاری خــۆی کــردو لــەڕێ دەرچــوو پاشــان پــەروەردگاری هەڵیبــژارد بــۆ پێغەمبەرێتیو لەخۆی نزیکی خستەوەو تەوبەشی لێ وەرگـرتو شـارەزاو ڕێنمـایی کـرد (١٢٢).

جـا ئـادەم و حـەوا تەوبـەیان کـردو گەڕانـەوە بـۆلای خـوا، خـوایش تەوبەکـەیانی وەرگرت، بەڵام ئیبلیس بەردەوام بوو لەخراپەکارییەکەی و تەوبەی نەکرد، بۆیە خـوای گەورە لەڕەحمەتی خۆی دووری خـستەوەو لەعنـەتی لێکـردو کردویەتییـە سەرچـاوەی هەموو خراپەکارییەك.

مەبەست لە: (فأخرج منها بعدما عصى الله عز و جل).

دەرکردنی لەبەهەشت وەکو سزایەکی تاوانەکەی بوو، بەڵام تەوبەی کردوو گەڕایەوە بۆلای خوا، هەروەکو خوای گەورە ئەوەی بۆ باسکردووین لە قورئاندا.

**﴿٢٥﴾ نوسەر دەڵێت: (والإيمان بالمسيح الدجال).**

واتە: باوەڕهێنان بە – هاتنی– مەسیحی دەججال.

ڕاڤە:

لەبنەماکانی ئەهلی سوننەو جەماعەیە:– باوەڕهێنانە بەهاتنی مەسیحی دەججال، ئەویش کابرایەکە لەنەوەی ئادەم لەناو جولەکەکاندا دەردەچێت و جولەکەکان شوێنی دەکەون، ئەویش ئەو (مەهدی)یەیە جولەکەکان چاوەڕوانی ئەون، چونکە مەهدی هەموو کەسێك بانگەشەی بۆ دەکەن، جولەکە بانگەشەی بۆ دەکەن و باوەڕیان پێیەتی‌و مەهدییەکەی ئەوانش (مەسیحی دەججال)ە، گرووی شیعە چاوەڕوانی ئەو (مەهدی)یە دەکەن لەژێرزەمینەکەدا خۆی شاردوەتەوە هەروەکو دەڵێن‌و لەنەوەی ئیمامی حوسێنە، ئەهلی سوننەو جەماعەش چاوەڕوانی ئەو مەهدییە دەکەن کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی بۆ کردووین لە فەرمووده ڕاست و دروست و (متواتر)ەکاندا بەمانا، ئەویش کابرایەکە لە (آل البيت) ی پێغەمبەرەو لەنەوەی (حەسەن)ی کوڕی (عەلی)یە، لەکۆتا سەردەمدا دەردەچێ و موسڵمانان بەیعەی پێ دەدەن و لەپێناوی خوادا جیهاد دەکات، زەوی پڕ دەکات لە دادپەروەری و پێش نوێژی بۆ موسڵمانان دەکات، لەکاتێکدا ئەوان بەو شێوەن مەسیحی دەججال دەردەچێ، بەردەوام موسڵمان لەتێکۆشاندان بەرانبەر بەئەو تاکو عیسا ی کوڕی مەریەم دادەبەزێ کەواتە لەوێدا دوو (مەسیح) هەیە:_

١/ مەسیحی گومڕایی ئەویش دەججالە.

٢/ مەسیحی هیدایەت ئەویش عیسای کوڕی مەریەمە.

مەسیحی دەججال پێی دەگوترێت (المسيح) لەبەر پەلە ڕۆیشتنی بەسەر زەویدا، چونکە خوای گەورە هۆکارەکانی بۆ ئاسان دەکات بتوانێ بەو پەلەیە بەسەر زەویدا

بـڕوات، بـۆ ئـازاردان و خراپـەکاری و فیتنـە، پێـی دەگوترێـت دەججـال ئـەویش لـە (دجل)ەوە هاتوە بە واتای (درۆ) دێت، چونکە دەججال: زیادەڕەوەی دەکات لەدرۆدا، ئەو کەسێکی درۆزنە، تاکو ئەو رادەیەی بانگەشەی ئەوە دەکات ئـەو خوایـە، خـەڵکی بەهۆیەوە تووشی فیتنە دێن تەنها کەسانێك نەبێت خوای گـەورە دامـەزراوی کـردبێتن، بەهەشت و ئاگری پێیـە، شـتی نائاسـایی ئـەنجام دەدات ئـەویش بریتـی یـە لـە: شـتی نائاسایی شەیتانییەو کەرامات نییە، بەڵکو شـتی نائاسـایی شـەیتانییە، خـوای گـەورە لەسـەر دەسـتی ئـەنجامی دەدات بـۆ فیتنـەو تاقیکردنـەوەی بەنـدەکان، هـاتنی زۆر ترسـناکە بۆیـە پێغەمبـەران خـەڵکیان لێ ئاگـادار کردوەتـەوە، لەهـەموویان زیـاتر پێغەمبەرمان (محمد) (ﷺ) خەڵکی ئاگادار کردووەتـەوەو فـەرمانی پـێ کـردوین پـەنا بەخوا بگرین لە فیتنەی ئەو لە دوایین (تشهد)ی نوێژەکانمانـدا، چـونکە ئێمـە پـەنا بـە خوا دەگرین لە چوار شت: لـە سـزای جەهەنـەم و سـزای نـاو گـۆڕ و لەفیتنـەی ژیـان و مردن و لە فیتنەی مەسیحی دەججال.

فیتنـەی دەججـال گـەورەترین فیتنەیـە لەسـەر ڕووی زەویـدا ڕوودەدات _ پـەنا بـە خوا_ ئەمە مەسیحی دەججالە، لەو کاتەی ئەو تەنگی بەموسڵمان هەڵچنیوەو ئازاریـان دەداو تاقییـان دەکاتـەوە لـەو کاتـەدا مەسـیح (عیـسای کـوڕی مەریـەم) لەئاسمانـەوە دادەبـەزێت، شـوێن دەججـال دەکـەوێت و دەیکوژێـت، موسـڵمان لەخراپـەی ڕزگاریـان دەبێ و دەسەڵات دەگرێتە دەست و لەسەر زەویدا دادپەروەری بەرقەرار دەکات و خاچ دەشـکێنێ و بـەراز دەکوژێـت و هـیچ دینێـك نـامێنێ تـەنها دینـی ئیـسلام نـەبێت، یەهودییەتو نەصرانییەت و هەموو دینە کافرەکانی تر پووچەڵ دەکاتەوە، هیچ دینێك نامێنێ تەنها ئیسلام نەبێ و بە شەریعەتەکەی (محمد) (ﷺ) حـوکم دەکـات و دەبێتـە شـوێنکەوتەی ئـەو چـونکە هـیچ پێغەمبـەرێك لـەپاش محمـد (ﷺ) نییـە، (مەسـیح)

دادەبەزێ وەکو شوێنکەوتەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، بە شەریعەتەکەی ئەو حوکم دەکات، شەریعەتی ئیسلام، ئەمە باسی دەرکەوتنی دەججال و دابەزینی مەسیحە.

بە عیسا دەگوترێت مەسیح:- دەڵێن چونکە دەست بەسەر هەر نەخۆشییەکدا بهێنێ ئەوا بە ئیزنی خوا چاك دەبێتەوە، ئەمەش لە(موعجیزات)ی ئەوە، ئەو دەستی دەهێنێ بەسەر چاوی کوێرو کوێری زکماك و گەڕ دا بەهۆی دەست پێ هێنانەکەیەوە چاك دەبێتەوەو نامێنێ بۆیە پێی دەگوترێت مەسیح بە واتای: (الماسح).

**﴿٣٦﴾ نوسەر دەڵێت: (والإيمان بنزول عيسى ابن مريم (عليه السلام) ينزل فيقتل الدجال ويتزوج ويصلي خلف القائم من آل محمد (ﷺ) ويموت ويدفنه المسلمون).**

واتە: باوەڕهێنان بەدابەزینی عیسای کوڕی مەریەم (عليه السلام)، دادەبەزێ و دەججال دەکوژێت، ژن دەهێنێ‌و نوێژ دەکات لەپشت مەهدییەوە کە لە بنەماڵەی پێغەمبەری خودایە(ﷺ) و دەمرێت و موسڵمانان دەینێژن.

مەبەست لە: (والإيمان بنزول عيسى ابن مريم (عليه السلام)).

ئەوەش لەنیشانە گەورەکانی قیامەتە.

مەبەست لە: (نزوله).

واتە لەئاسمانەوە، چونکە خوای گەورە بەرزی کردەوە کاتێ جولەکەکان ویستیان بیکوژن، هاتن بۆلای بەمەبەستی کوشتن و لەخاچدانی و چوونە ژوورەوە بۆلای، خوای گەورە لەبەر دەستیاندا بەرزی کردەوە لەکاتێکدا ئەوان هەستیان پێ نەکرد، شێوەی عیسا درا بەسەر کابرایەکدا ئەوانیش ئەو کابرایەیان کوشت وایان زانی مەسیحە، کەچی ئەو نەبوو، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَكِن شُبِّهَ لَهُمْ (١٥٧) النساء) واتە: کەچی نە توانییان بیکوژن و نە توانیشیان لە قەنارەی بدەن وەکو خۆیان کردیانە هەرا، بەڵکو سەریان لێ تێکچوو بوو، پیاوێکیان دێت لە بیچم و شکڵدا وایان زانی (عیسا)یە و لە قەنارەیان دا).

خوای گەورە شێوەی دا بەسەر ئەو کابرایە، دەڵێن:- چونکە ئەو پیاوە شوێنی عیسای بەئەوان گووت، خوای گەورە بەو شێوەیە تۆڵەی لێ سەندەوە، هەروەها دەڵێن:- ئەو کابرایە لەشوێنکەوتووانی (عیسا) بوو لە (الحواريين) بوو عیسا پێی

فەرموو:- خوای گەورە شێوەی من دەخاتە سەر تۆ و بەهەشتت دەست دەکەوێت، ئەو کابرایەش ڕازی بوو بە شوبهاندن بە ئەو و بە کوشتن و لەخاچدان، چونکە ئەو بەوە بەهەشتی دەوێ.

مەبەست لە: (ينزل فيقتل الدجال).

دەججال دەکوژێت لەدەرگای (لد) ئەویش جێگایەکی دیارو ئاشکرایە، عیسای کوڕی مەریەم بەدوای دەججالدا دەچێ، کاتێ دەیبینێ دەججال دەتوێتەوە، هەروەکو چۆن خوێ لەئاودا دەتوێتەوە، ئەمجار لێی نزیك دەبێتەوە بەخەنجەرەکەی لێی دەدا و دەیکوژێ.

مەبەست لە: (ويتزوج ويصلي خلف القائم من آل محمد (ﷺ)).

مەبەست لە: (ويتزوج) لەچەند ئەسەرێکدا هاتووە کەچی جێگیرو ئیسپات نەبوە[٧٣].
بەڵام نوێژکردنی لەپشت مەهدییەوە ئەوە جێگیر و سابیتە، مەهدی داوای لێ دەکات پێش نوێژی بکات بۆ موسڵمانان، چونکە ئەو لەکاتی نوێژی بەیانیدا دادەبەزێ، موسڵمان کۆبونەتەوە بەمەبەستی ئەنجامدانی نوێژ، بۆیە مەهدی داوای لێ دەکات پێش نوێژی بۆ موسڵمانان بکات، (مەسیح)یش دەڵێت: (لا، بعضكم لبعض أئمة)[٧٤] واتە: (نەخێر، هەندێکتان پێشەوای هەندەکەی ترن) بۆیە لەپشت مەهدییەوە نوێژ دەکات.

وە (القائم) مەهدییە، ناوی (محمدی کوڕی عبدالله)یە، ناوی وەکو ناوی پێغەمبەرە(ﷺ) و ناوی باوکی وەکو ناوی باوکی پێغەمبەرە (ﷺ)، ئەویش لەنەوەی (حەسەن ی کوڕی عەلی)یە، دەڵێن: حیکمەت لەوەدا -والله اعلم- کاتێ حەسەن

---

٧٣ / تەماشای : فتح الباري (٦/ ٤٩٣) و عمدة القاري (١٦/ ٤٠) بکە .

٧٤ / رواه مسلم : (١/١٣٧) برقم (١٥٦) .

لەخیلافەت هاتە خوارەوەو تەسلیمی دەستی معاوییەی کرد لەپێناوی پاراستنی خوێنی موسڵمان، خوای گەورە بەوە ڕێزداری کرد کەوا مەهدی لەنەوەی ئەو بێت.

مەبەست لە: (ويموت ويدفنه المسلمون).

ئەمە لەقورئاندا هاتوە، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِنْ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِ قَبْلَ مَوْتِهِ (١٥٩) النساء) واتە: کاتێ عیسا لە ئاسمان دێتە خوارێ گشت خاوەن کتێبەکان بەر لە مەرگی عیسا بڕوای پێ دێنن).

ئەو دەمرێت هەروەکو چۆن خەڵکی دەمرێت، (وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِنْ قَبْلِكَ الْخُلْدَ أَفَإِنْ مِتَّ فَهُمُ الْخَالِدُونَ (٣٤) الانبياء) واتە: ئێمە پێش لە تۆ وامان نەکرد مرۆیەك نەمرێ ئایا ئەگەر تۆ بمری، ئەوانە ژیانی هەتا هەتاییان دەبێ؟!)

ئەو لەکۆتایی تەمەنیدا دەمرێت ئەو تەمەنەی خوای گەورە بۆی نوسیوە، موسڵمانان دەینێژن هەروەکو چۆن مردوەکانیان دەنێژن.

**﴿٢٧﴾ نوسەر دەڵێت: (والإيمان بأن الإيمان قول وعمل ونية يزيد وينقص يزيد ما شاء الله وينقص حتى لا يبقى منه شيء).**

واتە: (باوەڕ بەوەی ئیمان وتەو کردەوەو نیەتە، زیاد دەکات و کەم دەکات، زیاد دەکات تا خوای گەورە ویستی لەسەر بێت، کەم دەکات تاکو هیچی لێ نامێنێ).

**ڕاڤە/**

(الایمان) لە زمانەوانیدا:- بەڕاستزانینێکی دڵنیاییە، کە دڵنیایی لە گەڵدایە و هیچ گومانی تێدا نەبێت، دەگوترێت: (آمن له) واتە: باوەڕی پێ کرد، بە راستی زانی، (وَمَا أَنْتَ بِمُؤْمِنٍ لَنَا (١٧) يوسف) واتە: باوەڕمان پێ ناکەیت، (فَآمَنَ لَهُ لُوطٌ (٢٦) العنكبوت) واتە: باوەڕی بە ئیبراهیمی مامی کرد.

بەڵام (الایمان) لەشەرعدا: بریتییە لە باوەڕبوون بەدڵ و وتنی بە زمان و کارکردن بەئەندامەکان، زیاد دەکات بەگوێڕایەڵی و کەم دەکات بەسەرپێچی، ئیمان دروست نابێت ئیللا بەهەموو ئەم شتانە نەبێ، جا هەرکەسێ باوەڕی پێ هێنا بەدڵی و بەزمانی باوەڕی پێ نەهێنا ئەوە ئیماندار نییە، چونکە خوای گەورە دەربارەی بێ باوەڕان فەرموویەتی: (قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُ لَيَحْزُنُكَ الَّذِي يَقُولُونَ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ (٣٣) الانعام) واتە: چاك ئەزانین بەو قسانەی کافرو بێ باوەڕەکان بەرامبەر بەتۆ دەیکەن دڵ زویر ئەبیت، لەڕاستیشدا لەسەر بنەمایەك بەدرۆزنت نازانن، بەڵکو لەبەر ئەمەیە ستەمکارو بێ باوەڕەکان، کردوویانە کە هەردەم نکوڵی و ململانێی ئایەتەکانی خوا بکەن).

دەربارەی فیرعەون فەرموویەتی: (قَالَ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا أَنْزَلَ هَؤُلَاءِ إِلَّا رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ (١٠٢) الاسراء) واتە: مووسا وتی: ئەی فیرعەون ! بەڕاستی تۆ چاك دەزانی

کە ئەو بەڵگەو ئایەتانە لەخۆیانەوە نەهاتوون بەڵکو هەر پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی ناردوونی).

هەروەها خوای گەورە دەربارەی بێ باوەڕان فەرموویەتی ئەوانەی ئایەتەکانی بەدرۆ دەخەنەوە: (وَجَحَدُوا بِهَا وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنْفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا (١٤) النمل) واتە: نکۆڵییان کردو لەناخی دەروونیاندا متمانەو یەقینیان هەبوو بەڕاستییان نکۆڵیان کردن لەڕووی ستەمکاری و خۆ بەزلزانینەوە).

کەواتە ئیمان هێنان تەنها بەدڵ بەس نییە هەروەکو گرووی (المرجئة) دەڵێن، ئەوە ئیمان نییە، هەروەها ئیمان تەنها بەزمان بەس نییە چونکە ئەمە ئیمانی دووڕووەکانە، (يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِمْ مَا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ) الفتح/١١) واتە: شتێ بەزمانیان دەڵێن غەیری ئەوەیە لەدڵیاندایە).

هەروەها ئیمان بەدڵ و وتنی بەزمان تەنها بەس نییە هەروەکو هەندێ لە (المرجئە)کان دەڵێن، ئەمە بەس نییە بەڵکو دەبێ بەئەندامەکان کار بکرێت، جا ئەو کەسەی ئیمان دەهێنێ بەدڵ و بەزمانی بەڵام نوێژ ناکات هەرگیزو ڕۆژوو ناگرێت وە فەرزی حەج جێ بەجێ ناکات، هیچ کارێک لەکارەکان ئەنجام نادات ئەوا کافرە، هەرچەندە بەزمانی ئیمان بهێنێ و بیڵێت و بەدڵی باوەڕی پێی هەبێت وەشایەتی بدات کە: (لا اله الا الله محمد رسول الله) بەڵام وازی لەکارکردن هێناوە بەبێ هیچ بیانوویەك ئەوە نایکاتە ئیماندار، ئیللا کەسێك نەبێت بە هۆی عوزرێکەوە واز لەکار بهێنی وەکو کەسێکی ناچار (مکره) یان لەبیری چووبێ یان نەفام، هەروەها کەسێك بێتە ناو ئیسلامەوە بەڵام نەتوانێ کارێك بکات، وەکو کەسێك ببێتە موسڵمان و یەکسەر بمرێت، ئەوە لێپرسینەوەی کاری لەگەڵدا ناکرێت چونکە ئەو نەیتوانی، هەروەها کەسێك عەقڵی تێك چوو بێت ئەو کەسە ناتوانێ کار بکات، بەڵام کەسێك بتوانێ کاربکات و بەیەکجاری وازی لێ بهێنێ ئەوە ئیماندار نییە.

**هەندێکیان بۆ پێناسەی ئیمان مەسەلەی چوارەمی بۆ زیادکردوە (هەروەکو نوسەر باسی کردوە) ئەویش شوێنکەوتنی سوننەتە، دەڵێن:** (الإيمان: قول واعتقاد و عمل وسنة) **واتە: ئیمان: وتەو باوەڕو کردەوەو سوننەت، واتە: شوێنکەوتنی سوننەت، بەم پێیە بیدعەکاران دەردەچن، ئەوانەی بەسوننەت کار ناکەن، بەڵکو بەداهێنراوەکان کار دەکەن ئەمەش نوسەر باسی کردووە لەو وتەیەی کە دەڵێت:** (نية وإصابة) **واتە: کارکردن بەسوننەت، بەڵام کەسێك بەهەڵە کاربکات لەبیدعەو خورافات و داهێنراوەکان ئەوە نابێتە ئیمانداران.**

**مەبەست لە:** (ويزيد بالطاعة)**.**

**ئەمە لە تەواوکاری پێناسەکەیە، کەوا ئیمان زیاد دەکات بە گوێڕایەڵی، ئەمەش بەڕوونی و ئاشکرا لەقورئاندا هاتوە:**

**خوای گەورە دەفەرموێت:** (وَيَزِيدُ اللَّهُ الَّذِينَ اهْتَدَوْا هُدًى (٧٦) مريم) **واتە: ئەو کەسانەش خوا ڕێنمای کردوون بۆ ڕێگەی سەرفرازی و بەختیاری، زیاتر ڕێنوێنیان ئەکا).**

**هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:** (وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا (٢) الأنفال) **واتە: هەرکە ئایەتەکانیشی دەخوێنرێتەوە بەسەریاندا باوەڕیان زیاد و بەهێز ئەبێ).**

(وَيَزْدَادَ الَّذِينَ آمَنُوا إِيمَانًا) المدثر /٣١) **واتە: بۆ ئەوەش بڕوادارەکان زیاتر بڕوایان دامەزرێت).**

**ئەمە ڕوون و ئاشکرایە کەوا ئیمان بەگوێڕایەڵی زیاد دەکات.**

**مەبەست لە:** (وينقص بالمعصية)**.**

**چونکە ئەو شتەی زیاد دەکات کەمیش دەکات، هەروەها لەفەرموودەیەکدا هاتوە:** (أن الذي لا ينكر المنكر بقلبه ليس وراء ذلك من الايمان حبة خردل)[٧٥] **واتە: ئەو کەسەی**

---

٧٥ / رواه مسلم (٦٩/١) برقم (٥٠) .

ئینکاری لە مونکەر ناکات چیتر لە پاش ئەوە بە ئەندازەی تۆوێکی خەردەل ئیمان نییە) .

بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئیمان لاواز دەبێت تاوەکو بە ئەندازەی دەنکە خەردەلێکی لێ دێت، هەروەها لەفەرموودەیەکی (صحیح)ی تردا هاتوە: (أنه يخرج من النار من كان في قلبه أدنى مثقال حبة من خردل من إيمان)[٧٦] واتە: خوای گەورە لە ئاگردا کەسانێك دەردەکات کە لە دڵیدا لە مسقاڵە تۆوێکی خەردەل کەمتر کەمتر ئیمان هەبێت).

بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئیمان لاواز دەبێت تاوەکو بە ئەندازەی دەنکە خەردەلێکی لێ دێت، خوای گەورە دەفەرموێت: (هُمْ لِلْكُفْرِ يَوْمَئِذٍ أَقْرَبُ مِنْهُمْ لِلْإِيمَانِ)آل عمران /١٦٧) واتە: ئەوانە ئەو ڕۆژە لەکوفرەوە نزیکتر بوون تا لەئیمان و باوەڕەوە.

ئیمانێکی لاوازیان هەیە، کە لە کوفر نزیکترن، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئیمان لاواز دەبێت، تاوەکو خاوەنەکەی نزیکترە لەکوفر_پەنا بەخوا_

ئەمە مانای: (وينقص حتى لا يبقى منه شيء).

کەم دەکات تاوەکو هیچی لێ نامێنێ، ڕەنگە بەقەد دەنکە خەردەلێکی لێ بمێنێتەوە ئەمەش خاوەنەکەی سوودی لێ دەبینێ و لەئاگر دەری دەکات، ئەگەر دەنکە خەردەلەکەش نەمێنێ ئەوا دەبێتە کەسێکی ئەهلی ئاگر بە تا هەتایی لەئاگردا دەمێنێتەوە.

---

٧٦ / رواه البخاري ومسلم .

**﴿٢٨﴾نوسەر دەڵێت: (وأفضل هذه الأمة والأمم كلها بعد الأنبياء صلوات الله عليهم أجمعين: أبو بكر ثم عمر ثم عثمان هكذا روي لنا عن ابن عمر، قال: كنا نقول ورسول الله (ﷺ) بين أظهرنا: إن خير الناس بعد رسول الله (ﷺ) أبو بكر وعمر وعثمان ويسمع بذلك النبي (ﷺ) فلا ينكره).**

واتە: باشترین کەس لەم ئوممەتەداو لەهەموو ئوممەتەکاندا لەپاش پێغەمبەران: (ئەبوبەکر)ە ئەمجار(عومەر)ە ئەمجار(عوسمان)ە، بەم شێوەیە لە (ئیبن عومەر)ەوە بۆمان گێڕدراوەتەوە، دەڵێت: ئێمە دەمانگوت –لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەنێوماندا بوو–: باشترین کەس لەپاش پێغەمبەری خوا (ﷺ) (ئەبو بەکر وعومەر وعوسمان)ە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەی دەبیست و ئینکاری لێ نەدەکرد.

ڕاڤە/

باشترین سەدەکان: ئەو سەدەیەیە پێغەمبەری خوای (ﷺ) تێیدا ڕەوانە کراوە، ئەمجار ئەوانەی پاش ئەوان دێن، ئەمجار ئەوانەی پاش ئەوان دێن، ئەو سێ سەدەیە باشترین سەدەن، باشترینی سێ سەدە باشەکە: بریتییە لەهاوەڵان،ئەمجار لەنێو خۆیاندا باشتر هەیە، جا باشترینیان (ئەبو بەکر صدیق)ـە، یەکەم کەس بوو ئیمانی بەپێغەمبەر (ﷺ) هێنا کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) رەوانە کرا، پشتیوانی لێ کردو بەرگری لێ کردو سەروەت و سامانەکەی لە پێناوی سەرخستنیدا خەرج کرد، لە گەڵیدا بوو تا کۆچی دوایی کرد، ئەمجار خیلافەتی گرتە دەست لەپاش ئەوو باشترین شێوە کارەکانی جێ بەجێ کرد، خوای گەورە لەسەردەستی دینەکەی دامەزراو کرد، لەپاش ئەوەی پێی خەڵکی کەوتە لەرزە بەمردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، خوای گەورە وەکو شاخەکان دامەزراوی پێ بەخشی، تاکو ئەم ئوممەتەی پێ دامەزراو بوو، لە سەردەستی ئەو هەڵگەڕاوەکان و بێ باوەڕان گەڕانەوە، ئیسلامی قایمو جێگر کرد لەپاش مردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەمجار کۆچی دوایی کردو بەتەنیشت

پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) نێژرا، جا ئەو هاوڕێ و هاوەڵی ئەوە بەزیندویی و بەمردوویی، هەر ئەویش هاوڕێ و هاوەڵی بوو لەئەشکەوتەکەدا، خوای گەورە دەفەرموێت: (إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لَا تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا) التوبة/٤٠) واتە: لە ئەشکەوتەکەی کێوی (سەور)دا بوون، لەو دەمەدا پەیامبەر (ﷺ) بە هاوڕێکەی خۆی (ئەبوبەکر)ی دەگوت: خەمی منت نەبێ‌و لەبەر من دڵتەنگ مەبە، دڵنیابە خوا لە گەڵماندایە).

جا ئەو باشترین کەسی ئەم ئوممەتەیە، ئەمجار لەپاش ئەو (عومەری کوڕی خەتتاب)دێت، خەلیفەی دووەم ئەمجار لەپاش ئەو (عوسمان) دێت، ئەمجار لەپاش ئەو (عەلی) دێت، ئەوانە چوار خەلیفە ڕاشیدیەکەن، خوایان لێ ڕازی بێت.

ئەمجار ئەو دوای دە کەسە باشەکە دێن شایەتی بەهەشتیان بۆ دراوە (العشرة المبشرة) ئەوانیش:- چوار جێ نشینەکەو (سعد ی کوڕی أبی وقاص) و (سعیدی کوڕی زید ی کوڕی عمرو کوڕی نفیل) و (طلحة ی کوڕی عبیدالله) و(الزبیر ی کوڕی العوام) و (أبو عبیده عامر ی کوڕی الجراح)و (عبدالرحمن ی کوڕی عوف)، جا ئەوانە دە کەسن شایەتی بەهەشتیان بۆ دراوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) شایەتی بەهەشتی بۆ داون، ئەوانە باشترین کەسی هاوەڵانن.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (أبو بكر في الجنة و عمر في الجنة و عثمان في الجنة و علي في الجنة و طلحة في الجنة و الزبير في الجنة و عبد الرحمن بن عوف في الجنة و سعد بن أبي وقاص في الجنة و سعيد بن زيد في الجنة و أبو عبيدة بن الجراح في الجنة)[٧٧].

ئەمجار لەپاش ئەوان:- ئەوانەی بەشداری جەنگی بەدریان کردوە، ئەمجار ئەوانەی بەشدارییان لە (بيعة الرضوان) کردوە لەکۆچەران و پشتیوانان، ئەمجار ئەوانەی موسڵمان بوون و کۆچیان کرد لەپێش ڕزگارکردنی مەککە ئەوانە باشترن لەوانەی کە

---

٧٧ / صحيح : أخرجه الترمذي (٣٧٤٧) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٥٠) .

موسڵمان بوون و لەپاش رزگارکردنی مەککە کۆچیان کرد، جا هاوەڵان لەباشیدا جیاوازییان هەیە، بەپێی پێشینی موسڵمان بوون و پایەیان لەئیسلامدا، هەروەها فەزڵێکی گشتییان هەیە هیچ کەسێك پێی ناگات ئەویش: هاوڕێتی کردنی پێغەمبەری خوایە(ﷺ) و کۆچکردنە، جا کۆچەران باشترن لەپشتیوانان، ئەم فەزڵە گشتی یە بۆ هەموویان هیچ کەسێك پێی ناگات ئەوانەی لەپاش ئەوان دێن، ئەوانە باشترین سەدەن و چاکترین سەدەن.

جا هەر کەسێك تانەیان لێ بدات یان ڕقی لەوان بێت ئەوە کافرە بە خوا، چونکە خوای گەورە ستایش و مەدحی ئەوانی کردووەو ئەوانی هەڵبژاردووە بۆ هاوڕێتی کردنی پێغەمبەرەکەی (ﷺ)، جا هەر کەسێك تانە لەهاوەڵان بدات یان بەکافریان بزانێ یان بەکەمیان بزانێ ئەوە کافرە بەخوا، خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بەدرۆ دەخاتەوە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: (وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ بِإِحْسَانٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ (١٠٠) التوبە) واتە: لەدەستەی یەکەمی پێشەنگی کۆچکەران و پشتیوانان و چاك پەیڕەوانی ئەوانیش خوا ڕازی بوو لێیان و ئەوانیش لەخوا ڕازی بوون).

(لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ (١٨) الفتح) واتە: بێ گومان خوا ڕازی بوو لەئیماندارەکان کاتێ _ لەژێر ئەو درەختە دا پێی دەڵێن (شجرة الرضوان) پەیمانیان لەگەڵ دەبەستیت).

مەبەست لە: (هكذا روي لنا عن ابن عمر، قال: كنا نقول - ورسول الله (ﷺ) بين أظهرنا -: إن خير الناس بعد رسول الله (ﷺ) أبو بكر وعمر ثم عثمان)[٧٨].

(ئەبوبەکر وعومەر) ئەمە ئیجماعی لەسەرە، بەڵام لە(عوسمان و عەلی)دا لە چاکێتیدا جیاوازی لەسەرە، هەندێکیان عوسمان بەباشتر دەزانن و هەندێکیان عەلی

---

٧٨ / رواه البخاري .

خوا لێیان رازی بێت، بەڵام (ئەبوبەکر وعومەر) هەردوو باشترین کەسی ئـەم ئوممەتـەن بەئیجماعی موسڵمانان، ئەمە لەچاکێتی دا (لەفەزیلەتدا) بـەڵام لەخیلافەتـدا: ئـەوا بـەم تەرتیبەیە: ئەبوبەکر ئەمجار عومەر ئەمجار عوسمان ئەمجار عەلی، جا هەرکەسێك تانـە لەخیلافەتی یەکێکیان بدات ئەوە گومڕایە.

شـیخ الاسـلام لـە(الواسـطیة)دا دەفـەرموێت[79]: (هەرکەسـێك تانـە لـە خیلافـەتی یـەکێکیان بـدات ئـەوە لەگوێدرێـژ گـومڕاترە) چـونکە ئـەو کەسـە لەگـەڵ ئیجمـاعی موسڵماناندا جیاوازە، چونکە موسڵمانان ئیجماعیان لەسەر ئەوە بووە ئەبو بەکر پـێش بکـەوێت لەخیلافەتـدا ئـەمجار عومـەر پـێش بخرێـت لـەپاش ئـەو، ئـەمجار عوسمـان و ئەمجار عەلی، جا ئەو کەسەی عەلی پـێش بخـات و بڵێـت ئـەو شایـستەترە بەخیلافـەت تەنانەت لە (ئەبوبەکر) یش، هـاوەڵان سـتەمیان لێ کـردوە و خیلافـەتیان لێ سـەندوە! ئەم قسەیە بۆ گومڕاکردنی ئوممەتە_پەنا بەخوا_ جیاوازە لەگەڵ ئەو دەقانەی لەسـەر تەرتیبی ئەوان هاتوە لەخیلافەتدا.

جا ئەو تەرتیبە لەخیلافەتدا جێگای ئیجماعە، بەڵام لـە تـەرتیبی چـاکێتی لـەنێوان (عوسمان و عەلی) دا ئەوە جێی جیاوازییە، ڕا ڕاستەکە ئەوەیـە کـە عوسمـان چـاکترە، چونکە هـاوەڵان لەکاتێکدا (عـەلی) لەناویانـدا بـووە کەچـی ئـەویان دیـاری کـردوە بـۆ خیلافەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، لەکاتێکدا عەلی بوونی هـەبوە، هەڵبـژاردنی هـاوەڵان بۆ عوسمان بەڵگەی ئەوەیە ئەو باشترە، (عبـدالرحمن ی کـوڕی عـوف) دەڵێـت: (رأیت الناس لا یعدلون بعثمان)[80] واتە: خەڵکیم بینی لە عوسمان لایان نەدەدا بۆ هیچ کەسێکی تر) ئەمەش بەڵگەیە ئەو چاکترە.

---

٧٩ / العقیدة الواسطیة (ص/٤٢) .

٨٠ / رواه البخاري .

**نوسـەر دەڵێـت:** (ثم أفضل الناس بعد هؤلاء: علي وطلحة والزبير وسعد بن أبي وقاص وسعيد بن زيد وعبد الرحمن بن عوف وأبو عبيدة عامر بن الجراح وكلهم يصلح للخلافة.

ثم أفضل الناس بعد هؤلاء: أصحاب رسول الله (ﷺ) القرن الأول الذي بعث فيهم: المهاجرون الأولون والأنصار وهم من صلى إلى القبلتين).

**واتە: ئەمجار باشترین کەس لەپاش ئەوانە:** (علي وطلحة والزبير وسعد بن أبي وقاص وسعيد بن زيد وعبد الرحمن بن عوف وأبو عبيدة عامر بن الجراح) **هەمویان شایستەی ئەوەن بکرێن بە خەلیفە.**

**ئەمجار باشترین کەس لە پاش ئەوان: هاوەڵانی پێغەمبەری خوان (ﷺ)، سەدەی یەکەم کە پێغەمبەری خوای (ﷺ) تیادا ڕەوانە کرا: کۆچەرە یەکەمەکان و پشتیوانان، ئەوانەن کە نوێژیان بەرەو هەردوو قیبلەکە کرد.**

**ڕاڤە/**

**واتە: باشترین هاوەڵان لەپاش سێ خەلیفەکە ئەو دوای دە هاوەڵەکەیە مـوژدەی بەهەشتیان پێدراوە، ئەوانیش ئەوانەن نووسەر باسیانی کردوە.**

**مەبەست لە:** (كلهم يصلح للخلافة).

**واتە:** (أصحاب الشورى) **ئەوانەی ئیمامی عومەر هەڵبـژاردن و دیـاریکردنی خیلافـەتی لەپاش خـۆی گەڕاندەوە بۆیـان، چـونکە ئیمـامی عومـەر کـاتێ مردنـی نزیك بـووەوە (شورا)ی دانا بۆ هەڵبژاردن و دیاری کردنی خەلیفەی گەڕاندەوە بۆ ئـەو دوای، چـونکە هەریەکێك لەوان شایستەی ئەوەن بکرێنە خەلیفە بۆیە کارەکەی گەڕاندەوە بۆ ئەوان و ئەوانیش (عوسمان)یان هەڵبژارد.**

**مەبەست لە:** (القرن الاول).

**سەدەی یەکەم لە سێ سەدە باشـەکە، ئـەویش ئـەو سـەدەیەیە پێغەمبـەری خـوای (ﷺ)تێدا ڕەوانە کراوەو ئیمانیان پێ هێناوە.**

(الاصحاب): کۆی وشەی (صحابی)یە، (صحابی): ئەو کەسەیە گەیشتبێتە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئیمانی پێ هێنابێ و لەسەر ئەوە مردبێت.

● جا هەرکەسێ باوەڕی بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) هێنابێ و پێی نەگەیشتبێ ئەوە (صحابی)نییە وەکو (النجاشی)، بەڵکو بە (تابعی) دەژمێردرێت.

● ئەو کەسەی پێی گەیشتبێت و باوەڕی پێ نەهێنابێ (صحابی) نییە، چونکە بێ باوەڕان و موشریکەکان بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەیشتن و باوەڕییان پێی نەهێنا.

● هەرکەسێ پێی گەیشتبێ و باوەڕی پێ هێنابێ ئەمجار لەدینەکەی هەڵگەڕابێتەوە ئەوا (صحبە)ەکە پووچەڵ دەبێتەوە (واتە: صەحابی نییە) ئەگەر لەسەر ئەو هەڵگەڕانەوە مردبێت، بەڵام ئەگەر تەوبەی کرد ئەوا خوای گەورە تەوبەکەی لێ وەردەگرێت و (صحبە)کەی بۆ دەگەڕێتەوە.

بۆیە (ابن حجر) لەکیتابی (النخبة)دا لەپێناسەی (صحابي)دا دەڵێت: (هەرکەسێ بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) گەیشت و باوەڕی پێ هێنابێ و لەسەر ئەو باوەڕە مردبێت، هەرچەندە تووشی هەڵگەڕانەوە هاتبێت و لەو ماوەیەدا لەسەر ڕای ڕاست و دروست)[٨١] (واتە: تووشی هەڵگەڕانەوە لەدین هاتبێت و بەڵام لەپاشان گەڕابێتەوە بۆ ئیسلام و لەسەر ئیسلام مردبێت) واتە لەسەر ڕاسترین دوو ڕای زانایان.

ڕای دووەم: ئەوەیە (صُحبة)ەکەی بەتاڵ دەبێتەوە هەرچەندە تەوبەش بکات، چونکە هەڵگەڕانەوە لەدین کارەکانی پێشتری پووچەڵ دەکاتەوە.

مەبەست لە: (القرن الأول الذي بعث فيهم المهاجرون الأولون والأنصار وهم من صلى القبلتين).

کۆچەران لەکاتی باسکردندا لەپێشترن لە پشتیوانان، ئەوەش بەڵگەیە کۆچەران باشترن، بەفەزڵی ئەو کۆچکردنەی ئەنجامیان دا لەپێناوی خوادا، چونکە ئەوان وازیان

---

٨١ / نخبة الفكر (ص/٥٧٥– مع شرح ملا علي القاري) .

لە نیشتیمان و سەروەت وسامانی خۆیان هێنا، هەروەها خوای گەورە لە زۆر ئایەتدا باسی کۆچەران لەپێش پشتیوانان دەکات، هەروەکو ئەوەی خوای گەورە دەفەرموێت: (وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ) التوبة/١٠٠)

لە جێگایەکی تردا دەفەرموێت: (لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا وَيَنْصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُولَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ (٨) وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ) الحشر) واتە: پشتیوانان، جا باسی کۆچەرانی لە پێش پشتیوانان کردووە.

(لَقَدْ تَابَ اللَّهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ) التوبة/١١٧) ئەوە بەڵگەیە کۆچەران باشترن لە پشتیوانان، (الانصار) کۆی وشەی (أنصاری)یە، ئەوانیش ئەو ئیماندارانەن لەهۆزی (الاوس) و(الخزرج)، خەڵکی شاری مەدینەن ئەوانەی بەیعەتیان بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) دا لە (بیعة العقبة) و پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆچی کرد بۆ لایان و ئەوانیش سەریان خست و پشتگیرییان لێ کردو داڵدەیان داو داڵدەی هاوەڵانیان دا کە لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) بوون، خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت: (وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِنْ قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (٩) الحشر) واتە: ئەو کەسانەی نیشتەجێی (دار الهجره)و (دار الایمان) بوون، واتە: پشتیوانان لە پێش کۆچی کۆچەریەکان، کۆچەریەکانیان خۆش دەوێن‌و بەشێك لە دارایی خۆیانیان ئەدەنێ‌و دڵخۆشیان دەکەن، هیچ شتێکیان لە دڵدا نییە سەبارەت بەوەی بە کۆچەریەکان درا لە فەیئی بەنی نەزیر، چونکە پەیامبەری خوا (ﷺ) لەو هەموو دەستکەوتە تەنها بەشی سێ کەسیانیدا، لە گەڵ ئەوەیشدا کەسێك نەبوو پێی ناخۆش بێت وئیساری کۆچەریەکان دەکەن بە سەر خۆیاندا لە سەروەت و ساماندا، ئەگەر چی خۆیشیان نیازیان پێی هەبێ‌و هەژار بن، هەر کەسێ لە سیفەتی رژدی دەروونی بپارێزێ، واتە: هەرکەسێ خوا بیپارێزی لە چرووکی دەروونی جا ئەوانەن برەوەکان).

لەپێشدا پێیان دەگوترا: ئەوس و خەزرەج، بەڵام پاش ئەوەی بەیعەیان بەپێغەمبەری خوادا (ﷺ) لەسەر سەرخستنی ناوی لێ نان (الانصار) واتە: پشتیوانانی پێغەمبەری خوا (ﷺ).

**نوسەر دەڵێت:** - ثم أفضل الناس بعد هؤلاء: من صحب رسول الله (ﷺ) يوما أو شهرا أو سنة أو أقل من ذلك أو أكثر، نترحم عليهم ونذكر فضلهم ونكف عن زللهم ولا نذكر أحدا منهم إلا بالخير لقول رسول الله (ﷺ): (إذا ذكر أصحابي فأمسكوا)[٨٢].

وقال سفيان بن عيينة: (من نطق في أصحاب رسول الله (ﷺ) بكلمة فهو صاحب هوى).

**واتە: ئەمجار باشترین کەس لەپاش ئەوانە: هەرکەسێك هاوڕێتی پێغەمبەری خوای (ﷺ) کردبێ بۆ ڕۆژێك یان مانگێك یان ساڵێك یان کەمتر یان زۆرتر، ڕەحمەتیان بۆ دەنێرین، باسی فەزڵەکەیان دەکەین، واز لەباسکردنی زەللەکانیان دەهێنین، باسی هیچ یەکێك لەوان ناکەین ئیللا بەچاکە نەبێت لەبەر ئەو وتەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دەفەرموێت:** (إذا ذكر أصحابي فأمسكوا) **واتە: ئەگەر باسی هاوڕێکانم کرا ئێوە بێدەنگ بن).**

**(سفیان ی کوڕی عیینە) دەفەرموێت: هەرکەسێك ئەگەر بەتەنها وشەیەکیش بەهاوەڵان قسەی کرد ئەوە شوێن ئارەزوو کەوتوە (صاحب الهوى)یە.**

**ڕاڤە/**

**هاوڕێتی (هاوەڵ بوون)ی پێغەمبەری خوا (ﷺ) جیاوازی هەیە: تیایاندا هەیە زۆر هاوڕێتی کردووەو زیاتر لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بووە، تیایاندا هەیە کەم**

---

٨٢ / صحيح : أخرجه الطبراني في (الكبير) (١٠/١٩٨) وأبو نعيم في (الحلية) (٤/١٠٨) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع ) (٥٤٥) .

هاوڕێتی کردووە و کەمتر لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بووە. بەڵام خاوەنەکەی فەزڵی (صُحبە) ی دەسکەوتووە هەرچەندە هاوڕێتییەکەی کەم بووبێ.

مەبەست لە: (نترحم عليهم ونذكر فضلهم ونكف عن زللهم).

حەقی هاوەڵان لەسەرمان:– ئێمە داوای ڕازی بوونی خوایان بۆ بکەین و داوای ڕەحمەتیان بۆ بکەین و چاویان لێ بکەین و ستایشیان بکەین و زمانی خۆمان بگرین لەتانەدان لێیان یان لە هەر یەکێکیان، یان بچینە ناو باسی ئەوەی لە نێوانیاندا ڕووی داوە لەفیتنەو جەنگەکان، چونکە هەریەکێك لەوان (مجتهد) بووە، تیایاندا هەیە(مجتهد)ێکەو پێکاویەتی و دوو پاداشتی هەیەو تیایاندا هەیەو (مجتهد)ێکەو هەڵەی کردووە یەك پاداشتی هەیە، هەڵەش خوا لێی خۆش دەبێت، ئەمجار هێندە کردەوەی چاکیان هەیە دەبێتە هۆی لێخۆشبونیان لەو هەڵانەی کردوویانە.

مەبەست لە: (ولا نذكر أحدا منهم إلا بالخير).

چونکە ئەوان تەنها حەقیان ویستووەو ئیجتیهادیان تێدا کردووە، هەر یەکە لەوان بەئیجتیهادەکەی خۆی کاری کردووە، جا تیایاندا هەبووە پێکاویەتی و تیایاندا هەبووە هەڵەی کردووەو خوالێی خۆش دەبێ، هەموویان هاوەڵی پێغەمبەری خوان (ﷺ)، ناچینە نێو ئەو باسەی لەنێوانیاندا ڕوویداوە، زۆر بەجوانی بیر لەم ئایەتە بکەرەوە (وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ) واتە لەپاش کۆچەران و پشتیوانان (يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ (١٠) الحشر) واتە: ئەوانەش لەدوای ئەوانەوە هاتوون دەڵێن: ئەی پەروەردگارەکەمان ! لەئێمەو لەو برایانەمان پێش ئێمە باوەڕیان هێناوە خۆش ببەو هیچ بوغزو قینێك مەخە دڵمانەوە بەرامبەر بەو کەسانەی باوەڕیان هێناوە ئەی پەروەردگاری ئێمە ! بەڕاستی تەنها ئەتۆی بەسۆزی میهرەبان).

بۆیە (شیخ الاسلام ابن تیمیة) لەو بارەیەوە دەفەرموێت: (لەبنەماکانی ئەهلی سوننەو جەماعە ئەوەیە: پارێز بوونی دڵ و زمانیان دەربارەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)[٨٣]).

سلامة قلوبهم:- رقیان لەهیچ یەکێك لەوان نییە، وسلامة ألسنتهم:- لەحەقی هیچ یەکێکیاندا قسە ناکەن و بەکەمیان نازانن، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەفەرموودەیەکی (صحیح) دا فەرموویەتی: (لا تسبوا أصحابي، فوالذي نفسي بيده لو أنفق أحدكم مثل أحد ذهباً، ما بلغ مدَّ أحدهم ولا نصيفه)[٨٤] واتە: جنێو بە یارانی مەن مەدەن، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە ئەگەر یەکێ لە ئێوە بە ئەندازەی کێوی ئوحود ئالتون بکات بە خەیر، ئەوا ناگاتە مشتی یەکێ لەوان و بە نیوەی مشتێکیش).

(لاتسبوا أصحابي): ئەمجار کەسێکی بێ عەقڵی ئیمان لاوازی شوێنکەوتەی ئارەزوو دێت و بەهاوەڵان قسە دەکات! جا ئەگەر ئەو کەسە لەگرووپە گومڕاکان بوایە ئەوا زۆر باسمان نەدەکرد، بەڵام کێشەکە لەوەدایە ئەو کەسە خۆی داوەتە پاڵ ئەهلی سوننەو جەماعەو دەڵێت: ئەمە لەباسی لێکۆڵینەوەی مێژوویییە؟ ئەی باشە تۆ تەکلیفت لێکراوە بە لێکۆڵینەوەی مێژوویی!؟ دەچێتە ناو باسێکەوە لێی نازانێ و ترسێکی زۆری لەسەر بنیات دەنرێ و گومان دەخەیتە نێو دڵی خەڵکییەوە بەرانبەر بەهاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، دڵی خەڵکی پڕ لە رقو کینە دەکەیت بەرانبەر بەهاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، پێویستو واجب ئەوەیە: واز بهێنی لەباسکردنی ئەوەی لەنێوانیاندا ڕوویداوە.

---

٨٣ / العقيدة الواسطية (ص/٤٠) .

٨٤ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٣٤٧٠) ومسلم (٢٥٤٠) .

مەبەست لە: (لقول رسول الله (ﷺ): (إذا ذكر أصحابي فأمسكوا)[٨٥].

لەوە ڕوونتر و ئاشکرا تر ئەو فەرموودەیە کە دەفەرموێت: (لاتسبوا أصحابي) ئەمە نەهییە لەجوێندان بەهەر یەکێك لە هاوەڵان، ئەوەی پێویستە لەسەرمان دوعای ڕەحمەتیان بۆ بکەین و داوای لێخۆشبوونییان بۆ بکەین، وەکو کارکردنێك بەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: (وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ (١٠) الحشر) واتە: ئەوانەش لەدوای ئەوانەوە هاتوون دەڵێن: ئەی پەروەردگارەکەمان ! لەئێمەو لەو برایانەمان پێش ئێمە باوەڕیان هێناوە خۆش ببە).

دەبێ زمان و قەڵەمەکانمان بگرینەوە لەقسەکردن بەهاوەڵانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)و دەبێ بەرگرییان لێ بکەین‌و ڕەددی ئەو کەسانە بدەینەوە لەپایەی هەریەکێك لەوان کەم دەکەنەوە، قسەکانیان پووچەڵ بکەینەوە، چونکە ئەوە ناگونجێ‌و جیاوازە لەگەڵ عەقیدەی ڕاست‌و دروستدا، عەقیدەی ئەهلی سوننەو جەماعە.

شیخ الاسلام لە (الواسطية)دا دەفەرموێت: (ئەوەی لەوانەوە بۆ ئێمە گواستراوەتەوە یان ڕاست نییە ئەویش درۆو دەلەسەیە، ئەوەشی ڕاستە(صحیح)ە ئەوە خاوەنەکەی (مجتهد)ە، (مجتهد)یش ئەگەر بیپێکێ ئەوە دوو پاداشتی هەیەو ئەگەر هەڵەی کردبێ ئەوا یەك پاداشتی هەیە، هێندە چاکەو فەزڵیان هەیە کە ئەو هەڵانەی کردوویانە دایدەپۆشێ)[٨٦].

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەربارەی (حاطب ی کوڕی أبو بلتعة) فەرمووی:- کاتێ ئیجتیهادی کردو نوسراوی بۆ خەڵکی مەککە نووسی‌و عومەر فەرمووی: لێم گەڕێ با لەگەردنی بدەم ئەمە دووڕووە- پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (لا تدري يا عمر،

---

٨٥ / رواه الطبراني و أبو نعيم قال العراقي اسناده حسن .

٨٦ / العقيدة الواسطية (ص/٤٠) .

لعل الله اطلع على أهل بدر فقال: اعملوا ما شئتم فقد غفرت لكم)[٨٧] **ئەم هاوەڵە یەکێك بوو لەوانە لەجەنگی بەدردا بەشدارییان کردبوو.**

**مەبەست لە:** (وقال سفيان بن عيينة: من نطق في أصحاب رسول الله (ﷺ) بكلمة فهو صاحب هوى).

**چونکە هیچ کەسێك قسەیان پێ ناکات ئیللا کەسێك نەبێت شوێنی ئارەزووەکەی کەوتبێت یان بیەوێ بەرانبەری هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بگرێت.**

**پێویستە لەسەرمان هاوەڵانی پێغەمبەری خوامان (ﷺ) خۆشبوێت، ڕێزو حورمەتیان لێ بگرین، پایەو قەدریان بزانین‌و چاویان لێ بکەین، چونکە باشترین و چاکترین سەدەن، چونکە ئەوان پێغەمبەری خوایان (ﷺ) بینیوەو باوەڕیان پێ هێناوە، هاوڕێتی ئەویان کردوەو سەریان خستوەو جیهادیان لەگەڵدا کردوە، لەئەوەوە عیلمیان وەرگرت و فێری بوون، جا ئەوان باشترین کەسی ئەم ئوممەتەن، بەڵکو ئەوان باشترین کەسن لەپاش پێغەمبەران (ﷺ)، چونکە خوای گەورە ئەوانی تایبەتمەند کرد بۆ هاوڕێتی پێغەمبەرەکەی (محمد) (ﷺ) دوایین پێغەمبەرو باشترین نێردراوی خوا، بۆیە هیچ کەسێك تانەیان لێ نادات ئیللا کەسێك نەبێ ڕق و کینە لەدڵدا هەبێ و بەرانبەر بە ئیسلام، چونکە ئەو تانەیان لێ نادات لەبەر خوودی خۆیان، بەڵکو تانەیان لێ دەدات لەبەر ئەو هەموو خزمەتەی ئیسلامیان کردو هەوڵیان دا بۆ سەرخستن و گەیاندنی بۆ خەڵکی بە ئەمانەتەوە.**

**جا ئەو کەسەی تانەیان لێ دەدا لەبەر ئەوە تانەیان لێ دەدات، چونکە ڕقی لەئیسلامە، ئەو لەئیسلام تۆقیوەو دەترسێت جا ئەو بەوە شیفا وەردەگرێت، هەروەها لەبەر ئەوەی ئەو پەیوەندییەی نێوان ئەم ئوممەتەو پێغەمبەرەکەیدا (ﷺ) هەیە**

---

٨٧ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٢٨٤٥) ومسلم (٢٤٩٤) .

بیبــچڕن، چــونکە ئــەوان هۆکــارو ئەڵقــەی پەیوەنــدین لــەنێوان ئێمــەو پێغەمبــەری خوادا(ﷺ)، جا ئەمە مەبەستی ئەو کەسەیە تانە لەهاوەڵان دەدات.

ئەمەش کاتێ باسی کۆچەران و پشتیوانانی کرد لەسورەتی (الحشر) دا فـەرمووی: (وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ (١٠)) بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی هەرکەسـێك تانەیان لێ بدات یان تانە لەیـەکێکیان بـدات ئـەوە بـەهۆی ئـەو ڕق و کینەیەیـە لەدڵیـدا هەیە بەرانبەر بەوان، بۆیە ئەو پێشەوا بـەڕێزە(سـفیان ی کـوڕی عیینـە) دەفـەرموێت: (هەرکەسێك ئەگەر بەتەنها وشـەیەکیش بـەهاوەڵان قـسەی کـرد ئـەوە شـوێن ئـارەزوو کەوتوە(صاحب الهوى)یە).

جـا ئـەوە ئـارەزووە وای لێکـردوە ئـەو کـارە بکـات، ئـارەزوو ئـەو ڕق و کینەیـە بەرانبەریان، بۆیـە دەبینـی خـراپترین کەسـانێکن قـسە بـە هـاوەڵانی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دەکەن، ئەوانیش ڕیسوا بوون بەدرۆ و بە ڕق لێبونیـان لـەنێوان خەڵکیـدا، هـیچ کەسێك ئەوان نابینێ ئیللا ڕقی لێیانە، چونکە خوای گەورە ڕقی ئەوانی خـستۆتە دڵـی خەڵکیەوە لەزەویدا، بۆیە هیچ کەسێك یـەکێك لەوانـەی ڕقـی لـە هـاوەڵانی پێغەمبـەری خوایە(ﷺ) نابینێ ئـیللا لـەناخی خۆیـدا ڕق و کینـەی هەیـە بەرانبـەریان، داوا لـەخوا دەکەم بمانپارێزێ.

ئەمــەش زیــانی بــۆ هــاوەڵانی پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) نییــەو زیــان بــە ئیــسلام ناگەیەنێت، چونکە هاوەڵان قەدرو پاداشتیان زۆر فراوانە، ئیسلامیش بەردەوامەو سـەر دەکەوێت و سوپاس بۆ خوا، بەڵکو ئەوانە زیان بـەخۆیان دەگەیـەنن، بـەڵام تـرس لـەو کەسە هەیە کتێبەکانیان دەخوێنێتەوە بەبێ زانست و زانیاری، شتێ لەناخیدا دروست دەبێ بەرانبەر بەهاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و پێی کاریگەر دەبێ، چەند کەس لە ڕۆلەی موسڵمان بوون بەنێچیری ئەوان بەهۆی خوێندنـەوەی کتێبـی ئەوانـەوە، چـونکە

کاتێ دەیخوێنێتەوە پێی کاریگەر دەبێ و لەناخیدا ڕق و کینەی بۆ دروست دەبێ بەرانبەر بەهاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) یان بەلای کەمەوە قەدرو پلەو پایەیان لایان کەم دەبێتەوە.

بەڕاستی ئەمە ئەو ترسەیە لەسەر گەنجی موسڵمانان، لەسەر ئەو کەسانەی توانایان نییە فێری عیلم بن و کاریگەر دەبن بەو کتێبانەی تانەدانی هاوەڵانی پێغەمبەری خوای (ﷺ) تێدایە، بەتایبەتی ئێستا بڵاو دەکرێتەوەو بایەخی پێ دەدەرێت، بەجوانترین شێوە چاپ دەکرێت و بەرگ دەگیرێت، لەپێشانگاکاندا نمایشی دەکەن‌و ڕەواجی پێ دەدەن، چونکە ئەوە بەهەلێك دەزانن بۆ بڵاو کردنەوەی ئەو تانەدانە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا(ﷺ).

گومانی تێدا نییە تانەدان لەهاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تانەدانە لە پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەگەر نا چۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاوڕێکانی بەو شێوە دەبن ئەوان بەو شێوە ناشرینە وەصفیان کردوە؟ بە ڕاستی ئەمە تانەدانە لەپێغەمبەری خوا (ﷺ).

هەروەها ئەوە بەدرۆخستنەوەی قورئانە چونکە خوای گەورە لەقورئانە پیرۆزەکەیدا ستایشی هاوەڵانی کردوە لەچەندین ئایەتدا، لەو ئایەتانە، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ بِإِحْسَانٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ (١٠٠) التوبة)

خوای گەورە دەفەرموێت: (لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنْزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا (١٨) وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا (١٩)الفتح) واتە: بێ گومان خوا ڕازی بوو لەئیمانداره‌کان کاتێ _ لەژێر

ئـەو درەختــە دا پێـی دەڵـێن (شـجرة الرضـوان) پـەیمانیان لەگـەڵ دەبەسـتیت ئـەی موحەممەد جا خوا بـەو ڕاسـتی و وفایـەی لەدڵیانـدا بـوو بـۆ پەیامەکـەت ئاگـادار بـوو ئینجا لەکاتی پەیمانەکەدا ئارامی دابەزاندە سەریان و بەسەرکەوتنێکی نزیـك پاداشـتی دانەوە (١٨) جگە لەوەیش بەدەستکەوتێکی زۆریش بەڵێنی پێدان ئـەی ئامـادەبووانی حودەیبیە خوا هەمیشە خوایەکی بەدەسەڵاتی بەحیکمەتە(١٩).

خوای گەورە دەفەرموێت: (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِمْ مِنْ أَثَرِ السُّجُودِ ذَلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ) واتە سیفەتی ئەوان لەتەوراتـدا، چـونکە ئـەوان باسـکراون لەتەوراتـدا، هـەروەکو چـۆن پێغەمبەرەکـەیان (محمـد) (ﷺ) باسـکراوە، (وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنْجِيلِ) ئـەو ئینجیلەی دابەزیوەتە سەر (عیسا)، (كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَى عَلَى سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ (٢٩) الفتح) واتـە: موحەممـەد (ﷺ) ڕەوانـەکراوو پەیامبەری خوایە ئەو کەسانەش لەگەڵ ئەون و شـوێنی ئـەو کـەوتوون لەبەرامبـەر بـێ بڕواکانە ئازاو بەهێزن، لەناو خۆشـیاندا میهرەبـان و بەسـۆز و دڵ نـەرمن دەبـان بینـی هـەردەم خـەریکی ڕکـوع و سـوژدەن هـەموو کـات ئاواتیـان بەدەسـت هێنـانی فـەزڵ و میهرەبانی و خۆشنوودی خوایە ومەبەستیان ئەوەیە خـوا لێیـان ڕازی بێـت نیـشانەیان لەشوێنەواری سوجدە بردنەکانیانـەوە بـۆ خـوا لەڕوخـسارياندا دیـارە ئـەوە وەسـفیانە لەتەورات مەسەل و وەسفیان لە (ئینجیل)یشدا وەك کشتێ وایە کە لەسەرەتاوە وەچی دەرکردبێ ئینجا وەچـەکە بـەهێزی کردبـێ و ئینجـا ئەسـتوریش بـووبێ ئەوسـا لەسـەر بنجەکانیشی وەسـتابێ ئەوەنـدە زوو هـەڵ بـداو گەشـە بکـات، وەرزێـرو کشتەوانەکان سەرسام بکات بۆ ئەوەی ڕکی کافرەکانیان پـێ هەڵسێنێ خوا بەڵێنی بەو کەسـانە داوە کـەبڕوایان هێنـاوەو کـارە چـاکەکانیان ئـەنجام داوە بـەلێبوردنی تـەواو و پاداشـتێکی گەورە).

ئەمەش بەڵگەیە کەوا هیچ کەسێك ڕقی لەهاوەڵان نییە ئیللا کەسێکی کافر نەبێت بەبەڵگەی ئەوەی خوای گەورە دەفەرموێت: (لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ) ئەمەش نیشانەی کوفرە، جا ڕق لێبونی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کوفرو دووڕوویی یە -پەنا بەخوا-.

مەبەست لە: (بكلمة فهو صاحب هوى).

واتە: ئەگەر قسەی کرد بەتەنها وشەیەك لەکەمکردنەوەی قەدری هاوەڵان ئەوە خاوەن ئارەزووە(واتە: شوێنکەوتەی ئارەزووەکەیەتی).

ئەمە ئەگەر تەنها وشەیەك بێت ئاوایە....

ئەی ئەو کەسەی چەند کتێبێك دەنووسێ لەسەر جوێندان بە ئەوان؟

بەدوای کەم و کورتیەکانیاندا دەگەڕێت و پاشان گەورە کردنەوەی؟؟

ئەوە چۆنە؟؟

ئەگەر کەسێك لەتەنها وشەیەکدا بەرانبەر هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خاوەن ئارەزوو بێت، واتە شوێنی ئارەزووەکەی دەکەوێت چونکە ئەو ئەو قسەیەی نەکردووە تەنها لەبەر ئارەزوویەك لەناخیدا بووەو لەبەر ڕق و کینەی لە هاوەڵانی پێغەمبەری خودا (ﷺ).

**﴿٢٩﴾ نوسەر دەڵێت: (والسمع والطاعة للأئمة فيما يحب الله ويرضى ومن ولي الخلافة بإجماع الناس عليه ورضاهم به فهو أمير المؤمنين).**

واتە: گوێڕایەڵی کردنی پێشەوایان لەوەی خوای گەورە پێی خۆشە و پێی ڕازییەو هەرکەسێك خیلافەتی گرتە دەست بە کۆڕای خەڵکی لەسەری و ڕازی بوونیان، ئەوە ئەمیری ئیماندارانە.

**﴿٣٠﴾ ولا يحل لأحد أن يبيت ليلة ولا يرى أن ليس عليه إمام برا كان أو فاجرا).**

**واتە: حەلاڵ نییە بۆ هیچ کەسێك تەنها شەوێك بمێنێتەوە و(نەبینێ) پێشەوایەکی لەسەر نییە، چاکەکار بێت یان خراپەکار.**

**ڕاڤە/**

**لەبنەماکانی ئەهلی سوننەو جەماعە بنیات نراوە لەسەر قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ):- گوێڕایەڵی کردنی دەسەڵاتدارانی موسڵمانانە، خوای گەورە دەفەرموێت:** (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ) النساء/٥٩) **واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ! گوێڕایەڵی فەرمانی خوا و پەیامبەر بن لە هەموو کاروبارێکدا وە بەر فەرمانی کاربەدەستان و کارسازانی خۆتان بن).**

**مەبەست لە** (منكم) **واتە لەموسڵمانان بێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت:** (أوصيكم بتقوى الله و السمع و الطاعة و أن تأمر عليكم عبد)[٨٨] **لەڕیوایەتێکدا:** (و أن تأمر عليكم عبد حبشي)[٨٩] **وە لەڕیوایەتێکدا:** (عبد مجدع الأطراف)[٩٠] **واتە: هەردوو پێی و هەردوو دەستی بڕا بێت، چونکە ئەو دەسەڵاتدارە، پێویستە گوێڕایەڵی بکرێت لەچاکەدا، ئەمە لەبنەماکانی عەقیدەیە، هەر کەسێك دەرچێت بەڕووی پێشەوایانی**

---

٨٨ / سبق تخريجه .

٨٩ / صحيح : سبق تخريجه .

٩٠ / رواه مسلم .

موسڵماناندا ئەوە لەگومڕایانە یان ئەو لەخەواریجەکانە، یان لەموعتەزیلەکانە، یان خاوەنی گروپێکە ناگونجێ و جیاوازە لەگەڵ سوننەتی پێغەمبەری خوادا(ﷺ).

مەبەست لە: (والسمع والطاعة للأئمة فيما يحب الله ويرضى).

بەو مەرجە خوای گەورە پێی خۆش بێت و پێی ڕازی بێت، بەڵام لەسەرپێچیدا ئەوە گوێڕایەڵییان ناکرێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق)[91] هەروەها دەفەرموێت: (إنما الطاعة في المعروف)[92] مانای ئەوە نییە ئەگەر دەسەڵاتدارێك فەرمانی کرد بەسەرپێچییەك لەسەرپێچییەکان چیتر لە ئیمامەت دادەماڵرێت، بەڵکو ئەو گوێڕایەڵی ناکرێت لەو سەرپێچییەدا، بەڵام گوێڕایەڵی دەکرێت لەو شتانەی سەرپێچی نەبێت و ویلایەتەکەی دەمێنێ، گوێڕایەڵی دەکرێت لەوەی سەرپێچی نەبێت.

مەبەست لە: (ومن ولي الخلافة بإجماع الناس عليه ورضاهم به فهو أمير المؤمنين).

ئەمە ڕوونکردنەوەی ئەو شێوازانەیە ئیمامەتی پێ دەبەسترێ، چونکە ئیمامەت بەیەکێ لەم ڕێگایانە دەبەسترێ و جێگیر دەبێ:-

کاری یەکەم: ئەوەی نووسەر باسی کردوە، ئەویش ئەوەیە موسڵمانان دیارییان کردوە و هەڵیان بژاردوە، مەبەست لەوانەی ئیمام هەڵدەبژێرن بریتین لە (أهل الحل والعقد) لەزانایان و ئەمیرەکان و سیاسەتمەداران و سەرکردە سەربازییەکان، مانای

---

٩١ / صحيح : أخرجه الطبراني في (الكبير) (١٨ / ١٧٠)، والقضاعي في (مسند الشهاب ) (٨٧٣ )وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع ) (٧٥٢٠) .

٩٢ / رواه البخاري ومسلم .

ئـەوە نییـە هەڵبـژاردنی ئیمـام بـۆ هـەموو کەسـێکە لەمنـداڵان و ژنـان و شارنـشین و دەشتەکی، چونکە خەڵکی شوێنکەوتەی (أهل الحل والعقد)ن، جا ئەگەر (أهـل الحل والعقد) ئیمامێکیان هەڵبژارد پێویستە لەسەر ئەودوای خەڵکی گوێڕایـەڵی بن، ئەمـەش هەروەکو ئەوەی لەخیلافەتی (ئەبو بەکر الصدیق)دا ڕوویدا، جا هاوەڵان لەپاش مردنـی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆڕا بوون لەسەر بەیعەتدان بە ئەبو بـەکر، ئـەو دوای ئوممـەت شوێنکەوتەی ئەوانە بوون، کە(ئەبو بـەکر) یـان هەڵبـژاردو بـوار نەکرایـەوە بـۆ هـەموو کەسێك بەشدار بێت لەهەڵبژاردنـدا چـونکە ئەمـە تایبەتـە بـە (أهـل الحـل والعقـد) جـا موسڵمانان ئەبو بەکریان هەڵبـژارد کـە باشـترینەکەیان بـوو، ئـەم هەڵبژاردنـەش چـەند بەڵگەیەکی لەسوننەتی پێغەمبەرەوە هەیە.

یەکەمیان: ئەبو بـەکر باشـترین هـاوەڵ بـوو بـەڕەهایی، هـیچ کەسـێك لەمـە جیـاواز نەبووە.

دووەم: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) چـەند ئاماژەیـەکی کـردووە بـۆ خیلافـەتی ئـەو لەوانە:_ لەکاتی نەخۆشی مردنەکەیدا (ئـەبو بـەکر) ی پـێش خـست بـۆ پـێش نوێـژی موسڵمانان لەمیحرابەکەی خۆیدا[٩٣]، لەجێگەکـەی پێغەمبـەری خـوادا (ﷺ) ڕاوەسـتا، ئەمـە ئاماژەیەکـە ئـەو ئیمـامی ئەوانـە لەخیلافەتـدا هـەروەکو چـۆن ئیمـامی ئەوانـە لەنوێژدا، ئەوانیش ئەبو بەکریان هەڵبژاردو وتیـان: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بـەتۆ ڕازی بووە بۆ دینەکەمان و ئێمەیش پێت ڕازی نەبین بۆ دونیاکەمان!!؟؟ بەیعەت بەسـترا و دروسـت بـوو، هـاوەڵان یەکـدەنگ بـوون لەسـەر ئـەوە، هەرکەسـە بەشـداربووە لـەو هەڵبژاردنەو هەرکەس بەشدار نەبوبێت ئەوا شوینکەوتەیە، موسڵمانانیش یەك کۆمەڵن و یەك دەستن.

---

٩٣ / رواه البخاري ومسلم .

کاری دووەم: کاتێ ئەبو بەکر مردنی نزیك بووەوە (عومەری کوڕی خەتتاب)ی هەڵبژاردو دیاری کرد لەجێگەی خۆی، موسڵمانانیش بیستیان و گوێڕایەڵ بوون، ئەمەش ڕێگای دووەمە لەڕێگاکانی جێگیر بوونی ئیمامەتە ئەویش ئەوەیە وەلی ئەمری موسڵمانان (ولي العهد) هەڵدەبژێرێ لەپاش مردنی جێگەی ئەو بگرێتەوە هەروەکو(ئەبو بەکر) ئەنجامی دا کاتێ (عومەر)ی هەڵبژارد.

کاری سێ یەم: ئەگەر یەکێك لەموسڵمانان زاڵ بوو و سەرکەوت و خەڵکی ملکەچی ئەمارەتەکەی بوون و ئەوە ئەو کاتە دەبێتە ئەمیر و پێشەوایان هەروەکو (عبدالملك ی کوڕی مەروان) ئەنجامی دا، چونکە کاتێ جیاوازی ڕوویدا لەپاش مردنی (یزید ی کوڕی معاویە)دا، ئەو کاتە (عبدالملك ی کوڕی مەروان ی کوڕی الحكم) هەستا بەو کارە، ئەو کەسێکی لیهاتوو زیرەكو بەهێز بوو، خوای گەورە لەسەر دەستی سوودی گەیاندە موسڵمانان، بەیعەتەکەی بەستراو جێگیر بوو، موسڵمانان گوێبیستی ئەو بوون و گوێڕایەڵی بوون، لەوەدا خەیرو چاکەی موسڵمانانی تێدا بوو.

ئەمە ئەو ڕێگایانەیە ویلایەتی پێشەوای موسڵمانانی پێ جێگیر دەبێت، یان بە هەڵبژاردنی (أهل الحل والعقد) یان پێشین پاشین دیاری بکات یان یەکێ لەموسڵمانان زاڵ بێت ببێتە ئیمام و خەڵکی بەقسەی بکەن و گوێڕایەڵی بن، چیتر دروست نییە هیچ کەسێك سەرپێچی بکات.

مەبەست لە: (بإجماع المسلمين).

وا تێ مەگە لەم قسەیە دەبێ بە هەڵبژاردنی هەموو موسڵمانان بێت، بەڵکو ئەوە بەهەڵبژاردن و ئیجماعی (اهل الحل والعقد) دەبێت، وەکو ڕوویدا لەخیلافەتی (ئەبو بەکر) داو وەکو ئەوەی ڕوویدا لەخیلافەتی (عوسمان)دا چونکە ئەوانەی هەڵیانبژارد ئەهلی شوورا بوون، ئەوانیش ئەوانەی مابوون لە دە کەسەکە موژدەی بەهەشتیان پێ

درابوو، ئەوان هەڵیانبژاردو ئیمامەتەکەی جێگیر بوو، هیچ کەسێك ناڕازی نەبوو لەو کارەدا، بەڵکو کۆڕابوون لەسەر ئیمامەتی (عوسمان).

مەبەست لە: (لا يحل لأحد أن يبيت ليلة ولا يرى أن ليس عليه إمام براً كان أو فاجرا).

ئەم مەسەلەیە زۆر گرنگە ئەویش ئەوەیە هیچ کەسێك بۆی نییە لە (کۆمەڵی موسڵمانان) دەرچێت، لەگوێڕایەڵی دەرچێت جا ئەگەر ئەو ئەوەی کرد (بات ليلة وليس له إمام) و باوەڕی بە ئیمامەتی هەبێت، ئەوە (قد خلع ربقة الاسلام من عنقه)[٩٤] بەمانای ئەوەی ئەو لەگەڵ موسڵماناندا بووەو پەیوەست بووە بەموسڵمانانەوە،کاتێ لە گوێڕایەڵی ئیمام دەرچوو ئەوا ئەو پەیوەندییەی لەگەڵ موسڵماناندا بچڕی، وەکو:_ ئەوەی حەبلێکی درێژ بۆ بەرخەکان دیاری دەکەن و چەند ئەڵقەیەکی لێ دەکەن‌و سەری بەرخەکانی پێوە دەکەن بۆ ئەوەی بیپارێزێ لەبزر بوون، پێی دەگوترێ (الرِّبَق) جا کۆبونەوەی موسڵمانانی لەسەر ئیمامێك بەوەی شوبهاندوە، جا هەرکەسێك لەگوێڕایەڵی ئیمام دەرچێت ئەوە ئەو ئەڵقەی داماڵییەو خۆی تووشی بزربوون و گورگو ئارەزووەکان کردووە، مانای ئەوە نییە کافر دەبێت، بەڵکو مانای ئەوەیە ئەو لەجەماعەت جیا بوەتەوەو لەگوێڕایەڵی دەرچووە، هەروەکو وڵاخێکی لێ دێت لە جێگاکەی خۆی دەرچوە خۆی توشی گیانداری دڕندەو دزی و جەردەیی کردوە.

نەڵێت: من بەیعەم نەداوەو ئیمامم نییە، چونکە تۆ یەکێکی لەموسڵمانان، کاتێ (أهل الحل والعقد) بەیعەیان دا ئەوا تۆش شوێنکەوتەی ئەوانی.

٩٤ / صحيح : سبق تخريجه .

**﴿٣١﴾ نوسـەر دەڵێـت: (والحـج والغـزو مـع الإمـام مـاض، وصـلاة الجمعـة خلفهم جائزة، ويصلى بعدها ست ركعات، يفصل بـين كـل ركعـتين، هكـذا قال أحمد ابن حنبل).**

واتە: حەج و غەزا لەگەڵ پێشەوادا بەردەوامە، نوێژی هەینی لەپـشتیانەوە دروسـتە، لەپاش ئەوەش شەش ڕکات نوێژ دەکرێت، دوو ڕکات دوو ڕکات بە جیا دەکرێ، ئا بـەم شێوەیە (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل) فەرموویەتی.

ڕاڤە/

دەسەڵاتەکانی ئیمام زۆرن، جێگای ژماردن و کۆکردنەوەو خوێندنەوەی: کتێبەکانی ئەحکامی سوڵتانییەکانە کە لەو بارەوە نوسراوە وەکو:(الاحكام السلطانية) لە نوسینی (الماوردی) و (الاحكام السلطانية) لەنوسینی (ابو یعلی الحنبلی)، چەندین کتێبی تر لەو بارەیەوە نوسراوە تیایدا دەسەڵاتەکانی ئیمامی تێدا باسکردوە، ئەمـەش لەکتێبـەکانی فیقهدا باسکراوە، هەروەها لە کتێبەکانی عەقیدەدا باسـکراوە، هـەروەکو چـۆن لێـرەدا باسکراوە.

یەکەم: ئەو هەڵدەستێ بە ئەنجامدانی نوێژی هەینی و هـەردوو جـەژن و موسـڵمانان لەپشتیەوە نوێژ دەکەن، ئیللا مەگەر خۆی کەسێك دیاری بکات، کەسێك لە زانایان یان لەقوتابیانی عیلم بۆ ئەوەی پێش نوێژی بۆ خـەڵکی بکـەن، بـەڵام ئەصـڵ ئەوەیـە ئـەو لەهەموو کەس شایستەترە پێش نوێژی بکات لە هەینی و هـەردوو جەژنـدا، جـا ئەگـەر هەرکەسێکی لەجێی خۆی دانا ئەوە بۆی هەیەو دروستە، ئەمەش ئەوەیە ئێـستا کـاری پێ دەکرێ.

دووەم: ئەو حەج بەڕێوە دەبات وپێشەنگی حاجییەکان دەکات و دەبێتە ئەمیری ئەوان و لەکێشەکان دەکۆڵێتەوە.

سێیەم: ئەنجامدانی جیهادکردن لەپێناوی خوادا لەدەسەڵاتەکانی ئیمامە ئەو فەرمان بەوە دەکات، هەر ئەوە ئاڵاکان ڕێك دەخات، هەر ئەویشە سەرباز و جەنگاوەران دیاری دەکات، ئەمیرەکان هەڵدەبژێرێ، سریەو سوپاکان تەجنید دەکات، موجاهیدەکان چەکدار دەکا و ڕەوانەی غەزای دوژمنیان دەکاتو ئەو شوێنەیان بۆ دیاری دەکات دەبێ بۆ غەزا بۆی بچن، جا جیهاد لەدەسەڵاتەکانی ئیمامەو جیهاد پاشاگەردەنی نییە، هەرکەسێك بیەوێ چەك هەڵبگرێ و هێرش ببات و بڵێت: من جیهاد دەکەم لەپێناوی خوادا، ئەمە جیهاد نییە لەپێناوی خوادا، جیهاد لەپێناوی خوادا ڕێکخراوە بە یاساکانی شەرع، بەڵام ئەگەر پاشاگەردەنی تێکەڵ بوو ئەوا دەبێتە وێرانکردن و زیانەکەی لەقازانجەکەی زۆرتر دەبێت ئەگەر سودیشی هەبێت، چونکە ئەو زیانەی بەهۆیەوە ڕوو دەدات زۆرترە، جا هەموو کارەکان ڕێکخەری خۆی هەیە، جیهادیش کارێکی مەزنە، پێویستی بە ڕێکخەر هەیە، پێویستی بەوە هەیە پەیوەست بین بە ئەحکامەکانی جیهادەوە کە لەقورئان و سوننەت و قسەی زانایان باسکراوە، کارەکە پاشاگەردەنی نییە، وەکو ئەوەی یەکێك لەبانگەوازکارانی فیتنە دێت و سەرکردایەتی ئەو زیادەڕەوانە یان ئەو توندڕەوانە یان ئەو نەفامانە دەکات کە نازانن، سەرکردایەتییان دەکەن و دەڵێن: جیهاد دەکەین لەپێناوی خوادا، ئەمە بە زیان دەژمێردرێت بۆ سەر ئیسلام و موسڵمانانو ئەمەش جیهاد نییە، چونکە بە ڕێکخەرەکانی جیهادەوە نەبەستراوەتەوە، ئەگەر بە ڕێکخەرەکانی جیهادەوە نەبەسترابووەوە ئەوا دەبێتە فەسادو نابێتە جیهاد، هەر شتێك لەسنووری خۆی دەرچێت ئەوا دەگۆڕدرێتە دژەکەی، ئەوان ئەگەر نکوڵی کارەکەیان بکەیت ئەوا پێت دەڵێن:– ئێوە ڕێگرن لەجیهادکردن لەپێناوی خوادا.

ئێمەیش دەڵێین:- ئێمە هەرگیز ڕێگر نین لە جیهاد کردن لەپێناوی خوادا بەڵام دەڵێین:- پێویستەو دەبێ جیهاد بە ڕێکخەری شەرعی پەیوەست بکرێ و ڕێك بخرێ، ئەمەی ئێوە دەیکەن ئەوە پاشاگەردەنیەو جیهاد نییە، خوایش فەرمانی بەوە نەکردوە.

جا ئەنجامدانی حەج و غەزا و هەینی و هەردوو جەژن لەدەسەڵاتەکانی ئیمامە.

مەبەست لە: (وصلاة الجمعة خلفهم جائزة).

واتە هەرچەندە ئەوان (فسق)یان هەبێت، هەرچەندە ئەوان سەرپێچییان هەبێت، ئەوا نوێژ لەپشتیانەوە دەکرێ، چونکە نوێژکردن لەپشتیانەوە دەبێتە هۆی یەکخستنی وشەی موسڵمانان، هەروەها کەسی (فاسق) ئەگەر چاکەی کرد ئەوا تۆیش چاکەی لە گەڵدا بکە، بۆیە کاتێ بە (عوسمان)یان گوت لەکاتێکدا ئابلۆقە درابوو: فلان کەس ئیمامەتی خەڵکی دەکات و ئیمام نییە بەڵکو ئەو ئیمامی فیتنەیە. فەرمووی: (یا بن أخي إذا أحسن الناس فأحسن معهم وإذا أساءوا فتجنب إساءتهم)[٩٥] واتە: ئەی برازاکەم... ئەگەر خەڵکی چاکەیان کرد ئەوا تۆیش چاکەیان لە گەڵدا بکە و ئەگەر خراپەیان کرد ئەوا لە خراپەکەیان دوور بگرە).

جا ئەگەر ئەوان نوێژیان کرد ئەوا ئێمەیش نوێژیان لەگەڵدا دەکەین ئەگەر هاتوو کاربەدەست بوو هەرچەندە ئەو (فسق) و سەرپێچی هەبێت، چونکە ئەوە بەرژەوەندی تێدایە، چونکە نوێژ پەرستشەو کەسی (فاسق) ئەگەر نوێژی کرد ئەوا هان دەدرێت لەسەر ئەوەو دوعای بۆ دەکرێ، هاوەڵان نوێژیان کردوە لەپشت چەند ئەمیرێکەوە چەند تێبینییەکیان لەسەر بوە وەکو (حەججاج) و جگە لەو، هاوەڵانی پێغەمبەری خوا

---

٩٥ / رواه البخاري .

(ﷺ) نوێژیان لەپشتەوە کردووە وەکو بەجێ هێنانی فەرمانی پێغەمبەری خـوا (ﷺ) یەکخستنی وشەی موسڵمانان.

مەبەست لە: (ويصلي بعدها ست ركعات).

ئەم مەسەلەیە مەسەلەیەکی فیقهییە لەم شوێنەدا بەهۆی باسی نوێژی هەینی یـەوە هاتووە، جا نوێژی هەینی نوێژی سوننەت لەپێشییەوە نییـە، جـا هەرکەسـێك هـات بـۆ مزگەوت نوێژ دەکات تا ئەوەندەی بۆی کراو دادەنیشێ و چاوەڕوان دەبـێ، جـا ئەگـەر هەر نوێژ بکات تاوەکو ئیمام دێت ئەوە باشـترە، بـەپێی ئـەوەی نوێـژە (نوافـل)ەکـان ڕەهان و پەیوەندییان بەنوێژی هەینییەوە نییە، بەڵام نوێـژی(راتبـە)ی جومعـە لـەپاش نوێژەکەیە، کەمترینی دوو ڕکاتە و زۆرترینیان چـوار ڕکاتـە بـە دوو سـەلام لەسـەر ڕای پەسـەند، لەڕیوایەتێکدا هـاتوە شـەش ڕکاتـەو بەسـێ سـەلام، کەواتـە کـەمترینی دوو ڕکاتەو زۆرترینی شەش ڕکاتە یان چوار ڕکاتە هەروەکو ئێستا بڵاوە.

مەبەست لە: (يفصل بين كل ركعتين هكذا قال أحمد بن حنبل)[٩٦].

واتە: مانای ئەوە نییە شەش ڕکاتەکە پێکەوە بەیەك سەلام ئەنجامی دەدات، بەڵکو شەش ڕکاتەو هەر دوو ركات بەسەلامێك یان چوار ڕکات و هەردوو ركـات بـە سـەلامێك، ئەمە لەهەمووی باشترە، قسەکەی داوەتە پاڵ ئیمامی ئەحمەد چونکە دانەری کتێبەکە (حەنبـەلی)یـەو لـەبارەی مەزهـەبی (حەنبـەلی)یـەوە دەزانـێ، ئـەم ڕیوایەتـە لـە ئەحمەدەوەیە کە شەش ڕکاتە، ڕای مەشهور ئەوەیە چوار ڕکاتە.

---

٩٦ / في مسائل عبدالله بن الامام أحمد (ص/١٢١ رقم ٤٣٧) .

**﴿٣٢﴾ نوسەر دەڵێت: (والخلافة في قريش إلى أن ينزل عيسى ابن مريم عليه السلام).**

واتە/ خیلافەت لەناو قورەیشدایە (لەقورەیش دەبێ) تاکو عیسا (علیه السلام) دادەبەزێ.

ڕاڤە:

ئەگەر کەسێك زیاتر ڕکابەرییان کرد بزانە کام لەوان دەبێتە ئیمامو هەموویان شایستەی ئیمامەت بوون ئەوا قورەیشییەکە پێش دەخرێت، لە بەر ئەو تایبەتمەندیەی هەیانە، بەبەڵگەی ئەو فەرموودەیەی دەفەرموێت: (الأئمة من قريش)[97] وە دەڵێت: (قدموا قريشاً ولا تقدموها)[98] جا ئەگەر قورەیشییەکە کەسێکی چاك بوو و ڕکابەرایەتی ڕوویدا ئەوا کێ دەسەڵات دەگرێتە دەست؟ ئەوا قورەیشییەکە پێش دەخرێت لەبەر وەسێتەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەوە، چونکە کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆچی دوایی کرد پشتیوانان وتیان: ئەمیرێك لەئێمەو یەکێك لەئێوە، ئەبو بەکر بەوانی گووت: (إن العرب لا تدين بهذا الأمر إلا لهذا الحي من قريش)[99] بۆیە بەیعەیان بە (ئەبو بەکر)دا و لەپاش ئەو بە (عومەر)و لەپاش ئەو بە (عوسمان)و لەپاش ئەو بە(عەلی)و لەپاش ئەو بە (معاویە)و لەپاش ئەو بە (بەنی ئومەییە)و پاش ئەوان (بەنی عەبباس) هەموویان لەقورەیشن، بەڵام ئەگەر ئەمارەتێك جێگیر بوو و بەسترا ئەوا گوێڕایەڵی پێویستە، هەرچەندە قورەیشی نەبێت یان ئەگەر قورەیشییەکە شایستەی ئیمامەت نەبوو چونکە

---

٩٧ / صحيح : أخرجه أحمد (١٢٩/٣، ١٨٣) والنسائي في (الكبرى) (٣/ ٤٦٧) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٢٧٥٨) .

٩٨ / صحيح : أخرجه ابن أبي شيبة في (مصنفه) (٤٠٢/٦) والبيهقي في (الكبرى) (١٢١/٣) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع ) (٢٩٦٦) .

٩٩ / تەماشای : صحيح البخاری (١٣٤١/٣) رقم (٣٤٦٧) بكە .

تەنها قورەیشی نایکاتە ئیمام ئیللا مەگەر لەگەڵ قورەیشی بوونیدا شایەنی ئەوە بێت بکرێتە ئیمام و ئیمامیکش دەسەڵاتدار نەبێت.

مەبەست لە: (إلى أن ينزل عيسى ابن مريم عليه الصلاة والسلام).

ئەمە ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی کاتێ عیسا دادەبەزێ و ئیمامی موسڵمان (محمد بن عبدالله المهدى) یە ئەویش لەنەوەی (الحسن بن علی بن أبی طالب)ە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دوایین ئیمام لە قورەیش دەبێ و یەکەمیانیش لەقورەیش بوە، ئەمەش بەگوێرەی توانا هەروەکو باسمان کرد، ئەگەر کەسێکی قورەیشی هەبوو ئەوا ویلایەتەکە لەکار ناخرێت، یان ئەگەر کەسێك بەو کارە هەستاو قورەیشی نەبێت و شایستەی ئەو کارە بوو ئەوا ئێمە دووری ناکەینەوەو ناڵێین:_ تۆ بەکەڵکی ئەو کارە نایەیت، بۆیە پێویستە ئەو کارانە بزانرێت.

**﴿٣٣﴾ نوسەر دەڵێت: (ومن خرج على إمام من أئمة المسلمين فهو خارجي قد شق عصا المسلمين وخالف الآثار وميتته ميتة جاهلية).**

**واتە: هەرکەسێك دەرچوو لەدژی پێشەوایەك لەپێشەوایانی موسڵمانان، ئەوە (خارجی)یەو یەکرِیزی موسڵمانانی تێك داوە، ناکۆك بووەو جیاواز بووە لەگەڵ ئەسەرەکاندا و مردنی ئەو مردنێکی نەفامانەیە.**

**ڕاڤە:**

**مەبەست لە:** (ومن خرج على إمام من أئمة المسلمين فهو خارجي).

**هەر کەسێك لەگوێڕایەڵی کاربەدەستان دەرچێتو خۆی لەگوێڕایەڵی داماڵێ بەحوججەی ئەوەی ئەو کاربەدەستە سەرپێچی هەیە، یان موخالەفاتی هەیە هەروەکو خەواریج کردیان ئەوا حوکمی خەواریجی هەیە، خەواریجیش کۆمەڵێکی گومڕان تۆوی ئەوان لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) سەری هەڵدا کاتێ (ذو الخويصرة) هات بە پێغەمبەری خوای (ﷺ) گوت -کاتێ دەستکەوتی دابەش دەکرد- پێی گوت: ئەی (محمد) (ﷺ) دادپەروەر بە چونکە تۆ دادپەروەر نەبویت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:** (ويلك فمن يعدل إذا لم أعدل) **واتە: وەیل بۆ تۆ جا کێ دادپەروەر دەبێت ئەگەر من دادپەروەر نەبم؟ کاتێ کابرا ڕۆیشت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:** (يَخْرُجُ من ضئضيء هذا قَوْمٌ تَحْقِرُونَ صَلَاتَكُمْ الى صَلَاتِهِمْ وَ عبادتكم الى عبادتهم يقرؤون الْقُرْآنَ ولَا يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ يَمْرُقُونَ من الدِّينِ كما يَمْرُقُ السَّهْمُ من الرَّمِيَّةِ فأينما لقيتموهم فاقتلوهم فإن في قتلهم أجراً لمن قتلهم)[100].

---

١٠٠ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٣٤١٤) ومسلم (١٠٦٤) .

بۆیــە پێویـستە کوشـتاریان لەگەڵـدا بکرێـت لەبـەر نەهێـشتنی خراپـەیان لەسـەر موسڵمانان.

ئەمە ئەگەر چەکیان هەڵگرت و چەکداریان ئاشکرا کرد، بـەڵام تـەنها ڕاو بۆچـوونی خەواریج ئاشکرا بکەن و قسەی لەسەر بکەن و کوشتار نەکەن و چەکدار نەبن ئەوا ئێمە ئینکارییان لێ دەکەین و گومڕاییەکەیان ڕوون دەکەینەوەو کوشتاریان لەگەڵدا ناکـەین، بەڵام ئەگەر دڕکیان هەبوو، وەکو ئەوەی کوشـتاریان لەگـەڵ موسـڵماناندا دەکـرد ئـەوا دروسـت نییـە موسـڵمانان وازیـان لێ بهێـنن بـەڵکو پێویـستە لەسـەر کاربەدەسـتی موسڵمانان کوشتاریان لەگەڵدا بکات، پێویستە لەسەر موسڵمانان لەگـەڵ کاربەدەسـتی خۆیاندا بن لەدژی ئەوان، هەروەکو لەخیلافەتی (عەلی)دا ڕوویدا کاتێ کوشتاری لەگـەڵ خەواریجـدا کـرد لـە نـەهرەوان، هـاوەڵان خۆیـان داوە پـاڵ (عـەلی) و لەگـەڵ ئـەودا کوشتاریان لەگەڵ خەواریجدا کرد تاکو بەخراپترین شێوە ئەوانی کوشت، بەم شـێوەیە ئـەو پاداشـتەیان دەسـتکەوت کـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بـەڵێنی پـێ دابـوون، لـەو فەرموودەیەدا کە دەفەرموێت: (فإن في قتلهم أجراً لمن قتلهم)[١٠١] واتە: لە کوشتنی ئەوانـدا پاداشت هەیە بۆ ئەو کەسـانەی دەیانکوژێـت) ئەمـەش لەفـەزڵ و چاکەی (عـەلی) یـە، (عـەلی) فـەزڵی زۆرە لەوانـە: ئـەو کوشـتاری لەگـەڵ خەواریجـدا کـرد و قـسەکەی پێغەمبەری خوای (ﷺ) لەواندا جێ بەجێ کرد.

مەبەست لە: (قد شق عصا المسلمين وخالف الآثار وميتته ميتة جاهلية).

خــەواریج بــەرگی گوێڕایــەڵییان داماڵانــدو دەرچــوون و بەرانبــەر کاربەدەسـتی موسڵمانانیان گرت، هەروەها ئەوانن موسڵمانان بەکافر دەزانن بەهۆی تاوانی گـەورەوە کە لە شیرك کەمترەو بچوکترە، جا ئەوان دوو نیشانەیان هەیە:ـ

---

١٠١ / بەشێکە لە فەرموودەکەی أبو سعيدی پێشوو .

نیـشانەی یەکـەم: دەردەچـن لـەدژی کاربەدەسـتی موسـڵمانان و هـەوڵ دەدەن کاربەدەستەکە لەسەر کارەکەی لادەن.

نیشانەی دووەم: ئەوان موسڵمانان بەکافر دەزانن بەئەنجامدانی تاوانی گەورە جگە لەشیرك بێت.

ئـەوەی وای لێکـردن زیادەڕەوییـە_ پـەنا بـەخوا_ بۆیـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ئاگاداری کردینەوە لـەزیادەڕەوی فەرموویـەتی: (إياكم والغلو فإنما أهلك من كان قبلكم الغلو)[١٠٢] واتە: دوور بکەونەوە لە زیادەرەوی، چونکە ئەوەی بـووە هـۆی بـە هەلاکـەت چوونی ئەوانەی پـێش ئێـوە زیـادەرەوی بـوو) ئـەویش شـتی زیادەیـە لەدینـدا، زیـادە لەشـتی دروسـتدا لـەئینکاری کـردن لـە (منکـر)، ئەمـە ئـەو زیادەڕەوییـە پـاڵی بەخەواریجەوە ناوە ئەوە بکەن کە کردیان، زیـادەڕەوی لـە ئینکـاری کردنـی (منکـر)دا تاکو بەرگی گوێڕایەڵیان دامـاڵی، زیـادەڕەوی لەپەرسـتندا تـاکو وای لیّ کـردن کەسـێك تاوانی گەورەی ئەنجامدابیّ بە کافری بزانن لە موسڵمانان.

مەبەست لە: (خالف الاثار).

واتـە ئـەو فەرموودانـەی لـە پێغەمبـەری خـواوە (ﷺ) هـاتووە لەدەسـتگرتن بـە گوێڕایەڵی کردنی کاربەدەستی موسڵمانان.

مەبەست لە: (وميتته ميتة جاهلية).

---

١٠٢ / صحيح : أخرجه النسائي (٣٠٥٧)، وابن ماجه (٣٠٢٩)، وأحمد (١/٢١٥، ٣٤٧) وصححه الشيخ الألبـاني في (الصحيحة) (١٢٨٣) .

واتە: چونکە ئاکارێکی تێدایە لە ئاکارەکانی نەفامی، چونکە عەرەب لە سەردەمی نەفامیدا جیاوازبوون لە ناو خۆیاندا بۆ چەند خێڵێك، ئیمامێکیان نەبوو کۆیان بکاتەوە، بەڵکو هەر خێڵێك سەربەخۆ بوو بۆ خۆی، هێرشی دەکردە سەر خێڵێکی تر، کۆنەبوونەوەو یەکیان نەدەگرت تاکو خوای گەورە پێغەمبەری (ﷺ) نازداری ڕەوانە کرد، بانگی ئەوانی کرد بۆ ئیسلام و ئەوانیش موسڵمان بوون، هەموویان چوونە ژێر یەك ئاڵا، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: (وَاذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنْتُمْ أَعْدَاءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُمْ بِنِعْمَتِهِ إِخْوَانًا) آل عمران/١٠٣) واتە: نیعمەت و بەخششەکانی خوا وەبیر بێنن ئەودەمە ئێوە دژ بەیەکتر بوون ئینجا خوای بەبەزەیی هۆگری خستە نێوان دڵەکانتانەوە، ئەوجا ئێستا بەهۆی بەخشش و میهرەبانی خۆیەوە بوونە برا).

خوای گەورە دەفەرموێت: (وَاذْكُرُوا إِذْ أَنْتُمْ قَلِيلٌ مُسْتَضْعَفُونَ فِي الْأَرْضِ تَخَافُونَ أَنْ يَتَخَطَّفَكُمُ النَّاسُ فَآوَاكُمْ وَأَيَّدَكُمْ بِنَصْرِهِ وَرَزَقَكُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ (٢٦) الأنفال) واتە: ئەوکاتە بیر بێننەوە کە ئێوە ئەی موسڵمانان! لەمەککەدا کەم و کزبوون و لاوازو دەستەپاچەش بوون و دەترسان خەڵك بتان ڕفێنن و بتان کوژن لەوکاتەدا خوای میهرەبان پەنایدان و لەڕۆژەکەی (بەدر) دا یارمەتی دان و پشتگیری لێ کردن و سەری خستن و ڕۆزی پاك و چاکی پێ بەخشین گشت ئەمانەی بۆ کردن بەشکو شوکرانە بژێر بن).

ئەمە لەبەرووبوومی گوێڕایەڵی کردنی کاربەدەستی موسڵمانانە، هەموو ئەم خەیر و چاکەیە ڕوو دەدەن:- بەر قەراربوونی ئەمن و ئاسایش، گەڕان بەدوای ڕزقدا، هەوڵدانی خەڵکی و سەرقاڵ بوونیان بە کۆشش کردن بۆ بەدەستهێنانی ڕزق و ڕۆزی بەهۆی ئەمن و ئاسایش ڕێگاو بانەکانەوە، بەڵام ئەگەر ترس هەبوو ئەوا خەڵکی سەفەر ناکەن، ناکڕن و نافرۆشن چونکە ترسیان لە خۆیان هەیە، ئەمە لە فەزڵ و چاکەی جەماعەیەو

گوێڕایەڵی کاربەدەستی موسڵمانانە، بەڵام دەرچوون لەدژی کاربەدەستان و دامالینی بەرگی گوێڕایەڵی ئەوا چەند شتێکی لێ دەکەوێتەوە لەوانە:-

یەکەم: پەرتەوازە بوونی جەماعەتی موسڵمانان.

دووەم: ڕشتنی خوێن بەبێ حەقی خۆی.

سێ یەم: سەرکەوتنی دوژمن، چونکە دوژمنان دڵیان بەوە خۆش دەبێ، بۆیە دەبینی دوژمنان خۆشحاڵ دەبن بەدوو بەرەکی ناو موسڵمانان، کار دەکەن بۆ پەرتەوازەبوونی موسڵمانان، یارمەتی گروپە گومڕاکان دەدەن و چەکدارییان دەکەن، یارمەتییان دەدەن بەپلان لە پێناوی ئەوەی دەرچن لەجەماعەتی موسڵمانان و دووبەرەکی ڕووبدات لەناو موسڵماناندا، بەو شێوە چەندین دەستکەوتیان دەستدەکەوێت هەروەکو ڕوویدا، ئەمە هەر هەمووی بەهۆی دوو بەرەکی موسڵمانانەوەو سەرپێچی پێغەمبەری خوداو (ﷺ) دەرچوون لەدژی کاربەدەستی موسڵمانان.

دەرئەنجام: ئەو کەسەی ئیمامێکی نەبێ ئەوە وەکو ئەو کەسەیە لەسەردەمی نەفامیدا بژیت و ئەگەر بمرێت ئەوە مردنێکی نەفامییە، مانای ئەوە نییە پێی کافر دەبێت، بەڵام مانای ئەوەیە: ئەو ئاکارێك لەئاکارەکانی نەفامی تێدایە، چونکە نەچووەتە ژێر گوێڕایەڵی ئیمام و لەپاشاگەردەنیدا دەژێت.

**﴿٣٤﴾ نوسەر دەڵێت: ولا يحل قتال السلطان، ولا الخروج عليه وإن جار وذلك لقول رسول الله (ﷺ) لأبي ذر الغفاري: (اصبر وإن كان عبدا حبشيا) وقوله للأنصار: (اصبروا حتى تلقوني على الحوض) وليس من السنة قتال السلطان فإن فيه فساد الدنيا والدين).**

واتە/ حەڵاڵ نییە کوشتار بەرانبەر سوڵتان بکرێت و نابێت دەرچیت دژی ئەو، هەرچەندە ستەمی کرد، لەبەر ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە (أبو ذر الغفاری) فەرموو: (ئارامبگرە، هەرچەندە کۆیلەیەکی حەبەشی بێت) و بەپشتیوانانی فەرموو: (ئارامبگرن تاکو پێم دەگەن لەسەر حەوزەکە) و لە سوننەتدا کوشتاری سوڵتان نەهاتووە، چونکە فەسادی دونیاو دینی تێدایە).

ڕاڤە/

دروست نییە بۆ هیچ کەسێك کوشتار لەگەڵ سوڵتاندا بکات، بەوەی بەچەکەوە لەدژی بوەستێ، چونکە ئەمە چەندین خراپەکاری بەدوای خۆیدا ڕادەکێشێ.

**مەبەست لە:** (ولا يحل قتال السلطان ولا الخروج عليه وإن جار).

**واتە:** حەرامە کوشتار بەرانبەر سوڵتان بکرێت هەروەکو چۆن خەواریج دەیکەن.

**مەبەست لە:** (وإن جار).

**واتە:** ستەمی لێ بوەشێتەوە دەبێ ئارامبگرێت لەسەری، چونکە ئارامگرتن لەسەر ئەوە بەو هەموو زیانەو زەرەرەی هەیەتی سوکترو کەمترە لەوەی بەهۆی دەرچوونەوە لەدژی ڕوو دەدات، جا ئەو زەرەرو زیانەی بەهۆی ئارامگرتنەوە ڕوو دەدات لەسەر گوێڕایەڵی سوڵتانێکی ستەمکار سوکترو کەمترە لەزەرەرو زیانی ئەوەی ڕوو دەدات

بەهۆی دەرچوونەوە لەدژی، گومانیش نییە لەبنەماکانی ئیسلامدا هاتوە: ئەنجامدانی سوکترین دوو زەرەرەکە لەبەر پاڵنان و ئەنجامنەدانی بەرزەکەیان.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە پشتیوانانی فەرموو: (إنكم سترون بعدي أثرة فاصبروا حتى تلقوني على الحوض)[١٠٣] ئامۆژگاری ئەوانی کرد بە ئارامگرتن هەرچەندە تووشی (أثرة)دەبن، (أثرة) واتە: سەرکردەو ئەمیرەکان سامان دەبخشنە کەسانێك کەچی بە ئەندازەی ئێوە شایستە نین) جا ئامۆژگاری ئەوانی کرد بە ئارامگرتن چونکە دوور خستنەوەی مەفسەدە گەورەکەی تێدایە.

مەبەست لە: (وذلك لقول رسول الله (ﷺ) لأبي ذر الغفاري: (اصبر وإن كان عبدا حبشيا).

واتە کاربەدەستەکە بەکەم نەزانێ هەرچەندە ڕواڵەتێکی ناشیرینی هەبێ، هەرچەندە ڕەنگی ڕەش بێت، یان نەسەبی عەرەب نەبێ، چونکە عیبرەت بەپلەو پایەکەیەتی _ کە خیلافەت و ئەمارەتە_ عیبرەت بەکەسایەتییەکەی نییە، جا گوێڕایەڵی دەکرێت چونکە ئەو موسڵمانە، تەماشای ڕواڵەتی ناکرێت کە پێی باش نەبێت لەبەر ناشیرین و نابوتی، یان لەعەیبێك لەجەستەیدایە، (مجدع الاطراف)[١٠٤] هەموو ئەمانە ڕێخۆشکەر و عوزر نین بۆ دەرچوون لەدژی، هەرچەندە نەخۆشی بێت، یان لاوازی تەندروستی هەبێت، لەبەر ئەوەی بەیعەی بەستراوە ئەوا دەبێ ئارامبگرێت لەسەری، گوێی لێ دەگیرێ و گوێڕایەڵی دەکرێت هەرچەندە ئەو سیفاتانەی هەبێت.

مەبەست لە: (وليس من السنة قتال السلطان).

---

١٠٣ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٣٥٨١) ومسلم (١٨٤٥) .

١٠٤ / سبق تخريجه .

کوشتاری سوڵتان لەسوننەتێکی سابتی پێغەمبەری خـوادا (ﷺ) نـەهاتوە، لەیـەك فەرموودەدا نەهاتووە نە (ضعیف)و نـە (حـسن)و نـە (صـحیح)، لەسـوننەتدا نـەهاتوە بەڵگە بێت لەسەر کوشتاری سـوڵتانی موسـڵمان، هەرچـەندە کەسـێکی (فاسـق) بێـت، هەرچـەندە کەسـێکی سـتەمکار بێـت، هەرچـەندە کەسـێکی زۆردار بێـت، هەرچـەندە سەروەت و سامان بە ویستی خۆی سەرف بکات، ئەوا دروست نییـە لـەدژی دەرچـیت، بەڵکو فەرموودەکان بەڵگەن لەسەر ئارامگرتن لەسـەر ئەوانـەو حـەرامبوونی دەرچـوون لەدژیان.

ئەمەش مانای ئەوە نییە سـوڵتان ئامۆژگـاری ناکرێـت، بـەڵکو ئامۆژگـاری دەکرێـت بەنهێنی لەنێوان ئەو و ئامۆژگارەکەدا بۆیە پێویستە هەرکەسـێك ئامۆژگارییـەکی هەیـە بیگەیەنێتـە سـوڵتان، هـەروەکو پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: (الدين النصيحة قلنا: لمن؟ قال: لله ولكتابه ولرسوله ولأئمة المسلمين وعامتهم)[١٠٥] جا ئەوە مانـای ئـەوە نییـە ئامۆژگـاری ناکرێـت و وازی لێ دەهێنرێـت، بـەڵکو دەبـێ ڕوون بکرێتـەوەو ئامۆژگـاری بکرێت، ئەمەش حەقی سوڵتانە بەسـەر زانایانـەوەو بەسـەر ژێـر دەستەکەی و بەسـەر ڕاوێژکارانەوەو بەسەر ئەوانەی ڕاو بۆچوونیان هەیە دەبێ ئامۆژگاری بکەن.

مەبەست لە: (وليس من السنة قتال السلطان) واتە لەسوننەتدا هـیچ بەڵگەیـەك نییـە، نـە (صـحیح)و نـە (ضـعیف) لەسـەر دروسـتی کوشـتاری سـوڵتانی موسـڵمانان بـەڵکو لەسوننەت و قورئاندا بەڵگە هاتووە لەسەر فەرمان کـردن بـە گوێڕایـەڵی ئـەوە (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ) النساء /٥٩) واتـە: ئـەی ئـەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە! گوێڕایەڵی فەرمانی خـواو پەیامبـەر (ﷺ) بـن لـە هـەموو کاروبارێکداو بەر فەرمانی کاربەدەستان و کارسازانی خۆتان بن).

---

١٠٥ / أخرجه مسلم (٥٥) .

تەماشای ئەو ئایەتە بکە (مِنْكُمْ) لەبەر ئەوەی موسڵمانە ئەوا پێویستە گوێڕایەڵی بکرێت.

مەبەست لە: (فإن فيه فساد الدنيا والدين).

لەکوشتاری سوڵتاندا فەسادی دونیای تێدایە بەوەی موڵك لە دەست دەردەچێتو پاشاگەردەنی بڵاودەبێتەوەو دوژمنان زاڵ دەبنو دین بزر دەبێت، چونکە هیچ کەسێك چیتر سنوورەکان جێ بەجێ ناکات، هیچ کەسێك (قصاص) جێ بەجێ ناکات، هیچ کەسێك حوکمە شەرعییەکان جێ بەجێ ناکاتو مافەکان بگەڕێنێتەوە بۆ خاوەن مافەکان، حوکمە (قضائی)یەکان جێ بەجێ بکات، ئا بەم شێوەیە دینەکە فەساد دەکات، فەسادو پاشاگەردەنی بڵاو دەبێتەوە، جا ئەگەر دەستی دز نەبڕدرێت ئەوا سەروەت و سامانەکان لەدەست دەردەچێت، ئەگەر دەستی ڕێگرەکان نەبڕدرێت ئەوا ڕێگاکان لەکار دەکەوێ، کێ ئەوانە دەکات؟

ئەوە کاربەدەستە دەیکات، ئەمەش لەدەسەڵاتی کاربەدەستە، هیچ کەسێك ناتوانێ هەرچەندە هەموو خەڵکی کۆببنەوە ئەوا ناتوانن ئەو کارانە ئەنجام بدەن، بەڵکو دەبێتە پاشاگەردەنی.

**﴿٣٥﴾ نوسەر دەڵێت: (ويحل قتال الخوارج إذا عرضوا للمسلمين في أموالهم وأنفسهم وأهليهم وليس له إذا فارقوهم أن يطلبهم ولا يجهز على جريحهم ولا يأخذ فيئهم ولا يقتل أسيرهم ولا يتبع مدبرهم).**

واتە: کوشتاری خەواریج حەڵاڵە کاتێ ڕێگە لەموسڵمانان بگرن لە سامان و ماڵ و کەس‌و کاریاندا، ئەگەر وازیان هێناو ئەوا بەشوێنیاندا ناڕۆی و بریندارەکانیان ناکوژرێت‌و دەستکەوتەکانیان نابرێت‌و دیلەکان ناکوژرێت‌و ئەوانەی هەڵبێن دوایان ناکەوی.

ڕاڤە/

زانیمان خەورایج ئەوانەن بەرگی گوێڕایەڵییان داماڵی، وا دەبینن کاربەدەست بەیعەی نییە یان بەیعەی بەسەر خەڵکیەوە نەماوە ئەگەر سەرپێچییەکی ئەنجامدا، موسڵمانان بەکافر دەزانن لەبەر ئەنجامدانی تاوانی گەورە، جا ئەوانە ئەگەر ئەو مەزهەبەیان هەڵبژاردو شوێنی کەوتن و دڕکیان نەبوو کوشتاریان نەدەکرد ئەوا وازیان لێ دەهێنرێ لەگەڵ ئامۆژگاری کردنیان و ڕوونکردنەوە بۆیان بەڵکو تەوبە بەکەن.

بەڵام ئەگەر دڕکیان هەبوو، هێزی خۆیان دەرخست، ئەوا پێویستە لەسەر موسڵمانان کوشتاریان لەگەڵدا بکات بەمەبەستی نەهێشتنی خراپەیان‌و ناکوژرێن وەکو ئەوەی ئەوانە کافرن، بەڵکو دەکوژرێن وەکو ئەوەی ئەوانە موسڵمانن ستەمیان لەموسڵمانان کردووەو تەعەدای لێیان کردوە، بۆیە کاتێك پرسیار کرا لەئەمیری ئیمانداران (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) دەربارەی خەواریج: ئەوانە کافرن؟ وتی: (لا، من الكفر فرّوا ولكنهم قوم بغوا علينا) واتە: نەخێر ئەوانە لەکوفر هەڵاتوون، بەڵام ئەوانە کۆمەڵێکن جەورووستەمیان لێ کردووین).

جا ئەوانە ناکوژرێن لەبەر ئەوەی کافرن، بۆیە ژن و کۆیلەکان نابرێت، سامانەکەیان نابرێت و بریندارەکانیان ناکوژرێت، چونکە کوشتاری ئەوان لەبەر نەهێشتنی خراپەیە نەك لەبەر کوفریانە.

مەبەست لە: (ویحل قتال الخوارج إذا عرضوا للمسلمین في أموالهم وأنفسهم وأهلیهم).

چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی کردووە بەکوشتنیان و چونکە (عەلی) ئەوانی کوشت کاتێ ڕێگایان گرت لە (عبدالله بن خباب بن الارت) و کوشتیان سکی کەنیزەکەیان دڕی کە لەو کاتەدا دوو گیان بوو، لەو کاتەدا ئەمیری ئیمانداران بڕیاری کوشتاری ئەوانی دا، چونکە چەند دەستپێشخەرییەك لەوانەوە ڕوویدا.

مەبەست لە: (ولیس له إذا فارقوهم أن یطلبهم).

ئەگەر وازیان لەجەنگ هێنا ئەوا کار بەدەست بۆی نییە شوێنیان بکەوێ و غەزایان بکات، چونکە تەعەدا کردن لەوانەوە ڕووی نەدا ئەوا ئەوان گومڕان بەبێ گومان و پێویستە ئامۆژگاری بکرێن بەڵکو بگەڕێنەوە، بەڵام کوشتاریان لەگەڵ ناکرێت.

مەبەست لە: (ولا یجهز علی جریحهم) چونکە بریندار زیانی نەماوە.

مەبەست لە: (ولا یأخذ فیئهم) واتە سامانیان بەدەستکەوت نابردرێت، چونکە سامانی موسڵمانانە.

مەبەست لە: (ولا یقتل أسیرهم) چونکە موسڵمانن و زەرەرو خراپەیان نەما بەبریندارکردنیان یان بەدیل گرتنیان.

مەبەست لە: (ولا یتبع مدبرهم) ئەگەر شکستیان هێنا و هەڵاتن ئەوا کاربەدەست وازیان لێ دەهێنێ و شوێنیان ناکەوێ چونکە خراپەیان کۆتایی پێ هات و نەما.

﴿٣٦﴾ نوسەر دەڵێت: واعلم أنه لا طاعة لبشر في معصية الله عز و جل.

واتە: بزانە گوێڕایەڵی هیچ مرۆڤێك نابێت بكرێت لەسەرپێچی خوادا.

﴿٣٧﴾ ومن كان من أهل الإسلام، ولا يُشهد على أحد، ولا يُشهد له بعمل خير ولا شر فإنك لا تدري بما يُختم له عند الموت، ترجو له رحمة الله وتخاف عليه، لا تدري ما يسبق له عند الموت إلى الله من الندم، وما أحدث الله في ذلك الوقت إذا مات على الإسلام، ترجو له الرحمة، وتخاف عليه ذنوبه.

واتە: هەركەسێك لەئەهلی ئیسلام بێت، شایەتی بۆ هیچ كەسێكو شایەتی لەسەر هیچ كەسێك نادرێت بەكارێكی چاك یان خراپ، چونكە تۆ نازانی بەچی شتێك كۆتایی پیٚ دێت لەكاتی مردندا، تكاو ڕجات بۆی هەیە بەڕەحمەت و دەترسی لێی (لە ئاخر شەڕی)، نازانی چی شتێك پێشی دەكەویٚ لەكاتی مردندا بۆ لای خوا لە پەشیمانی، خوای گەورە چی شتێك دەكات لەو كاتەدا ئەگەر لەسەر ئیسلام مرد، تكای ڕەحمەتت بۆی هەیەو لە ئەنجامی تاوانەكانی دەترسی.

**﴿٣٨﴾ وما من ذنب إلا وللعبد منه توبة.**

**واتە: هیچ تاوانێك نییە ئیللا بەندەكان بۆیان هەیە تەوبەی لێ بكەن.**

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (واعلم أنه لا طاعة لبشر في معصية الله عز و جل).

**ئەمە بەدەرخستنی حوكمەكەی پێشوە، كاتێ باسی ئەوەی كرد پێویستە گوێڕایەڵی كاربەدەستان بكرێت ئەوەی ڕوونكردەوە لەهەموو شتێكدا پێویست (واجب) نییە، بەڵكو لەو شتانەدا گوێڕایەڵی دەكرێن سەرپێچی نییە، بەڵام ئەگەر فەرمانیان كرد بەسەرپێچی ئەوا گوێڕایەڵیان ناكرێ لە سەرپێچیدا، لەفەرموودەیەكدا هاتوە:- پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەمیرێكی لەهاوەڵان بەسەر سریەیەكدا دانا، كاتێ بەڕێگادا ڕۆیشتن بەوانی گووت:- چیلكەو دار كۆبكەنەوە، كاتێ كۆیان كردەوە گوتی:- دایگرسێنن، كاتێ دایانگیرساند گوتی:- بچنە ناو ئاگرەكەوە، ئایە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناڵێت: ببیستن و گوێڕایەڵ بن؟ هەندێكیان گوتیان:- ئێمە گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەبووین تەنها بەمەبەستی ئەوەی لەئاگر هەڵبێین، ئیتر چۆن بچینە ناو ئاگرەكەوە؟ بۆیە ڕازی نەبوون بچنە ناو ئاگرەكەوە، كاتێ ئەو هەواڵە گەیشتە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:** (أما إنهم لو دخلوها لم يخرجوا منها، إنما الطاعة في المعروف)[١٠٦] **واتە: ئەگەر ئەوانە بچوایەنەتە ناو ئاگرەكەوە ئەوا لێی دەرنەدەچوون، بەڵكو گوێڕایەڵی لە چاكەدایە)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:** (لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق)[١٠٧] **واتە: (گوێڕایەڵی بۆ هیچ دروستكراوێك نییە لەسەرپێچی خوادا).**

---

١٠٦ /متفق عليه : أخرجه البخاري (٤٠٨٥ ) ومسلم (١٨٤٠) .

١٠٧ / سبق تخريجه .

خوای گەورە دەربارەی دایك و باوك فەرموویەتی: (أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ (١٤) وَإِنْ جَاهَدَاكَ) واتە: دایك و باوك (عَلَى أَنْ تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا وَاتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّ (١٥) لقمان) واتە: كەوایە (ئەی مرۆڤ!) بەردەوام سوپاسی من بكە لە سەر نیعمەتەكانم و سوپاسی باوك و دایكیشت بكە لە سەر ئەو هەموو ئەزیەت و ئازارە لە پێناوی تۆدا چێشتوویانە، گێڕانەوەشتان هەر بۆ لای منە دوای زیندووبوونەوە (١٤) خۆ ئەگەر هەوڵیشیانداو پێیان داگرت لەسەر ئەوەی كە شتێك بكەی بەشەریك و هاوبەشم، هیچ بەڵگەو زانیارییەكت پێ نییە ئەوسا گوێڕایەڵییان مەكەو لەدونیادا لەگەڵ هەردووكیاندا بەشێوەیەكی چاك و پەسەند هاوەڵی بكەو بەردەوام هەر ڕێگەی ئەوە بگرە بەرەو من ڕێگەی گرتۆتە بەر و گەڕاوەتەوە بۆ لام (١٥).

بەڵام مانای ئەوە نییە ئەگەر كاربەدەست فەرمانی كرد بەسەرپێچی بەرگی گوێڕایەڵی دادەماڵی، بەڵام گوێڕایەڵی ناكرێت لەو سەرپێچییەدا، گوێڕایەڵی ئەودەمێنێ و بەردەوامە لەشتێكدا سەرپێچی نەبێت، ئەمە مانای ئەوەیە كە (گوێڕایەڵی بۆ هیچ دروستكراوێك نییە لەسەرپێچی دروستكاردا) بۆیە ناگوترێت: خوای گەورە فەرمانی كردوە بەگوێڕایەڵی كاربەدەستان و فەرمانی كردوە بەچاكە كردن لەگەڵ دایك و باوكدا، بەڵام لەچاكەدا نەك لەسەرپێچی خوادا.

مەبەست لە: (فلا يُشهد على أحد ولا يُشهد له بعمل خير ولا شر).

ئەم مەسەلەیە شایەتی دانە بەسەر كەسێكی دیاریكراودا بەبەهەشت یان بە ئاگر، جا شایەتی بەهەشت بۆ هیچ كەسێكی دیاریكراو نادرێت و شایەتی بۆ هیچ كەسێكی دیاریكراو نادرێت بەئاگر، ئیللا بەبەڵگەیەك نەبێ لەقورئان یان لە سوننەت، بەڵام ئەو كەسەی بەڵگەیەك نەبێ ئەهلی بەهەشتە هەرچەندە پیاوچاكێكی ئیماندار بێت ئەوا

شـایەتی بـۆ نادرێـت، چـونکە ئێمـە نـازانین کۆتاییەکـەی چـۆن دەبـێ، هـەروەها سەرپێچیکار یان کافر ئێمە نالێین ئەوە لەئەهلی ئاگرە، چونکە ڕەنگـە تەوبـە بکـات و ئێمەش ئاگامان لێی نییە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (إن أحدكم ليعمل بعمل أهل الجنة فلا يكون بينه وبينها إلا ذراع فيسبق عليه الكتاب فيعمل بعمل أهل النار فيدخلها وإن أحدكم ليعمل بعمل أهل النار حتى ما يكون بينه وبينها إلا ذراع فيسبق عليه الكتاب فيعمل بعمل أهل الجنة فيدخلها)[١٠٨] واتە: کەسێك لە ئێوە کار دەکات بـە کـرداری ئـەهلی بەهەشت تاوەکو هیچ لە نێوانیاندا نامێنی تەنها باڵێك نـەبێ ئـەمجار کتێبەکـەی پێـشی دەکەوێتو بە کردەوەی ئەهلی ئاگر کار دەکاتو دەچێتە ئـاگرەوە، هـەروەها کەسـێك لە ئێوە کار دەکات بە کرداری ئەهلی ئاگر تاوەکو هیچ لە نێوانیاندا نامێنی تەنها باڵێك نەبێ ئەمجار کتێبەکەی پێشی دەکەوێتو بە کردەوەی ئـەهلی بەهەشـت کـار دەکـاتو دەچێتە بەهەشتەوە).

کەواتە کارو کردەوەکان بەپێی کۆتایەکەیەتی، کۆتاییەکانیش هیچ کەسێك نازانێت تەنها خوا نەبێ کە ئاگادارو زانایە بەهەموو غەیبەکان، بەڵام لەئەنجامی سەرپێچیکاران دەترسین و تکا دەکەیت بۆ گوێڕایەڵان بەڵام جەزمی ناکـەین، بـەڵکو تکامـان هەیـە بـۆ گوێڕایـەڵان و جـەزمی ناکـەین و لـە ئـەنجامی سەرپێـچی سەرپێـچیکاران دەترسـین و جەزمی ناکەین، ئەمە بەنیسبەت کەسی دیـاریکراوەوە، بـەڵام بەنیـسبەت گـشتی یـەوە ئەوا جەزمی ئەوە دەکەین ئیمانداران لەبەهەشتدان و جەزمی ئەوە دەکەین بێ باوەڕان لـەئاگردان، خـوای گـەورە دەربـارەی ئـاگر دەفـەرموێت: (أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ (١٣١) آل عمران)، هەروەها دەربـارەی بەهەشـت دەفـەرموێت: (أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ (١٣٣) آل عمران) ئەمە بەپێی گشتی یە، بەڵام وەکو تاکەکان و دیاریکراوەکـان ئـەوە دەگێڕدرێتـەوە بـۆ

---

١٠٨ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٣٠٣٦ ) ومسلم (٢٦٤٣) .

لای خوا، بەلام بەپێی ڕواڵەتیان مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەین، مامەڵە لەگەڵ ئەهلی گوێڕایەڵدا دەکەین بەپێی ئەوەی لامان ئاشکرایە، مامەڵە لەگەڵ ئەهلی سەرپێچیدا دەکەین بە پێی ئەوەی ئاشکرایە لامان، ئێمە حوکم تەنها بەڕواڵەت دەدەین، نەك لەسەر ئاکام و کۆتایی چونکە ئەوە بەدەستی خوایە.

**﴿٣٩﴾ نوسەر دەڵێت: (والرجم حق) واتە: ڕەجم کردن حەقە.**

**راڤە/**

خـوای گـەورە چـەند شـتێکی حـەرام کـردوە لـە بابـەتی شـەرەف و نامووسـداو لەمامەڵەداو جگە لەوە، ئەم حەرامکراوانە دەکرێتە چەند بەشێکەوە:—

چەند حەرامکراوێکی گەورە.

چەند حەرامکراوێکی بچووك.

ئـەمجار بـەپێی سـزاکەی لەسـەر ئـەو کەسـەی ئـەنجامی دەدات دەکرێتـە سـێ بەشەوە:—

بەشی یەکەم: چەند حەرامکراوێك خوای گەورە سزایەکی دیاریکراوی بۆ دانـاوە، پێی دەگوترێت سنورەکان (الحدود)، ناوی لێ نراوە (الحدود) کە لە (الحدّ)ەوە هـاتووە بـەمانای (المنـع) واتـە: ڕێگـرتن، چـونکە ئـەم سـزایانە ڕێ لەخاوەنەکـەی دەگرێـت بەکەوتنە ناو سەرپێچیەوە.

بەشی دووەم: چەند حەرامکراوێك خوای گەورە سنوری (حدود)ی بۆ دانەناوە بـەڵام سەرزەنشت (تعزیر)ی تێدایە ئەمەش خراوەتە دەستی کاربەدەست، بەشێوەیەك خۆی پێی باش بێتو ببێتە هۆی ئەوەی لێی دووربکەوێتەوە، پێـی دەگوترێـت: سەرزەنـشت (التعزیر) ئەویش بە مانای (التأدیب) دێت.

بەشـی سـێ یـەم: ئـەوەی حـەدو تـەعزیری تێـدا نییـە لەحـەرامکراوەکان، بـەڵکو هەڕەشەو تووڕەبوون و لەعنەت و ئـاگری تێدایـە، جگـە لەوانـە لـەجۆرەکانی هەڕەشـە، وەکـو خـواردنی سـوو و قومـار و جگـە لەوانـە، ئەمـە هەڕەشـەیەکی تونـدی تێدایـە، هەرکەسێ ئیمان لەدڵیدا هەبێت ئەوا لێی دوور دەکەوێتەوە، هەرکەسێك ئیمـان لەدڵیـدا

نەبێت یان ئیمانی لاواز بێت ئەوا لێپرسینەوەو سزا لەپێشێتی لەدوا ڕۆژدا، خوای گەورە خۆی ئەو حەرامکراوانەی حەرامکردووە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (إن الله تعالى فرض فرائض فلا تضيعوها وحرم أشياء فلا تنتهكوها وسكت عن أشياء رحمة بكم غير نسيان فلا تسألوا عنها)[١٠٩].

لەو حەددانە حەدی زینایە، زیناش بریتییە لە ئەنجامدانی کارێکی خراپە لەڕێگەی دامێنێکەوە بۆی حەڵاڵ نییە، ئەوە زینایە، ئەنجامدانی کاری خراپە لەدامێنەکانەوە خوای گەورە حەرامی کردوە، تەنها لەڕێگای گرێ بەستێکی شەرعیو دروستەوە نەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ (٢٩) إِلَّا عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ (٣٠) فَمَنِ ابْتَغَى وَرَاءَ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْعَادُونَ (٣١) المعارج) واتە: ئەوانەی داوێنی خۆیان دەپارێزن لەحەرام (٢٩) جگە لەژنەکانیان، یان لەکەنیزەکەکان (٣٠) ئینجا ئەوەی جگە لەوە بخوازێ و ئەو کارە بکات، ئەوانە دەست درێژیکارن و خۆیان ڕانواندووە بۆ سزای خوا (٣١).

واتە ئەوانەی لەحەڵاڵەوە لادەدەن بۆ حەرام،جا هەر کەسێك تووشی زینا هات ئەوا دوو بەشە:—

یان کەسێکی عازەبەو لەپێش ئەوە ژنی نەهێناوە بەڕێگای شەرعی بیپارێزی، ئەوە عازەبە، ئەمەش سزاکەی ئەوەیە سەد جەڵدەی لێ بدرێ، خوای گەورە دەفەرموێت: (الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ وَلَا تَأْخُذْكُمْ بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ (٢) النور) واتە: ئەو کچ و کوڕەی زینا و شەروالٌ پیسی ئەکەن دەبێ لە هەریەکەیان سەد جەڵدە (شەلاق)ی لێ بدەن، نابێ بەزەیی و نەرم و نیانی و سۆز بتانگرێ لە بەرامبەر هەریەك لەو دوانەوە لە

١٠٩ / رواه الطبراني وابن جرير والدار قطني والحاكم والبيهقي وحسنه النووي في رياض الصالحين .

راپەراندنی حوكمی خوادا، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خوا و بە رۆژی دوایی هەیە جا بۆ ئەوەی ئەو دوانە پتر ئێشیان پێ بگاتو خەڵكیش پەند وەرگرن با كۆمەڵێ لە بروادارانٍ ئامادەی سزاكەیان بن و ببینن).

لە سوننەتدا هاتووە (نامۆ) دەكرێت واتە لەو شارە دوور دەكرێتەوە ئەو كارەی تێیدا ئەنجامداوە بۆ شارێكی تر، بۆ ماوەی یەك ساڵ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (البكر بالبكر جلد مائة وتغريب عام)[١١٠] واتە: عازەب لەگەڵ عازەبدا لێدانی سەد جەڵدەو دوورخستنەوەی یەك ساڵ).

كەواتە دوور خستنەوەكەی جێگیرو سابتە لەسوننەتدا، بەڵام جەڵدە ئەوە سابت و جێگرە لەقورئاندا و زانایان یەكدەنگن لەسەر جەڵدەو زۆربەشیان یەكدەنگن لەسەر دوور خستنەوە، ئەمە حەددی كەسی عازەبە.

بەڵام (الثيّب): ئەویش ئەو كەسەیە لەپێشدا بەرێگای شەرعی ژنی هێناوە، بەهاو قەدرو حورمەتی نامووسی زانیوە ئەوا ئەم كەسە بەردباران دەكرێت تا مردن، ئەمەش سابتە لەقورئاندا كە وشەكانی (لفظ)ی نەسخ كراوەتەوە بەڵام حوكمەكەی ماوە، هەروەكو چۆن عومەر لەسەر مینبەرەكەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (نَزلت آية الرجم فوعيناها وحفظناها ورجم رسول الله وأخشى إن طال بالناس زمان أن يقولوا: ما نجد الرجم في كتاب الله ألا إنه في كتاب الله)[١١١] ئاماژە بۆ ئەو ئایەتە دەكات كە خوای گەورە فەرموویەتی: (الشيخ والشيخة إذا زنيا فأرجموهما البتة نكالا من الله والله عزيز حكيم)[١١٢] ئەم

١١٠ / أخرجه مسلم (١٦٩٠) .

١١١ / رواه البخاري ومسلم .

١١٢ / أخرجه مسلم (١٦٩١) .

قورئانە وشەکانی نەسخ کراوەتەوەو حوکمەکەی ماوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕەجمی کردوەو فەرمانیشی بەڕەجم کردوە، موسڵمانان یەکدەنگن لەسەر ئەوە، هیچ کەسێك ناکۆك نییە لەم مەسەلەدا تەنها ئەهلی بیدعە نەبێت کە هیچ بایەخ بە ناکۆکی ئەوان نادرێت وەکو خەواریج.

جا (بەردەباران کردن) سابتە لەقورئان و سوننەتی وتن‌و کرداری (قولي و فعلي) هەروەها بە(إجماع) یەکدەنگی زانایان، هەر کەسێك نکۆڵی لێ بکات ئەوا کافرە، چونکە ئەو کەسە خواو پێغەمبەرو(ﷺ) (إجماع)ی موسڵمانانی بەدرۆخستۆتەوە،جا (بەردەباران کردن) سابتە هیچ ڕێگای قسەکردنی تێدا نییە، بۆیە لێرەدا دانەر فەرموویەتی: (الرجم حق) ئەمە بەشێکە لەعەقیدەی ئەهلی سوننەو جەماعە وەکو وەڵامدانەوەو ڕەددی بیدعەکاران کە نکۆڵی لە بەردەباران کردن دەکەن بەبێ زانیاری، بەبێ چاوڕوونی لەبەر نەفامی خۆیان، خۆیان کردووەتە ئەوەی زانان، پشتیان بە عەقڵو فیکری خۆیان بەستوە، ئەوانە بایەخ بە ناکۆکییەکەیان نادرێت و تەماشای قسەکانیان ناکرێت، ڕەنگە کەسێکی نەفام بانگەشەی زانیاری و لێکۆڵینەوە دەکات و دەڵێت:- ئەم بابەتە جیاوازی تێدایە، بۆیە پێی دەگوترێت ئایە هەموو جیاوازییەك بایەخی پێ دەدرێت؟! چونکە چەندین جیاوازی هەیە بایەخی پێ نادرێت و گوێی لێ ناگیرێت، یەکێك لەوانە ئەم جیاوازییەیە، بۆیە شاعیر دەڵێت:-

وليس كل خلاف جاء معتبراً إلا خلافٌ له حظ من النظر

مەسەلەکە بریتی نییە لەبانگەشەی جیاوازی، بەڵکو مەسەلەکە: بریتییە لە لێکۆڵینەوەو ساغکردنەوەی‌و پەیوەست کردنی بەبەڵگەوە، جا هەرکەسێك ناکۆك بوو لەگەڵ بەڵگەدا ئەوا نەیارە(مخصوم)ەو هیچ عیبرەت لەو جیاوازییەدا نییەو بایەخی پێ نادرێت، خوای گەورە دەفەرموێت: (فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنْتُمْ

تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا (٥٩)النساء) واتـە: ئەگـەر لـە شـتێكدا كێشەو ناكۆكیتـان بـوو جـا بیگێڕنـەوە بـۆ لای خـواو پەیامبـەر (ﷺ) واتـە: بـا تـەنها قورئان و سوننەت داوەر و حەكەمتان بـن، ئەگـەر باوەڕتـان بـە خـواو بـە ڕۆژی دوایـی هەیە دەبێ ئاوابێت، ئەو گێڕانەوەی كێشەو هەرایە بۆ لای قورئـان و سـوننەت جـوانترو چاكترە بۆتان چاكترین ڕەفتاریشە بۆ داهاتووتان).

لەسەر ئەو جیاوازییە نامێنین بەڵكو دەگەڕێینەوە بۆلای بەڵگـە لەبـەر ئـەو ئایەتـەی دەفـەرموێت: (فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا (٥٩)النساء) بۆیە لەم كتێبە باسی مەسەلەی ڕەجمی كردوە هەرچەندە كیتابەكە كیتابێكی عەقیدەیە، چونكە پێویستە باوەڕ بەڕەجم كردن بكـەین، هەركەسـێك نكـۆڵی لێ بكـات ئـەوا كـوفری كـردوە، جـا ئەمـە دەقێكـە لەسـەر ئـەوەو ڕەدی بیدعەكارانـە، ئەوانەی نكۆڵی لە ڕەجم دەكەن.

﴿٤٠﴾ نوسەر دەڵێت: (والمسح على الخفين سنة).

واتە: مەسح کردن لەسەر هەردوو خوف سوننەتە.

راڤە/

مەبەست لە: (والمسح على الخفين سنة).

دەقێکی هێناوەتەوە لەسەر ئەم مەسەلەیە، هەرچەندە ئەم مەسەلەیە مەسەلەیەکی فیقهییە، چونکە پەیوەندی هەیە لە گەڵ عەقیدەدا، جا هەرکەسێك مەسح کردنی لەسەر هەردوو خوف ئینکار کرد ئەوا لە ئەهلی سوننەو جەماعە دەرچووە و جیاوازو ناکۆکە لە گەڵ عەقیدەی راستو دروستدا، چونکە مەسح کردن لەسەر خوف سابتە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) لە چەندین فەرموودەوە دەگاتە پلەی (المتواتر).

(والمسح على الخفين) ڕوخسەتە، کارکردن بە ڕوخسەت سوننەتە، بەبەڵگەی ئەو فەرموودەیە دەفەرموێت: (إن الله يحب أن تؤتى رخصه كما يكره أن تؤتى معصيته)[113] واتە: خوای گەورە پێی خۆشە ڕوخسەتەکانی ئەنجام بدرێت هەروەکو چۆن پێی ناخۆشە سەرپێچییەکانی ئەنجام بدرێت).

جا مەسح کردن لەسەر هەردوو خوف و مەسح کردن لەسەر ئەوەی جێگای خوف دەگرێتەوە وەکو (گۆرەوی) ئەوە سابتە لە سوننەتی پێغەمبەری خواوە (ﷺ)، هیچ کەسێ جیاواز نییە لەم بابەتەدا تەنها (الرافضة) نەبێت، بەڵکو ئیسپاتی مەسح کردنیان لەسەر هەردوو پێ کردووە، جا هەردوو پێ لای (الرافضة) ناشۆردرێت بەڵکو بەسەریاندا مەسح دەکرێ بەبەڵگەی ئەو ئایەتە کەدەفەرموێت: (وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ) بە(کسرە) لەوشەی (ارجلَكم) (الى الكعبين)، (الكعبان) لای ئەوان ئەو

---

[113] / صحيح : أخرجه أحمد (٢/١٠٨) وابن خزيمة في (صحيحه) (٢٠٢٧) وابن حبان في (صحيحه) (٢٧٤٢) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع )(١٨٨٥) .

(الكعبان)ە ناسراوو دیارە نییە لەخوارەوەی پێ، بەڵكو (الكعبان) لای ئەوان دەكەوێتە خوارەوەی شوێنی بەستنی قەیتانی پێڵاو، ئەویش پاژنەیە وپشتی قاچەكانە، ئەمە مانای (الكعب)ە لای (رافضة) ئەویش ئەو (كعب)ە نییە لای ئەهلی سوننەو جەماعەیە.

هیچ بەڵگەیەك نییە لە خوێندنەوە بە (كسرة) لەئایەتەكەدا چونكە خوێندنەوە مەشهورەكە (نصب)ە واتە (فتحة)یە، (وَأَرْجُلَكُمْ) (عطف) كراوەتە سەر (فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ) خوێندنەوە بە(كسرة) لەبەر (المجاورة) یە واتە: (هاوسێتی) لەگەل ئەو ئایەتەدا كە دەفەرموێت: (وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ) بەبەڵگەی ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەردوو پێی دەشۆردو مەسحی نەدەكرد تەنها لەسەر هەردوو خوف نەبوایە.

﴿٤١﴾ نوسەر دەڵێت: (وتقصير الصلاة في السفر سنة).

واتە: کورتکردنەوەی نوێژ لەسەفەردا سوننەتە.

ڕاڤە/

لەو ڕوخسەتانەی شەرع هێناویەتی وەکو ئاسانکارییەك بۆ بەندەکانی و لادانی حەرەج لەسەریان: کورتکردنەوەی نوێژە لەسەفەردا، ئەویش بریتییە لەکورتکردنەوەی نوێژە چوار ڕکاتییەکانە، ئەمەش بەدەقی قورئانی پیرۆز، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الْأَرْضِ) واتە ئەگەر سەفەرتان کرد (فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلَاةِ إِنْ خِفْتُمْ أَنْ يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا (١٠١) النساء) ڕواڵەتی ئایەتەکە وادیارە کورتکردنەوە دروست نییە تەنها لەحاڵەتی ترسدا نەبێت، ئەم ناڕوونیە نەما، چونکە پرسیار کرا لەپێغەمبەری خوا (ﷺ): (ما بالنا نقصر وقد آمنا؟ قال: (تلك صدقة تصدق الله بها عليكم، فاقبلوا من الله صدقته)[114] هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە هەموو سەفەرەکانیدا نوێژی کورت دەکردەوە، نوێژی چوار ڕکاتییەکانی دەکردە دوو ڕکات، ئەمە سوننەتی پێغەمبەرە (ﷺ)، هەر کەسێك نوێژەکە (إتمام)بکات ئەوا (إتمام) یش دروستە بەڵام جیاوازی لەگەڵ چاکتردا کردووە.

جا کورتکردنەوەی نوێژ ڕوخسەتە هەر کەسێك ویستی لێ بێت ئەنجامی دەدات ئەویش چاکترە، هەرکەسێك ویستی لێ بێ وازی لێ دەهێنێ و (إتمام) دەکات ئەوا هیچ حەرەجێکی لەسەر نییە لەوەدا، چونکە (الاتمام) ئەصلە، نووسەری ئەم کتێبە باسی ئەوەی کردووە چونکە وەرگرتنی ڕوخسەتە شەرعییەکان لەمەسەلە عەقیدیەکانە، ئەمەش ڕەدە بۆ ئەو کەسە توندڕەوانە کەوا ڕوخسەتە شەرعییەکان وەرناگرن.

١١٤ / رواه مسلم .

**﴿٤٢﴾ نوسەر دەڵێت: (والصوم في السفر من شاء صام ومن شاء أفطر).**

واتە: ڕۆژوگرتن لەسەفەردا هەر کەسێك ویستی لێ بێ ڕۆژودەگرێتو هەرکەسێك ویستی لێ بێ دەیشکێنێ (ڕۆژوو ناگرێت).

ڕاڤە:

لەو ڕوخسەتانەی خوای گەورە ڕوخسەتی بەندەکانی خۆی داوە، ڕۆژونەگرتنە لە (ڕمضان)دا لەسەفەردا، ئەویش ڕوخسەتە، هەر کەسێ بیەوێ ڕۆژوناگرێت و هەرکەسێ ویستی لێ بێ دەیگرێت، ئەگەر ڕۆژووی گرت ئەوا ڕۆژووەکەی دروستە، چونکە یەکێك لەهاوەڵان پرسیاری لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد کەوا ئەو بەهێزەو توانای ڕۆژوو گرتنی هەیە لەسەفەردا؟ جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئیزنی پێدا بە ڕۆژوو گرتن لەسەفەردا[115]، ئەوە ڕوخسەتە، ڕوخسەتیش جێ بەجێ کردنی (واجب) نییە، بەڵکو جێ بەجێ کردنی چاکترە وەکو ئەو دوای ڕوخسەتەکانی تر، ئەگەر گەڕایەوە بۆ ئەصڵەکەو ڕۆژووەکەی گرت ئەوا ئاساییە خوای گەورە دەفەرموێت: (فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ وَمَنْ كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ) البقرة/١٨٥) واتە: هەرکەسێکتان مانگی ڕەمەزانی بەسەرهات دەبێ بەڕۆژو ببێ ئینجا ئەو کەسەشتان نەخۆش و لەش بەبارە، یا لەسەفەرەو ڕێبوارەو ڕۆژووەکەشی دەشکێنێ دەبێ لەڕۆژانی دیکەدا چەند ڕۆژێکی تر بەقەزا بیگرێتەوە).

هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەفەرەکانیدا ڕۆژووی نەدەگرت (بەڕۆژوو نەدەبوو)[116].

---

١١٥ رواه مسلم .

١١٦ / رواه البخاري ومسلم .

﴿٤٣﴾ نوسەر دەڵێت: (ولا بأس بالصلاة في السراويل).

واتە/ نوێژکردن بەدەرپێوە (شەرواڵەوە) ئاساییەو دروستە.

(السراويل) وشەیەکی تاکە، ئەوەش شتێکی ئاشکراو ناسراوە، ئەو شتەیە لەبەر دەکرێت لەسەر عەورەت، ئەوەش دەدورێت بە ئەندازەی خوارەوەی جەستە.

دەڵێت: نوێژ دروستە بەشەرواڵەوە ئەمە بەنیسبەت پیاوانەوە، چونکە عەورەتی پیاو نێوان ئەژنۆو ناوکییەتی، شەرواڵیش ئەوە دادەپۆشێ، جا ئەگەر نوێژی کرد بەشەرواڵێکەوە نێوان ناوك و ئەژنۆی داپۆشی ئەوا نوێژەکەی دروستە.

بەڵام ئافرەت هەمووی عەورەتە تەنها ڕوومەتی نەبێت ئەگەر پیاوانی نامەحرەمی لا نەبێت.

جا ئەگەر بەپشتەماڵەوە نوێژی کرد چاکترە لەشەرواڵ، یان ئەگەر بەقەمیصەوە نوێژی کرد ئەوا چاکترە لەشەرواڵ، چونکە ئەوە جوانترە، خوای گەورە دەفەرموێت: (يَا بَنِي آدَمَ خُذُوا زِينَتَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ) الاعراف/٣١) واتە: ئەی ڕۆڵەکانی ئادەم !هەرکە دەچنە مزگەوت جل و بەرگی جوان و پاك و خاوێن لەبەر بکەن).

واتە: لەکاتی هەموو نوێژێکدا، (الزينه) هەروەکو شيخ الاسلام دەفەرموێت:– لەوە گشتگیرترە تەنها عەورەت داپۆشێت[117].

١١٧ / ئەمە وڵامی هەندێ لە گرووپی شیعەیە کە وا دەبینن دروست نییە بەدەرپێوە(شەرواڵەوە) نوێژ بکرێت .

**﴿٤٤﴾ نوسـەر دەڵێـت: (والنفـاق أن يظهـر الإسـلام باللـسان ويخفـي الكفـر بالضمير).**

واتە/ (النفاق) بریتییە لەوەی بە زمان ئیسلام دەرخات و لەناخیدا کوفر بشارێتەوە.

ڕاڤە/

النفاق/ بریتییە لەدەرخستنی چاکەو شـاردنەوەی خراپـە، ئـەویش دەکرێـت بـەدوو بەشەوە:—

## جۆری یەکەم: نفاق أعتقادي (دووڕوویی لە بیروباوەڕدا).

ئەمەش کوفری گەورەیە، کەسی دووڕوو لەکافرێکی ئەصڵی خراپترە، چونکە کافری ئەصڵی دەزانرێ و دەناسرێ ئەو کافرەو ئـەو کەسـێکی دوژمنـە، بـەڵام کەسـی دووڕوو موسـڵمانان دەخەڵـەتێنێ، وا دەری دەخـات ئـەو لەوانـە کەچـی ئـەو دوژمنـی ئەوانـە، وادەری دەخات موسڵمانە کەچی ئـەو کـافرە، (يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّا أَنْفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ (٩)البقرة) واتە: ئەوانە بە نیازی خۆیان دەیانەوێ فێڵ و تەڵەکـە لـە گەڵ خوادا و ئەو کەسانەدا بکەن بڕوایان هێناوە بەڵام لە ڕاستیدا تەنها لە گەڵ خۆیـان فێـل و فـەرەج ئەکـەن و زیانەکەشـی هـەر بـۆ خۆیـان ئەگەڕێتـەوە و تـەنها خۆیـان دەخەڵەتێنن لە حاڵێکدا هەستیش بەو ڕاستیە ناکەن).

بۆیە خوای گەورە ئەوانی خستۆتە پلەی خوارەوەی ئاگر، لەژێرەوەی بت پەرسـتان و کـافران، چـونکە ئەوانـە لـەکافران خـراپترن، بۆیـە خـوای گـەورە دەربارەیـان دەفەرموێت: (هُمُ الْعَدُوُّ فَاحْذَرْهُمْ قَاتَلَهُمُ اللَّهُ أَنَّى يُؤْفَكُونَ (٤) المنافقون) واتە: هـەر ئـەوانن دوژمن، دەسا ئێوەش هۆشیارو ئاگاداریان بن و خۆتان بپـارێزن لێیـان،خوا بیـانکوژێ، لەناویان بەرێت، چۆن لەڕێی هەق لائەدرێن؟!).

جا (النفاق الاعتقادي) ئەو (نفاق)ەیە کە هەرگیز ئیمان لەگەڵیدا کۆ نابێتەوە.

## جۆری دووەم/ (النفاق العملي) (دووڕوویی کرداری).

دووڕوویی کرداری ئەو (نفاق)ەیە کەوا کەسەکە لەڕواڵەت و ناخەوەدا ئیماندارە، بەڵام چەند ئاکارێك لە ئاکارەکانی دووڕووانی لێ دەوەشێتەوە،دەبێتە هۆی ئەوەی ئیمانەکەی کەم دەکاتەوەو هەڕەشەیەکی توندی لەسەرە، بەڵام لەئیسلام دەری ناکات، پێی دەگوترێت دووڕوویی کرداری و پێی دەگوترێت دووڕوویی بچووك، نموونەی ئەوەی لەفەرموودەکەی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) هاتوە: (أربع من كن فيه كان منافقا خالصا، ومن كانت فيه خصلة منها كان فيه خصلة من النفاق حتى يدعها: إذا حدث كذب وإذا وعد أخلف وإذا اؤتمن خان، و إذا خاصم فجر)[118] واتە: چوار ئاکارو ڕەوشت هەن هەرکەسێ تێیدا بوو ئەوا دووڕوویەکی ڕوونە، ئەگەر هەرکەسێك ئاکارێکی تێدا بوو ئەوا ئاکارێکی لە دووڕوویی تێدایە تاکو وازی لێ دەهێنێ: ئەگەر قسەیەکی کرد درۆ دەکاتو ئەگەر بەڵێنێکی دا ئەوا بەسەری نابات و ئەگەر سپاردەیەکی پێ سپێردرا ئەوا خیانەتی لێ دەکات و ئەگەر دوژمنایەتی و نەیارێتی کەسێکی کرد ئەوا لە ڕاستی لا دەدا).

جا ئەم ئیماندارە ڕەنگە دووڕووییەکی کرداری لێ بوەشێتەوە ئەوە لەبەر کەمکردنەوەی ئیمانەکەیەتیو شایستەی ئەو هەڕەشەیەیە، بەڵام بەوە لەدین دەرناچێت.

ئەم دووڕووە بریتییە لەڕیا کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە هاوەڵانی لێی دەترساو ناوی لێ ناوە شیرکی بچووك، دەفەرموێت: (إن أخوف ما أخاف عليكم الشرك الأصغر، قالوا: و ما الشرك الأصغر، يا رسول الله؟ قال: الرياء، يقول الله عز وجل يوم القيامة إذا جزى الناس بأعمالهم: اذهبوا إلى الذين كنتم تراءون في الدنيا، فانظروا هل تجدون عندهم جزاء)[119]

---

١١٨ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٣٤ ) ومسلم (٥٨) .

١١٩ / صحيح : أخرجه أحمد (٥/٤٢٨) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع ) (١٥٥٥) .

واتە: ئەو شتەی لە هەموو شتێك زیاتر لێی دەترسم لێتان شیرکی بچووکە، وتیان: ئایە شیرکی بچووك چییە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ فەرمووی: ریایە، خوای گەورە لە رۆژی قیامەتدا کاتێ پاداشتی خەڵکی دەداتەوە بە کردەوەکانیان دەفەرموێت: برۆن بۆ لای ئەو کەسانەی ریاتان بۆیان دەکرد لە دونیادا، تەماشا بکەن بزانن هیچ پاداشتێکتان لایان دەست دەکەوێت).

دەفەرموێت: (ألا أخبركم بما هو أخوف عليكم عندي من المسيح الدجال؟ قالوا: بلى، قال: الشرك الخفي، يقوم الرجل فيصلي فيزين صلاته لما يرى من نظر رجل إليه)[١٢٠] واتە: ئایە هەواڵتان پێ بدەم بەوەی لێی دەترسم تووشتان ببێت زیاتر لە مەسیحی دەججال؟ وتیان: بەڵێ، فەرمووی: شیرکی شاراوە، کەسێك هەڵدەستێ نوێژ دەکاتو نوێژەکەی دەرازێنێتەوە لەبەر ئەوەی کەسیکیتر تەماشای دەکات.

ئەگەر لای خەڵکی نوێژ بکات ئەوا نوێژەکەی دەرازێنێتەوە، ئەگەر لەماڵەکەیدا نوێژ بکات یان لەجێگایەکی شاراوەدا ئەوا دەنووك دەدا لەزەوییەکە لەنوێژەکەیدا، ئەمە ئەو جۆرەیە هاوەڵان لێی دەترسان تووشی ببن بە توندترین شێوە، جا هیچ کەسێك نییە لێی نەترسێ و لەوە نەترسێت تووشی ببێت، بۆیە دەڵێن: (لا يخافه إلا مؤمن ولا يأمنه إلا منافق) واتە: لێی ناترسێت تەنها ئیماندار نەبێتو لێی تەئمین نییە تەنها کەسی دووڕوو نەبێت) جا کەسی موسڵمان لەخۆی دەترسێ تووشی ئەو (نیفاق)ە بێت کە ئەویش دووڕوویی بچووکە.

مەبەست لە: (والنفاق أن يظهر الإسلام باللسان ويخفي الكفر بالضمير).

ئەمە پێناسەی (نفاق الاعتقادی)یە ئەویش (نفاق)ی گەورەیە، ئەمەش ئیمان لەگەڵیدا کۆ نابێتەوەو لەکەسی ئیماندارەوە هەرگیز ناوەشێتەوە، خوای گەورە

---

١٢٠ / حسن : أخرجه ابن ماجه (٤٢٠٤) وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٢٦٠٧) .

لەسەرەتای سورەتی (البقرة)دا خەڵکی کردووەتە سێ بەشەوە ئیمانداران بەڕواڵەت و پەنهاندا و کافران بەڕواڵەت و پەنهاندا، و دووڕووەکان کەئیسلام دەردەخەن لە ڕواڵەتداو کوفر دەشارنەوە، ئەوەتا خوای گەورە لە قورئاندا فەرموویەتی: (الم (١) ذَلِكَ الْكِتَابُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِلْمُتَّقِينَ (٢) الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ (٣) وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ وَبِالْآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ (٤) أُولَئِكَ عَلَى هُدًى مِنْ رَبِّهِمْ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (٥) البقرة) واتە: الم (١) ئەم کتێبە (قورئان) بۆ کەسێك تێ بفکرێ هیچ گومانێکی تێدا نییە لە لایەن خواوە هاتووە، نوورو ڕێنمایە بۆ موسڵمانە پارێزگارەکان (٢) ئەوانەی بڕوایان بە گشت نهێنی و نادیارەکان هەیە، وەکو بەهەشت و دۆزەخ و فریشتەو زیندووبوونەوە، بە ڕاستی بە شێوەیەکی تێروتەسەل و گشت کات لە کاتی خۆیدا نوێژەکانیان دەکەن‌و لەوەش کردوومانە بە رزق و ڕۆزییان لە ڕێگای خێردا دەبەخشن و زەکاتی لێ دەدەن (٣) ئەوانەی بڕوایان بەو قورئان‌و کتێبە هەیە بۆ تۆ دابەزێنراوەو بەو کتێب‌و نامە ئاسمانیانەش پێش تۆ بۆ پێغەمبەران دابەزێنراون واتە تەورات و ئینجیل وسحوفەکان، بڕوای بەهێزو یەقینیشیان بە ڕۆژی دوای هەیە (٤) ئەوانە خاوەنی ئەو پێنج سیفاتەن لەسەر ئەو ڕێگەو ڕێبازەن لە لایەن پەروەردگاری خۆیانەوە ڕێنمایکراون بۆی هەر ئەوانش رزگارو سەرفرازن (٥)).

ئەمە باسی ئیماندارانە لەڕواڵەت و پەنهانیدا، بەڵام بێ باوەڕان بەڕواڵەت و پەنهانی دەربارەیان دەفەرموێت: (إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَأَنْذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنْذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ (٦) خَتَمَ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ وَعَلَى سَمْعِهِمْ وَعَلَى أَبْصَارِهِمْ غِشَاوَةٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ (٧) البقرة) واتە: ئەوانەش خوا نەناس و بێ باوەڕن وەك یەك وایە ئایا بیانترسێنی یان نەیانترسێنی، هەر باوەڕ ناهێنن (٦) چونکە خوا مۆری بەدبەختی بەسەر دڵ و گوێیاندا ناوەو بەسەر

**چاویشیانەوە پەردەیەك هەیە هەر بۆیە سزایەكی زۆر مەزنو گەورەشیان بۆ هەیە (٧).**

**ئەمجار دەربارەی كۆمەڵی سێیەم دەفەرموێت:** (وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَا هُمْ بِمُؤْمِنِينَ (٨) يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّا أَنْفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ (٩) فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ فَزَادَهُمُ اللَّهُ مَرَضًا وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ (١٠) وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ قَالُوا إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ (١١) أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْمُفْسِدُونَ وَلَكِنْ لَا يَشْعُرُونَ (١٢) وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ آمِنُوا كَمَا آمَنَ النَّاسُ قَالُوا أَنُؤْمِنُ كَمَا آمَنَ السُّفَهَاءُ أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ السُّفَهَاءُ وَلَكِنْ لَا يَعْلَمُونَ (١٣) وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ آمَنُوا قَالُوا آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْا إِلَى شَيَاطِينِهِمْ قَالُوا إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِئُونَ (١٤) اللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ (١٥) أُولَئِكَ الَّذِينَ اشْتَرَوُا الضَّلَالَةَ بِالْهُدَى فَمَا رَبِحَتْ تِجَارَتُهُمْ وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ (١٦)مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ الَّذِي اسْتَوْقَدَ نَارًا فَلَمَّا أَضَاءَتْ مَا حَوْلَهُ ذَهَبَ اللَّهُ بِنُورِهِمْ وَتَرَكَهُمْ فِي ظُلُمَاتٍ لَا يُبْصِرُونَ (١٧) صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لَا يَرْجِعُونَ (١٨) البقرة) **واتە: لەو خەڵكانەدا كەسانێك هەن دەڵێن: باوەڕمان بە خواو بە رۆژی دوایی هەیە كەچی درۆ دەكەنو لە راستیدا بڕوایان نییە بەڵكو دەیانەوێ ئێوە فریو بدەنو وردە وردە لێتان نزیك ببنەوەو لە دژتان پیلان بگێڕن و بشێوی بخەنە ناوتانەوەو ریزەكانتان تێك بدەن بۆیە دەفەرموێ:(٨) ئەوانە بە نیازی خۆیان دەیانەوێ فێڵو تەڵەكە لە گەڵ خواداو ئەو كەسانەدا بكەن بڕوایان هێناوە بەڵام لە راستیدا تەنها لە گەڵ خۆیان فێڵو فەرەج ئەكەن و زیانەكەشی هەر بۆ خۆیان ئەگەڕێتەوەو تەنها خۆیان دەخەڵەتێنن لە حاڵێكدا هەستیش بەو راستیە ناكەن! دیارە هۆی بێ هەستیشیان هەر ئەمەیە كە: (٩) دڵیان دەردو نەخۆشی و حەسوودی و گومان و ناپاكی تیادایە جا خوایش رۆژ لە دوای رۆژ دەردو نەخۆشیەكانی زیاد كردن جگە لەوەیش سزایەكی سەخت و ئێش پێكەیەنەریان بۆ هەیە لە بەر ئەوە درۆیان كرد بە تایبەت ئەو دەمەی دەیانگوت بڕوامان بە خواو بە رۆژی دوایی هەیە (١٠) كاتێ**

پێیان بگوترێ: گێرە شێوێنی و ئاشووب و خراپەکاری لەم وڵات و زەوییەدا مەکەن دەڵێن: ئێمە هەر چاکسازو رێکخەری کاری چاك و باش بووینە (١١) وشیار بن! بەڕاستی هەر ئەوانن موفسیدو خراپەکارو گێرە شێوێن بەڵام هەست ناکەن (١٢) کاتێ پێیان بگوترێ: دەسا ئێوەیش وەکو ئەو مەردمە ئیمانداره ئیمان و باوەڕێکی ڕاستەقینە بێنن دەڵێن: جا ئایا ئێمەیش وەکو ئەو خەڵکە گێل و نەفامانە بڕوا بێنین؟! خەڵکینە چاك بزانن! ئەوانن گێل و نەفامی ڕاستەقینە بەڵام بەخۆیان نازانن (١٣) کاتێ توشی ئەوانە دەبن باوەڕیان هێناوە دەڵێن: ئێمەیش وەك ئێوە باوەڕمان هێناوەو کاتێکیش دەگەنە لای فەرماندە شەیاتینەکانیان دەڵێن: ئێمە لەگەڵ ئێوەداین ئێمە هەر گاڵتەیان پێ دەکەین (١٤) بەڕاستی خوای باڵادەست گاڵتە بەوان دەکاتو مۆڵەتیان دەدات تاپتر خۆیان بەدبەخت بکەن و لە سەرکێشی و لاڕێیی خۆیاندا سەرگەردان بن (١٥) ئەو ناپاکانە هیدایەت و ڕێنوێنیان بە ڕێبازی چەوت و گومڕایی فرۆشت جا ئەو سەوداو بازرگانییەیان سوود بەخش نەبوو قازانجیان لێ نەکردو ڕێگەی بەختیاری و هیدایەتیان دەست نەکەوت (١٦) نموونەی ئەو دوو ڕووە ناپاکانە وەك مەسەلەی کەسێکە بۆ خۆی خەریکی هەڵگیرساندنی ئاگرێك بێت، تارێی پێ دەربکات هەرکە ئاگرەکە هەڵگیرساو دەورووبەری ڕووناککردەوە خوا ڕووناکیەکەی بردن و کوژاندییەوە لەناو تاریکستاندا وێڵی کردن و هێشتنیەوە دیارە ئیتر بەهیچ کلۆجێ نابینن (١٧) کەڕو لاڵ و کوێرن ئیتر پەشیمانیش نابنەوەو ناشتوانن بگەڕێنەوە (١٨).

ئەمە هەمووی دەربارەی دووڕووەکانە، ئەویش چەند ئایەتێکە.

مەبەست لە: (ويخفي الكفر بالضمير) (الضمير) مانای ئەو شتەیە لە دڵدا دەیشارێتەوە.

﴿٤٥﴾ نوسەر دەڵێت: (واعلم بأن الدنيا دار إيمان وإسلام).

واتە: بزانە ئەم دونیایە ماڵی ئیمان و ئیسلامە.

﴿٤٦﴾ (وأمة محمد (ﷺ) فيها مؤمنون مسلمون في أحكامهم ومواريثهم وذبائحهم والصلاة عليهم).

واتە: ئوممەتی محمد (ﷺ) تێیدا ئیماندارو موسڵمانن لە حوکمەکانیان و میراتەکان و سەربڕینەکان و نوێژکردن لەسەریان.

﴿٤٧﴾ (ولا نشهد لأحد بحقيقة الإيمان حتى يأتي بجميع شرائع الإسلام فإن قصر في شيء من ذلك كان ناقص الإيمان حتى يتوب واعلم أن إيمانه إلى الله تعالى: تام الإيمان أو ناقص الإيمان إلا ما أظهر لك من تضييع شرائع الإسلام).

واتە: شایەتی حەقیقەتی ئیمان بۆ هیچ کەسێك نادەین تاکو هەموو شەریعەتەکانی ئیسلام جێ بەجێ نەکات، ئەگەر لە هەر شتێکدا کورتڕەوی کرد ئەوا ئیمانی کەم دەکاتەوە تاکو تەوبە دەکات، بزانە ئیمانەکەی بۆ خوای گەورە: ئیمانێکی تەواوە یان ئیمانێکی نوقصانە، ئیللا ئەوە نەبێ شتێکی لێ بوەشێتەوە ئیسلامەکەی لەدەست بدات (ئیسلامەکەی پووچەڵ بکاتەوە).

راڤە/

مەبەست لە: (واعلم بأن الدنيا دار إيمان وإسلام).

واتە ئیسلام و ئیمان لەدونیادا کە ماڵ و خانەی کارکردنە، بەڵام لەدوارۆژدا ئەوە خانەی سزاو پاداشتە، جا ئیسلام و ئیمان لەدونیادا دەبێت، بەڵام ئەگەر کەسێك

لەسەر جگە لەئیسلام و ئیمان مرد ئەوا کافرەو هیچ سوودی نییە ئەگەر لەرۆژی قیامەتدا ئەوەی کوفری پێ کردووە بینی ئیمانی پێ بهێنێ یان خۆزگەی گەڕانەوە بخوازێت و داوا لەخواکەی بکات بگەڕێتەوە بۆ دونیا بۆ ئەوەی ئیمانی پێ بهێنێ، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَلَوْ تَرَى إِذْ وُقِفُوا عَلَى النَّارِ فَقَالُوا يَا لَيْتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِآيَاتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ (٢٧) الانعام) واتە: ئەگەر ئەو کاتە هاوبەشدانەرەکان ببینی لەبەرامبەر ئاگردا ڕاگیراو و بەندکراون، ئینجا لەو ڕۆژەدا ئەڵێن: ئای خۆزگە جارێ تر دەگێڕراینەوە بۆ دونیا و بەبەڵگەو نیشانەکانی پەروەردگارمان کافرو بێ باوەڕ نەدەبووین و لەبڕوادار دەبووین).

ئیسلامو ئیمان جیاوازی لەنێوانیاندا هەیە، چونکە دین لەسێ پلە پێك هاتوە:-

یەکەم: ئیسلام.

دووەم: ئیمان.

سێ یەم: ئیحسان.

هەروەکو لە فەرموودەکەی (جبریل)دا هاتوەو فراوانترینیان ئیسلامە، چونکە ئیسلام بریتییە لە تەسلیم بوون و ملکەچبوون لەڕواڵەتداو ڕەنگە لەناخ و پەنهاندا ئیماندار بێت و ڕەنگە دووڕوو بێتو لەڕواڵەتدا تەسلیم بوو بێت، لەناخدا کافر بێت.

بەڵام (منافق) ئیمانی نادرێتە پاڵ، بەڵکو کەسی تەواو ئیمان و کەم ئیمان دەگرێتەوە، جا ئەگەر باسی ئیسلام و ئیمان پێکەوە کرا ئەوا مەبەست لە ئیسلام: حوکمە دیارەکانەو مەبەست لە ئیمان حوکمە پەنهانەکانە هەروەکو لە فەرموودەکەی (جبریل) دا هاتوە: (الإسلام أن تشهد أن لا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله، وتقيم الصلاة، وتؤتي الزكاة، وتصوم رمضان، وتحج البيت) واتە: ئیسلام ئەوەیە شایەتی بدەیت کەوا جگە لە (الله) هیچ خوایەکی تر نییە شایەنی پەرستن بێتو (محمد)یش (ﷺ) نێردراوی

خوایەو نوێژەکانت بە ڕێك و پێکی ئەنجام بدەیتو زەکاتی ماڵەکەت بدەیت و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگریت و حەجی ماڵی خوا بکەیت).

ئەمە کارە ئاشکراکانە، فەرمووی: (أخبرني عن الإيمان؟، قال: أن تؤمن بالله، وملائكته، وكتبه، ورسله، واليوم الآخر، وأن تؤمن بالقدر خيره وشره)[١٢١] واتە: فەرمووی: ئەی پێغەمبەر پێم بڵێ ئیمان چییە؟ ئەویش فەرمووی: ئەوەیە باوەڕی تەواو بهێنیت بە خوای گەورەو فریشتەکانی و کتێبە ئاسمانییەکان و هەموو پێغەمبەران و ڕۆژی دوایی و باوەڕیش بە قەزاو قەدەر بهێنیت چ چاك بێت یان خراپ) ئەمە کارە پەناهانەکانە.

جا پێویستە ئیسلام و ئیمان هەردوو کۆ ببێتەوە لە کەسێکدا.

بەڵام ئەگەر باسی یەکێکیان کرا ئەوا ئەویتر دەگرێتەوە، ئەگەر باسی ئیمان کرا بە تەنها ئەوا ئیسلامیش دەگرێتەوەو ئەگەر باسی ئیسلام کرا بە تەنها ئەوا ئیمانیش دەگرێتەوە، بۆیە دەڵێن: (الاسلام والايمان إذا أجتمعا افترقا وإذا افترقا اجتمعا) واتە: ئیسلامو ئیمان ئەگەر بە یەکەوە بوون ئەوا مانایان جودایەو ئەگەر جودا بوون ئەوا مانایان یەکە) هەروەکو (الفقير والمسكين) ئەگەر بە یەکەوە باسکران ئەوا مانای (الفقير) شتێکەو مانای (المسكين) شتێکەو ئەگەر باسی یەکێکیان بە تەنها کرا ئەوا ئەویتر دەگرێتەوە[١٢٢].

مەبەست لە: (وأمة محمد (ﷺ) فيها مؤمنون مسلمون في أحكامهم ومواريثهم وذبائحهم والصلاة عليهم).

ئوممەتی محمد (ﷺ) موسڵمانی ئیماندارن، چونکە هەرکەسێ ئیماندار بێت ئەوە موسڵمانەو هەرکەسێ موسڵمان بێت ئەوا ڕەنگە ئیماندار بێت و ڕەنگە دووڕوو بێت،

---

١٢١ / صحيح : سبق تخريجه .

١٢٢ / تەماشای (مجموع الفتاوی) (٧/٥٥١) بکە .

بەڵام ئیسلامە راستو دروستەکە پێویستە ئیمانی لە گەڵدا بێت هەرچەندە کەمیش بێت، (قَالَتِ الْأَعْرَابُ آمَنَّا قُلْ لَمْ تُؤْمِنُوا وَلَكِنْ قُولُوا أَسْلَمْنَا (١٤) الحجرات) واتە: عەرەبە دەشتەکییەکان وتیان: بڕوامان هێناوە بڵێ: نەخێر باوەڕتان نەهێناوە بەڵام بڵێن: موسڵمان و ملکەچ بووین).

مەبەست لە: (في أحكامهم ومواريثهم).

موسڵمان هەرچەندە بە رواڵەت بێت حوکمی موسڵمانانی هەیە، دۆستایەتی دەکرێت، ئەگەر بمرێت ئەوا دەیشۆرنو کفنی دەکەن و نوێژی لەسەر دەکەنو لە گۆرستانی موسڵماناندا دەینێژن، کاتێ لە ژیاندا بێت خۆشیان دەوێتو دۆستایەتی دەکەنو بەزەییان بە یەکتردا دێتەوەو برایەتی یەکتر دەکەن. ئەمە ئوممەتی (محمد)ە(ﷺ)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (مثل المؤمنين في توادهم و تراحمهم و تعاطفهم مثل الجسد إذا اشتكى منه عضو تداعى له سائر الجسد بالسهر و الحمى)[١٢٣] واتە: نمونەی ئیمانداران لە خۆشەویستیو بەزەییو سۆزدارییاندا بۆ یەکتر وەکو جەستەیەك وان ئەگەر بەشێکی (ئەندامێکی) ئازاری چەشت ئەوا هەموو جەستەی – لەبەر ئەو بەشەی– شەونخۆنی دەکەنو تووشی تا دەبن).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمویت: (المؤمن للمؤمن كالبنيان يشد بعضه بعضا، و شبك بين أصابعه)[١٢٤] واتە: ئیماندار بۆ ئیماندار وەکو جەستەیەکە یەکتر بۆ لای یەکتر رادەکێشن (یەکتر بەهێز دەکەن)، ئەمجار پێغەمبەری خوا (ﷺ) پەنجەکانی هەڵکێشا بە یەکتردا).

جا ئەوان برای یەکترن (إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ) حجرات /١٠) واتە: بە راستی هەر بڕواداران برای یەکن).

برایەتی لەئیماندا نەك لەپشتو نەسەبدا.

---

١٢٣ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٥٦٦٥ ) ومسلم (٢٥٨٦) .

١٢٤ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٤٦٧ ) ومسلم (٢٥٨٥) .

مەبەست لە: (وذبائحهم).

ئەوەی موسڵمان سەری دەبڕێ حەڵاڵە، هەرچەندە ئەگەر کەسێکی (فاسق) بێت، لەبەر ئەوەی ئەو لە ئیسلام دەرنەچوە ئەوا سەربڕینی دەستی ئەو حەڵاڵە، کەسی (منافق) ئەگەر شتێکی سەربڕی ئەوا ئێمە دەیخۆین بەحوکمی ئەوەی ئەو موسڵمانە، تا بۆمان ڕوون نەبێتەوە ئەو (منافق)ە، خوای گەورە دەفەرموێت: (إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ المائدة/٣) واتە: مەگەر بەر لەگیان دەرچوونی فریای چەقۆ کەوتبێ و سەرتان بڕیبێ).

ئەمە دواندنە بۆ هەموو موسڵمانان، هەروەها سەر بڕینی دەستی ئەهلی کیتابیش بۆ ئێمە حەڵاڵە، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حِلٌّ لَكُمْ) المائدة/٥) واتە: سەربڕاوی دەستی ئەوانەی نامەیان پێ دراوە ڕەوایە بۆتان و دەتوانن بیخۆن).

واتە: سەربڕینەکانیان، چونکە ئەوان بەڕێگای شەرعی سەری دەبڕن، بەپێی ئەوەی لەکتێبەکەیاندا هەیە.

بەڵام سەربڕینی بت پەرستان و بێ باوەڕان و دەهرییەکان و هەڵگەڕاوەکان ئەوا ئێمە نایخۆین، چونکە سەربڕینی کافرە ئەوەش پیسە، چونکە سەربڕینی کەسی کافر مردارەوە بوەو پیسە بەکوفر، چونکە کاریگەری دەبێ بەو کەسەی سەری بڕیوە بۆیە پیس دەبێ چونکە کەسەکە سەری بڕیوە پیسەو کاریگەری لەسەر دەبێت، خوای گەورە سەربڕاوەکانی ئەهلی کیتابی بۆ حەڵاڵ کردووین بەتایبەتی بەڵگەی ئەوەیە سەربڕاوی جگە لەوان حەرامە.

مەبەست لە: (والصلاة عليهم).

نوێژ لەسەر هەموو موسڵمانێك دەکرێت، هەرچەندە ئەگەر کەسێکی (فاسق)و سەرپێچی کار بێت یان (منافق)بێتو نفاقەکەی ئاشکرا نەکردوە، چونکە ئەو لەئیسلام دەرنەچوە، ئەوا نوێژی لە سەر دەکرێت، دوعای بۆ دەکرێت و داوای لێخۆشبوونی

لەخوا بۆ دەکرێت و میراتی کەسە نزیکە موسڵمانەکەی وەردەگرێت، کەسە موسڵمانە نزیکەکەی میراتی ئەو وەردەگرێت.

مەبەست لە: (ولا نشهد لأحد بحقيقة الإيمان حتى يأتي بجميع شرائع الإسلام).

واتە: تەزکییەی هیچ کەسێك ناکەین بەوەی بڵێین: فلان کەس ئیماندارە، چونکە شایەتی دان بەوەی ئەو کەسێکی ئیماندارە ڕەنگە شایەتی دانێك بێت شایستەی نەبێت، بۆیە کاتێك کابرایەك بە پێغەمبەری خوای (ﷺ) فەرموو: بەشی فلان بدە چونکە ئەو ئیماندارە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:- یان موسڵمانە، دیسان فەرمووی: بەشی فلان بدە چونکە ئەو ئیماندارە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:- یان موسڵمانە[١٢٥]، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەمە دەیەوێ هیچ کەسێك نابێت تەزکییە بکرێت، بەڵکو ناوە گشتییەکەی دەدرێتێ و دەڵێت: (ئەو موسڵمانە) ڕەنگە موسڵمانێکی بە توانا بێت لە ئیسلامداو ڕەنگە موسڵمانێك بێت (فسق)ی هەبێت، سەرپێچیو کەموکورتی هەبێت، ڕەنگە کەسێکی (منافق)بێت، بۆیە شایەتی (کەمال)ی بۆ نادەین.

مەبەست لە: (فإن قصر في شيء من ذلك كان ناقص الإيمان حتى يتوب).

عەقیدەی ئەهلی سوننەو جەماعە ئەوەیە سەرپێچییەکان هەرچەندە گەورەکان بێت چونکە لەشیرك بچووکترەو شیرك نییە ئەوا کەسی موسڵمان لەئیسلام دەرناکات، یان لەبازنەی ئیمان دەری ناکات، بەڵکو دەبێتە ئیماندار بەئیمانەکەی و دەبێتە (فاسق) بەتاوانە گەورەکەی، یان دەڵێت: ئەو کەسێکی ئیمانداری کەم ئیمانە.

مەبەست لە: (واعلم أن إيمانه إلى الله تعالى: تام الإيمان أو ناقص الإيمان).

واتە ڕواڵەتەکەی وەردەگرین و نهێنییەکانی دەگێڕینەوە بۆ لای خوا.

---

١٢٥ / رواه البخاري (٢٧) ومسلم (١٥٠) .

مەبەست لە: (الا ما أظهر لك من تضييع شرائع الإسلام).

واتە: ئیللا مەگەر هەڵوەشێنەرێك لە هەڵوەشێنەرەوەكانی ئیسلامی ئەنجامدابێت، لەوانە وازهێنان لە شەرائیعی ئیسلام ئەوا تۆ حوكمی هەڵگەڕانەوەی بەسەردا دەدەیت، هەروەكو چۆن بە ئەنقەست واز لەنوێژ بهێنێ، یان ئەگەر قسەیەكی كوفری كرد وەكو جوێندان بەخوا یان جوێندان بەپێغەمبەری خوا (ﷺ)، یان جوێندان بەدینی ئیسلام، ئەوا تۆ حوكمی هەڵگەڕانەوەی بەسەردا دەدەی بەهۆی ئەوەی لێی دەركەوت، جا هەركەسێك هەڵوەشێنەرێك لە هەڵوەشێنەرەوەكانی ئیسلامی ئاشكرا كرد لەگەڵ نەبوونی عوزرو نەبوونی هیچ مانعێك، یان تەئویلی كردبێ، یان تەقلید دەكات، ئایە نەفامە، ئایە تووڕەیە، ئەوا ئەو كاتە حوكمی هەڵگەڕانەوەی بەسەردا نادەین لەكاتی بوونی ئەو ڕێگرانە).

**﴿٤٨﴾ نوسەر دەڵێت: (والصلاة على من مات من أهل القبلة سنة: والمرجوم والزاني والزانية والذي يقتل نفسه وغيره من أهل القبلة والسكران وغيرهم، الصلاة عليهم سنة).**

واتە: نوێژکردن لەسەر ئەو کەسەی بمرێت لەئەهلی قیبلە سوننەتە، کەسی ڕەجمکراو و ئەو کەسەی زینای کردوە چ پیاو بێت یان ئافرەتو ئەو کەسەی خۆی دەکوژێتو جگە لەوانە لە ئەهلی قیبلەو سەرخۆش و جگە لەوان ئەوا نوێژکردن لەسەریان سوننەتە.

ڕاڤە:

ئەمە وەکو ئەوەی پێشوە، کەوا هەر کەسێ ئیمانو ئیسلامی دەرخست ئەوا نوێژی لەسەر دەکەینو دەبێتە ئەهلی قیبلە، ئەوانەن نوێژ دەکەن بەرەو کەعبە –قیبلەی موسڵمانان– ئەوانە بەگوێرەی ڕواڵەتیان مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەین، حوکم دەدەین بەسەریاندا بەوەی ئەوان موسڵمانن، مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەین وەکو مامەڵەی موسڵمانان، بە زیندوویی و بەمردوویی.

مەبەست لە: (والمرجوم والزاني والزانية والذي يقتل نفسه وغيره من أهل القبلة).

ئەو ئیماندارە (فاسق)ـە بەهۆی تاوانە گەورەکەیەوە لەئیسلام دەرنەچوە ئەوا وەکو موسڵمانان مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەین، دوعای بۆ دەکرێت، وەکو ئەو کەسەی خۆی دەکوژێتو ئەو کەسەی بەهۆی زیناوە ڕەجم کراوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی لەسەر ڕەجمکراوەکان کردوە، نوێژی لەسەر (ماعز) کرد[١٢٦] و نوێژی لەسەر ئەو ئافرەتە (غامدی)یە کرد[١٢٧]، ڕەنگە هەندێ جار بۆ هەندێ خەڵکی نوێژ ناکرێت وەکو

١٢٦ / رواه البخاری (٦٤٣٤) .

١٢٧ / رواه مسلم (١٦٩٥) .

ئەو کەسەی خۆی دەکوژێت یان ئەو کەسەی دزی لە غەنیمە دەکات، لەبەر ئەوەی خەڵکی تەمێ بکرێن و نەك لەبەر ئەوەی کافرە، بۆیە ڕێگەی بەهاوەڵان دا نوێژ لەسەری بکەن و ڕێگەی لێ نەگرتن نوێژی لەسەر بکەن چونکە موسڵمانن.

مەبەست لە: (والسكران وغيرهم، الصلاة عليهم سنة).

ئەو سەرخۆشەی مەی دەخواتەوە کەسێکی (فاسق)ـە و حەددی لەسەر جێ بەجێ دەکرێت، بەڵام لە ئیسلام دەرناچێت، جا ئەگەر مرد نوێژی لەسەر دەکرێت هەرچەندە مەی بخواتەوە، چونکە ئەو ئەهلی قیبلەیە.

مەبەست لە: (سنة) واتە لەسوننەتی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) شوێنکەوتنی (واجب)ـە.

**﴿٤٩﴾ نوسەر دەڵێت: (ولا يَخرج أحد من أهل القبلة من الإسلام حتى يرد آية من كتاب الله عز و جل أو يرد شيئا من آثار رسول الله (ﷺ)، أو يصلي لغير الله، أو يذبح لغير الله، وإذا فعل شيئا من ذلك فقد وجب عليك أن تخرجه من الإسلام، فإذا لم يفعل شيئا من ذلك فهو مؤمن ومسلم بالإسم لا بالحقيقة).**

واتە: هیچ کەسێك لەئەهلی قیبلە لەئیسلام دەرناکرێت تاکو ئایەتێك لەقورئان ڕەدنەکاتەوە یان فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕەدنەکاتەوە یان نوێژ بۆ جگە لەخوا بکات یان سەرببڕێت بۆ جگە لەخوا، جا ئەگەر هەر کاتێك لەوانەی کرد ئەوا پێویستە لەسەرت لە ئیسلام دەری بکەیت، جا ئەگەر هیچ لەوانەی ئەنجام نەدا ئەوا ئیماندارو موسڵمانە بەناو نەك بەحەقیقەت).

**ڕاڤە/**

هیچ کەسێك لەئەهلی قیبلە لەئیسلام دەرناچێت ئیللا بەئەنجامدانی هەڵوەشێنەرێك لەهەڵوەشێنەرەکانی ئاشکرای ئیسلام وعوزری نەبێت.

**مەبەست لە:** (حتى يرد آية من كتاب الله عز و جل).

ئەگەر کەسێك نکوڵی لەقورئان کرد یان لەبەشێکی یان لەسوننەتی (صحيح) یان لەبەشێکی، یان ئینکاری لە شتێکی قورئان کرد، یان ئینکاری شتێکی لەسوننەتی صحیح کرد، ئەوا حوکمی هەڵگەڕانەوەی بەسەردا دەدرێت، چونکە ئەوە خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بەدرۆ خستۆتەوە، ئەگەر نەزان نەبێت یان چاولێکەر یان تەئویلی نەکردبێت ئەوا بۆی ڕوون دەکرێتەوە جا ئەگەر بۆی ڕوون کرایەوەو کەچی ئەو سوور بوو لەسەری ئەوا حوکمی هەڵگەڕاوەی بەسەردا دەدرێت.

مەبەست لە: شوێنەوارەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموودەکانییەتی.

مەبەست لە: (أو يرد شيئا من آثار رسول الله (ﷺ)).

واتە: ئەوا کوفری کردوە، ئەمەش یاسایەکی مەزنە لای ئەهلی سوننەو جەماعە، لەگەڵ دوو کۆمەڵدا لەم مسەلەدا جیاوازن:-

کۆمەڵەی یەکەم: (الخوارج) و(الغلاة) زیادەڕەوەکان ئەوانەی خەڵکی بەتاوانی گەورە کافر دەکەن کە جگە لەشیرکە.

کۆمەڵەی دووەم: کۆمەڵی (المرجئة) کە دەڵێن:- لەگەڵ ئیماندا سەرپێچی هیچ زیانێکی پێ ناگەیەنێت، چونکە کەسەکە بەدڵی ئیماندارە، ئەوا هیچ سەرپێچییەك زیانی پێ ناگەیەنێ، ئەگەر وازی لەهەموو کردەوەکانی هێناو هیچ کارێکی نەکرد، ئەوا کەسێکە ئیماندارەو ئیمانی تەواوە (کاملە).

بەڵام ئەهلی سوننەو جەماعە هەروەکو نوسەر باسی کردوە:- ئەوان ناوەندن لەنێوان ئەو دوو کۆمەڵەداو دەڵێن:- تاوانە گەورەکان جیاوازن، ئەگەر شیرکی گەورەو کوفری گەورە بوو ئەوا خاوەنەکەی لە ئیسلام دەردەکات بەکۆڕای زانایان (الاجماع)، بەڵام ئەگەر کوفر یان شیرك نەبوو، بەدرۆخستنەوەی قورئان یان بەدرۆخستنەوەی سوننەتی پیغەمبەری خوا (ﷺ) نەبوو، وازهێنان لەنوێژکردن نەبوو، داواکردن لەجگە لەخوا نەبوو، یان سەربڕین بۆ جگە لەخوا نەبوو، ئەوە تاوانێکی گەورەیەو بەندە لەئیسلام دەرناکات بەجیاواز لەگەڵ خەواریج و موعتەزیلە، بەڵام زیان لە ئیماندار دەدات و ئیمانەکەی کەم دەکاتەوەو لاوازی دەکات بە جیاواز لەگەڵ (مورجیئە)دا کە دەڵێن:- لەگەڵ ئیماندا سەرپێچی زیان ناگەیەنێ، ئەمە مەزهەبی ناوەندەو کۆکەرەوەی هەردوو دەقە موژدەدەرو هەڕەشەکانە.

خــەواریج و موعتەزیلــە دەقــە هەڕەشــەکانیان وەرگرتــوەو وازیــان لــە دەقــە موژدەدەرەکان هێناوە.

مورجیئـە بـە پێـچەوانەوە: دەقـە موژدەدەرەکانیـان وەرگرتـوە و وازیـان لەدەقـە هەڕەشەکان هێناوە.

هەردوو کۆمەڵەکە گومڕان.

مەبەست لە: (أو يصلي لغير الله أو يذبح لغير الله).

نوێژ دەکات بۆ گۆڕێك بۆ ئەوەی لێی نزیك ببێتەوە یان سوژدە بۆ بتێك دەبات، یان بـۆ جگـە لـە خـوا سـەردەبڕێ و کارێـك لەپەرسـتنەکان بـۆ جگـە لـەخوا دەکـات، ئـەوا کەسێکی موشریکەو کافرەو لەدین دەرچووە، جگە لەوانە و لەوانـە کـەمتر ئـەوا ئـەهلی سوننە ناوەندن تێیدا لەنێوان مورجیئەو خەواریجدا.

مەبەست لە: (وإذا فعل شيئا من ذلك فقد وجب عليك أن تخرجه من الإسلام).

ئەگەر کارێك لەوانەی ئەنجامدا، واتە نوێژی بۆ جگە لەخوا کرد یان بـۆ جگـە لـەخوا سەربڕینی ئەنجامدا، یان هەر پەرستنێکی بۆ جگە لەخوا ئەنجامدا، ئەوا (واجب) دەبـێ لەسەرت لەئیسلام دەری بکەیت، واجبـە لەسـەرت بـاوەڕت وابێـت ئـەو کـافرە، مـەڵێ: پەیوەنـدی بەمنــەوە نییـە، یـان دەربـارەی نـازانم، بـەڵکو (واجـب)ە لەسـەرت کـافر و موشریك بە کافر بزانیتو بەکەسـی سەرپێـچیکار تـاوانێکی گـەورەی ئەنجامـداوە جگـە لەشیرك کەسێکی (فاسق)ە، پێویستە لەم مەسەلەیەدا حەق ڕوون بکرێتەوە.

مەبەست لە: (فإذا لم يفعل شيئا من ذلك فهو مؤمن ومسلم بالإسم لا بالحقيقة).

واتە: بەڕواڵەت لای ئێمە، نهێنی و پەنهانییەکەی دەگەڕێنینەوە بۆ لای خوا.

**﴿٥٠﴾ نوسەر دەڵێت: (وكلما سمعت من الآثار شيئا مما لم يبلغه عقلك نحو قول رسول الله (ﷺ): (قلوب العباد بين أصبعين من أصابع الرحمن عز و جل)[١٢٨].**

وقوله: (إن الله ينزل إلى السماء الدنيا)[١٢٩] وينزل يوم عرفة.

وينزل يوم القيامة، وإن جهنم لا يزال يطرح فيها حتى يضع عليها قدمه جل ثناؤه[١٣٠]، وقول الله تعالى للعبد: (إن مشيت إليَّ هرولت إليك)[١٣١]، وقوله: (خلق الله آدم على صورته)[١٣٢] وقول رسول الله (ﷺ): (رأيت ربي في أحسن صورة) وأشباه هذه الأحاديث، فعليك بالتسليم والتصديق والتفويض والرضا، ولا تفسر شيئا من هذه بهواك فإن الإيمان بهذا واجب، فمن فسر شيئا من هذا بهواه، وردّه فهو جهمي.

**واتە: هەرکاتێك گوێبیستی فەرموودەیەك بووی عەقڵت پێی نەدەگەیشت وەکو ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دەڵێت: (دڵی بەندەکان لە نێوان دوو پەنجەیە لە پەنجەکانی خوای میهرەباندا).**

**ئەو فەرموودەیە: (خوای گەورە دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا) و لەڕۆژی عەرەفەدا دادەبەزێ.**

**لەڕۆژی قیامەتدا دادەبەزێ، دۆزەخ بەردەوام خەڵکی تێ دەکرێت تاکو خوای پەروەردگار پای خۆی دەخاتە سەر، خوای گەورە بەبەندەکەی دەڵێت: (ئەگەر بە**

---

١٢٨ / أخرجه مسلم (٢٦٥٤) .

١٢٩ / متفق عليه : أخرجه البخاري (١٠٩٤) ومسلم (٧٥٨) .

١٣٠ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٤٥٦٧) ومسلم (٢٨٤٨) .

١٣١ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٦٩٧٠) ومسلم (٢٦٧٥) .

١٣٢ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٣١٤٨) ومسلم (٢٨٤١) .

ڕێکردن بەرەو لام بێیت ئەوا بە هەروەلە مـن بـەرەو لات دێـم) دەڵێـت: (خـوای گـەورە ئادەمی دروست کردوە لە سەر صورەتی خۆی) پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دەفـەرموێت: (پەروەدگارم بینی لەسەر جوانترین صورەت).

نموونەی ئەو فەرموودانە، ئەوا پێویستە لەسـەرت تەسـلیم بـوونو بەڕاسـت زانـینو ڕاسپاردن (التفویض)و ڕازی بوون، هیچ یەکێك لەوانە بەئارەزووی خۆت تەفسیر مەکـە چـونکە باوەڕهێنـان بـەوە واجبـە، جـا هـەر کەسـێك شـتێکی لەوانـە تەفـسیر کـرد بـە ئارەزووی خۆیو ڕەددی کردەوە ئەو (جەهەمی) یە.

ڕاڤە/

دەقەکانی سیفات جێگرو سابتە بۆ خـوا، پێویـستە لەسـەرت بیـسەلمێنی هـەروەکو هاتوە لەسـەر حەقیقـەتی خـۆی، بـەبێ ئـەوەی بەعـەقڵت بەشـداری بکـەیت و تێکـەڵی بکەیتو بڵێیت: ئەمە لایەقی خوای گەورە نییە، یـان خـوای گـەورە پاکـە لـەو شـتانە، ئەمەش تەشبیهە، هەروەکو (المعطلة) دەڵێن.

یان باوەڕت وابێت خـوای گـەورە لەدروسـتکراوەکانی دەچـێت هـەروەکو (الممثلـة) دەڵێن، ئەوا هەردوو کۆمەڵەکە گومڕان.

(المعطلة): زیادەڕەوییان کردن لە پاکراگردندا، تاکو ناوو سیفاتەکانی خوایان نەفی کرد بەقسەی خۆیان دەیانەوێ لە لەیەکچواندن (تەشبیهکردن) هەڵبێن.

(الممثلـة): زیادەڕەوییـان کـرد لـە ئیـسپاتدا، تـاکو خوایـان چـواند (شـوبهاند) بەدروستکراوەکانی، هەردوو کۆمەڵەکە ناڕەواو (باطل)ن.

مەزهـەبی (ئـەهلی سـوننە): نێوەنـدن، ئیـسپاتی نـاوو سـیفاتەکانی خـوای گـەورە دەکەن ئیسپاتێك بەبێ لێکچوون، هـەر لەیەکـچوونێك لەگـەڵ دروسـتکراوەکانیدا نـەفی

دەکـەین وەك تـەنزیهێك نـەوەك وەك (تعطیـل) لەکارخـستن، ئەمـە مەزهـەبی ئـەهلی سوننەو جەماعەیە بەپێی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت:

(لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ) ئەمە وەڵامە بۆ (الممثلة)...

(وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ (١١)الشورى) ئەمە وەڵامە بۆ (المعطلة)...

ئایەتەکە بەڵگەی ئەوەی تێدایـە ئیـسپاتی نـاوو سـیفاتەکانی لێکـچوون و لێـچواندن لەخۆ ناگرێت، ئەمە بەرنامەو مەنهەجی تەواوە لەمەسەلەی ناوو سیفاتەکاندا.

بۆ نمونە: (قلوب العباد بين أصبعين من أصابع الرحمن عز و جل).

ئیسپاتی بوونی پەنجە دەکات بۆ خوای گەورە هـەروەکو لەفەرموودەکـەدا هـاتوە، مەڵێ: وەکو پەنجەی دروستکراوەکانە، چونکە ئەوە لێکچواندنە، خـوای گـەورە بـەپاك رادەگرین لەوەدا (لەو شوبهاندنەدا) بەڵکو ئیسپاتی دەکەین بەشێوەیەك لایـەقی خـوای گەورە بێت وەکو پەنجەکانی دروستکراوەکان نییە.

ئیسپاتی ئەو فەرموودە قودسییە دەکەین کە خوای گەورە تێیـدا دەفـەرموێت: (من أتاني يمشي أتيته هرولة)[١٣٣] واتە: هەر کەسێك پەلە بکات بۆ ڕازی بـوون و گوێڕایـەڵی مـن، منیش پەلە دەکەم لە لێخۆشبوونی تاوانـەکانی و جـێ بـەجێ کردنـی پێویـستییەکانی، مانـای ئـەو (الهرولـة) نییـە ناسـراوە لامـان، کۆتـایی فەرموودەکـە تەفـسیری دەکـات کەدەفەرموێت: (لئن سألني لأعطينه ولئن استعاذني لأعيذنه) جـا مانـای (الهرولـة) لێـرەدا: بریتییە لە پەلەکردن لە جێ بەجێ کردنی پێویستییەکانی بەندەکـەی، هـەروەکو چۆن بەندەکە پەلە دەکات لەگوێڕایەڵی خوادا جا ئایا بەندەکە بەحەقیقـەت (هرولـة) دەکـات یـان بەماناکـەی؟ ئەمـەش ڕەدی هەنـدێ لـەو کەسـانە دەداتـەوە ئیـسپاتی سـیفەتی

---

١٣٣ /رواه البخاري (٦٩٧٠) ومسلم (٢٦٧٥) .

(الهرولـة) دەکـەن، ئەمـەش لـەجۆری کـردارە (مقابلـة)کانـە، هـەروەکو خـوای گـەورە دەفـەرموێت: (فَيَسْخَرُونَ مِنْهُمْ سَخِرَ اللَّهُ مِنْهُمْ (٧٩) التوبة) واتـە: بـەدەر لـە تـەوس‌و تەشەرەکانیان هێشتا گاڵتەشیان پێ ئەکەن ! جا لەبەرانبەر ئەوەوە مەسخەرە بەوان دەکات).

(إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِئُونَ (١٤) اللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ) البقرة) واتـە: ئێمـە هـەر گاڵتـەیان پـێ دەکەین (١٤) بەڕاستی خوای بالادەست گاڵتە بەوان دەکات (١٥).

(وَمَكَرُوا وَمَكَرَ اللَّهُ (٥٤) آل عمران) واتە: دوژمنانی خوا فێڵیـان کـرد بـەڵام خـوا فـڕو فێڵەکەیانی پووچەڵ کردەوە).

بۆیە پێویستە ئەم بنەما مەزنانە بزانرێـت، بـۆ ئـەوەی موسـڵمان لەسـەر چـاوڕوونی بێت و مەزهەبی سەلەف لەو مەسەلەدا بزانێت، ئەوان لەوەدا جێگیرترو سـابتترن و لـەو زاناترن، خودی خـۆی بەسـەر بـەخۆیی تێگەیـشتنی خـۆی و عـەقڵی خـۆی و ئیـسپاتی شتێك بۆ خوا نەکات دەربارەی هیچ نەزانێت بەڵکو بەپێی ڕواڵەتەکـەیو لێکـچووەکان، چونکە لێرەدا چەندین بەڵگەی مەحکەم هەن ڕوونی دەکاتەوەو ئاشکرای دەکەن، بۆیـە پێویستە (متشابە)ـەکان بگێڕدرێتەوە بۆ (محکم)ـەکان، ئەمـەش هـەموو کەسـێك پێـی نازانێت تەنها ئەوانە نەبێت چوونەتە قوڵایی زانستەوە.

بۆیە پێویستە لەسەر قوتابی زانست‌و زانیاری (طالب العلـم)و کەسـێکی سـەرەتا لـە زانستدا پەلە نەکات لەم مەسـەلانەدا، بـەڵکو لێـی ڕادەوەسـتێ، فێـر ببێـت چـۆن لێـی تێدەگات بەپێی مەنهەجی سەلەف، ڕێگاکە ڕوونە، سـەلەف کەمتەرخـەمییان نـەکردوە لەڕوونکردنەوەی حەقداو دانانی ڕێساو بنـەماکان، بـەڵام ئەمـە پێویـستی بـە زانـست و زانیارییە، پێویستی بەتێگەیـشتنە، هـەروەها لەنمونـەی ئـەوە ئـەو فەرموودەیەیـە کـە دەفەرموێت:

(ينزل ربنا إلى السماء الدنيا)[١٣٤] واتە: پەروەردگارمان دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا.

(وينزل عشية عرفة)[١٣٥] واتە: ئێوارەی عەرەفە دادەبەزێت.

(يأتي يوم القيامة)[١٣٦] واتە: لە رۆژی قیامەتدا دێت.

(يجيء يوم القيامة لفصل القضاء بين عباده)[١٣٧] واتە: لە رۆژی قیامەتدا دێت بۆ داوەری کردن لە نێوان بەندەکانیدا.

ئەم شتانە ئیسپات دەکەین وەکو حەقیقەتی خۆی، بەبێ ئەوەی بچینە ناو دیاری کردنی چۆنیەتییەکەی بۆیە تەکلیف لەخۆمان ناکەین لەزانینی، چۆن دێت؟ جا ناچینە نێو باسی چۆنیەتی یەوە، بەڵام ماناکەی ئەوا شتێکی مەعقولە، بۆیە کاتێك پرسیار کرا لەئیمامی مالیك دەربارەی چۆنیەتی (الاستوا) پرسیارکارەکە وتی:- (الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى (٥) طه) چۆن ئیستوای کرد؟ پرسیاری دەربارەی چۆنیەتی دەکرد، ئیمامی مالیك پێی فەرموو: (الاستواء معلوم) واتە: ئیستوا ماناکەی زانراوە و ئاشکرایە (والكيف مجهول والايمان به واجب والسؤال عنه بدعة) واتە: چۆنیەتییەکەی نەزانراوەو باوەڕبوون پێی واجبە و پرسیارکردن دەربارەی چۆنیەتییەکەی بیدعەیە) ئەمە مەنهەجی سەلامەتە لە نمونەی ئەم مەسەلانەدا.

هەروەها: ئیسپاتی (صورە) بۆخوا دەکەین هەروەکو چۆن پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئیسپاتی بۆ کردوە لەو فەرموودەیەی کە دەڵێت: (خلق الله آدم على صورته)[١٣٨] لە

---

١٣٤ / رواه البخاری (١٠٩٤) ومسلم (٧٥٨) .

١٣٥ / رواه مسلم (١٣٤٨) .

١٣٦ / خوای گەورە دەفەرموێت : (هَلْ يَنْظُرُونَ إِلَّا أَنْ يَأْتِيَهُمُ اللَّهُ فِي ظُلَلٍ مِنَ الْغَمَامِ وَالْمَلَائِكَةُ وَقُضِيَ الْأَمْرُ وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الْأُمُورُ (٢١٠)) .

١٣٧ / خوای گەورە دەفەرموێت : (وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا (٢٢) الفجر .

١٣٨ / رواه البخاري (٥٨٧٣) ومسلم (٢٨٤) .

ریوایەتێکی تردا هاتوە: (على صورة الرحمن)[١٣٩] ئیسپاتی (صورە) بۆ خوا دەکەین،هەروەکو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئیسپاتی بۆ کردوە، لەو فەرمودەیەی کە دەفەرموێت: (رأيت ربي في أحسن صورة)[١٤٠] ئەمە لەدونیاداو بینینی خەو بووە (خەوبینین) ئیسپاتی (صورە)ی تێدایە بۆ خوا بەشێوەیەك لایەقی ئەو بێت نەوەك وەکو (صورە)ی دروستکراوەکان، بەڵکو ئەوە (صورە)تی خوای گەورەیە، ئەم مەسەلانە ئێمە ئیسپاتی دەکەین بۆ خوای گەورە و بەبێ ئەوەی بچینە ناو مەسەلەکانەوە یان گومانی لێ بکەین، یان دەمە قاڵەی لەسەر بکەین.

(التفويض) لەڕاستیدا (تفويض)ی چۆنیەتییە نەك (تفويض)ی مانا.

مەبەست لە: (ولا تفسر شيئا من هذه بهواك).

بەڵکو تەفسیر دەکەین بەمانایەکی ڕاست و دروست لایەق بێت بەخوای گەورە، ناگوترێت تەفسیر ناکرێت، بەڵکو تەفسیر دەکرێت و ماناکەی ڕوون دەکرێتەوە، (تفويض)ەکە تەنها بۆ چۆنیەتییەکەیە، ئیسپاتی دابەزین دەکەین و چۆنیەتییەکەی نەفی دەکەین، خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا دێت بۆ یەکلایی کردنەوەی داوەرێکان هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: (وَجَاءَ رَبُّكَ (٢٢) الفجر) وە دەفەرموێت: (هَلْ يَنْظُرُونَ إِلَّا أَنْ يَأْتِيَهُمُ اللَّهُ فِي ظُلَلٍ مِنَ الْغَمَامِ وَالْمَلَائِكَةُ وَقُضِيَ الْأَمْرُ وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الْأُمُورُ (٢١٠)البقرة) واتە: ئاخۆ پەیرەوانی شەیتان بێ لەمە لەڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە لەپەڵە هەورێکی سپیدا بێتە لایان و داوەرییان بکا، فریشتەکانیش بەڕیز ئامادەبن بۆ تێپەڕانی بڕیارەکانی خوا دادگایشیان ببڕێتەوە).

خوای گەورە دێت بۆ یەکلایی کردنەوەی کێشەکان لەنێوان بەندەکانیدا، بەڵام وەکو دروستکراوەکان نایەت بەڵکو هاتنێکە لایەقی خۆی بێت بەهەر شێوەیەك بیەوێت.

---

١٣٩ / رواه الطبراني والحارث بن أبي أسامة وابن خزيمة وصححه الامام احمد واسحاق بن راهويه .

١٤٠ / رواه أحمد والترمذي .

مەبەست لە: (بهواك).

واتە: تەفسیری ناکەیت بە بێ زانیاری، بەڵام ئەگەر تۆ تەفسیری دەکەیت بەپێی بەڵگەکانو گەڕانەوەی (المتشابه) بۆ (محکم) ئەوە ئاساییە، بەڵام کەسی تازە پێگەیشتوو یان نەفام ئەوا ناچێتە ناو ئەم بابەتو مەسەلە مەزنانەوە، چونکە ئەمە مەڵەیەو ترسێکی گەورەیە.

من دەبینم زۆرێك لەو گەنجانەی خۆیان بەزانا دەزانن جورئەت دەکەن لەمەسەلەکانی عەقیدەداو وایان لێهاتوە جورئەت دەکەن دەربارەی چەند شتێكو قسەی تێدا دەکەن، دژایەتی یەکتر دەکەنو ئەگەر جیاواز بوون ئەوا پەیوەندی نێوانیان دەبچڕێنن.

براکانم خوای گەورە تەکلیفی ئەم مەسەلانەی لێ نەکردوون، پێویستە لەسەرتان لەسەر مەنهەجی سەلەف بڕۆن، قسەکانی ئەوان بکەن، کتێبەکانی عەقیدە سوپاس بۆ خوا چاپکراون و ڕاستکراونەتەوە و دیراسەکراون و ڕێكو پێکن، بۆیە لەخۆتانەوە شتی نوێ دامەهێننو لە خۆتانەوە تێگەیشتنی نوێ دامەهێنن، ئەم بابەتانە کەسانێکی تر باسی کردوون و لەکۆڵ کراونەتەوە.

مەبەست لە: (فإن الإيمان بهذا واجب).

باوەڕ بوون بەناوو سیفات و کارەکانی خوای گەورە واجب و فەرزە لەسەر بەندەکان.

لەئیمان هێنان (باوەڕبوون) بەخوا: باوەڕ بوون بەناوو سیفاتەکانی بەشێوەیەك لایەقی ئەو بێت، جا هەر کەسێك بچێتە نێو بابەتی ناوو سیفەتەکانەوە بە لەکارخستن (التعطيل) یان بە لێکچواندن (التمثيل) یان بە (التفويض) یان بە تەفسیرێك لەخۆیەوە،

ئەوا ئەو کەسە ئیمانی بە خـوا نـەهێناوە ئیمـانێکی حـەقیقی، ئـەوە ئیمانەکـەی کـەم و کورتە.

مەبەست لە: (فمن فسر شيئا من هذا بهواه ورده فهو جهمي).

جەهەمییەکان نەفی ناوو سیفاتیان کرد، چونکە بەشێوەیەك تەفسیریان کـرد لایـەق بێت بە (مخلوق)، گومانیش لەوەدا نییە خوای گەورە پاکە لەو شتانەی لایـەق بێـت بـە (مخلـوق) ئـەوان لەپێـشدا شـوبهاندیان (تمثیـل)یـان کـرد، پاشـان لـەکاریان خـست (تعطیـل)یـان کـرد، بـەپێی (تمثیـل) کردنەکـەیان، چـونکە ئـەو دەقانـەیان بـۆ ڕوون نەبوویـەوە ئـیللا بـەو شـێوەیە نـەبێت کـە لـە دروسـتکراوەکاندا دەچـێت بۆیـە بـەو تێگەیشتنە نەفییان کرد.

ئەگەر بیانگوتایە: ئەم دەقانە ناوو سیفاتی خوای لەحەقیقەتدا تێدایە، بەڵام لایەقی ئەوە، جا ناوەکانی ئەو وەکو ناوی دروستکراوەکانی نییەو سیفەتەکانی وەکو سیفەتی دروستکراوەکانی نییە، ئەگەر ئەم مەنهەجەیان بگردایەتەبەر ئـەوا سـەلامەت دەبـوون، بەڵکو ئەوان بەتێگەیشتن و ئارەزووی خۆیان لەیەکیان دایەوە.

(الجهمیە): ئـەو ناوەیـان لێ نـراوە لەبـەر (الجهـم) کـوڕی (صـفوان)ی الترمـذی یـان السمرقندی، یەکەم کەس بوو ئەو قسەیەی ئاشـکرا کـردو وتـی: قورئـان دروسـتکراوە، نەفی ناوو سیفەتەکانی خوای کرد، هەروەها وتی: ئیمـان تـەنها بـریتی یـە لـە ناسـینی بەدڵ.... تا کۆتایی قـسە گـومڕاو کوفرەکـانی، جـا هـەر کەسـێك بـاوەڕی وابێـت ئـەوا دەدرێتە پاڵ ئەو، پێی دەگوترێ ئەو کەسە (جەهەمی)یە، وەکو نیسبەتێك بۆ (الجهم).

**﴿٥١﴾ نوسەر دەڵێت: (ومن زعم أنه يرى ربه في دار الدنيا فهو كافر بالله عز و جل).**

واتە/ هەرکەسێك باوەڕی وابێت خوای گەورە لەدونیادا دەبینی ئەوا کافرە بەخوای گەورە.

ڕاڤە/

هەر کەسیَ بلێت کەسێك بەچاو خوای گەورە دەبینیَ نەك بەخەو ئەوا کافرە، چونکە خوای گەورە لەدونیادا نابینرێت، بۆیە کاتیَ موسا (کلیم الله) داوای لەخوا کرد ـ ببینیَ ـ ئەوا خوای گەورە فەرموی: (قَالَ لَنْ تَرَانِي وَلَكِنِ انْظُرْ إِلَى الْجَبَلِ فَإِنِ اسْتَقَرَّ مَكَانَهُ فَسَوْفَ تَرَانِي) الاعراف/١٤٣) واتە: خوا فەرمووی: مووسا هەرگیز لەم دونیایە ناتوانی بمبینی بەلاَم لەم کێوە بڕوانە من خۆمی نیشان دەدەم جا ئەگەر ئەو لەجێی خۆی ماو، نەبزووت، ئەوساش تۆ دەتوانی بمبینی).

جا هیچ کەسێك لەم دونیایەدا خوا نابینیَ، ئەمە جێگای ئیجماعی زانایانە، بەڵکو بینینی خوای گەورە لەدوا ڕۆژدا دەبیَ، چونکە خەڵکی لەدونیادا لاوازن توانای بینینی خوایان نییە، چونکە لاوازییان تێدایە، بۆیە کاتێك خوای گەورە دەرکەوت بۆ شاخەکە، ئەوا خاپوور بوو، بوو بە گڵ، ئایە ئەی نەوەی ئادەم چۆنە؟ لە گۆشتو خوێنن، بەلاَم لە دواڕۆژدا خوای گەورە هێزێك دەبەخشێتە ئیمانداران بتوانن خوای گەورەی پێی ببینن و لەززەت لەو بینینە ببینن، جا بینینی خوای گەورە لەدواڕۆژدا جێگرو متواترە بۆ ئیمانداران، بەلاَم لەدونیادا ئەوا هیچ کەسێك بەچاو خوای گەورە نابینیَ.

جیاوازی لەوەدایە: ئایە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەشەوی میعراجدا خوای گەورەی بینی یان نا؟

ڕای ڕاست و ئەوەی جمهوری زانایان لەسەرە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەچاو نەیبینیوە بەڵام بەدڵ ئەوی بینیوە، چونکە هیچ کەسێك لەم دونیایە خوای گەورە نابینێ، چونکە خوای گەورە زۆر لەوە مەزنترە لەم دونیایەدا خەڵکی ببینێ، بۆیە کاتێ پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایە لەشەوی میعراجدا خوات بینی؟ فەرمووی: (نور أنى اراه)[١٤١] وە فەرمووی: (حجابه النور، لو كشفه لأحرقت سبحات وجهه ما انتهى إليه بصره من خلقه)[١٤٢] واتە: پەردەی زاتی خوا روناکییە، ئەگەر ئەو پەردە لاببات نووری رووخساری هەموو ئەو دروستکراوانە دەسوتێنێت کە بینایی پێی دەگات (واتە: هەموو بوونەوەر).

---

١٤١ / أخرجه مسلم (١٧٨) .

١٤٢ / أخرجه مسلم (١٧٩) .

**﴿٥٢﴾ نوسەر دەڵێت: (والفكرة في الله بدعة، لقول رسول الله (ﷺ): (تفكروا في الخلق ولا تفكروا في الله)[١٤٣] فإن الفكرة في الرب تقدح الشك في القلب).**

واتە: بیرکردنەوە لەزاتی خوا بیدعەیە، بەبەڵگەی ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (تفكروا في الخلق ولا تفكروا في الله) چونکە بیرکردنەوە لەزاتی پەروەردگارا دەبێتە هۆی دروستبوونی گومان لەدڵەکاندا.

ڕاڤە/

پێویستە لەسەر موسڵمان خۆی بەدووربگرێت لەبیرکردنەوە لەزاتی خوادا، بیرکردنەوە لەچۆنیەتی ناوو سیفات و کارەکانی، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: (يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِ عِلْمًا (١١٠) طه) واتە: خوا بەهەموو ئەو شتانە دەزانێت کەئەوان پێشیان خستووەو کردویانە لەدونیادا، هەروەها بەو شتانەش چاك دەزانێت لەڕۆژی دواییدا چاوەڕێیانە ئەوان بەزانین و عیلم ناتوانن دەورە بدەن بەبەڕێوەبردن و حیکمەتی خوا).

بۆیە پێویستە لەسەرت باوەڕت بەخوا هەبێت و بەمەزنی بزانی، بە بێ ئەوەی بیر لەزات و چۆنیەتی ناو سیفەتەکانی بکەیتەوە.

مەبەست لە: (لقول رسول الله (ﷺ): (تفكروا في الخلق ولا تفكروا في الله)[١٤٤]

واتە: بیر لەدروستکراوەکانی خوا بکەنەوە و بیر لەئایەتەکانی گەردوون بکەنەوە ئەوا ڕێنیشاندەرتانە بۆ تواناو دەسەڵاتی خوا:

فيا عجبا كيف يُعصى الإله | أم كيف يجحدهُ الجاحدُ
وفي كـلِّ شيءٍ لـه آيـــةٌ | تـدل عـلى أنَّـه واحـدٌ

١٤٣ / ضعيف : أخرجه أبو الشيخ في (العظمة) (٥) وضعفه الشيخ الألباني في (ضعيف الجامع) (٢٤٧٠) .

١٤٤ / ضعيف : أخرجه أبو الشيخ في (العظمة) (٥) وضعفه الشيخ الألباني في (ضعيف الجامع) (٢٤٧٠) .

جا تۆ بیر لەئایەتەکانی گەردوون بکەرەوە لە ئاسمان و زەوی، لەشاخەکان و بەردەکان و دارەکان و دەریاکان و دروستکراوەکانی بۆ ئەوەی ببنە بەڵگە بۆت بۆ گەورەیی‌و مەزنی دروستکار، بیر لەئایەتەکانی قورئان بکەرەوە، بەڵام ئەگەر بیر لەزاتی خواو چۆنیەتی ناوو سیفەتەکانی بکەینەوە ئەوا درکی پێ ناکەین و ئیحاتەی ناکەین: (وَلَا يُحِيطُونَ بِهِ عِلْمًا (١١٠)طه).

**﴿٥٣﴾ نوسەر دەڵێت: (وأعلم أن الهوام والسباع والدواب نحو الذرو والذباب والنمل كلها مأمورة ولا يعلمون شيئا إلا بإذن الله تعالى).**

واتە/ بزانە کەوا هەموو جرو جانەوەرەکان و شێرو درندەکان و گیانلەبەران وەکو مێروەکان و مێش و مێرووله هەمووی پێسپێرراون، هیچ شتێك نازانن ئیللا بە ئیزنی خوا نەبێت.

ڕاڤە/

هەموو گەردوون بەڕێوە دەبرێت و مەئمورە بە فەرمانی گەردوونی، ڕۆژ (خۆر) ڕێ دەکات، مانگ ڕێ دەکات، ئەستێرەکان، گەردوون دەخولێتەوە، گیانلەبەران و باڵندەکان هەمووی بەپێی سیستەمی خۆی ڕێ دەکات کەخوای گەورە بۆی داڕێژراوەو تەقدیری کردوە، (أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى (٥٠) طه) واتە: پەروەردگاری ئێمە ئەو زاتەیە هەموو شتێکی دروست کردووە، پاشانیش ڕێنمایی هەموو پێداویستییەکیشی کردوون).

هەموو دونیای ڕێك خستوە، هەموو ئەوەی لەم دونیایەدایە لەبونەوەرو دروستکراوەکان و گەردونەکان و ئاسمانەکان و زەوی، هەمووی بەتەقدیرو بەڕێوەبردنی دروستکارەکەی بەڕێوە دەچێ، ئەویش بەفەرمانی گەردوونی خوای گەورە دێت و دەچێت: (إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ (٨٢) يس) واتە: بەڕاستی هەرکاتێ ویستی شتێ بەدی بهێنێ هەر ئەوەیە کە پێی بفەرمێ ببە! ئەویش دەست بە جێ دەبێت).

ئەوانە ڕێ دەکەن و دەچن بەفەرمان و بەڕێوەبردنی و دروستکردن و ئیرادەو ویستی خوای گەورە و ملکەچی ئەون: (كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُسَمًّى) الرعد/٢) واتە:

هەردووكیشیان(خۆرو مانگ) تا ئەو كاتەی بۆیان دیاریكراوە لەخولگەی خۆیاندا هەر دێن و دەچن.

مەبەست لە: (ولا يعلمون شيئا إلا بإذن الله تعالى).

واتە: بە ئیزنی گەردوونی خوا ئەویش فەرمانی كەونییە، بە ویستی خوای گەورە، ئەوانە بەویستی خۆیان ڕێ ناكەن یان بەڕێوەبردنی هیچ كەسێك جگە لەخوا، بۆیە كاتێك كابرای ستەمكار (الجبار) بە ئیبراهیمی گووت: (أَنَا أُحْيِي وَأُمِيتُ) واتە: ووتی: خۆ منیش كەسانێ دەژێنم و كەسانێكیش دەمرێنم).

ئیبراهیم پێی فەرموو: (فَإِنَّ اللَّهَ يَأْتِي بِالشَّمْسِ مِنَ الْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ الْمَغْرِبِ فَبُهِتَ الَّذِي كَفَرَ (٢٥٨) البقرة) واتە: دەی باشە خوا لەخۆرهەڵاتەوە خۆر دێنێ دەسا تۆیش كەداوای خوایەتی ئەكەیت لەخۆرئاواوە بیهێنە ئەوسا ئیتر ئەو ستەمكارو بێ باوەڕە حەپەساو نقەی لێبڕا).

جا كارەكانی خوای گەورە هیچ كەسێك ناتوانێ بیكات یان وەكو ئەو بكات، چونكە تەنها ئەوە گەردوون بەڕێوەدەبات، بەچاكترین و جوانترین و وردترین شێوە ڕێكی خستووە، بەهیچ شێوەیەك ناگۆڕێت، (مَا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَنِ مِنْ تَفَاوُتٍ) الملك/٣) واتە: لەناو دروستكراوەكانی (خوای) بەبەزەییدا هیچ جۆرە ناڕێكی و ناتەواوییەك نابینی).

جا ڕۆژ و مانگ و ئەستێرەو ئاسمانەكان و زەوی لەوكاتەوە خوای گەورە دروستی كردوو تا ئەو كاتەی ویستی لەسەر بێت لەكۆتایی دونیا بەپێی سیستەمێكی خوای گەورە دەڕوات كە تەقدیركراوە و هەرگیز ناگۆڕێت.

**﴿٥٤﴾نوسەر دەڵێت: (والإيمان بأن الله قد علم ما كان من أول الدهر، وما لم يكن، وما هو كائن، أحصاه وعده عداً، ومن قال: إنه لا يعلم إلا ما كان وما هو كائن فقد كفر بالله العظيم).**

واتە: باوەڕ بەوەی خوای گەورە زانیویەتی ئەوەی ڕووی داوە لەسەرەتای زەمانەوە، ئەوەش ڕوونادات، ئەوەش کە ڕوودەدات، هەمووی ژماردووەو حەسابی کردوە، هەرکەسێك بڵێت: خوای گەورە نازانێت تەنها ئەوە نەبێت کە ڕوویداوەو ئەوەی هەیە، ئەوا کوفری بەخوای گەورە کردوە.

ڕاڤە:

پێویستو واجبە ئیسپاتی (عیلم) بۆ خوای گەورە بکەین، ئاگادارە بە هەموو شتێك، جا ئەو زانیارە دەربارەی هەموو شتێك و بەتوانایە بەهەموو شتێك، زانستی خوا نە سەرەتاو نە کۆتایی هەیە، (عیلم)ی خوای گەورە وەکو ئەو سیفەتەکانی تر وایە سابتو جێگرە هەر لە ئەزەلەوە، هەروەکو چۆن خوای گەورە سەرەتای نییە ئا بەو شێوە ناوو سیفەتو کارەکانی سەرەتایان نییە، هەروەکو چۆن خوای گەورە کۆتایی نییە ئا بەو شێوەیە ناوو سیفەت و کارەکانی کۆتاییان نییە، ئەو بەناو و سیفەتەکانیەوە یەکەمە و سەرەتای نییە، ئەو بەناو و سیفەتەکانییەوە دواینەوە کۆتایی نییە، هەروەکو پێغەمبەری نازدار (ﷺ) دەفەرموێت: (أنت الأول فليس قبلك شيءٌ، وأنت الآخر فليس بعدك شيءٌ، وأنت الظاهر فليس فوقك شيءٌ، وأنت الباطن فليس دونك شيءٌ)[١٤٥] واتە: ئەی خودایە.. تۆ یەکەم کەسێکیتو هیچ کەسێك لە پێش تۆ نەبووەو تۆ دوایین کەسێکیتو هیچ کەسێك لە پاش تۆ نییە، تۆ خاوەن دەسەڵاتو

---

١٤٥ / صحيح : سبق تخريجه .

شکۆمەندیو هیچ کەسێك لە سەرووی تۆوە نییە، هەر تۆ پەنهانیو جگە لە تۆ کەس لە وردەکارییەکان ئاگادار نییە).

مەبەست لە: (والإيمان بأن الله تعالى قد علم ما كان من أول الدهر، وما لم يكن، وما هو كائن، أحصاه وعده عدا).

خوای گەورە ئەوەی ڕوویداوەو ڕۆیشتوە لەسەردەمی پێشوودا زانیویەتیو ئەوەی لەئاییندەدا ڕوودەدات دەزانێ، ئەوەیشە نەبوە دەیزانێ و ئەگەر ببوایە دەیزانێ چۆن دەبێت، خوای گەورە عیلمەکە ئاگاداری هەموو شتێکە، بۆیە دەفەرموێت: (وَلَوْ رُدُّوا لَعَادُوا لِمَا نُهُوا عَنْهُ) الانعام/٢٨) واتە: ئەگەر گریمان بشگێڕدرێنەوە بۆ دونیا، ئەو کارانە ڕێیان لێ دەگیرا، هەم دیسان دەچوونەوە سەریان و هەردەیانکەن).

خوای گەورە زانیویەتی کەوا ئەگەر ئەوان بگێڕدرێنەوە بۆ دونیا ئەوا دیسان دەگەڕێنەوە بۆ سەر ئەو کارەی نەهییان لێ کرابوو، واتە: ئەگەر بگێردرێنەوە بۆ دونیا ئەوا ئەوان دەگەڕێنەوە بۆ کوفر، هەرچەندە گەڕانەوەیان بۆ دونیا هەرگیز ڕوو نادات.

مەبەست لە: (ومن قال إنه لا يعلم إلا ما كان، وما هو كائن فقد كفر بالله العظيم).

هەرکەسێك عیلمی خوای گەورە تەسك بکاتەوە تەنها لەو ڕووداوانەی ڕوو دەدەن و نازانێت چی ڕوودەدات لەپێش ڕوودانی ئەوا کوفری بە خوا کردوە، چونکە نکۆڵی لەعیلمی خوا کردوەو نکۆڵی لە فراوانی ئاگاداری عیلمی خوای کردوە، ئیسپاتی عیلمێکی کەموکورتی بۆ خوا کردووە، جا ئەو بەوە کوفری کردوە، چونکە عیلمی خوا سنووردار ناکرێت، بەڵام عیلمی دروستکراوەکان ئەوا سنورداره بکاتە هەر چەندێك: (وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ (٧٦)یوسف) واتە: خۆ لەبان هەموو زانایەکەوە زاناتر هەیە هەتا دەگاتە خوا، ئیتر لەخوا زاناتر نییە).

فەرمانی کردووە بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بڵێت: (وَقُلْ رَبِّ زِدْنِي عِلْمًا (١١٤) طه) واتە: بڵێ: ئەی پەروەردگارم ! زانست و زانیاریم زیاد بکە).

جا هەرکەسێك عیلمی خوا سنوردار بکات و بڵێت: عیلمی خوا ئەوەندەیەو ئەوە نازانێت ئەوە کافرە بەخوای گەورە چونکە بەکەمی زانیوەو نکۆڵی لەگشتگیری عیلمەکەی بەهەموو شتێك کردوە.

**﴿٥٥﴾ نوسەر دەڵێت: (ولا نكاح إلا بولي وشاهدي عدل)[١٤٦] وصداق قل أو كثر ومن لم يكن لها ولي فالسلطان ولي من لا ولي له).**

واتە: (نیکاح) هاوسەرگیری دانامەزرێت بەبێ بوونی خاوەن و دوو شایەتی عەدل) و مارەییەك جا ئەگەر کەم بێت یان زۆر، هەر ئافرەتێك خاوەنی نەبێت ئەوا دەسەڵاتدار خاوەنی ئەو کەسانەیە خاوەنیان نییە.

ڕاڤە:

ئەمە مەسەلەیەکی فیقهییە: ئەویش ڕوونکردنەوەی مەرجەکانی دامەزراندنی هاوسەرگیرییە لای جمهوری زانایان: لەوانە دەبێ بەئامادەبوونی خاوەنەکەی(ڕازی بێت) ئافرەت ناتوانێت خۆی بەشوو بداتو لەمەرجەکانی دەبێت شایەت هەبێت لەسەر ئەو گرێ بەستە، بۆیە دروست نییە گرێبەستەکە ببەسترێت بەنهێنی و بە بێ بوونی شایەت.

هەروەها لەمەزهەبی موسڵمانان‌دا هەیە دەبێ هاوسەرگیرییەکە ئاشکرا بکرێت و مەسەلەی خاوەنەکەی (الولی) جێگای ناکۆکی زانایانە، جا لای جمهوری زانایان: دەبێ خاوەنەکەی ئامادەبێ، لای حەنەفییەکان: ئەوا ئاساییە ئافرەت خۆی بەشوو بدات بەبێ خاوەنەکەی، بەڵام ئەمە مەزهەبێکی ناپەسەندە (مرجوح)ـە، جیاواز و ناکۆکە لەگەڵ بەڵگەدا، لەبەر ئەو فەرموودەیەی دەفەرموێت: (لا نكاح إلا بولي وشاهدي عدل) واتە: هیچ هاوسەرگیرییەك دانامەزرێت ئیللا بە بوونی خاوەن (ولی) و دوو شایەتی عەدل) لەفەرموودەیەکی تردا هاتووە: (لا تزوج المرأة المرأة، ولا تزوج المرأة

---

[١٤٦] / صحيح / أخرجه ابن حبان في (صحيحه) (٤٧٥) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٧٥٥٧)

نفسها، فإن الزانية هي التي تزوج نفسها)[١٤٧] **واتە: ئافرەت ئافرەت بە شوو نادات، ئافرەت خۆی بە شوو نادات، ئافرەتی زیناکەر ئەو ئافرەتەیە کە خۆی بە شوو دەدات).**

**دەفەرموێت:** (أيما امرأة نكحت بغير إذن وليها، فنكاحها باطل باطل باطل)[١٤٨] **واتە: هەر کاتێك ئافرەتێك شووی کرد بە بێ ئیزنی خاوەنەکەی ئەوا نیکاحەکەی پووچەڵە پووچەڵە پووچەڵە).**

**هەرچەندە هەرکەسێك بڵێت بەدروستییەتی لەفەقیهەکان بەئیجتیهادی خۆیان، جا عیبرەت بەبەڵگەیە، بۆیە نوسەر ئەم باسەی باسکردوە هەرچەندە مەسەلەیەکی فیقهییە، بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە کەوا ئەم مەزهەبە مەزهەبێکی تەواو و دروستە، هەر ئەمەش ئەو مەزهەبەیە جمهوری زانایانی لەسەرە کە بەڵگەی سوننەتی پێغەمبەری خوای (ﷺ) لەسەرە، بۆ ئەوەی هاوسەرگیریەکانی موسڵمانان ڕێك بخرێت، نهێنی و فرو فێڵی تێدا نەبێت، بەڵکو دەبێت ڕوون و ئاشکرا بێت، چونکە هاوسەرگیرییەکان گرنگترین کارەکانە، چونکە خێزانەکانی لەسەر بنیات دەنرێ، نەوەکانی لەسەر بنیات دەنرێ، ڕەچەڵەکەکان و نەسەبەکانی لەسەر بنیات دەنرێ، لە هەموو ئەوانە گرنگتر ئەوەیە حەڵاڵ کردنی دامێنەکانی لەسەر بنیات دەنرێ، بۆیە پێویستی بە چەند ڕێکخەرێکی شەرعی هەیە بۆ بەستنی ئەو هاوسەرگیرییە لە فەرموودەو ئایەتەکاندا هاتوە.**

---

١٤٧ / صحيح دون جملة الزانية / أخرجه ابن ماجه (١٨٨٢) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٧٢٩٨) دون جملة الزانية .

١٤٨ / صحيح / أخرجه أبو داود (٢٠٨٣) والترمذي (١١٠٢) وابن ماجه (١٨٧٩) وأحمد (٤٧/٦، ٦٦، ١٦٥) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع ) (٢٧٠٩) .

مەبەست لە: (وصداق قلّ أو كثر).

مارەیی مەرج نییە بەڵكو واجبە، بۆیە ئەگەر هاوسەرگیرییەك بەسترا بەبێ مارەیی ئەوا گرێبەستەكە دروستە بەڵام لەنمونەی هاوشێوەكانیان مارەیی بۆ دادەنرێت، چونكە ئەمە حەقی خۆیەتی.

مەبەست لە: (ومن لم يكن لها ولي فالسلطان ولي من لا ولي له).

بۆیە دەبێ وەلی (خاوەن) ئامادەبێ، (الولی): بریتییە لە خزمانی باوكی (عەصەبی) ژنەكە لەنزیكترین كەسیەوە پاشان نزیكترین كەسی لەوانە باوكی ئەمجار باپیری هەرچەندە بەرەو سەرەوە بێت، ئەمجار كوڕەكەی پاشان كوڕی كوڕەكەی هەرچەندە بەرەو خوارەوە بێت، ئەمجار براكەی لەدایك و باوكییەوە، ئەمجار براكەی لەباوكی یەوە، ئەمجار مامەكەی لەدایك و باوكەوە ئەمجار مامەكەی لەباوكی یەوە، ئەمجار كوڕی مامەكەی (كەلەدایك و باوكەوەیە برای باوكییەتی) ئەمجار كوڕی مامەكەی (كەتەنها لەباوكەوەیە برای باوكییەتی) ئەمە وەلی ئافرەتە، جا ئەگەر وارێك كەوت لە خزمانی باوكی (عەصەب)ەوە هیچ وەلییەكی نەبوو ئەمە خاوەن (وەلی)یەكەی دەسەڵاتدارە (سوڵتانە) یان ئەو كەسەی جێگری سوڵتان بێت كە ئەویش قازییە لە مەحكەمە، جا پێویستە هاوسەرگیری چەند ڕێكخەرێكی هەبێت و نابێت پاشاگەردەنی بێت و بەپێی حەزو ئارەزووی خەڵكی بێت.

**﴿٥٦﴾ نوسەر دەڵێت: (وإذا طلق الرجل امرأته ثلاثا فقد حرمت عليه، لا تحل له حتى تنكح زوجا غيره).**

**واتە: ئەگەر پیاوێك سێ جار خێزانەكەی خۆی تەڵاقدا ئەوا چیتر لێی حەرام دەبێت، بۆی حەڵاڵ نابێت تاوەكو شوو بەیەكێكی تر نەكات.**

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (وإذا طلق الرجل امرأته ثلاثا فقد حرمت عليه).

**واتە: ئەگەر پیاوێك خێزانەكەی خۆی سێ جار تەڵاقدا ئەگەر سێ تەڵاقی جیاواز بوو ئەوا بەكۆڕای زانایان لێی حەرام دەبێ، هەروەكو ئەوەی بڵێت: ئەوا تۆم تەڵاقدا، پاش ئەوە بڵێت: ئەوا تۆم تەڵاقدا، ئەمجار گووتی: ئەوا تۆم تەڵاقدا، یان گووتی: تۆم تەڵاقداو ئەمجار تۆم تەڵاقدا، یان (فطالق) بەپیتی (فاء) چونكە ئەم ڕێكخستنە و تەرتیبە تەڵاق دەدات و ڕوونی دەكاتەوە، ئەگەر تەڵاقەكان گەیشتنە سێ تەڵاق،چیتر لێی حەرام دەبێ، تاوەكو شوو بە پیاوێكی تر نەكات، خوای گەورە دەفەرموێت:** (الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا إِلَّا أَنْ يَخَافَا أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ (٢٢٩) فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَنْ يَتَرَاجَعَا إِنْ ظَنَّا أَنْ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ (٢٣٠) البقرة) **واتە: ئەو تەڵاقەی كەمێرد بتوانێ تێیدا ژنەكەی بگێڕێتەوە بۆ لای خۆی تەنها دوو كەڕەتە ئینجا دوایی (بۆ سێیەم جار) یا ئەبێ بەیاسایەكی چاك و قەشەنگ و بەگوزەرانێكی پەسەند ڕابگیرێ یان بەشێوەیەكی باش و بێ هەرا دەس لێك بەردانەو بۆتان نییە "ئەی مێردەكان " لەو ماددەیە بەژنەكانتان داوە هیچ شتێكیان لێ وەربگرنەوە "لەبەرامبەر**

تەلاقەکەیانەوە" مەگەر ئەو کاتە ژن و پیاوەکە بترسن کەنەتوانن سنوورەکانی خوا بەباشی ڕاگرن خۆ ئەگەر ترستان هەبوو" ئەی قازییەکان " کە ئەو ژن و پیاوە سنورەکانی خوا ڕاناگرن لەحالّی ئاوهادا هیچ گوناهێکتان ناگات، کەژنەکە دەس لەمارەییەکەی خۆی هەڵبگرێ ئەمانە گشت سنورو یاسای خوان، کەوابوو لێیان دەرمەچن ئەوانەش کە لەسنورەکانی خوا تێ دەپەڕن ستەمکارن(٢٢٩) ئینجا ئەگەر لەدوای ئەم دووجارەش بۆ جاری سێیەم ژنەکەی تەلاقدا، ئەوە ئیتر جارێکی تر ئەو ژنەی بۆ حەڵاڵ نابێ تا دەچێ شوو بە پیاوێکی تر دەکاو دەستیشی لەگەڵ تێکەڵ دەکا، خۆ ئەگەر ئەو مێردەی دووەمەیش " بەئارەزووی خۆی " تەلاقی دا ئەوساکە ئەو ژن و پیاوە هیچ گوناهیان لەسەر نییە دووبارە بگەڕێنەوە لای یەکتر بۆ ژیانی ژن و مێردی، بەو مەرجەی کەوا بزانن هەردووکیان دەتوانن سنوورەکانی خوا ڕاگرن ئەم یاسایانە گشت سنووری خوان و روونیان دەکاتەوە بۆ ئەو کەسانەی بیر لەپاشەڕۆژی کارەکانیان دەکەنەوە (٢٣٠)).

ئەمە ئەگەر تەلاقەکان جیاوازبوون هەرچەندە لەیەك مەجلیسیشدا بێت، بەلاّم ئەگەر وتی: تۆ تەلاقدراوی تۆ تەلاقدراوی تۆ تەلاقدراوی بەبێ پیتی (العطف) ئەوا تەماشا دەکەین: ئەگەر بەو دووبارە کردنەوە مەبەستی تەئکیدکردن و دڵنیابوونە ئەوا یەك تەلاقە، بەلاّم ئەگەر (تأسیس)ی دەوێ ئەوا لێی جیا دەکرێتەوە ئەگەر گەیشتە سێ تەلاق.

بەلاّم ئەگەر هەرسێ تەلاقەکان بەیەك (لفظ)بوو، وەکو ئەوەی بڵێت: تۆ بەسێ جار تەلاقدراوی یان تۆ سێ جار تەلاقدراوی، ئەوا جمهوری زانایان لەسەر ئەوەن، ئەوا سێ جار تەلاقەکەی دەکەوێت و لێی جیا دەکرێتەوەو لێی حەرام دەبێ تاکو شوو بەپیاوێکی تر نەکات، ئەمەش مەزهەبی هەر چوار پێشەواکەیە.

لە قسەی هەندێ لە لێکۆڵەرەواندا هاتوە سێ تەلاقەکە بە یەك (لفظ) ئەوا یەك تەلاقە.

مەسەلەکە ناکۆکییەکی دوورو درێژی تێدایە بەڵام ئەوەمان بەسە بزانین کەوا سێ تەلاق حەرامی دەکات، نەك بۆ هەتا هەتایی بەڵکو ئەوەندە حەرامی دەکات تاکو شوو بە پیاوێکی تر دەکات ئەمجار ئەویش تەلاقی دەدات، بەڵام چوونە ناو ئەو ناکۆکییانەوە ئێستا مەبەستی ئێمە نییە.

مەبەستی نووسەر لە باسکردنی ئەم مەسەلانە لەعەقیدەدا (والله أعلم) ئەوەیە: بابەتو مەسەلەی هاوسەرگیری مەسەلەیەکی گرنگە پێویستە بایەخی پێ بدرێت، بەپێی ئەو رێکخەرە شەرعییانە بۆی دانراوە، کەمتەرخەمیو تەساهولی تێدا نییەو بەڵکو ئیجرائاتی تێدایە، لەبەر ئەوەی کیتابەکە ناوی (شرح السنه)یە واتە: روونکردنەوەی سوننەت لە هەموو شتێکدا، لەو باسانە مەسەلەی هاوسەرگیرییە.

**﴿٥٧﴾ نوسەر دەڵێت: (ولا يحل دم امرئ مسلم يشهد أن لا اله الا الله ويشهد أن محمدا عبده ورسوله إلا بإحدى ثلاث: زنا بعد إحصان أو مرتد بعد إيمان أو قتل نفسا مؤمنة بغير حق فيقتل به، وما سوى ذلك فدم المسلم على المسلم حرام أبدا حتى تقوم الساعة).**

**واتە: خوێنی هیچ موسڵمانێك -شایەتی دابێت هیچ خوایەك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت و (محمد) بەندەو پێغەمبەری ئەوە - حەڵاڵ نییە، ئیللا بەیەكێك لەم سێ خاڵە نەبێت:- زینا بكات لەپاش ئەوەی ژنی هێنابێ (یان شووی كردبێ) یان لەدینەكەی هەڵگەڕێتەوە پاش ئەوەی ئیمانی هێنابێ یان كەسێكی ئیمانداری بەناحەق كوشتبێ بۆیە بەهۆی ئەوەوە دەكوژرێ، جگە لەوانە ئەوا خوێنی موسڵمان بۆ موسڵمان حەرامە تاكو ڕۆژی دوایی.**

**ڕاڤە:**

**مەسەلەی كوشتنی موسڵمانی لەپاش مەسەلەی هاوسەرگیری باس كردوە، چونكە ئیسلام هاتوە بۆ پاراستنی ناموس و پاراستنی خوێن و پاراستنی سەروەت و سامان، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت:** (إن دماءكم وأموالكم وأعراضكم عليكم حرام)[149] **واتە: خوێن و سامان و ناموستان حەرامە لەیەكتر) دەفەرموێت:** (كل المسلم على المسلم حرام، دمه وماله وعرضه)[150] **واتە: هەموو موسڵمانێك خوێن و سامان و ناموسەكەی حەرامە لەسەر موسڵمانان) كاتێ لەپێشدا باسی ناموسی كرد بەوەی پەیوەندی ها بە هاوسەرگیری و تەڵاقەوە ئەمجار دەستی كرد بەباسكردنی خوێنەكان.**

---

١٤٩ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٦٧) ومسلم (١٦٧٩) .

١٥٠ / أخرجه مسلم (٢٥٦٤) .

جا هەرموسڵمانێك ئەگەر شایەتی دا هیچ خوایەکی بەحەق نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێت و (محمد) (ﷺ) پێغەمبەری ئەوە ئەوا خوێن و سامانی حەرام دەبێت، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (أمرت أن أقاتل الناس حتى يقولوا: لا إله إلا الله فإذا قالوها عصموا مني دماءهم وأموالهم إلا بحق الاسلام وحسابهم على الله تعالى)[١٥١] واتە: فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵکیدا بجەنگم تاکو دەڵێن: (لا اله الا الله) جا ئەگەر ئەوەیان گووت ئەوا خوێن و سامانیان پارێزراو دەبێت (لێم حەرام دەبێت) ئیللا بەحەقی ئیسلام نەبێ و لێپرسینەوەو حیسابیان لەسەر خوایە).

جا هەر کەسێك ئیسلامبوونی خۆی ئاشکراکردو شایەتمانی هێنا ئەوا ئێمە لێی وەردەگرین و بەموسڵمانی دەزانین و حوکمەکانی موسڵمانانی بەسەردا جێ بەجێ دەکەین، جا ئەگەر لەدڵیدا نیفاقێك (دووڕوویيەك) هەبێت ئەوا لەنێوان خۆی و خوادایە، خوای گەورە خۆی لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکات، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئیسلامبوونی دووڕووەکانی وەرگرت، حوکمە ئاشکراکانی بەسەردا جێ بەجێ دەکرد.

بەڵام ئەگەر کەسێك هەڵوەشێنەرەوەیەك لە هەڵوەشێنەروەکانی ئیسلامی ئەنجامدا ئەوا ئەو کاتە حوکمی هەڵگەڕانەوەی بەسەردا دەدەین، ئەگەر تەوبەی کرد ئەوا باشە ئەگەر نا دەکوژرێت، بەمەبەستی پاراستنی دینەکە، ئەمە یەکەم شتە بەهۆیەوە خوێنی موسڵمانان حەڵاڵ دەبێت.

دووەم شت لەوانەی خوێنی موسڵمان حەڵاڵ دەکات: (القصاص) واتە: کوشتنی نەفسێك لەبەر نەفسێك، خوای گەورە دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالْأُنْثَى بِالْأُنْثَى فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ ذَلِكَ تَخْفِيفٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ فَمَنِ اعْتَدَى بَعْدَ ذَلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ

---

١٥١ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٢٥) ومسلم (٢٢) .

أَلِيمٌ (١٧٨) وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ (١٧٩)البقرة) واتـە: ئـەی ئەوانەی باوەڕدارن! لـەبارەی کوژراوانـەوە، بەشـێوەیەکی دادگەرانـەو یەکسانی و بـێ دەستدرێژیو زیادەڕەوی (قیساس) و تۆڵەمان لەسەر داناون ئازاد لەباتی ئازاد، بەنـدە لەباتی بەندە، مێینە لەباتی مێینە ئینجا هەر کەسیش لەلایەن برای هاودینی خۆیـەوە، واتە لەلایەن کەس و کاری کوژراوەوە چاوپۆشـی لێکرا (لەکوشـتنەوە)و بـەخوێن ڕازی بوو دەبا خوێن وەرگرەکە ڕێی چاکە بگرێتە بـەرو و لایـەنی بکوژەکـەش بەجوامێرانـەو مەردانە خوێن بەکەس و کاری کوژراوەکـە بـدەن دوای ئـەم خـوێن گـرتن و لێ بووردنـە، هەر کەسێك دەست درێژی کردبۆ سەر خوێندەرەکان سـزایەکی ئـێش پێکەیەنـەری بـۆ هەیـە(١٧٨) ئـەی خاوەنـانی فـام و ژیـری! لـەم تۆڵـە وەرگرتنـەوەدا ژیـانی خـۆش و مەزنتان هەیە، واتە: ئەم یاسایە دەبێتە مایەی مانەوەی ژیانی مرۆڤ و خۆ دورگـرتن لـە کوشت و کوشتار چونکە کابرای بکـوژ بزانـێ کەسـێ بکـوژێ دەکوژرێتـەوە ئـیتر دەس درێژی بۆ سەر گیانی ئەم و ئەو ناکات، بەڵکو لە بەر ئەو یاسایە لـە سـنوورەکانی خـوا خۆبپارێزن ئاسوودەیی و بـەختیاری بـۆ وڵات و ناوچـەکەتان بگەڕێتـەوەو خـوێن ڕێـژی نەکرێ (١٧٩).

(القصاص) دەبێتە هۆی ژیان _هەرچەندە لەخودی خۆیدا کوشتنە_ چونکە کەسی بکوژ ئەگەر زانی دەکوژرێتەوە ئەوا واز لەکوشتن دەهێنـێ، هـەروەها خـەڵکیش ئەگـەر بینییان ئەوا بکوژ دەکوژرێتەوە واز لەکوشتن دەهێنن بۆیە چیتر خوێنڕێـژی و کوشـتن نامێنێ.

جا بۆیە (القصاص) هۆی مانەوەی ژیانە، هەرچەندە تاوانباری تێدا دەکوژرێتـەوە، کەواتە ئەوە کوشتنێکە دەبێتە هۆی ژیانی ئەوانیتر لەکۆمـەڵگادا، تەعـەداکردن لەسـەر خوێنەکان کـەم دەبێتـەوە، بـەڵام ئەگـەر واز لـە بکـوژ بهێنرێـت و بڵـێن: ئەمـە لەگـەڵ مافەکانی مرۆڤدا ناگونجێ و وازی لێ بهێنرێت و نـەکوژرێت، ئەمـە دەبێتـە هـۆی خـوێن

ڕشتن‌و تێکچوونی ئاسایش و ترساندنی خەڵکی، دەبێتە هۆی چەندین خراپەکاری و(مفسدە)و کوشتن زۆر دەبێت و خوێن دەرێژرێت، تەنانەت لە سەردەمی نەفامیدا دەیانگوت: کوشتن کوشتن ناهێڵێ، کوشتنی کەسی تاوانبار دەبێتە هۆی نەهێشتنی کوشتن لە ئایندەدا، لەم ئایەتەشدا هاتووە: (وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ)

ئەوانەی دەڵێن: کوشتن لەجیاتی کوشتنی کەسێکی تر لەگەڵ مافەکانی مرۆڤدا ناگونجێ، ئەوا پێیان دەڵێین: ئایە کوژراوەکەش مرۆڤ نییە؟ جا لە (قصاص) دا پاراستنی مافی ئەوی تێدایە.

سێیەم کۆمەڵ خوێنیان حەڵاڵ دەبێت: (الثيب الزانى) (الثيب) ئەو کەسەیە ژنی هێناوەو گواستویەتییەوە بە هاوسەرگیرییەکی تەواو (نکاح صحيح)، جا ئەگەر ئەو کەسە زینای کرد ئەوا بەرد باران دەکرێت تاکو دەمرێت، بەو شێوەیە خوێنی حەڵاڵ دەبێت.

ئەمە ئەو هۆکارانەیە خوێنی موسڵمانی پێ حەڵاڵ دەبێ:-

یان (القصاص) کەسێك لەبەر کەسێکی تر بکوژرێت...

یان کەسێك زینا بکات لەپاش ئەوەی هاوسەرگیری کردوە...

یان کەسێك لەدینەکەی هەڵگەڕێتەوە یەکێك لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام ئەنجام بدات: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (من بدَّل دينه فأقتلوه)[152] واتە: هەرکەسێك دینەکەی خۆی گۆڕی ئەوا بیکوژن) لە فەرموودەیەکدا هاتوە: (والتارك لدينه

١٥٢ / اخرجه البخاري (٢٨٥٤) .

المفارق للجماعة)[١٥٣] واتە: ئەوەی واز لەدینەکەی دەهێنێ و لەکۆمەڵی موسڵمانان جیا دەبێتەوە).

لەمەشدا بەڵگەیەك هەیە لەسەر ئەو کەسانەی نکۆڵی لەحەددی هەڵگەڕانەوە دەکەن بەبەڵگەی ئەو ئایەتەی دەفەرموێ (لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ) البقرة /٢٥٦) ئەم بەڵگە هێنانەوە هەڵەیە، چونکە کوشتنی کەسی هەڵگەڕاوە مەبەست لێی ئەوە نییە خەڵکی بەزۆر بکرێنە موسڵمان، بەڵکو مەبەست لێی پاراستنی دینە لە یاری کردن تێیدا بۆ کەسێك بە ویستی خۆی هاتۆتە ناو ئیسلامەوەو پاشان وازی لێ هێنا لەپاش ئەوەی شایەتی داوەو زانیویەتی دینەکە حەقە.

مەبەست لە: (ولا يحل دم امرئ مسلم يشهد أن لا اله الا الله).

موسڵمان ئەو کەسەیە شایەتمانی هێناوەو گوتویەتی: (لا اله الا الله، محمد رسول الله) بەڵام لەگەڵ شایەتماندا دەبێ کاری هەبێ:- نوێژ بکات و زەکات بدات و مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بێت و حەجیماڵی خوا بکات ئەگەر بتوانێت، پێویستە کاری هەبێت.

مەبەست لە: (وما سوى ذلك فدم المسلم على المسلم حرام أبدا حتى تقوم الساعة).

خوێنی موسڵمان لەسەر موسڵمان حەرامە، هەرگیز هیچ کاتێك نایەت خوێنی موسڵمان حەڵاڵ بێت، ئیللا مەگەر تەعەدا بکات و یان چووە سەر ماڵی خەڵکی یان ڕێگای لەخەڵکی بڕی یان دەرچوو دژایەتی کاربەدەستانی کرد یان جگە لەوانە ئەوا دەکوژرێت بۆ نەهێشتنی خراپەی، ئەگەر خراپەی پاڵ نەنرێت و نەهێڵرێت ئیللا بەکوشتنی نەبێت.

---

١٥٣ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٦٤٨٤) ومسلم (١٦٧٦) .

**﴿٥٨﴾ نوسەر دەڵێت: (وكل شيء مما أوجب الله عليه الفناء يفنى إلا الجنة والنار والعرش والكرسي والصور والقلم واللوح ليس يفنى شيء من هذا أبدا، ثم يبعث الله الخلق على ما أماتهم عليه يوم القيامة ويحاسبهم بما شاء فريق في الجنة وفريق في السعير ويقول لسائر الخلق ممن لم يخلق للبقاء: كونوا ترابا).**

واتە: هەموو شتێك خوای گەورە پێویستی كردوە لەسەری بەنەمان ئەوا نامێنێ ئیللا بەهەشت و دۆزەخ و عەرش و كورسی و كەڕەنا (صور) و قەڵەم و لەوح نەبێ، ئەوا هیچ لەوانە هەرگیز فەنایان بەسەردا نایات، ئەمجار خوای گەورە خەڵكی زیندوو دەكاتەوە لەسەر ئەوەی لەسەری مردوونە لەڕۆژی قیامەتدا بەوەی خۆی ویستی لەسەر بێت لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەكات، كۆمەڵێك بۆ بەهەشت و كۆمەڵێك بۆ دۆزەخ، پاشان بەهەموو دروستكراوەكان _ ئەوانەی بەمەبەستی مانەوە دروست نەكراون _ دەگوترێت: ببنە خاك و خۆڵ.

**ڕاڤە/**

مەبەست لە: (وكل شيء مما أوجب الله عليه الفناء يفنى).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ (٢٦) وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ (٢٧)﴾ الرحمن) واتە: هەرچی بە سەر پشتی زەوییەوەیە هەر هەموو لە نێو دەچێ (٢٦) وە تەنها رووی پەروەردگاری خاوەن شكۆ و كەرەمكەرت دەمێنێتەوە(٢٧).

هـەموو دروسـتكراوەكان لەناودەچـن و نـامێنن تـەنها خـوای گـەورە دەمێنـێ، لـەو ئایەتـەدا كـە دەفـەرموێت: (كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ) آل عمران / ١٨٥) واتـە: هـەموو كەسێك بێ جیاوازی تامی مردن دەچێژێ).

ئەو ئایەتە كـە دەفـەرموێ: (وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَنْ شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنْظُرُونَ (٦٨) الزمر) واتـە: هەركـە لەلایـەن (ئیسرافیلەوە) فـوو بەشـەیپوور كـرا ئـیتر ئـەو كاتـە هـەموو ئەوانـەی لەئاسمانـەكان و زەویدان مەگەر كەسێك خوا خۆی بیەوێ نـەمرێ، لەپاشـان بـۆ جـارێكی تـر كـە فـووی پیاكرا ئەوجا لەناكاو تەواوی دروستكراوەكان لەگۆڕەكانیاندا هەڵئەسنەوەو چـاوەڕوانن چییان پێ بكرێ).

مانـای (إِلَّا مَنْ شَاءَ اللَّهُ) دەڵـێن: ماناكـەی: فریـشتەكانە یـان (حـور العـین)ەكـانی بەهەشتە [١٥٤]، والله أعلم.

هەموو خەڵكی دەمـرن ئـەمجار لـەڕۆژی قیامەتـدا زینـدوو دەكرێنـەوە (ثُمَّ إِنَّكُمْ بَعْدَ ذَلِكَ لَمَيِّتُونَ (١٥) ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ تُبْعَثُونَ (١٦) المؤمنون) واتە: پاشـان بەڕاسـتی دوای ئەو هەموو ژیان و بڕینی قۆناغانە ئێوە گشت ئەمرن(١٥)دوایە بۆ جارێكی تر هەر ئێـوە لەڕۆژی قیامەتدا زیندوو دەكرینەوەو گیان دەكرێتەوە بەبەرتانا (١٦).

جا كەسی موسڵمان بیری مردن دەكاتەوەو خۆی بـۆ ئامـادە دەكـات بەئەنجامـدانی كاری چـاكەو داوا لـەخوا دەكـات ئـاخر خـەیری بكـات و لەتاوانـەكانی تەوبـە دەكـات، ئەمەش سوودی یادكردنی مردنە، ئەگەر ئەو یـادی مردنـی كـرد ئـەوا خـۆی بـۆ ئامـادە دەكات، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (تذكروا هاذم اللذات: الموت فإنكم لا تذكرونه في كثير إلا قلله ولا في قليل إلا كثره)[١٥٥] واتـە: یـادی ڕوخێنـەرو هـۆی نەهێـشتنی

---

١٥٤ / ذكره البغوي في تفسيره (٤٣٢/٣) عن الضحاك .

١٥٥ / رواه احمد والترمذي وابن ماجه والنسائي وابن حبان .

خۆشییەکان بکەنەوە: مردن، چونکە ئێوە هەرگیز یادی ناکەنەوە لەشتێکی زۆردا ئیللا کەمی دەکاتەوەو لەشتێکی کەمدا یادی ناکەن ئیللا زۆری دەکاتەوە) بۆیە پێویستە موسڵمان هەرگیز لەمردن بێ ئاگا نەبێ، بەڵکو دەبێ هەرگیز مردنی لەیاد بێت و خۆی بۆ ئامادە بکات.

باوەڕی بەزیندووبوەنەوە هەبێت، ئەو ڕۆژەی خەڵکی لە گۆڕەکانیان ڕاست دەبنەوە بەفەرمانی خوای گەورە: ﴿ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنْظُرُونَ (٦٨) الزمر﴾ ڕوحەکانیان بۆ دەگێڕێتەوە، لەپاش گەڕانەوەی جەستەکانیان لە گۆڕەکانیان، ئەمجار هەموویان بەرەو مەحشەر دەبرێن، تا کۆتایی ئەوەی تووشی دەبن لەدوا ڕۆژدا لەمەترسییەکان پێیدا تێدەپەڕن، تاکو ئەو کاتەی تێیدا جێگر دەبن یان لە بەهەشتدا و یان لەئاگردا، چونکە بەهەشت و ئاگر هەردوو ماڵی جێگیر بونن.

مەبەست لە: (إلا الجنة والنار والعرش والكرسي).

بەهەشتو دۆزەخ هەرگیز لەناو ناچن و فەنایان بەسەردا نایەت، خوای گەورە دروستی کردوون بۆ ئەوەی بمێننەوە، بەڵام زەوی و ئاسمانەکان ئەوا دەگۆڕدرێن، ئاسمانەکان لەیەك دەترازێنو لەتوپەت دەبن، زەویش قاژقاژ دەبێ، ئەم جیهانە دەگۆڕدرێت: ﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ الْأَرْضُ غَيْرَ الْأَرْضِ وَالسَّمَاوَاتُ وَبَرَزُوا لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ (٤٨) ابراهيم﴾ واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا ئەم زەوییەی ئێستایە ئەگۆڕدرێ بە زەوییەکی تر، ئاسمانەکانیش هەروا! ئەوجا هەموان لە گۆڕەکانیان دەهێنرێنە دەرو دەبرێن بۆ بەردەست خوای تاك و تەنیای دەسەڵاتدار، لە دەشتێکی کاکی بە کاکیدا دەنوێنرێن بێ ئەوەی پەردەیەك لە نێوانیاندا بێت).

بەڵام عەرش ناگۆڕدرێت و بەهەشت و دۆزەخ هەرگیز فەنایان بەسەردا نایەت و ناگۆڕدرێت.

مەبەست لە: (والكرسي).

(كورسی) لەعەرش بچووكترەو عەرش لەو گەورەترە، كورسی هەموو زەوی‌و ئاسمانەكان دەگرێتەوەو عەرش لە كورسی فراوانترە.

مەبەست لە: (والصور).

صور: بریتییە لە كەڕەنا كە (ئیسرافیل) هەڵیگرتوە، فووی پێدا دەكات بەڕوحەكان بۆیە بەئیزنی خوای گەورە ڕوحەكان دەچنە جەستەكانەوەو زیندوو دەبنەوە: (ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنْظُرُونَ (٦٨) الزمر) واتە: لەپاشان بۆ جارێكی تر كە فووی پیا كرا ئەوجا لەناكاو تەواوی دروستكراوەكان لەگۆڕەكانیاندا هەڵئەسنەوەو چاوەڕوانن چییان پیێ بكرێ).

مەبەست لە: (والقلم واللوح).

مەبەست لە (اللوح): (لوح المحفوظ)ـە، مەبەست لە: (القلم) ئەو قەڵەمەیە خوای گەورە (المقادیر)ی پیێ نووسیوە.

مەبەست لە: (ليس يفنى شيء من هذا أبدا).

ئەم شتانە خوای گەورە دروستی كردووە بە مەبەستی مانەوەیان، عەرش و كورسی[١٥٦] و (اللوح)و قەڵەم و بەهەشت و دۆزەخ و ڕۆحەكان ئەگەر دروستكران ئەوا فەنایان بەسەردا نایەت و لەناو ناچن.

مەبەست لە: (ثم يبعث الله الخلق على ما أماتهم عليه يوم القيامة).

واتە: لەسەر ئەوەی لەسەری مردوون، لە سەر كوفر یان لەسەر ئیمان، هەموان بەپێی كارو كردەوەی خۆی زیندوو دەكرێتەوە.

---

١٥٦ / روي عن أبي حاتم في تفسيره (٣٠٢٨/٩) .

باوەڕبوون بەزیندووبونەوە یەكێكە لە شەش پایەكانی ئیمان، لەزۆر ئایەتدا باوەڕبوون بەڕۆژی دوایی لەگەڵ باوەڕبوون بەخوای گەورە هاتووە.

زیندووبوونەوە (البعث) بریتییە لە: زیندووكردنەوەی خەڵكی لەپاش مردنیان، لەجیهانێكی تردا لەدونیادا دەژین بەمەبەستی كاركردن، پاشان دەمرن و لەزەویدا دەنێژرێن و لەوێدا دەمێننەوە تاكو خوای گەورە خۆی ویستی لەسەر بێت لەجێگای چاوەڕوانی كە ئەویش بەرزەخە، لە نێوان دونیاو دوا ڕۆژدایە، ئەمجار لەم گۆڕانە زیندوو دەكرێنەوە، هەڵدەستن لەو گۆڕانە بەزیندوویی هەروەكو چۆن بوون ئاوا، هیچ شتێكیان لێ بزر نابێت، ئەمجار ڕۆحەكانیان دەگەڕێتەوە بۆ جەستەكانیان ئەمجار بەرەو مەحشەر بەڕێ دەكرێن بۆ ئەوەی پاداشتی ئەو كارانەیان بدرێتەوە لەدونیادا ئەنجامیان دابوو، لەچاكەو خراپە، (وَلَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ (٥٤) یس) واتە: پاداشە تۆڵەی ئەوە نەبێ كردووتانە، پاداش نادرێنەوە).

جا هیچ كەسێك پاداشتی چاكەی نادرێتەوە بەكردەوەی كەسێكی تر یان سزا بدرێت بەكردەوەی كەسێكی تر، (وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى) الأنعام) واتە: هیچ كەسێك باری گوناهی هیچ كەسێكی تر هەڵناگری).

هەموو كەسێك پاداشتی كارەكەی خۆی وەردەگرێت چ چاكە بێت یان خراپە، ئەمەش دادپەروەرییە لەلایەن خوای گەورەوە، بەبێ پاداشت بەجێیان ناهێڵێ لەكاتێكدا خۆیان ماندوو كردووە _پەنا بەخوا _ بەكوفرو شیرك و(فسق)و فەسادكردن لەزەویدا ئەگەر لە بێ باوەڕان بووبن، جێیان ناهێڵێ بەبێ سزا، ئەمە دادپەروەری خودایە، ئەمە مانای قسەكەیەتی لێرەدا:– هەموو كەسێك بەپێی كردەوەی خۆی پاداشت دەدرێتەوە، جا ئەگەر وابێت ئەوا پێویستە لەسەر بەندە تەماشای كارەكەی بكات، تاكو لەژیاندا ماوەو زیندووە، جا ئەوەی چاكەیە با بیكاتە توێشوی خۆی،

ئەوەی خراپەیە با تەوبەی لێ بکات و بگەڕێتەوە بۆلای خواو خۆی لێ ڕزگار بکات تاکو لەتوانایدایە، خوای گەورە دەفەرموێت (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَلْتَنْظُرْ نَفْسٌ مَا قَدَّمَتْ لِغَدٍ)الحشر /١٨) واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ! پارێز لە خوا بکەن بە جێبەجێکردنی فەرمانەکانیو دوورگرتن لە قەدەغەکراوەکان و هەر کەس سەرنج بداو بزانێ چ شتێکی بۆ سبەینی (قیامەت) پێش خستووە لە کردەوەی چاك؟).

لێپرسینەوەی خۆت بکە لەم دونیایە پێش لێپرسینەوەی دوارۆژ، لێپرسنەوەی خۆت بکە لەسەر کردەوەکانت و تەماشایان بکە جا ئەوەی خراپە چاکی بکەرەوە، ئەوەی چاکەیە زیاتری بکەو لەغەفڵەت و بێ ئاگایی بەخەبەر بێرەوە، ئەمە پێویستە لەسەر کەسی ژیر.

بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (الكيِّس من دان نفسه وعمل لما بعد الموت والعاجز من أتبع نفسه هواها وتمنى على الله الأماني)

(الكيِّس) واتە: ژیر، (من دان نفسه) واتە: ئەو کەسەیە لێپرسینەوەی خۆی دەکات، (وعمل لما بعد الموت) ئەمە کەسی ژیرە (والعاجز من أتبع نفسه هواها) لەم دونیایەدا (وتمنى على الله الأماني)[157] بەهەشتی دەوێ و دەربازبوونی دەوێ هیچ کارێك ناکات ئەمە کەسێکی بێ دەسەڵاتە (عاجز)ە _ پەنا بەخوا _ واتە بێ تواناو بێ دەسەڵاتە، بێ تواناو دەسەڵاتییەکی خراپی نەك ئەو بێ توانایەی ناتوانێت کارێك بکات چونکە ئەوە لێی ناگیرێ: (لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا)البقرة/٢٨٦) واتە: خوای گەورە بەدەر لەتوانا تەکلیف و ئەرکێ ناخاتە سەرشانی هیچ کەسێك).

بەڵام ئەویتر بەتوانایەو دەتوانێ بەڵام بێ دەسەڵاتە لەبەر تەمبەڵیو گوێ پێ نەدان، ئەمە کەسی بێ تواناو بێ دەسەڵاتە، لەگەڵ ئەوەشدا خۆزگە دەخوازێو

١٥٧ / رواه أحمد والترمذي وابن ماجه والحاكم والبغوي وغيرهم وصححه الحاكم وحسنه البغوي والترمذي .

چاوەڕوانە لەدواڕۆژدا ببێتە کەسێکی ئەهلی بەهەشت بەبێ کاروکردەوە، نابێت و ناکرێت ئەمە ببێتە ئەهلی بەهەشت بەبێ کاروکردەوە.

مەبەست لە: (ويحاسبهم بما شاء فريق في الجنة وفريق في السعير).

لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکات لەسەر کاروکردەوەیان، (الحساب) بریتییە لە لێپرسینەوە لەسەر کردەوەکان.

جا خەڵکی چەند بەشێکن:-

* هەندێ لەئیمانداران لێپرسینەوەیان لەگەڵدا ناکرێتو دەچنە بەهەشتەوە بەبێ هیچ لێپرسینەوەو سزایەك.

* هەندێکیان: لێپرسینەوەیەکی سووکیان لەگەڵدا دەکرێت ئەویش بریتییە لە (العرض).

* هەندێکیان لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت و (من نوقش الحساب عُذب)[١٥٨] _پەنا بەخوا _

* کەسی بێ باوەڕ لێپرسینەوەی (موازنە)ی لەگەڵدا ناکرێت بەڵکو لێپرسینەوەی (تقرير)ی لەگەڵدا دەکرێ – واتە: دان پێدانان- بەوەی تەماشای کردەوەو کوفرو شیرکەکەی خۆی بکات و دانی پێدا بناتو ناشتوانێ نکۆڵی لێ بکات هەرگیز، ئەمجار بەرەو ئاگر ڕەوانە دەکرێت.

مەبەست لە: (فريق في الجنة وفريق في السعير) ئەمە لەو ئایەتەوە وەرگیراوە کە دەفەرموێت: (وَتُنْذِرَ يَوْمَ الْجَمْعِ لَا رَيْبَ فِيهِ) الشورى/٧) (فَرِيقٌ فِي الْجَنَّةِ) ئەوانیش ئیماندارانن (وَفَرِيقٌ فِي السَّعِيرِ) ئەوانیش بێ باوەڕو تاغوتەکانن.

---

١٥٨ / رواه البخاري (١٠٣) ومسلم (٢٨٧٦) .

مەبەست لە: (ويقول لسائر الخلق ممن لم يخلق للبقاء: كونوا ترابا).

خوای گەورە هەموو دروستکراوەکان زیندوو دەکاتەوە لەڕۆژی قیامەتدا مرۆڤەکانو گیانلەبەرانو باڵندەکان (وَمَا مِنْ دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّا أُمَمٌ أَمْثَالُكُمْ مَا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِنْ شَيْءٍ ثُمَّ إِلَى رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ (٣٨) الأنعام) واتــە: گــشت ڕەوکــەرو گیانلەبەرێکی ئەم زەوییە هەموو باڵندەیەکیش کە بە دوو باڵان دەفڕێ هــەموو ئەمانــە چەند ئوممــەتێکن وەکــو ئێــوە دروســتکراوی خۆمــانن‌و یاســای تایبــەتیمان دانــاوە بــۆ ژیانیان و موحتاجمانن لە هیچ شتێك کەمتەرخەمیمان نەکردووە لــە (لــوح المحفــوظ) دا لە پاشــانیش هــەموو بــۆ لای پــەروەردگاریان کــۆ دەکرێنــەوەو توێژینــەوەیان لــە گــەڵ دەکرێ و پاداش و تۆڵە وەردگرنەوە).

خــوای گــەورە دەفــەرموێت: (وَإِذَا الْوُحُوشُ حُشِرَتْ (٥) التكوير) واتــە: کــاتێ گیانلەبەرانی کێوی کۆکرانەوە پاش ئەوە کە لە ترسی یەکتر نــەیان ئــەوێرا بــە یەکــەوە بژین).

هەموو دروستکراوەکان حەشر دەکرێن بەمەبەستی جێ بــەجێ کردنــی دادپــەروەری لەنێوانیاندا، تاکو حەقی یــەکتر لەیــەکتر دەسێننەوە، تەنانــەت وڵاخ و گیانلەبــەرانیش حەقی یەکتر لەیەکتر دەسێننەوە حەقی مەڕی بێ شاخ لەمەڕی شاخدار دەسێنرێتەوە هەروەکو لەفەرموودەیەکی (صحیح)[١٥٩] دا هاتوە، پاشان کەحەقیان لەیەکتر ســەندەوە ئەوا خوای گەورە پێیان دەڵێت: ببنە خاك وخۆل، چونکە ئەوانە زیندوو نەکراونەتــەوە بــۆ ئــەوەی لــەدوا ڕۆژدا بمێننــەوە، بــەڵکو زینــدوو کرانــەوە تــەنها پاداشــتی خۆیــان وەرگرنەوە، ئەمــەش لەدادپــەروەری خــوای گەورەیــە، ئــا لــەو کاتــەدا کەســی بێبــاوەڕ دەڵێت: (يَا لَيْتَنِي كُنْتُ تُرَابًا (٤٠)النبأ). ئەگەر بە ئاژەڵ و گیانلەبەران وتــرا: ببنــە خــاك و خۆڵ ئەوا بێ باوەڕیش خۆزگە بەوان دەخوازێت.

---

١٥٩ / رواه مسلم (٢٥٨٣) .

**﴿٥٩﴾ نوسەر دەڵێت: (والإيمان بالقصاص يوم القيامة بين الخلق كلهم بني آدم والسباع والهوام حتى للذرة من الذرة حتى يأخذ الله عز و جل لبعضهم من بعض لأهل الجنة من أهل النار ولأهل النار من أهل الجنة ولأهل الجنة بعضهم من بعض ولأهل النار بعضهم من بعض).**

واتە: باوەڕبوون بە (القصاص) لەڕۆژی قیامەتدا لەنێوان هەموو دروستکراوەکاندا، مرۆڤەکان ودڕندەکانو جڕو جانەوەرو تەنانەت مێرولەیەك لەمێرولەیەکی تر، تاکو خوای گەورە حەقیان لە یەکتر وەردەگرێتەوە، بۆ ئەهلی بەهەشت لەئەهلی ئاگر، بۆ ئەهلی ئاگر لەئەهلی بەهەشت، بۆ ئەهلی بەهەشت لە یەکتر و بۆ ئەهلی ئاگر لەیەکتر.

ڕاڤە/

لەپێشدا باسکرا خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا دروستکراوەکان زیندوودەکاتەوە بەمەبەستی پاداشت دانەوەیان لەسەر چاکەو خراپەیان بەنیسبەت مرۆڤەکانەوە، بۆ (القصاص) بەنیسبەت مرۆڤەکانەوەو ئاژەڵانەوە، ئاژەڵەکان زیندوو دەکرێنەوە تەنها بەمەبەستی (القصاص) و مرۆڤەکان زیندوو دەکرێنەوە بۆپاداشت و(القصاص) لەنێوان خۆیاندا.

مەبەست لە: (والإيمان بالقصاص يوم القيامة بين الخلق كلهم بني آدم والسباع والهوام).

هەموان بەمەبەستی (القصاص) زیندوو دەکرێنەوە، بەڵام گیانەوەران ئەگەر حەقی یەکتریان لەیەکتر سەندەوە ئەوا کارەکەیان تەواو دەبێتو دەبنە خاكو خۆڵ، بەڵام بەنی ئادەم ئەوا دوو کۆمەڵن: کۆمەڵێکیان لەبەهەشتدانو کۆمەڵێکیان لەئاگردان، هەرگیز لەپاش ئەوە نامرن، بەهەتا هەتایی دەمێننەوە یان لەبەهەشتدا و یان لەئاگردا.

مەبەست لە: (حتى للذرة من الذرة).

تەنانەت (الذرة) ش کە بریتییە لەمێرووڵەیەکی بچووك لەمێرووڵەیەکی بچووك حەق لەیەکتر دەسێننەوە، چونکە خوای گەورە هەرگیز بە ستەم رازی نییە، چونکە (أحكم الحاكمين)ـە هەر ئەوە حەکەمی دادپەروەر، بۆیە بە ستەم رازی نییە تەنانەت لەنێوان ئاژەڵانو مێرووەکاندا، ڕۆژی قیامەت زیندوویان دەکاتەوە ئەمجار حەقی هەندێکیان لەوانی تر دەکاتەوە.

بەڵام ئیمانداران یەکەم شتێك داوەری لەنێوانیاندا بکرێت لە ڕۆژی قیامەتدا (خوێنەکانە) لەمافەکانی خەڵکی، حەقی یەکتر لەیەکتر دەسێنرێتەوە لەپاش ئەوەی لەپردی (صراط) تێدەپەڕن و پێش ئەوەی بچنە بەهەشت، دەوەستێنرێنو حەقی یەکتر لەیەکتر دەسێنرێتەوە، جا ئەگەر پاك کرانەوە ئەوا ئیزنیان پێ دەدرێت بچنە بەهەشتەوە، چونکە هیچ کەسێك ناچێتە بەهەشت هەرگیز ئەگەر هەر حەقێکی لەسەر بێت، چونکە بەهەشتماڵی چاکەکارانە، هەرکەسێ چاك نەبێت ناچێتە بەهەشتەوە، ئەوانەی هیچ لێپرسینەوەیەکیان لەسەر نەماوە، هیچ حەقێکی کەسیان لەسەر نەماوە، هیچ تاوانێك، تەنانەت کەسی ئیمانداری سەرپێچیکار لەئاگردا سزا دەدرێت بەئەندازەی سەرپێچییەکەی یان خوای گەورە بەویستی خۆی لێی خۆش دەبێت: (إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ) النساء/٤٨) واتە: بێگومان هەرگیز خوا لە دانانی هاوبەش بۆی نابوورێ و لە خوار شیرکەوە لە هەر گوناهێك دەبوورێ بۆ هەر کەسێك خۆی بیەوێت).

ئەگەر ویستی لەسەر بێت ئەوا لێی خۆش دەبێتو ئەگەر ویستی لەسەر بێت سزای دەدات بەئەندازەی تاوانەکەی تاکو پاکی دەکاتەوە لەتاوان ئەمجار دەیخاتە بەهەشتەوە، بۆیە هیچ کەسێك ناچێتە بەهەشتەوە تەنها کەسی پاك نەبێت، یان بە (القصاص) و یان بەسزادان پاك دەکرێنەوە.

**مەبەست لە:** (حتى يأخذ الله عز و جل لبعضهم من بعض لأهل الجنة من أهل النار ولأهل النار من أهل الجنة).

**تەنانەت کەسی ئیمانداریش ئەگەر ستەمی لە بێباوەڕێك کرد ئەوا حەقی بێباوەڕەکە دەدرێتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا، بە پێچەوانەشەوە، کەسی بێباوەڕ ئەگەر ستەمی لە ئیماندارێك کردبێت ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا حەقی لێ دەسێنرێتەوە، بۆیە هیچ کەسێك نامێنێتەوە حەقی لا بێت، تەنانەت ئیمانداریش حەقی کەسی ئیمانداری لێ دەسێنرێتەوە.**

**﴿٦٠﴾ نوسەر دەڵێت: (وإخلاص العمل لله).**

**واتە: ئیخلاص‌و نیازپاكی لە كردەوەكاندا تەنها بۆ خوا بێت.**

**ڕاڤە:**

ئیخلاص‌و نیاز پاكی لە كردەوەكاندا تەنها بۆ خوا بریتییە لەوەی شیركی تێدا نەبێت، چونكە خوای گەورە هیچ كارێك وەرناگرێت ئیللا ئەوە نەبێت تەنها لە پێناوی ئەودا بێت و شیركی تێدا نەبێت، ئەمەش یەكێكە لە مەرجەكانی وەرگرتنی كارو كردەوەكان.

مەرجی دووەم: شوێنكەوتن‌و كاركردن بە سوننەت، بەوەی كارەكە لە گەڵ سوننەتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بگونجێ‌و بیدعە نەبێت، چونكە خوای گەورە بیدعە وەرناگرێت بەڵكو لەسەری سزا دەدات، جا ئەگەر هەر مرۆڤێك خۆی ماندوو بكات بە كارێكەوە نیازی خوا نەبێت تێیدا ئەوا وەكو تۆزو گەردی بڵاوەیان پێ دەكرێت، ئەگەر خۆی ماندوو بكات لە كارێكدا لە گەڵ سوننەتدا نەگونجێت ئەوا وەرناگیرێت، جا كردەوەكان وەرناگیرێن ئیللا بە بوونی ئەو دوو مەرجە نەبێت:

- نیاز پاكی بۆ خوا (الاخلاص).
- شوێنكەوتنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) (المتابعة).

(وَقَالُوا لَنْ يَدْخُلَ الْجَنَّةَ إِلَّا مَنْ كَانَ هُودًا أَوْ نَصَارَى تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ (١١١) بَلَى مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُ أَجْرُهُ عِنْدَ رَبِّهِ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ (١١٢)البقرة) واتە: جوولەكە وتیان: هیچ كەسێ _بێجگە لەجوولەكە _ ناچێتە بەهەشتەوە، گاورەكانیش هەر بەو جۆرە گوتیان: نەساراو عیسایی نەبێت كەسی تر ناڕواتە بەهەشتەوە ئەم قسەو باسانە بەهەمیشە ئاوات و خەیاڵ و پلاویانە تۆش پێیان بڵێ: دەسا ئەگەر ڕاست بێژن لە بۆچوونەكانتاندا بەڵگەكانتان بهێنن

(١١١) بەڵێ.. ڕاستییەکەی ئەمەیە: هەرکەسێك بەچاکی و بێخەوش خۆی بەدەست خواوە دابێ و ڕووی هەر لەخوابێ و لەفەرمانەکانی سەرپێچی نەکا و لەهەمان کاتدا چاکە خوازیش بێت ئەوە پاداشتی خۆی لای پەروەردگاری خۆی وەردەگرێ و مسۆگەرەو نەترس و بیمێکیان دەبێت لەقیامەتدا نەخەم و خەفەتیش دەخۆن بۆ دونیا (١١٢).

(مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ) واتە: لە ئەنجامدانی کارەکەیدا تەنها نییەتی خوا بێت (وَهُوَ مُحْسِنٌ) واتە: شوێنکەوتەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بێت لە هەموو کەسێك، لە جوولەکە لە گاور، لە هەموو خەڵکی، بەم دوو مەرجە:

نیاز پاکی و شوێنکەوتن (الاخلاص والمتابعة).

**﴿٦١﴾ نوسەر دەڵێت: (والرضى بقضاء الله). واتە: رازی بوون بە قەزای خوای گەورە.**

**ڕاڤە:**

مەبەست لە: (الرضى بقضاء الله) ئیمان هێنان بە قەزاو قەدەر یەکێکە لە شەش پایەکەی ئیمان (أن تؤمن بالله، وملائكته، وكتبه، ورسله، واليوم الآخر، وتؤمن بالقدر خيره وشره)[١٦٠].

ئەویش مانای ئەوەیە: باوەڕت وا بێت خوای گەورە تەقدیری شتەکانی کردوەو قەزای کردوە هەر لە ئەزەلەوەو لە (لوح المحفوظ)دا نوسیویەتیو دروستی کردوەو هێناویەتییە بوون بە ویستی خۆی، جا ئیمان بە قەزاو قەدەر چوار پلە لە خۆی دەگرێت:

<u>پلەی یەکەم:</u> پلەی زانستو زانیاری (العلم): ئەویش بریتییە لەوەی خوای گەورە دەربارەی شتەکانی زانیوە بە عیلمی خۆی هەر لە ئەزەلەوە پێش ئەوەی بێنە بوون.

<u>پلەی دووەم:</u> باوەڕ بەوەی خوای گەورە شتەکانی نوسیوە لە(اللوح المحفوظ)دا لەپێش دروست کردنیان، خوای گەورە دەفەرموێت: (مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنْفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ نَبْرَأَهَا إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ (٢٢) الحديد) واتە: هیچ بەڵاو نەهامەتیەکتان توشتان نابێت نە لەزەویداو نە لەخۆشتاندا مەگەر پێش ئەوە بەدی بێنین لە (لوح المحفوظ) دا تۆمارکراوە بەڕاستی ئەوەش بۆ خوا شتێکی ئاسانە).

<u>پلەی سێیەم:</u> باوەڕ بەوەی خوای گەورە خۆی دەیەوێو ویستی لەسەر ئەم ڕووداوانە بوە: کوفرو ئیمان، گوێڕایەڵی و سەرپێچی، خراپەو چاکە، خەیرو شەڕ،

---

١٦٠ / صحيح : سبق تخريجه .

هەموو ئەوانە خوای گەورە ویستی لێ بوو بەویستو ئیرادەیەکی کەونی، جا هیچ شتێك ئەگەر نەیەوێ لەموڵك ودەسەلآتی ئەودا ڕوو نادات، بەڵام ئەو خەیری ویستووەو ئیمانی ویستووەو شەڕی ویستوە لەبەر حیکمەتێكو لەبەر تاقیکردنەوە، جا خوای گەورە خەیری ویستووەو خۆشی دەوێ و پێی ڕازییەو شەڕی ویستووەو خۆشی ناوێ و پێی ڕازی نییە، بەڵام ویستوویەتی لەبەر حیکمەتو تاقیکردنەوە، چونکە ئەگەر تەنها خەیر بوایە ئەوا هیچ کەسێك تایبەتمەندیو جیاوازی نەدەبوو، تاقیکردنەوەش نەدەبوو، هەموو خەڵکیش دەبوونە چاکەکار، ئەگەر تەنها خراپە بوایە ئەوا هیچ کەسێك تایبەتمەندیو جیاوازی نەدەبوو بەکردنی چاکە، ئەمەش مانای ئەوەیە خوای گەورە بەندەکانی خۆی تاقیدەکاتەوە بۆ ئەوەی پاكو پیس دەرکەوێ ئیماندارو بێباوەڕ دەرکەوێ، ئەوەش تاقیکردنەوەیەکە خوای گەورە تاقییان دەکاتەوە، خوای گەورە ئەوانەی بەبێ هوودە دروست نەکردوە.

<u>پلەی چوارەم:</u> دروستکردنو هێنانەبوون، هەموو شتێك ڕوو دەدات ئەوا خوای گەورە خۆی دروستی کردوە، (فعل)و کاری بەندەکان دروستکراوی خودان لە هەمان کاتدا (فعل)و کاری بەندەکانن، ئەویش دروستکراوی خودان، خوای گەورە دەفەرموێت: (اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ (٦٢)الزمر) واتە: بەڕاستی خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکەو ئەو بەهەمو شتێکدا ڕادەگا، خۆی سەرپەرشتیکاری هەموو شتێك دەکا چۆن حیکمەتی بخوازێ).

دەفەرموێت: (وَهُوَ الْخَلَّاقُ الْعَلِيمُ (٨١) يس) واتە: هەرئەویشە دروستکارو زانیار).

دەفەرموێت: (وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ (٩٦) الصافات)

جا ئەوانە دروستکراوی خودان، لەهەمان کاتدا کارو (فعل)ی بەندەکانن و بەویستو هەڵبژاردەی خۆیان ئەنجامی دەدەن.

جا کەسی ئیماندار بڕوای بەم چوار پلەیە هەیە:

- زانست.
- نووسین.
- ویستو ئیرادە.
- دروستکردنو هێنانەبوون.

ئەمجار کەسی ئیماندار لەکاتی بەلاو موصیبەتدا ڕازی دەبێت بەقەزاو قەدەر، پەستو تووڕە نابێت، بەڵکو خۆی لەتووڕەبوون دەگرێتەوەو زمانی خۆی دەگرێتەوە لە شکایەت کردن بۆ لای جگە لە خوا، دەست خۆی دەگرێتەوە لەدادڕین و لەخۆدان، جا ئەمە ڕازی بوونە بەقەزاو قەدەر، دەزانێ کە: (ان ما أصابك لم يكن ليخطئك، وما أخطأك لم يكن ليصيبك)[١٦١] هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی، ئیمانی هیچ کەسێك تەواو نابێ بەبێ ئەمە.

---

١٦١ / رواه أحمد وأبو داود وابن ماجه وصححه ابن حبان .

**﴿٦٢﴾ نوسەر دەڵێت: (والصبر على حكم الله. والإيمان بأقدار الله كلها خيرها وشرها حلوها ومرها. والإيمان بما قال الله قد علم الله ما العباد عاملون والى ما هم صائرون لا يخرجون من علم الله ولا يكون في الأرضين والسماوات إلا ما علم الله تعالى).**

واتە: ئارامگرتن لەسەر حوکمی خوا. باوەڕبوون بەهەموو قەدەرەکانی خوای گەورە خەیرەکەی‌و شەڕەکەی، شیرینەکەی‌و تاڵەکەی. باوەڕبوون بەوەی خوای گەورە فەرموویەتی، خوای گەورە زانیویەتی بەندەکانی چی دەکەن‌و بەرەو کوێ دەڕۆن‌و لەزانینی خوا دەرناچن، لەزەوی‌و ئاسمانەکاندا هیچ شتێك ڕوو نادات ئیللا خوا زانیویەتی).

ڕاڤە:

ئەمە لەپێشدا باسکرا لەباسی پلەی یەکەم لەپلەکانی باوەڕ بەقەزاو قەدەر.

ئیحتجاج کردن بەقەزاو قەدەر لەو موصیبەتانەی مرۆڤ هەڵبژاردنی تێدا نییە ئەوا شتێکی باشە چونکە بەڵگەی ڕازی بوون‌و تەسلیم بوونە، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ (١٥٥) الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُمْ مُصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ (١٥٦) البقرة) واتە: ئەی موحەمەد(ﷺ)! بەوانە کە خۆڕاگرو بە ئارامن مژدە بدە (١٥٥) ئەوانەی کە تووشی هەر بەڵاو نەهامەتی و چورتمێك دەبن و خێرا دەڵێن: ئێمە هەر هی خواین و ئەو دروستی کردووین و دەرئەنجامیش لە قیاماتدا هەر بۆ لای ئەو دەچینەوە (١٥٦).

بەڵام ئیحتیجاج کردن بەقەزاو قەدەر لەسەر کاری خراپە کە هەڵبژاردن‌و کاری مرۆڤەکانە، ئەوا هیچ حوججەیەکیان نییە لەقەدەردا لەو شتانەدا، بەڵکو سزا دەدرێن

لەسەر ئەو کارەیانو لەسەر کەمتەرخەمییان، دەرگای تەوبەشی کراوەیە، جا لەجیاتی ئەوەی رکابەری خوا بکەیتو بڵێیت: بۆ بەم شێوە تەقدیرت لەسەرم کردوە؟ واز لەتەوبە دەهێنی _ئەمەش جۆرێکە لەجۆرەکانی بێ دەسەڵاتی نەخوازراو _ئەوا پەلە بکە لە تەوبەکردن و داوای لێخۆشبوون ولۆمەی خۆت بکە، ئەمە داواکراو و خوازراوە لەبەندەکان، تەماشای کارەکانی خۆی بکات (وَلْتَنْظُرْ نَفْسٌ مَا قَدَّمَتْ لِغَدٍ) الحشر/١٨) واتە: هەر کەس سەرنج بداو بزانێ چ شتێکی بۆ سبەینی(قیامەت) پێش خستووە لە کردەوەی چاك؟)

تەماشای کردەوەکانت بکە، دەتوانیت بیگۆڕیتو تەوبەی لێ بکەیت،داوای لێخۆشبوون بکەیت، بەڵام قەزاو قەدەر ئەوا کاری خودایە و کاری تۆ نییە.

مەبەست لە: (لا يخرجون من علم الله).

هەموو شتێك خوای گەورە پێی زانایە، ئاگای لێیەتی، ئەو زانایە بەکوفری کافرانو خراپەی خراپەکارانو ستەمی ستەمکاران، هیچ شتێکی لا شاراوە نییە، گوێڕایەڵی گوێڕایەڵان دەزانێو کاری گوێڕایەڵان دەزانێ، ئەمەو ئەوەش دەزانێ، بەڵام دوایان دەخات بۆ ئەوەی تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە، جا ئەگەر تەوبەیان کرد ئەوا باشە ئەگەر نا لێپرسینەوەیان لەپێشە، خوای گەورە هەرگیز فەرامۆشیان ناکات.

مەبەست لە: (ولایکون في الأرضينَ والسموات إلا ما علم الله).

ئەمە وەکو ئەوەی پێشە، هەموو شتێك خوای گەورە زانیویەتی، ئەوەی لەڕابردوودا بووەو ئەوەشی لەداهاتوودا دەبێ، هەموو لێی بەئاگایەو هیچ شتێکی لێ ناشاردرێتەوە، زانیویەتیو تەقدیری کردوەو نوسیویەتیو ویستی لەسەر بووەو ئیرادەی بووەو دروستی کردوە.

**نوسەر دەڵێت:** (وتعلم أن ما أصابك لم يكن ليخطئك وما أخطأك لم يكن ليصيبك، ولا خالق مع الله عز و جل).

**واتە/ بزانە ئەوەی تووشی تۆ بوە نەئەبوایە لێت لایبدایەو تووشت نەبوایە، ئەوەی تووشت نەبوو نەئەبوایە تووشت ببێت.**

**هەروەها هیچ دروستکارێك لەگەڵ خوادا نییە.**

**ڕاڤە:**

**ئەمە دەقی فەرموودەیەکە، هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە (ئیبن عەبباس)ی فەرموو:** (واعلم أن ما أخطأك لم يكن ليصيبك وما أصابك لم يكن ليخطئك)[١٦٢].

(ما أخطأك لم يكن ليصيبك) **ئەگەر سووریش بووی لەسەری و دەتویست بەلام تووشت نەبوو، ئەوا بزانە خوای گەورە تەقدیری نەبووە بۆت،** (وما أصابك لم يكن ليخطئك) **مەڵێ: ئەگەر ئەو کارەم بکردایە ئەوا تووشم نەدەبوو.**

**مەبەست لە:** (ولا خالق مع الله).

**ئەمە پەیوەستە بە پلەکانی قەزاو قەدەرەوە، ئەمەش ڕەددی ئەو کەسانە دەداتەوە کەدەڵێن بەندە (فعل)و کاری خۆی دروست دەکات، جا خوای گەورە خۆی تەنها دروستکارە، هیچ کەسێك لەگەڵ ئەودا دروست ناکات، هەموو شتێك تەنها لە دروستکراوی خوای تاكو تەنهایە، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێ:** (قُلْ أَرَأَيْتُمْ مَا تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُوا مِنَ الْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِي السَّمَاوَاتِ ائْتُونِي بِكِتَابٍ مِنْ قَبْلِ هَذَا أَوْ أَثَارَةٍ مِنْ عِلْمٍ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ (٤) الأحقاف) **واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) پێیان بڵێ: هەواڵی ئەو پەرستراوانەم بدەنێ ئێوە لەباتی خوا ئەیان پەرستن‌و هاواریان بۆ دەبەن؟**

---

١٦٢ / رواه الفريابي والآجري .

ئەوانە لەم زەوییەدا چییان دروست کردووە، نیشانمی بدەن؟ یان لەدروست کردنی ئاسمانەکاندا بەشداریکیان هەیە؟! ئەگەر هاوبەشییان هەیە، دەکەواتە نامەیەکی ئاسمانیم نیشان بدەن لەپێش هاتنی ئەم قورئانەدا بۆتان هاتبێت، یان شوێنەوارێکی زانستی لەڕابوردووانەوە بەڵگە بێت لەسەر قسەکەتان، ئادەی یەکێ لەمانەم بۆ بێنن ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن و ئەوانە هاوبەشی خوان).

خوای گەورە دەفەرموێت:(إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ لَنْ يَخْلُقُوا ذُبَابًا وَلَوِ اجْتَمَعُوا لَهُ) الحج /٧٣) واتە: بەڕاستی لەخوا بەدەر ئەوانەی ئێوە ئەیان پەرستن و هاواریان بۆ دەبەن هەرگیز ناتوانن تەنها مێشێکیش بەدی بێنن، ئەگەر چی هەمووشیان کۆببنەوە).

خوای گەورە دەفەرموێت:((أَمْ جَعَلُوا لِلَّهِ شُرَكَاءَ خَلَقُوا كَخَلْقِهِ فَتَشَابَهَ الْخَلْقُ عَلَيْهِمْ قُلِ اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ (١٦) الرعد/١٦) واتە: یا ئەوانە چەند هاوبەشێکیان بۆ خوا داناوە وەکو دروستکراوی ئەو (خوا)یە یان دروست کردبێ ئەوجا ئەو دروستکردنە لەوانی شێواندبێ‌و چەواشە بووبن بڵێ: ئەی موحەممەد(ﷺ) تەنها هەر خوایە دروستکەری هەموو شتێك‌و ئەویش تاك‌و تەنیای دەسەڵاتدارە بەسەر هەموو شتێکدا).

بۆیە خوای گەورە وەصفی وێنەکێشان دەکات دەڵێت: (فما اظلم ممن ذهب يخلق كخلقي) بەمانای ئەوەی هەوڵ دەدات شێوەیەك بدۆزێتەوە وەکو ئەوەی خوای گەورە دروستی کردووە (فليخلقوا حبةً أو ليخلقوا شعيرة) لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە (أو ليخلقوا ذرة)[١٦٣] هیچ کەسێك ئەوە ناتوانێ، هەرچەندە ئەگەر بتوانێ‌و وێنەیەك بکێشێ‌و دروستی بکات ئەوا ناتوانێ ژیانی بە بەردا بهێنێ.

---

١٦٣ / رواه البخاري (٥٩٥٣) ومسلم (٢١١١) .

جا ژیان لەدروستکراوەکانی خوایە، هیچ کەسێك ناتوانێ تەنانەت ئەگەر وێنەیەکی شێوە وردی کێشا ئەوا ناتوانێ ڕۆحی بەبەردا بهێنێ، ژیان بەبەریدا بهێنێ ئەمە دروستکراوی خودایە، بۆیە لەڕۆژی قیامەتدا بە وێنەکێشان دەگوترێت: (أحيوا ماخلقتم)[١٦٤] وەکو شتێکی تەعجیزیو سزایەك بۆ ئەوان.

١٦٤ / متفق عليه : أخرجه البخاري (١٩٩٩) ومسلم (٢١٠٧) .

**﴿٦٣﴾ نوسەر دەڵێت: (والتكبير على الجنائز أربع، وهو قول مالك بن أنس، وسفيان الثوري، والحسن بن صالح، وأحمد بن حنبل، والفقهاء، وهكذا قال رسول الله (ﷺ)).**

واتە: (تەکبیر) کردن (واتە: وتنی الله اکبر) لەسەر جەنازە چوار جارە (دانەیە)، ئەمەش لەسەر قسەو ڕای (مالیکی کوڕی ئەنەس)و (سفیان الثوری)و (الحسن ی کوڕی صالح)و (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل)و فەقیهەکان، ئابەم شێوەیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی.

ڕاڤە:

ئەم مەسەلەیە مەسەلەیەکی لاوەکییە (فەرعی یە) بەڵام لێرەدا باسی کردوە چونکە جیاوازیو خیلافی تێدایە، بۆ ئەوەی لەو مەسەلەیەدا سوننەت ڕوون بکاتەوە، چونکە کیتابەکە ناوی (شرح السنه)یە، ڕای بڵاوو بەناوبانگ لای ئەهلی سوننەو جەماعەو پێشەوایان ئەوەیە تەکبیرکردن لەسەر جەنازە چوار تەکبیرەیە، هەروەکو لەفەرموودەیەکی (صحیح)دا هاتووە: (أن النبي صلى على النجاشي صلاة الغائب وكبر عليه أربعاً)[١٦٥] واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی لەسەر نەجاشی کرد بە (صلاه الغائب) چوار (الله اکبر)ی لەسەر کرد).

لەزۆربەی فەرموودەکاندا بەچوار هاتوەو لەهەندێکیاندا پێنج یان زیاتر هاتوە، بەڵام ئەوەی کۆڕای موسڵمانانی لەسەرە چوار (الله اکبر)ە، ئەوەی لەوە زیاتر جێی خیلافو جیاوازییە و کەسی موسڵمانیش ناڕوات بۆ لای خیلافو جیاوازیو واز لەو ڕایە بهێنێ کۆڕای لەسەرەو خەڵکی شپرز ناکەن، بەتایبەتی پێشەوای مزگەوتەکان با خەڵکی نەشڵەژێنن، چونکە خەڵکی لەچوار (تەکبیرە) زیاتر ڕانەهاتوون، جا ئەگەر

١٦٥ / متفق عليه : أخرجه البخاري (١١٨٨) ومسلم (٩٥١) .

دەتەوێ ئەنجامی بدەیت ئەوا بۆ خۆت بیکەو خەڵکی مەشلَژێنە، چەند قسەیەکی نامۆو ڕیوایەتی جیاوازیان بۆ بهێنی، چونکە ئەمە کارو پیشەی قوتابی زانستو زانیاری نییە، چونکە قوتابی زانستو زانیاری دڵی خەڵکی یەك دەخەن و سەریان لیَ ناشێوێنن، کار بەوە دەکەن ئیجماعی لەسەرە، خۆیان پەیوەست دەکەن بەوەوە، ئەمە پێویستو دلواکارییە لەسەریان، ئەمەش مەبەستی دانەرە لێرەدا چوار تەکبیرەکەی هێناوە چونکە ئەوەی زانایان کۆکن لەسەری چوارە، بۆیە لەوە زیاتر ناکات و خەڵکی ناشلَژێنن.

مەبەست لە: (وهو قول مالك بن أنس وسفيان الثوري والحسن بن صالح وأحمد بن حنبل).

مالیکی کوڕی ئەنەس: پێشەوای شاری مەدینە و یەکێکە لەچوار پێشەواکە.

سفیان الثوري: سفیانی کوری سعید الثوري یەکێکە لەپێشەوا بەناوبانگەکانی فیقهی.

الحسن ی کوڕی صالح ی کوڕی حيّ: ئەمەش یەکێکە لەگەورە پێشەواکان.

ئەحمەد ی کوڕی حەنبەل: یەکێکە لەچوار پێشەواکە.

مەبەست لە: (والفقهاء وهكذا قال رسول الله (ﷺ)).

واتە: ئەوە قسەی زۆربەی فەقیهەکانە وەکو شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆیە پێویستە لەسەر قوتابیانی زانستو زانیاری خەڵکی نەشلَژێنن بە حوججەی ئەوەی قسەیەك یان فەرموودەیەك هەیە ئەو زیادەی تێدایە، زانایان خۆیان خیلافی مەسەلەکانیان دەزانی، کەچی نەدەڕۆیشتن شتێك بهێنن ببنە هۆی تێکدانی خەڵکی، جیاوازی بکەن لەوەی کاری لەسەر کراوە.

**نوسەر دەڵێت:** (والإيمان بأن مع كل قطرة ملك ينزل من السماء حتى يضعها حيث أمره الله عز و جل).

**واتە: باوەڕ بەوەی هەموو دڵۆپەیەکی باران فریشتەیەکی لەگەڵدایە لەئاسمانەوە دادەبەزێت تاکو دەیخاتە ئەو جێگەیەی خوای گەورە فەرمانی پێ کردوە.**

**ڕاڤە:**

**گومان لەوەدا نییە خوای گەورە لە ئاسمانەوە باران دەبارێنێ بەئەندازە، خوای گەورە دەفەرموێت:** (وَأَنْزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً بِقَدَرٍ فَأَسْكَنَّاهُ فِي الْأَرْضِ) المؤمنون /١٨) **واتە: لەو ئاسمانەوە بەئەندازەیەکی دیاریکراو، ئاومان بۆتان باراندە خوارێ ئینجا لەزەویدا لەجێگایەکی تایبەتدا جێمان پێداو ڕامان گرت).**

**خوای گەورە تەقدیری ئەندازەی دابەزینی بارانی کردوە، تەقدیری چەندو ئەندازەکەی دیاری کردوە، ئەو زەوییەی لەسەری دادەبەزێ هەر بەویستی خۆی بەکاری دەهێنێ، ڕەوانەی دەکات و فەرمانی پێ دەکات و باران دەبارێ و فەرمانی پێ دەکات و دەیگرێتەوەو فریشتەیشی لەگەڵدایە، لە وەصفی میکائیلدا هاتوە دڵۆپەکان و ڕووەکەکانی پێ سپێردراوە، جا فریشتەکان ئەو کارانە دەکەن خوای گەورە لەئەستۆی ئەوانی داناوەو لەو کارانە: دڵۆپە باران.**

**﴿٦٤﴾ نوسەر دەڵێت: (والإيمان بأن رسول الله (ﷺ) حين كلم أهل القليب يوم بدر أي: المشركين كانوا يسمعون كلامه).**

واتە / باوەڕبوون بەوەی کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ ئەهلی (القليب)دا قسەی کرد لە ڕۆژی بەدردا _واتە: بێ باوەڕان _ ئەوان قسەی پێغەمبەری خودایان (ﷺ) دەبیست.

**ڕاڤە:**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) خاوەنی چەندین موعجیزەیە، (المعجزة): بریتییە لەکارێکی نائاسایی، بە هیچ شێوەیەك دەستی مرۆڤی تێدا نییە، بەڵکو تەنها لەدروستکراوی خودایە، (وَقَالُوا لَوْلَا أُنْزِلَ عَلَيْهِ آيَاتٌ مِنْ رَبِّهِ قُلْ إِنَّمَا الْآيَاتُ عِنْدَ اللَّهِ وَإِنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُبِينٌ (٥٠) ‏عنكبوت) واتە: وتیان: جا بۆ ڕاستی خۆی بۆ لەلایەن پەروەردگارییەوە چەند بەڵگەیەکی بۆ دانەبەزێنرا تۆش پێیان بڵێ: هەموو بەڵگەو نیشانەکان هەر لای خوان و بەدەستی ئەون و من هەر بێدار کەرەوەو ترسێنەرێکی ئاشکرام مەگەر ئەوانە داوای بەڵگە ئەکەن، ئەوەیان بەس نییە کە ئێمە قورئانمان بۆ ناردوویتو بەسەریاندا ئەخوێنرێتەوە؟ تا بیکەنە بەڵگە بۆ ڕاستی تۆ؟ بەڕاستی لەو قورئانەدا بەزەیی و ئامۆژگاری هەیە، بۆ هەر قەوم و هۆزێ بیانەوێ باوەڕ بێنن).

پێشنیار دەکەن بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ئایەتێك بهێنێ لەخۆیەوە ببێتە بەڵگەی ڕاستێتی پەیامەکەی هەروەکو ئەوان دەڵێن، ئایەتەکانیش لەلایەن خوداوەیە، پێغەمبەر (ﷺ) لە خۆیەوە ئایەت ناهێنێ تەنها لەلایەن خوداوە نەبێ، (قُلْ إِنَّمَا الْآيَاتُ عِنْدَ اللَّهِ) هەر ئەوە موعجیزەکان ئاشکرا دەکاتو دەری دەخات، لەسەر دەستی پێغەمبەرانی دەری دەخات بەمەبەستی پشت ڕاستکردنەوەیان، جا لەوانە: مردوویەك ئەگەر قسەی لەگەڵدا بکەیت ئەوا قسەکانت نابیسێو نازانێ تۆ چی دەڵێیت، بەڵام

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ کوژراوانی بەدر قسەی کرد لەقورەیشییەکان ئەوانەی ئازاریان دابوو و ئازاری موسڵمانانیان دابوو لەمەککە، خۆیان بەزل دەزانی بەسەر ئیماندا و سەرپێچی پێغەمبەری خوایان (ﷺ) دەکردو ئەویان لەمەککە دەرکرد، هاوەڵانیان دەرکرد و ئازاری ئەوانیان دا، خوای گەورە لەرۆژی بەدردا زاڵی کردن بەسەریاندا و کوژران، گەورەکانی ئەوان لەو رۆژەدا کوژران (شەیبەی کوڕی عوتبە) و (عوتبەی کوڕی رەبیعە) و (ابوجهل ی کوڕی هشام) و ژمارەیەکی زۆر لە گەورەکانی قورەیش لەرۆژی بەدردا کوژران، ئەمجار پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی کرد فڕێی بدەنە (قُلیب) یەکێکە لەبیرەکانی بەدر، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر ئەوان ڕاوەستاو قسەی لەگەڵ ئەواندا کرد: ئەی فلانی کوڕی فلان، ئەی (ابو جهل ی کوڕی هشام)، ئەی عوتبە، ئەی شەیبە، ئەی ئومەییە، یەك بەیەك قسەی لەگەڵ ئەواندا کرد، ئایە ئەوەی خوای گەورە بەڵێنی پێ دابوون حەق و ڕاست دەرچوو؟ ئەوەی خوای گەورە بەڵێنی پێم دابوو حەق و ڕاست دەرچوو، عومەر بە پێغەمبەری خوای (ﷺ) فەرموو:- ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، چۆن قسەیان لەگەڵدا دەکەیت؟ لەکاتێکدا ئەوان مردوویەکی بۆگەنن و نابیستن؟ فەرمووی: (ما أنتم بأسمع لما أقول منهم لكنهم لا ينطقون أو لا يتكلمون)[١٦٦] واتە: (هەرگیز ئێوە گوێبیستتر نین لەوەی دەیڵێم لە ئەوان بەڵام ئەوان قسەناکەن).

ئەمە موعجیزەیەکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خوای گەورە لەسەر دەستی بەدی هێنا.

---

١٦٦ / أخرجه البخاري (١٣٠٤، ٣٧٦٠) ومسلم (٢٨٧٤) .

**﴿٦٥﴾ نوسەر دەڵێت: والإيمان بأن الرجل إذا مرض آجره الله على مرضه.**

واتە: باوەڕبوون بەوەی هەر کەسێك ئەگەر نەخۆش بکەوێت ئەوا خوای گەورە پاداشتی دەداتەوە لەسەر نەخۆشییەکەی.

**﴿٦٦﴾ والشهيد يأجره الله على شهادته.**

واتە: شەهید خوای گەورە پاداشتی دەداتەوە لەسەر شەهید بوونەکەی.

ڕاڤە:

خوای گەورە پاداشتی ئیمانداران بزر ناکات، موصیبەت دەهێنێتە سەر ئیمانداران بەمەبەستی پاککردنەوە یان بەمەبەستی زیادکردنی پاداشت، ڕەنگە هەندێ جار دەیهێنێتە سەر ئیمانداردا بەمەبەستی هەڵوەرین و نەهێشتنی تاوانەکانی، پاککردنەوەی لە گوناهەکانی، ڕەنگە تاوانی نەبێ و دەیهێنێتە سەریدا بۆ ئەوەی پلەو پایەی بەرز بکاتەوە، چونکە خوای گەورە پلەیەکی بۆ نوسیوە لەبەهەشتدا بەکردەوەی خۆی پێی ناگات، جا خوای گەورە تووشی موصیبەتی دەکات تاکو پاداشتەکانی چەند جاران بکاتەوەو دەگاتە ئەو پلەو پایەیە، جا ئیماندار بەردەوام لەخەیرو چاکەدایە، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:- (عجبا لأمر المؤمن! إن أمره كله له خير، إن أصابته سراء فشكر كان ذلك خيرا له، وإن أصابته ضراء وصبر كان ذلك خيرا له، وليس ذلك إلا للمؤمن)[١٦٧] جا کەسی ئیماندار تووشی موصیبەت دەبێ و لەهەمان کاتدا لە بەرژەوەندی ئەودایە، یان خوای گەورە دەیکاتە هۆی کەفارەتی تاوانەکانی، یان خوای گەورە دەیکاتە هۆی بەرزبوونەوەی پلەو پایەی.

---

١٦٧ / أخرجه مسلم (٢٩٩٩) .

(شەهید): ئەو کەسەیە لەجەنگداو بەرانبەر بەبێ باوەڕان کوژراوەو جەنگی کردووە بۆ ئەوەی وشەی (الله) بەرز ڕابگرێ و بەرزکاتەوە، جا ئەمە خوای گەورە لەهەموو تاوانەکانی خۆش دەبێ تەنها قەرز نەبێ، چونکە قەرز حەق و مافی خەڵکییە، حەق و مافی خەڵکی لەسەر لاناچێت ئیللا بەدانەوەی نەبێ یان بە لێخۆشبوون و گەردن ئازایی نەبێ، بەڵام ئەو تاوانانەی لەنێوان خۆیو خوادایە ئەوا خوای گەورە لەهەمووی خۆش دەبێ بەهۆی شەهیدبوونی لەپێناوی خوادا.

چەند جۆر شەهیدێك هەیەو شەهیدی جەنگ نین، وەکو کەسێك بەهۆی نەخۆشی (طاعون)ەوە بمرێت ئەوە شەهیدە، هەر کەسێك لەکاتی بەرەنگاری لە پێناوی سامانەکەی یان ناموس و شەرەفی یان کەس و کارەکەی بکوژرێ ئەوە شەهیدە، ئەو کەسەی بەهۆی ڕووداوێکی کت و پڕدا وەکو سووتان یان خنکان بمرێت ئەوا شەهیدە لای خوا[١٦٨]، واتە پاداشتی شەهیدی هەیەو لەحوکمەکانیدا وەکو شەهیدی جەنگ نییە، بەڵکو دەشۆردرێو کفن دەکرێ و نوێژی لەسەر دەکرێ، بەڵام شەهیدی جەنگ ئەوە ناشۆردرێو بەو جل و بەرگەوە کفن دەکرێ پێوەی کوژراوەو نوێژی لەسەر ناکرێو بەخوێنەکەی خۆیەوە دەنێژرێ.

---

١٦٨ / رواه البخاري (٦٢٤) ومسلم (١٩١٥) .

**﴿٦٧﴾ نوسەر دەڵێت: (والإيمان بأن الأطفال إذا أصابهم شيء في دار الدنيا يألمون وذلك أن بكر بن أخت عبد الوهاب (عبدالواحد)[١٦٩] قال: لا يألمون، وكذب)**

واتە: باوەڕبوون بەوەی منداڵان ئەگەر تووشی هەر شتێك ببن لەدونیادا ئەوا ئازاریان پێ دەگات، ئەوەتا (بكر)ی خوشكەزای عبدالوهاب (عبدالواحد) دەڵێ: ئەوان ئازاریان پێ ناگات، بزانە درۆی كردوە.

ڕاڤە:

ئەم مەسەلەیەی باسكردوە لێرەدا بەهۆی ئەوەی كەسێك بڵێت: منداڵان ئازاریان پێ ناگات، ئەوەی لێرەدا باسكردووە بۆ ئەوەی ڕەددی ئەو كابرایە بداتەوە، دەڵێن ئەو پیاوە: كەسێكی خەواریج بوە، خەواریجەكان قسەی لەوە هیچ و پووچتریان هەیە، بەهۆی نەفامی و خۆبەزانا زانینیانەوە.

بۆیە منداڵێك ئەگەر تووشی شتێك ببێت هاوار دەكاتو دەگریو تكا دەكات پێی بگەن، ئەمەش بەڵگەیە ئازاری پێ دەگات، ئەمە شتێكی بینراوو هەست پێكراوە بەڵام ئەم پیاوە خاوەنی چەند بیرۆكەیەكی نامۆیە، لەو بیرۆكانە ئەم مەسەلەیەیە.

١٦٩ / تەماشای (لسان الميزان)ی ابن حجر بكە (٢/٦٠)

**﴿٦٨﴾ نوسەر دەڵێت: (واعلم أنـه لا يـدخل أحـد الجنـة إلا برحمـة الله، ولا يعـذب الله أحـدا إلا بقـدر ذنوبـه، ولـو عـذب أهـل الـسموات والأرض بـرهم وفاجرهم، عذبهم غير ظالم لهم، لا يجوز أن يقال لله عز و جل: إنـه ظـالم، وإنما يظلم من يأخذ ما ليس له، والله له الخلق والأمر، والخلق خلقه، والدار داره، لا يسأل عما يفعل وهم يسألون، ولا يقال: لمَ وكيـف؟ ولا يـدخل أحـد بين الله وبين خلقه).**

واتە: بزانە هیچ کەسێك ناچێتە بەهەشـتەوە ئـیللا بەڕەحمـەتی خـوا نـەبێ، خـوای گەورە سزای هیچ کەسێك نادات ئیللا بە ئەندازەی تاوانەکەی خۆی نەبێ، ئەگەر سـزای ئەهلی ئاسمانەکانو زەوی بدات، چاکەکارو خراپـەکاران، سـزایان دەدات بـەبێ ئـەوەی ستەمی لێیان کردبێ، نابێت بەخوای گەورە بگـوترێ: سـتەمکارە، چـونکە ئـەو کەسـە ستەم دەکات شتێك بباتو هی خۆی نەبێ، خوای گەورە هەموو دروستکردن و تەکبیرو فەرمانی بۆ بـەڕێوەبردنی هـەموو بوونـەوەر، هـەر بـە دەسـتی ئـەوە، دروسـتکراوەکان دروستکراوی ئەوەو ئەم ماڵەماڵی ئەوە، پرسیاری لێ نـاکرێ هـەر شـتێك بکـات بـەڵکو ئـەوان بەرپرسـیارن و ناگوترێـت: بـۆ و چـۆن؟ هـیچ کەسـێك ناکەوێتـە نێـوان خـواو دروستکراوەکانی.

ڕاڤە:

مەبەست لە: (واعلم أنه لا يدخل أحد الجنة إلا برحمة الله).

بەهەشت بەرزو بەنرخە، کـەس بـەکردەوە پێـی ناگـات، هەرچـەندە مرۆڤـەکان کـار بکەن، هەرچەندە هەموو گوێڕایەڵییەکان ئەنجام بدەن، چونکە کارەکانی بەرانبەر ئـەو نیعمەتانە نییە پێی دراوە، جا ئەگەر لەسەر نیعمەتەکانی لێپرسـینەوەی لەگـەڵ بکـرێ ئەوا هیچ کارێکی نامێنێ، ئەمە لە ڕوویەکەوە.

لایەنی دووەم: بەهەشت بەنرخە، هیچ بەهاو نرخێکی دیاریکراو نییە لەکردەوە یان پارە یان جگە لەوانە، هیچ کەسێك گەورەیی‌و مەزنی نازانێ تەنها خوا نەبێ، بەڵام خوای گەورە ئیمانداران دەخاتە بەهەشتەوە بە رەحمەتی خۆی، بەهۆی کردەوەکانیانەوە، جا کردەوەکانی هۆکاری چوونە بەهەشتن، پێویستکارو موجبی چوونە بەهەشت نین، نرخ‌و بەهای بەهەشت نین، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لن يدخل أحد منككم الجنة بعمله) واتە: هیچ کەسێك لە ئێوە ناچێتە بەهەشتەوە بەکردەوەی خۆی) ئەمە بۆ ئەوەیە مرۆڤەکان سەرسامی کردەوەکانی خۆیان نەبن، نەك لەبەر ئەوەیە واز لەکردەوەکانیان بهێنن، ئەو ئایەتەی کەدەفەرموێ: (ادْخُلُوا الْجَنَّةَ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ (٣٢) النحل) ئەو پیتی (باء) لەوشەی (بما)دا (باء)ی خستنەبەر (عوض)و بەها (ثمن) نییە، بەڵکو (باء)ی هۆکاری (سببی)یە، واتە: بەهۆی ئەو کارانەی ئەنجامتان دەدا، بەبەڵگەی ئەو فەرموودەیەی دەفەرموێت: (لن يدخل أحد منككم الجنة بعمله) وتیان: تۆیش ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ فەرمووی: (ولا أنا إلا أن يتغمدني الله برحمته)[170] واتە: منیش ئیللا مەگەر خوای گەورە بمخاتە بەر رەحمەتی خۆی) جا بۆیە هەرگیز با مرۆڤەکان سەرسامی خۆیان نەبن، بەڵام ناچێتە بەهەشتەوە ئیللا بەهۆی کردەوەکانیانەوە نەبێ، چونکە ئەگەر کار نەکات ئەوا ناچێتە بەهەشتەوە، چونکە هۆکارەکەی نەگرتۆتە بەر.

مەبەست لە: (ولا يعذب الله أحداً إلا بقدر ذنوبه).

بەهەشت لەفەزڵی خوداو رەحمەتی ئەوە، کردوەکان تەنها هۆکاری چوونە بەهەشتن‌و ئەهلی دۆزەخ سزا نادرێن ئیللا بەهۆی تاوانی خۆیانەوە نەبێ، بەهۆی

---

١٧٠ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٥٣٤٩) ومسلم (٢٨١٦) .

تـاوانی کەسـی تـرەوە سـزا نـادرێن، بـەبێ ئەنجامـدانی تـاوان سـزا نـادرێن، ئەمـەش دادپەروەرییە، کەواتە بەهەشت لەفەزڵی خودایەو دۆزەخ لە دادپەروەری ئەوە.

**مەبەست لە:** (ولو عذب أهل السموات والأرض برهم وفاجرهم عذبهم غير ظالم لهم).

ئەمە هەروەکو ئەوەی پێشەوەیە، کەوا مرۆڤ هەرچەندە کار بکات ئەوا کردەوەکەی بەرانبەر بەهەندێ لە نیعمەتەکانی خوا نییە بەسەریەوە، جا ئەگەر خوای گەورە سـزای بـدات ئـەوا لەدادپەروەرییـە، لەبـەر کەمتەرخـەمی شـوکرکردنی نیعمەتـەکانی خودایـە بەسەرییەوە، ئەم قسەیەی باسی کرد دەقی فەرموودەیەکی پێغەمبەری خودایە (ﷺ) کـە دەفـەرموێت: (لو أن الله عذب أهل سماواته وأهل أرضه لعذبهم وهو غير ظالم لهم ولو رحمهم كانت رحمته خير لهم من أعمالهم)[١٧١] واتە: ئەگەر خوای گەورە سزای هەموو ئـەهلی ئاسمانەکان و ئـەهلی زەوی بـدات ئـەوا سـزایان دەدات و ستەمکار نییـە بەرانبـەریان، ئەگەر ڕەحمیان لێ بکات ئەوا ڕەحمەتەکەی چاکترە بۆیان لەکردەوەکانیان).

چونکە خراپەکار سزای دەدات بەهۆی خراپەکەیەوە، سزای چاکەکار دەدات چـونکە کارەکـەی وای لێ نـەکردوە ببیاتـە بەهەشـتەوە، چـونکە ناگاتـە نیعمەتـەکانی خـوا بەسەرییەوە.

**مەبەست لە:** (لا يجوز أن يقال لله: إنه ظالم).

خوای پەروەردگار خۆی پاکڕاگرتوە لەستەمکردن: خوای گـەورە دەفـەرموێت: (وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّامٍ لِلْعَبِيدِ (٤٦) فصلت) واتە: پەروەردگاریشت هەرگیز غەدرباز و ستەمکار نییە لە بەندەکانی و بێ کەم و کورت پاداشتیان ئەداتەوە).

---

١٧١ / رواه احمد وابو داود وابن ماجه والگبراني وابن حبان .

خوای گەورە دەفەرموێت: (لَا ظُلْمَ الْيَوْمَ إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ (١٧) غافر) واتە: لەو ڕۆژەدا هیچ جۆرە ستەمو غەدرێك نییە بێ زیادو کەم هەموو کەسێك پاداشت و تۆڵە ئەدرێتەوە، بە ڕاستی خوا زوو و بە پەلە حیساب و لێکۆڵینەوە دەکات).

خوای گەورە دەفەرموێت: (وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا (٤٩) الكهف) واتە: پەروەردگاریشت ناهەقی و ستەم لەهیچ کەسێك ناکات).

خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَكِنْ كَانُوا هُمُ الظَّالِمِينَ (٧٦) الزخرف) واتە: ئێمە هیچ ستەممان لێ نەکردوون بەڵام ئەوان خۆیان ستەمکار بوون و لەڕێگەی ئێمە لایان دا).

خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَكِنْ كَانُوا أَنْفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ (١١٨) النحل) واتە: ئێمە ستەممان لێ نەکردن، بەڵام ئەوان ستەمییان لەخۆیان کرد بەهۆی لادان و سنوور بەزاندنەوە).

خوای گەورە لەفەرمودەیەکی قوودسیدا دەفەرموێت: (یاعبادی إني حرمت الظلم علی نفسي وجعلته بينكم محرما فلا تظالموا)[١٧٢] واتە.. ئەی بەندەکانم.. من ستەمم لەسەر خۆم حەرام کردوەو لەنێوان ئێوەشدا حەرامم کردوە بۆیە ستەم لەیەکتر مەکەن) جا خوای گەورە حەکەمو دادپەروەرە، ستەمکردن لایەقی ئەو نییە.

مەبەست لە: (وإنما يظلم من يأخذ ما ليس له، والله له الخلق والأمر).

ستەم: بریتییە لەبردنی حەقو مافی خەڵکی، ئایە خەڵکی حەق و مافیان بەسەر خوداوە هەیە؟ هیچ کەسێك حەق و مافی بەسەر خوداوە نییە، هیچ کەسێك هیچ حەقێك پێویستو واجب ناکات لەسەر خوا، بەڵکو حەقی بەندەکان بەسەر خوداوە

١٧٢ / رواه مسلم (٢٥٧٧) .

ئەوەیە سزای هیچ کەسێك نەدا هاوەڵیان بۆ بڕیار نەدابێ، ئەم حەقە فەزڵێکە لەخوداوە.

ستەم: دانانی شتێکە لەجێگەیەك هی خۆی نەبێ، جا خوای گەورە هیچ کەسێك ناکاتە نێو سزاوە شایستەی خۆشگوزرانی بێت، هیچ کەسێك ناخاتە خۆشگوزرانییەوە شایستەی سزا بێت، بەڵکو هەر کەسێك شایستە خۆشگوزرانی بێت دەیخاتە خۆشگوزرانییەوەو هەرکەسێك شایستە سزا بێت دەیخاتە نێو سزاوە، ئەمە دادپەروەرییە، بەڵام پێچەوانەی ئەمە ستەمە، ئەگەر سزای ئیمانداران بدات و ڕێز لەبێ باوەڕان بگرێت ئەوە دەبووە ستەم، خوای گەورەش پاکو بێگەردە لەو ستەمە، ناکرێت خوای گەورە سزای ئیمانداران بداتو ڕێز لەبێ باوەڕان بگرێت، بێ باوەڕان بخاتە بەهەشتەوەو ئیمانداران بخاتە ئاگرەوە، ئەمە لایەقی خوای گەورە نییە.

مەبەست لە: (والله له الخلق والأمر، والخلق خلقه، والدار داره).

خوای گەورە دەفەرموێت: (أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ (٥٤) الأعراف) واتە: چاکیش بزانن! دروستکردن و تەکبیرو فەرمانی بۆ بەڕێوەبردنی هەموو بوونەوەر، هەر بە دەستی ئەوە، زۆر بە بەرەکەت و گەورەیە خوایەك کە پەروەردەگاری گشت جیهانە).

(أَلَا لَهُ الْخَلْقُ) بریتییە لەهێنانەبوونی شتەکان لەنەبوونەوە، جا هەموو دروستکراوەکان خوای گەورە دروستی کردوە، هیچ کەسێك لەگەڵ خوادا دروست ناکات، خوای گەورە دەفەرموێت: (اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ) الزمر/٦٢) واتە: بەڕاستی خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە).

خوای گەورە دەفەرموێت: (أَمْ جَعَلُوا لِلَّهِ شُرَكَاءَ خَلَقُوا كَخَلْقِهِ فَتَشَابَهَ الْخَلْقُ عَلَيْهِمْ قُلِ اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ (١٦) الرعد) واتە: یا ئەوانە چەند هاوبەشێکیان بۆ خوا

داناوە وەکو دروستکراوی ئەو (خوا)یەیان دروست کردبێ ئەوجا ئەو دروستکردنە لەوانی شێواندبێ و چەواشە بووبن بڵێ: ئەی موحەممەد (ﷺ) تەنها هەر خوایە دروستکەری هەموو شتیك و ئەویش تاك و تەنیای دەسەڵاتدارە، بەسەر هەموو شتێکدا).

بەشێوەیەك ئەوەی بەندە دروستی کردوە هاوشێوەی ئەوەیە خوا دروستی کردوە، ئەمە هەرگیز نابێتو ئەستەمە، (قُلِ اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ(١٦)الرعد) واتە: بڵێ: ئەی موحەممەد (ﷺ) تەنها هەر خوایە دروستکەری هەموو شتیك و ئەویش تاك و تەنیای دەسەڵاتدارە، بەسەر هەموو شتێکدا).

دەفەرموێت: (قُلْ أَرَأَيْتُمْ مَا تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُوا مِنَ الْأَرْضِ) الأحقاف/٤) واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) پێیان بڵێ: هەواڵی ئەو پەرستراوانەم بدەنێ کە: ئێوە لەباتی خوا ئەیان پەرستنو هاواریان بۆ دەبەن؟ ئەوان لەم زەوییەدا چییان دروست کردووە، نیشانمی بدەن؟).

(والأمر) هەمووی بۆ ئەوە، (الأمر) بریتییە لە: دانانی شەرعو وەحی دابەزاندن، جا دروستکار ئەو کەسەیە فەرمان دەکات یان نەهی دەکات یان شەرع دادەڕێژێ بۆ بەندەکانی بەرژەوەندی ئەوانی تێدایە، نەهی لە شتێك دەکات زیانی ئەوانی تێدایە، هیچ کەسێك بۆی نییە فەرمان بکات یان نەهی بکات یان پەرستنێك پێویست (واجب) بکات یان نەهی لەشتێك بکات بەبێ بەڵگە، (أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُمْ مِنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنْ بِهِ اللَّهُ) الشورى /٢١) واتە: ئاخۆ ئەوانە ڕێگەی خواناسین دەگرن یا خۆ چەند هاوبەشێك بۆ خوا دادەنێن چەند یاساو بەرنامەیەکیان بۆ داهێنابن لەئاین کە بەهیچ شێوەیەك خوا مۆڵەتی نەدابن).

جا هەموو فەرمانێك بۆ خودایە، فەرمانی کەونی قەدەری و فەرمانی شەرعی، فەرمان دەکات و نەهی دەکات، (أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ) ألأعراف/٥٤) خوای گەورە جیاوازی کردووە لەنێوان دروستکردن‌و فەرماندا (الخلق و الامر) ئەمەش بەڵگەیە کە فەرمان (أمر) دروستکراو نییە، ئەمەش وەڵام و ڕەددی جەهەمییەکانە کە دەڵێن: قورئان دروستکراوەو قسەی خوای گەورە دروستکراوە، خوای گەورە جیاوازی کردووە لە نێوان (الخلق و الامر)، جا (الامر) بریتییە لەقسەکردن و کەلامو تەشریع، خوای گەورە جیاوازیکردووە لەنێوان (الخلق و الامر) ئەمەش بەڵگەیە قسەی خوای گەورە دروستکراو نییە.

مەبەست لە: (والدار داره) ماڵەکان سێ دانەن:-

- ماڵی دونیا.
- ماڵی بەرزەخ.
- ماڵی جێگیربوون. ئەویش دوا ڕۆژە.

هەمووی هی خوایە.

مەبەست لە: (لا يُسأل عما يفعل وهم يُسألون).

هەرگیز پرسیاری لێ ناکریت لەوەی دەیکات، چونکە کارەکانی هەرگیز کەم‌و کووڕی تێدا نییە، هیچ خەوشێکی تێدا نییە، جا کارەکانی هەموو مەحکەم و تەواون، هەرگیز تووشی کەم و کووڕی و خەوش نابێ. پرسیار کردن بۆ ئەو کەسەیە دەبێ کەم‌و کووڕی‌و خەوش لەکارەکانیدا هەبێ، جا خوای گەورە پرسیاری لێ ناکرێت هەرچی بکات، چونکە کردەوەکانی هەموو تەواوو بێ کەم و کووڕین، نەك تەنها لەبەر زاڵ بوون‌و پەروەردگارێتی، هەروەکو هەندێ کەس دەڵێت، ئەو پرسیاری لێ ناکرێت لەبەر مەزنی و شکۆمەندی، بەڵام تەنها ئەوە نییە، بەڵکو پرسیاری لێ ناکرێ -لەگەڵ

ئەوەشدا– چونکە کارەکانی تەواون‌و هەرگیز تووشی کەم و کووڕی و خەوش نایەن، بەجیاواز لەگەڵ دروستکراواندا کەپرسیاری لیّ دەکریّ دەربارەی کارەکانی چونکە هەڵە دەکات و کارەکانی کەم و کووڕی تێدایەو چەند تێبینییەکی لەسەرە، جا ئەو پرسیاری لیّ دەکریّ چونکە لەهەموو ڕوویەکەوە کەم و کووڕی تێدایە، ئیللا کەسێك نەبیّ خوای گەورە خۆی کامل کردبیّ و یارمەتی دابیّ و پێکابێتی، بۆیە فەرمووی: (وهم يُسئلون) ئەمە یەکێکە لەجیاوازییەکانی نێوان دروستکراوو دروستکار: ئەویش ئەوەیە خوای گەورە پرسیاری لیّ ناکریّ و دروستکراو پرسیاری لیّ دەکریّ.

مەبەست لە: (ولا يقال: - لم وكيف؟ ولا يدخل أحد بين الله وبين خلقه).

نابیّ ڕووبەڕووی خوا ببینەوە بە وتنی: بۆ خوای گەورە ئەو شتەی دروستکردوە؟ دروستکردنی ئەو شتانە لەلایەن خوداوە چۆنە؟ ئەمە بەرانبەر بەخوای گەورە ناگوترێت، بەڵکو پێویستە لەسەرمان تەسلیم‌و ملکەچ بین، باوەڕمان بەوە هەبیّ کردەوەکانی خوا هەموو کامل‌و تەواون‌و هەرگیز تووشی کەم‌و کووڕی‌و خەلەل نایەن، هەرچەندە هەندیّ حیکمەت‌و هۆکار لای ئێمە شاراوە بێت ئەوا پرسیاری لیّ ناکەین، بەڵکو تەسلیمی دەبین، ئەگەر حیکمەت‌و هۆکارەکەیمان زانی ئەوا شتێکی باشە، ئەگەر حیکمەت و هۆکارەکەیمان نەزانی ئەوا تەسلیمی دەبین، ڕووبەڕووی خوا نابینەوە یان لەکارێك ڕاوەستین و ئەنجامی نەدەین تاکو حیکمەت و هۆکارەکەی نەزانین.

**﴿٦٩﴾ نوسەر دەڵێت: (وإذا سمعت الرجل يطعن على الآثار ولا يقبلها أو ينكر شيئا من أخبار رسول الله (ﷺ) فاتهمه على الإسلام فإنه رجل رديء المذهب والقول ولا يطعن على رسول الله (ﷺ) ولا على أصحابه لأنا إنما عرفنا رسوله وعرفنا القرآن وعرفنا الخير والشر والدنيا والآخرة بالآثار.**

**﴿٧٠﴾ فإن القرآن إلى السنة أحوج من السنة إلى القرآن.**

واتە: ئەگەر بیستت کەسێك تانە لە شوێنەوار (فەرموودە) دەداتو وەری ناگرێت یان ئینکاری لە شتێك لەهەواڵەکانو فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکات ئەوا تۆمەتباری بکە لەسەر ئیسلام، چونکە ئەوە کابرایەکی خاوەن مەزهەبو قسەیەکی خراپە، نابێت هەرگیز تانە لەپێغەمبەری خواو(ﷺ) هاوەڵانی بدرێت، چونکە ئێمە پێغەمبەری خوداو (ﷺ) قورئانو چاکەو خراپەو دونیاو دوا ڕۆژمان لەڕێگای شوێنەوار (فەرموودە)وە ناسیوە.

جا قورئان زیاتر پێویستی بەسوننەت هەیە لەوەی سوننەت پێویستی بەقورئان بێت.

ڕاڤە:

مەبەست لە: (وإذا سمعت الرجل يطعن على الآثار ولا يقبلها أو ينكر شيئا من أخبار رسول الله فاتهمه على الإسلام). چونکە لەماناى شایەتیدان (محمد) (ﷺ) پێغەمبەری خودایە ئەوەیە: (أشهد أن محمداً رسول الله):

١. گوێڕایەڵی کردنی لەوەی فەرمانی پێ کردووە.

٢. بەڕاست زانینی لەوەی هەواڵی پێ داوین.

٣. دوورکەوتنەوە لەوەی نەهی لێ کردووەو زەجری کردووە.

٤. نابێت خوا بپەرستین ئیللا بەو شێوازە نەبێ کە لەشەرعدا بۆی داڕێژاوین.

ئەمە مانای شایەتیدانە کەوا (محمد) پێغەمبەری خوایە (ﷺ)، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا)الحشر/٧) واتە: هەرچی پەیامبەر پێی دان وەری بگرن، واتە:- بەچی فەرمانی پێ کردن بیکەن و جێبەجێی بکەن. رێیشی لە هەر شتێ لێ گرتن، ئێوەش دەستی لێ هەڵگرن).

خوای گەورە دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ) النساء/٥٩) واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە! گوێڕایەڵی فەرمانی خواو پەیامبەر (ﷺ) بن لە هەموو کاروبارێکدا).

پێویستە لەسەر کەسی موسڵمان جێ بەجێ کردنی ئەوەی لەفەرموودەکانی پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) هاتوە چونکە ئەوە وەحی دووەمە لەپاش قورئان، چونکە بنەمای بەڵگەکان لەئیسلامدا کە ئیجماعی لەسەرە بریتییە لە:-

یەکەم: قورئان.

دووەم:سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ).

سێیەم: (ئیجماع).

ئەمانە چەند بەڵگەیەکن نابێ مرۆڤ بڵێت: من تەنها قورئان دەکەمە بەڵگە بۆ خۆم، سوننەت ناکەمە بەڵگە بۆ خۆم، هەروەکو خەواریجەکان دەڵێن، ئەوانەش رێگای ئەوانیان گرتوەتە بەر و دەڵێن: قورئان (متواتر)ە و پارێزراوە لەخەوش، بەڵام سوننەت لەریوایەتی (ڕاوی)یەکانەوەیە بۆیە تووشی خەلەل دەبێ، ئەمەش تۆمەتبارکردنی ئەم ئوممەتەو زانایان و هاوەڵانو شوێنەکەوتووانە ئەوانەی سوننەتیان بۆ ئێمە گواستوەتەوە، تۆمەتباریان دەکەن بەنەبوونی سیقەو نەبوونی سپاردە

پارێزی، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی ئەوانەی کردوەو فەرموویەتی: (يوشك رجل شبعان على أريكته، يقول: بيننا وبينكم كتاب الله، فما وجدنا فيه من حلال استحللناه وما وجدنا فيه من حرام حرمناه) واتە: خەریکە وای لێ دێت کەسێکی تێر لەسەر قەنەفەکەی دانیشتوەو دەڵێت: نێوان ئێمەو ئێوە کیتابەکەی خودایە (قورئانە) (واتە: تەنها ئەم قورئانەمان بەسە) ئەوەی حەڵاڵ بوو تیایدا ئەوا حەڵاڵی دەکەین و ئەوەی حەرام بوو تیایدا ئەوا حەرامی دەکەین) ئەمجار فەرمووی: (ألا وإني أوتيت القرآن ومثله معه)[١٧٣] واتە: خوای گەورە قورئانی پێ بەخشیوم و هاوشێوەکەی لە گەڵدایە (واتە: سوننەت).
هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (نضر الله امرأً سمع مقالتي فوعاها وبلغها كما سمعها، فرب مبلغ أوعى من سامع)[١٧٤].

هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەعەرەفەدا کاتێ وتاری دەخوێندەوە فەرمووی: (ليبلغ الشاهد منكم الغائب)[١٧٥]

جا ئەوەی گوێبیستی بوە لەپێغەمبەری خوداوە (ﷺ) ئەم دینە دەگەیەنن کە پیاوانی فەرموودەو ڕاوییەکان بۆی گێڕاوینەتەوە خوای گەورە پاداشتیان بداتەوە سوونەتی پێغەمبەری خودایان (ﷺ) بۆ پاراستووین لەهەموو درۆو دزەیەك، بەپاکیو پوختەیی گەیاندیان، هەروەکو چۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی بەئەمانەتەوە، ئەمەش لەموعجیزەکانی ئەم پێغەمبەرەیە (ﷺ)، جا سوننەت جێگای ڕاوەستان و تۆمەتبارکردن نییە بەڵکو پێویستە باوەڕی پێ بکرێ، پێویستە کاری پێ بکرێ، هەروەکو چۆن کار بە قورئان دەکرێ، چونکە ئەویش وەحییە لەلایەن خوداوە،

---

١٧٣ / رواه أحمد والدارمي وأبو داود والترمذي وابن ماجه وابن حبان والحاكم وقال الترمذي (حسن غريب) وقال الحاكم : (اسناده صحيح) .

١٧٤ / صحيح : أخرجه الترمذي (٢٦٥٧) وابن ماجه (٢٣٢) وصححه الشيخ الألباني في (المشكاة) (٣٣) .

١٧٥ / صحيح : سبق تخريجه .

خوای گەورە دەربارەی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەفەرموێ: (وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى (٣) إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى (٤)النجم)

جا فەرموودەکان وەحییە لەلایەن خوداوە، هەرچەندە وشەکانی لەلایەن پێغەمبەری خوداوەیە (ﷺ)، بەڵام قورئان وشەو ماناکەی لەلایەن خوداوەیە، بەڵام سوننەت و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ماناکەی لەلایەن خوداوەیەو وشەکانی هی پێغەمبەری خودایە (ﷺ) کە هەرگیز لەخۆوە قسە ناکات، جا وشەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بێ هەڵەن و ڕاستن و مرۆڤ تووشی هیچ گومانێك ناکات، جا هەر کەسێ ئینکاری لەسوننەت بکات ئەوە (کافرە)، چونکە بنەمای دووەمی لەکارخست، قورئانیش بەبێ سوننەت ناکرێ چونکە ڕوونی دەکاتەوەو ڕاڤەی دەکات، (وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ) النحل/٤٤) واتە: وا بۆ تۆش ئەم قورئانەمان دابەزاندە خوارێ بۆ ئەوەی بۆ ئەو خەڵکە ڕوون بکەیتەوە ئەوەی بۆیان دابەزێنراوە).

جا سوننەت ڕۆشنکەرەوەو تەفسیری قورئانە، چونکە قورئان شتەکان بە (مجمل)ی باس دەکات وەکو نوێژ، زەکات، حەج، ڕۆژوو، سوننەتیش هەموو ئەوانەی ڕوونە کردۆتەوەو ڕۆشنی کردوەتەوە، زەکاتی ڕوونکردوەتەوەو ئەندازەکەی دیاری کردوە، ڕۆژوو کەی دەست پێ دەکات و کەی تەواو دەبێت؟ (مناسك)ـەکانی حەج، موسڵمان دەبێ چۆن حەج بکات؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:) لتأخذوا عني مناسككم)[١٧٦] واتە:(مناسك)ەکانتان لەمنەوە وەرگرن).

پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی: (صلوا كما رأيتموني أصلي)[١٧٧] واتە: نوێژ بکەن هەروەکو چۆن منتان دەبینی نوێژم دەکرد).

١٧٦ / أخرجه مسلم (١٢٩٧ ) .

١٧٧ / أخرجه البخاري (٦٠٥ )

خوای گەورە دەفەرموێ: (لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ)الاحزاب: ٢١) واتـە: بە راستی پەیامبەری خوا (ﷺ) چاکترین نموونەی ڕێك و پێكی و سەرمەشقە بۆتان).

جا سوننەت قورئان ڕوون دەکاتەوەو تەفسیری دەکاتو ڕێنموییمان دەکات بـۆی، ئەو کەسەی دەڵێت:- من کار بەقورئان دەکەمو کار بەسوننەت ناکـەم ئـەوا کەسـێکی درۆزنە، ئەو کەسە کاری بەقورئان نەکردوە چونکە لەقورئاندا هاتوە: (وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا الحشر /٧).

دەفەرموێ: (وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى (٣) إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى (٤) النجم).

دەفەرموێ: (لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ (٤٤) النحل).

جـا کـە وازی لـەکارکردن بەسـوننەت هێنـا ئـەوا بـەقورئانیش کـاری نـەکردوە کـە بانگەشەی ئەوە دەکات گوایە کاری پێ دەکات.

هەندێ خەڵکی هەن جیاوازی دەکەن لەنێوان فەرموودەکانـداو دەڵـێن: فـەرموودەی (المتواتر) ئەوا ئیفادەی (علم) دەکاتو فەرموودەی (الاحاد) ئیفادەی (الظـن) دەکـات، ئەمەش قسەیەکی پووچەڵو ناڕاستە، چونکە هەر فەرموودەیەك لەپێغەمبەری خـوداوە (ﷺ) سابتو جێگیر بێت ئەوا ئیفادەی (علم) دەکـات، جـا ئەگـەر (متـواتر) بێـت یـان (آحاد) هیچ جیاوازی لەنێوان دەلالەتی فەرموودە (صحیح)ەکاندا نییـە، دەبـێ کـار بـە هەمووی بکرێ و شوێنکەوتەی ببین بەبێ جیاوازی.

(سۆفی)یەکانش کار بە سوننەت و بەقورئانیش ناکەن، بەڵکو کـار بـەزەوقی خۆیـان دەکەن و دەڵێن: ئێمە ڕاستەوخۆ لەخوداوە وەردەگرین، لەڕێگای پێغەمبـەرەوە (ﷺ) وەرناگرین چونکە ئێمە گەیشتوینەتە خواو پێویستمان بە پێغەمبەر (ﷺ) نییە.

ئەو پێغەمبەرە (ﷺ) بۆ خەڵکی عەوامە، ئەوانەی هێشتا بەخوا نەگەیشتوون، ئەم قسەیەیش پووچەڵترینی قسە پووچەڵەکانەو دیارترین کوفرە _پەنا بە خوا_.

مەبەست لە: (أو ينكر شيئاً).

ئەو کەسەی ئینکاری لەسوننەت دەکات بەگشتیو دەڵێت: ئەو کار بەسوننەت ناکات و بەڵکو تەنها کار بە قورئان دەکات، یان ئینکاری هەندێ سوننەت دەکات لەکاتێکدا فەرموودەی (صحیح)ن و دەڵێت: کاری پێ ناکرێتو هەندێکیان دەڵێن: کار بەفەرموودە ناکرێت ئیللا بەمەرجێك:- ئەویش لەگەڵ قورئاندا بگونجێ، ئەم قسەیش پووچەڵەو تۆمەتبارکردنی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) بەوەی کە هەندێ شتی هێناوە لەگەڵ قورئاندا ناکۆكو جیاوازە، جا ئەم قسەیەش دروست نییە، ڕەنگە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی بەهەندێ شت کردبێ لە قورئاندا نییە، وەکو: حەرام بوونی کۆکردنەوە لەنێوان ژن و پووریدا (واتە کەسێك پووری ژنەکەی خۆی بهێنێ لەکاتێکدا ژنەکەی خۆی زیندوە) ئەمە لەقورئاندا نییە، قورئان حەرام بوونی کۆکردنەوەی نێوان دوو خوشکی تێدایە، پێغەمبەری خواش (ﷺ) دەفەرموێ: (لا يُجمع بين المرأة وعمتها، ولا بين المرأة وخالتها)[178] واتە: لەنێوان ژن و پووریدا(خوشکی باوکی) کۆ ناکرێتەوە، وە لە نێوان ژنو پووریدا (خوشکی دایکی). بۆیە پێویستە کار بەوە بکەین کە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) فەرموویەتی.

مەبەست لە: (فأتهمه على الاسلام، فإنه رجل رديء المذهب والقول).

ئەو کەسەی ئەم قسەیە دەکات یان لە خەواریجە، یاخود کەسێکی جەهمییە یان موعتەزیلەیە، وەیان صۆفییە ئەوانەی دەڵێن ئەوان پێویستییان بەفەرموودە نییە، چونکە ئەوان گەیشتوونەتە خوا، بەڕاستەوخۆیی لەخوداوە وەردەگرێ، دەڵێن: ئێوە دینەکەتان لەمردوویەکەوە وەردەگرن ئەویش لەمردوویەکەوە بەڵام ئێمە دینەکەمان لەزیندوویەکەوە وەردەگرین کە هەرگیز نامرێت.

---

١٧٨ / رواه البخاري (٤٨٢٠) ومسلم (١٤٠٨) .

**مەبەست لە:** (ولا يطعن على رسول الله (ﷺ) ولا على أصحابه).

**تانە لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) نادرێت، چونکە ئەو (معصوم)ە لەلایەن خوداوە، جا هەرکەسێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) تۆمەتبار بکات یان تانەی لێ بدات یان بڵێت خاوەن ئارەزوو بووە یان ئەو ستەم دەکات یان لەو جۆرە قسانە ئەوە کافرە بەخوای گەورە.**

**هەروەها ئەو کەسەی تانە لەهاوەڵان بدات، هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ)، چونکە خوای گەورە لەوان ڕازی بووەو مەدحی کردوون، پێغەمبەری خودا (ﷺ) لەوان ڕازی بووەو مەدحی کردوون و ستایشی کردوون و ئەوانیش باشترین سەدەکانن، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت:** (خيركم قرني..)[179]**، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:** (لا تسبوا أصحابي، فوالذي نفسي بيده لو أنفق أحدكم مثل أُحد ذهباً، ما بلغ مدَّ أحدهم ولا نصيفه)[180] **واتە: جنێو بە یارانی من مەدەن، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە ئەگەر یەکێ لە ئێوە بە ئەندازەی کێوی ئوحود ئاڵتون بکات بە خێر، ئەوا ناگاتە مشتی یەکێ لەوان و بە نیوەی مشتێکیش).**

**خوای گەورە دەفەرموێ:** (وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ بِإِحْسَانٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ (١٠٠) التوبة) **واتە: لەدەستەی یەکەمی پێشەنگی کۆچکەران و پشتیوانان و چاك پەیڕەوانی ئەوانیش خوا ڕازی بوو لێیان و ئەوانیش لەخوا ڕازی بوون بەدەر لەوەش چەندان باخ و بێستانی بۆ سازداون کە: بە بەردرەخت و کۆشکەکانییدا ڕووبار گەڵێ دەچێت بەهەتا هەتاییش تێیدا ئەمێننەوە هەر ئەوەیشە دەسکەوت و سەرفرازی گەورەو بەنرخ).**

---

١٧٩ / صحيح : سبق تخريجه .

١٨٠ / صحيح : سبق تخريجه .

خوای گەورە دەفەرموێ: (لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنْزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا (١٨)الفتح) واتە: بێ گومان خوا ڕازی بوو لەئیماندارەکان کاتێ لەژێر ئەو درەختەدا پێی دەڵێن (شجرة الرضوان) پەیمانیان لەگەڵ دەبەستیت ئەی موحەممەد (ﷺ) جا خوا بەو ڕاستی و وفایەی لەدڵیاندا بوو بۆ پەیامەکەت ئاگاداربوو ئینجا لەکاتی پەیمانەکەدا ئارامی دابەزاندە سەریان و بەسەرکەوتنێکی نزیک پاداشتی دانەوە).

لەژێر دارەکە داری (البیعە) لە حودەیبیە (فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنْزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا (١٨)الفتح) لەکۆتایی سورەتەکە دا دەفەرموێ: (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ) واتە هاوەڵان (أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِمْ مِنْ أَثَرِ السُّجُودِ ذَلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ) واتە سیفەتی ئەوان باسکراوە لە تەوراتدا (وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنْجِيلِ) واتە سیفەتی ئەوان لە ئینجیلدا باسکراوە کە دابەزیوەتە سەر عیسا (كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَى عَلَى سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ) الفتح:٢٩) ئەمەش بەڵگەیە ئەو کەسەی ڕقی لەهاوەڵان بێ کافرە: (لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ).

مەبەست لە: (لأنا إنما عرفنا الله وعرفنا رسوله وعرفنا القرآن وعرفنا الخير والشر والدنيا والآخرة، بالآثار).

واتە ئەو فەرموودانەی ڕیوایەتیان کردوە، ئەویش ئەو فەرموودانەن لەپێغەمبەری خوداوە (ﷺ)ڕیوایەتیان کردوە، جا ئەو کەسەی تانەیان لێ بدات، ئەوا تانە لەشەریعەت دەدات، چونکە لەڕیوایەتی چەند درۆزنو کەسی بێ سیقەوەیە، ئەمەش مەبەستی جولەکەو ئاگرپەرستانە (مەجوسە) کۆمەڵێك جوێن بەهاوەڵان دەدەن، مەبەستیان پووچەڵ کردنەوەی شەریعەتە، چونکە ئەگەر ئەوان راوی فەرموودەکانو

هەڵگرانی پووچەڵ بکەنەوە ئەوا تانەیان لەباشترینی ئەم ئوممەتە داوەو جا تانەدانیان لە جگە لەوان لەپێشترە.

مەبەست لە: (فإن القرآن إلى السنة أحوج من السنة الى القرآن).

قورئان پێویستی بەسوننەتە هەروەکو باسمان کرد، چونکە سوننەت ڕوونکەرەوەو تەفسیری قورئانە، چونکە چەند شتێك هەن لەقورئاندا (مجمل)ە وسوننەت ڕوونی کردوەتەوە، خوای گەورە فەرمانی بەنوێژکردن کردوە بەڵام ژمارەی ڕکاتەکانی دیاری نەکردوەو چۆنیەتی نوێژی ڕوون نەکردوەتەوە، ئەمەش پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕوونی کردوەتەوەو فەرموویەتی: (صلوا كما رأيتموني أصلي)[181] واتە: نوێژ بکەن هەروەکو چۆن منتان دەبینی نوێژم دەکرد).

حەج لەقورئاندا بە (مجمل)ی هاتووە، ڕوونکردنەوەی خستووەتە ئەستۆی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، حەجی بەموسڵمان کردوو لەحەجی ماڵئاوایی دا فەرمووی: (لتأخذوا عني مناسككم)[182] واتە:(مناسك)ەکانتان لەمنەوە وەرگرن) واتە لەکردەوەو قسەکانم فێر ببن کە (مناسك)ەکانی خۆتانی پێ ئەنجام دەدەن، خوای گەورە دەفەرموێ: (لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِمَنْ كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا (٢١) الاحزاب) واتە: بە ڕاستی پەیامبەری خوا (ﷺ) چاکترین نموونەی ڕێك و پێکی و سەرمەشقە بۆتان، دەسا ئێوەش لە دڵسۆزی و سیاسەتی و جیهادی و ئارامی و تەقوای و تەواوی بوارەکانی ژیاندا چاوی لێ بکەن و بە دوایدا بچن بە تایبەتی بۆ ئەو کەسە، کە بە تەمای خوا و ڕۆژی دواییە یادی خواش زۆر دەکا).

جا قورئان پێویستی بەسوننەتە بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە، جا ئەو کەسەی تەنها قورئان وەردەگرێ، ئەوا قورئانی بچڕاندووە لەوەی ڕوونی دەکاتەوە، ئەمەش ئامانجی

---

١٨١ / متفق عليه .

١٨٢ / رواه مسلم (١٢٩٧) .

گومڕاکارانەو ئەوانەی لەدڵیاندا نەخۆشی و دوو دڵی هەیە، چونکە لادەران چمکێکی بەڵگەکان وەردەگرنو واز لەچمکەکەی تر دەهێنن کە ڕوونی دەکاتەوە، لایەکی بەڵگە (متشابهەکان) وەردەگرن و واز لەو لایە (مُحكم)ـەکە دەهێنن کە روونی دەکاتەوە، ئەمە ڕێگای لادەرانە، ڕێگای خۆبەزانازانو نەفامەکانە، ئەوانەی بانگەشەی عیلم دەکەن و ڕێگا و چۆنیەتی ئیستدلال کردن و بنەماکانی ئیستدلال نازانن، بۆیە حەرام دەکەنو حەلاڵ دەکەن بەبێ چاوڕوونی _پەنا بەخوا _ چونکە ئەوان بەرنامەی زانستیان نەگرتوەتە بەر، بەڵکو لەخۆیانەوە فێربوون یان لە کتێبەکانەوە فێربوون یان لەسەر دەستی کەسێکەوە وەکو خۆیانە لەنەفامیدا.

**﴿٧١﴾ نوسەر دەڵێت: (والكلام والجدال والخصومة في القدر خاصة منهي عنه عند جميع الفرق، لأن القدر سر الله، ونهى الرب جل تعالى الأنبياء عن الكلام في القدر، ونهى النبي (ﷺ) عن الخصومة في القدر،وكرهه أصحاب رسول الله (ﷺ) والتابعون، وكرهه العلماء وأهل الورع، ونهوا عن الجدال في القدر، فعليك بالتسليم والإقرار والإيمان، واعتقاد ما قال رسول الله (ﷺ) في جملة الأشياء واسكت عما سوى ذلك).**

واتە: قسەکردنو رکابەری و مشتومڕ کردن بەتایبەتی لەقەدەردا نەهی لێ کراوە لەلایەن هەموو گروپو کۆمەڵەکانەوە، چونکە قەدەر نهێنی خودایە، پەروەردگار نەهی کردوە لە پێغەمبەران قسە لەقەدەردا بکەن، پێغەمبەری خواش (ﷺ) نەهی کردووە لە مشتومڕ (خصومە)کردن لەقەدەرداو هاوەڵانی پێغەمبەری خوداش (ﷺ) حەزیان لێ نەکردوەو شوێنکەوتوانیش حەزیان لێ نەکردوەو زانایان و ئەهلی وەرع حەزیان لێ نەکردوەو نەهییان کردوە لە (جیدال) کردن لەقەدەردا بۆیە ئەوەی لەسەرتە تەسلیم بوون و دان پێدانان و باوەڕە، باوەڕ بەوەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی لەنێو کۆمەڵێ شتداو بێ دەنگ بە لەجگە لەوانە.

ڕاڤە/

لەبنەماو پایەکانی ئیمان بریتییە لە: باوەڕبوون بە قەزاو قەدەر، قەزاو قەدەر بریتییە لەوەی: خوای گەورە لەئەزەلدا قەزای کردوەو تەقدیری کردوە لەڕووداوەکان کە ڕوو دەدەن، هەر شتێك ڕوو دەدات هەرگیز لە خۆیەوە ڕوو نادات، یان بەبێ ئەوەی خوای گەورە لە پێشدا تەقدیری بۆ کردبێ، بەڵکو خوای گەورە ئەوەی ڕوویداوە زانیویەتی و ئەوەش ڕوو دەدات دەزانێ، ئەوەی لەڕابووردوودا بوەو ئەوەی لەئایندەدا دەبێ ئەمجار ئەوەی لە (اللوح المحفوظ)دا نووسیوە.

جا (أول ما خلق الله القلم، قال له: اكتب ما هو كائن إلى يوم القيامة، فجرى القلم بما هو كائن الى يوم القيامة)[١٨٣] **واتە: یەکەمجار خوای گەورە قەڵەمی دروست کرد پێی فەرموو: بنووسە ئەوەی ڕوو دەدات تاکو ڕۆژی قیامەت، بۆیە قەڵەمیش ئەوەی نووسی ڕوو دەدەن تاکو ڕۆژی قیامەت).**

**دروست کردنی (قەڵەم) لەپێشدا بووە، لەپێش دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی بە پەنجا هەزار ساڵ، ئەو کاتە عەرشی خوای گەورە لەسەر ئاو بوە[١٨٤]، لێرەدا بوە کێشە لەنێو زانایاندا: ئایە عەرش لەپێش قەڵەم دروست کراوە یان قەڵەم لەپێش عەرش دروست کراوە؟ ڕای ڕاستو پەسەند ئەوەیە[١٨٥]: عەرش لەپێش قەڵەم دروست کراوە، چونکە لەکاتی دروست کردنی قەڵەمدا و فەرمانی کردوە بە نووسین ئەو کاتە عەرشی خوا لەسەر ئاو بوە، بۆیە زانای پایەدار (ابن القيم) دەفەرموێت:**

| | |
|---|---|
| والنـاس مختلفون في القلم الذي | كتب القضـاء به من الديان |
| هل كان قبل العرش أو هو بعده | قولان عند أبي العلا الهمذاني |
| والحـق أن العرش كان قبلُ لانهُ | قبل الكتابة كـان ذا أركان |
| وكتـابة القلم الشريف تعقبت | إيجاده من غير فرق زمان[١٨٦] |

**قسەکردن دەربارەی قەدەر لەپێشدا باسکرا بەڵام ئەوەی لێرەدا باسی دەکەین نەهی کردن لە چوونە ناو باسەکەوە.**

---

١٨٣ / رواه أبو داود والطبراني والبيهقي وصححه الضياء في المختارة .

١٨٤ / رواه مسلم (٢٦٥٣) .

١٨٥ / ئەمەش قسەی جمهوری زانایانە تەماشای (بغية المرتاد) ابن تيمية و (البداية والنهاية)ی ابن كثير بكە.

١٨٦ /تەماشای شرح نونيە ابن القيم بكە لە نوسينی ابن عيسى(١/٣٧٥).

مەبەست لە: (والكلام والجدال والخصومة في القدر خاصة منهي عنه).

زانیمان باوەڕهێنان بەقەزاو قەدەر بەهەموو پلەكانییەوە، پایەیەكە لەپایەكان باوەڕبوون بەخوا، جا هەركەسێ باوەڕی بەقەزاو قەدەر نەبێت ئەوا ئیماندار نییە، چونكە نكۆڵی لەڕوكنێك لەڕوكنەكانی ئیمان كردوە.

هەروەها نابێت (جیدال) بكرێت لەقەزاو قەدەردا، بۆ خوای گەورە سزای ئەوە دەدات؟ بۆ خوای گەورە وا دەكات؟ هەروەكو چۆن لەپێشدا باسمان كرد كە ناگوترێت: بۆ؟ چۆن؟ بۆیە نابێ ڕووبەڕووی خوا ببینەوەو ڕەخنە بگرین، مەڕۆ ناو قەزاو قەدەرەوە بە (جیدال) كردن چونكە ناگەیتە ئەنجام، بۆیە ئەوەی لەسەرتە تەسلیم بوون و باوەڕبوونە، مەڕۆ نێو كارێك لەكارەكانی خوداوە، چونكە ئەوە هیچ كەسێك نازانێت تەنها خوا نەبێ، ناگەیتە ئەنجام، بۆیە دەڵێن: (قەدەر نهێنی خودایە)[187] جا نهێنی خوا هەرگیز دركی پێ ناكرێ و نازانرێت، بۆیە مەڕۆ ناو ئەو باسەوە بەڵكو لەسەرتە باوەڕ بهێنی بەوەی لەدەقەكاندا هاتوە لەقورئان و سوننەتدا، لێرەدا ڕاوەستی، ڕووبكەیتە كاری چاكەو واز لەتاوان و سەرپێچی بهێنیو مەڵێ:- ئەگەر خوا تەقدیری كردبێ من ئەهلی بەهەشتم ئەوا دەبمە ئەهلی بەهەشت هەرچەندە هیچ كارێكیش نەكەم و ئەگەر خوا تەقدیری كردبێ من ئەهلی ئاگر بم ئەوا دەبمە ئەهلی ئاگر، ئەمە قسەیەكی پووچەڵە.

بۆیە نابێت بچێتە ناو ئەو باسانەوە، چونكە ئەمە كاری بەندەكان نییە، ئەمە كاری خودایە، كاری تۆ كاركردنە، ئەمە پێویستە لە سەرت، بەڵام چوونە نێو باسی قەزاو قەدەرەوە ئەوە چوونە نێو گێجەڵێكەوە هەرگیز بەندەكان لێی دەرناچن.

---

١٨٧ / تەماشای (الاستذكار) ی ابن عبدالبر بكە (٢٦٣/٨) .

مەبەست لە: (منهي عنه عند جميع الفرق، لأن القدر سر الله).

لای هەموو ئوممەتەکان، چونکە قەدەر نهێنی خودایەو نهێنی ناکرێت بزانرێتو درکی پێ بکرێت، خوای گەورە دەفەرموێت (وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِنْ عِلْمِهِ إِلَّا بِمَا شَاءَ) البقرة/ ٢٥٥) واتە: هیچ کەسیش ناتوانێ بە پلەی زانینی خوادا بگا، مەگەر خوا خۆی بیەوێ، کە لە سەر زمانی پەیامبەران شتێکیان بۆ روون بکاتەوە و ئاگاداریان بکا).

دەفەرموێت: (يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِ عِلْمًا (١١٠)طه) واتە: خوا بەهەموو ئەو شتانە دەزانێت کەئەوان پێشیان خستووەو کردویانە لەدونیادا، هەروەها بەو شتانەش چاك دەزانێت کەلەڕۆژی دوایدا چاوەڕێیانە ئەوان بەزانین و عیلم ناتوانن دەورە بدەن بەبەڕێوەبردن و حیکمەتی خوا).

مەڕۆ ناو کاری خوداوە، بەلام لەسەرتە بڕۆیتە نێو کاری خۆتەوە، لەسەرتە کاری چاك بکەیت و واز لەتاوانەکان بهێنی و تەوبەی لێ بکەیت، لێپرسینەوە لە گەڵ خۆتدا بکەیت تاکو لەژیاندا ماویت، بەخۆتەوە خۆت خەریك بکە، بەلام خۆت خەریك بکەیت بەقەزاو قەدەرەوە، بۆ وا ڕوویدا؟ بۆ ڕوو دەدات؟ ئەگەر خوا تەقدیری شتەکانی کردبێ ئەوا من پێویستم بەکار کردن نییە، ئەمانە هەر هەموو قسەی پووچن و هیچ بایەخێکی نییە، کاتێ هاوەڵان بە پێغەمبەری خوایان (ﷺ) فەرموو: ئایا پشت بەوە نەبەستین بەوەی لەکیتابەکەماندا هەیە؟ ئەوەی تەقدیرمان بۆ کراوە، فەرمووی: (اعملوا فكل ميسر خلق له)[١٨٨] خوای گەورە ئەو ئایەتانەی دابەزاند کە دەفەرموێت: (إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّى (٤) فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى (٥) وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى (٦) فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى (٧) وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَى (٨) وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَى (٩) فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَى (١٠) الليل) ﴾[١٨٩] واتە: بێ گومان

١٨٨ / متفق عليه : أخرجه البخاري (١٢٩٦) ومسلم (٢٦٤٧) .

١٨٩ / رواه البخاري (٤٦٦١) ومسلم (٢٦٤٧) .

کارو تێکۆشانی ئێوەش ئەی مرۆڤ هەروا جیاوازو جۆراو جۆرە(٤) ئینجا ئەوەی ماڵو سامانی خۆی لە بەر خوا بەخشی و لە نافەرمانی خوا خۆی پاراست (٥) وە بڕوای بە پاداشتی چاکتر کرد (٦) ئەوا ئێمەش بێ گومان بۆ بەهەشت و بۆ کاری ئاسان و چاك ئامادەو رێنوینی دەکەین، دەیخەینە سەر راستە رێ (٧)وە ئەوەش چرووکی کرد و خۆی بێ نیاز گرت (٨) بڕواشی بە پاداشی چاکتر نەکرد لە لای خوا (٩) ئەوا ئێمەش کار ئاسانی بۆ دەکەین بۆ دژوارترین رێگە (١٠).

جا تۆ هۆکارەکە ئەنجام دەدەیت یان بۆ ڕزگار کردنی خۆتو یان بۆ بەهەلاکەت بردنیدا، بەو کارانەی خۆت ئەنجامی دەدەی بەهەڵبژاردن و ویستی خۆت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (کل الناس یغدو، فمعتق نفسه أو موبقها)[١٩٠].

مەبەست لە: (ونهی الرب جل تعالی الأنبیاء عن الکلام في القدر).

خوای گەورە نەهی کردوە لە پێغەمبەران و جگە لەوان لە باسکردن و قسەکردن دەربارەی قەدەر، پێغەمبەران نەهاتووە دەربارەیان کەوا ڕووبەڕووی قەدەر بووبێتنەوە هەرگیز، چونکە ئەوان مەزنی خواو حیکمەتی ئەو دەزانن، بۆیە تەسلیم دەبنو بەئەدەب دەبن بەرانبەر بەخوا، پرسیار لەشتێك ناکەن بەرژەوەندیو سوودی ئەوانی تێدا نەبێ، جا پێغەمبەران پرسیاریان دەربارەی نەکردووە، هەروەها شوێنکەوتەی پێغەمبەرانیش پرسیاریان دەربارەی نەکردووە هەرگیز.

بەڵکو پێغەمبەران و شوێنکەوتوانیان ڕوویان دەکردە کارکردن و بایەخیان پێ دەدا، هەرگیز پرسیاریان دەربارەی قەزاو قەدەر نەکردووە ئیللا لەڕووی باوەڕو ئیمان هێنان پێی نەبێ.

---

١٩٠ / أخرجه مسلم (٢٢٣) .

باوەڕبوون بەقەزاو قەدەر ئاسوودەت دەكات لەگومان و خەم و پەژارە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (اعلم أن ما أصابك لم يكن ليخطئك، وما أخطأك لم يكن ليصيبك)[١٩١] واتە: بزانە ئەوەی تووشی تۆ بوە نەئەبوایە لێت لایبدایەو تووشت نەبوایە، ئەوەی تووشت نەبوو نەئەبوایە تووشت ببێت).

بۆیە مەڵێ:_ ئەگەر من وام بكردایە ئەوا ئاوا ڕووی دەدا.

بەڵكو بڵێ:_ ئەوەی خوای گەورە خۆی ویستی لەسەر بوو ڕووی دا[١٩٢].

مەبەست لە: (ونهى النبي عن الخصومة في القدر وكرهه أصحاب رسول الله وكرهه التابعون وكرهه العلماء وأهل الورع).

كاتێ كۆمەڵی (القدرية) دەركەوتن لەكۆتایی سەردەمی هاوەڵاندا ئەوا هاوەڵان ئەو بەڕی ئینكارییان لێ كردن و خەڵكیان لێ ئاگادار كردەوەو ڕوونیان كردەوە كەوا پێویستە لەسەر بەندەكان باوەڕ بكەن بەوەی تووشیان بووە ئەوا نەئەبوو لێی هەڵەی بكردایەو ئەوەی كە تووشی نەبووە ئەوا نەدەبوو تووشی ببێ و هەر كەسێ باوەڕی بەئەمە نەبێ ئەوا خوای گەورە بەئاگر دەیسووتێنێ[١٩٣]، ئا بەم شێوەیە هاوەڵان ڕێك كەوتن كاتێ گرووپی (القدرية) لەسەردەمی ئەواندا دەركەوت.

مەبەست لە: (فعليك بالتسليم والاقرار والايمان).

ئەمە پێویستە لەسەرت بەرانبەر بەقەزاو قەدەر: تەسلیم بوون بەقەزاو قەدەری خوا، هەرگیز بەرەنگاری نەبیتەوە، باوەڕت وابێ خوای گەورە هەرگیز هیچ شتێك ناكات بەبێ حیكمەت، سزای هیچ كەسێك نادات ئیللا بەكردەوەی خۆی نەبێ، جا

١٩١ / صحيح : سبق تخريجه .

١٩٢ / تەماشای (صحيح مسلم) بكە (٢٦٦٤) .

١٩٣ / تەماشای (مسند أحمد) (٥/١٨٥-١٨٩) و سنن ابو داود (٤٦٩٩) و سنن ابن ماجه (٧٧) بكە .

خەلەل لەخۆتە، لەجێی ئەوەی لۆمەی قەدەر بکەین ئەوا لۆمەی خۆت بکەو تەوبە بکەو بگەڕێوە بۆ لای خوا هیچ کەسێك ڕێگرت نییە لەتەوبەکردن، خوای گەورەش تەوبەی ئەو کەسانە وەردەگرێ تەوبە دەکەن، ئیتر بۆ خۆت بەشتێکەوە خەریك دەکەیت بەرژەوەندی تۆی تێدا نییە؟؟!

جا تەسلیم و ملکەچ بوونت لەسەرە، نەچیتە نێو باسێکەوە پەیوەندی بەتۆوە نییە، لەفەرمودەکەی ئەبو هورەیرە دا هاتووە کەوا خۆشەویست (ﷺ) فەرموویەتی: (من حسن الاسلام المرء تركه ما لا يعنيه)[١٩٤].

مەبەست لە: (واعتقاد ما قال رسول الله (ﷺ) في جملة الأشياء واسكت عما سوى ذلك).

واتە باوەڕت بەوە هەبێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی چونکە ئەو هەرگیز لەخۆیەوە قسەناکات، فەرموودەکان تۆمەتبار مەکە، یان گومانی لێ دروست مەکە لەبەر ئەوەی سابتو جێگرن لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) چونکە هیچ بواری دڵەڕاوکێی تێدا نییە، (فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنْفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا (٦٥) النساء) واتە: نەخێر سوێند بە پەروەردگارت ئەی پێغەمبەر (ﷺ) نابنە باوەڕدار تا بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەکانی نێوانیان تۆ دەکەنە داوەر و ئەوساش بەرامبەر بەو بڕیارەی تۆ داوتە، هیچ تەنگیەکیان دەست نەکەوێ لەدەرونیاندا و بەچاکیش تەسلیم و ملکەچ بن).

هەروەها دەفەرموێت: (وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُبِينًا (٣٦) الاحزاب) واتە: بۆ هیچ پیاو و ژنێکی بڕوادار نییە کاتێ خواو پەیامبەرەکەی (ﷺ) بڕیاری کارێکیان دا سەرپشککرانیان بۆ هەبێ لە کارەکەیاندا واتە: بۆیان نییە خۆیان بارێك هەڵبژێرن،

---

١٩٤ / رواه الترمذي وابن ماجه والبيهقي وابن حبان .

بەڵکو دەبێت بێ سەرلێکردنەوە فەرمانبەردار و ملکەچ بن، هەر کەسێك سەرپێچی بکات لە فەرمانی خواو پەیامبەرەکەی (ﷺ) بەو شێوەیە کە جگە لە بڕیارەکانی ئەوان کارێکی دی هەڵبژێرێ بۆ خۆی ئەوە بێ گومان گومڕا بووە بە گومڕابوونێکی ئاشکرا).

چەندین ئایەتی تر لەشێوەی ئەوانە، جا ئەوەی پێویستە لەسەرت: جێ بەجێ کردن و تەسلیم بوون و ملکەچ بوونە).

مەبەست لە: (في جملة الاشياء) واتە: هەموو شتەکان، پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەموو ئەوەی خەڵکی پێویستیان پێیەتی لەکارو باری دینەکەیان پێی ڕاگەیاندوون، خوای گەورە دینەکەی پێ کامل کردوە، هیچ خەیرو چاکەیەك نییە ئیللا بە ئوممەتەکەی ڕاگەیاندوەو هیچ خراپەو شەڕێك نییە ئیللا ئوممەتەکەی لێ ئاگادار کردوەتەوەو ئوممەتەکەی لەسەر ڕێگایەکی سپیو ڕوون بەجێ هێشتوە شەوەکەشی وەکو ڕۆژە هیچ کەسێك لێی لانادات ئیللا بەهەلاکەتدا دەچێ.

مەبەست لە: (واسكتْ عما سوى ذلك) ئەمە هەروەکو ئەوەیە لەفەرموودەکەدا هاتوە: (إن الله فرض فرائض فلا تضيعوها وحرم أشياء فلا تنتهكوها وسكت عن أشياء رحمة بكم غير نسيان فلا تسألوا عنها)[١٩٥] تۆ پرسیار مەکە تەنها دەربارەی شتێك نەبێ پێویستت پێی دەبێ لەکاروباری دینەکەت یان دونیاکەت، (من حسن الاسلام المرء تركه ما لا يعنيه) بەلام پرسیارکردن لەشتێك پێویستت پێی نەبێ ئەوا پرسیار کردن لەبارەیەوە پێی دەڵێن: خۆتێهەڵقورتاندن (الفضول) وە پێغەمبەری خوا (ﷺ): (نهى عن قيل وقال وكثرة السؤال وإضاعة المال)[١٩٦] جا با پرسیارەکانت بە ئەندازەی پێویستیت بێت، پرسیار مەکە لەشتێك پێویستت پێی نییە.

---

١٩٥ / سبق تخريجه .

١٩٦ / رواه البخاري (١٤٠٧) ومسلم (٥٩٣) .

**﴿٧٢﴾ نوسەر دەڵێت: (والإيمان بأن رسول الله (ﷺ) أسري به إلى السماء وصار إلى العرش وكلم الله تبارك وتعالى ودخل الجنة واطلع الى النار ورأى الملائكة وسمع كلام الله عز و جل ونشرت له الأنبياء ورأى سرادقات العرش والكرسي وجميع ما في السموات وما في الارضين في اليقظة حمله جبريل على البراق حتى أداره في السموات وفرضت عليه الصلوات الخمس في تلك الليلة ورجع إلى مكة ليلته وذلك قبل الهجرة).**

واتە: باوەڕبوون بەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئیسرای پێ کرا بۆ ئاسمان‌و ڕۆیشت بەرەو ئاسمان، لەگەڵ خوای گەورەدا قسەی کردو چوە بەهەشتەوەو ئاگری بینی و فریشتەی بینی‌و قسەی خوای گەورەی بیست‌و پێغەمبەرانی بۆ کۆکرایەوە، دەوروبەری عەرش‌و کورسی‌و هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکان‌و زەوی دا هەیە بینی بە ئاشکراو بە بەئاگایی، جبریل لەسەر پشتی بوراقدا هەڵیگرت‌و تاکو بە ئاسمانەکاندا گەڕاندی‌و ئەو شەوە پێنج نوێژەکەی لەسەر فەرزکراو هەر ئەو شەوە گەڕایەوە مەککە، ئەمەش لەپێش هیجرەت ڕوویدا.

**ڕاڤە/ مەبەست لە** (والإيمان بأن رسول الله أُسري به إلى السماء).

ئەمە یەکێکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، جا هەر لەباوەڕبوون بە پێغەمبەر (ﷺ)، باوەڕبوونە بە موعجیزەکانی ئەوەی کە دەلالەت دەکات بۆ ڕاستێتی پەیامەکەی، گەورەترین موعجیزە: قورئان‌و سوننەتە، ئەمە گەورەترین موعجیزەی پێغەمبەرە (ﷺ)، ئەمەش موعجیزەیەکە تاکو ڕۆژی قیامەت دەمێنێ و بەردەوامە.

هەروەها لەموعجیزەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئیسراو میعراجە.

ئیسرا: بریتییە لەشەوڕەوی، (میعراج)یش بریتییە لە چوونە سەرەوە، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەشەو ئیسرای پێکرا لە (المسجد الحرام)ەوە لە مەککە بۆ (المسجد الاقصی) لە فەڵەستین، لەیەك شەودا بە هاوڕێتی جبریل، ئەمجار لە(بیت المقدس)ەوە بەرەو ئاسمان بەرزکرایەوە،چۆن بەیەك شەو لەمەککەوە ڕۆیشت بۆ (بیت المقدس)و ئەمجار بەرزکرایەوە بۆ ئاسمانو ئەمجار لە ئاسمانەوە دابەزیو ئەمجار گەڕایەوە بۆ مەککە؟؟ ئەمە هەموو بە تواناو دەسەڵاتی خوا بوو کەهیچ شتێك لەژێر دەستی دەرناچێ، ئەمە بە توانای پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەبوو، بەڵکو بەتوانای خوای تاك و تەنهایە کە هیچ شتێك لەژێر دەستی دەرناچێ، (بوراق)یان بۆ هێنا کە بریتییە لە وڵاخێکی خێرا هەنگاوی بەئەندازەی هێندەی چاو بڕ دەکات ئەوەندەیە، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) سواری بوو جبریلیش هاوڕێی بوو بەرەو (بیت المقدس) ئەمە ئیسرایە.

(میعراج)یش: ئەوەیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە (بیت المقدس)ەوە بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان، حەوت چینەکەی ئاسمانی تێپەڕاندو گەیشتە (سدرە المنتهی)و گوێی لەقسەی خوا بوو، خوای گەورە فەرمانی ئەنجامدانی نوێژی پێ کرد، لەم شەوەدا بەهەشتو دۆزەخی بینی، لەم شەوەدا پێغەمبەرانو نێردراوانی خوای لە ئاسمانەکاندا بینی، خوای گەورە ئەوانی بۆ کۆکردەوە ئەویش پێش نوێژی بۆ کردن، وەك دەرخستنی فەزڵی بەسەر ئەواندا، خوای گەورە پێنج نوێژەکەی لەسەر فەرز کرد کە هێشتا ئەو لە ئاسمان بوو، ئەمجار خۆشەویست دابەزی بۆ (بیت المقدس) ئەمجار لە (بیت المقدس)ەوە گەڕایەوە (مەککە) بەیەك شەو، ئەو شەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە مەککە ڕۆژی کردەوە.

ئەو ئیسراو میعراجە بەجەستەو ڕۆح ڕوویدا[١٩٧]، تەنها بە ڕۆحی نەبوو هەروەکو هەندێ کەس ئینکاری لێ دەکات یان ئەوانەی ئەم شتە بەنامۆ دەزانن و دەڵێن: ئەو تەنها بە ڕۆحی ئیسرای پێکرا بەبێ جەستەی، ئیسرایش خەو بینین نییە، ئەوە موعجیزەیەکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەری نازدار (ﷺ)، خوای گەورە دەفەرموێت: (سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلًا مِنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الْأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ (١) الاسراء) واتە: پاکەو خاوێنە لەبەر چی شتێك لەهەرشتێکی ناپەسەندو خراپ، ئەو خوایەی کە شەوڕەوی بەبەندەی خۆی (موحەممەد) (ﷺ) کرد لەبەشێکی زۆر کەمی شەوێکدا لەمزگەوتی (حەرام)ەوە لەمەککەدا بۆ مزگەوتی (بیت المقدس) لەفەلەستیندا، ئەو مزگەوتەی ئێمە دەوروبەریمان پیرۆزو پیتدار کرد تا هەندێ نیشانەکانی دەسەڵات و توانایی خۆمانی پێ نیشان بدەین لەو شەو ڕەوییەدا هەر ئەوە زۆر بیسندەو زۆر بیناو بەئاگا).

لەم شەوەدا چەندین شتی سەرسوڕهێنەری بینی، هەروەکو چۆن خوای گەورە دەفەرموێت(: لَقَدْ رَأَى مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَى (١٨) النجم)، لە سورەتی (الاسراء) دا دەڵێ: (لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا) لەم گەشتە پیرۆزەدا چەندین ئایەتی خوای بینی، جا پێویستە لەسەر موسڵمان باوەڕ بەوانە بهێنێ و بەڕاستی بزانێ، بچووکترین گومان لەدڵیدا دروست نەبێ لەو شتەدا، هەر کەسێ ئینکاری لێ بکات ئەوا کافرە، چونکە خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بەدرۆ خستوەتەوە، ئیجماعی موسڵمانانیش بەدرۆ دەخاتەوە.

---

١٩٧ / تەماشای تفسیر ابن کثیر (٣/ ٢٣-٢٤) و فتح الباري (١/٤٦٠) و (شرح العقیدة الطحاویة) ی ابن ابي العز (٢٤٥-٢٤٦) بکە .

مەبەست لە: (ودخل الجنة واطلع الى النار).

چوە ناو بەهەشتەوەو هەموو خۆشییەکانی بەهەشتی بینیو تەماشای ئاگری کردو سزاو ناخۆشییەکانی بینی، چونکە خوای گەورە دەیەوێ ئایەتەکانی خۆی نیشان بدات.

مەبەست لە: (ورأى الملائكة).

جبریلی بینی لەسەر شێوە فریشتەییەکەی خۆی کە سێ سەدو شەست باڵی هەبوو، هەر باڵێکی بەر ئاسۆی گرتوە، جا فریشتە دروستکراوێکی مەزنە، جبریلیش مەزنترین فریشتەیەو گەورەی فریشتەکانە، جا فریشتەی بینیو پێغەمبەرانی بینی لە کاتێکدا ئەوان مردوون، خوای گەورە ئەوانی بۆ کۆکردەوە، خواش توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

مەبەست لە: (ورأى سرادقات العرش والكرسي).

دەوروبەری عەرشو کورسی بینی، ئەوانیش دوو دروستکراوی مەزنن، مەزنترینی دروستکراوەکانو ئەوانەی لە دەوروبەری ئەون.

مەبەست لە: (وجميع ما في السموات في اليقظة).

ئەمە ڕەدو وەڵامی ئەو کەسانەیە دەڵێن: بەخەو بووە، جا ئەگەر خەو بوایە ئەوا بێ باوەڕان ئینکارییان لێ نەدەکرد، چونکە ئینکاری لەخەو ناکرێت، ئەوان ئینکاری ئەوەیان کرد لەکاتی بە ئاگابووندا، خوای گەورە دەفەرموێت: (أَسْرَى بِعَبْدِهِ) وشەی (العبد) ناوێکە بۆ ڕۆح و جەستە پێکەوە بەکار دەهێنرێت، چونکە ڕۆح بەتەنها پێی ناگوترێ (عبد) هەروەها جەستەش بەبێ ڕۆح پێی ناگوترێ (عبد)، بۆیە ناگوترێت (عبد) ئەگەر ڕۆح و جەستە پێکەوە نەبێ.

مەبەست لە: (حمله جبريل على البراق) بوراق: ولاخێکه.

مەبەست لە: (وفرضت عليه الصلوات الخمس تلك الليلة).

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر مەزنی ئەم پێنج نوێژە، کەوا فەرز کرایە سەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ئاسمان لەنێوان خۆیو خوادا بەبێ هیچ (واسطة)یەك، بەجیاواز لە گەڵ ئەو شەریعەتەکانی تردا، چونکە ئەوانی تر دادەبەزێنە سەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر زەویو بە (واسطة)ی جبریل ئەمەش بەڵگەی مەزنی ئەو پێنج نوێژەیە لای خوای گەورە.

کاتی ڕوودانی ئیسرا لە پێش کۆچکردن بوو بۆ شاری مەدینە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێنج نوێژەکەی لەمەککە ئەنجامدا.

مەبەست لە: (ورجع الى مكة ليلته، وذلك قبل الهجرة).

هەر ئەو شەوە گەڕایەوە مەککە، بۆیە بێ باوەڕان بەوە سەرسام بوون، خۆشحاڵ بوون بە باسکردنی ئەم ڕووداوە چونکە بەهۆیەوە ڕەخنەیان لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) گرت، گاڵتەیان پێکرد، بەڵام خوای گەورە فێڵی ئەوانی ڕەد کردەوەو گەڕاندەوەو پێغەمبەری (ﷺ) پشت ڕاستکردەوە و لەوبارەیەوە قورئانی دابەزاند.

**﴿٧٣﴾ نوسەر دەڵێت: (واعلم أن أرواح الشهداء في حواصل طير خضر تسرح في الجنة وتأوي إلى قناديل تحت العرش[١٩٨] وأرواح الفجار والكفار في بئر برهوت[١٩٩]، وهي في سجين)**

واتە: بزانە ڕۆحی شەهیدەکان وان لە چیکلدانی(حواصل)ی باڵندەی سەوزدا لەبەهەشتدا دەگەڕێن، دەگەڕێنەوە بۆ چراکانی (قناديل) ژێر عەرش، ڕۆحی خراپەکاران و بێ باوەڕان لەبیری (برهوت)دان، ئەویش لە (سجين)دایە.

ڕاڤە/

**مەبەست لە:** (واعلم أن أرواح الشهداء في حواصل طير خضر تسرح في الجنة).

ڕۆحەکان کە مرۆڤەکان بەهۆیەوە دەژێن ودەجوڵێنەوەو درکی پێ دەکەن، نهێنییەکە لەنهێنییەکانی خوای گەورە، هیچ کەسێك دەربارەی نازانێن تەنها خوا نەبێ، واتە هیچ کەسێك حەقیقەتەکەی نازانێ تەنها خوا نەبێ، خوای گەورە دەفەرموێت:(وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا (٨٥) الاسراء) واتە: لە بابەت (ڕۆح)ـەوە لێت دەپرسن و دەڵێن: باشە ئەو ڕۆحەی کە هۆی ژین و زیندوێتی ئادەمیزادە چییە؟ پێیان بڵێ: ڕۆح منیش هیچی لێ نازانم چونکە لە فەرمانە نهێنییەکانی پەروەردگارمەو ئێوە بە تایبەتی لە بابەت ڕۆحەوە بەشێکی کەم زانیاریتان پێ دراوە).

---

١٩٨ / كما في الحديث الذي أخرجه مسلم (١٨٨٧) .

١٩٩ / هیچ فەرموودەیەکی (صحیح) لەم بارەیەوە نەهاتووە .

لەسەر قسەی ئەوانەی دەڵێن: مەبەست لە (روح) لێرەدا: بریتییە لەوەی مرۆڤەکان‌و گیانلەبەران و هەموو خاوەن ڕۆحەکان پێی دەژین و دەڵێن: مەبەست لە (روح) لێرەدا: جۆرێکە لەفریشتەکان، خوای گەورە خۆی زاناترە.

(روح) لەزمانەوانیدا: بەو شتە دەگوترێت کە خاوەن ڕوحەکان بە هۆی ئەوەوە دەژین، چونکە ژیان دوو بەشە:-

١ - ژیانێکی جووڵە: ئەمەش لەخاوەن ڕۆحەکاندا هەیە.

٢ - ژیانێکی گەشەو نش‌ونماکردن: ئەمەش لەدارو ڕووەکدا هەیە[٢٠٠]، ژیانی کۆرپەلە لە سك دایکیدا لەپێش ئەوەی ڕۆح بە بەریدا بکرێت لەم بەشەیە، جا کە ڕۆح بەبەریدا کرا ئەوا دەبێتە ڕۆحی جووڵە بەڵام لەپێش ئەوە ڕۆحی گەش و نمای تێدایە.

(متکلم)ەکان و فەیلەسوفاکان لە حەقیقەتی ڕۆحدا یەك دەنگ نین و نەیانتوانی لێی تێ بگەن و لەو باسەدا لێیان تێك چوو و هەڵەیان زۆر کردو نەیانتوانی درکی پێ بکەن.

---

٢٠٠ /بۆ زانینی جۆرەکانی ژیان تەماشای (زاد المعاد) (٥/٧٥٥) بکە .

**﴿٧٤﴾ نوسەر دەڵێت: (والإيمان بأن الميت يُقعدُ في قبره وترسل فيه الروح حتى يسأله منكر ونكير عن الإيمان وشرائعه ثم تسل روحه بلا ألم).**

ويعرف الميت الزائر إذا زاره[٢٠١] ويتنعم المؤمن في القبر ويعذب الفاجر كيف شاء الله**)**.

**واتــە: بــاوەڕبوون بــەوەی مــردوو لــە گۆڕەکەیــدا دادەنیــشرێت و ڕۆحەکــەی بۆدەگێڕدرێتــەوە تــاکو (منکــر و نکــیر) پرســیاری لێ دەکــەن دەربــارەی ئیمــان و شەریعەتەکانی ئەمجار ڕۆحەکەی لێ دەردەچێ بەبێ هیچ ئازارێك.**

**مــردوو دەزانــێ هــەر کەســێك ســەردانی بکــات، کەســی ئیمانــدار لەگۆڕەکەیــدا لەخۆشیدایەو سزای خراپەکار دەدرێت بەو شێوەی خوای گەورە ویستی لێ بێ).**

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (والإيمان بأن الميت يقعد في قبره).

**پێویــستە باوەڕمــان بــەوە هــەبێ مــردوو لەگۆڕەکەیــدا دادەنیــشرێتو ڕۆحەکــەی دەگەڕێتەوە بۆ جەستەی، ئەمجار دوو فریشتە دێن بۆ لای، یەکێکیان (مونکەر)ەو ئــەویتر (نــەکیر)ە، جــا پرســیاری لێ دەکــەن، ئەمــەش فیتنەیــە لەقــەبردا، ئــەویش سەختترین شتە لەسەر مردوو، ئەگەر لەم فیتنەیە ڕزگاری بــوو ئــەوا لەوانــەی پــاش ئەویش ڕزگاری دەبێ، بەڵام ئەگەر لەم فیتنەیە ڕزگاری نەبێ ئەوا بەهەلاکەتدا دەچێ و ڕزگار بوونی نییە، لەبارەی سێ مەسەلەوە پرسیاری لێ دەکەن:**

**پەروەردگارت کێ یە؟**

**جا کەسی ئیماندار دەڵێ: پەروەردگاری من (الله)یە، بــەڵام کەســی دووڕوو و دوو دڵ دەڵێ: ها ها نازانم.**

---

**٢٠١ / هیچ فەرموودەیەکی (صحیح) لەم بارەیەوە نەهاتووە .**

ئەمجار پێی دەڵێن: ئەی پێغەمبەرەکەت کێیە؟

جا کەسی ئیماندار دەڵێ: پێغەمبەری من (محمد)ـە (ﷺ)، بەڵام کەسی دووڕوو دەڵێت: ها ها نازانم.

کەسی ئیماندار قەبرەکەی بۆ فراوان دەبێتەوە، لە بەهەشتەوە بۆی فەرش دەکرێت، دەرگایەکی لەبەهەشتەوە بۆ دەکرێتەوەو لەبۆن و بەرامی بەهەشتی بۆ دێت، لەقەبرەکەدا بەخۆشی دەمێنێتەوە.

کەسی بێ باوەڕو دووڕوو: قەبرەکەی لەسەر تەنگ دەکرێتەوەو بەئاگرەوە فەرشی بۆ دەکرێ‌و دەرگایەکی لە ئاگرەوە بۆ دەکرێتەوەو لە گەرمی و ناخۆشی ئاگری بۆ دێت.

ئەمە مانای ئەو قسەیەیە کە دەڵێت: (وترسل فيه الروح حتى يسأله منكر ونكير عن الإيمان وشرائعه).

مەبەست لە: (ويعرف الميت الزائر إذا زاره).

بۆیە دروستە سەردانی گۆڕستان بکرێ چونکە مردوو سەبووری بۆ دێت بەسەردان کردنی، ئەمەش لەباس‌و کاروباری بەرزەخە، ئێمە دەربارەی ڕۆژی دوایی‌و بەرزەخ هیچ شتێك ناڵێین ئیللا ئەوە نەبێ بەبەڵگەوە سابت‌و جێگربوە، چونکە ئەوە لەعیلمی غەیبە کەهیچ کەسێك دەربارەی نازانێ تەنها خوا نەبێ و لە ئەمەشەوە ئەوە وەرناگیرێت کەمردوو دروستە داوای شتی لێ بکرێ، دەڵێن: لەبەر ئەوەی ئەو مردووە دەزانێ کێ سەردانی دەکات ئیتر بۆ پێداویستییەکانمانی لێ داوا نەکەین؟ دەڵێین: ئەمە خوای گەورە بەشەرعی دانەناوە، مردوو داوای هیچ شتێکی لێ ناکرێ، هاوەڵان هەرگیز داوای هیچ شتێکیان لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) نەدەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو زیندووە لە قەبرەکەیدا بە ژیانێکی بەرزەخی کە ژیانی دونیایی نییە.

مەبەست لە: (ويتنعم المؤمن في القبر ويعذب الفاجر كيف شاء الله).

لەبنەماکانی ئیمان: باوەڕبوونە بەسزاو خۆشی ناو گۆڕ، بە جیاواز لەگەڵ کۆمەڵی موعتەزیلەدا کە ئەوان ئینکاری لەوە دەکەن و دەڵێن: مردوو لەگۆڕەکەیدا هەر وەکو ئەو کاتەیە کە نێژامان نەسزا دەبینێ و نە خۆشی، پشت بەعەقڵ و چاوو بیرو بۆچوونی خۆیان دەبەستن و باوەڕیان بە غەیب نییە، دونیا لەگەڵ دوا ڕۆژدا هاوتا ناکرێت و قیاس ناکرێت، یان دوا ڕۆژ لەگەڵ دونیادا، بۆیە پێویستە لەسەرت باوەڕ بەغەیب بکەیت.

سزاو خۆشی ناو گۆڕ سابت و جێگیرە، بەڵکو (متواتر)ـە لە فەرموودەکاندا کەوا مردوو یان سزا دەدرێت لە قەبرەکەیداو یان لەخۆشیدا دەبێ، جا هەر کەسێك ئینکاری بکات لەسزای ناو گۆڕ لەکاتێکدا دەقەکان و بەڵگەکان دەزانێ ئەوا کافرە، بەڵام ئەگەر ئینکاری لێ بکات لەڕووی تەئویلەوە یان تەقلیدەوە و یان نەزانینەوە ئەوا حەقی بۆ ڕوون دەکرێتەوە، جا ئەگەر سوور بوو لەسەری لەپاش ڕوونکردنەوە ئەوا حوکمی کوفر دەدرێت بەسەریدا.

**﴿٧٥﴾ نوسەر دەڵێت: (والإيمان بأن الله هو الذي كلم موسى بن عمران يوم الطور وموسى يسمع من الله الكلام بصوت وقع في مسامعه منه لا من غيره فمن قال غير هذا فقد كفر بالله العظيم).**

واتە: باوەڕبوون بەوەی خوای گەورە ئەو بوو لەگەڵ موسای کوڕی عیمراندا قسەی کرد لە ڕۆژی (الطور) و موسایش گوێی لەقسەکانی خوا بوو بەدەنگەوە گەیشتە گوێی موسا، لەجگە لەخواوە نەبوو، جا هەرکەسێك جگە لەم قسەیە بکات ئەو کوفری بەخوای مەزن کردوە.

ڕاڤە/

سەلماندنی قسەکردن بۆ خوای گەورە لەبنەماکانی بیرو باوەڕی ئەهلی سوننەو جەماعەیە، کەوا خوای گەورە قسە دەکات بەقسەکردنێکی حەقیقی، جبریل لەئەوەوە بیستی، موساش لەئەوەوە بیستی کاتێ ڕۆیشت بۆ لای ئاگرەکە بۆ ئەوەی لەئاگرەکە بهێنێ، بینی کەوا خوای گەورە لەدارەکەوە قسەی لەگەڵدا دەکات، هەروەکو چۆن خوای گەورە لەقورئاندا باسی ئەوەی کردوە، موسا قسەکەی خوای گەورەی بیست، خوای گەورە دەفەرموێ: (وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا (١٦٤) النساء) واتە: خوای میهرەبان بۆ خۆی_ڕاستەوخۆ قسەی لەگەڵ موسادا کردووە بۆیە پێی دەوترێ (کلیم)).

خوای گەورە دەفەرموێ: (وَلَمَّا جَاءَ مُوسَى لِمِيقَاتِنَا وَكَلَّمَهُ رَبُّهُ (١٤٣) الاعراف) واتە: ئەوسا کەموسا هات بۆ شوێنی موناجاتەکە لەگەڵمان و پەروەردگاری کەوتە قسەو گفتوگۆ لەگەڵی و گوێی لە دەنگییەوە بوو).

ئەمە جاری دووەمە کاتێ خوای گەورە کاتێکی بۆ دیاری کرد تەوراتی پێ ببەخشێ، موسا ڕۆیشت بۆ جێگای دیاریکراو و خوای گەورە قسەی لەگەڵدا کردوو بەنوسراوی تەوراتی لەچەند(لوح)ێکدا پێدا، جا موسا گوێی لەقسەکانی خوا بوو.

لە شەوی میعراجدا خوای گەورە لەگەڵ پێغەمبەرمان (محمد) (ﷺ) قسەی کرد و پێنج نوێژەکەی لەسەر فەرز کرد، جا خوای گەورە قسە دەکات بەقسەکردنێ کە دەبیسترێ و بەپیت و بەدەنگ.

بەڵام جەهمی‌و موعتەزیلەکان دەڵێن: خوای گەورە قسە ناکات چونکە ئەگەر قسەکردن بۆ خوا بسەلمێنین ئەوا ئێمە بە دروستکراوەکانمان شوبهاندوە، چونکە دروستکراوەکان قسەدەکەن، ئایە قسەکردنی خوا بەقسەکردنی دروستکراوەکان قیاس دەکرێ؟ جیاوازی هەیە لەنێوان قسەی خواو قسەی دروستکراوەکاندا، جا ئەوان جیاوازی ناکەن لەنێوان خوداو دروستکراوەکانیدا_پەنا بەخوا _ لەئەنجامی گێلی عەقڵ و تێگەیشتنیان، جا خوای گەورە قسەدەکات بەقسەکردنێ ببیسترێ، قورئانیش قسەی خوای گەورەیە، خوای گەورە فەرموویەتی و قسەی پێ کردوەو بەتەورات و بەئینجیلیش قسەی کردووەو ئەوانیش قسەی ئەون، هەرکاتێ ویستی لێ بێ قسە دەکات، ئەگەر بیەوێ، جا قسەکردنەکەی لە کرداری (فعل)ی ئەوە، فعلی ئەویش سەرەتاو کۆتایی نییە، قسە دەکات هەرکات بیەوێ، ئەگەر بیەوێ، بەهەر شتێك بیەوێ، جا قسەکردن سیفەتێکە لەسیفاتە (فعل)ییەکان.

مەبەست لە: (منه سبحانه لا من غيره).

واتە لەدارەکەوە نەبوو، لە (اللوح المحفوظ)ەوە نەبوو، لە (جبريل)ەوە نییەو لە (محمد)یشەوە (ﷺ) نییە، جا ئەوە قسەیەکی حەقیقیە لەخوداوە (جبريل‌و محمد) تەنها ئەوەیان گواستوەتەوە لەلایەن خوداوە و لەلایەن ئەوەوە گەیاندیان.

مەبەست لە: (فمن قال غير هذا فقد كفر بالله العظيم).

هەر کەسێ بڵێت: قسەی خوا دروستکراوەو خوای گەورە قسەناکات و سیفەتی قسەکردنی خوای لەکارخست (تعطيل) کرد ئەوە کافرە، چونکە ئەوە خواو پێغەمبەرو

(ﷺ) ئیجماعی موسڵمانانی بەدرۆ خستوەتەوە، ئیللا مەگەر کەسێك بێت نەفام بێت یان تەئویلی کردبێ یان چاولێکەر (مقلد) بێت بۆ کەسێ کە گومانی باشی پێیان هەیە، ئەوا ئەو کەسانە بۆیان ڕوون دەکرێتەوەو ئەگەر سوور بوون لەسەری ئەوا حوکمی کوفر دەدرێتە سەریاندا، چونکە خوای گەورە موشریکەکانی بەوە عەیبدار کرد کەوا ئەوان بتێك دەپەرستن قسە ناکات، ئیبراهیم فەرمووی: (يَا أَبَتِ لِمَ تَعْبُدُ مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ وَلَا يُغْنِي عَنْكَ شَيْئًا (٤٢) مريم) واتە: ئەو دەمەی بە باوکی خۆی (ئازەر)ی وت: بابە! تۆ بۆچی شتێکی وا ئەپەرستی نەئەبیسێ و نە ئەبینێ؟! و نەئەیشتوانێ لەکاتی تەنگانەدا هیچ زیانێکت لێوە دوورخاو بێ نیازت کا).

بە بێباوەڕانی فەرموو ئەوانەی بتپەرست بوون: (فَاسْأَلُوهُمْ إِنْ كَانُوا يَنْطِقُونَ (٦٣) الانبياء) واتە: دەئەوەتانێ لێیان بپرسن ئەگەر قسە ئەکەن).

خوای گەورە دەربارەی بەنی ئیسرائیل دەفەرموێت: (وَاتَّخَذَ قَوْمُ مُوسَى مِنْ بَعْدِهِ مِنْ حُلِيِّهِمْ عِجْلًا جَسَدًا لَهُ خُوَارٌ أَلَمْ يَرَوْا أَنَّهُ لَا يُكَلِّمُهُمْ) الاعراف/١٤٨) واتە: پاش چوونەکەی مووسا بۆ کێوی (توور) گەلەکەی _لەخشڵ و زێڕەکەیان_ گوێرەکەیەکی بە بۆڕەیان بۆ خۆیان سازداو پەرستیان! مەگەر نەیاندی ئەو گوێرەکەیە قسەیان لەگەڵ ناکات).

ئەمە دەلالەت دەکات پەروەردگار قسە دەکات و ئەوەی قسە ناکات پەروەردگار نییە، چۆن فەرمان دەکات؟ چۆن نەهی دەکات؟ چۆن بەڕێوە دەبات؟ لەکاتێکدا ئەو قسە ناکات؟ پاك و بێ گەردیی بۆ خوای گەورە لەو قسانە.

لەسورەتی (طه) دا هاتوە: (أَفَلَا يَرَوْنَ أَلَّا يَرْجِعُ إِلَيْهِمْ قَوْلًا وَلَا يَمْلِكُ لَهُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا (٨٩) طه) واتە: ئاخۆ ئەوانە کە ئەو گوێلکە ئەپەرستن نابینن کە ئەو گوێلکەیە نەوەڵامیان دەداتەوە ئەگەر داوایەکی لێ بکەن و نەدەسەڵاتی زیانێکی بۆیان هەیەو نەدەتوانرێ هیچ جۆرە کەڵکێکی لێ وەربگیرێ).

(أَلَّا يَرْجِعُ إِلَيْهِمْ قَوْلًا) واتە: وەلاّمیان ناداتەوە کاتێ قسەی لەگەڵ دەکەن.

**نوسەر دەڵێت:** (وأعلم أن الشر والخير بقضاء الله وقدره).

واتە:بزانە چاکەو خراپە بەقەزاو قەدەری خوا ڕوو دەدەن.

ڕاڤە/

پێویستە باوەڕ بەقـەزاو قـەدەر بکـەین، هـەموو شـتێك لـەم گەردوونـەدا ڕوو دەدات لەخۆیەوە نییە، بەڵکو هەموو تەقـدیر کـراوەو لـە (لـوح المحفـوظ)دا نووسـراوە، خـوای گـەورە هـەموو ئەوانـەی زانیـوەو نوسـیویەتی لـە (لـوح المحفـوظ)دا ئـەمجار تەقـدیری کـردوە، پاشـان دروسـتی کـردوەو هێنایـە بـوونو ویـستی لێ بـوە، هـیچ شـتێك لـەم گەردوونەدا نییە پێش قەزاو قەدەری خوا بکەوێ، هەموو شتێك تەقدیر کـراوە، لەوانـە: چـاکەو خراپـە، ئـەو چـاکەیەی تووشـی خـەڵکی دەبـێ بەقـەزاو قـەدەری خوایـەو ئـەو خراپەیەی تووشـی ئـەوان دەبـێ بەقـەزاو قـەدەری خوایـە، کـوفرو ئیمـانو نەخۆشـیو لەشساغی، برسێتیو تێربوون، دەوڵەمەندیو هەژاری، هەموو ئەمانە بەقـەزاو قـەدەری خوا دەبێ.

**﴿٧٦﴾ نوسەر دەڵێت: (والعقل مولود، أعطي كل انسان من العقل ما أراد الله يتفاوتون في العقول مثل الذرة في السماوات ويطلب من كل إنسان من العمل على قدر ما أعطاه من العقل، وليس العقل باكتساب، إنما هو فضل من الله).**

واتە: عەقڵیش دروستکراوە، خوای گەورە بەئەندازەی ئەوەی بیەوێ عەقڵی بەخشیوەتە مرۆڤ، جیاوازن لەعەقڵەکانیاندا وەکو گەردیلە لەئاسمانەکاندا، بەئەندازەی ئەوەی خوای گەورە عەقڵی بەمرۆڤ بەخشیوە خوای گەورە داوای کاری لێ دەکات و عەقڵ بەهەوڵدان نییە بەڵکو ئەوە فەزڵی خودایە).

**ڕاڤە/**

عەقڵ: بریتییە لەو هێزەی خوای گەورە بەخشیویەتییە مرۆڤ، مرۆڤ بە هۆیەوە درك بەشتەکان دەکات، شتی زیان بەخش لەسوودبەخش بەهۆیەوە جیا دەکەنەوە، چاکەو خراپە بەهۆیەوە لەیەك جیا دەکاتەوە، هیچ کەسێك چۆنیەتی عەقڵ نازانێ، خەڵکی لەم بارەیەوە قسەی زۆریان کردوە بەڵام نەگەیشتوونەتە ئەنجام، چونکە ئەوە لەنهێنییەکانی خودایە هیچ کەسێك لێی نازانێت تەنها ئەو نەبێ.

عەقڵ: پێی دەگووترێت عەقڵ چونکە مرۆڤ لەڕێگەیەوە ئەو شتانەی زیانی پێ دەگەیەنێ دەیبەستێتەوە هەروەکو چۆن حەبل ولاَغ دەبەستێتەوە لەڕاکردنو دەربازبوون (یعقله).

پێی دەگوترێت: (حِجر) (هَلْ فِي ذَٰلِكَ قَسَمٌ لِذِي حِجْرٍ (٥) الفجر) مانای (الحِجر) عەقڵە پێی دەگوترێت (حِجر) چونکە مرۆڤ دەبەستێتەوە لەوەی زەرەری پێ دەگەیەنێ (يحجره).

پێی دەگوترێت: (النُهى)، (إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِأُولِي النُّهَى (٥٤)طه) واتە: بەڕاستی لەو شتانەدا باسمان کردن گەلێ بەڵگەو نیشانەی ڕوون هەیە لەسەر یەکتایی خوا بۆ خاوەن ئاوەزان و فامیدەکان).

واتە: خاوەن عەقڵەکان.

پێی دەگوترێت: (اللُب)، (لِأُولِي الْأَلْبَابِ (١٩٠) آل عمران) واتە: خاوەن عەقڵەکان.

جا ئەم عەقڵە یەکێکە لە ئایەتەکانی خوای گەورە.

مەبەست لە: (وهو مولود).

ئەوەی ئاشکرابێ مەبەستی دروستکراوەو مەبەستی کۆن نییە، یان لەگەڵ مرۆڤدا ئەویش لەدایك دەبێ، ئەم عەقڵەش_هەروەکو باسمان کرد_ هیچ کەسێك حەقیقەتەکەی نازانێ تەنها خوای گەورە نەبێ، بۆیە زانایانی (الکلام) و فەیلەسووفەکان یەك دەنگ نەبوون و یەك قسە نین و لەباسی عەقڵدا نەگەیشتوونەتە ئەنجام، چونکە ئەمە پسپۆری ئەوان نییە.

عەقڵەکانیش جیاوازن:-

هەندێ خەڵکی هەن: عەقڵی ئەوان کامل و تەواوە وەکو پێغەمبەران.

هەندێ خەڵك هەن: ئەصڵەن عەقڵی نییە وەکو شێتەکان و شێتۆکەکان و منداڵان.

هەندێ خەڵکی هەن: لەنێوان ئەو دوو کۆمەڵەدان لەنێوان عەقڵێکی تەواو و بێ عەقڵیدا.

واتە: عەقڵی هەیە بەڵام (کامل)نییەو لە کەمبوونشدا جیاوازن خەڵکی هەیە نوقسانی عەقڵەکەیان زۆرەو هەیە عەقڵی نوقسانەو ئا بەم شێوەیە، ئەمەش بەپێی ئەوەی خوای گەورە دایناوە.

هەندێ جار بەتێگەیشتنیش دەڵێن عەقڵ، دەڵێن: (عَقَل الآيات القرآنية) واتە لەئایەتەکانی قورئان تێگەیشتن، (لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ (١٢) النحل) واتە لەئایەتە گەردوونیو ئایەتە قورئانییەکان تێ دەگەن (وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ وَمَا يَعْقِلُهَا إِلَّا الْعَالِمُونَ (٤٣) العنكبوت) واتە: ئەو مەسەلانەش _کەناو بەناو _بۆ خەڵکیان دەهێنینەوە هەر بۆ تێ گەیشتنە تێیان ناگەن، تەنها زاناو وردبینەکان نەبێ).

جا عەقڵ بۆ تێگەیشتنو درك كردنو شارەزابوون لەدینی خوا دەگوترێت: (أَفَلَا تَعْقِلُونَ (٦٠) القصص).

هەندێ کەس هەیە پەردە دەدرێتە سەر عەقڵیدا بەهۆی کوفرەکەیەوە، بەهۆی بێ ئاگابوونیەوە، بۆیە جیاوازی ناکات لەنێوان سوود بەخش و زیان بەخشدا، ئەو عاقڵە، بەڵام سوودی لەعەقڵەکەی خۆی نەبینیوە، لەعەقڵی خۆی مەحروم بووە _پەنا بەخوا_ بەهۆی کوفرەکەیەوە بۆیە وای لێ هاتووە تێ ناگات، (أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا (٤٤) الفرقان) واتە: یا پێت وایە کەزۆربەیان " وتەکانت " بەدڵ ئەبیسن و بیر لەماناو مەبەستەکەی ئەکەنەوەو تێ دەگەن؟ خۆ ئەوانە هەر وەك ماڵاتن خاوەنی بیر کردنەوە نین).

خوای گەورە لەعەقڵی خۆی مەحرورمی دەکات وەکو تۆڵەیەك (عقوبەیەك) بۆ ئەو، چونکە لەشتێکدا سوودی بۆی هەیە بەکاری نەهێناوە، بەڵکو لەشتێکدا بەکاری هێناوە سوودی لێ نابینێ، یان لە شتێکدا زیانی بۆی هەیە، جا عەقڵ ئایەتێکە لەئایەتەکانی خوای گەورە.

مەبەست لە: (ويطلب من كل إنسان من العمل على قدر ما أعطاه من العقل).

تەکلیفەکان وفەرمانەکان و نەهییەکان و پاداشتەکان و سزاکان هەموو بەپێی عەقڵ دەبێ.

مەبەست لە: (وليس العقل باكتساب إنما هو فضل من الله).

عەقڵ لەخوداوەیە خۆی دەیبەخشێتە مرۆڤەکان، ئەویش لەنهێنییەکانی خودایە لەنێو دروستکراوەکانیدا، مرۆڤ ناتوانێ عەقڵی دەستکەوێت، بەڵێ، مرۆڤ دەتوانێ عەقڵی خۆی بەهێز بکات لەڕێگای بیرکردنەوە لەئایەتەکانی خواو لەتێگەیشتنو قورئان، بەڵام هەوڵ بدات بۆ پەیداکردنی عەقڵێك بوونی نەبێ ئەوا نەخێر، چونکە خوای گەورە خۆی عەقڵی هێناوەتە بوون و بەخشیویەتییە مرۆڤ و هەرگیز خۆی ناتوانێ عەقڵ بهێنێتە بوونو پەیدای بکات بەڵام دەتوانێ بەهێزی بکات، (أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا أَوْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَكِنْ تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ (٤٦) الحج) واتە: ئاخۆ هێشتا ئەوانە بەزەویدا نەگەڕاون؟ تاببنە خاوەن دڵان و ڕاستییەکانی پێ دەرك بکەن؟ یا گوێچکە گەلێکی ژنەوا کە بانگی ڕاستی پێ لەڕاستیدا چاو کوێر نابن بەڵکو ئەو دڵانە کوێر دەبن و هێزی دەرك کردنیان نامێنێ کەجێیان لەناو سینەکانە).

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بیرکردنەوە لەگەردوون و بیرکردنەوە لەوەی ڕوویداوە لە ئوممەتەکانی پێشوو لەوەی لە ناوچوونو بەهەلاکەتدا چوون بەهۆی کوفرو تاوانیانەوە سوودی بۆ مرۆڤ هەیەو عەقڵی بەهێز دەکات، نەك عەقڵێك بۆ خۆی بهێنێتە بوون خۆی بوونی نەبووە.

**﴿٧٧﴾ نوسەر دەڵێت: (واعلم أن الله فضل العباد بعضهم على بعض في الدنيا والآخرة عدلا منه لا يقال: جار ولا حابى فمن قال: إن فضل الله على المؤمن والكافر سواء فهو صاحب بدعة، بل فضل الله المؤمن على الكافر والطائع على العاصي والمعصوم على المخذول عدلا منه هو فضله يعطيه من يشاء ويمنعه من يشاء).**

**واتە: بزانە خوای گەورە فەزڵی بەندەکانی داوە بەسەریەکتردا لە دونیاو دوارۆژدا، ئەمەش لەدادپەروەری ئەوەو ناگوترێت: ئەو ستەمی کردوەو لایەنگیری لایەکیانی کردوە، هەرکەسێ بڵێت: فەزڵی خوای گەورە بەسەر ئیماندارو بێ باوەڕدا وەکو یەکە ئەوە خاوەنی بیدعەیە (بیدعەچییە) بەڵکو خوای گەورە فەزڵی ئیمانداری داوە بەسەر بێ باوەڕاندا، گوێڕایەڵان بەسەر سەرپێچی کاردا و کەسی پارێزراو بەسەر کەسی دواکەوتودا، ئەمەش دادپەروەری ئەوە، ئەوە فەزڵی خۆیەتی دەیبەخشێتە هەرکەسێ ویستی لەسەر بێت و لەهەرکەسێ بیەوێ دەیگرێتەوە.**

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (واعلم أن الله فضل العباد بعضهم على بعض في الدنيا والآخرة).

**خوای گەورە فەزڵی هەندێ کەسی داوە بەسەر ئەوانیتردا، فەزڵی ئیمانداری داوە بەسەر کافردا بەهۆی ئەو ئیمانەی خۆی پێی بەخشیوە بەهۆی ئیمانەکەیەوە، کافری بێ بەش کردوە بەهۆی کوفرەکەیەوە. خوای گەورە فەزڵی ئیماندارانی داوە بەسەر یەکداو فەزڵی هەندێ لە پێغەمبەرانی داوە بەسەر هەندێکی تردا،** (تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ) البقرة/٢٥٣) **واتە: ئێمە بەهەموو ئەم پەیامبەرانە شان و شەوکەتی**

تایبەتیمانــداوە لەگــەڵ ئەوەشــدا هەنــدێکیان لەهەنــدێکی تریــان لەپلــەو پایــەی پەیامبەریەتیدا بەرزترن).

ئەمە فـەزڵی خوایـە دەیداتـە هەرکەسـێ خـۆی ویـستی لەسـەر بـێ، هـیچ کەسـێك بەرهەڵستی لەکاری خـوا ناکـات چـونکە ئەمـە مـوڵکی خۆیـەتی، دەیداتـە هـەر کەسـێ ویستی لێ بێت.

جا موڵکیش مـوڵکی خۆیـەتی دەیبەخـشێتە هـەر کەسـێ ویـستی لێ بـێ و فـەزڵیش فەزڵی خۆیەتی دەیبەخشێتە هەر کەسێ ویستی لێ بێ، جا هیچ بەرهەڵستێك لـەکاری خـوادا نییـە، موعتەزیلـەکان دەڵـێن:_ واجبـە لەسـەر خـوا دادپـەروەر بێـت لـەنێوان خەڵکیداو وەکو یەکیان پێ ببەخشێ، ئەمەش بێ ئەدەبییە لەگەڵ خـواداو بەرهەڵستی کردنە لەکارەکانی، پاك و بـێ گـەردی بـۆ خـوا لـەو قسانەی دەیکـەن، چـونکە خـوای گەورە فەزڵی هەندێ لەدروستکراوەکانی دەدا بەسـەر هەنـدێکی تـردا، ئەمـەش مـوڵکی خۆیەتیو نابێ بەرهەڵستی لەکاری ئەودا بکرێت، سزای هیچ کەسێك نادات بەبێ تـاوانی خۆی، چونکە ئەمە جیاوازە لەگەڵ دادپەروەری ئەوداو خوای گـەورەش سـتەم ناکـات، سزای هیچ کەسێك نادات بەبێ ئەوەی تاوانی کردبێ، یان سزای کەسێك بدات بە تاوانی کەسێکی تر: (وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى وَإِنْ تَدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَى حِمْلِهَا لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَيْءٌ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى) فاطر/١٨) واتـە: لـەڕۆژی قیامەتـدا هـیچ کـەس بـاری گونـاهی هـیچ کەسـێکی تـر هـەڵناگرێ خـۆ ئەگـەر کەسـێکی گوناهکـاری بـارقورس _بـەتاوان _ لەکەسـێکی تـر بپاڕێتەوە بـۆ سـوککردنی تاوانـەکانی هـیچ شـتێکی بـۆ هـەڵناگیرێ ئەگەرچـی خزمـی نزیکیشی بێ).

خوای گەورە لەڕووی سزاوە ئەوەی دەیدات هەمووی دادپەروەرییە، بەڵام لەڕووی بەخشینەوە ئەمە فەزڵە لەخۆیەوە و هیچ کەسێك بەرهەڵستی لێ ناکات.

مەبەست لە: (فمن قال: إن فضل الله على المؤمن والكافر سواء فهو صاحب بدعة).

ئەمە قسەی کۆمەڵی موعتەزیلەیە دەڵێن: پێویستە لەسەر خوا هەموو خەڵکی بکاتە ئیماندارو نابێ هەندێ کەس بکاتە ئیماندارو هەندێکی تر بێباوەڕ، دەبێ هەموویان دەوڵەمەند بکات و هەموویان زانا بکات، ئەمەش بەرهەڵستییە لەکاری خوا، چونکە خوای گەورە خۆی دانایە، لەحیکمەتی خوادا نییە هەموو خەڵکی وەکو یەك بکات لەعیلمدا یان لەسەروەت و ساماندا یان لەسزاو پاداشتدا.

هەروەها لەحیکمەتی خوادا نییە هەموو خەڵکی دەوڵەمەند بکات، چونکە ئەگەر هەموو خەڵکی دەوڵەمەند بوایەن ئەوا گەردوون تێك دەچوو، چونکە هیچ کەسێ نادۆزنەوە کار بکاتو بەرهەم دەوەستێت، بۆیە خوای گەورە فەزڵی هەندێ کەسی داوە بەسەر ئەوانیتردا لەڕزق و ڕۆزیدا، خوای گەورە ئەم کەسەی دەوڵەمەند کردوە و ئەویتری هەژار کردووە لەبەر ئاوەدانکردنەوەی گەردوون، جا ئەگەر هەموویان دەوڵەمەندبن ئەوا هیچ بەرهەمیان نەدەبوو، ئەگەر هەموویان هەژار بوایەن ئەوا نەیاندەتوانی کار بکەن و بەرهەم بهێنن.

جا خوای گەورە جیاوازی لەنێوانیاندا کردووە لەبەر ئاوەدانکردنەوەی گەردوون، (وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ لِيَتَّخِذَ بَعْضُهُمْ بَعْضًا سُخْرِيًّا) الزخرف/٣٢) واتە: هەندێکیانمان بەرز کردۆتەوە بە سەر هەندێکیاندا بەچەندین پلە لەماڵ و سامان و دەسەلأت بۆ ئەوەی هەندیکیان هەندێکی تریان بکەنە بەرکار لەکارو بارياندا).

واتە: هەندێکیان دەرەخسێنی بۆ ئەوانی تر بۆ کارکردن بەکریێ، تا لەو کاتەدا گەردوون گەشە دەکاتو بەرژەوەندییەکان ڕوو دەدەن.

مەبەست لە: (بل فضل الله المؤمن على الكافر والطائع على العاصي والمعصوم على المخذول).

خوای گەورە فەزڵی ئیمانداری داوە بەسەر بێ باوەڕدا و گوێڕایەڵی داوە بەسەر سەرپێچیکاردا، ئەمەش دادپەروەرییو فەزڵی ئەوە، جا هیچ کەسێك بەرهەڵستی لەکاری ئەو ناکات.

**﴿٧٨﴾ نوسەر دەڵێت: (ولا يحل أن تكتم النصيحة أحدا من المسلمين برهم وفاجرهم في أمر من أمور الدين فمن كتم فقد غش المسلمين ومن غش المسلمين فقد غش الدين ومن غش الدين فقد خان الله ورسوله والمؤمنين).**

واتە: حەڵاڵ نییە ئامۆژگاری لەهیچ موسڵمانێك بشاردرێتەوە، چاكەكاران و خراپەكارانیان لە هەر كارێك لەكاروباری ئەم دینە، جا هەر كەسێك شاردییەوە ئەوا گزی لە موسڵمانان كردوەو هەر كەسێك گزی(غەش) لەموسڵمانان بكات ئەوا گزی(غەشی) لەدین كردوە و هەر كەسێك گزی(غەش) لەدین بكات ئەوا خیانەتی لەخواو پێغەمبەرو ئیمانداران كردوە.

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (ولا يحل أن تكتم النصيحة أحدا من المسلمين برهم وفاجرهم).

**(النصيحة) بریتییە لە: ڕزگاربوون لە گزی (غەش)، هەر شتێك (ناصح) بێت واتە شتێكی پوخت و پاڵفتەیە.**

**جا ئیماندار دەبێ (ناصح) بێت واتە: پاڵفتەو پاكبێ لە دووڕوویی، پاڵفتەو پاك بێت لەغەش و پاڵفتەو پاك بێت لەخەڵەتاندن، دەبێ ناوەوەو دەرەوەی وەكو یەك بێت لە ڕاستگۆییدا.**

**(النصيحة) دینە، هەروەكو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:** (الدين النصيحة الدين النصيحة الدين النصيحة، قلنا: لمن يا رسول الله؟ قال: لله ولكتابه ولرسوله ولأئمة المسلمين وعامتهم)[202].

٢٠٢ / صحيح : سبق تخريجه .

مەبەستی لێرەدا ئەوەیە: کە مرۆڤ خۆی پاڵفتە بکات لەهەموو ڕەوشتێکی خراپ و بەڕەوشتی جوان خۆی برازێنێتەوە.

جا کەسی ئامۆژگاریکار (ناصح) ئەو کەسەیە هیچ غەشی تێدا نییە بەرانبەر هیچ کەسێك، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (من غشنا فليس منا)[٢٠٣] جا دژی (النصيحة) بریتییە لە: غەش.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو فەرموودەی: (الدين النصيحة) سێ جار دووبارەی کردەوە لەبەر دڵنیابوون و بایەخدانەوەو هەموو دینی لە ئامۆژگاریدا حەصر کردووە.

ئامۆژگاری بۆ خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئەمە لەعەقیدەدا، هیچ کەسێك نابێتە موسڵمان ئیللا دەبێ عەقیدەکەی سەلامەت بێ‌و شیرکی تێکەڵ نەبووبێ‌و کارەکەی هیچ بیدعەیەکی تێدا نەبێ، شوێنکەوتەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بێت ئەمە کەسی ئامۆژگاری کارە (ناصح)ە بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ)، ئەو کەسەی کارەکەی خاڵی بێت لەشیرك و خاڵی بێت لە بیدعە.

ئامۆژگاری کردن بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بریتییە لە باوەڕبوون بەپەیامەکەی‌و خۆشویستنی و ڕێز گرتنی و شوێنکەوتنی و چاولێکردنی‌و پێش خستنی قسەی ئەو بە سەر قسەی هەر کەسێکی تردا، وازهێنان لە بیدعەو شتی تازە کەپێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێمەی لێ ئاگادار کردووە، باوەڕهێنان‌و بەڕاست خستنەوەی ئەوەی هەواڵی پێ داوین لەباسە غەیبییەکانی ڕابوردوو ئایندەو دوورکەوتنەوە لەوەی نەهی لێ کردوە ئەمە ئامۆژگارییە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ).

---

٢٠٣ / أخرجه مسلم (١٠١) .

مەبەست لە: (ولكتابە).

کیتابەکەی خوا قورئانە ئەویش بەوە دەبێ کە باوەڕی پێ بکەیت کەوا قسەی خوایە و دایبەزاندوەو دروستکراو نییەو قسەی کەسی تر نییە، هەروەکو چۆن گومڕاکاران دەڵێن، دەبێ فێری ببیت و خەڵکی فێر بکەیت و کاری پێ بکەیتو لەماناکەی تێ بگەیتو بیری لێ بکەیتەوە، ئەمە ئامۆژگارییە بۆ کیتابەکەی خوا، فێربوونی و فێرکردنیو تێگەیشتنیو شارەزابوون لێیو کار پێکردنی، هەروەها ئامۆژگاری کردن بۆ کیتابەکەی خوا زۆر خوێندنەوەیەتیو بێ ئاگا نەبوونە لێی.

ئامۆژگاری کردنی پێشەوای ئیمانداران کە ئەوانیش سەرکردەو دەسەڵاتدارانن بە گوێڕایەڵییان دەبێ لەشتێکدا سەرپێچی خوای تێدا نەبێ، دەستی گوێڕایەڵی لێ نەبچڕی و لەدژی دەرنەچیو بەدوای هەڵەو عەیبەکانیاندا نەگەڕێی و لەناو خەڵکیدا بڵاوی بکەیتەوە.

هەر لە ئامۆژگاری کردنی ئەوان ئەوەیە: ئەگەر عیلم و توانات هەبوو دوو بەدوو ئامۆژگارییان بکەیت، ئامۆژگارییەکەی خۆتی پێ بگەیەنەو هەڵەکانیان پێ بگەیەنی و پێیان بڵێیت یان بەژێر دەستەکانیو ئەوانش بەوانی بگەیەنن، لە ناو کۆڕو کۆمەڵدا باسیان نەکەیت، ئەمە بریتییە لە گزی (غەش)، جا ئامۆژگاری ئەوەیە کە ئامۆژگاری لەخۆتەوە بگەیەنیتە ئەوان، ئەمە ئامۆژگاری کردنی دەسەڵاتدارانە.

هەروەها لە ئامۆژگاری کردنی دەسەڵاتدار بریتییە لە: هەستان بەو کارەی پێت ڕادەسپێرێ جا چ فەرمانبەرییەك بێت یان سەرکردایەتییەك یان جگە لەوانە لەکاروباری دین بێت یان دونیا، هەستیت بەو کارەی پێی ڕاسپاردووی لە نێوان خۆت و خۆیدا، خەلەلەکەی پێ بگەیەنیت بۆ ئەوەی چاکی بکاتەوە ئەمە بەشێکە لە ئامۆژگاری.

هەر لەئامۆژگاری کردنی دەسەلاتداران: پاڕانەوەیە بۆیان بە چاکسازی، چونکە ئەگەر ئەوان چاك بوون ئەوا ژێر دەستەکانیش چاك دەبن، دوعایان بۆ دەکەیت،جا ئەگەر هەر کەسێکت بینی قوتابی زانستو زانیاری بوو دوعایان بۆ ناکات یان ئینکاری دوعاکردن دەکات بۆیان، بزانە ئەوە کەسێکی غەشاشەو ئامۆژگاری کاری دەسەلاتدار نییە.

ئامۆژگاری کردن بۆ موسڵمان بەوە دەبێ ڕێنموییان بکەیت بۆ ڕاستە ڕێ، ئاگاداریان بکەیتەوە لە هەڵەکان و فەرمان بەچاکە بکەیتو نەهی بکەیت لەخراپەو کەسی نەفام فێر بکەیتو بێ ئاگاکان بە ئاگابهێنیتەوەو ئەوەی بۆ خۆت پێت خۆشە لەچاکە بۆ ئەوانیش پێت خۆش بێت، بەزەییت بە هەژاراندا بێتەوەو ببەخشی بە نەداران، ئەمە ئامۆژگارییە.

هەروەها ڕاوێژی باش بکات بۆ ئەو کەسانەی پرسی پێ دەکەن، پارێزگاری کردنی نهێنی ئەو کەسانەی نهێنییان لا باس کردوون و پاراستنی ئەمانەتەکان، دەبێ لەهەموو ڕوویەکەوە ئامۆژگاری کار بێت و ئامۆژگاری کردن لەکڕین و فرۆشتندا غەش نەکات و کەس نەخەڵەتێنێ.

ئەمە باسی ئامۆژگاری بوو بەکورتی، جا هەر کەسێك وانەبێ ئەوا غەشاشەو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (من غشنا فليس منا)

**﴿٧٩﴾ نوسەر دەڵێت: (والله سميع بصير عليم، يداه مبسوطتان، قد علم أن الخلق يعصونه قبل أن يخلقهم، علمه نافذ فيهم، فلم يمنعه علمه فيهم أن هداهم للإسلام، ومنّ به عليهم كرما وجودا وتفضلا فله الحمد).**

واتە: خوای گەورە بیسەرو بینەرو زانایە، دەستەکانی والآن، زانی بەندەکانی سەرپێچی دەکەن پێش ئەوەی دروستیانی کردبێ، زانینی ئەو دەربارەیان کاریگەرە، ئەو زانینەی خۆی بەرانبەریان ڕێگر نەبوە بۆ هیدایەت دانیان بۆ ئیسلام، منەتی خۆی ڕژاندوە بەسەریاندا وەکو بەخشندەیی‌و میهرەبانی‌و فەزڵێك بۆیە سوپاس‌و ستایش تەنها بۆ ئەوە.

ڕاڤە/

مەبەست لە: (والله سميع بصير عليم).

ئەمە جۆری سێیەمە لەجۆرەکانی یەکتاپەرستی ئەویش: سەلماندنی ناوو سیفەتەکانی خودایە، هەروەکو لەقورئان‌و سوننەتدا هاتوە، لە گەڵ باوەڕبوون بەماناکەی و ئەوەی دەلالەتی بۆ دەکات، بەرهەڵستی چۆنییەتییەکەی نەبینەوە، چونکە چۆنیەتییەکەی هیچ کەسێك نازانێ تەنها خوا نەبێ، بەڵام ماناکەی ئەوا ئاشکراو دیارە، بۆیە پێویستە لەسەرت باوەڕت پێی هەبێ بیسەلمێنی بەو دەلالەتەی بۆی کردوە هەروەکو ئیمامی مالیك فەرمووی: (الاستواء معلوم) واتە: ماناکەی دیارو ئاشکرایە (والكيف مجهول) چۆنییەتییەکەی نادیار و نەزانراوە.

مەبەست لە: (قد علم أن الخلق يعصونه قبل أن يخلقهم).

خوای گەورە بەهەموو شتێك زانایە، زانی چی ڕوودەدات لە ئیمان و کوفر، گوێڕایەڵی‌و سەرپێچی، هیچ شتێکی لێ ناشاردرێتەوە، لەپێش ئەوەی ئاسمانەکان و زەوی دروست بکات.

مەبەست لە: (فلم يمنعه علمه فيهم أن هداهم للإسلام).

لەگەڵ ئەوەی خوای گەورە زانی چی کارێك دەکەن لەکوفرو ئیمان کەچی خوای گەورە ئەوانی بانگ کرد بۆ ئیسلام و بانگی کردن بۆ ئیمان، پێغەمبەرانی ڕەوانە کردووەو کیتابی دابەزاندوە بۆ ڕێنموویی کردنی ئەوان، لە کاتێکدا دەزانێ ئەوان چی دەکەن، بەڵام لە ڕەحمەتی خوای گەورەیە وازی لێ نەهێناون وتەوکیلی ئەوان بخاتە سەر عیلمەکەی خۆی، بەڵکو ئیقامە حوججەی لەسەریان کردوەو هەڵبژاردن و ویست و توانای پێ بەخشیون، جا ئەوان توانای کارکردنیان هەیە ئەگەر وازی لێ بهێنن ئەوا تاوان تاوانی خۆیانەو کەمتەرخەمی کەمتەرخەمی خۆیانە، خوای گەورە هیدایەتی هەموو خەڵکی داوە ئیمانداران و بێ باوەڕان، بەمانای ئەوەی ڕوونی کردووەتەوە بۆیان، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَاهُمْ) هديناهم: واتە ڕوونمان کردەوە بۆیانو ڕێنمووییمان کردن، کەچی ئەوان وەریان نەگرت و بەرهەڵستیان کردوو خۆیان بەزل زانی، (فَاسْتَحَبُّوا الْعَمَى عَلَى الْهُدَى فَأَخَذَتْهُمْ صَاعِقَةُ الْعَذَابِ الْهُونِ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ (١٧) فصلت) واتە: گەلی (سەموود)یش ڕێگەی خەیرو ڕێگەی شەڕمان نیشان دا، ڕاستیمان بۆ ڕۆشن کردنەوە، کەچی گومڕاییان بەسەر هیدایەتدا هەڵبژارد! جا بە هۆی ئەو کارەیانەوە دەیان کرد، هەورە تریشقەی سزای سووکەر گرتنی لەناو چوون).

واتە: بەهۆی کاری خۆیانەوە، نەك ئەوەی خوای گەورە ئەوەی زانیوە تەقدیری بۆ کردوون، بەڵکو: بەوەی خۆیان ئەنجامیان داوە بەهەڵبژاردن و ئیرادەو کردەوەی خۆیان.

هیدایەت دوو هیدایەتە:-

- (هداية الإرشاد) هیدایەتی ڕێنمویی کردن: ئەمەش بۆ هەموو کەسێکە ئیماندارو بێباوەڕ.

- (هداية التوفيـق) ئەمـەش تايبەتـە بـە ئيمانـداران ئەوانـەی هيدايـەتی ڕێنمـويی خودايان وەرگرتو خوای گەورەيش تەوفيقی ئەوانی داوەو دامەزراوی كردن.

مەبەست لە: (ومنَّ به عليهم كرما وجودا وتفضلا فله الحمد).

واتە خوای گەورە بانگی ئەوانی كـردو بـۆی ڕوونكردنـەوەو ئـەويش بـە ميهرەبـانیو بەخشندەيی خۆيەتی، وەكو فەزڵێك لەبەر پێويستی ئەوان بـەوە، بـەڵام خـوای گـەورە دەوڵەمەندەو پێويستی بەوان نييە، چ كوفر بكەن يان ئيمـان بهێـنن، گوێڕايـەڵی بكـەن يان سەرپێـچی، هـيچ زەرەرو قـازانج بـەخوا ناگەيـەنن، چـونكە هـيچ پێويـستی بـەوان نييە،بەڵكو ئەمە بۆخۆيان دەگەڕێنەوە چ قازانجەكـەی يـان زەرەرەكـەی. لەڕەحمـەتی خوای گەورەيە بەوان ڕێگەی چاكو ڕێگـەی خراپـەی بـۆ ڕوونكردوونەتـەوە، هێـزی پـێ بەخشيونو تواناى پێداون و عەقڵی پێ داون بە هۆيەوە شتە زيان بەخشەكان و سـوود بەخشەكان لەيەك جيا بكەنەوە.

**﴿٨٠﴾ نوسەر دەڵێت: (واعلم أن البشارة عند الموت ثلاث بشارات، يقال: أبشر يا حبيب الله برضى الله والجنة، ويقال: أبشر يا عبد الله بالجنة بعد الاسلام، ويقال: أبشر يا عدو الله بغضب الله والنار. هذا قول ابن عباس).**

**واتە: بزانە موژدەدان لەكاتی مردندا سێ موژدەدانە:**

**دەڵێن: موژدەت لێبێ ئەی خۆشەویستی خوا بەڕازی بوونی خواو بەهەشت.**

**دەڵێن: موژدەت لێبێ ئەی بەندەی خوا بەبەهەشت لە پاش ئیسلام.**

**دەڵێن: موژدەت لێبێ ئەی دوژمنی خوا بەتوورە بوونی خواو ئاگر. ئەمە قسەی (ئیبن عەبباس)ە.**

**ڕاڤە/**

**ئەو کەسەی ها لەگیانەلآدا ئیماندار بێت یان کافر موژدەی پێ دەدرێت لەکاتی مردندا، جا ئەگەر ئیماندار بێت ئەوا موژدەی ڕەحمەتی خواو بەهەشتی پێ دەدەرێ، ئەگەر بێباوەڕ بوو ئەوا موژدەی توورەبوونی خوا و ئاگری پێ دەدەرێ، جا نامرێت تاكو جێگاكەی خۆی ئەزانێ، چیتر ناتوانێ تەوبە بكات و لێی دەرباز بێت، یان چیتر توێشوی كاری چاكە كۆبكاتەوە، ئەمەش لەفەرموودەیەكدا هاتووە:** (من أحب لقاء الله أحب الله لقاءه ومن كره لقاء الله كره الله لقاءه فقلت يا نبي الله أكراهية الموت فكلنا يكره الموت قال: ليس ذلك ولكن المؤمن إذا بشر برحمة الله ورضوانه وجنته أحب لقاء الله فأحب الله لقاءه وإن الكافر إذا بشر بعذاب الله وسخطه كره لقاء الله وكره الله لقاءه)[٢٠٤] **واتە: هەركەسێ حەز لە دیدەنی خوای گەورە بكات ئەوا خوای گەورەش حەز بە دیدەنی ئەو دەكاتو هەركەسێ حەز بە دیدەنی خوای گەورەی نەكرد ئەوا خوای گەورەش حەز بە دیدەنی**

---

٢٠٤ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٦١٤٢) ومسلم (٢٦٨٣، ٢٦٨٤) .

ئەو ناكات، عائیشە دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا مەبەستت رق بوونە لە مردن، ئێمە هەموومان رقمان لە مردنە؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: مەبەستم ئەوە نییە، بەڵكو كەسی ئیماندار ئەگەر مـوژدەی رەحمەت و رەزامەنـدی و بەهەشتی خوای پێدرا ئەوا حەز بە دیدەنی خوا دەكاتو كەسی بێ باوەڕ ئەگەر مـوژدەی سزاو تووڕەیی خوای پێدرا ئەوا حەز بە دیدەنی خوا ناكات و خوایش حەزی لە دیدەنی ئەو نییە).

خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ (١٣)الاحقاف) واتە: بەڕاستی ئەو كەسانەی دەڵێن: پەروەردگارمان (الله)یەو پاشان پابەندی ئەو ئیمانە دەبن و ڕێك و پێك لەسەر ڕێگای ڕاست، دەڕۆیشتن و هەرگیز بەڕاست و چەپدا لانادەن ئەوانە هیچ بیم و ترسێكیان لەسەر نابێت " لەپاشە ڕۆژدا" و خەفەتبارو دڵ زویریش نابن، بۆ دونیاو بۆی پەشیمان نابن).

خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنْتُمْ تُوعَدُونَ (٣٠) فصلت) واتە: بێ گومان ئەو كەسانەش گوتیان: پەروەردگارمان خوایە پاشان خۆیان راست كردبوویەوە، واتە: زۆر بە مەحكەمی لە سەر یەكناسین وەستان و بە هیچ لایەكدا لایان نەدا، كاتێ مردن، لە گۆڕدا لە كاتی زیندووبوونەوەدا فریشتە دائەبەزنە لایان و پێیان دەڵێن: لە پاشەڕۆژتان مەترسن و بۆ ماڵ و منداڵیشتان – پاش خۆتان – دڵ زویر مەبن ئێمە چاودێریان دەبین موژدەتان لێ بێت بەو بەهەشتەی بەڵێنتان پێ دەدرا لە دونیادا، مزگێنی بێت ئەمڕۆ ئەكەونە خۆشی و شادییەوە).

خوای گەورە دەفەرموێت: (وَلَوْ تَرَى إِذْ يَتَوَفَّى الَّذِينَ كَفَرُوا الْمَلَائِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ وَذُوقُوا عَذَابَ الْحَرِيقِ (٥٠) الانفال) واتە: ئەگەر لەسەرە مەرگدا بێ باوەڕان ببینی كە: چۆن فریشتەكان گیانیان ئەكێشن دەبینی لە حاڵەتەدا دەم و چاوو پشتیان دەكوتن و پێشیان دەڵێن: دەسا سزای سووتێنەری دۆزەخ بچێژن).

**﴿٨١﴾ نوسـەر دەڵێـت: (واعلـم أن أول مـن ينظـر إلى الله تعـالى في الجنـة الاضراء ثم الرجال ثـم النـساء بـأعين رؤوسـهم كما قال رسول الله (ﷺ): (إنكم سترون ربكم كما تـرون القمـر ليلـة البـدر لا تـضامون في رؤيتـه٢٠٥) والإيمان بهذا واجب وإنكاره كفر).**

**واتە: بزانە یەکەم کەسێك تەماشـای خـوا دەکـەن لـە بەهەشـتدا نابیناکـانن ئـەمجار پیـاوان ئـەمجار ئافرەتـان، بەچـاوی سـەریان، هـەروەکو پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویەتی** (إنكم سترون ربكم كما ترون القمر ليلة البدر لا تضامون في رؤيته) **باوەڕ بـوون بەمە واجبەو ئینکاری کردنی کوفرە.**

**ڕاڤە/**

**لەپێشدا باسی سەلماندنی بینینی خوامان کرد، ئەمەش دووپاتکردنی ئـەوەی پـێش خۆیەتی، بەڵام ئەم ڕیزبەندییە دانەر باسی کردوە پێویستی بەبەڵگەیە.**

---

٢٠٥ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٥٢٩) ومسلم (٦٣٣) .

**﴿٨٢﴾ نوسەر دەڵێت: (واعلم أنها لم تكن زندقة ولا كفر ولا شكوك ولا بدعة ولا ضلالة ولا حَيرة في الدين إلا من الكلام وأهل الكلام والجدل والمراء والخصومة. والعجب وكيف يجترئ الرجل على المراء والخصومة والجدال والله يقول: (مَا يُجَادِلُ فِي آيَاتِ اللَّهِ إِلَّا الَّذِينَ كَفَرُوا (٤) غافر) فعليك بالتسليم والرضى بالآثار والكف والسكوت)**

واتە: بزانە (زەندەقە)و كوفر و گومان و بیدعەو گومڕایی و دۆشدامان لەدیندا نەبووە ئیللا لە (كەلام) و ئەهلی كەلام و ململانێ و دەمبازی (جدل) و مشتومڕ (میراء) و ناكۆكی(الخصومە)ەوە نەبێ.

سەرسامی لەوەدایە چۆن كەسێك جورئەتی مشتو مڕ و ناكۆكی و جیدال (المراء والخصومە والجدال) دەكات لەكاتێكدا خوای گەورە دەفەرموێت (مَا يُجَادِلُ فِي آيَاتِ اللَّهِ إِلَّا الَّذِينَ كَفَرُوا (٤) غافر) جا ئەوەی لەسەرتە تەسلیم بوونو ڕازی بوون بەشوێنەوارەكان (فەرمودەكان) و وازهێنان و بێ دەنگییە.

ڕاڤە/

ئەمە لە پێشدا باسكراو لێی ئاگاداركرانەوە.

مەبەست لە: (فعليك بالتسليم والرضى بالآثار والكف والسكوت).

پێویستە لەسەرت تەسلیمی قسەی خواو قسەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بیتو وازهێنان لە مشتومڕ و گومانكردن، چونكە تۆ نەهیت لێ كراوە لەوە، بەڵكو سەرسامیت زیاد دەكات، بۆیە قسەكانی خواو پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەربگرە، بەوە ڕازییە بۆ ئەوەی هیدایەت بدرێیتو ڕزگارت ببێت لە دوودڵی و گومان و دڵاودڵیو لەسەر چاوڕوونی ببیت،چونكە خوای گەورە ئەم قورئانەی دابەزاندووە بۆ ڕوونكردنەوەی هەموو شتێك.

**﴿٨٣﴾ نوسەر دەڵێت: (والإيمان بأن الله يعذب الخلق في النار في الأغلال والانكال والسلاسل والنار في أجوافهم وفوقهم وتحتهم وذلك أن الجهمية منهم هشام الفوطي قال: إنما يعذب الله عند النار، ردا على الله ورسوله).**

**واتە: باوەڕ بەوەی خوای گەورە خەڵکی سزا دەدات لەئاگردا، لە کۆتو زنجیرو ئاگر لەناخیاندایەوەو لەسەرەوەو لەخوارەوەیانەوە چونکە جەهەمییەکان لەوانە (هشام الفوطی) دەڵێت: خوای گەورە خەڵکی سزا دەدات لەتەنیشت ئاگر، ئەمەش ڕەدی قسەی خواو پێغەمبەرەکەیەتی (ﷺ).**

**راڤە/**

**مەبەست لە:** (والإيمان بأن الله يعذب الخلق في النار في الأغلال والانكال والسلاسل، والنار في أجوافهم وفوقهم وتحتهم).

**خوای گەورە ئاگر گڕ دەدات بەجەستەی بێ باوەڕان و جەستەی ئەوان سوتەمەنی دۆزەخە،** (وَأُولَئِكَ هُمْ وَقُودُ النَّارِ (١٠) آل عمران) **ئەوان ئەسوتێن و جەستەیان دەسوتێت _پەنا بەخوا_** (فَالَّذِينَ كَفَرُوا قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِنْ نَارٍ يُصَبُّ مِنْ فَوْقِ رُءُوسِهِمُ الْحَمِيمُ (١٩) يُصْهَرُ بِهِ مَا فِي بُطُونِهِمْ وَالْجُلُودُ (٢٠) وَلَهُمْ مَقَامِعُ مِنْ حَدِيدٍ (٢١) الحج) **واتە: جا ئەوانەی کافرو بێ بڕوابوون، جلو بەرگو پۆشاکی ئاگریان بۆ بڕاوە، بەئەندازەی قەدو باڵای خۆیان ئاوی بەکوڵیشیان لەسەرەوە بەسەرا دەکرێ (١٩) هەر بەو ئاوە ناوسکیان و پێستییان ئەتوێنرێتەوەو دەبێتە ئاوو دێتە خوارەوە، پێستەکەشیان هەموو لەتاو گەرمای ئەو ئاوەدا دەبلۆخێ (٢٠) بەر گورزی ئاسنیش دەدرێن (٢١)).**

**خوای گەورە باسی کردوە کەوا سزاکە تووشی جەستەی بێ باوەڕان دەبێ‌و ئاگر دەیانسوتێنێ‌و گڕیان تێ بەردەبێت،** (يُصَبُّ مِنْ فَوْقِ رُءُوسِهِمُ الْحَمِيمُ) **هەندێ لە کۆمەڵی موعتەزیلە هەن دەڵێن: ئەوان سزا نادرێن و بەئاگر جەستەیان ناسوتێت، بەڵکو تەنها**

لەتەنیشتی ئاگر سزا دەدرێنو جەستەیان ناسوتێت، خوای گەورە لەقورئانەکەیدا دەفەرموێت: ئەوان سووتەمەنی ئاگرن و پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (أول من تسعر بهم النار يوم القيامة: العالم الذي لا يعمل بعلمه، والمتصدق الذي يرائي في صدقته، والمجاهد الذي يرائي بجهاده)[٢٠٦] واتە: یەکەم کەسێك لە رۆژی قیامەتدا ئاگریان پێ دادەگیرسێنرێت، ئەو زانایەی کار بە زانستو زانیارییەکەی خۆی ناکاتو ئەو خێرومەندەی (بەخشندەیە)ی بە بەخشینەکەی ریا دەکات و ئەو موجاهیدەی بە جیهادەکەی ریا دەکات).

(الأغلال) ماناکەی ئەوەیە ئەوان دەستیان تاکو گەردنیان بەکۆت و زنجیر دەبەسترێتەوە _پەنا بەخوا_

(الأنكال) ئامێرەکانی سزادانە، (إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ سَلَاسِلَ وَأَغْلَالًا وَسَعِيرًا (٤) الانسان) واتە: بەراستی ئێمە کۆت و زنجیر _کەهەردوو قاچ و پێی پێ ئەبەسترێتەوەو هەردوو دەستی بەگەردنییەوە پێ جەز دەدەرێ _لەگەڵ ئاگرێکی سوتێنەرو هەڵگیرساودا ئامادەمان کردووە بۆ بێ باوەڕەکان).

(إِنَّ لَدَيْنَا أَنْكَالًا وَجَحِيمًا (١٢) المزمل) واتە: بەراستی ئێمە سزای دونیاییمان هەیەو لەپاشەرۆژیشدا کۆت و زنجیری سەنگین و ئاگری هەڵگیرساوی دۆزەخمان هەیە).

(الأنكال) ئامێرەکانی سزادانە —پەنا بەخوا— زنجیرو کۆت و ئاگرە.

مەبەست لە: (والنار في أجوافهم وفوقهم وتحتهم) خوای گەورە دەفەرموێت: (لَهُمْ مِنْ جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِنْ فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ وَكَذَلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ (٤١) الاعراف) واتە: ڕایەخیان ئاگرە لەدۆزەخدا و لێفەی سەریشیان هالآوی ئاگرە دیارە گشت ستەمکاران ئا بەو شێوە سەختەیە تۆڵە ئەدەین).

---

٢٠٦ / صحيح : أخرجه الترمذي (٢٣٨٢) .

**﴿٨٤﴾ نوسـەر دەڵێـت: (واعلـم أن صـلاة الفريـضة خمـس صـلوات، لا يـزاد فيهن ولا ينقص في مواقيتها، وفي السفر ركعتان، إلا المغرب، فمن قـال: أكثـر من خمس، فقد ابتدع، ومن قال: أقل مـن خمـس، فقـد ابتـدع، لا يقبـل الله شيئا منها إلا لوقتها إلا أن يكون نسيانا فإنه معذور، يـأتي بهـا إذا ذكرهـا، أو يكون مسافرا فيجمع بين الصلاتين إن شاء).**

واتە: بزانـە نوێـژە فـەرزەکان پێـنج نوێـژن، لەوانـە زیـاد ناکرێـتو کـەم ناکرێتـەوە لەکاتەکانیاندا، لەسەفەردا دوو ڕکاتـە، تـەنها مـەغریب نـەبێ، جـا هـەر کەسـێك بڵێـت: نوێژەکان لەپێنج فەرز زیاترە ئەوا بیدعـەی کـردوە[٢٠٧] و هـەر کەسـێك بڵێـت: نوێـژەکان لەپێنج فەرز کەمترە، ئەوا بیدعەی کردووە، خوای گەورە وەری ناگرێت ئـیللا لـە کـاتی خۆیدا نـەبێ، ئـیللا مەگـەر کەسـێك لـەبیری چـووبێت ئـەوا عـوزری هەیـە، کـاتێ بـیری هاتەوە ئەوا ئەنجامی دەدات، یان موسافیر بێت ئەوە لە نێوان دوو نوێژدا کۆدەکاتـەوە ئەگەر بیەوێ).

ڕاڤە/

باسو مەسەلەی پێنج نوێژەکە باسـێکی مەزنـە، ئـەویش دووەم پایەیـە لەپایـەکانی ئیسلام لەپاش شایەتمان، هەر کەسێك وازی لێ بهێنێ و باوەڕی بە واجـب بـوونی نـەبێ ئەوە کافرە بە یەکدەنگی و ئیجماعی موسڵمانان، بەڵام هەر کەسێك وازی لێ هێنا لەبەر تەمبەڵی لەگەڵ ئەوەی دان بە (واجب)بوونیدا دەنا ئـەویش لەسـەر ڕای ڕاسـت کـافرە، زانایان دوو قسەیان لەو بارەوە هەیە، بەڵگەش لەسـەر ئـەوە فـەرموودەی پێغەمبـەری خوایـە (ﷺ) کـە دەفـەرموێت: (بين العبد وبين الكفر ترك الصلاة)[٢٠٨] واتـە: نێـوان

---

٢٠٧ / قال الشيخ ربيع : بل كفر وتزندق (عون الباري ببيان ما تضمنه شرح السنة للامام البربهاري : ٢/ ٥٢٧) .

٢٠٨ / أخرجه مسلم (٨٢) .

بەندەکان و کوفر وازهێنانە لە نوێژ) هەروەها ئەو فەرموودەیەی: (العهد الذي بيننا وبينهم الصلاة فمن تركها فقد كفر)[٢٠٩] واتە: ئەو پەیمانەی لە نێوان ئێمەو ئەواندایە نوێژە جا هەرکەسێ وازی لێهێنا ئەوە لەوانە).

ئەمەش ڕوون و ئاشکرایە، نەیفەرموو: هەرکەسێ وازی لێ بهێنێ و باوەڕی بەواجب بونی نەبێ، بەڵکو بەگشتی باسی کردووەو لەچەندین بەڵگەدا کە ئێرە شوێنی باس کردنی نییە.

نوێژەکان لەسەر پێنج نوێژ جێگیر بوو لەشەوو ڕۆژێکدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێ (معاذ)ی بۆ یەمەن ڕەوانە کرد پێی فەرموو: (فَلْيَكُنْ أَوَّلَ ما تَدْعُوهُمْ إليه شهادة أن لا إله إلا الله فإن أجابوك لذلك فأعلمهم أَنَّ اللَّهَ افْتَرَضَ عليهم خَمْسَ صَلَوَاتٍ...)[٢١٠] واتە: با یەکەم شتێك بانگی ئەوانی بۆ دەکەیت شایەتیدان بێت بەوەی کە هیچ خودایەك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها الله نەبێت، جا ئەگەر وەڵامی تۆیان دایەوە لەوەدا ئەوا ئاگاداریان بکەرەوە کە خوای گەورە پێنج نوێژ لەسەر فەرز کردوون).

ئەم نوێژە لەسەر پێغەمبەرو (ﷺ) ئوممەتەکەی فەرزکرا لەشەوی میعراجدا لەسەرووی ئاسمانەکانەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر گرنگی.

یەکەمجار نوێژەکان فەرزکران پەنجا نوێژ بوو لەشەوو ڕۆژێکدا، ئەمجار پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگارەکەی داوای سووککردنی لێکرد تاکو خوای گەورە نوێژەکانی کردە پێنج نوێژ بەکردار و پەنجا نوێژە لە سەر تەرازوو، چونکە چاکە دە بەئەندازەی خۆی زیاد دەکرێت تەنها یەك نوێژ خەیری دە نوێژی هەیە، ئەویش دەکاتە پەنجا نوێژ بەڵام بە کردەوە تەنها پێنج نوێژە لەشەوو ڕۆژێکدا.

---

٢٠٩ / صحيح : أخرجه الترمذي (٢٦٢١) والنسائي (٤٦٣) وابن ماجه (١٠٧٩) وأحمد (٣٤٦/٥) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع ) (٤١٤٣) .

٢١٠ / متفق عليه : أخرجه البخاري (١٣٣١) ومسلم (١٩) .

هەرکەسێ بڵێت: نوێژە فەرزەکان لەپێنج جار زیاترە ئەوا (مبتدع)ـە چونکە شتێکی لەدیندا زیادکردووە لەدیندا نییەو ئەو کەسەشی بڵێت: لەپێنج نوێژ کەمترە، هەروەکو چۆن کۆمەڵێکی (مبتدع) و گومڕاکار دەڵێن سێ جارە.

نوێژەکان بەپێی قورئان و سوننەت و ئیجماعی موسڵمانان پێنج نوێژە، خوای گەورە دەفەرموێت: (أَقِمِ الصَّلَاةَ لِدُلُوكِ الشَّمْسِ إِلَى غَسَقِ اللَّيْلِ وَقُرْآنَ الْفَجْرِ إِنَّ قُرْآنَ الْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا (٧٨) الاسراء ) واتە: نوێژە فەرزەکان ئەو کاتەی خۆر کلا دەبێ و لەناوەڕاستی ئاسمان لادەدا نوێژەکەی (نیوەڕۆ و عەسرت)بکە، کاتێکیش تاریکی شەو داهات، نوێژەکەی (شێوان و خەوتنان)ت ئەنجام بدەو نوێژەکەی بەیانیشت بەچاکی ئەنجام بدەو قورئانی زۆریشی تێدا بخوێنە چونکە قورئان خوێندنی نوێژی سپێدەی بەیانیان فریشتەکانی شەوو ڕۆژی تێدا جەم دەبێت).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەقسەو کرداری خۆی ڕوونی کردەوە، هەموو نوێژەکان کاتی خۆی هەیە خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّ الصَّلَاةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَابًا مَوْقُوتًا (١٠٣) الاسراء) واتە: فەرزکراوە لەسەرتان لەکاتی دیاریکراودا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەکردارو قسە ڕوونی کردەوە بۆیە نابێ لەکاتی خۆی دەری بکەن ئیللا لەکاتێکدا عوزری هەبێ وەکو ئەوەی دەخەوێ یان لەبیری دەچێ تاکو لەکاتی خۆی دەردەچێ، جا ئەگەر هاتەوە یادی یان لەخەو هەستا ئەوا (واجب)ە لەسەری ئەنجامی بدات لەهەر کاتێکدا بێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (من نسي صلاة أو نام عنها فليصلها إذا ذكرها، لا كفارة لها إلا ذلك)[٢١١] واتە: هەرکەسێك نوێژێکی لەبیر چوو یان خەوتبوو ئەوا با ئەنجامی بدات ئەگەر هاتەوە یادی، هیچ کەفارەتێکی نییە ئیللا ئەوە نەبێت).

---

٢١١ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٥٧٢) ومسلم (٦٨٤) .

بەڵام هەر کەسێ بەقەسدی نوێژەکانی لەکاتی خۆی نەکات، ئەوا نوێژەکەی دروست نییە هەرچەندە بیکاتەوە، چونکە ئەو نوێژەی نەکردووە خوای گەورە فەرمانی پێ کردوە، بەڵکو نوێژێکی کردوە بەپێی ئارەزووی خۆی، جا ئەگەر بەقەسدی نوێژەکەی لەکاتی خۆی دەرکردو نەیکرد ئەوا نوێژەکەی لێ وەرناگیرێ هەرچەندە بیکات، بۆیە پێویستە لەسەری تەوبە بکات و بگەڕێتەوە بۆلای خوا پارێزگاری لەنوێژەکانی بکات.

ژمارەی ڕکاتەکان پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕوونی کردوونەتەوە، نوێژی بەیانی دوو ڕکاتەو مەغریب سێ ڕکاتە، چونکە ویتری ڕۆژە و نیوەڕۆ چوار ڕکاتەو عەسر چوار ڕکاتەو عیشا چوار ڕکاتە.

لەسەفەردا نوێژە چوار ڕکاتییەکان دەبنە دوو ڕکات، نیوەڕۆو عەسر و عیشا هەروەکو لەسوننەتی سابت و جێگیری پێغەمبەری خوادا (ﷺ) هاتوەو لەقورئانیشدا هاتووە: (وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلَاةِ) النساء/١٠١) واتە: کاتێ بەسەفەر چوون بەوڵاتدا ئەوە لەحاڵی وادا هیچ گوناهێکتان لەسەر نابێ کەنوێژە چوار ڕکاتییەکان کورت بکەنەوە).

بەڵام نوێژی بەیانی هەروەکو خۆی لەسەر دوو ڕکاتەکە دەمێنێتەوە، بەڵام مەغریب کورت ناکرێتەوە چونکە ویتری ڕۆژە، ئەگەر کورت بکرێتەوە دەبێتە (شفع)، ئا بەم شێوەیە فەرموودەکان دەربارەی ئەم نوێژانە هاتوون، بۆیە دروست نییە هیچ کەسێك بە ویستی خۆی زیادو کەمی بکات، یان لەکاتەکەی خۆی دەری بکات.

**﴿٨٥﴾ نوسەر دەڵێت: (والزكاة من الذهب والفضة والتمر والحبوب والدواب على ما قال رسول الله (ﷺ) فإن قسمها فجائز وإن دفعها إلى الإمام فجائز، والله أعلم).**

واتە: زەكاتدان لەئاڵتون و زیو وخورماو دانەوێڵەو ولآخدا هەروەكو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی، جا ئەگەر خۆی دابەشی بكات ئەوا دروستەو ئەگەر بیداتە پێشەوای ئیمانداران ئەوا دروستە، خوای گەورە زاناترو شارەزاترە.

ڕاڤە:

پایەی سێ یەم لەپایەكانی ئیسلام بریتییە لە: زەكات، ئەویش هاوڕێی نوێژە لەزۆربەی ئایەتەكانی قورئاندا.

زەكات حەقێكی ئاشكراو دیارە لەسامانی دەوڵەمەندەكانەوە بۆ هەژاران.

ئەو سەروەت و سامانەی زەكاتی تێدا واجبە چوار جۆرە:-

جۆری یەكەم: دوو نەقدەكەیە، ئاڵتون و زیو و ئەوەی جێگەی ئەوان دەگرێتەوە وەكو پارە.

جۆری دووەم: وەلآخ، ئەویش وشترو مانگاو مەڕە.

جۆری سێ یەم: ئەوەی لەزەوییەوە دەردەچێ لەدانەوێڵەو بەروبووم.

جۆری چوارەم: كاڵای بازرگانی، ئەویش بریتییە لەو كاڵاو كەلوپەلانەی دەفرۆشرێتو دەكڕێت.

ئەمە سەروەتو سامانی زەکاتە پێویستە زەکاتی لێ دەرکرێ، بەڵام لەجگە لەم چوار جۆرە سامانە ئەوا ئەگەر مرۆڤ بیەوێو ویستی لێ ببێت صەدەقەی لێ بداتو لێی ببەخشێ ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ خۆی، دەرگای صەدەقەو بەخشین فراوانە.

مەبەست لە: (فإن قسمها فجائز وإن دفعها إلى الإمام فجائز).

واجبە لەسەری زەکات دەرکات، بەبەڵگەی ئەو ئایەتە: (وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ) البقرة /٤٣) آتُوا: واتە:بیدەن، بۆیە واجبە لەسەر خاوەن سامان ئەو زەکاتە بدات، ئەویش بەر پرسیارە لێی، بەڵام ئەگەر پێشەوای موسڵمانان داوای لێ کرد بۆ ئەوەی بیخاتە ئەستۆی خۆی ئەوا واجبە لەسەری بەوی بدات، چونکە گوێڕایەڵی کردنی واجبە، لە ئەستۆی خاوەن سامان نامێنێ، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) (جابی) باج سێنەکانی دەنارد بۆ وەرگرتنی زەکات لەخاوەنەکانیان و دابەشی دەکرد بەو کەسانەی شایستەی زەکاتن، دەسەڵاتدارەکان لەپاش پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەکارەکەی ئەو هەڵدەستن بەڵام ئەگەر داوای نەکات ئەوا بەرپرسیاری سامانەکە خاوەنەکەیەتی.

**﴿٨٦﴾ نوسەر دەڵێت: (واعلم أن أول الإسلام شهادة أن لا اله الا الله وأن محمدا عبده ورسوله).**

**واتە: بزانە یەکەم پایەی ئەم ئیسلامە شایەتی دانە کە هیچ خوایەك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێ، (محمد)یش (ﷺ) بەندەو نێردراوی ئەوە.**

**ڕاڤە/**

**بزانە ئەی برای موسڵمان، ئەی قوتابی زانستو زانیاری واتە: بزانەو ڕوون ببێتەوە لێت کەوا یەکەم پایەی ئەم ئیسلامە بریتییە لەشایەتی دان بەوەی هیچ خوایەك نییە شایستەی پەرستن بێت تەنها (الله) نەبێو (محمد)یش (ﷺ) پێغەمبەری ئەوە، ئەم دوو شایەتییە یەکەم پایەیە لەپایەکانی ئیسلام، هەروەکو لەفەرموودەکەی (جبریل)دا هاتوە کاتێ پرسیاری کرد لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:** (الإسلام أن تشهد أن لا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله، وتقيم الصلاة، وتؤتي الزكاة، وتصوم رمضان، وتحج البيت إن استطعت إليه سبيلا)[٢١٢] **واتە: ئیسلام ئەوەیە شایەتی بدەیت کەوا جگە لە (الله) هیچ خوایەکی تر نییە شایەنی پەرستن بێت و (محمد)یش (ﷺ) نێردراوی خوایەو نوێژەکانت بە ڕێكو پێکی ئەنجام بدەیتو زەکاتی ماڵەکەت بدەیت و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگریت و حەجی ماڵی خوا بکەیت ئەگەر توانات هەبوو).**

**جا هەردوو شایەتی دانەکە یەکەم شتە بانگەوازی خەڵکی بۆ دەکرێ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی:** (أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ الناس حتى يَقولوا: لَا إِلَهَ إلا الله فإذا قالوها عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إلا بِحَقِّ الْإِسْلَامِ وَحِسَابُهُمْ على اللَّهِ)[٢١٣] **واتە: فەرمانم پێکراوە کوشتار لە گەڵ خەڵکیدا بکەم تاکو شایەتی دەدەن هیچ خوایەك نییە شایستەی پەرستن بێت**

---

٢١٢ / صحيح : سبق تخريجه .

٢١٣ / رواه البخاري (٢٥) ومسلم (٢٢) .

تەنها (الله) نەبێت، جا ئەگەر ئەوەیان گوت ئەوا چیتر خوێن و سەروەت و سامانیان پارێزراو دەبێت ئیللا بە حەقی ئیسلام نەبێت و حیسابیان لەسەر خودایە).

کاتێ (معاذ)ی ڕەوانەی یەمەن کرد پێی فەرموو: (إنك تأتي قوما من أهل الكتاب فليكن أول ما تدعوهم إليه: شهادة أن لا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله)[٢١٤] جا ئەمە یەکەم شتە خەڵکی بۆ بانگ دەکرێت، چونکە ئەوە دەرگای چوونە ژوورەوەی دینی ئیسلامە.

بەڵام هەرکەسێ بایەخی بەیەکتاپەرستی نەدا – هەروەکو خاوەن بانگەوازو بەرنامە بانگەوازییەکانی ئەم سەردەمە کە بایەخی پێنادەن– ئەمە جیاوازە لەگەڵ ئەم بنەما مەزنەدا، مەبەست لەدوو شایەتی دانەکە تەنها وتنی بەزار نییە، بەڵام مەبەست لە وتنێتی لەگەڵ زانینی ماناکەی و کارکردن بەناوەڕۆکەکەی، بەڵام هەرکەسێ شایەتی دا کە (لااله الا الله وأن محمد رسول الله) ئەوا لێی وەردەگیرێ، جا ئەگەر بەردەوام بوو لەسەری ئەوا موسڵمانە، ئەگەر شتێکی لێ دەرکەوت ببێتە مایەی هەڵوەشاندنەوەی ئەوا کەسێکی هەڵگەڕاوەیە(مُرتد)ە.

مانای شایەتی (لا اله الا الله): باوەڕت ببێ بە دڵت و بەزمانت بیڵێی و دانی پێدا بنێیت کەوا هیچ کەسێك شایستەی پەرستن نییە تەنها (الله) نەبێ، هەر پەرستراوێك جگە لە ئەو پووچەڵە (باطل)ەو پەرستنیشی پووچەڵە (باطل)ە، خوای گەورە دەفەرموێت: (ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ هُوَ الْبَاطِلُ وَأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ (٦٢)الحج) واتە: لەبەر ئەوەیە چونکە تەنها هەر خۆی ڕاست و هەقە، هەر ئاین و پەرستنی ئەو هەقەو هەر شتێ بێ بڕوایان لەباتی ئەو هاواری بۆ ئەبەن و ئەی پەرستن، بتەکان و هەرشتێکی تر ئەوە باتڵە پووچەڵەو لەناهەق بەدەر نییەو هەر ئەو خوایەیە باڵادەستی گەورە، نە لەو بڵندتر هەیەو نە لەویش گەورەتر).

---

٢١٤ / صحیح : سبق تخریجه .

ماناى شايەتى دانـى (محمد رسول الله): دان بـەوەدا بنێيـت بەئاشـكراو نهێنـى كـەوا (محمـد) (ﷺ) نێـردراوى خودايـە، بـەڵام ئەگـەر كەسـێك بـەزارى گـووتى و لەناخيـدا باوەڕى بەپەيامەكەى نييە ئـەوە دووڕووە (منـافق)ە، خـواى گـەورە دەفـەرموێت: (إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ قَالُوا نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ (١)المنافقون) واتە: كاتىێ دووڕووەكان هاتن بۆ لات ئەى پێغەمبەر (ﷺ) ئەڵێن: شايەتى ئەدەين كە بە راستى تۆ پەيامبەرى خوايت، لە حاڵێكدا خوا خـۆى ئـەزانىێ كـە تۆ پەيامبەرى ئەويت و خوا گەواهى ئەدات كە ئەو دووڕووانە درۆ دەكەن كـە ئـەڵێن تـۆ پەيامبەرى خوايت).

دەفەرموێت: (يَقُولُونَ بِأَفْوَاهِهِمْ مَا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ (١٦٧)آل عمران) واتە: ئەوەى بـەزار دەيڵێن غەيرى ئەوەيە لە دڵياندايە).

جا پوختەى ماناى شايەتى دان بەوەى كە (محمد رسول الله)يە بريتييە لە:

١. (طاعته فيما أمر): گوێڕايەڵى كردنى لەوەى فەرمانى پىێ كردووە.

٢. (وتصديقه فيما أخبر): باوەڕ هێنان و بەڕاست زانينى ئەو هەواڵانەى گووتويەتى.

٣.(واجتناب ما نهى عنه وزجر): دووركەوتنـەوە لـەوەى نـەهى لىێ كـردووەو زەجـرى كردووە.

٤. (وأن لا يُعبد إلا بما شرع): هـەرگيز خـواى گـەورە نەپەرسـترێت ئـيللا بـەو شـێوە نەبىێ لە (شەرع)دا دايناوە.

طاعته فيما أمر:

جا ئەگـەر پێغەمبـەرى خـوا (ﷺ) فـەرمانى كـرد بەفـەرمانێك ئـەوا جـىێ بـەجێى دەكەيت: (وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ

وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُبِينًا (٣٦) الاحزاب) **واتە: بۆ هیچ پیاوو ژنێکی بڕوادار نییە کاتێ خواو پەیامبەرەکەی بڕیاری کارێکیاندا سەرپشککرانیان بۆ هەبێ لە کارەکەیاندا هەرکەسێك سەرپێچی بكات لە فەرمانی خواو پەیامبەرەکەی بەو شێوەیە کە جگە لە بڕیارەکانی ئەوان کارێکی دی هەڵبژێرێ بۆ خۆی ئەوە بێ گومان گومڕا بووە بە گومڕابوونێکی ئاشکرا).**

تصديقه فيما أخبر:

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی چەند شتێکی کردووە لەکاروباری غەیبی ئایندەو ڕابوردوو، جا دەبێ باوەڕ بەو قسانەی بکرێت کەگوتویەتی و ئەویش هەر لەخۆیەوە قسە ناکات:** (إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى) (٤) النجم).

**جا هەواڵەکانی ڕاست و دروست و دڵنیان، هیچ گومانێکی تێکەڵ نابێ ئەگەر فەرموودەکە (صحیح)بێت لەئەوەوە.**

واجتناب ما نهى عنه وزجر:

**دوورکەوتنەوە لەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەهی لێ کردووە ئەویش بەبەڵگەی ئەو ئایەتەی دەفەرموێت:** (وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ) (٧) الحشر) **واتە: هەرچی پەیامبەر پێی دان وەری بگرن، واتە:- بەچی فەرمانی پێ کردن بیکەن چ لەم دەستکەوتەدا و چ لە هەر شتێکی تردا جێبەجێی بکەن. ڕێیشی لە هەر شتێ لێ گرتن، ئێوەش دەستی لێ هەڵگرن و خۆتان لە خەشم و غەزەبی خوا بپارێزن بە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی و وازهێنان لە قەدەغەکراوەکانی بە راستی خوا سەخت تۆڵەیە قین و ڕقی لە هەر کەسێك گرت ڕزگاری نابێ).**

وأن لا يُعبد الله إلا بما شرع:

**ئـەو شـەرعەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دانـاوە ئـەویش لـەخوداوە گەیاندوویـەتی ئەمیش نـەفی بیدعـەو شتە تـازەو خورافاتـەکان دەکات کـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرمانی پیٚ نەکردووە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفـەرموێت:** (من عمل عملا ليس علي أمرنا فهو رد). **هـەروەها دەفـەرموێت:** (من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه فهو رد).**لـە جێگایەکی تردا دەفەرموێت:** (وإياكم ومحدثات الأمور). **دەفەرموێت:** (عليكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين المهديين من بعدي تمسكوا بها وعضوا عليها بالنواجذ وإياكم ومحجثات الأمور، فإن كل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة)[٢١٥].

**جا هەر پەرستنێك پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) لەشـەرعدا داینـەنابیٚ ئـەوا پـەرستنێکی (باطل)ە، هیچ پاداشتێکی تێدا نییە بەڵکو تاوانی تێدایە، چـونکە بیدعەیـەو بیدعـەیش خاوەنەکەی لەخوا دووردەکاتەوەو لەخوا نزیکی ناکاتەوە.**

**مەبەسـت لـە:** (واعلم أن أول الإسلام شهادة أن لا اله الا الله وأن محمدا عبده ورسوله) **ئەمە ڕوکنی یەکەمە، ئەویش دەرگای چـوونە ژوورەوەیـە، ئـەمجار لـەپاش ئـەوە نوێـژ دێت، ئەمجار لەپاش ئەو زەکات دێت و ئەمجار ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان و ئەمجار حـەج کردنـی مـاڵی خـوا، ئـەمجار ئـەودوای شـەریعەتەکانی تـری ئـەم دینـە، هـەموو ئەوانـە شـوێنکەوتەو تـابعی هـەردوو شـایەتی دانەکـەن:** (شهادة ان لااله الا الله وأن محمد رسول الله).

---

٢١٥ / سبق تخريج هذه الأحاديث .

**﴿٨٧﴾ نوسەر دەڵێت: (وأن ما قال الله كما قال ولا خلف لما قال وهو عند ما قال).**

**ئەوەی خوا فەرموویەتی هەر ئەوەیە کە ئەو فەرموویەتی و هەر بەڵێنێکی دابێت جێ بەجێی دەکات و دەیباتە سەر).**

**ڕاڤە:**

**مەبەست لە:** (وأن ما قال الله كما قال ولا خلف لما قال وهو عند ما قال).

**خوای گەورە هەر قسەیەکی فەرموو ئەوە هەر قسەکەی ئەوەو هیچ گومانێکی تێکەڵ نابێت خوای گەورە دەفەرموێت:** (وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ حَدِيثًا (٨٧) النساء) **واتە: جاکێ لەخوا قسەو گوفتاری ڕاستترە؟!).**

**دەفەرموێت:** (وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ قِيلًا (١٢٢) النساء) **واتە: هیچ کەسێك لەخوا ڕاستگۆتر نییەو ئەگەر خوای گەورە بەڵێنێك بدات ئەوا لێی پەشیمان نابێتەوە).**

**دەفەرموێت:** (وَعْدَ اللَّهِ لَا يُخْلِفُ اللَّهُ وَعْدَهُ) الروم /٦) **واتە: بەڵێنی خوایە هەرگیزیش خوا پێچەوانەی بەڵێنی خۆی ناکا).**

**جا ئەگەر بەڵێنی دا ئەوا لە بەڵێنەکەی پەشیمان نابێتەوەو ئەگەر هەڕەشەی دا ئەوە ڕەنگە لێی خۆش نەبێ جا جیاوازی هەیە لەنێوان بەڵێن و هەڕەشەدا، بەڵێن: هەرگیز لێی پەشیمان نابێتەوە. بەڵام هەڕەشە: ئەوا خوای گەورە ڕەنگە ببوورێ و ببەخشێ‌و ڕەنگە هەڕەشەی جێ بەجێ نەکات ئەویش لەڕەحمەت و بەزەیی و فەزڵی خۆیەتی.**

**﴿٨٨﴾ نوسەر دەڵێت: (والإيمان بالشرائع كلها) واتە: باوەڕبوون بەهەموو شەریعەتەکان.**

**راڤە:**

**پێویستە باوەڕ بەهەموو شەریعەتەکان بکرێت کە خوای گەورە دایبەزاندووەتە سەر هەموو پێغەمبەرانی، بە شێوەیەکی کورتی لە کورتەو خولاسەدا، بە درێژی لە کاتی درێژی باسەکەدا.**

**خوای گەورە دەفەرموێت:** (قُولُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنْزِلَ إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى وَمَا أُوتِيَ النَّبِيُّونَ مِنْ رَبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ (١٣٦) البقرة) **واتە: ئەی بڕواداران بڵێن: ئێمە باوەڕمان بەخواو بەو (قورئانە)ی بۆمان دابەزیوە هەیەو بەو بەرنامەیە کەبۆ (ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب و نەوەکانیان) نێردراوەو بەو کتێبەش کە بە مووساو عیسا دراوەو بەو پەیامەش بەهەموو پەیامبەرانی تر دراوە لەلایەن پەروەردگاریانەوە هیچ فەرق و جیاوازییەکیش ناخەینە نێوان هیچ کامێکیانەوە، بەتەنیایش ملکەچی فەرمانەکانی ئەوین).**

**هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:** (قُلْ آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنْزِلَ عَلَيْنَا وَمَا أُنْزِلَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى وَالنَّبِيُّونَ مِنْ رَبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ (٨٤) آل عمران) **واتە: بڵێ: خۆم و گەلەکەم باوەڕمان هێناوە بەو قورئانە بەو پەڕانەش کە بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب و نەوەکانی ئەو هاتبوو باوەڕیشمان بەو تەورات و ئینجیلە کە بۆ مووساو عیسا هاتووەو بەگشت پەیامبەرانی تر هەیە لە بەرامبەر هیچ کەسێکیشیاندا جیاوازییمان نییەو**

بڕوامان بەهەموویان هەیە تەنهاو تەنها ملکەچ و گوێڕایەڵی ئەوین و سەرپێچی لەهیچ بڕیارێکی ناکەین).

جا ئێمە باوەڕ بە هەموو شەریعەتەکانی خوای گەورە دەکەین، باوەڕ دەکەین بەوەی خوای گەورە بۆ هەموو کاتێك شەرعێك دادەنا ئەمجار بە شەریعەتێکی تر نەسخی دەکاتەوە بگونجێ لەگەڵ ئەوانەی پاش ئەوان دێن، کاتێ (محمد) (ﷺ) ڕەوانە کرا شەریعەتێکی چەسپیو و دامەزراوی هێنا تاکو ڕۆژی قیامەت و نەسخ نابێتەوەو هەرگیز ناگۆڕێت و دەگونجێ بۆ هەموو کات و شوێنێك.

**﴿٨٩﴾ نوسەر دەڵێت: (واعلم أن الشراء والبيع حلال إذا بيع في أسواق المسلمين على حكم الكتاب والسنة من غير أن يدخله تغرير أو ظلم أو غدر أو خلاف للقرآن أو خلاف للعلم).**

**واتە: بزانە کڕین‌و فرۆشتن حەڵاڵە ئەگەر لەبازاڕی موسڵماناندا فرۆشرا لەسەر حوکمی قورئان‌و سوننەت، بەبێ خەڵەتاندن‌و ستەم و غەدری تێکەڵ بێت یان جیاواز بێت لەگەڵ قورئاندا یان جیاواز بێت لەگەڵ عیلمدا.**

**ڕاڤە/**

**باوەڕمان وایە کڕین و فرۆشتن حەڵاڵە،** (وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا) البقرة /٢٧٥) **واتە: خوای گەورە کڕین و فرۆشتنی ڕێداوە و سوود خۆریشی حەرام و یاساغکردووە).**

**خوای گەورە دەفەرموێت:** (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلَّا أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ وَلَا تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا (٢٩)النساء) **واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! ماڵ و سامانی یەکتری لەخوت و خۆڕایی مەخۆن مەگەر لەڕێگەی سەداو بازرگانی و ڕەزامەندی نێو خۆتانەوە بێت‌و خۆتان مەکوژن چونکە بەڕاستی خوا دەربارەی هەمووتان دلۆڤان و میهرەبانە).**

**هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:** (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَاةِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ (٩) فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلَاةُ فَانْتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِنْ فَضْلِ اللَّهِ وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ (١٠) الجمعة) **واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! کاتێ ڕۆژی هەینی بانگدرا بۆ نوێژ جا ئێوە بە پەلە بچن بەدەم زیکری خواوەو واز لە هەموو کڕین‌و فرۆشتنێك بێنن ئەو خۆ ئامادە کردنە بۆی چاکترە بۆتان واتە: ئەبێتە هۆی ڕەزامەندی خوا لە دونیاو قیامەت**

ئەگەر بزانن و دەرکی راستی بکەن (٩) جا کەنوێژەکە تەواو بوو، بڵاو ببنەوە بەڕوی زەویدا و داوای ڕزق و ڕۆزی و بەهرەی خوا بکەن و هەوڵی ڕۆزی بدەنو یادی خوا زۆر بکەن بەو ئومێدە بەختیارو سەرفراز بن (١٠).

خوای گەورە دەفەرموێت: (يُسَبِّحُ لَهُ فِيهَا بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ (٣٦) رِجَالٌ لَا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ) النور/٣٧) واتە: نویژو ستایشو تەسبیحاتی پاکی ئەو دەکەن(٣٦) پیاوانێك بازرگانی و کڕین و فرۆش لەیادی خواو لەبەرپاکردنی نوێژو بەخشینی زەکات غافڵیان ناکا (٣٧).

(لا تلهيهم):

نەیفەرموو نافرۆشن و بازرگانی ناکەن بەڵکو فەرموی: بازرگانیەکانیان لەزیکری خوای گەورە غافڵیان ناکات، بەڵکو ئامادەی مزگەوتەکان دەبن و نوێژ لەگەڵ جەماعەتدا دەکەن و ئەمجار دەڕۆن بۆلای کڕین و فرۆشتنەکەیان، کڕین و فرۆشتن یەکێکە لەپاکترین کەسابەتەکان ئەگەر دوور بوو لەساختەو خەڵەتاندن و فرۆشتنی شتی حەرام و مامەڵەکردن بەحەرام و ڕیبا، جا ئەگەر کڕین و فرۆشتن دوور بوو لەخراپەکان ئەوا لەپاکترین کەسابەتە.

مەبەست لە: (إذا بيع في أسواق المسلمين).

ئەوەی دەهێنرێتە بازاڕی موسڵمانان ئەوا پرسیار لەبارەیەوە مەکە، چونکە ئەصڵ ئەوەیە حەڵاڵە ئیللا مەگەر بە دڵنیاییەوە بزانی حەرامە.

مەبەست لە: (على حكم الكتاب والسنة).

بەوەی مەرجە ئاشکراکانی فرۆشتنی تێدا بێت، جا ئەگەر حەوت مەرجە زانراوەکەی تێدا بوو ئەوا فرۆشتنێکی دروستە، ئەوەی ئەفرۆشرێ حەڵاڵە، ئەصڵی بازاڕی موسڵمانان لەسەر ئەوە بەندە.

مەبەست لە: (من غير أن يدخله تغرير أو ظلم أو غدر).

بەلام ئەگەر فرۆشتنەکە خەڵەتاندنو نەزانینو نادیارو سەرەرۆیی تێکەڵ بوو ئەوا ئەو کاتە دەبێتە حەرام چونکە ئەو کاتە دەبێتە قومار، یان دەبێتە خەڵەتاندن، بەوەی شتێك ئاشکرا بکات وەکو حەقیقەتەکەی نەبێ، وەکو ئەوەی کەرەستەکە بەشێوەیەك دەربخات لەسەر حەقیقەتەکەی خۆی نەبێ ئەمەش پێی دەڵێن (تدليس) ئەویش بریتییە لە: دەرخستنی کالآیەك بەشێوەیەك ئەو کەسەی دەیبینێ سەرسام دەبێ و لەناخیشدا جیاوازی ئەوەیە.

مەبەست لە: (أو ظلم).

بەوەی بەزۆر لەخاوەنەکەی بیکڕێ، بەڵکو فرۆشتن دەبێ بەڕەزامەندی بێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (إنما البيع عن تراض)[٢١٦] خوای گەورە دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلَّا أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ (٢٩) النساء) واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! ماڵ و سامانی یەکتری لەخوت و خۆڕایی مەخۆن مەگەر لەڕێگەی سەداو بازرگانی و ڕەزامەندی نێو خۆتانەوە بێت).

جا یەکێ لەمەرجەکانی فرۆشتن بریتییە لەڕازی بوونی فرۆشیار، دەبێ لەپاش ویست و هەڵبژاردنی خۆی بێت و بەزۆر نەبێ، چونکە ناچار کردنی ستەمە، ئیللا مەگەر ناچارکردنەکەی لەسەر حەق بێت وەکو ئەوەی قەرزی لەسەر بێت و ڕازی نییە بەدانەوەی قەرزەکە لەم کاتەدا دادوەر بەشداری دەکاتو ماڵەکەی دەفرۆشێتو قەرزەکانی پێ دەداتەوە هەرچەندە ڕازیش نەبێ بەوە، چونکە ئەم زۆر لێ کردنە حەقە، بۆیە دەڵێن: (لايصح بيع المكره إلا بالحق) واتە: فرۆشتنی زۆر لێکراو دروست نییە ئیللا مەگەر بەحەق نەبێت.

---

٢١٦ / صحيح : أخرجه ابن ماجه (٢١٨٥) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٢٣٢٣) .

**﴿٩٠﴾ نوسەر دەڵێت: (واعلم – رحمك الله - أنه ينبغي للعبد أن تصحبه الشفقة أبدا ما صحب الدنيا لأنه لا يدري على ما يموت وبما يختم له وعلام يلقى الله عز و جل وإن عمل كل عمل من الخير).**

واتە: بزانە_ڕەحمەتی خوات لێ بێ_ کەوا پێویستە هەردەم بەزەیی‌و دڵنەرمی هاوڕێی بەندە بێت تاکو لەدونیادایە، چونکە نازانێت لەسەر چی دەمرێت، بەچی کۆتایی بەژیانی دێت، لەسەر چی شتێك دەگاتە خواکەی خۆی، هەرچەندە هەموو کارێکی باش ئەنجام بدات.

**﴿٩١﴾ نوسەر دەڵێت: (وينبغي للرجل المسرف على نفسه ألا يقطع رجاءه من الله تعالى عند الموت ويحسن ظنه بالله ويخاف ذنوبه فإن رحمه الله فبفضل وإن عذبه فبذنب).**

واتە: پێویستە لەسەر کەسی زیادەڕەو رجاو تکا لەخواکەی خۆی نەبڕێت لەکاتی مردندا، گومانی باش بەخواکەی ببات، ترسی ئاکامی تاوانەکەی هەبێ، جا ئەگەر خوای گەورە ڕەحمی پێ کرد ئەوە بەفەزڵی خوایەو ئەگەر سزای بدات ئەوا لەسەر تاوانەکانی خۆیەتی.

ڕاڤە/

ئەم مەسەلەیە مەسەلەیەکی مەزنە ئەویش: ئیماندار دەبێ لەنێوان ترس و تکادا کۆ بکاتەوەو لەکارەکانیدا لە نێوان ترس‌و ڕجادا ڕێ دەکات، نابێت تەنها بترسێت و بێ نومێد بێت لەڕەحمەتی خوا، خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّهُ لَا يَيْأَسُ مِنْ رَوْحِ اللَّهِ إِلَّا الْقَوْمُ الْكَافِرُونَ (٨٧) يوسف) واتە: چونکە مەگەر هەر خوانەناس و بێ باوەڕان لەڕەحم‌و میهرەبانی خوا بێ هیواو نائومێد بن).

خوای گەورە دەفەرموێت: (قَالَ وَمَنْ يَقْنَطُ مِنْ رَحْمَةِ رَبِّهِ إِلَّا الضَّالُّونَ (٥٦)الحجر) واتە: ئیبراهیم وتی: دەبێ کێ لە میهرەبانی پەروەردگاری خۆی نائومێد بێ، بەدەر لەڕێ لادەرەکان؟).

خوای گەورە دەفەرموێت: (قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ (٥٣) الزمر) واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) لە منەوە بڵێ: ئەی بەندەکانی من! ئەی ئەوانەی ستەم و زیادە ڕۆییتان لە خۆتان کردووە! ئێوە لە رەحمەت و میهرەبانی خوا بێ ئومێد مەبن).

نابێت ترسێکی زیاد لەحەد لەدڵیدا ببێت، ببێتە هۆی ئەوەی بێ ئومێدی بکات لەڕەحمەتی خوا، ئەو ترسە ترسێکی خراپەو نەویستراوە، هەروەها دەبێ ڕجای خوای هەبێ، بەڵام ڕەجاکەی وای لێ نەکات تەئمینی بکات لەمەکری خوا، بەڵکو دەبێ بترسێ لەمەکری خوا، مەکری خوا مەکرێکە لایەقی کەمالی خۆیەتی،وەکو مەکری دروستکراوەکانی نییە، چونکە مەکر لەزماندا بریتییە لەگەیاندنی ئازار بۆ کەسێکی تر بە نهێنی، بەشێوەیەك هەستی پێ ناکات جا ئەگەر ئەمە بەحەق بێت ئەوا دادپەروەرییە ئەمەش مەکری خودایە، چونکە مەکر بەستەمکاران و فاسقەکان دەکات، جا سزاکەیانی پێ دەگەیەنێ بەشێوەیەك هەستی پێ نەکەن، ئەمەش دادپەروەری خودایە دەبێ سوپاس و ستایشی بکەین لەسەری.

بەڵام ئەگەر هاتوو گەیاندنی ئازارەکە بۆ کەسانی تر بەناحەق بوو ئەوە ستەمەو دروست نییە ئەمەش مەکری خەڵکی یە (دروستکراوەکانە) بەڵام مەکری دروستکار چاکەو ویستراوە، چونکە دادپەروەرییە لەئەوەوە، ئەمە جیاوازییە لەنێوان هەردوو لادا، لەنێوان مەکری خوداو مەکری دروستکراوەکاندا، (وَمَكَرُوا وَمَكَرَ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ (٥٤) آل عمران) واتە: دوژمنانی خوا فێڵیان کرد بەڵام خوا فرو فێڵەکەیانی پووچەڵ کردەوە بێ گومان بن خوا باشتر چارەکەرە بۆ هەڵوەشاندنەوەی فێڵ و پیلانەکانیان.)

ئەمە لەباسی سزای ئەواندا، جا ئەوە ستەم نییە لە خوداوە، بەڵکو ئەوە ئەنجامی مەکرەکەی ئەوانە، ئەوان مەکریان کردو خوای گەورەیش مەکری کرد بەسەریاندا وەکو سزایەك بۆیان، ئەمەش دادپەروەرییە لەخوداوە، لەفەرموودەدا هاتووە: (إِنَّ أحدكم لَيَعْمَلُ بعَمَلَ أَهْلِ الْجَنَّةِ حتى ما يكون بينه وبينها ذراع فيسبق عليه الكتاب فيعمل بعمل أهل النار فيدخلها)[217] واتە: (کەسی وا هەیە کردەوەی ئەهلی بەهەشت ئەنجام دەدات تاکو

٢١٧ / صحيح : سبق تخريجه .

نێوان ئەوو بەهەشت تەنها یەك باڵ دەمێنی کەچی کیتابەکەی پێشی دەکەوێت و بە کرداری ئەهلی ئاگر کردەوە دەکاتو دەچێتە ئاگرەوە).

دەچێتە ناو ئاگرەوە بەهۆی ئەوەی کردەوەی ئەهلی ئاگری ئەنجام داوە، سزاکەی بە پێی کردەوەکەی خۆیەتی، جا لەبەر ئەوەی کۆتاییەکەی بە کردەوەی ئەهلی ئاگر کرداری کرد بۆیە دەچێتە ئاگرەوە، بەپێچەوانەوە، (إِنَّ أحدكم لَيَعْمَلُ بعَمَلَ أَهْلِ الْنار حتى ما يكون بينه وبينها ذراع فيسبق عليه الكتاب فيعمل بعمل أهل الجنة فيدخلها)[٢١٨] واتە: کەسی وا هەیە کردەوەی ئەهلی ئاگر ئەنجام دەدات تاکو نێوان ئەوو ئاگر تەنها یەك باڵ دەمێنی کەچی کیتابەکەی پێشی دەکەوێت و بە کرداری ئەهلی بەهەشت کردەوە دەکاتو دەچێتە بەهەشتەوە).

دەچێتە ناو بەهەشتەوە چونکە بەکردەوەی ئەهلی بەهەشت کاری کرد، لەسەری مردوە، جا کەس ناچێتە ئاگرەوە بەبێ کردەوەو کەس ناچێتە بەهەشتەوە بەبێ کردەوە، کردەوەکانیش بەپێی کۆتاییەکەیەتی، بۆیە نابێت مرۆڤ لە خۆبایی ببێت بەکردەوە چاکەکانیو بەردەوامبوونیو لەلادان تەئمین بێت، چەند کەس لەئیمانداران و موسڵمانان و زانایان لەڕاستەڕێ لایاندا؟ خوای گەورە لەڕێگەی ڕاست لایانی دا بەهۆی سەرپێچی کردنی خۆیانەوە، نابێت مرۆڤ تەئمین بێت لەخۆی و تەزکییەی خۆی بکات، نابێ تەئمین بێت لەلادان و تێکەڵ بەخراپەکاران ببێ وگوێیان لێ نەگرێ و تەماشای فیتنە نەکات، تەئمین نەبێ لە خۆی.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (قلوب العباد بين إصبعين من أصابع الرحمن)[٢١٩] واتە: دڵی بەندەکان لە نێوان دوو پەنجەیە لە پەنجەکانی خوای میهرەباندایە) تەئمین

٢١٨ / صحيح : سبق تخريجه .

٢١٩ / صحيح : سبق تخريجه .

**نەبێ لەخۆی لەکاتێکدا** (ابراهيم الخليل) **دەفەرموێت:** (وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَنْ نَعْبُدَ الْأَصْنَامَ (٣٥) رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ (٣٦) ابراهيم) **واتــە: خوایــە! خــۆم و کوڕەکــانم لــە بتپەرستی وەدوورخە (٣٥) ئەی پەروەردگارم ! بە راستی ئەو بتانە خـەڵکێکی زۆریـان سەرلێشێواو و گومڕا کردووە (٣٦).**

**جا مرۆڤـ تەئمین نەبێ لەخۆی لەفیتنەو لە ئاخر شەڕی هەرچـەندە باشـترین کـەس بێت، هەرگیز لەڕەحمەتی خوا بـێ ئومێـد نـەبێ هەرچـەند بـێ بـاوەڕترین کـەس بێـت، ڕەنگـە خــوای گــەورە تەوبــەی بەقــسمەت بکـات و لەســەر ئیــسلام بمرێــت و بــچێتە بەهەشتەوە چونکە لەژیاندایە ئەوا ئەوە ڕێی تێ دەچێت تووشی ئەم بێت یـان تووشــی ئەو بێت، جا کردەوەکان بەپێی کۆتاییەکانە.**

**مەبەست لە:** (ويحسن ظنه بالله، ويخاف ذنوبه).

**گومانی باش بەخواکەی ببات و لەڕەحمەتی خوا بێ ئومێد نەبێ.**

**مەبەست لە:** (ويخاف ذنوبه).

**واتە هیچ ڕجایەك ناکات بەبێ ئەوەی ترسی لەگەڵدا نـەبێ، بـەڵکو لـەنێوان تــرس و ڕەجــادا کۆبکاتــەوە** (إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا (٩٠) الانبياء) **واتە: چونکە ئەوان هەموویان لەکاری خێرو چاکەدا بەردەوام پەلـەو تالوکـەیان دەکـرد هەمیشە لەبەر هیوای میهرەبانی و ڕەحمـەتی ئێمـەدا نزایـان دەکـرد و لەترسـی دۆزەخ هاواریان دەکرد.**

**ئەوانە پێغەمبەرانن و خێرا دەکەن و پەلە دەکەن لەئەنجامـدانی چـاکەکاریدا و داوا لەخوادەکەن و** (رغبا) **واتە بەتەماحی پاداشـتی و** (رهبا) **واتـە: لەترسـی سـزاکەیدا، جـا پێغەمبــەران لــەنێوان تــرس و ڕەجــادا کۆدەکەنەوە،تــەنها لایــەك وەرنــاگرن و واز لــەو**

لایەکەی تر بهێنن، تەنها لایەنی ترس وەرناگرن و واز لەلایەنی ڕەجا بهێنن، یان لایـەنی ڕەجا وەرناگرن و واز لە ترس بهێنن.

دەبێ بەنـدە گومـانی بـاش بەخواکـەی ببـات بـە تایبـەتی لـەکاتی مردنـدا، زانایـان دەڵێن: لەکاتی تەندروستدا لایەنی ترس زاڵ ببێت بەسەریدا باشـترەو لـە کـاتی مردنـدا لایەنی رجا زاڵ ببێت بە سەریدا باشترە، چـونکە لـەکاتی ژیانـدا دەتـوانێ کـار بکـات و تەوبە بکاتو داوای لێ خۆشبوون بکات، بەڵام لەکاتی مردندا ناتوانێ هیچ شـتێك بکـات بۆیە لایەنی ڕەجا زاڵ ببێت بەسەریدا باشترە، بۆیە لەفەرموودەیەکدا هـاتوە، (لا يموت أحدكم إلا وهو يحسن الظن بالله)[٢٢٠].

مەبەست لە: (فإن رحمة الله فبفضل، وإن عذبه فبذنب).

ئەمەش هەروەکو ئەوەی لەپێشدا باسکرا کـەوا خـوای گـەورە سـزاو خۆشـی ناداتـە بەنـدەکانی ئـیللا بـەکردەوەی خۆیـان نـەبێ (وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا (٤٩)الكهف) واتـە: پەروەردگاریشت ناهەقی و ستەم لەهیچ کەسێك ناکات).

٢٢٠ / أخرجه مسلم (٢٨٧٧) .

**﴿٩٢﴾ نوسەر دەڵێت: (والإيمان بأن الله تعالى اطلع نبيه (ﷺ) على ما يكون في أمته إلى يوم القيامة).**

واتە: باوەڕبوون بەوەی خوای گەورە هەموو ئەوەی دێت بەسەر ئوممەتی پێغەمبەرەکەیدا تاکو ڕۆژی قیامەت پیشان پێغەمبەرەکەی (ﷺ) داوە.

ڕاڤە/

پێغەمبەری خوا (ﷺ) غەیب نازانێ، هیچ یەکێك لەدروستکراوەکانی خوا غەیب نازانن، (قُلْ لَا يَعْلَمُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ (٦٥) النمل) واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) پێیان بڵێ: هیچ کەسێك لەوانەی کە لەئاسمانەکان و زەویدان _بێجگە لەخوا_ئاگایان لەغەیب نییە).

غەیب: ئەو شتەیە لە ئێمە بزرەو ئامادە نییە، لەئایندەو لەڕابوردوودا، ئێمە ئەو شتانە نازانین، بەڵام پێغەمبەران ئەوا خوای گەورە شتیان پیشان دەدا لەغەیبدا لەبەر بەرژەوەندی بانگەواز بۆ لای خوا، لەوانە: پێغەمبەرمان (محمد) (ﷺ) خوای گەورە چەندین شتی پشاندا لەغەیبەکانو بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی داوە لە بەر بەرژەوەندی ئەم ئوممەتە، خوای گەورە دەفەرموێت: (عَالِمُ الْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ أَحَدًا (٢٦) إِلَّا مَنِ ارْتَضَى مِنْ رَسُولٍ) الجن) واتە: ئەو زاتە زانای نادیار و غەیبە، غەیبی خۆی بۆ هیچ کەسێك دەرناخاو ئاشکرا ناکا (٢٦) مەگەر بۆ پەیامبەرێك کە خۆی لێی ڕازی بێت).

(الا من ارتضى من رسول):

واتە: خوای گەورە ئەوەی ویستی لەسەر بێت ئاگاداری پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کردووەتەوە.

بۆ نموونە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ هاوەڵەکانیدا ڕێی دەکرد، بەتەنیشت دوو گۆڕدا تێپەڕین، فەرمووی: (إنهما ليعذبان)[٢٢١] هـاوەڵان هەسـتیان بـەوە نـەکرد خـاوەنی ئەو دوو گۆڕە سزا دەدەرێن بەڵام خوای گەورە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئاگادار کـردەوە بەسزادانی ئەو دوو مردووەو فەرمووی: (إنهما ليعذبان) ئەمە لەو شتانەیە خـوای گـەورە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئاگادار کردەوە، ئەمەش لەتایبەتمەندییەکانی پێغەمبەرانە.

ئاگـاداری کـردەوە لـەوەی لەئاینـدەدا ڕوودەدات، مەرجـەکانی قیامـەتی پـێ ڕاگەیاندووین، دەربارەی فیتنەکان هەواڵی پـێ داویـن، بـۆ ئـەوەی ئاگـاداربین و لـەوە بترسین تووشی ئەو کێشانە ببین و بەرانبـەریان چـاوڕوون بـین، هـەواڵی پێـداین لەبـەر بەرژەوەندی خۆمان لە ڕووی ئاگادارکردنەوەمانو لـەپێناوی ئـەوەی ئاگـاداری خۆمـان بین، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرمویـەتی: (وستفترق هذه الأمة على ثلاث وسبعين فرقة، كلها في النار إلا واحدة)[٢٢٢] واتە: ئوممەتەکـەم دەبێتـە حـەفتا و سـێ تـاقم و فیرقـەوە، هەمووی لە ئاگردایە تەنها یەکێکیان نەبێت).

ئەمە هەواڵێکـە لەئـەوەوە کـەوا جیـاوازی و پارچـە پارچـە بـوون لـە ئوممەتەکەیـدا ڕوودەداتو هەروەکو ئەوەی ئەو هەواڵی پێ داویـن ڕووی دا، بـۆ ئـەوەی دامـەزراو بـین لەسەر حەق و لەگەڵ یاخی بووەکاندا نەڕۆین.

---

٢٢١ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٢١٣) ومسلم (٢٩٢) .

٢٢٢ / حسن : سبق تخريجه .

**﴿٩٣﴾ نوسەر دەڵێت: (واعلم أن رسول الله (ﷺ) قال: (ستفترق أمتي على ثلاث وسبعين فرقة كلها في النار إلا واحدة وهي الجماعة) قيل: من هم يا رسول الله؟ قال: ما أنا عليه اليوم وأصحابي).**

**واتە: بزانە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (ئوممەتەکەم دەبێتە حەفتا و سێ تاقم و فیرقەوە، هەمووی لە ئاگردایە تەنها یەکێکیان نەبێت ئەویش جەماعەتە، فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کێن ئەو کۆمەڵە رزگار بووە؟ فەرمووی: ئەو رێگایەی ئەمڕۆ منو هاوەڵانی لە سەرین).**

**مەبەست لە:** (واعلم أن رسول الله (ﷺ) قال: (ستفترق أمتي على ثلاث وسبعين فرقة كلها في النار إلا واحدة وهي الجماعة).

**خوای گەورە فەرمانی پێ کردووین لەسەر حەق کۆببینەوە** (وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا ال عمران /١٠٣) **واتە: بەتێکڕا گشتتان دەست بەپەتەی ئایینی خواو قورئانەکەیەوە بگرن و قەت لێی نەترازێن).**

**خوای گەورە دەفەرموێت:** (إِنَّ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعًا لَسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ إِنَّمَا أَمْرُهُمْ إِلَى اللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُمْ بِمَا كَانُوا يَفْعَلُونَ (١٥٩) الانعام) **واتە: بێگومان ئەو کەسانەی دینی خۆیانیان پەرت و بڵاوکردو بوونە چەند دەستەو بەستەیەکی جیاوازو لێکترازاو تۆ کارێکت بەوان نییە، بەڕاستی بڕیاری چارەنوسیان هەر لای خوایە پاشانیش بەهەر کارێ کردوویانە ئاگاداریان دەکات).**

**هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:** (وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ تَفَرَّقُوا وَاخْتَلَفُوا مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَأُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ (١٠٥) آل عمران) **واتە: ئێوە وەکو ئەو جوولەکەو گاورانە مەبن، کەدوای چەندین بەڵگەو نیشانەی ڕوون بۆیان هات، پەرت**

بوون و دوو بەرەکییان تێ کەوت دژی یەکدی وەستان ئەوانە سزایەکی گەورەو گرانیان بۆ هەیە).

جـا نـەهی لێکـردووین لەدووبـەرەکیو فـەرمانی پـێ کـردووین بەکۆبوونـەوەو دەستگرتن بە کیتابەکەی خوداو سـوننەتی پێغەمبەرەکـەی (ﷺ)، فەرموویـەتی: (وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ (١٥٣) الانعام) واتـە: ئەم هێڵە شاستەیە بەرنامەو ڕێبازەکەی منە، دەسا ئێوەیش ئەی ئیمانداران! هەمیشە شوێنی بکەون و هەر بەودا بچن مەکەونە شوێنی ڕێچکەکانی تر، ئەوسا لەشـاڕێگەکەی خوا بترازێن و پەڕاگەندە ببن).

بۆیە دروست نییە دووبەرەکی و جیاوازی بکەین لەبەر شوێنکەوتنی ئارەزووەکـان، یان لەبەر چـاولێکردنی بـاوو باپیران یـان چـاولێکردنی جوولەکـەو گاورەکـان، چـونکە جیاوازیو دووبەرەکی لەکاروباری عەقیدەو بنەماکانی دیندا دروست نییە، بەڵکو دەبـێ یەکدەنگ بین و لەسەری کۆ ببینەوە.

جیاوازی لەمەسەلە فیقهییەکاندا ڕوو دەدەن بەڵام دەبێ بگەڕێینەوە بۆ ئـەو ڕایـەی لەسەر بەڵگە ڕاوەستاوە، خوای گەورە دەفـەرموێت: (فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا (٥٩) النساء) واتـە: ئەگەر لە شتێکدا کێشەو ناکۆکیتان بوو جا بیگێڕنەوە بۆ لای خوا و پەیامبەر واتـە: بـا تەنها قورئان و سوننەت داوەر و حەکـەمتان بـن، ئەگـەر باوەڕتـان بـە خـواو بـە ڕۆژی دوایی هەیە دەبێ ئاوابێت، ئەو گێڕانـەوەی کێـشەو هەرایـە بـۆ لای قورئـان و سـوننەت جوانتر و چاکترە بۆتان چاکترین ڕەفتاریشە بۆ داهاتووتان).

کەواتە جیاوازی لەعەقیدەدا دروست نییە، چونکە عەقیـدە شـتێکی (تـەوقیفی)یـەو جێگەی ئیجتیهاد نییە.

بەڵام لە مەسەلە فیقهییەکان ئەوا: هەمووان لە ئەهلی عیلم – ئەوانەی گەیشتوونەتە پلەی ئیجتیهاد– ئیجتیهاد دەکەن، رەنگە لە بۆچوونیاندا جیاوازبن بەڵام لـە سـەر ئـەو جیاوازییە نامێنن بەڵکو دەگەڕێنەوە بـۆ کیتابەکـەی خـوا و سـوننەتی پێغەمبەرەکـەی (ﷺ)، جا هەرکەسێ بەڵگەی پێ بوو ئەوا شوێنی دەکەون و قسەکەی وەردەگرن‌و واز لەبۆچوونی خۆیان دەهێنن، ئەمە مەزهەبی ئـەهلی سـوننەو جەماعەیـە، هـەر ئەمەشـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ڕێنمـویی بـۆ کـردووین، بـەڵام بڵـێین:– واز لەخـەڵکی بهێـنن هەریەکـەو شـوێنی بۆچـوونەکەی خـۆی بکـەوێ وجیـاوازی ئـەم ئوممەتـە ڕەحمەتـە هـەروەکو دەڵـێن، ئـەوا دەڵـێین: ئەمـە قـسەیەکی پوچـەڵە (باطـل)ە، خـوای گـەورە دەفەرموێت: (وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ (١١٨) إِلَّا مَنْ رَحِمَ رَبُّكَ (١١٩) هود) جا ئایەتی (إِلَّا مَنْ رَحِمَ رَبُّكَ) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەوانەی خوای گەورە ڕەحمی لێ کـردوون جیـاوازی و دووبەرەکییان نـەکردوە، بەڵگەشـە لەسـەر ئـەوەی جیـاوازی عەزابـەو ڕەحمـەت نییـە، ڕەحمەت بۆ ئەو کەسانەیە جیاواز نەبوونە، ئەگـەر جیـاوازی‌و دووبـەرەکی یـان تـووش بوو ئەوا دەگەڕێنەوە بۆ قورئـان و سـوننەت و ئـەوەی ڕاسـتە وەری دەگـرن و ئـەوەی هەڵە بوو وازی لێ دەهێنن، ئەمە ڕێگای ئەهلی سوننەو جەماعەیـە، بـەڵام هـەر کەسـەو لەسـەر ڕاو بۆچـوونی خـۆی بمێنـێ و قـسەی فـلاَن و فـلاَن وەرگـرێ، ئەمـە ڕێگـای موسـڵمانان نییـە، ئەمـە ڕێگـای ئـەهلی ئـارەزوو و شـەهەواتە بـەدوای ئـەو قـسانەدا دەگەڕێن لەگەڵ ئارەزوویانـدا بگـونجێ و یـان لەگـەڵ حەزەکەنیانـدا بگـونجێ، ئـەوەی لەگەڵ حەزەکانیانـدا نـەگونجێ ئـەوا وازی لێ دەهێـنن هەرچـەندە ئـەو زانایـەش بیڵـێ کەقسەکانی وەردەگرن، واتە ئەوان قسەی پێشەوایان‌و زانایـان وەرنـاگرن ئـیللا ئـەوە نەبێ لەگەڵ حەزەکانیاندا دەگونجێ بەڵام ئـەوەی لەگـەڵ حەزەکانیانـدا جیـاوازە ئـەوا ڕەدی دەکەنەوە، ئەمەش بەڵگەیە کەوا ئەوان شـوێنی ئـارەزوو کـەوتوون، جـا ئـەوەی لەگـــەڵ ئارەزوەکانیانـــدا گونجـــا وەری دەگـــرن و ئـــەوەی جیـــاواز بـــوو لەگـــەڵ ئارەزووەکانیاندا وازی لێ دەهێنن، ولاحول ولا قوة الا بالله.

ئەمەش ئەوەیە ئێستا لەگۆڤارو ڕۆژنامەو کۆڕو کۆنگرەکاندا بانگەشەی بۆ دەکەن بەزۆری، لە کەناڵە ئاسمانییەکاندا ڕەواج بەو جیاوازییانە دەدەنو دەڵێن: بۆ خەڵکی فراوانی دەکەینەوە! بەچی شتێك بۆ خەڵکی فراوانی بکەینەوە؟ بە وازهێنان لەقورئانو سوننەت و ڕۆیشتن بۆلای ئەو قسانەی خاوەنەکانیان (معصوم) نین، کە هەڵە دەکەن و دەپێکن؟؟ هەر ئەوانن نەهی دەکەن لەوەی قسەکانیان وەرگرین ئیللا ئەو قسانە نەبێ لەگەڵ بەڵگەکاندا دەگونجێ، ئەوان نەهیمان لێ دەکەن قسەکانیان وەرگرین ئەگەر لەگەڵ بەڵگەکاندا جیاواز بوو، ئەمە بابەتێکەو پێویستە بیزانین چونکە ئەمڕۆ خەڵکی ئیبتلا بوونە بەو کەسانەی لە خەڵکی تێك دەدەن و شتەکان دەشارنەوە.

جا ئەو قسەیەی: (واعلم أن رسول الله (ﷺ) قال: (ستفترق أمتي على ثلاث وسبعين فرقة كلها في النار إلا واحدة) ئەمە فەرموودەیەکی (صحیح)ە بەکۆی ڕێگاو ڕیوایەتە زۆرەکانی، پێشەوایان تەخریجیان کردوەو ستایشیان کردوە، ئەوەی لەبەر چاومانە پشت ڕاستی دەکاتەوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی پێداوین کەوا ئوممەتی (محمد) (ﷺ) دەبێتە حەفتاو سێ کۆمەڵەوە، ئەمەش بنەمای (اصول)ی کۆمەڵەکانن، چونکە لەو کۆمەڵانە زۆرتر هەن، بەڵام ئەمە بنەماکانیانن هەموویان لەئاگردان، واتە حەفتاو دوو کۆمەڵ دەچنە ئاگرەوە، تەنها یەکێك نەبێ، ئەویش حەفتاو سێیەمین کۆمەڵە، ئەوانیش ئەو کۆمەڵەن لەسەر ئەو بەرنامەیەن پێغەمبەرو (ﷺ) هاوەڵان لەسەری بوون، ئەم کۆمەڵەیە لەئاگر ڕزگاریان دەبێ، بۆیە پێیان دەڵێن: (الفرقة الناجية) هەروەها پێیان دەڵێن: ئەهلی سوننەو جەماعە، جگە لەوان ئەوا بەرهەڵستکارن و هەڕەشەی ئاگریان لێ دراوە، هەیانە دەچنە ئاگرەوە لەبەر کوفرەکەی و هەیانە دەچنە ئاگرەوە لەبەر (فسق)ەکەی و هەیانە دەچنە ئاگرەوە لەبەر سەرپێچی یەکەی

هەموویان وەك یەك نین لە چوونە ناو ئاگرەوە، لەم فەرموودەیە ئەوە وەرناگیرێ کەوا ئەم کۆمەڵانە هەموو کافرن.

مەبەست لە: (وهي الجماعة).

جەماعە: ئەو کەسانەن لە سەر حەقن هەرچەندە تەنها یەك کەسیش بێت ئەمە جەماعەیە، بەڵام زۆری کۆمەڵەکە بەڵگەی ئەوە نییە لەسەر حەقن، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِنْ تُطِعْ أَكْثَرَ مَنْ فِي الْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ) الانعام/١١٦) واتە: ئەگەر لە زۆربەی خەڵکانی ئەم سەر زەوییە، کە بێ باوەڕن پەیڕەوی بکەیت لە ڕێگەی خوا لات ئەدەن و چەواشە و سەر لێشێواوت ئەکەن).

خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَا أَكْثَرُ النَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ (١٠٣)یوسف) واتە: زۆربەی ئەو مەردمە، هەرچەندە تۆ زۆریش سووربیو تێکۆشی بۆ باوەڕ هێنانیان، ئەوان باوەڕ ناهێنن).

خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَا وَجَدْنَا لِأَكْثَرِهِمْ مِنْ عَهْدٍ وَإِنْ وَجَدْنَا أَكْثَرَهُمْ لَفَاسِقِينَ (١٠٢) الاعراف) واتە: خۆ زۆربەی ئەوانەشمان بەوەفادارو بەئەمەك نەدی بێ گومان زۆربەشیانمان بەفاسق و سنور بەزێن دیت).

جا عیبرەت بەزۆری نییە، عیبرەت بەوەیە کەلەسەر حەقن هەرچەندە کەمیش بن، ئەگەر تەنها یەك کەسیش بێت ئەوا جەماعەیە.

مەبەست لە: (قيل: من هم يا رسول الله؟ قال: ما أنا عليه اليوم وأصحابي).

ئەمە ڕێگا ڕاستەکەیە، ئەو کەسەی لەسەر ئەو ڕێگایە بێت پێغەمبەرو هاوەڵانی لەسەر بوون، هەر ئەوەش جەماعەیە.

**﴿٩٤﴾ نوسەر دەڵێت: (هكذا كان الدين إلى خلافة عمر بن الخطاب الجماعة كلها وهكذا في زمن عثمان فلما قتل عثمان رضي الله عنه جاء الاختلاف والبدع وصار الناس أحزابا وصاروا فرقاً فمن الناس من ثبت على الحق عند أول التغيير وقال به وعمل به ودعا الناس إليه).**

واتە: ئا دینەکە بەم شێوەیە بوو، تاکو خیلافەتی عومەری کوری خەتتاب هەمووی جەماعەیە هەر بەم شێوەیە بوو لە سەردەمی عوسماندا، کاتێ عوسمان کوژرا چیتر جیاوازی و بیدعە هاتە کایەوە و خەڵکی بوونە چەند حیزبو گروپێکەوە، جا لەخەڵکیدا هەبوون دامەزراو بوو لەسەر حەق هەر لە یەکەم گۆڕانکارییەوە، بەو قسەوە قسەی دەکردو کاری پێ دەکرد و خەڵکی بۆ بانگ دەکرد.

راڤە/

**مەبەست لە:** (هكذا كان الدين إلى خلافة عمر بن الخطاب الجماعة كلها وهكذا في زمن عثمان).

لەسەردەمی هاوەڵان و شوێنکەوتواندا بەرهەڵستکاران خۆیان شاردبووەو تێکەڵی خەڵکی بوون وەکو قەدەرێکان و جگە لەوان لەبەر هێزو دەسەلاتی ئیسلام و موسڵمانان، تاکو ئەو کاتەی جولەکە کابرایەکی جولەکەیان لەیەمەنەوە تێکەڵ بەموسڵمانان کرد پێیان دەگوت: (ابن السوداء عبدالله بن سبأ اليهودی) ئەویش هات بۆ مەدینەو ئیسلام بوونی خۆی ڕاگەیاند لەسەردەمی خیلافەتی عوسماندا، دەستی کرد بەجوێندان بە عوسمان لەمەجلیسەکاندا، چونکە ئەو لەبەر هەڵخەڵەتاندنی خەڵکی بانگەشەی ئیسلامی دەکرد، ئەمجار ژەهرەکەی خۆی ڕژاندە نێو خەڵکی لەمەجلیسەکاندا و خەڵکی نەفام ئامادەی دەبوون و خەڵکی خراپو نەفام ئامادەی دەبوون، هەندێ لەخەڵکی یان زۆرێك لەخەڵکی حەز لە جوێندانو وتی دەکەن،

بۆیە لای ئەو کۆبوونەوە، کاتێ لێی بەئاگا هاتن لەمەدینە دەرکرا ئەویش ڕۆیشت بۆ میسر، لە میسر گوندێکی دۆزییەوە بە دووبەرەکی ناوبانگی دەرکردبوو ئەویش لەوێ نوقم بوو، لەوێ ژەهرەکەی خۆی بڵاو کردەوەو جوێنی بەعوسمان دەدا، ئەمجار لەکۆتاییدا لەوان گروپێکی چەتەی لێ دروست کردوون پڕچەك و هێزدار بوون، هاتن بۆ لای عوسمان و بەرهەڵستیان لێ دەکردو هەڵەیان لێ دەگرت، جا عوسمان وەڵامی ئەوانی دەدایەوەو گومانەکانیانی لەناو برد، ئەمجار گەڕانەوە، ئەمجار لەڕێگا لۆمەی یەکتریان دەکردو گوتیان: ئێمە هیچ شتێکمان نەکرد، ئەمجار گەڕانەوە بۆلای عوسمانوماڵەکەیان ئابڵوقەدا، هاوەڵان ویستیان بەرگری لەخەلیفە بکەن بەڵام عوسمان نەهی لێ کردن لەترسی فیتنەو لەترسی خوێنڕشتن، نەهی لێ کردن بەهیوای ئەوەی مەسەلەکە هێشتا گفتوگۆو گەڕانەوەی تێدایە، ویستی قەناعەت بەوان بکات بەڵام ئەوان کاتێ بینیان هیچ شتێکیان لەڕێگەی بەڵگەوە دەست نەکەوت ئەوا بەشەو هەڵیان کوتایە سەرو کوشتیان لەکاتێکدا خەڵکی خەوتوە، کاتێ بینیان بەڵگەکانیان پووچەو وەرنەگیراوە، سوودیان لە ئەو هەلە وەرگرت، لەکاتێکدا زۆربەی خەڵکی لەحەج بوون و خەڵکی لە مەدینەدا خەوتوون و ئارامن، چونکە باوەڕیان وابوو مەسەلەکە هێشتا گفتوگۆو گەڕانەوەی تێدایە، بەشەو هەڵیان کوتایە سەری _خوای گەورە روویان ناشرین کات_ لەماڵەکەی خۆیدا و شەهیدیان کرد، لەکاتێکدا ئەو قورئانی دەخوێندو (مصحف)ی پێ بوو تاکو خوێنەکە ڕژایە سەر (مصحف)ەکە، چیتر ئەو کاتە فیتنە ڕوویدا، ئەو کابرا چەپەڵەی دەیگوت خیلافەت هی (عەلی)یەو بۆ ئەبوبکرو عومەرو عوسمان نییە،بەڵکو تەنها هی (عەلی)یە، چونکە (عەلی) تەنها وەصی پێغەمبەری خوایەو (ﷺ) ئەوانە ستەمیان لە خیلافەت کردووەو بەزۆر لە (عەلی)یان زەوت کردوە لەوە سەر سوڕهێنەرتر ئەوەیە عەلی خۆی بانگەشەی ئەوەی نەکردوەو وای نەگوتوەو داوای خیلافەتیشی نەکردوەو نەیفەرموو من لەوان شایستە ترم، بەڵکو ئەو بەیعەی بە هەرسێ برا خەلیفەکەی داو گوێڕایەڵ و گوێبیستی ئەوان بوو، بەهۆی

ئەوەوە فیتنە لە نێوان موسڵمانانداا پەیدابوو، کوشتار لەنێوان موسڵماندا دەستی پێکرد بەهۆی ئەم کابرا پیسو چەپەڵەوە کە دزەی کردبوە نێو ڕیزەکانی موسڵمانانەوە بەڵام خوای گەورە هەوڵەکانی شکاندو سەرشۆڕ بوو، ڕاستە بەلایەك تووشی موسڵمانان بوو چەندین کەس کوژرا، بەڵام نەیتوانی هیچ بە ئیسلام بکات، ئیسلام -سوپاس بۆ خوا - بەسەر بەرزی مایەوەو هیچی تووش نەبوو، نە ئەو و نە جوولەکە هیچیان دەست نەکەوت لەم دینە سوپاس بۆ خوا، بەڵێ هاوەڵان تووشی هەندێ موصیبەتو فیتنەو کوشتن بوون بەڵام ئەوە لەپێناوی خودایەو خوا لێیان ڕازی بێت، ئەو کابرا چەپەڵە هیچی دەست نەکەوت، سوپاس بۆ خوا.

ئەمە پوختەی کێشەی فیتنەی کوشتنی عوسمانە، ئەمەش بەڵگەیە کەوا دروست نییە دەرچیت لەدژی کار بەدەستان، دەرچوون لەدژی دەبێتە هۆی خراپە لەناو ئەم ئوممەتەداو دەبێتە هۆی خوێن ڕشتن، خەڵکی لەو کاتەوە بەردەوام لەفیتنەدان، ئێوەیش باش ئەوانە دەناسن کەوا بانگەشەی فیتنە دەکەن، ئەوانەی بانگەواز بۆ فیتنەو دەرچوون لەسەر کار بەدەستان دەکەن بە بیانووی ئینکارکردن لە (منکر)، بۆیە گرووپی (المعتزله)و (الخوارج) دەرچوون، هەموویان لەو مەسەلەیەدا بەردەوامن تاکو ئێستا هەن.

مەبەست لە: (فلما قتل عثمان جاء الاختلاف والبدع).

دەبێ ئاگاداری ئەو کەسانە بین بانگەواز بۆ گومڕایی دەکەن و نەرم و نیان نەبین لەگەڵیاندا، دروست نییە قسە بەکار بەدەستان بکرێت، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئامۆژگاری کردین بەگوێبیستیو گوێڕایەڵیو دەرنەچوون لەسەر کاربەدەستان هەرچەندە ستەمیش بکەنو (فسق)بکەن بەمەرجێ نەگاتە ئەوەی کوفری ئاشکرا بکەن، ئا بەم شێوەیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئامۆژگاری کردووین.

**مەبەست لە:** (وصار الناس فرقاً فمن الناس من ثبت على الحق عند أول التغيير وقال به وعمل به ودعا الناس إليه).

**کاتێ کۆمەڵەکانو دووبەرەکی پەیدا بوون خوای گەورە ئەهلی حەق و سوننەی دامەزراو کرد، لە سەر بەرنامەکەی پێغەمبەرو (ﷺ) هاوەڵان ڕۆیشتن، بەڵام گرووپەکانی تر جیاوازبوونو لەسەر ئەو بەرنامەیە لایاندا پێغەمبەرو هاوەڵان لەسەری بوون، بۆیە شایەنی هەڕەشەکردن بوون بە ئاگر، بە هۆی ئەو کارانەی لەوانەوە ئەنجام درا.**

**نوسەر دەڵێت:** (فكان الأمر مستقيما حتى كانت الطبقة الرابعة في خلافة بني فلان انقلب الزمان وتغير الناس جدا وفشت البدع وكثر الدعاة إلى غير سبيل الحق والجماعة ووقعت المحنة في كل شيء لم يتكلم به رسول الله (ﷺ) ولا أحد من الصحابة).

**واتە: کارەکە بە ڕاستیو ڕێكو پێکی دەڕۆیشت تاکو چینی چوارەم پەیدا بوو لەخیلافەتی بەنی فلان و زەمانە هەڵگەڕایەوە و خەڵکی زۆر گۆڕان، بیدعە بڵاوبوەوە، بانگەوازکاران بۆ ڕێگەی جگە لەحەق و جەماعە زۆر بوون، لەهەموو شتێکدا تاقیکردنەوە ڕوویدا کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) قسەی تێدا نەکردبوو هەروەها یەکێ لەهاوەڵان قسەیان تێدا نەکردبوو.**

**ڕاڤە:**

**مەبەست لە:** (فكان الأمر مستقيما حتى كانت الطبقة الرابعة في خلافة بني فلان انقلب الزمان وتغير الناس جدا وفشت البدع).

**دووبەرەکی و جیاوازی زۆرتربوو لەگەڵیدا فیتنە زۆرتربوو لەپاش تێپەڕبوونی سێ سەدە چاکەکە تاکو سەردەمی عەبباسییەکان هات و مەئمونی عەبباسی تێدا هەڵکەوتوو لەپاش ئەو (معتصم) و (واثق) هات و شوێنی قسەی (الجهمیە) کەوتن،**

ویستیان ئەهلی سوننە ناچار بکەن لەسەری ئەویش بە وتنی (دروستکردنی قورئان) هەندێ لە پێشەوایانیان کوشت و ئازاری هەندێکی تریاندا، بەلام حەق سابت و جێگیرەو سوپاس بۆ خوا.

مەبەست لە: (وكثر الدعاة إلى غير سبيل الحق والجماعة).

زۆرێك هەن ئێستا دەڵێن: ئەوان بانگەوازکارن، کۆمەڵ و گروپ پێك دەهێنن لەژێر ئەو پەردەیەدا، لەکاتێکدا ئەوان دەیانەوێ خەڵکی بانگ بکەن بۆ گومڕایی ئیللا ئەوانە نەبێ خوا ڕەحمی پێ کردوون و دامەزراو بوون لەسەر بانگەوازکردن لەسەر قورئان و سوننەت و بەرنامەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە بانگەوازەکەیدا کە هەر ئەوەش حەقە، هەر ئەوەش بانگەوازی حەقە، هەر شتێك پێی بڵێن بانگەواز مەرج نییە ڕاست بێت تاکو تەماشای بەرنامەکەی نەکرێت لە سەری دەڕوات، جا ئەگەر هاتوو لەسەر ئەو بەرنامەیە ڕۆیشت پێغەمبەرو هاوەڵانی لەسەر بوون ئەوا ئەو بانگەوازکارە بۆ حەق، بەلام ئەگەر هاتوو جیاواز بوو لەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەری بوە لە بەرنامەی کارکردن و بانگەوازیدا ئەوە لەسەر (باطل)ە و کەس پێی هەڵنەخەڵەتی بەوەی دەڵێت: ئەو لە بانگەوازکارانە، چونکە ئاشکرایە بانگەوازکارانی وا هەن لەسەر دەرگای جەهەننەمن هەر کەسێ گوێڕایەڵییان بکات ئەوە فڕێی دەدەنە ئاگرەکەوە هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی کردوە[٢٢٣]، بۆیە دانەر دەڵێت: (وكثر الدعاة إلى غير سبيل الحق والجماعة) هەروەکو ئێستا ڕوویداوەو هەیە، زۆرن ئەوانەی بانگەشەی ئەوە دەکەن بانگەواز بۆ ئیسلام دەکەن لەژێر ئەم پەردەیەدا، ئەگەر تەماشای بەرنامەو هەڵسوکەوتیان بکرێت دەبینرێت بەتەواوی لەگەڵ ئیسلامدا جیاوازە.

---

٢٢٣ / رواه البخاري (٣٤١١) ومسلم (١٨٤٧) .

**مەبەست لە:** (ووقعت المحنة في كل شيء لم يتكلم به رسول الله (ﷺ) ولا أحد من الصحابة).

**قسەكردن و جیاوازی و وتی وتی و بانگەشەی عیلم زۆر بوون بەڵام هەموو ئەوانە نامێنن و لەناو دەچن تەنها ئەوە دەمێنێتەوە كە قورئان و سوننەت دەلالەتی بۆ كردوە هەر ئەوەشە بەرنامەی تەواوو ڕێگای ڕاستە، بەڵام ئەمە پێویستی بەدوو كارە:_**

**یەكەم: زانستێكی سوودبەخش:**

**لە ڕێگایەوە ئەو بەرنامەیە دەزانی كە پێغەمبەرو هاوەڵانو شوێنكەوتوانی لەسەر بوون.**

**دووەم: ئارامگرتنو دامەزراوی:**

**لە گەڵ فیتنەكاندا لانەدات یان لەگەڵ بانگەوازكارانی گومڕاییدا، بەڵكو دەبێت دامەزراو بێت، ئارام بگریت لەسەر ئەوەی تووشت دەبێ لە لۆمەكردنو گلەییو هەڕەشە چونكە تۆ لەسەر حەقی بۆیە دەبێ ئارام بگری،** (وَاصْبِرْ عَلَى مَا أَصَابَكَ إِنَّ ذَلِكَ مِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ (١٧) لقمان) **واتە: لەسەر هەر ئەو بەڵاو نەهامەتییەی تووشت دەبێ خۆڕاگربە بێ گومان ئەو كارانە لەو كارە پەسەندو گرنگانەیە خوا دەیەوێن).**

**نوسەر دەڵێت:** (ودعوا إلى الفرقة وقد نهى الله عز و جل عن الفرقة وكفر بعضهم بعضا وكل دعا إلى رأيه وإلى تكفير من خالفه فضل الجهال والرعاع ومن لا علم له وأطمعوا الناس في شيء من أمر الدنيا وخوفوهم عقاب الدنيا فاتبعهم الخلق على خوف في دينهم ورغبة في دنياهم).

**واتە:**

**بانگەوازیان كرد بۆ جیاوازی و دووبەرەكی لەكاتێكدا خوای گەورە نەهی لەدووبەرەكی كردوە، هەندێكیان ئەوانیتری كافر كرد و هەریەكەو بانگەشەی بۆ بۆچوونی خۆی دەكات و بۆ بەكافر زانینی ئەوانەی ناكۆكن لەگەڵیاندا، بۆیە نەفامان و**

خەڵکی عەوامو ئەوانەی عیلمیان نییە گومڕا بوون، تەماحیان دا بەخەڵکی بە شتی دونیا، بەسزای دونیا ئەوانیان ترساند، بۆیە خەڵکی شوێنی ئەوان کەوتن لەترسی دینەکەیان و بەتەماحی ئەوەی لەدونیاکەیاندا هەیە).

ڕاڤە/

مەبەست لە: (ودعوا إلى الفرقة وقد نهى الله عز و جل عن الفرقة).

خوای گەورە نەهی کردوە لە دووبەرەکی و فەرموویەتی: (وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ تَفَرَّقُوا وَاخْتَلَفُوا مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْبَيِّنَاتُ (١٠٥) آل عمران) واتە: ئێوە وەکو ئەو جوولەکەو گاورانە مەبن، کە دوای چەندین بەڵگەو نیشانەی ڕوون بۆیان هات، پەرت بوون و دوو بەرەکییان تێ کەوت دژی یەکدی وەستان).

هەروەها دەفەرموێت: (وَمَا تَفَرَّقَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ إِلَّا مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَتْهُمُ الْبَيِّنَةُ (٤) البينة) واتە: خاوەن نامەکان لەپێغەمبەرێتی (موحەممەد) (ﷺ) جیاوازیان تێ نەکەوتو دەستە دەستە نەبوون، دوای ئەوە نەبێ کە بەڵگەی ڕوونیان بۆ هات دەربارەی پێغەمبەر (ﷺ)).

ئەوان جیاوازی و ناکۆك بوون نەك لەسەر نەفامیو جەهل بەڵکو لە عیلمەوە.

مەبەست لە: (وكفر بعضهم بعضا).

گرووپەکان وایان لێ هات هەندێکیان ئەوانی تر بەکافر بزانن، ئەمە ئاکارێکی ئاشکرای ئەوانە، ئەمەش بەڵگەیە هەر هەموویان لەسەر (باطل)ن، بەڵام ئەهلی حەق و ئەهلی سوننە هەندێکیان ئەوانیتر بەکافر نازانن، بەڵکو هەندێکیان پشتیوانی ئەوانیتر دەکەن، هەندێکیان ئەوانیتریان خۆشدەوێو ئامۆژگاری یەکتر دەکەن، هەروەها گرووپو کۆمەڵەکانی تر بەکافر نازانن ئیللا ئەوانە نەبێ بەڵگە هەیە لە قورئان و

سوننەتدا بۆ کافر کردنی ئەوان، ئەگەر نا ئەوان ناوەندن لەمەسەلەی بەکافر دانانـدا، هـیچ کەسـێك بـەکافر نـازانن ئـیللا ئەوانـە نـەبێ بەڵگـە هەیـە لەسـەر کـافربوونی، لـەم مەسەلەیەدا پەلە ناکەن.

مەبەست لە: (وكل دعا إلى رأيه وإلى تكفير من خالفه).

ئەمە سیفەتو ئاکاری ئەهلی گومڕاییە، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: (فَتَقَطَّعُوا أَمْرَهُمْ بَيْنَهُمْ زُبُرًا كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ (٥٣) المؤمنون) واتـە: لـەناو خۆیانـدا کـارو فـەرمانی ئایینەکەیان پچڕ پچڕ کردو بوونە چەند گرووپ و دەستەیەکەوە، هەر گرووپـەش ڕێگـاو ڕێبازێکی بۆخۆی هەڵبژارد! هەموو دەستەو گرووپێك بەو بەرنامەیەی لایانە خۆشحاڵو دڵخۆشن).

(زُبُرا) واتـە: (کُتبـاً) کتێـب دادەنـێنو دەینوسـن ئەمەشـە واقیعـە، چـەندین کتێـب دەنووسن و دادەنەن لەپێناوی سەرخستنی مەزهـەب و حیزبەکـەیان، خۆشـحاڵ دەبـن بەوەی لەسەرین، ئەوان ئەگەر لەسەر نـەفامی بـن ئـەوا تکـا دەکـرێ بگەڕێنـەوە بـەڵام خۆشحاڵن بەوەی کە لە سەرین لە (باطل) و وایدەزانن و باوەڕیان وایە حەقـە، ئەمـەش سزای خوایە لەسەریان.

مەبەست لە: (فضل الجهال والرعاع ومن لا علم له).

نەفامان و خەڵکی عەوامو ئەوانەی عیلمیان نییە گومڕا بوون، بـەڵام ئـەهلی حـەق و ئەهلی عیلم ئەوا هیچ کاریگەر نابن بەو کۆمەڵانەو ئەو گومڕایانە، چونکە دەزانن ئەوانـە (باطل)ە.

مەبەست لە: (وأطمعوا الناس في شيء من أمر الدنيا وخوفوهم عقاب الدنيا).

هـەروەها لـەهۆکارەکانی فیتنەکـەیان ئەوەیـە ئـەوان بەشـوێنکەوتووانیان شـتێك لەتەماح دەبەخشن.

**مەبەست لە:** (فاتبعهم الخلق على خوف في دينهم ورغبة في دنياهم).

**زۆرێـك لەخـەڵكی دونیایـان خـۆش دەوێ بۆیـە شـوێنی ئەوانـە دەكـەون شـتێكی لەسامانیان پێ بدات هەرچەندە لەسەر (باطل)بن بەتەماحی سەروەت و سامانەوە.**

**نوسـەر دەڵێـت:** (فصارت السنة وأهل السنة مكتومين وظهرت البدعة وفشت وكفروا من حيث لا يعلمون من وجوه شتى ووضعوا القياس وحملوا قدرة الرب وآياته وأحكامه وأمره ونهيه على عقولهم وآرائهم فما وافق عقولهم قبلوه وما خالف عقولهم ردوه فصار الإسلام غريبا والسنة غريبة وأهل السنة غرباء في جوف ديارهم).

**واتە: جا سوننەت و ئەهلی سوننە شـاراوەبوون و بیدعـە دەركـەوتو بـڵاو بـووەوە، بەشـێوەیەك نـازانن لەچـەند ڕوویەكـەوە كوفریـان كـردو قیاسـیان دانـا، توانـای پەروەردگارو ئایەتەكانی و ئەحكامەكانی و فەرمانەكانی و نەهییەكانی بـەپێی عـەقڵ و بۆچوونی خۆیان لەیـەك دەدایـەوە، جـا ئـەوەی لەگـەڵ عـەقڵی ئەوانـدا دەگونجـا ئـەوا وەریان دەگرتو ئەوەی لەگەڵ عـەقڵیان نـەدەگونجا ڕەدیـان دەكـردەوە بۆیـە ئیـسلام نامۆ بوو، سوونەتیش نامۆ بوو، ئەهلی سوننە لەماڵی خۆیاندا نامۆ بوون.**

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (فصارت السنة وأهل السنة مكتومين وظهرت البدعة وفشت).

**لەپاش ئەوەی ئەهلی سوننە ئاشـكراو دیـاربوون لەسـێ سـەدە چـاكەكەدا و ئـەهلی خراپە كپكراو و بێدەنگكراو بوون بەڵام كارەكە هەڵگەڕایەوە، ئـەهلی سـوننە كپكـراو و بێدەنگكرانو ئەهلی (باطل) دەركەوتن، بـەڵام ئەمـەش بـەردەوام نـابێ، ئەگـەر ئـەهلی (باطل) لەماوەیەكدا دەركەوتن ئەوا لەئاینـدەدا دەشـكێن و نـامێنن، هـەردەمو هـەرگیز دوا ڕۆژیش بۆ لە خواترسانە.**

پێشەوا (ابن القيم) دەفەرموێ:

والحق منصور وممتحن فلا          تعجب فهذي سنة الرحمن[٢٢٤]

مەبەست لە: (ووضعوا القياس).

**(قياس) واتە لە عەقیدەدا، چونکە عەقیدە قیاسی تێدا نییە، چونکە عەقیدە (تەوفیقی)یە کار ناکرێت ئیللا بەوە نەبێ بەڵگەی لەسەر هەبێ، لەبیر و باوەڕەکاندا قیاس نییە بەڵکو (قیاس) لەبواری فیقهدا هەیە.**

مەبەست لە: (وحملوا قدرة الرب وآياته وأحكامه وأمره ونهيه على عقولهم وآرائهم).

**ئەمە (قیاس)ێکی (باطل)ـە، (قیاس) لەحەقی خوای گەورەدا، ئەوەی بەعەقڵ و بۆچوونی خۆیان ناگونجێ ئەوا بەقیاسی عەقڵی خۆیان قسەی خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ڕەد دەکەنەوە.**

مەبەست لە: (فما وافق عقولهم قبلوه وما خالف عقولهم ردوه).

**ئەوان عەقڵ و بۆچوونی خۆیان دەکەن بە داوەرو حاکم، ئەوەی لەگەڵیدا نەگونجێ ڕەددی دەکەنەوە یان بەتەئویل یان بە ڕازینەبوون و وەرنەگرتن.**

مەبەست لە: (فصار الإسلام غريبا والسنة غريبة وأهل السنة غرباء في جوف ديارهم).

**هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:** (بدأ الاسلام غريبا وسيعود غريبا كما بدأ فطوبى للغرباء)[٢٢٥] قالوا: من الغرباء يا رسول الله؟ قال: (الذين يصلحون إذا فسد الناس)[٢٢٦] وفي رواية: (يصلحون ما أفسد الناس)[٢٢٧] **واتە: ئیسلام بە نامۆیی دەستی**

---

٢٢٤ / الكافية الشافية (١/١٢٤ — مع شرح ابن عيسى ) .

٢٢٥ / رواه مسلم (١٤٥، ١٤٦) .

٢٢٦ / رواه الطبراني .

٢٢٧ / رواه الترمذي والطبراني .

پێکردو جارێکی تر بە نامۆیی دەگەڕێتەوە هەروەکو چۆن دەستی پێکرد، بۆیە مـوژدە بۆ نامۆکان، وتیان: ئایە نامۆکان کێن ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ فەرمووی: ئەوانەی چاکسازی دەکەن ئەگەر خەڵکی خراپ بوون) وە لە ریوایەتێکی تردا هاتوە: چاکسازی دەکەن ئەوەی خەڵکی خراپی کردوە).

خۆیان چاکسازی دەکەنـەوەو ئەوەشـی خـەڵکی خراپـی کـردوە چـاکی دەکەنـەوە، ئەوانە نامۆن.

بۆ پێیان دەگوترێ: (نامۆکان)؟

چونکە ئەوانەی ناکۆکن لەگەڵیاندا زۆرن، ئەوانەی ئینکارییـان لێ دەکـەن زۆرن، جـا ئەوان نامۆن لە نێو هاوەڵان و هاوسەردەمی خۆیاندا.

**﴿٩٥﴾ نوسەر دەڵێت: (واعلم أن المتعة -متعة النساء- والاستحلال حرام إلى يوم القيامة).**

واتە: بزانە سیخەو حەڵاڵکردنی دامێنەکان حەرامن تاکو ڕۆژی قیامەت.

ڕاڤە:

ئەمە مەسەلەیەکی فیقهییە بەڵام لێرەدا هێنای، چونکە پەیوەندی بەعەقیدەوە هەیە، لەبەر ئەوەی سیخە (متعە) حەڵاڵکردنی شتێکە خوای گەورە حەرامی کردوە.

سیخە (متعە): مانای ئەوەیە کەسێك ئافرەتێك مارە بکات بۆ ماوەیەکی دیاری کراو چ کورت بێت ماوەکە یان درێژ، لەپاش ئەوە ئەو هاوسەرگیرییە تەواو دەبێ لەخۆوە و پێویستی بەتەڵاق نییە.

لەسەرەتای ئیسلامدا سیخە (متعە) دروست بوو، ئەمجار پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەغەزای خەیبەردا حەرامی کرد[٢٢٨]، ئەمجار لەڕۆژی ڕزگارکردنی مەککە حەڵاڵی کرد، ئەمجار بۆ تاهەتایی حەرامی کرد[٢٢٩]، جا ئەو لەسەرەتادا حەڵاڵ بوو ئەمجار حەرام کرا ئەمجار حەڵاڵ کرا ئەمجار بۆ هەتاهەتایی حەرام کراو موسڵمانان ئیجماعیان لەسەر ئەوەیە حەرامە و هاوسەرگیرییەکی (باطل)ە، ئیجماعی ئەم ئوممەتە لەسەر حەرامبوونین، هیچ کەسێك لەگەڵیاندا ناکۆك نییە تەنها شیعەی جەعفەری (رافضی) نەبێ، ئەوان لەوەدا ناکۆکن، ناکۆکی ئەوان هیچ عیبرەتێکی تێدا نییەو هیچ بەهایەکی نییە جا ئیجماع و دەق لەسەر حەرامبوونی (متعە)یە و هاوسەرگیرییەکی (باطل)ەو حوکمی زینای هەیە.

مەبەست لە: (المتعة - متعة النساء -).

---

٢٢٨ / رواه البخاري (٤٨٢٥) ومسلم (١٤٠٧) .

٢٢٩ / رواه مسلم (١٤٠٦) .

مەبەست ئەوەیە (متعە)ی حەج ناگرێتەوە کەوا کەسێك (تمتع) بکات بە(عومرە) بۆ (حەج) ئەمە مەبەستی نییە، چونکە ئەو(تمتع)ـە ڕای جمهوری زانایانی لەسەرە، هیچ کەسێك ناکۆك نییە لەگەڵیاندا ئیللا ژمارەیەکی کەم نەبێ، بەڵام (متعة النساء) ئەوا حەرامە بە ئیجماع و هیچ کەسێك ناکۆك نییە بایەخ بە ناکۆکییەکەی بدرێ، (متعە) لەحەجدا مەسەلەیەکی فیقهییە، بەڵام (متعە) لەهاوسەرگیریدا مەسەلەیەکە پەیوەندی بە عەقیدەوە هەیە چونکە حەڵاڵ کردنی شتێکە خوا حەرامی کردووە.

**﴿٩٦﴾ نوسەر دەڵێت: (واعرف لبني هاشم فضلهم لقرابتهم من رسول الله (ﷺ) واعرف فضل قريش والعرب وجميع الأفخاذ فاعرف قدرهم وحقوقهم في الإسلام ومولى القوم منهم، وتعرف لسائر الناس حقهم في الاسلام).**

واتە: فەزڵی (بەنی هاشم) بزانە، لەبەر نزیکیان لەپێغەمبەری خوداوە (ﷺ) و فەزڵی قورەیش و عەرەب و هەموو تیرەکان بزانە، جا قەدرو مافیان بزانە لە ئیسلامدا و مەولای هەر قەومێك هەر لە خۆیانەو حەقی هەموو خەڵکی بزانە لە ئیسلامدا.

ڕاڤە/

(بەنی هاشم) نەوەی (هاشم ی کوڕی عبد مناف)ن، چونکە (عبد مناف) چەند کوڕێکی هەبووە ئەوانیش:-

(هاشم) باپیری پێغەمبەرە (ﷺ).

(عبد شمس) باپیری عوسمانی کوڕی عەففانە.

(نوفل بن عبد مناف) باپیری (حکیم کوڕی حزام).

(المطلب بن عبد مناف) باپیری (بنی المطلب) ئەوانە کوڕی (عبد مناف)ن. پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە نەوەی (هاشم بن عبد مناف) ڕەوانە کرا، کەواتە ئەو (هاشمی قریشی)یەو فەرموویەتی: (إن الله اصطفى كنانة من ولد إسماعيل، واصطفى من كنانة قريشاً واصطفى من قريش بني هاشم، واصطفاني من بني هاشم)[٢٣٠].

جا ئەوانە نزیکەکانی پێغەمبەری خوان (ﷺ) لەئیمانداران لە نەوەی هاشم، ئەوانە نزیکەکانن کەحەقیان لەسەر موسڵمانان هەیە، (صدقە)یان بۆ حەرامە و دیارییان بۆ

---

٢٣٠ / أخرجه مسلم (٢٢٧٦) .

حەڵاڵە، بەڵام جگە لەئیمانداران هیچ بەهایەکیان نییە هەرچەندە لە (بەنی هاشم) بن، بەڵام ئەگەر نزیکی لە پێغەمبەرەوەو (ﷺ) ئیمان کۆبووەوە ئەوا گومانی تێدا نییە لەخەڵکی تر جیاوازن، حەقی ڕێزو حورمەت و پێش خستنیان هەیە، چونکە ئەمە بەشێکە لەڕێزگرتن لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، بەڵام ئەگەر ئیماندار نەبوون ئەوا ئەوپەڕەکەی ئەوەیە لە بەنی (هاشم)ن و ئەوان کافرن، بۆیە هیچ ڕێزیان نییە، هەروەها هەر کەسێ لە نەوەی هاشم بێت بەڵام لەسەر مەزهەبی ئەهلی سوننەو جەماعەو سەقامگیر نەبێ ئەوا بایەخی نییە، جا تەنها نزیکی لەپێغەمبەری خوداوە (ﷺ) بەڵگەی ئەوە نییە لە سەر حەقن، بەڵکو نزیکی لەگەڵ ئیماندایە، خوای گەورە دەفەرموێت: (قُلْ لَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلَّا الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَى) الشورى/٢٣) واتە: بەوانە بڵێ: _کە وەڵامت نادەنەوە_ من لەسەر گەیاندنی پەیامەکەی خوا، هیچ کرێ و مزەیەکم لەئێوە ناوێت، ئەوە نەبێت کە ئێوە لەبەرخوا مافی خزمایەتی بپارێزن و وازم لێ بێنن با پەیامەکەم بگەیەنم).

واتە: نزیکەکانی پێغەمبەر (ﷺ) _لەسەر یەکێ لە ڕاکان_خوای گەورە بەشی ئەوانی داناوە لە (خُمس)دا، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى) الانفال/٤١) واتە: دەبێ بزانن ئەی بڕواداران! کەهەر جۆرە دەستکەوت و غەنیمەتێکتان دەسکەوت دەبێ یەك لەسەر پێنجی بۆخواو بۆ پەیامبەرو خزمانی..... بێت) نزیکەکانی پێغەمبەر (ﷺ).

مەبەست لە: (وأعرف فضل قريش والعرب).

ئەمجار لەپاش بەنی هاشم، فەزڵی موسڵمانانی قورەیش، چونکە قورەیش فەزڵیان هەیە بەسەر ئەودوای عەرەبدا، ئەمجار عەرەب فەزڵیان هەیە بەسەر عەجەمدا، بۆ؟ چونکە خوای گەورە قورئانی بەزمانی ئەوان دابەزاندوەو پێغەمبەری خوای (ﷺ) لە

نێو ئەواندا رەوانە کردو ئەوانی هەڵبژارد بۆ گەیاندنی پەیامەکەی بۆیە خوای گەورە لەقورئاندا دەفەرموێ: (فَاسْتَمْسِكْ بِالَّذِي أُوحِيَ إِلَيْكَ إِنَّكَ عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ (٤٣) وَإِنَّهُ لَذِكْرٌ لَكَ وَلِقَوْمِكَ وَسَوْفَ تُسْأَلُونَ (٤٤) الزخرف) واتە: کەوابوو دەست بگرە بەو قورئانەی وەحی کراوە بۆت ئەی مەحەممەد چونکە تۆ لەسەر ڕێگەو ڕێبازێکی ڕاستی(٤٣) بێ گومان ئەم قورئانە شەرەفو ناوو شۆرەتێکی گەورەیە بۆ خۆتو هۆزەکەت و لەئایندەشدا پرسیارتان دەربارەی قورئان لێ ئەکرێ (٤٤).

واتە: ئەم قەرئانە شەرەفێکە بۆ تۆ، ﴿وَلِقَوْمِكَ﴾ واتە: عەرەب، ﴿وَسَوْفَ تُسْأَلُونَ﴾ چونکە پرسیارتان لێ دەکرێ دەربارەی هەستان بەم قورئانەو بانگەوازکردن بۆیو گەیاندنی چونکە خوای گەورە کردوویەتییە ئەستۆی ئێوە بۆ ئەوەی بیگەیەننە ئەو دوای جیهان ئەمە هۆی فەزڵی عەرەبە، ئەوان فەزڵیان نەدراوە بەسەر خەڵکیدا چونکە تەنها عەرەبن، بەڵکو فەزڵیان دراوە بەوەی کە خوای گەورە تایبەتیانی کردووە بە قورئان و سوننەت و ڕەوانەکردنی پێغەمبەرو ئەوان هەڵدەستن بەگەیاندنی ئەم دینە، خوای گەورە دەفەرموێت: (كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ (١١٠) آل عمران) واتە: ئێوە چاکترین ئوممەت و کۆمەڵن، هێنراونەتە ئەم سەر زەوییە بۆ کەڵك گەیاندن بە مەردم و ڕێنمایی کردونیان، بۆیە فەرمان بە چاکە دەدەنو ڕێ لە کاری خراپەو شیرك دەگرنو باوەڕیشتان بە خوا هەیە).

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: (وَلْتَكُنْ مِنْكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (١٠٤) ال عمران) واتە: پێویستە هەمیشە کۆمەڵ و دەستەیەك لەئێوە ببێت ئەی موسڵمانان! مەردم بۆ ڕێی خێرو چاکە بانگ بکەنو فەرمان بەچاکە بدەن و ڕێ لەخراپە بگرن دیارە ئەوانەن سەرفرازو بەختیار).

ئەمـە هـۆی تایبەتمەنـدی عەرەبـە، بەمـەرجێ ئەگـەر دەست بـەم دینـەوە بگـرن و بیگەیەنن ئەوا فەزڵیان دەبوو بەسەر جگە لەخۆیان بـەڵام ئەگـەر کەسـێك دەسـت بـەم دینەوە نـەگرێ ئـەوا فـەزڵی نییـە چـونکە خـوای گـەورە دەفـەرموێ: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ (١٣)الحجرات) واتە: ئەی خەڵکینە! بێ گومان ئێوەمان لە پیاوو ژنێك دروست کردووە —واتە: ئادەمو حەوا— کردوومانن بە چەند گەلو تیرەیەك تا یـەکتری بناسـن، نـەك بـۆ گاڵتــە کــردنو تانــەو تەشــەرەدان لەیــەکترو ســتەم لــە یــەکتر کــردن، بــێ گومــان بەڕێزتریشتان لای خوا، ئەوەتانە کە بە تەقواترو خۆ پارێزتر بێـت و لـە سـنوورەکانی خوا نەترازێت).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفـەرموێ: (لافضل لعربي على عجمي ولا لأبيض على أسود إلا بالتقوى، كلكم لآدم وآدم من تراب).

ئەمــە هــۆی فــەزڵی عەرەبــە ئەگــەر هەســتان بــەوەی خــوای گــەورە خــستویەتییە ئەستۆیان لە بڵاوکردنەوەی ئەم دینەو بانگەواز کردن بۆیەو ڕوونکردنەوەی بۆ خـەڵکی، جا ئەوان باشترن لەجگە لەوان.

مەبەست لە: (وجميع الافخاذ).

(فخذ) تیرەیەکـە لـە هۆزێـك، سـەرەتا هـۆز دێـت ئـەمجار تـیرە (افخاذ) جـا ئـەوە تیرەیەکە لە هۆزێك.

مەبەست لە: (فاعرف قدرهم وحقوقهم في الاسلام).

هەریەکەو بەپێی فەزڵو حەقی خۆی.

**مەبەست لە:** (ومولى القوم منهم).

**ئەمە فەرموودەیەکە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ)[231]، واتە: کۆیلەیەکی ئازادکراو – العتیق – ئەگەر ئازادکراوەکە هی بەنی هاشم بوو ئەوا حوکمی حوکمی هاشمییەکانی هەیە و ئەگەر هی جگە لەوان بوو ئەوا حوکمی حوکمی ئەوانی هەیە.**

**نوسەر دەڵێت:** (واعرف فضل الأنصار ووصية رسول الله (ﷺ) فيهم وآل الرسول فلا تسبهم، واعرف فضلهم و كراماتهم وجيرانه من أهل المدينة فاعرف فضلهم).

**واتە: فەزڵی ئەنسارِ بزانەو ئامۆژگارییەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەواندا بزانەو فەزڵی ئالی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بزانە، بۆیە هەرگیز جوێنیان پێ مەدە و فەزڵ و کەراماتیان بزانەو دراوسێکانی لە ئەهلی مەدینەش ئەوا ئەوانش فەزڵیان بزانە.**

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (واعرف فضل الأنصار).

**لەئەوس و خەزرەج، هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەباشترین سەدەکانن لەبەر ئەو فەرموودەیەی دەفەرموێت:** (خيركم قرني)[232] **واتە: باشترینی ئێوە ئەم سەدەیەی منە) لە بەر ئەوەی خوای گەورە ئەوانی هەڵبژارد بۆ هاوڕێتی پێغەمبەرەکەی (محمد) (ﷺ) و لەبەر ئەوەی بەیعەیان بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) داوەو جیهادیان لەگەڵدا کردوەو لەئەوەوە ئەم عیلمەیان هەڵگرتووەو بەخەڵکیان گەیاند، جا هاوەڵان باشترینی سەدەکانن، هیچ کەسێك ناگاتە فەزڵی ئەوان، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (لا** تسبوا أصحابي، فوالذي نفسي بيده لو أنفق أحدكم مثل أحد ذهباً، ما بلغ مدَّ أحدهم ولا

---

٢٣١ / رواه البخاري (٦٣٨٠) .

٢٣٢ / صحيح : سبق تخريجه .

نصیفه)[٢٣٣] واتە: جنێو بە یارانی من مەدەن، سوێند بێت بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە ئەگەر یەکێ لە ئێوە بە ئەندازەی کێوی ئوحود ئاڵتون بکات بە خێر، ئەوا ناگاتە مشتی یەکێ لەوان‌و بە نیوەی مشتێکیش) واتە: ئەگەر یەکێك بەئەندازەی کێوی ئوحود ئاڵتون ببەخشێ ئەوا ناگاتە مشتێکی جۆ هاوەڵێك بەخشیویەتی، ئەمەش بەڵگەی فەزڵی هاوەڵانە.

جا ئەمە فەزڵێکی مەزنە ئەبێ بزانرێت، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ بِإِحْسَانٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الْأَنْهَارُ (١٠٠)التوبة) واتە: لەدەستەی یەکەمی پێشەنگی کۆچکەران و پشتیوانان‌و چاك پەیڕەوانی ئەوانیش خوا ڕازی بوو لێیان‌و ئەوانیش لەخوا ڕازی بوون بەدەر لەوەش چەندان باخ و بێستانی بۆ سازداون کە: بە بەردرەخت و کۆشکەکانییدا ڕووبار گەلێ دەچێت بەهەتا هەتاییش تێیدا ئەمێننەوە هەر ئەوەیشە دەسکەوت و سەرفرازی گەورەو بەنرخ).

خوای گەورە دەفەرموێت: (لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنْزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا (١٨) الفتح) واتە: – بێ گومان خوا ڕازی بوو لەئیماندارەکان کاتێ _ لەژێر ئەو درەختەدا پێی دەڵێن (شجرة الرضوان) پەیمانیان لەگەڵ دەبەستیت ئەی موحەممەد (ﷺ) جا خوا بەو ڕاستی و وفایەی لەدڵیاندا بوو بۆ پەیامەکەت ئاگاداربوو ئینجا لەکاتی پەیمانەکەدا ئارامی دابەزاندە سەریان و بەسەرکەوتنێکی نزیك پاداشتی دانەوە).

خوای گەورە دەفەرموێت: (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِمْ مِنْ أَثَرِ السُّجُودِ ذَلِكَ

---

٢٣٣ / صحيح : سبق تخريجه .

مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ) واتە: سیفەتیان لە تەوراتدا (وَمَثَلُهُمْ) واتـە: سـیفەتی ئـەوان (فِي الْإِنْجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَى عَلَى سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنْهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا (٢٩) الفتح) واتــە: موحەممــەد ڕەوانەکراوو پەیامبەری خوایە ئـەو کەسـانەش لەگـەڵ ئـەون و شـوێنی ئـەو کـەوتوون لەبەرامبەر بێ بڕواکانە ئازاو بەهێزن،لەناو خۆشـیاندا میهرەبـان و بەسـۆز و دڵ نـەرمن دەیان بینی هەردەم خەریکی ڕکوع و سوژدەن هەموو کات ئاواتیـان بەدەسـت هێنـانی فـەزڵ و میهرەبـانی و خۆشـنوودی خوایـەو مەبەسـتیان ئەوەیـە خـوا لێیـان ڕازی بێـت نیشانەیان لەشوێنەواری سوجدە بردنەکانیانـەوە بـۆ خـوا لەڕوخـسارياندا ديـارە ئـەوە وەسـفيانە لەتـەورات مەسـەل و وەسـفيان لـە (ئینجیـل)يـشدا وەك كـشتێ وايـە كـە لەسەرەتاوە وەچی دەرکردبێ ئینجا وەچەکە بەهێزی کردبێو ئینجا ئەستوریش بووبێ ئەوسا لەسەر بنجەکانیـشی وەسـتابێ ئەوەنـدە زوو هـەڵ بـداو گەشـە بكـات، وەرزێـرو كشتەوانەكان سەرسام بكات بۆ ئەوەی ڕکی كافرەكانيان پێ هەڵسێنێ خوا بەڵێنی بەو کەسانە داوە کەبڕوایان هێنـاوەو كـارە چـاکەکانيان ئـەنجام داوە بـەلێبووردنی تـەواو و پاداشتێکی گەورە).

ئەم ئایەتانە لـەبارەی هاوەڵانـەوە هـاتوە، بەڵگەیـە لەسـەر فـەزڵ و پلـەو پايـەيان لەلای خوای گەورەو لای پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەوانیش لە نێـو خۆیانـدا جیاوازییـان هەیە لەفەزڵدا، جا چوار خەلیفەکە باشترینی هـاوەڵانن، ئـەمجار ئـەودوای دە كەسـەكە دێن موژدەی بەهەشتیان پێ دراوە (العشرة المبشرة) ئەمجار کۆچەران، چـونکە خـوای گـەورە لـەپێش ئەنـصارەوە باسـی ئـەوانی کـردوە، چـونکە وازيـان لـە وڵات و مـاڵ و سەروەت و سامانی خۆیان هێنا لە پێناوی خوادا، لـەپێناوی خـوادا کۆچيان کـرد، جـا ئـەوان لـە ئەنـصار چـاکترن، ئـەمجار ئەنـصار دێـت چـونکە هەسـتان بەداڵـدەدانی پێغەمبەری خواو (ﷺ) داڵدەدانی موسـڵمانانو سەرخـستنيانو يارمـەتی ئـەوانيان دا بەسەروەت و سامانەکانیان و لەگەڵیاندا تێکەڵ بوون ئـەوانيان خۆشويـست و ئەوانـەی

بەشداری بەدریان کردووە ئەوانیش فەزڵ و تایبەتمەندییان هەیە، و ئەوانەی بەشداری بەیعەی (الرضوان) یان کردووە، خوای گەورە دەفەرموێت: (لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ) الفتح/١٨) ئەمجار ئەوانەی موسڵمان بوون لەپێش ڕزگارکردنی مەککە چاکترن لەوانەی لە پاش ڕزگارکردنی مەککە موسڵمان بوون، جا ئەوانیش وەك یەك نین لەچاکێتیدا، بەڵام ئەوان بەگشتی چاکترن لەهەموو ئەوانە لە پاش ئەوانن تاکو قیامەت هەستێ، هیچ کەسێك هاوتایان نییە.

مەبەست لە: (ووصية رسول الله (ﷺ) فيهم).

واتە: وەصێتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەربارەی ئەنصار، خۆشەویست (ﷺ) دەفەرموێت: (لايحب الأنصار إلا مؤمن، ولا يبغضهم إلا منافق)[٢٣٤] واتە: هیچ کەسێك ئەنصاری خۆش ناوێ تەنها ئیماندار نەبێت و هیچ کەسێك ڕقی لەوان نییە تەنها دووڕوو نەبێت).

مەبەست لە: (وجيرانه من أهل المدينة فاعرف فضلهم).

واتە ئەوەی نیشتەجێی مەدینەیەو ئارام دەگرێت لەسەری بەئومێدی پاداشتو ئارام دەگرێت بە شوێنەکە بە ئومێدی ئەوەی پاداشتی دەستکەوێت، بەردەوام دەبێت لە سەردانی مزگەوتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوە پاداشتی دەست دەکەوێت لەوەدا بەبێ گومان، بەڵام ئەوەی نیشتەجێی دەبێو فەسادی تێدا بڵاو دەکاتەوەو شەریك بۆ خوا بڕیار دەداتو بیدعە بڵاو دەکاتەوە ئەوا سزاکەی توندترە، سزاکەی چەند جار زیاترە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (من أحدث فيها حدثاً أو آوى محدثا فعليه لعنة الله والملائكة والناس أجمعين)[٢٣٥].

---

٢٣٤ / رواه البخاري (٣٥٧٢) ومسلم (٧٥) .

٢٣٥ / متفق عليه : أخرجه البخاري (١٧٧١) ومسلم (١٣٧٠) .

**﴿٩٧﴾ نوسەر دەڵێت: (واعلم أن أهل العلم لم يزالوا يـردُون قـول الجهميـة، حتى كان في خلافة بني العبـاس تكلمـت الرويبـضة في أمـر العامـة، وطعنـوا على آثار رسول الله (ﷺ) وأخذوا بالقياس والرأي وكفروا من خالفهم).**

واتە: بزانە ئەهلی عیلم بەردەوام ڕەددی قسەی جەهەمییەکانیان دەدایەوە، تاکو سەردەمی خیلافەتی بەنی عەبباسی هات و (رويبضة) هاتە زمان لەکاروباری گشتی دا، تانەیان دا لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا و (ﷺ) (قیاس) و بۆچوونیان وەرگرت و ئەوانەی جیاوازیان بوو لە گەڵیاندا بە کافریان دەزانی.

ڕاڤە/

**مەبەست لە:** (واعلم أن أهل العلم لم يزالوا يردون قول الجهمية).

جەهەمییەکان لەپێشدا پێناسەی کرا: ئەوانیش شوێنکەوتەی (جەهەم)ی کوڕی (صفوان)ن ئەو کەسەی ئەو قسە چەپەڵەی بڵاو کردەوە کەوا قورئان دروستکراوە، بە ئاشکرا نەفی ناوو سیفاتەکانی خوای دەکردو مەزهەبی ئیرجائی بڵاوکردەوەو خاوەنی مەزهەبێکی پیس بوو، جا شوێنکەوتەکانی پێیان دەڵێن: (جەهەمی)یە لەبەر (جهم)و وەلەخراپترین قسەکانیان ئەوەیە دەڵێن قورئان دروستکراوەو نەفی ناوو سیفەتەکانی خوای گەورەیان دەکردو تەحریفی قسەی خوای گەورەو قسەی پێغەمبەری خوایان (ﷺ) دەکرد بە (باطل)، جا ئەوان پیسترین کۆمەڵن و خراپترینیانن، بۆیە ئەهلی سوننەو ئەهلی عیلم وازیان لێیان نەهێنا، بەڵکو ڕەدی گومانەکانیان دایەوەو قسەکانیانیان پووچەڵ کردەوە، ئەمەش لەکتێبەکانی ئەهلی عیلمدا هەیە، لەوانە: ڕەدی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لەسەر (جەهەمی)یەو ئەو کتێبەش لەبەر دەستدایەو چاپکراوە، لەوانە ڕەددی عوسمانی کوڕی سەعید الدارمی لەسەر (بشر المريسى) کەللەرەق، ئەویش چاپکراوە.

لەوانە (بيان تلبيس الجهمية) لەدانانی (شيخ الاسلام ابن تيمية)، لەوانە (اجتماع الجيوش الاسلامية على غزو المعطلة والجهمية) لەدانانی (ابن القيم).

**مەبەست لە:** (حتى كان في خلافة بني العباس).

لە خیلافەتی (مەئمون)دا لە بەنی عەبباس خراپە ڕوویدا، کەسانێك ئەهلی ئەوە نەبوون قسە بکەن لەعیلم و بنەماکاندا هاتنە قسە، جا ئەگەر هەر کەسێك لە بوارێکدا قسەی کرد پسپۆری خۆی نەبێ ئەوا کارەکە خراپ دەکات، بۆیە نابێ هیچ کەسێك لە کاروباری دین و عیلمدا قسە بکات ئیللا ئەهلی پسپۆرو ئەهلی عیلم نەبێ، نابێت کارەکە ببێتە پاشاگەردەنی، هەمووان قسە دەکەن و بانگەشەی عیلم دەکات، هەروەکو ئێستا هەیە لەوانە خۆیان بەزانا دەزانن، ئەوانەی قسە لەمەسەلەی عەقیدەدا دەکەن و دەچنە ناو ئەو باسەوە، جا قسە دەربارەی ئیمان و حەقیقەتی ئیمان دەکەنو لە شتانێکدا قسەیان کرد هیچ پەیوەندی بە ئەوانەوە نییە، لەسەر دەستی زانایان فێر نەبوون بەڵکو لەخۆیانەوە فێربوونو پشتیان بەتێگەیشتنی خۆیان بەست، ئەمجار وایان لێهات چەند یاساو ڕێسایەکیان دانا لەخۆیانەوەو بە تێگەیشتنی خۆیان، جا کارەکە زۆر ترسناکە.

**مەبەست لە:** (تكلمت الرويبضة في أمر العامة).

ئەمە لەفەرموودەدا هاتووە، (اذا تكلمت الرويبضة) واتە لەنیشانەکانی قیامەت ئەوەیە کەسێك قسە بکات لەکاروباری گشتیدا شارەزای عیلم نەبێ[٢٣٦]، ئەمە (رويبضة)یەو قسەکردنیان لە نیشانەکانی قیامەتە، بۆیە دروست نییەو نابێت لە کاروباری گشتیداو لەمەسەلە گشتییەکاندا قسە بکات ئیللا ئەهلی عیلمو زانایان نەبێ، هەموو کەسێك ناچێتە ناو باسی عیلمەوە، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِذَا

---

٢٣٦ / رواة احمد والبزار والطحاوي وقال ابن كثير (إسناده جيد) .

جَاءَهُمْ أَمْرٌ مِنَ الْأَمْنِ أَوِ الْخَوْفِ أَذَاعُوا بِهِ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَى أُولِي الْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنْبِطُونَهُ مِنْهُمْ (٨٣) النساء) **واتە: هەرکە هەواڵێکی خۆش وەك بەدەستهێنانی ئەمن و ئاسایش و سەرکەوتن، یان هەواڵێکی ناخۆش و ترسناکیان پێ بگا سەربەخۆ بلاویان دەکردەوەو لای هەموو کەس دەیانکردە هەرا خۆ ئەگەر بیانبردایەتەوە بۆلای پەیامبەرو فەرماندەکانیان ئەوا خاوەن سەلیقەکانیان دەیانزانی هەواڵە ڕاستەکەی لێ دەربێنن).**

**جا کاروبارە گشتییەکانی ئوممەت هیچ کەسێك نابێ قسەی تێدا بکات ئیللا پسپۆر نەبێ.**

**مەبەست لە:** (وطعنوا علی آثار رسول الله (ﷺ)).

**قسەیان لەبارەی فەرمودەکانەوە کردو لەکەداریان کردو چەندین کتێبیان نووسی دەستیان کرد بە (صحیح) کردنو (ضعیف) کردنی فەرموودەکان لەکاتێکدا ئەوان بەعیلمەوە ناسراو نەبوونو فێرنەبوونەو لە(ڕاوی) فەرموودە نین و لەپێشەوایانی فەرموودە نین، جا ئەوانە (رویبضة)ن هەستان دەستیان کرد بە قسەکردن لە ترسناکترین شتدا کە ئەویش زانستی فەرموودەیەو زانستی ڕیوایەتە.**

**مەبەست لە:** (وأخذوا بالقیاس والرأي وکفروا من خالفهم).

**مەبەست لە (قیاس) لێرەدا: قیاسی پوچەڵە (باطل)ـە، بەلام (قیاسی دروست) ئەوە یەکێکە لەبنەماکانی بەڵگەکان لای زانایان، بەلام (قیاس الباطل) وەکو قیاسی خوای گەورە بە دروستکراوەکانی یان قیاسی مەسەلەکە لەگەڵ ئەوەی قیاسی لەگەڵدا کراوە یەك ناگرنەوە لە عیللەدا، چونکە قیاس بریتییە لە: گەیاندنی لقێك (فەرعێك) بە بنچینێکەوە (ئەصڵەوە) لە حوکمدا لەبەر عیللەتێك لەهەردووکیاندا هەبێ، جا ئەگەر عیللەتەکە لە هەردووکیاندا نەبوو ئەوە قیاسێکی (باطل)ە.**

**نوسەر دەڵێت:** (فدخل في قولهم الجاهل والمغفل والذي لا علم له حتى كفروا من حيث لا يعلمون، فهلكت الأمة من وجوه، وكفرت من وجوه، وتزندقت من وجوه، وضلت من وجوه، وتفرقت وابتدعت من وجوه، إلا من ثبت على قول رسول الله (ﷺ) وأمره وأمر أصحابه، ولم يتخط أحدا منهم، ولم يجاوز أمرهم، ووسعه ما وسعهم، ولم يرغب عن طريقتهم ومذهبهم، وعلم أنهم كانوا على الإسلام الصحيح، والإيمان الصحيح فقلدهم دينه واستراح، وعلم أن الدين إنما هو بالتقليد، والتقليد لأصحاب محمد (ﷺ)).

**واتە: بۆیە خەڵكی نەفامو بێ ئاگا ئەوانەی زانیاریان نییە چوونە سەر ڕای ئەوان، تاكو توشی كوفر بوون بەشێوەیەك ئاگایان لەخۆیان نەبوو، بۆیە ئەم ئوممەتە بەهەلاكەتدا چوون لەچەند ڕوویەكەوەو كوفریان كرد لەچەند ڕوویەكەوەو زەندیق بوون لەچەند ڕوویەكەوەو گومڕا بوون لەچەند ڕوویەكەوە، جیاواز بوونو بیدعەیان كرد لەچەند ڕوویەكەوە، ئیللا ئەوانە نەبێ دامەزراوبوون لەسەر قسەی پێغەمبەری خوداو (ﷺ) فەرمانی ئەوو فەرمانی هاوەڵانی، قسەیان پێش هیچ یەكێك لەوان نەكردو لە كاری ئەوان تێنەپەڕێ و ئەوەی ئەوان وتیان هەر ئەوەی بەسە، ڕقی لەڕێگاو مەزهەبی ئەوان نەبوو و زانی كەوا ئەوان لەسەر ئیمان و ئیسلامی ڕاست و تەواوبوون، بۆیە لەدینەكەیدا چاوی لەوان كردو بێ خەم بوو، زانی كەوا دین بریتییە لەچاولێكردن، چاولێكردنی هاوەڵانی محمد (ﷺ).**

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (فدخل في قولهم الجاهل والمغفل والذي لا علم له).

**دەرگا كرایەوە بۆ ئەوانەی هاتنو چوون، بۆیە لەمەسەلە عیلمییەكاندا قسەیان كرد، ئێستا _هەروەكو دەزانن_ بەهۆی ئەم كەناڵە ئاسمانیانەوە، لەبەر ئەم قسەو پاشاگەردەنییە زانستییە وای لێهاتووە تەنانەت خەڵكی عەوام قسە لەمەسەلە**

عیلمییەکان دەکەن و گومانی تێدا دروست دەکەن، گومان لەحوکمە شەرعییەکاندا دروست دەکەن، گومان لەفەتوای پێشەواکان دروست دەکەن، هەروەکو لەپێشدا باسمان کرد ئەوانەی جیاوازیان بن ئەوا بەکافریان دەزانن، تەنانەت پێشەوا پێشووەکانیان بەکافر زانی و بەنەفامیان زانی، تاکو گەیشتە ئەوەی هەندێکیان دەڵێن: (من مرۆڤم و ئەحمەدی کوڕی حەنبەلش مرۆڤە، ئێمە پیاوین و ئەوانیش پیاون، ومالك پیاوەو منیش پیاوم) گەیشتە ئەو ڕادەیە و قسەی پێشەواکان هیچ تایبەتمەندییەکی نییە.

مەبەست لە: (حتى كفروا من حيث لا يعلمون).

تووشی کوفربوونو کوفریان کرد بەشێوەیەك ئاگایان لەخۆیان نەبوو، چونکە مرۆڤ ڕەنگە قسەیەکی کوفر بکات و نەزانێ ئەوە کوفرە بەهۆی نەفامییەوە، جا کوفر دەڵێتو ڕەواجی پێ دەداو کەچی نازانێ ئەوە کوفرە، بەهۆی ئەوەی چوە ناوباسێکەوە بەباشی لێی نازانێ، جا ترسناکییەکە زۆر مەزنە لەسەر خۆیو لەسەر ئەم ئوممەتە، جا ئەگەر ترسەکە تەنها لەسەر خۆی بوایە ئەوا سوکتر بوو، بەڵام کێشەکە لەوەدایە ئەمە لەناو ئەم ئوممەتەدا بڵاو دەبێتەوە.

مەبەست لە: (فهلكت الأمة من وجوه وكفرت من وجوه).

واتە: لەسەر ئەم ئوممەتە تێکەڵیان کرد، چەندین خەڵەلیان هاویشتە ناو ئوممەتەکەوە تەنانەت هەندێکیان قسەی کوفر وەردەگرن و دەڵێن: ئەمە قسەی زانایانە، هەروەکو قسەی جەهمییەکان و موعتەزیلەکان دەڵێنەوەو دەڵێن ئەمە قسەی زانایانە، تەنانەت هەندێکیان لەڕۆژنامەکاندا نوسیویانەو بە زانایان دەڵێن: ئێوەن تەنها خۆتان بەهەق دەزانن‌و قسەی پێشەوایان وەرناگرن وەکو: (ابن سينا) و (ابن عربي) و (الجهم بن صفوان) و ئەو زانایانە نرخو بەهای خۆیان هەیە.

**مەبەست لە:** (وتزندقت من وجوه وضلت من وجوه وتفرقت وابتدعت من وجوه).

**هـەموو ئـەو نەهامەتییانـە بـەهۆی ئەوەوەیـە نەفامـەکان دەچـنە نێـو مەسـەلە عیلمییەکانەوە و ترسـی خـوا کەمـە لەدڵەکانیانـدا، کـاتێ ترسـی خـوا لـە دڵیانـدا کـەم بووەوە چوونە نێو ئەم بابەتانەوە، بۆیە هەندێ لەسەلەف دەڵێن:** (قَلَ وَرَعُهُم فَتَكَلَّمُوا) **واتە: ترس و وەرعیان کەم بوویەوەو قسەیان کرد). بەڵام ئەو کەسەی لەخوا دەترسـێ ئەوا ناچێتە ناو باسێکەوە بەجوانی لێی نەزانێ، ناچـێتە نـاو باسـێکەوە بـەجوانی لێـی نەزانێ و ئەهلی ئەو باسە نەبێ، بەتایبەتی لەکاروباری دیندا.**

**مەبەست لە:** (إلا من ثبت على قول رسول الله (ﷺ) وأمره وأمر أصحابه ولم يتخط أحدا منهم).

**هیچ کەسـێك لـەم بـەڵاو نەهامەتییـە رزگـاری نـەبوو: لـە نەهامـەتی کـوفرو لادان و گومڕابوون و وێڵبوون و دژایەتی و بچراندن ئیللا ئەوانە نەبێ دەستیان گرتـووە بـەوەی پێغەمبەری خـواو (ﷺ) هـاوەڵانی لـە سـەر بـوون، هـەروەکو پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویەتی:** (وستفترق أمتي على ثلاث وسبعين فرقة كلها في النار إلا واحدة، قالوا: من هي يا رسول الله؟ قال: من كان على ما أنا عليه وأصحابي)[٢٣٧] **واتـە: ئوممەتەکـەم دەبێتـە حەفتاو سێ تاقم و فیرقەوە، هەمووی لە ئاگردایە تەنها یەکێکیان نـەبێت، فـەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کێن ئەو کۆمەڵە رزگـار بـوە؟ فـەرمووی: ئـەو کەسـەی لـە سەر ئەو رێگایەیە منو هاوەڵانمی لە سەرین).**

**مەبەست لە:** (ووسعه ما وسعهم).

**ئەویش قورئانو سوننەتەو ئەوەی پێـشینە چـاکەکان لـەهاوەڵانو شـوێنکەوتووانو سێ سەدە چاکەکە وپێشەوایان لەسەری بوون، بـەڵام کێـشەکە لەوەدایـە کـە دەڵێـت:**

---

٢٣٧ / حسن : سبق تخريجه .

(ئەوان پیاوبوونو ئێمەش پیاوین و قسەكانی ئەوان هیچ تایبەتمەندییەكی نییە بەسەر قسەكانی ئێمەدا).

**مەبەست لە:** (وعَلِمَ أنهم كانوا على الإسلام الصحيح والإيمان الصحيح).

**هەروەكو خوای گەورە دەفەرموێت:** (وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ بِإِحْسَانٍ (١٠٠)التوبة) **پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دەفەرموێت:** (عليكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين المهديين من بعدي) ئەو كەسەی ڕزگاری دەوێت ئەوا ئەمە ڕێگاكەیەتی، ئەوەی ڕزگاری ناوێت ئەوا خۆی هەڵیبژاردوەو هی خۆیەتی، هیچ كەسێ زەرەر ناكات تەنها خۆی نەبێ، بەڵكو ئەو تاوانی خەڵكی هەڵدەگرێ لەگەڵ تاوانەكەی خۆیدا، خوای گەورە دەفەرموێت: (لِيَحْمِلُوا أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَمِنْ أَوْزَارِ الَّذِينَ يُضِلُّونَهُمْ بِغَيْرِ عِلْمٍ أَلَا سَاءَ مَا يَزِرُونَ (٢٥) النحل) واتە: هەتا ڕۆژی قیامەت باری گوناهەكانی خۆیان بەتەواوی هەڵدەگرن، وەلە گوناهی ئەو كەسانەش هەڵگرن كەبەنەزانیو گێلانەو بێ بەڵگە ئەوان گومڕایان دەكەن هۆشیار بن چ بڕیارێكی نالەبارو خراپ هەڵئەگرن؟).

گومان لەوەدا نییە هاوەڵان و سێ سەدە چاكەكە ئەوان لەسەر ئیسلام و دینە ڕاستو دروستەكە بوون، جا ئیتر چۆن بەجێی دەهێڵیو وازی لێ دەهێنیو دەڕۆی بۆ لای كەسێك هیچ دڵنیا نیت لەسەر دینە ڕاستو دروستەكەیە یان لەسەر حەقە.

**مەبەست لە:** (فقلدهم دينه واستراح).

(قلَّدهم): واتە: شوێنیان دەكەون، (وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ بِإِحْسَانٍ) تەقلید لێرەدا مانای شوێنكەوتنە.

**مەبەست لە:** (وعلم أن الدين إنما هو بالتقليد والتقليد لأصحاب رسول الله (ﷺ)).

**هەروەکو باسمان کرد مەبەست لە تەقلید: تەقلیدی تەواوە ئەویش شوێنکەوتنە، هەروەکو یوسف فەرمووی:** (إِنِّي تَرَكْتُ مِلَّةَ قَوْمٍ لَا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَهُمْ بِالْآخِرَةِ هُمْ كَافِرُونَ (٣٧) وَاتَّبَعْتُ مِلَّةَ آبَائِي إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ (٣٨) يوسف) **واتە: چاك بزانن کە من ئایینی ئەو کەسانەم واز لێ هیناوە کە نە بروایان بەخوا هەیەو، نەبەڕۆژی دوایی (٣٧) بۆ خۆم کەوتومەتە شوێنی ئاینی باوو باپیرانم: ئیبراهیمو ئیسحاقو یەعقووب) (٣٨).**

**جا شوێنکەوتنی پێشینە چاکەکان ئەوە حەقە، هیچ لۆمەیەکی تێدا نییە ئەگەر شوێنی ئەوان کەوتیت، بەڵکو لۆمە لەوەدایە ئەگەر شوێن کەسێك بکەویت شایەنی شوێنکەوتن نەبێ، چاو لەیەکێك بکەیت بەکەڵکی پێشەنگی نەیەت.**

**﴿٩٨﴾ ومن قال: لفظي بالقرآن مخلوق فهو جهمي، ومن سكت فلم يقل: مخلوق أو غير مخلوق فهو جهمي، وهكذا قال أحمد بن حنبل، وقال رسول الله (ﷺ): إنه من يعش منكم بعدي فسيرى اختلافا كبيرا، فإياكم ومحدثات الأمور، فإنها ضلالة، وعليكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين المهديين، وعضوا عليها بالنواجذ)[٢٣٨].**

**واتە: هەركەسێ بڵێت: گفتم (لفظی) بە قورئان دروستكراوە ئەوە جەهەمییە، هەركەسێ بێ دەنگ بوو و نەیگووت: دروستكراوە یان دروستكراو نییە ئەویش جەهەمییە، ئا بەم شێوەیە ئەحمەدی كوڕی حەنبەل فەرموویەتی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموی:** (إنه من يعش منكم بعدي فسيرى اختلافاً كبيراً، فاياكم ومحدثات الامور فإنها ضلالة وعليكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين المهديين وعضوا عليها بالنواجذ) **واتە: هەركەس لەئێوە _لەپاش من_ بژێت ئەوا جیاوازی و دووبەرەكی زۆر دەبینێ، جا ئامۆژگاریتان دەكەم دەست بەسوننەتو رێگاكەی منەوە بگرن و دەست بە سوننەتو ڕێگای جێنشینە رێنمویی كراوەكانەوە بگرن، توند دەستی پێوە بگرن، بە ددانەكانتان توند بیگرن).**

**ڕاڤە/**

**خوای گەورە لەچەندین ئایەتدا سیفەتی كەلامی بۆ خۆی سەلماندوە،** (قُلْ لَوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَادًا لِكَلِمَاتِ رَبِّي لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أَنْ تَنْفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَدًا (١٠٩)الكهف) **واتە: پێیان بڵێ: ئەگەر بۆ نوسینی وشەكانی پەروەردگارم دەریا گشت مەرەكەب بێ پێش لەكۆتایی هێنانی وتەو بڕیارەكانی پەروەردگارم دەریا هەموو هەڵدەچۆڕێ ئەگەرچی ئەوەندەی تریشیان فریاخەین بۆ كۆمەكیان).**

---

٢٣٨ / صحيح : سبق تخريجه .

(كلمات الله) واتە: کەفـەرمانی پـێ دەکـات و نـەهی پـێ دەکـات و گـەردوونی پـێ دەباتە ڕێـوە کـێ دەتـوانێ (كلمات الله) بـژمێرێ لەکاتێکـدا دەریاکـان بەشـی ناکـەن، پێنووسەکان هەموو ناتوانن بینووسن.

قسەی خوای گەورە _هەروەکو ئەهلی سوننەو جەماعە دەڵـێن_ جۆرەکـەی کۆنـەو تاکـەکانی تازەیـە، جـا قورئـان یەکێکـە لـە تاکـەکانی قـسەی خـوای گـەورە، یەکێکـە لەقـسەکانی خـوا، جـا قـسەی خـوا سـابیتەو جـێگیرە بـەپێی قورئـانو سـوننەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ)، گومان لەوەدا نییە عەقڵـە سـاغو سـەلامەتەکان قـسە بـۆ خـوا دەسـەلمێنن، چـونکە ئـەو سـیفەتی کەمالـەو نـەبوونی سـیفەتی کـەمو کوڕییـە، بـەلاّم جەهەمییەکان کە ئەوانیش شـوێنکەوتەی (جەهـەم)ی کـوڕی (صـفوان)ن، کـە ئـەویش کابرایەکی پیسو چەپەڵ بوو لەناو خەڵکیدا دەرکەوت گومانی بۆ خەڵکی لەدینەکەیاندا دروست دەکـرد، فـەرمانی پـێ دەکـردن بـەکوفرو ئیلحـاد، لەوانـە گومـانی بـۆ خـەڵکی دروست کرد خوای گەورە قسە دەکات، وتی: قسەکانی خـوا هەیـەو بـوونی هەیـە ئـەوا دروستکراوە، خوای گەورە لە (لـوح)دا دروسـتی کـردووە یـان لـە (جبريـل)دا دروسـتی کردوە، یان لە (محمد)دا (ﷺ) دروستی کردوە، ئەویش لەجۆری دانە پاڵی دروستکراو بۆ دروستکارەکەی وەکو: بيت الله، ناقة الله، ئـا بـەم شـێوەیەی گـووت، خـوای گـەورە ریسوای بکات، دەڵێت: خوای گـەورە قـسەناکاتو قـسەکردن دانـە پـاڵ خـوای گـەورە لەجۆری دانە پاڵی دروستکراوە بۆ دروستکارەکە، ئەمە لـە مەزهەبەکەیـەتی، هـەروەها لەقەدەردا مەزهەبی (جەبر) هەیە، واتە: ناچـاری، هـەروەها مەزهـەبێکی هەیـە لەنـەفی ناوو سیفەتەکانی خوا، هەروەها مەزهەبێکی هەیـە لـە بەدرۆخـستنەوەی سـوننەتەکەی پێغەمبـەری خـواو (ﷺ) بەدرۆخـستنەوەی قورئـان، جـا ئـەو کەسـێکی بـێ بـاوەڕی چەپەڵە هەستا بە وتنی ئەم درۆیە، ئـەم مەزهەبـەش لەجولەکـەوە هـاتوە، هـەروەکو (شيخ الاسلام) باسی کردوە لەپێشەکی (الحموية)، (جەهەم) یەکـەم کـەس نـەبوو ئـەم

مەزهەبەی دەست پێکرد، بەڵکو پێش ئەو (الجعد) ی کوڕی (درهم) ئەم بوو ئەم قسە خراپەی دەست پێ کرد و ئەویش لە (طالوت)ی جولەکەوە وەریگرت، (طالوت)ش لە (لبيد بن الاعصم اليهودي) یەوە وەری گرت، ئەو کەسەی کە سیحری لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد، جا ئەم قسەیە لەجولەکەوە دزەی کردووەو هاتووە، ئەوانەی قسەی خوای گەورە لەجێگەو مانای خۆی لادەدەن، بۆیە هیچ سەرسام مەبە بەم مەزهەبە چەپەڵە، ئەگەر زانرا سەرچاوەکەی لە جوولەکەوەیە، ئەم مەزهەبەیان تێکەڵ بەموسڵمانان کرد بەهۆی ئەو کابرا پیسەوە (الجعد بن درهم) کە (خالد القسری) کوشتی لەڕۆژی جەژنی قورباندا، هەروەکو (ابن القيم) باسی کردووەو دەفەرموێت:

| | |
|---|---|
| ولاجـل ذا ضحى بجعد خـالد | القسري يوم ذبائح القربـان |
| إذ قـــال ابراهيم ليس خليله | كلا ولا موسى الكليم الدان |
| شكر الضحية كل صاحب سنة | لله درك مـن أخي قربـــان |

ئەم قسەیە (جهم) ی کوڕی (صفوان) لەئەوەوە وەریگرت،بۆیە دەدرێتە پاڵ ئەو، چونکە ئەو بوو بڵاوی کردەوە نەك ئەو یەکەم کەس بوو دەستی پێکرد.

ئەهلی سوننە ئینکارییان لێکرد ئینکارییەکی توندو قسەی توندیان لەو باسەدا کردووە، ئەوەش دێت _ان شاء الله _ لەو دەستەواژەیەی پاش ئەمە دێت، بەڵام لێرەدا لە باسی بەشێکی ئەم مەزهەبە چەپەڵەداین، ئەویش نەفیکردنی قسەکردنە بۆ خوای گەورە، بەڵام لای ئەهلی سوننە کێشەیەك دروست بوو ئەویش ئەوەیە کە: ئایە دەگوترێت: (گفتم بەقورئان دروستکراوە یان دروستکراو نییە)؟ ئەمەشیان تێکەڵ بە موسڵمانان کرد، ئایە دەڵێیت: گفتم بەقورئان دروستکراوە یان دەڵێیت: گفتم بەقورئان دروستکراو نییە؟ جا ئەگەر بیانەوێ گوتن بەقورئان بێت ئەوا (گوتنەکە) گفتەکە دروستکراوەو دەنگەکەشی دروستکراوە، بۆیە پێویستی بە ڕوونکردنەوەیە، ئەمەش

ئـەو روونکردنەوەیـە کـە ئیمـامی ئەحمـەدو بوخـاری و کۆمـەڵێك لەلێکۆڵـەرەوان فەرموویانە، بۆیە مەڵێ: گفتم بەقورئان دروستکراوە بەڕەهاییو مەڵێ: گفتم بـەقورئان دروستکراو نییە بەڕەهایی، بەڵکو لەمەدا روونکردنەوە بدە.

**﴿٩٩﴾ نوسەر دەڵێت: (واعلم أنه إنما جاء هلاك الجهمية: أنهم فكروا في الرب عز و جل، فأدخلوا: لم؟ وكيف؟ وتركوا الأثر ووضعوا القياس وقاسوا الدين على رأيهم، فجاءوا بالكفر عيانا لا يخفى، فكفروا وكفّروا الخلق واضطرهم الأمر إلى أن قالوا بالتعطيل).**

واتە: بزانە کەوا بە هەلاکەت چوونی جەهەمییە بەهۆی ئەوەوە بوو بیریان لە پەروەردگار کردەوە، چەند وشەیەکیان هێنایە ئاراوە وەك: بۆ؟ چۆن؟ وازیان لەفەرمووده هێنا، (قیاس)یان دانا، قیاسی دینیان بەبۆچوونی خۆیان کرد، بۆیە بەئاشکرایی کوفریان هێنایە کایەوەو ناشاردرێتەوە، جا خۆیان کافر بوون و خەڵکیشیان کافر کردو کارەکە ناچاری کردن تاکو لەکارخستنیان هێنایە کایەوە (واتە: التعطيل).

راڤە/

مەبەست لە: (واعلم أنه إنما جاء هلاك الجهمية: أنهم فكروا في الرب عز و جل).

هۆی ئەوەی جەهەمییەکان بەو گومرا دوورە گومرابوون ئەوان چوونە نێو باسی زاتی خوداوە، وایان لێ هات لەوەدا دەگەڕان، دروست نییە بۆ موسڵمان لەزاتی خوای گەورەدا بگەڕێ، بەڵکو ئەوەی لەسەرە باوەڕ بهێنێ بەناوو سیفەتەکانی و نەچێتە نێو باسی چۆنیەتییەوە، هیچ کەسێك لەزات و چۆنیەتی ناوو سیفەتەکانی خوای گەورە نازانێ ئیللا خۆی نەبێ، خوای گەورە دەفەرموێت: (يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِ عِلْمًا (١١٠) طه).

جا هیچ کەسێك نییە ئیحاتەی خوا بکات بەڵکو ئەوە خوای گەورەیە کە زانایە دەربارەی خۆی و جگە لە خۆی، جا ئێمە دەربارەی زاتی خوا هیچ قسە ناکەین ئیللا

بەوە نەبێ بەڵگەی لەسەر هاتبێ لەقورئان و سوننەو ئەوەی هیچی لەسەر نەهاتووە ئێمەش قسە ناکەین، جەهەمییەکان ئینکارییان لەقورئان و سوننەت کردو بەعەقڵی خۆیان چوونە ناو باسی زاتی خوداوەو تاکو گوتیان: ئەو خوایە لەناو جیهاندا نییەو لەدەرەوەش نییەو لەسەرەوە نییەو لەخوارەوەش نییەو لەڕاستەوە نییەو لەچەپەوەش نییە.

کەواتە خوا نییە، پاکی و بێ گەردی بۆ خوا لەو قسانەی دەیکەن، گوتیان: خوای گەورە بیستنو بینین و عیلم و ویستی نییە، جا کەواتە ئەو خوایە (جماد)ە، چونکە (جماد) بەو شێوەیە وەصف دەکرێت وەکو بتی لێ دێ پاکیو بێ گەردی بۆ خوای گەورە لەوەی دەیلێن.

مەبەست لە: (وقاسوا الدين على رأيهم).

شوێنی قیاسی (باطل) کەوتن، قیاسی خوای گەورەیان بەدروستکراوەکانی کرد بۆیە نەفی ناوو سیفاتەکانیان کرد، چونکە لای ئەوان مانای شوبهاندنی هەیە، نەیانزانی ناوو سیفەتەکانی خوا تایبەتن بەخۆیەوە، ناوو سیفەتەکانی دروستکراوەکان تایبەتن بەخۆیانەوەو هیچ لێکچوونێك نییە لەنێوان ئەمو ئەودا، هەروەکو چۆن خوای گەورە زاتێکی هەیە لەزاتەکانیتر ناچێت، ئاواش ناوو سیفاتی هەیە لە ناوو سیفەتەکانی دروستکراوەکان ناچێت، هەر کەسێك بەم شێوەیە وەریگرێ ئەوا ئاسوودە دەبێ و لەسەر ڕێگا ڕاستەکەیە.

مەبەست لە: (فجاءوا بالكفر عيانا لا يخفى).

کوفریان بەخوا کرد بەهۆی ئەو قسە چەپەڵانەوە کە لە زاتی خوادا کردیان.

**مەبەست لە:** (فكفروا وكفَّروا الخلق).

**ئەوانەی وەسفی خوای گەورە دەكەن بەناوو سیفاتەكانی ئەوا لەلایەن ئەوانەوە كافر كران، چونكە دەڵێن: ئەمانە شوبهاندنەو شوبهاندنش كوفرە، ئێمەش دەڵێین: نەخێر ئەمە شوبهاندن نییە، خوای گەورە دەفەرموێت:** (لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ (١١) الشورى) **نەفی شوبهاندنی لە خۆی كرد، بەڵام بیستن و بینین بۆ خۆی سەلماند، لەگەڵ ئەوەشدا بیستن و بینین لەدروستكراوەكاندا بوونیان هەیە، ئەوەش بەڵگەیە كە ئەوە لەگەڵ ئەویتردا ناشوبهێنرێتو لەیەك ناچن.**

**مەبەست لە:** (واضطرهم الأمر إلى أن قالوا بالتعطيل).

التعطيل: **بریتییە لە نكۆڵی كردن لە دروستكار، چونكە ئەمە بەرەو (تعطیل) دەبات، چونكە ئەوكەسەی نابیسێ و نابینێ و قسەناكات و ئیرادەو ویستی نییەو هەروەها لەناو جیهاندا نییەو لەدەرەوەی جیهان نییەو لەسەرەوە نییەو لەخوارەوە نییە، كەواتە ئەوە خوایەك نییە تاكو بپەرسترێ، بۆیە كارەكە بەرەو لەكارخستن (تعطیل)و بێ باوەڕی (إلحاد) بردنی.**

**﴿١٠٠﴾ نوسەر دەڵێت: (وقال بعض العلماء -منهم الإمام أحمد بن حنبل-: الجهمي كافر ليس من أهل القبلة، حلال الدم، لا يرث ولا يورَث لأنه قال: لا جمعة ولا جماعة ولا عيدين ولا صدقة،وقالوا: من لم يقل: القرآن مخلوق فهو كافر).**

واته: هەندێ لەزانایان فەرموویانه - لەوانه ئەحمەدی کوڕی حەنبەل-:- جەهمی کافرەو ئەهلی قیبله نییه، خوێنی حەڵاڵەو لەمیرات هیچ وەرناگرێ و ماڵەکەی نابێته میراتی چونکه ئەو دەڵێت:- نەجومعەو نەجەماعەت و نەدوو جەژن و نەصەدەقه هەیه، هەروەها دەڵێن:- هەر کەسێ نەڵێت: قورئان دروستکراوه ئەوا کافره.

ڕاڤه:

قسەی زانایان: (الجهمي كافر ليس من أهل القبلة).

واته: کافره بەکۆی قسەکانی، چونکه ئەو سیفاتەکانی خوای گەورەی لەکارخست (تعطيلي) کرد، گومان لەوەدا نییه ئەمه توندترین کوفره.

قسەکانیان کوفرن بەرەو (تعطيل) دەیانبات، هەروەکو شەیخ فەرمووی: ئەویش ئینکارکردنی بوونی خودایه، ئیمامی ئەحمەد وەڵامی ئەوانی داوەتەوه لەکتێبەکەیدا (الرد على الجهمية) که کیتابێکی چاپکراوەو تەحقیق کراوه سوپاس بۆ خوا، جگه لەیەکێ وەڵامی ئەوانی داوەتەوه، (شيخ الاسلام) له کتێبێکی گەورەدا ڕەددی ئەوانی داوەتەوه بەناوی (بيان تلبيس الجهمية).

مەبەست له: (حلال الدم، لا يرث ولا يورث).

چونکه ئەو لەدینەکەی هەڵگەڕاوەتەوه (مرتد)ه، بۆیه خوێنی حەڵاڵه، چونکه ئەوەی خوێنی پارێزراو دەکات ئیسلامه، کەسی کافر خوێنەکەی حەڵاڵه.

**مەبەست لە:** (لأنه قال: لا جمعة ولا جماعة).

**واتە: چونکە (جەهەم) ئینکاری لەنوێژی جومعە کرد، ئینکاری لەنوێژی جەماعەت کردوە، بەڵکو لای ئەو تەنها ناسینی خوا بەسە، جا ئیمان لای ئەو تەنها ناسینە، ئەگەر مرۆڤ پەروەردگارەکەی خۆی بەدڵ ناسی ئەوا دەبێتە کەسێکی ئیماندار خاوەن ئیمانێکی تەواو، هەرچەندە نوێژیش نەکات و ڕۆژوو نەگرێت و هیچ پەرستنێك ئەنجام نەدا.**

**مەبەست لە:** (ولا عيدين ولا صدقة).

**چونکە وای دەبینێ کەوا کردەوەکان لەئیمان نین، گوتن بەزمانیش لەئیمان نییەو هەروەها باوەڕ بوونیش، چونکە ئیمان لای ئەو تەنها ناسینە.**

**مەبەست لە:** (وقالوا: من لم يقل: القرآن مخلوق فهو كافر).

**جەهەمییەکان دەڵێن:- هەر کەسێ نەڵێ: قورئان دروستکراوەو وتی قورئان کەلامی خوایە ئەوا کافرە، چونکە ئەو خواکەی بەدروستکراوەکانی شوبهاندووەو شوبهاندنیش کوفرە.**

**نوسەر دەڵێت:** (واستحلوا السيف على أمة محمد (ﷺ) وخالفوا من كان قبلهم وامتحنوا الناس بشيء لم يتكلم فيه رسول الله (ﷺ) ولا أحد من أصحابه وأرادوا تعطيل المساجد والجوامع).

**واتە: کوشتاری ئوممەتی (محمد)یان (ﷺ) حەڵاڵ کرد، لەگەڵ ئەوانەی پێش خۆیاندا جیاوازبوون، خەڵکیان تاقی دەکردەوە لەشتێکدا پێغەمبەری خواو (ﷺ) هاوەڵانی قسەیان تیادا نەکردوە، ویستیان مزگەوتەکان لە کاربخەن.**

**ڕاڤە:**

**مەبەست لە:** (واستحلوا السيف على أمة محمد (ﷺ)).

**کوشتنی موسڵمانانیان حەڵاڵ کرد، ئەوانەی لە عەقیدەدا لەگەڵیاندا جیاوازن، بۆیە کاتێ لەسەردەمی (مەئمون)دا دەسەڵاتیان گرتە دەست ئەوەی کوشتیان لەزانایان کوشتیان و ئەوەی سزایاندا ئەوا سزایاندا، بۆ ئەوەی ناچاریان بکەن لەسەر وتنی مەزهەبی جەهەمییە.**

**مەبەست لە:** (وخالفوا من كان قبلهم).

**لەموسڵمانان، چونکە ئەم قسەیە تەنها لەواندا دەرکەوت لە کەسی پێش خۆیان نەبوە.**

**مەبەست لە:** (وامتحنوا الناس بشيء لم يتكلم فيه رسول الله (ﷺ)).

**ویستیان خەڵکی ناچار بکەن بۆ وتنی قسەکەی خۆیان، هەروەکو لەسەردەمی مەئمونو ئەوانەی پاش ئەوان هاتن ڕوویدا کاتێ خەڵکی ناچار کرد بە وتنی ئەوەی قورئان دروستکراوە.**

**مەبەست لە:** (وأرادوا تعطيل المساجد والجوامع).

**چونکە مەزهەبی ئەوان لەئیماندا تەنها ناسینە هەرچەندە هیچ کارێك نەکات و هەرچەند بەزمانش نەیڵێ هەرچەندە بەدڵی باوەڕی نەبێ کەواتە هیچ پێویست بەمزگەوت ناکات چونکە لای ئەوان نوێژەکان واجب نییە.**

**﴿١٠١﴾ نوسەر دەڵێت: (وأوهنوا الإسلام وعطلوا الجهاد وعملوا في الفرقة وخالفوا الآثار وتكلموا بالمنسوخ واحتجوا بالمتشابه فشككوا الناس في أديانهم واختصموا في ربهم وقالوا: ليس هناك عذاب قبر ولا حوضا ولا شفاعة والجنة والنار لم يخلقا وأنكروا كثيرا مما قال رسول الله (ﷺ) فاستحل من استحل تكفيرهم ودمائهم من هذا الوجه لأنه من رد آية من كتاب الله فقد رد الكتاب كله ومن رد حديثا عن رسول الله (ﷺ) فقد رد الأثر كله وهو كافر بالله العظيم).**

واتە: بوونە هۆی لاوازبوونی ئیسلامو جیهادیان لەکارخست (تعطیل) کرد و کاریان بۆ پارچە پارچەکردنی موسڵمان کرد، لە گەڵ بەڵگەو سوننەتەکاندا جیاوازبوون، بەڵگە(منسوخ)ەکانیان وەرگرتو بەڵگە (متشابهەکان)یان کردە حوججە، بۆیە گومانیان خستە ناو دڵی خەڵکییەوە لە دینەکەیاندا و دەمبازیان (مخاصمە)یان لەزاتی پەروەردگاردا کرد ووتیان: سزای ناوگۆڕ بوونی نییە، (حوض)و شەفاعەت نییە، بەهەشت و دۆزەخ دروست نەکراون، زۆربەی ئەوانەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی ئینکاریان لێ کرد، بۆیە ئەوانەی بەکافریان دەزانن خوێنی ئەوانیان حەڵاڵ کرد لەم ڕوویەوە چونکە هەرکەسێ یەك ئایەت لەقورئان ڕەد بکاتەوە ئەوا هەموو قورئانی ڕەد کردووەتەوەو هەر کەسێ یەك فەرموودە ڕەد بکاتەوە ئەوا هەموو فەرموودەکانی ڕەد کردووەتەوە، ئەویش کافرە بەخوای گەورە.

ڕاڤە:

مەبەست لە: (وأوهنوا الإسلام).

واتە: جەهمیيەکان، ئیسلامیان لاواز کرد.

مەبەست لە: (وعطلوا الجهاد).

جیهادکردنیان لەپێناوی خوادا لەکار خست، چونکە کافرەکان بەکافر نازانن، چونکە ئەو کافرانە خوا دەناسن، مانای ئەوەیە فیرعەون موسڵمانە، چونکە خوای گەورەی بەدڵ دەناسی، خوای گەورە دەفەرموێت: (قَالَ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا أَنْزَلَ هَؤُلَاءِ إِلَّا رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ (١٠٢)الاسراء) واتە: مووسا وتی: ئەی فیرعەون! بەڕاستی تۆ چاك دەزانی کە ئەو (٩) نۆ بەڵگەو ئایەتانە لەخۆیانەوە نەهاتوون بەڵکو هەر پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی ناردوونی).

جا ئەو خوا بەدڵ دەناسیێ، موشریکەکان لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بەدڵ خوایان دەناسی بەڵکو بەهەموو شێوەیەك عیبادەتیان دەکرد جا ئەوان باوەڕیان وابوو خوای گەورە پەروەردگارەو شایستەی پەرستنە، بەڵام هاوەڵیان بۆ بڕیاردەدا باوەڕیان وابوو ئەو هاوەڵ بڕیاردانە لەخوا نزیکیان دەکاتەوە.

مەبەست لە: (وخالفوا الآثار).

واتە: لەگەڵ بەڵگە و سوننەتدا جیاواز بوون.

مەبەست لە: (وتكلموا بالمنسوخ).

بەڵگە مەنسوخەکان وەردەگرن و کار بە (ناسخ)ەکان ناکەن لەبەر گومڕا کردن، هەروەکو خوای گەورە فەرموویەتی: (فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ)آل عمران/٧) واتە: ئینجا ئەوانەی لەدڵیاندا لادان و چەوتی هەیە هەر لەموتەشابیهەکان دەگەڕێن و هەر لەوان پەیڕەوی دەکەن).

مەنسوخ یەکێکە لە (متشابهە)کان، چونکە دەبێ موسڵمانان (ناسخ و مەنسوخ) و (مطلق ومقید) و(خاص وعام) بزانن و زانستەکانی (استدلال) بزانن، بۆیە نابێ هیچ

دەقێك بكرێتە بەڵگە بەبێ ئەوەی بزانی (منسوخ)ە یان (مخصص)ە یان (مقید)ە، جا ئەوانە تەماشای ئەمە ناكەن، لەبەر لادان، لەبەر گومڕاكردنی خەڵكی و دەڵێن: – ئێمە قورئان دەكەینە بەڵگە، لە كاتێكدا ئەوان قورئانیان نەكردوەتە بەڵگە، قورئان ئەو كەسە دەیكاتە بەڵگە هەمووی پێكەوە وەرگرێ، بەڵام كەسێك هەندێكی وەرگرێ و واز لەهەندێكیتر بهێنێ ئەوا پێی كافرە، خوای گەورە فەرموویەتی: (أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ)البقرة/٨٥) جا ئەو كەسەی لەنێوان (محكم) و (متشابهە)دا كۆنەكاتەوە ئەوا هەندێ لەقورئانی وەرگرتوە و وازی لەو هێندەكەی هێناوە، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: (وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ) وتیان: (كُلٌّ) واتە: (محكم) و (متشابهە) (كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا) آل عمران/٧) ئەوان (متشابهەكان) بۆ (محكمـ)ـەكان دەگێڕنەوە، جا ڕوونی دەكاتەوەو تەفسیری دەكات، بەڵام ئەمە پێویستی بە زانایە، نابێ خۆبەزانازان بچێتە ناو ئەو باسەوە، یان لادەرێك گومڕاكردنی دەوێ، جا هیچ كەسێك (متشابهەكان) وەرناگرێ ئیللا دوو كەس نەبێ: –

- یان لادەرێك گومڕاكردنی دەوێ، وەكو جەهمییەكان، بۆیە ئیمامی ئەحمەد دەربارەیان فەرمووی: بەڵگە متشابهەكانی قورئان دەكەنە بەڵگە[٢٣٩].
- یان خۆ بە زانازانێك كە نازانێ، بە ناو دینی خواوە قسە دەكات بەبێ عیلم.

مەبەست لە: (واحتجوا بالمتشابه).

بۆیە ئیمامی ئەحمەد لە كتێبی (الرد على الجهمية) ڕەدی ئەوانی داوەتەوە، لەكتێبەكەدا ئەو دەقانەی ئەوان كردوویانەتە بەڵگە هێناویەتییەوەو هەموو بۆچوونەكەیانی پووچەڵ كردەوە، ڕا ڕاستەكەی تیادا دیاری كرد، جەمعی لەنێوان ئایەت و فەرموودەكاندا كردوە.

---

٢٣٩ / الرد على الزنادقه والجهميه (ص / ٦) .

مەبەست لە: (فشككوا الناس في أديانهم).

گومانی تیادا نییە ئەمە تێکدانی بیرو هزرەکانە، بۆیە دروست نییە هیچ کەسێ لەمەسەلە عیلمییەکاندا قسە بکات بەتایبەتی لەعەقیدەدا ئیللا کەسانێك نەبێ زانان، دروست نییە نیوە زاناکان یان خۆبەزانازانەکان قسەی تێدا بکەن، هەروەها لادەران و گومڕاکان لە پێشترن بەوەی قسەی تێدا نەکەن.

مەبەست لە: (واختصموا في ربهم).

(جیدال)یان داهێنا، خوای گەورە دەفەرموێت: (مَا يُجَادِلُ فِي آيَاتِ اللَّهِ إِلَّا الَّذِينَ كَفَرُوا فَلَا يَغْرُرْكَ تَقَلُّبُهُمْ فِي الْبِلَادِ (٤)غافر) واتە: هەر ئەوانە لەبارەی ئایەتەکانی خواوە ململانێ و دەمبازی ئەکەن _لەڕووی عینادەوە_ کافرو بێ باوەڕن جا با هەڵسوڕانیان لەشاراندا تۆ فریو نەدا).

کەسی ئیماندار لەئایەتەکانی خوادا جیدال ناکات، بەڵکو وەری دەگرێتو باوەڕی وایە ئەوە قسەی خوایە، هەر ئەویش خەیرو هیدایەتە، بەڵام ئەوانەی لەسەری ڕادەوەستن و گومانیان لێی هەیە ئەمە کەسێکی دەمبازە (مجادل)ـە لە ئایەتەکانی خوادا.

مەبەست لە: (وقالوا: ليس هناك عذاب قبر).

ئەمە قسەیە یەکدەنگن لەسەری لە مەزهەبەکەیاندا چونکە لای ئەوان هەر کەسێ خوای ناسی ئەوە ئیماندارەو پێویست ناکات نوێژ بکات و ڕۆژوو بگرێت و حەج و عەمرە بکات و کارەکانی تر ئەنجام بدات، بەپێی ئەم قسانە سزای ناو گۆڕ بوونی نییە چونکە هەموو خەڵکی خوا دەناسن، هیچ گوێڕایەڵی و سەرپێچی نییە، ئەوانەی وا لە گۆڕدان هەموویان خوا دەناسن، کەواتە سزا نادرێن.

مەبەست لە: (ولا حوضا ولا شفاعة).

**ئینکارییان لەهەموو بابەتە غەیبیەکان کرد، چونکە ئەوان تەنها پشت بە عەقڵی خۆیان دەبەستن.**

**مەبەست لە:** (والجنة والنار لم يخلقا).

**واتە: جەهەمییەکان دەڵێن: بەهەشت و دۆزەخ ئێستا دروست نەکراون، هەرچەندە خوای گەورە هەواڵی پێ داوین کەوا دروستکراون ئێستا، خوای گەورە دەربارەی بەهەشت دەفەرموێت:** (أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ (١٣٣) آل عمران) **وشەی:** (أُعِدَّتْ) **بەڵگەیە بەهەشت ئێستا ئامادەیەو بوونی هەیە، دەربارەی ئاگر فەرمویەتی:** (أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ (١٣١) ال عمران) **هەروەها پێغەمبەری خوا** (ﷺ) **هەواڵی پێ داوین سەختی گەرمایی لە گڕو تینی دۆزەخە، ئەوەش بەڵگەیە ئێستا بوونی هەیە، هەروەها ئاگر دوو هەناسەی هەیە، هەناسەیەك لەزستانداو ئەویش لە سەختترین ساردیدا دەیبینن و هەناسەیەك لە هاویندا ئەویش لەسەختترین گەرمیدا دەیبینن، فەرمویەتی:** (ان شدة الحر من فيح جهنم)[240].

**مەبەست لە:** (وأنكروا كثيرا مما قال رسول الله (ﷺ)).

**لە زۆرێك لەوانەی لە قورئان و سوننەتدا هاتووە ئینکاریان لێ کرد، چونکە لەگەڵ بۆچوون و باوەڕی ئەواندا جیاوازەو ناگونجێ.**

**مەبەست لە:** (فاستحل من استحل تكفيرهم ودمائهم من هذا الوجه).

**هەرکەسێ لەئەهلی سوننەو جەماعە ئەوانی بەکافر زانیوە ئەوا لەبەر کۆی ئەو قسە چەپەڵانەیان ئەوانی بەکافر زانیوە، چونکە قسەکانیان بەوە کۆتای دێت کەوا دین بوونی نییە.**

**مەبەست لە:** (لأنه من رد آية من كتاب الله فقد رد الكتاب كله).

---

٢٤٠ / سبق تخريجه .

هەروەکو لەپێشدا باسمان کرد هەر کەسێ هەندێ لەقورئانەکە بەبەڵگە وەربگرێ و واز لەو هەندەکەی تر بهێنێ کە پەیوەندی پێوەیە، ئەوا یەکێکە لەوانەی باوەڕی بەهەندێ لەقورئانەکە هێناوەو وازی لەهەندەکەی تر هێناوە، جا ئەو کەسەی (متشابهەکان) بکاتە بەڵگەو واز لە (محکمەکان) بهێنێ ئەوا لەو کەسانەیە باوەڕی بە هەندێکی کیتاب کردووەو کوفری بەو هەندەکەی تر کردوە.

**مەبەست لە:** (ومن رد حديثا عن رسول الله (ﷺ) فقد رد الأثر كله).

هەروەها لەسوننەتدا (محکم) و (متشابە) هەیە، جا هەرکەسێ لەسوننەتدا (متشابە) وەرگرێ و واز لە (محکم) بهێنێ ئەوا ڕەددی هەموو سوننەی کردوەتەوە.

**مەبەست لە:** (وهو كافر بالله العظيم).

ئەمە ئەنجامەکەیە پەنا بەخوا، چونکە ئەو کەسەی باوەڕی بەخوا هەیە دەڵێت: (آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا) آل عمران/٧) بەڵام ئەوەی لەدڵیدا لادان هەیە ئەوا (متشابە) وەردەگرێ،چونکە بۆ ئەو دەگونجێ، بەڵام (مُحکم)ـەکان ئەوا بەکەڵکی ئەو نایەت بۆیە وازی لێ دەهێنێ، ئەمە ڕێگای ئەهلی ئارەزووە هەردەمو تایبەت نییە بەجەهمییەکان بەڵام سەرچاوەکەی جەهمییەکانە، چونکە ئارەزوو پەرستان هەموویان لە هەر کاتێکدا بن ئەمە ڕێگایانە، ئەو بەڵگانە وەردەگرن لە گەڵ ئارەزوویاندا بگونجێو واز لەو ڕایە دەهێنن لەگەڵ حەزو ئارەزوویاندا نەگونجێ.

**نوسەر دەڵێت:** (فدامت لهم المدة، ووجدوا من السلطان معونة على ذلك، ووضعوا السيف والسوط على من دون ذلك فدرس علم السنة والجماعة وأوهنوهما، وصارتا مكتومتين لإظهار البدع والكلام فيها ولكثرتهم واتخذوا المجالس وأظهروا رأيهم ووضعوا فيها الكتب وأطمعوا الناس وطلبوا لهم الرئاسة فكانت فتنة عظيمة لم ينج منها إلا من عصم الله فأدنى ما كان يصيب الرجل من مجالستهم أن يشك في دينه أو يتابعهم أو يرى رأيهم على الحق ولا يدري أنه على

حق أو على باطل فصار شاكا فهلك الخلق حتى كانت أيام جعفر الذي يقال له المتوكل فأطفأ الله به البدع وأظهر به الحق وأظهر به أهل السنة وطالت ألسنتهم مع قلتهم وكثرة أهل البدع إلى يومنا هذا).

**واتە: ماوەیەك ڕۆژگار بۆ ئەوان بوو، لە لایەن دەسەڵاتەوە یارمەتی دەریان هەبوو بۆ بڵاوکردنەوەی ڕاکەیان، بەشمشێرو قامچی دەجووڵانەوە لەگەڵ ئەو کەسانەی لە گەڵ ڕاو بۆچوونی ئەواندا نەبوون، بۆیە عیلمی سوننەو جەماعە پەرتو بڵاو بوەوەو لاوازیان کرد، ئەهلی سوننەو جەماعە شاراوەو نادیار بوون لەبەر دەرکەوتنی بیدعەو کەلام لە مەسەلەکاندا، لە بەر ژمارە زۆرییانو چەندان مەجلیسان داناو بۆچوونی خۆیان دەرخستو چەندین کتێبیان لەو بابەتەدا نووسی، تەماحیان خستە بەر خەڵکیو سەرۆکایەتیو دەسەڵاتیان بۆ ئەوان دەویست، بۆیە فیتنەیەکی مەزن بەرپا بوو، هیچ کەسێك لێی دەرباز نەبوو ئیللا ئەوانە نەبێ خوای گەورە پاراستنی، کەمترین شت تووشی کەسێك دەبوو لە مەجلیسەکانی ئەواندا ئەوە بوو گومانی لەدینەکەیدا بۆ دروست دەبوو، یان شوێنی ئەوان دەکەوت یان وایدەزانی ڕاو بۆچوونی ئەوان لەسەر حەقە، نەیدەزانی خۆی لەسەر حەقە یان لەسەر (باطل)ە بۆیە گومانی بۆ پەیدا بوو، خەڵکی بەهەلاکەتدا چوون تاکو سەردەمی (جەعفەر) کە پێیان دەگووت: (المتوکل) خوای گەورە بە هۆی ئەوەوە ئاگری بیدعەی کوژاندەوەو حەقی دەرخستو ئەهلی سوننە بەهۆیەوە دەرکەوتن و زمانیان درێژ بوو هەرچەندە خۆیان کەم بوون و ئەهلی بیدعە زۆربوون تاکو ئەمڕۆ.**

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (فدامت لهم المدة ووجدوا من السلطان معونة على ذلك).

**ئاماژە بە سەردەمی (مەئمون) و نەوەکەی دەکات خوای گەورە لەئێمەو ئەویش خۆشبێت کە پێی مەغرور بوون و پێی هەڵ خەڵەتان.**

**مەبەست لە:** (ووضعوا السيف والسوط على من دون ذلك).

**واتە لەسەردەمی مەئموندا زاڵ بوون بەسەر ئەهلی سوننەو جەماعەدا، ئەمەش ئەنجامی دانانی هاوڕازی پیسو چەپەڵە، جا پێویستە لەسەر کەسی موسڵمان چ دەسەڵاتدار بێت یان دەسەڵاتدار نەبێ هەردەم کەسی چاك بکاتە هاوڕازی خۆی، خوای گەورە دەفەرموێت:** (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا بِطَانَةً مِنْ دُونِكُمْ لَا يَأْلُونَكُمْ خَبَالًا) آل عمران /١١٨) **واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! بەدەر لە خۆتان کەسێك مەگرنە دۆست و مەیکەنە جێی راز و نیازی خۆتان و نهێنییەکانی خۆتانیان لا بدرکێنن، لە کار تێکدان و زیان پێگەیاندنتان درێغ ناکەن و کۆڵ نادەن).**

**جا کەسی موسڵمان هاوڕازی چاکی هەیەو ئاگاداروو وریایە لە هاوڕازی خراپ، بەتایبەتی کاربەدەستان، تەماشاکە هاوڕازی خراپ چی بە (مەئمون)کرد، لەگەڵ ئەو هەموو زیرەکی و خانەدانەی، ئەو لە نەوەی (هاشم)ە، لەگەڵ ئەمەشدا مەغرور بوو پێیان، تەماشاکە هاوڕازی خراپ چی بەدوایین خەلیفەی بەنی عەبباس کرد: ابن العلقمي و الطوسي، چییان بەخەلیفەی عەبباسی کرد؟ لە ڕۆژهەڵاتەوە تەتاریان هێنایە سەری و ئەوانیان هێناو ڕێگایان بۆ کردنەوەو ڕێگایان بۆ سووك و ئاسان کرد تا دەستیان بەسەر بەغدا و وڵاتانی موسڵماناندا گرت، کوشتارێکی گەورەو مەزنیان بەرپاکرد، هەموو کیتابەکانیان سوتاندو خستیانە ڕووباری دیجلەو فوراتەوە تاکو ڕەنگی ئاوەکە گۆڕا، وایان دەزانی ئەوان ئیسلامیان نەهێشت بەڵام ئیسلام لە لایەن خوداوە پشتیوانی لێ دەکرێ هەرگیز لەناو ناچێت.**

**مەبەست لە:** (فَدَرَس علم السنة والجماعة).

**دَرَسَ: واتە بڵاوبوویەوە چونکە (الدروس) بریتییە لەپەرت و بڵاوبوونەوە.**

**مەبەست لە:** (وأوهنوهما).

واتە: عیلمی کیتاب و سوننەیان لاواز کردو عیلم لای ئەوان بووە عیلمی (جدل) وعیلمی کەلام و عیلمی مەنتیق.

**مەبەست لە:** (وصارتا مكتومتين لإظهار البدع والكلام فيها).

وازیان لەسوننەت هێناو خۆیان بەدەرخستنی بیدعەو بانگەواز کردن بۆی خەریك کرد، بۆیە ئەهلی سوننە کپو بێدەنگ کران.

**مەبەست لە:** (ولكثرتهم واتخذوا المجالس وأظهروا رأيهم).

مەجلیس و قوتابخانەو کۆڕو کۆبوونەوەکانیان ئیستغلال کردو سوودیان لێ بینی بۆیە لەو جێگایانەدا ڕاوبۆچوونی خۆیان دەرخستو بڵاویان کردەوە، ئەهلی خراپەکاری بەو شێوەیەن ئەگەر دەسەڵاتیان هەبێ ئەوا هیچ چاوەڕوان نابن لە هەوڵدان بۆ نەهێشتنی ئیسلام.

**مەبەست لە:** (ووضعوا فيها الكتب).

واتە: کتێبیان نووسییەوە، کتێبی جەهمی و موعتەزیلە.

**مەبەست لە:** (وأطمعوا الناس وطلبوا لهم الرئاسة).

زۆرێك لەوانەی کە نەگەیشتبوونە عیلم توانیان قەناعەت بە بۆچوونەکانیان بکەن و شوێنیان کەوتن، چونکە فیتنە ئەگەر هات ئەوا کەمێك لە خەڵکی ڕزگاریان دەبێ، بەڵام هەندێ لەخەڵکی هەن زۆر پێی کاریگەر دەبن، هەیانە کەمتر کاریگەر دەبن پێی و هەیانە سەلامەت دەبن، بەڵام لەپاش تاقیکردنەوە، قەناعەتیان کرد بەخەڵکی بە مەزهەبەکەی خۆیان بەپارە مەغروریان کردن، ئەوان جاری وابوو بەهەڕەشەو کوشتن و لێدان و بەندکردن مامەڵەیان دەکرد و جاری وا بوو بەڵێنیان پێ دەدان بەپارەو پلەو پایەو ئایندەی گەش، جا کەسی نەفام و خاوەن تەماح دینەکەی بەدونیاکەی دەفرۆشێت _پەنا بەخوا_.

**مەبەست لە:** (فكانت فتنة عظيمة لم ينج منها إلا من عصم الله).

**هیچ کەسێك لێی دەربازی نەبوو ئیللا مەگەر کەسێك دەستی گرتبێ بەقورئان و سوونەتەوەو ئارامی گرتووە لەسەری وەك ئیمامی ئەحمەدو تیایاندا هەبوو کوژرا لەکاتێکدا دەستی گرتبوو بەقورئان و سوننەتەوە، بەڵام ئەوانەی لەگەڵ ئەواندا ڕۆیشتن ئەوا لەگەڵ ئەواندا بەهەلاکەتدا چوون.**

**مەبەست لە:** (فأدنى ما كان يصيب الرجل من مجالستهم أن يشك في دينه).

**واتە: هەندێ لەخەڵکی هەبوو لە دینەکەیان لایانداو هەندێکی تر لەدینەکەی لای نەدا، بەڵام چەند گومانێکی بۆ دروست بوو لە هەندێ مەسەلەدا چونکە دانیشتن لەگەڵ ئەوانەدا هەرگیز خەیرو چاکە لەگەڵ خۆیدا ناهێنێ.**

**مەبەست لە:** (أو يتابعهم).

**هەرکەسێ لەگەڵیاندا دانیشێ یان تووشی گومانی زۆر دەبێ و لەڕێ لادەدا، یان کەمێك تووشی لادان دەبێ یان بەلای کەمەوە تووشی جۆرێك لەجۆرەکانی گومان دەبێ لەهەندێ لە بابەتەکاندا.**

**مەبەست لە:** (يتابعهم أو يرى رأيهم على الحق ولا يدري أنه على حق أو على باطل فصار شاكا).

**بەتایبەتی کۆمەڵێك حوججەی ساختەو کۆمەڵێك ڕەوانبێژی و زمان پاراوی و زمان لووسیان پێیە، جا ئەوانە پێویستییان بەزانایەکی دامەزراوە بەرگری بکات و وەڵامیان بداتەوە، وەکو ئیمامی ئەحمەدو شیخ الاسلام (ابن تیمیە) وەکو ئەو پێشەوایانە کە بەرانبەریان ڕاوەستان و شکاندنیان.**

**مەبەست لە:** (فهلك الخلق حتى كانت أيام جعفر الذي يقال له المتوكل).

واتە: ئەم تاقیکردنەوە بەردەوام بوو لەسەردەمی مەئمونداو سەردەمی (معتصم)ی برای و سەردەمی (واثق)ی کوڕی (المعتصم) کاتێ (واثق) بەهەلاکەتدا چوو بەیعە درایە (متوکل)ی برای، جا ئەو سوننەی سەرخست و تاقیکردنەوەی لەسەر زانایان نەهێشت، دەرگای ڕەحمەت لەلایەن خوداوە کرایەوە، جا خوای گەورە پاداشتی خەیری بداتەوە، زۆر ڕێزی لەئیمامی ئەحمەد دەگرت و سەربەرزی کرد.

مەبەست لە: (يقال له المتوكل).

واتـە: (المتوكـل علـى الله) ئەمـە نازناوەکەیـەتی، بـەڵام ناوەکـەی (جعفـر)ی کـوڕی (الواثق) بوو.

مەبەست لە: (وطالت السنتهم).

واتە: ئەهلی سوننە، واتە: بەهێزبوون لەقسەکردندا، توند بوون لەقسەکردندا بەسەر ئەهلی بیدعەدا، جا کارەکە پێچەوانەوە بوو.

مەبەست لە: (مع قلتهم وكثرة أهل البدع إلى يومنا هذا).

بەڵام (باطل) هەرگیز بەرگەی حەق ناگرێت، هەرچـەندە ئەوانـەی لەسـەر (باطـل)ن زۆربن، جا ئەوانە بەرگەی حەق و حەق ویستان ناگرن، هەرچەندە ئەوانەی لەسەر حەق بـن کـەم بـن، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: (كَمْ مِنْ فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ (٢٤٩)البقرة) واتە: گەلێ جار بەفەرمانی خـوا کۆمـەڵێکی کـەم بەسـەر کۆمـەڵێکی زۆردا سەرکەوتوون).

ئیمامی ئەحمەد تەنها یەك کەس بوو تەماشـا بکـە چـی کـرد بەرانبـەر ئـەو لێشاوە بێباوەڕییە، خۆی بە تەنها دامەزراو بوو تاکو خوای گەورە لە سەردەستی ئەو سوننەی سەربەرز کرد، بۆیە پێی دەگوترێ: (پێشەوای ئەهلی سوننە).

**نوسەر دەڵێت:** (والرسم وأعلام الضلالة قد بقي منهم قوم يعملون بها، ويدعون إليها، لا مانع يمنعهم ولا أحد يحجزهم عما يقولون ويعملون).

**واتە: میراتگرانو ناودارانی گومڕایی مایەوە کۆمەڵێك لەوان مایەوە کاریان پێ دەکرد، بانگەوازی بۆ دەکەن، هیچ ڕێگرییەك ڕێگایان لێ ناگریت، هیچ کەسێك ڕێگرییان نییە لەوەی دەیڵێن و دەیکەن.**

**ڕاڤە:**

**مەبەست لە:** (والرسم وأعلام الضلالة قد بقي منهم قوم يعملون).

**خراپە کۆتایی نایەت، بەڵکو چاکەو خراپە دەمێنێتەوە بۆ تاقیکردنەوەو ئیبتلا، بەڵام هەندێ جار حەق سەردەکەوێ و دەردەکەوێ و هەندێ جار (باطل) دەردەکەوێ، بەڵام دەرکەوتنی (باطل) بەردەوام نابێ، بەڵام حەق هەرچی بەسەردا بێت ئەوا بەئیزنی خوای گەورە دەگەڕێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت:**

(وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ (٨٣)القصص) **واتە: پاشەڕۆژی چاکیش هەر بۆ پارێزگارانە).**

(وَالْعَاقِبَةُ لِلتَّقْوَى (١٣٢)طه) **واتە: پاشەڕۆژی چاك و پیرۆزیش تەنها بۆ خەڵکانی پارێزکارو بەتەقوایە).**

**پێشەوا (ابن القيم) دەڵێت:**

والحق منصور وممتحن فلا تعجب فهذه سنة الرحمن[٢٤١]

---

**٢٤١ / الكافيه الشافيه .**

**﴿١٠٢﴾ نوسەر دەڵێت: (واعلم أنه لم تجئ زندقة قط إلا من الهمج الرعاع اتباع كل ناعق يميلون مع كل ريح فمن كان هكذا فلا دين له قال الله عز و جل: (فما اختلفوا إلا من بعد ما جاءهم العلم بغيا بينهم) وهم علماء السوء أصحاب الطمع والبدع).**

واتە: بزانە هەرگیز (زەندەقە) پەیدا نەبوو ئیللا لە ناکەسانەوە نەبێ شوێنکەوتووانی هەموو بانگێکن لەگەڵ هەموو بایەکدا لاردەبنەوە، جا هەر کەسێ وابوو ئەوا دینی نییە، خوای گەورە دەڵێت: (قال الله عز و جل: فما اختلفوا إلا من بعد ما جاءهم العلم بغيا بينهم) ئەوانیش زانای خراپو خاوەنی بیدعەو تەماحن.

ڕاڤە:

مەبەست لە: (واعلم أنه لم تجئ زندقة قط).

زەندەقە: نیفاقە، دووڕووییە، ئەویش بریتییە لە دەرخستنی ئیمان و شاردنەوەی کوفر، جا زەندیقەکان: ئەوانەن لە سەرەتای ئیسلامدا پێیان دەگوترا: (منافقين) دووڕووەکان، لەنێو خەڵکیدا دەژین، ئەگەر هەلیان بۆ بڕەخسێ ئەوا خراپەی خۆیان دەردەخەنو دانیان جێی دەکەنەوە بەرانبەر بەحەقو ئەهلی حەق، هەروەکو ئێستا لەسەردەمی خۆماندا هەیە.

مەبەست لە: (إلا من الهمج الرعاع اتباع كل ناعق يميلون مع كل ريح).

واتە: خەڵکی عەوام شوێنی هەموو بانگێك دەکەون نازانن بەرەو کوێ دەڕۆن، بەڵام زانایانی (ئەهلی عیلم) ئەوانەن دامەزراون ئەوا شوێنی حەق دەکەون، بۆیە بە زۆری ئەوان مەغرور مەبە، زۆری خراپەکاران، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِنْ تُطِعْ أَكْثَرَ مَنْ فِي الْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ) الانعام/١١٦) واتە: ئەگەر لە زۆربەی خەڵکانی ئەم سەر

زەوییە کە بێ باوەڕن پەیڕەوی بکەیت لە ڕێگەی خوا لات ئەدەن و چەواشەو سەر لێشێواوت ئەکەن).

عیبرەت بە لەسەر حەق بوون دەبێ هەرچەندە کەمیش بن.

خوای گەورە دەفەرموێت: (كَمْ مِنْ فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ (٢٤٩) البقرة).

مەبەست لە: (فمن كان هكذا فلا دين له).

ئەو کەسەی دوو دڵ و دڵەڕاوکێ دەکات ئەوا دینی نییە، ئەوە کەسێکی دووڕووە خوای گەورە دەفەرموێت: (مُذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَلِكَ لَا إِلَى هَؤُلَاءِ وَلَا إِلَى هَؤُلَاءِ وَمَنْ يُضْلِلِ اللَّهُ فَلَنْ تَجِدَ لَهُ سَبِيلًا (١٤٣) النساء) واتە: لەنێوان ئیمان وکوفردا دوو دڵن نەئەوەیە بچنە لای ئەمان و موسڵمان بن، نەئەوەیشە بەیەکجاری خۆ بدەنە لای ئەوان و کافر بن،هەر کەسێکیش خوا گومڕای بکات بەهۆی لاساری ئەو کەسە خۆیەوە قەت تۆ ناتوانی هیچ ڕێگایەکی خێری نیشان بدەیت).

جا کەسی دوودڵ دینی نییە.

مەبەست لە: (قال الله عز و جل: فما اختلفوا إلا من بعد ما جاءهم العلم بغيا بينهم).

ئەوان ئەگەر لەنەزانینەوە توشی دووبەرەکی بوایەن ئەوا موصیبەتەکە ئاسان و سووك دەبوو، بەڵام ئەوان جیاواز بوون لەکاتێکدا دەزانن، چونکە ئەوان شوێنی ئارەزووی خۆیان کەوتن بۆیە جیاوازو دووبەرەکی کەوتە نێوانیان، جا ئەگەر شوێنی حەق بکەوتایەن ئەوا یەکدەنگ دەبوونو کۆدەبوونەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا) آل عمران/١٠٣) واتە: بەتێکڕا گشتتان دەست بەڕشتەی ئایینی خوا و قورئانەکەیەوە بگرن و قەت لێی نەترازێن).

ئەگەر جیاوازی لەگەڵ حەقدا لەنەزانینەوە بوو ئەوا تکا دەکرێت نەمێنێ، بەڵام ئەگەر لە زانینەوە بێت ئەوا نەهێشتن و نەمانی گرانە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِنَ اللَّهِ (٥٠) القصص) واتە: چ کەسێ گومڕاترە لەو کەسەی پەیڕەوی هەواو ئارەزووی خۆی کردووە، بێ ئەوەی هیچ ڕێنوێنێکی لەخواوە هەبێ..؟).

هیچ کەسێك لەو گومڕاتر نییە، (فَمَا اخْتَلَفُوا إِلَّا مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْعِلْمُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ)الجاثية /١٧) واتە: نەوەی ئیسرائیل لەنەزانینەوە جیاواز نەبوون بەڵکو بەهۆی ئارەزووەوە جیاواز بوون، هەروەها ئەوانەی لەوان دەچن لەم ئوممەتە.

**﴿١٠٣﴾ نوسەر دەڵێت: (واعلم أنه لا يزال الناس في عصابة من أهل الحق والسنة يهديهم الله ويهدي بهم غيرهم ويحيي بهم السنن فهم الذين وصفهم الله تعالى مع قلتهم عند الاختلاف فقال: (وما اختلف فيه إلا الذين أوتوه من بعد ما جآءتهم البينات بغيا بينهم) فاستثناهم فقال: (فهدى الله الذين ءامنوا لما اختلفوا فيه من الحق بإذنه والله يهدي من يشاء إلى صراط مستقيم) وقال رسول الله (ﷺ): (لا تزال عصابة من أمتي ظاهرين على الحق لا يضرهم من خذلهم حتى يأتي أمر الله وهم ظاهرون)[٢٤٢].**

**واتە: بزانە کۆمەڵێکی خەڵکی بەردەوام لەسەر ئەهلی حەق و سوننەتن، خوای گەورە ڕێنموییان دەکات و هیدایەتی جگە لەخۆیانیش دەدەن، سوننەتەکان زیندوو دەکەنەوە، ئەوانن خوای گەورە وەصفی ئەوانی کردووە لەکاتی جیاوازیدا هەرچەندە کەمن، دەفەرموێت:** (وما اختلف فيه إلا الذين أوتوه من بعد ما جآءتهم البينات بغيا بينهم) **خوای گەورە ئەوانی جیاکردەوەو فەرمووی:** (فهدى الله الذين ءامنوا لما اختلفوا فيه من الحق بإذنه والله يهدي من يشاء إلى صراط مستقيم) **هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی:** (لا تزال عصابة من أمتي ظاهرين على الحق لا يضرهم من خذلهم حتى يأتي أمر الله وهم ظاهرون).

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (واعلم).

**واتە: بزانە و فێربە.. ئەی موسڵمان.. ئەی قوتابی زانست و زانیاری کەوا حەق دەمێنێ، کۆمەڵێك خوای گەورە تەوفیقی داون لەسەر ڕێگا بمێننەوە هەرچەندە**

---

٢٤٢ / أخرجه مسلم (١٩٢٤) .

فیتنەکان زۆر بن، هەرچەندە دوژمنانی هەوڵ بدەن بۆ نەهێشتنی حەق و ئەهلی حەق ئەوا ناتوانن ئەوە بکەن، چونکە خوای گەورە خۆی دەیپارێزێ، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ (٩) الحجر) واتە: بەڕاستی ئێمە خۆمان ئەم قورئانەمان ناردۆتە خوارێ و هەر خۆیشمان ئاگادارو پارێزەری ئەکەین).

هەروەها دەفەرموێت: (إِنَّا لَنَنْصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ الْأَشْهَادُ (٥١) غافر) واتە: بێ گومان ئێمە یارمەتی پەیامبەرانمان و ئەوانەش بڕوایان هێناوە ئەدەین، لەژیانی دونیادا بەسەر دوژمنانیاندا سەریان ئەخەین، وەلەو ڕۆژەیشدا کە شایەددان _ لەپێغەمبەران و فریشتەو.... _ هەڵئەسن و ڕاست دەبنەوە).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (لاتزال طائفة من امتي على الحق ظاهرين لا يضرهم من خالفهم ولا من خذلهم حتى يأتي أمر الله تبارك وتعالى)[٢٤٣] جا حەق ماوەو ئەهلی حەق ماون هەر چەندە چەند ساڵانێك یان چەند کاتێك کەم ببنەوە، خوای گەورە هەرگیز ئەم حەقە بزر ناکات، بەڵام پێویستە لەسەر ئەو کەسانەی دەست بەم حەقەوە دەگرن ئارام بگرن لەسەری، ئارام بگرن لەسەر ئەوەی تووشیان دەبێ، ئەگەر نا ئەوا هەرگیز خوای گەورە ئەم حەقە بزر ناکات، بەڵکو چەند پشتیوان‌و شوێنکەوتوانێکی بۆ دەڕەخسێنێ، ڕەنگە لەجێگایەکەوە بگوازرێتەوە بۆجێگایەکی تر جا ئەگەر لە جێگایەکدا وازی لێ هێنرا ئەوا خەڵکی تری بۆ دەڕەخسێنێ، هەر وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِنْ تَتَوَلَّوْا يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوا أَمْثَالَكُمْ (٣٨) محمد) واتە: ئەگەر لەم دینە پشت هەڵکەن خوای گەورە ئێوە دەگۆڕێ بەقەوم و گەلێکی تر ئەوسا ئەوانیش وەك ئێوە نابن).

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَنْ يَرْتَدَّ مِنْكُمْ عَنْ دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ

---

٢٤٣ / رواه البخاري ومسلم .

اللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَائِمٍ ذَلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ (٥٤) المائدة) واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە هەرکەسێکتان لەئاینی خۆی (ئیسلام) پاشگەز بێتەوەو وەرگەڕێ جا خوا لەمەولا کەسانێك دێنێت خۆشی دەوێن و ئەوانیش ئەویان خۆش دەوێ و لەئاست خاوەن باوەڕاندا خۆ بەکەمزان و بەسۆزن و بەرامبەر بە کافرو بێ باوەڕان خۆ بەگەورەزان و سەربڵندو دەڕۆن بەرزن بۆ ڕەزامەندی خوا تێ دەکۆشن و جەنگ دەکەن و لەتەشەرو لۆمەی لۆمەکارانیش ناترسن و باکیان نادا ئەو خۆشەویستی و تێکۆشانە، فەزڵ و بەخششی خوایە بە هەرکەسێك خۆی بیەوێ دەیدا خواش فەزڵ و میهرەبانی فراوانە).

ئەمە دڵنیاییە لە لایەن خوداوە بۆ مانەوەی ئەم حەقە، چەندین کەسی بۆ دەڕەخسێنێ پێی هەستن و بیپارێزن، جا ترسەکە لەسەر لەناوچوونی دینەکە نییە، بەڵام ترسەکە لەسەر ئێمەیە ئەگەر دەست بەم دینەوە نەگرین و ئارامی لەسەر نەگرین، چونکە لە ئێمە دەسێنرێتەوەو دەدرێتە کەسانی تر، بۆیە پێویستە لەخۆمان بترسین بۆ ئەوەی ئەم دینەمان لێ نەسێنرێتەوە و بدرێتە جگە لەخۆمان و ئێمەش بەهەلاکەتدا بچین.

مەبەست لە: (أنه لا يزال الناس في عصابة من أهل الحق والسنة).

عصابة: واتە کۆمەڵێك (جەماعەتێك) هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (لا تزال طائفة) پێی دەگوترێت: طائفة، جماعة، عصابة.

مەبەست لە: (يهديهم الله). بۆ دەستگرتن بەم حەقەوە.

مەبەست لە: (ويهدي بهم غيرهم).

ئەوان خۆیان هیدایەت دراون جگە لە خۆیانش هیدایەت دەدەن، ئەمە صیفەتی زانا لەخوا ترسەکانە، ئەوان تەنها خەریکی خۆیان نابن، بەڵکو بانگەوازی جگە لەخۆیان

دەكەن بۆ حەق‌و چاوڕوونیان دەكەن‌و هیدایەتیان دەدەن، بە مانای ئەوەی ئەوان ڕێنموییان دەكەن‌و بۆیان ڕوون دەكەنەوە.

مەبەست لە: (ويحيي بهم السنن).

واتە: سوننەتەكانی پێغەمبەر (ﷺ)، لەپاش ئەوەی پەرت‌و بڵاوبوونەوەو نێژران ئەوان زیندووی دەكەنەوە، ئەمە ڕێگای ئەوانە، ئەوان سوننەتەكان زیندوو دەكەنەوەو بیدعەكان دەمرێنن و ئەم دینە تازە دەكەنەوە تاوەكو وەكو ئەو كاتەی لێ دێتەوە دابەزیوەتە سەر (محمد) (ﷺ) لەهەر ماوەیەكدا خوای گەورە كەسێك دەنێرێ بۆ ئەم ئوممەتە دینەكە تازە بكاتەوە، گۆڕانی زیادەڕەوان‌و خۆگۆڕینی ناراستان‌و تەئویلی نەفامانی لێ دوور دەخەنەوە، ئەمە فەزڵێكە لە خوداوە، چەندەها جار ئەم دینە تووش بوە كەچی بەردەوام سەربەرزە وەكو ئەو كاتەی دابەزیوەتە سەر (محمد) (ﷺ) بەقورئان و سوننەتەكەیەوە، هیچ كەسێك دەستی پێ نەگەیشتووە بۆ ئەوەی بیگۆڕێ، هەروەكو خوای گەورە فەرموویەتی: (إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ (٩)الحجر).

ئا ئەوەتا قورئانەكە هەروەكو ئەو كاتەی دابەزیوەتە سەر (محمد) (ﷺ) تەنها یەك پیتی لێ نەگۆڕاوە، ئەمەش پاراستنی خوای گەورەیە بۆ قورئانەكە، چونكە كتێبەكانی پێشوو قەشەو ڕاهیبەكان داوایان لێ كرابوو بە پاراستنی ئەوانیش كیتابەكەیان بزر كرد، گۆڕانكاری‌و تەحریفی بەسەردا هات، هەروەكو ئەوەی بەسەر تەورات و ئینجیلدا هات، بەڵام خوای گەورە خۆی كەفالەتی پاراستنی ئەم قورئانەی گرتە ئەستۆی خۆی، بۆیە هیچ كەسێك جورئەتی ئەوە ناكات تەنها یەك پیتێك بگۆڕێ ئەمەش لەنیعمەتی خوایە بەسەر ئەم ئوممەتەوە.

مەبەست لە: (فهم الذين وصفهم الله تعالى مع قلتهم عند الاختلاف فقال: (وما اختلف فيه إلا الذين أوتوه من بعد ما جآءتهم البينات بغيا بينهم)) (البقرة /٢١٣).

(وما اختلف فيه) واتە: لەم دینەدا یان لەم کتێبەدا (إلا الذين أوتوه من بعد ما جآءتهم البينات بغيا بينهم) ئەوان جیاواز نەبوون چونکە حەق شاراوە بوو لێیان و نادیار بوو و گەڕان بەدوای حەقدا، بەڵام جیاوازبوون بەهۆی جەوروستەمی هەندێکیان بەسەر ئەوانیتردا، بەهۆی ئارەزووەکانەوە، ئەمە هۆی جیاوازیو دووبەرەکییان بوو: ئارەزووەکان، حەزکردن لەخۆ دەرخستن، جا ئەوان ناکۆك نەبوون لەبەر نەزانین یان نادیاری و شاراوەیی حەق، ئەمە خۆی لە خۆیدا ئیقامەی حوججەی تێدایە بە سەریانەوە، لەوەی حەقیان بۆ هاتو ئاوڕیان لێ نەدایەوە، بەڵکو شوێنی ئارەزوو و مەبەست و تەماحی خۆیان کەوتن لەم ژیانەدا، جا ئەم ئایەتە زەمی دووبەرەکی تێدایەو پێویستە لەسەرمان لە سەر قورئان کۆببینەوە، هەروەها زەمی ئارەزوو حەزی نەفسەکانی تێدایەو پێویستە لەسەر موسڵمان شوێنکەوتەی حەق بێت، هەرچەندە حەقەکە جیاواز بێت لەگەڵ ئارەزووەکەیدا چونکە ئوممەتەکانی پێشوو: (كُلَّمَا جَاءَهُمْ رَسُولٌ بِمَا لَا تَهْوَىٰ أَنْفُسُهُمْ فَرِيقًا كَذَّبُوا وَفَرِيقًا يَقْتُلُونَ (٧٠) المائدة) واتە: کەچی هەر جارەی یەکێ لەو پەیامبەرانە، بەپێچەوانەی ئارەزووی ئەوان شتێکی بۆ هێنابان دەستەیەك لە پەیامبەرەکانیان بەدرۆزن دادەناو دەستەیەکیشیان هەر بە کوشتن شەهیدیان دەکردن).

جا ئەوان شوێنی پێغەمبەران دەکەون لەوەی لەگەڵ ئارەزووەکاندا دەگونجێ، بەڵام ئەوەی لەگەڵ ئارەزووەکانیاندا نەگونجێ ئەوا یان پێغەمبەرەکەیان دەکوژن و یان بەدرۆیان دەخەنەوە، ئەمە ڕێگاو ڕەوشتی ئوممەتە بەهەلاکەتچوە پێشووەکانە، جا پێویستە لەسەرمان لەسەر کیتابەکەی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کۆ ببینەوەو ئەوەی پێشین لەسەری بوون لەهاوەڵان و شوێنکەوتوان هەرچەندە لەگەڵ ئارەزووەکانماندا نەگونجێ، ئەمە لەبەرژەوەندی ئێمەدایە، شوێنکەوتنی ئارەزووەکانمان زیانی ئێمەی تێدایە، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَلَوِ اتَّبَعَ الْحَقُّ أَهْوَاءَهُمْ

لَفَسَدَتِ السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ) المؤمنون/٧١) **واتـە: ئەگـەر حـەق و ڕاسـتی دوای ئـارەزووی ئـەوان کـەوتبا بـێ گومـان ئێـستا سیـستەمی ئاسمانـەکان و زەوی و هـەر دروستکراوێکی تریش تیایاندایە دەشێواو تێك دەچوو).**

**مەبەست لە:** (فاستثناهم فقال: فهدى الله الذين ءامنوا لما اختلفوا فيه من الحق بإذنه والله يهدي من يشاء إلى صراط مستقيم).

**خـوای گـەورە دەفـەرموێت:** (كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً فَبَعَثَ اللَّهُ النَّبِيِّينَ مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ وَأَنْزَلَ مَعَهُمُ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ فِيمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ وَمَا اخْتَلَفَ فِيهِ إِلَّا الَّذِينَ أُوتُوهُ مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَتْهُمُ الْبَيِّنَاتُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ (٢١٣) البقرة) **واتە: لەسەرەتاوە هەموو خەڵك یەك دەستەو یەك بەرە بوون ئینجا خوا پێغەمبەرانی نارد موژدەدەرین و ترسێنەریش بـن و کتێب و نامـەی حـەق و ڕاستیـشی لەگـەڵ نـاردن تائـەوەی بوویـە کێـشەی نێوانیـان و ناکۆکی و دووبەرەکییان تێیدا هەبوو شـی بکاتـەوە خـۆ هـەر ئەوانـەیان لـەو بەرنامـەو کتێبەدا ناکۆك بوون، کە لەپێشدا کتێبیان پـێ درابوو ئەویش پاش ئـەو هـەموو بەڵگـەو نیـشانە ڕوونانــە بۆیــان هــاتن جیــاوازی و دژایەتییەکەشــیان هــەر لەبــەر ئێرەیــیو حەسادەتی ناوخۆیان بوو).**

**ڕوونـی کـردەوە جیـاوازیو دووبـەرەکییان بـەهۆی جەوروسـتەمو تەعـەدا کردنـی هەنـدێکیان بەسـەر ئـەوانیترداو شـوێنکەوتنی ئارەزوەکانیـان، نـەك لەبـەر نادیـاریو ناڕوونی حەق، بەڵام ئـەوان حـەقیان نـاوێ، ئـەمجار کۆمـەڵێکی لێ دەرهێنـاو فـەرموی:** (فَهَدَى اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا) **ئەوان شوێنکەوتوانی پێغەمبەرانو ئەهلی سوننەو جەماعەن لەم ئوممەتەدا، ئەوانیش ئەهلی حەقن، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کەوا پێویستی بـە ئیمانـە، بـەڵام هیدایەتەکـەی لـەو جێگایـە دایـدەنا کـە شایـستەن ئـەوانیش ئـەهلی ئیمـانن، خۆشویـستوانی حــەقن، جــا خــوای گــەورە هیدایــەتیان دەدا بــەهۆی ئیمــانو**

خۆشەویستییان بۆ حەق، ئەمەش بەڵگەیە هیدایەت هۆکاری خۆی هەیە ئەویش بریتییە لەئیمان و خۆشویستنی حەق و گەڕان بەدوایدا.

مەبەست لەو فەرموودەیەی کە دەفەرموێت: (لا تزال عصابة من أمتي ظاهرين على الحق لا يضرهم من خذلهم حتى يأتي أمر الله وهم ظاهرون)[٢٤٤].

ئەم فەرموودەیە بە چەند ڕیوایەتێکەوە مەشهوور بوە، لە ریوایەتێکدا هاتوە: (لاتزال عصابة)[٢٤٥] کە ئەویش جەماعەیە، لە ریوایەتێکدا هاتوە: (طائفة)، (على الحق ظاهرين) واتە: سەرکەوتوون بەسەر جگە لەخۆیاندا، (لايضرهم من خذلهم حتى يأتي أمر الله تبارك وتعالى) لەکۆتایی زەماندا، واتە لەنزیکی هەستانی قیامەت کاتێ خوای گەورە گیانی ئیمانداران دەکێشێ و هیچ ئیمانداریك لەسەر زەویدا نامێنێ، هیچ کەسێك نامێنێ تەنها کافران و موشریکان نەبێ، ئەمجار قیامەت بەسەر ئەواندا هەڵدەستێ، جا قیامەت بەسەر ئیماندارەندا هەڵناسێت بەڵکو بەسەر کافراندا هەڵدەستێ، پێغەمبەری خوا (ﷺ)دەفەرموێت: (إن من شرار الناس من تدركهم الساعة وهم أحياء،والذين ينون المساجد على القبور)[٢٤٦] واتە: لە خراپترین خەڵکی ئەوانەن کە قیامەت هەڵدەستێ و هێشتا ئەوان زیندوون و ئەوانەی لەسەر گۆڕەکان مزگەوت دروست دەکەن) ئەوانە خراپترینی خەڵکن _ پەنا بەخوا_ جا قیامەت بەسەر ئیمانداراندا هەڵناسێت بەڵکو بەسەر کافرو موشریکاندا هەڵدەستێ.

---

٢٤٤ / سبق تخريجه .

٢٤٥ / رواه مسلم (١٩٢٤) .

٢٤٦ / رواه البخاري معلقا ووصله معمر واحمد وابن ابي شيبة والبزار والطبراني وابن خزيمة وابن حبان .

**﴿١٠٤﴾ نوسەر دەڵێت: (واعلم – رحمك الله - أن العلم ليس بكثـرة الروايـة والكتب وإنما العالم من اتبع العلم والسنن وإن كان قليل العلم والكتـب ومـن خالف الكتاب والسنة فهو صاحب بدعة وإن كان كثير العلم والكتب).**

واته: بزانه _ڕەحمەتی خوات لێ بێت_ کەوا عیلم بـەزۆری کتێـب و ڕیوایـەت نییـە، بەڵکو زانـا ئـەو کەسـەیە شـوێنی عـیلم و سـوننەتەکان دەکـەوێت، هەرچـەندە عـیلم و کتێبی کەم بێت، هەرکەسێك لەگەڵ کیتاب و سوننەدا ناکۆك بوو ئەوا خاوەنی بیدعەیە هەرچەندە کتێب و عیلمی زۆر بێ.

ڕاڤە:

مەبەست لە: (واعلم – رحمك الله - أن العلم ليس بكثرة الرواية والكتب).

عیلم بەزۆری زانیاریو کتێبو کتێـب خوێندنـەوە نییـە، بـەڵکو عـیلم بەتێگەیـشتنو شوێنکەوتنو کارکردنە هەرچەندە عیلمەکەی کەم بێت، جا کـەمی عـیلمو لەگـەڵ کـاری چاکەو تێگەیشتن لەدینی خوادا زۆرە، عیلمـی زۆر بـێ کـردەوەو بـێ شـوێنکەوتن هـیچ سوودی نییە، جولەکـە زانایـان تێدایـە (ئـەحبار)یـان تێـدا بـوە لەگـەڵ ئەوەشـدا هـیچ سوودیان لەعیلمەکەیان نـەبینی و بوونـە ئەوانـەی خـوای گـەورە غـەزەبی لێ گرتـوون، چونکە سەرپێچی خوایـان کـرد بەچـاوڕوونی، جـا مەبەسـتەکە زۆری عـیلم نییـە، زۆری کتێب خوێندنەوە نییە بەڵکو مەبەست کارو کردەوەیە، ئەمە مەبەستی عیلمە، ئەمـەش ڕێگای ئەوانەیە نیعمەتیان بەسەردا ڕژاوە، هەروەکو خوای گـەورە دەفـەرموێت: (اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ (٦) صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ) ئەوانیش: ئەهلی عیلمو کـردەوەن (غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ) ئـەوانیش: ئـەهلی عـیلمن بـە بـێ کـردەوە (وَلَا الضَّالِّينَ (٧) الفاتحة) ئەوانەش ئەهلی کردەوەن بە بـێ عـیلم، جـا عـیلم هـیچ سـوودی نییـە بـەبێ کـردەوەو

کردەوەش سوودی نییە بەبێ عیلم، بۆیە دەبێ هەردوو پێکەوە بن، عیلم و کردەوە، هەر ئەمەش ڕێگای ئەوانەیە نیعمەتیان بەسەردا ڕژاوە.

مەبەست لە: (وإنما العالم من اتبع العلم والسنن وإن كان قليل العلم والكتب).

زانا ئەو کەسەیە شوێنی قورئانو سوننە کەوتبێ هەر چەندە خاوەنی عیلمێکی کەم بێت، بە جیاواز لەگەڵ ئەوەی خاوەنی عیلمی زۆرە یان خاوەنی کتێبی زۆرو جۆربەجۆر بێ بەڵام کردەوەی نەبێ ئەوا ئەم کەسە هیچ سوودی تیادا نییە.

عیلم ئەوەیە زۆر دەبێ و پاك دەبێتەوەو گەشە دەکاتو کردەوەی چاکەی لە گەڵدا بێت، بەڵام عیلمێك کردەوەی لە گەڵدا نەبێت ئەوا هیچ بەرەکەتی تێدا نییەو سەقامگیر نابێ، زاناکان دوو بەشن:_

یەکەم: زانایان تەنها بەزمان زانان.

دووەم: زانایان بەزمانو بەدڵ زانان، ئەوانیش ئەوانەن لەخوا دەترسن، (إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ) فاطر/٢٨) واتە: بە ڕاستی لە بەندەکانی خوادا هەر زاناکانن لە خوا ئەترسن و سەری نەوازشی بۆ دائەنوێنن چونکە هەر ئەوان دەزانن ئەو زاتەیە چ خاوەن دەسەڵاتێکە).

جا (عیلمو ترس) ئەو دووانە عیلمی تەواون، بەڵام عیلمی زمان بەبێ ترس ئەوە عیلمی دووڕووەکانە، داوا لەخوا دەکەین بمانپارێزێ.

مەبەست لە: (ومن خالف الكتاب والسنة فهو صاحب بدعة).

چونکە بیدعە: ئەوەیە بەندەیەك لەخوا خۆی نزیك بکاتەوە بە شتێك بەبێ هیچ بەڵگەیەك لەکیتابو سوننەتدا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه فهو رد) واتە کارەکەی بۆی دەگەڕدرێتەوە، لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە:

(من عمل عملا ليس عليه أمرنا فهو رد)[٢٤٧] جا ئەو کەسەی بیدعەیەك دادەهێنێ و ئەو کەسەی کاری پێ دەکات ئەوا کارەکەی بۆخۆی دەگەردرێتەوە چونکە ئەو کارێك دەکات کە خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی لەشەرعدا دایان نەرێژاوە، جا ئەو کارە خوای گەورە وەری ناگرێ، بۆیە زانایان دەربارەی کردەوە فەرموویانە: کردەوەکان وەرناگیرێن ئەگەر دوو مەرجی تێدا نەبێت:-

مەرجی یەکەم: نیاز پاکی بۆ خوا دوور کەوتنەوە لە شیرك (الاخلاص).

مەرجی دووەم: شوێنکەوتنی پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش بەوازهێنان لەبیدعەو داهێنراوەکان دەبێ (المتابعة).

جا هەر کردەوەیەك شیرکی تێدا بێت پووچەڵە (باطل)ـەو هەر کارێك لەسەر بیدعە بنیات نرابێ ئەویش (باطل)ـە، کارو کردەکان دروستو تەواو نین ئیللا دەبێ: تەنها لەبەر خوای گەورەبێ و لەسەر سوننەتی پێغەمبەری خوا بێ (ﷺ).

مەبەست لە: (وإن كان كثير العلم والكتب).

چونکە ئەو کەسێکی بیدعەچییە ئەوا سوود لەعیلمەکەی نابینێ، هەرچەندە کەسێکی خاوەن عیلمی زۆربێ ئەگەر هاتوو شوێنکەوتەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەبێ بەڵکو بە قسەی فلان و فلان کار بکات، ئەوا عیلمەکەی هیچ سوودێکی نییەو سوود لەکتێبەکانیشی نابینرێ، خوای گەورە دەربارەی جولەکە دەفەرموێت: (مَثَلُ الَّذِينَ حُمِّلُوا التَّوْرَاةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا كَمَثَلِ الْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًا) الجمعة/٥).

ئەو کەسەی کتێبخانەیەکی زەبەلاحی هەیەو لەکاتێکدا وازی لەکردەوە هێناوە یان بیدعەچییە، ئەوە وەکو گوێدرێژێکە، هەستاوە بەهەڵگرتنی کتێب بەڵام سوودی لێ نابینێ.

---

٢٤٧ / صحيح : سبق تخريجه .

**﴿١٠٥﴾ نوسەر دەڵێت: (واعلم —رحمك الله- أن من قال في دين الله برأيه وقياسه وتأويله من غير حجة من السنة والجماعة فقد قال على الله ما لا يعلم ومن قال على الله مالا يعلم فهو من المتكلفين)**

**واتە: بزانە_ ڕەحمەتی خوات لێ بێ _ هەر کەسێ لەدینی خوادا بەبۆچوون وقیاس‌و تەئویلی خۆی قسەی کرد بەبێ حوججە لەسوننەو جەماعەدا، ئەوا بەناوی خواوە قسەی کردووە بەبێ عیلم و هەر کەسێ بەناوی خواوە قسە بکات بەبێ عیلم ئەوە یەکێکە لە زۆر لە خۆکردووەکان.**

**ڕاڤە:**

**مەبەست لە:** (واعلم —رحمك الله -).

**هەر ڕستەیەك بە** (اعلم) **دەست پێ بکات ئەوە لەبەر وریاکردنەوەیە چونکە گرنگە.**

**مەبەست لە:** (واعلم —رحمك الله - أن من قال في دين الله برأيه وقياسه وتأويله من غير حجة من السنة والجماعة فقد قال على الله ما لا يعلم).

**جا دین بە ڕاو بۆچوون نییە، بەڵکو بە شوێنکەوتنە، دین بە بۆچوون و قیاس نییە، مەبەست لە قیاس: قیاسی پووچەڵە نەك قیاسی ڕاست و دروست، دین بە بۆچوونەکان‌و قیاسەکان‌و بیرۆکەکان نییە، بەڵکو بە ئەو (وەحی)یەیە دابەزیوەتە سەر پێغەمبەری نێردراو (ﷺ)، بە ڕاستی ئەوە دینە.**

**مەبەست لە:** (وقياسه).

**مەبەستی قیاسێکی پووچەڵە بەڵام قیاسی ڕاست‌و دروست کە لەسەر عیللە بنیات نراوە، ئەوە یەکێکە لەبنەماکانی بەڵگەکان (اصول الادلة)، چونکە بەڵگەکان بریتین لە**

کیتاب‌و سوننەو ئیجماع‌و قیاسی ڕاست‌و دروستی بنیات نراو لەسەر عیللەیەکی تەواو دەقی لەسەر هاتووە یان (المستنبطة)، چونکە عیللە دوو جۆرە:

یەکەم/ عیللەیەکی (منصوص) (دەقێکی شەرعی لەسەر هاتوە).

دووەم/عیللەیەکی (مستنبطة) (لە دەقێکی شەرعی دەرهێنراوە)

مەبەست لە: (وتأويله).

مەبەست لە تەئویل: بریتییە لە لادانی مانای (لفظ)ێك لەڕواڵەتەکەی خۆی بەبێ بەڵگە، ئەمە تەئویلێکی نەویستراوە.

مەبەست لە: (ومن قال على الله مالا يعلم فهو من المتكلفين).

(التكلف) بریتییە لەقسەکردن لەدیندا بەبێ بەڵگە.

**﴿١٠٦﴾ نوسەر دەڵێت: (والحق ما جاء من عند الله عز و جل والسنة: سنة رسول الله (ﷺ) والجماعة ما اجتمع عليه أصحاب رسول الله (ﷺ) في خلافة أبي بكر وعمر وعثمان).**

**واتە: حەقیش ئەوەیە لەلایەن خوداوە هاتبێ، سوننەتیش: سوننەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، جەماعە: ئەوەیە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەری کۆبوونەوە لەخیلافەتی ئەبو بەکرو عومەرو عوسماندا.**

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (والحق ما جاء من عند الله عز و جل والسنة: سنة رسول الله (ﷺ)).

**ئەوەی لەلایەن خوداوە هاتووە لەقورئاندا، ئەوەی لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتووە لەسوننەتدا، هەردوو وەحین لەلایەن خوداوە، قورئان وەحییە لەلایەن خوداوە، سوننەتیش وەحییە لەلایەن خوداوە، هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:** (وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى (٣) إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى (٤) النجم) **قورئان پێی دەگوترێ وەحی یەکەم، سوننەت وەحی دووەم لەپاش قورئان، هەر ئەویش تەفسیری قورئان دەکاتو ڕوونی دەکاتەوە، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی:** (وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ (٤٤) النحل) **واتە: وا بۆ تۆش ئەم قورئانەمان دابەزاندە خوارێ بۆ ئەوەی بۆ ئەو خەڵکە ڕوون بکەیتەوە ئەوەی بۆیان دابەزێنراوە).**

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) قورئان ڕوون دەکاتەوە بەسوننەت و کردەوەو قسەکانی.**

**سوننەت لەزمانەوانیدا: واتە: ڕێگا، مەبەست لێرەدا ئەوەی لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) هاتووە لەقسە یان کردەوە یان تەقریر، ئەمە مانای سوننەتە لای فەرموودەناسان.**

بەلای فەقیهەکانەوە، سوننەت: ئەو کارە (مستحب)ەیە کە ئەو کەسەی ئەنجامی دەدات پاداشت دەدرێتەوەو ئەوەی وازی لێ بهێنێ سزا نادرێت.

مەبەست لە: (والجماعة ما اجتمع عليه أصحاب رسول الله (ﷺ) في خلافة أبي بكر وعمر وعثمان).

جەماعە لەدیندا: ئەوەیە ئەهلی حەق لەسەری کۆبوونەتەوە.

یەکەمین جەماعەو پێشینی جەماعە: هاوەڵانی پێغەمبەری خودایە(ﷺ)، ئەوانیش باشترین سەدە بوون، ئەوەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەری کۆبوونەوە ئەوە جەماعەیە، لە پاش ئەوان ئەوەی لەسەر حەق بێت ئەوە جەماعەیە، جا ئەو کەسەی لەسەر حەق بێت پێی دەگوترێت: جەماعە هەرچەندە تەنها یەك کەسیش بێت، هەرچەندە هەموو خەڵکی لەگەل ئەودا جیاوازو ناکۆك بن، چونکە مەبەست لە جەماعە زۆری ژمارە نییە، بەڵکو مەبەست لە جەماعە ئەوانەن لەسەر حەقن، هەرچەندە کۆمەڵێکی کەم بن.

**﴿١٠٧﴾ نوسەر دەڵێت: (ومن اقتصر على سنة رسول الله (ﷺ) وما كان عليه أصحابه والجماعة فلج على أهل البدعة كلها واستراح بدنه وسلم له دينه إن شاء الله لأن رسول الله (ﷺ) قال: (ستفترق أمتي)[248] وبين لنا رسول الله (ﷺ)الناجي منها فقال: (ما كنت أنا عليه اليوم وأصحابي)٢٤٩ فهذا هو الشفاء والبيان والأمر الواضح والمنار المستنير وقال رسول الله (ﷺ): (إياكم والتعمق وإياكم والتنطع وعليكم بدينكم العتيق).**

**واتە: هەر کەسێ دەستی گرت بەسوننەتەکەی پێغەمبەری خوداوەو (ﷺ) ئەوەی هاوەڵانو جەماعە لەسەری بوون ئەوا زاڵ دەبێتە سەر هەموو ئەهلی بیدعەدا، جەستەی ئاسوودە دەبێو دینەکەی سەلامەت دەبێ _إن شاء الله_ چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:** (ستفترق امتی) **واتە: ئوممەتەکەم جیاوازو ناکۆك دەبن) پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆمەڵە ڕزگاربووەکەی بۆ ڕوون کردووینەتەوەو فەرمووی: (ئەوەی ئەمڕۆ منو هاوەڵانی لەسەرە) جا ئەمە چارەسەرو ڕوونکردنەوەی کارە ڕۆشنەکەو مەنارە ڕوناکەکەیە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ:** (إياكم والتعمق وإياكم والتنطع وعليكم بدينكم العتيق).

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (ومن اقتصر على سنة رسول الله (ﷺ) وما كان عليه أصحابه والجماعة فلج على أهل البدعة كلها).

**هەر کەسێ دامەزراو بوو لەسەر ئەم بنەما مەزنانە: لەسەر قورئان و لەسەر سوننەتو لەسەر ئەوەی کۆمەڵی موسڵمانان لەسەر بوون ئەویش ئیجماعە لەسەر**

---

٢٤٨ / سبق تخريجه .

٢٤٩ / سبق تخريجه .

حەق، ئەوا زاڵ دەبێ بەسەر ئەهلی (باطل)دا، واتە: سەردەکەوێت بەسەریاندا و حەق لای ئەم دەبێ لای ئەوان نابێ هەرچەندە ژمارەیان زۆر بێ.

**مەبەست لە:** (واستراح بدنه وسلم له دينه إن شاء الله).

**هەر کەسێ لەسەر کیتاب و سوننەو جەماعەتی موسڵمانان بێت، دین و جەستەشی پارێزراو دەبێ هەر چەندە تەنها یەك کەسیش بێت، هەروەها سەردەکەوێ بەسەر ئەهلی (باطل)دا بەهۆی بەڵگەو حوججەکانییەوە، چونکە ئەوان هیچ شتێکیان نییە تەنها گومان و ساختە نەبێ.**

**مەبەست لە:** (لأن رسول الله (ﷺ) قال: (ستفترق أمتي)).

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵێکی داوە کە مانای ئاگادار کردنەوەیە، هەواڵ دەربارەی ئایندە دەدات و ئەوەی ڕوو دەدا لەپێناوی بەرژەوەندی موسڵمانانو لەبەر ئەوەی لەسەر چاوڕوونی بن، هەواڵی داوە جیاوازیو دووبەرەکی ڕوو دەدات، تاکو ئەگەر ئەوە ڕوویدا لێی چاوڕوون بنو ئاگاداری خۆیان بنو هەڵنەخەڵەتێن بەزۆری ئەوانەی جیاوازو ناکۆکن، زاهید نەبن بەرانبەر بە حەق، ئەمەش لە ئامۆژگاری پێغەمبەری خوایە (ﷺ) بۆ ئوممەتەکەی، لەفەرموودەی (العرباض)ی کوڕی (سارية) فەرمووی:** (صلى بنا رسول الله (ﷺ) صلاة الصبح، فوعظنا موعظة بليغة ذرفت منها العيون، ووجلت منها القلوب، فقلنا: يا رسول الله (ﷺ) كأنها موعظة مودع فأوصنا؟ قال: أوصيكم بتقوى الله و السمع و الطاعة، و إن تأمر عليكم عبدٌ، فإنه من يعش منكم فسيرى اختلافا كثيرا، فعليكم بسنتي و سنة الخلفاء الراشدين من بعدي، فتمسكوا بها، و عضوا عليها بالنواجذ، و إياكم و محدثات الأمور، فإن كل محدثة بدعة، و كل بدعة ضلالة)[٢٥٠] **واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی بەیان بۆ کردین ئەمجار ئامۆژگارییەکی کردین چاوەکانی**

---

٢٥٠ / سبق تخريجه .

پێ فرمێسکاوی بوون و دڵەکانی پـێ راچڵەکین، وتمـان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دەڵێی ئەمە دوا ئامۆژگارییە بۆیە ئامۆژگاریمان بکە. ئـەویش فـەرمووی: ئامۆژگاریتـان دەکەم بـەوەی لـە خـوا بترسـن و تـەقوای خواتـان بێـت و گوێبیـست و گوێڕایـەڵ بـن، هەرچەندە ئەگەر بەندەیەك بوو بە ئەمیرتان، چونکە هەرکەس لـەئێوە _لـەپاش مـن_ بـژێت ئـەوا جیـاوازی و دووبـەرەکی زۆر دەبینـێ، جـا ئامۆژگاریتـان دەکـەم دەسـت بەسوننەت رێگاکەی منەوە بگـرن و دەسـت بـە سـوننەت و رێگـای جێنـشینە رێنمـویی کراوەکانەوە بگرن، توند دەستی پێوە بگرن، بـە ددانـەکانتان تونـد بیگـرن، ئاگـاداری کارە نوێیەکان بن، چونکە هەموو داهێنراوێك بیدعەیەو هەموو بیدعەیەك گومڕاییەك).

جا هەواڵی پێدان کە جیاوازییەکی زۆر ڕوودەدات لەپاش خـۆی، ئـەمجار ئامۆژگـاری کردن لەکاتی ڕوودانی دووبەرەکیدا دەست بەسوننەتی پێغەمبەرەوە (ﷺ) بگرن، هەر ئەوە خاوەنەکـەی دەربـاز دەکـات لـە فیتنـەکان، پـارێزەرە لـەجیاوازی و گومڕابـوون، هەورەها لەفەرموودەیەکی تردا هەواڵی پێداوین کەوا ئەم ئوممەتە دەبێتە حەفتاو سـێ کۆمەڵەوەو هەمووی لەئاگردایە تەنها یەکێك نەبێ فـەرموویان: ئـەو کۆمەڵـە ڕزگـاربووە کێ یە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ فەرمووی: (ما كان على مثل ما أنا عليه وأصحابي)[٢٥١] ئەمەیە هۆکاری دەربازبوون لە گومڕابوون لەکاتی جیاوازیـدا، لـە ڕۆژی قیامەتیـشدا لـە لەئاگر دەربازی دەبێ، ئەویش ئەوانەن کە لەسەر ئـەو ڕێگایـەن کـە پێغەمبـەری خـواو (ﷺ) هاوەڵە بەڕێزەکانی لەسەرە، ئەمە ڕزگاربوونە لەفیتنـەکانو جیاوازییـەکان، جـا هەفتاو دوو کۆمەڵەکـە هـەموویان لـەئاگردان ئـیللا ئـەو کەسـە نـەبێ دەسـتی گرتـووە بەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەری بووە، لە چوونە ناو ئـاگرەوە ئـەوان جیـاوازن، هەیانە کوفر دەکات لەگـەڵ کافرانـدا دەچـێتە ئـاگرەوە بەهـەتا هـەتایی دەمێنێتـەوە،

---

٢٥١ / سبق تخريجه .

هەیانە (فسق) دەکات و لەگەڵ سەرپێچی کاراندا دەچێتە ئاگرەوە تێیدا سزا دەدرێ‌و ئەمجار دەچێتە بەهەشتەوە لەپاش ئەوە، بوونی هەر هەموویان لەئاگردا بەڵگەی ئەوە نییە هەموویان کافرن بەڵکو بەڵگەی هەڕەشەی توندە لە جیابوونەوە لە سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، هەیانە کوفرە، هەیانە گومڕاییە و تیایاندا هەیە سەرپێچییە، هەرکەسەو بەپێی خۆی.

مەبەست لە: (فهذا هو الشفاء والبيان والأمر الواضح).

پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) وازی لێ نەهێناوین بەبێ ئەوەی ئایندەمان بۆ ڕوون بکاتەوە، بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایندەی بۆ ڕوون کردینەوە کەخوای گەورە بۆی ئاشکرا کردبوو، بۆ ئەوەی لەسەر چاوڕوونی بین، ئەمەش لەئامۆژگاری و بەزەیی ئەوە، لەوەی ئێمە لەکاتی ڕوودانی ئارەزوو و دووبەرەکیدا دەست بەحەقەوە بگرین و ئارامی لەسەر بگرین و لەسەری دامەزراو ببین، هەرگیز دەربازبوون نییە ئیللا بەوە نەبێ.

مەبەست لە: (والمنار المستنير).

لەعادەتی ئەواندا شتێکیان لەسەر جێگایەکی بەرز دادەناو ئاگریان لەسەری دەکردەوە بۆ ئەوەی موسافیرەکان ڕێنمویی بکات، ئەمەش لەدەریاکاندا دادەنرا بۆ ئەوەی کەشتییەکان ڕێنمویی بکات، مەنارەی ئەم ئیسلامە کیتاب و سوننەیە.

جا هەرکەسێ لەسەر ئەم مەنارە بڕوات ئەوا ڕزگاری دەبێ و هەر کەسێ وازی لەم مەنارەیە هێنا ئەوا بەهەلاکەتدا دەچێت جا یان لە وشکانیدا یان لەدەریادا بێت چونکە لە ڕێگا ئاڵۆزو پێچاوپێچەکاندایە، ئەمەش نمونەیەکی ڕوونە بۆ دەستگرتن بەحەقەوە.

مەبەست لە: (وقال رسول الله (ﷺ): (إياكم والتعمق وإياكم والتنطع)).

(التعمق والتنطع) بریتییە لە: زیادەڕەوی کردنو توندڕەوی کردن لەدیندا، وەکو ئەو کەسەی دەڵێت: من هەردەم بەڕۆژوو دەبمو نایشکێنم، ئەو کەسەی دەڵێت:- من هەموو شەوێ شەو نوێژ دەکەم و ناخەوم، ئەو کەسەی دەڵێت: من هەرگیز ژن ناهێنم بەگەنجێتی دەمێنمەوە، ئەمە توندڕەوی وچوونە قوڵاییە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕەددی کردەوەو توڕەبوو لەسەر ئەوەی ووتیان، ڕوونی کردەوە ئەو بە ناوەندی بوون هاتووە، نوێژ دەکاتو دەخەوێ، ڕۆژوو دەگرێتو دەیشکێنیۆ ژنیش دەهێنێ، جا هەرکەسێ حەز لەم سوننەتە نەکات ئەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێی بەرییە[٢٥٢]، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ)بەراشکاوی خۆی لە (المتنطعين)و زیادڕەوان لەپەرستن و توندڕەوانــدا دەربــڕی و فــەرمانی بەناوەنــدی بــوون کــردووە، نمونــەی هێنایــەوە بەسوننەتەکەی بەوەی کە لەسەریەتی.

مەبەست لە: (وعليكم بدينكم العتيق).

العتيق: واتە کۆن (دێرین) واتە ئەو دینەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەری بووە، بەوە واز لەداهێنراوەکان بهێنن، ئەو ڕێگایە بگرنە بەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێمەی لەسەر جێ هێشتووە، ئەویش دینە کۆنەکەیە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هێناویەتی، واز لەداهێنراوەکان و ئیجتیهادە هەڵەکان بهێنن کە خەڵکی دایدەهێنن هەرچەندە وادەزانن زیادەیە لەچاکەدا، ئەوە کارێکی زیاترەو ئەوە..ئەوە...، جا لەبەر ئەوەی جیاوازە لەگەڵ سوننەتەکەی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) ئەوا هەرگیز هیچ خەیرێکی تێدا نییە، ئەمە مانای (العتيق)ـە، واتە ئەوەی پێغەمبەرو (ﷺ) هاوەڵانی لەسەر بووەو ئەوەی کۆنەکان لەسەری بوون لە هاوەڵانو شوێنکەوتووانو شوێنکەوتەی شوێنکەوتووانو

---

٢٥٢ / تەماشای البخاري (٤٧٧٦) و مسلم (١٤٠١) بکە .

سێ سەدە چاکەکەو واز بهێنن لە داهێنراوەکان و شتە نوێیەکان کە خاوەنی وانیشانی دەدات چاکەیە، لەکاتێکدا چاکەو خەیر نییە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت:- (إنى تارك فيكم ما إن تمسكتم به لن تضلوا بعدي: كتاب الله وسنتي)[٢٥٣] واتە: (من لەناوتاندا بەجێم هێشتوە ئەگەر دەستی پێوە بگرن ئەوا هەرگیز گومڕا نابن لەپاش من:- کیتابەکەی خواو سوننەتەکەی من).

جا هیچ کردەوەیەك یان قسەیەك وەرمەگرە تاکو بەراوردی دەکەیت لەگەڵ کیتاب و سوننەتدا جا ئەگەر لەگەڵ کیتاب و سوننەدا گونجا ئەوا وەری بگرە و ئەگەر نەگونجا لەگەڵ کیتاب و سوننەدا ئەوا وازی لێ بهێنە.

---

٢٥٣ / سبق تخريجه .

**﴿١٠٨﴾ نوسەر دەڵێت: (واعلم أن الدين العتيق: ما كان من وفاة رسول الله (ﷺ) إلى قتل عثمان بن عفان رضي الله عنه وكان قتله أول الفرقة وأول الاختلاف فتحاربت الأمة وتفرقت واتبعت الطمع والأهواء والميل إلى الدنيا فليس لأحد رخصة في شيء أحدثه مما لم يكن عليه أصحاب رسول الله (ﷺ) أو يكون يدعو إلى شيء أحدثه من قبله من أهل البدع فهو كمن أحدثه فمن زعم ذلك أو قال به فقد رد السنة وخالف الحق والجماعة وأباح البدع وهو أضر على هذه الأمة من إبليس).**

واتە: بزانە دینە دێرینەکە: ئەو دینەیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەری وەفاتی کردو تاکو کوشتنی (عوسمانی کوڕی عەففان)و کوشتنی ئەو یەکەم دووبەرەکیو یەکەم جیاوازی بوو، جا ئەم ئوممەتە جەنگیان بەرپاکرد لەگەڵ یەکتردا، جیاوازبوون و شوێنی تەماح و ئارەزوو کەوتن و لادان بەرەو لای دونیا، جا هیچ کەسێك ئیزنی پێ نەدراوە لەهەرشتێکدا دایهێنابێ لەوەی هاوەڵان لەسەری نەبوون، یان بانگەواز بۆ داهێنراوێك دەکات لەپێش خۆی دایانهێنابێ لە بیدعەکاران، ئەوە وەکو ئەو کەسەیە خۆی دایهێنابێ، جا هەرکەسێ باوەڕی وابێ یان ئەوە بڵێت ئەوە سوننەتی ڕەدکردوەتەوە، لەگەڵ حەقو جەماعەدا ناکۆك بووەو بیدعەی حەڵاڵ کردوە جا ئەو کەسە زیانبەخش ترە لەسەر ئەم ئوممەتە لە ئیبلیس)

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (واعلم أن الدين العتيق: ما كان من وفاة رسول الله (ﷺ) إلى قتل عثمان بن عفان رضي الله عنه).

**واتە: لەو جەماعەتە پوختو پاکە جیاوازی و دووبەرەکی تێدا پەیدا نەبووە ئەو جەماعەتەیە لەسەردەمی سێ خەلیفەکەدا بوو: ئەبوبەکر وعومەرو عوسمان، چونکە**

لەسەردەمی ئەو سێ خەلیفەدا جیاوازی و دووبەرەکی نەبوو، کۆمەڵی موسڵمانان یەک جەماعەت بوون و لەسەر حەق کۆک بوون، کاتێ عوسمان کوژرا چیتر – بەکوشتنی ئەو – دەرگای دووبەرەکی و خراپەکاری و فیتنە کرایەوە.

مەبەست لە: (وكان قتله أول الفرقة).

یەکەم دووبەرەکی بەهۆی کوشتنی عوسمانەوە ڕوویدا، کاتێ ئەو کوژرا ئەوا ئەمن و ئاسایش تێکچوو، جەماعە پەرت بوون، چەندین کۆمەڵی گومڕا پەیدا بوون و ئەوەی ڕوویدا ڕوویدا، ئەوەی لە مێژوودا نوسراوە، بەلاّم لەگەڵ هەر هەموو ئەمانەشدا _سوپاس بۆ خوا_ دین پارێزراوە، هەرکەسێ حەقی بوێت و خەیری بوێت ئەوا تەنها لەسەریەتی بگەڕێتەوە بۆ کیتاب و سوننەو ئەوەی جەماعەی موسڵمانانی لەسەرە ئەوا _لەوێدا_ حەق بەڕوونی دەدۆزێتەوە، هەرچەندە خراپەکاری و جیاوازیو فیتنەو دووبەرەکی زۆر بێت، هۆی کوشتنی عوسمان _خەلیفەی راشدی دادپەروەر _ذوالنورین_: کابرایەکی جولەکە لەجولەکەکانی یەمەن پێیان دەگووت: (عبدالله ی کوڕی سبأ) نازناوی (ابن السودا) بوو، چونکە دایکی حەبەشییە، لەبەر خەڵەتاندن ئیسلام بوونی خۆی دەرخست، ئەمجار هات بۆ مەدینە، پاشان لەناو خەڵکیدا جوێندان بە عوسمانو کەمکردنەوەی عوسمانی بڵاو دەکردەوە، بەو کارەی هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی موسڵمانانی دەویستو پەرتبوونی موسڵمانانی دەویست، ئاشکراشە بانگەوازکارانی گومڕایی خەڵکانێك دەدۆزنەوە شوێنی ئەوان بکەونو بڕۆن بۆ لایانو گوێیان لێ بگرن، ئەمەش لەهەموو کات و ساتێکدا هەیە، بانگەوازکارانی گومڕایی زۆر دەبینین نەفامان گوێیان بۆ شل دەکەن و شوێنی هەواڵەکانی ئەوان دەکەون هەروەکو خوای گەورە فەرموویەتی: (وَلِتَصْغَى إِلَيْهِ أَفْئِدَةُ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ وَلِيَرْضَوْهُ وَلِيَقْتَرِفُوا مَا هُمْ مُقْتَرِفُونَ (١١٣) الانعام) واتە: دەبا ئیتر ئەوانەی وا بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نییە هەردڵی بدەنێو گوێی بۆ راگرن و قسەکەیان پەسەند بکەن و پێی رازی بن و هەر

تـاوانێکیش ئەکـەن بـا بیکـەن چـونکە تـەنها ئـەو کەودەنانـە دوایـان دەکـەون و پاشـە ڕۆژیشیان هەر لای خۆمانە).

ئەو نەفامانەی لە دەوری (ابن سبأ) کۆبوونەوە وایان لێ هات جوێنیان بـە عوسمـان دەدا، ئەمجار لێی ئاگادار بوونەوە بۆیـە ئـەویش لەمەدینـەوە هـەڵات بـۆ میـسر، لـەوێ کۆمـەڵێکی دۆزییـەوە، ئـەمجار ڕۆیـشت بـۆ جگـە لەمیـسر و لەوێـدا کۆمـەڵێکی تـری دۆزییەوە، کۆمەڵێکی خراپەکار لەدەوری کۆبوونەوە، ئـەمجار هـاتن و ئابڵووقـەی مـاڵی عوسمانیاندا، بە بیانووی ئەوەی ئەوان دەیانەوێ لەگەڵ عوسماندا گفـتوگۆو تێـڕوانین بکـەن، بگەڕێنـەوە بـۆ لای عوسمـان لەچـەند کاروبارێکـدا، ئەمـە ئـەوە بـوو کـە دەریاندەخست، ئەوان دەیانەوێت لە یەکتر تێبگەن، جا هاوەڵان شەڕیان لەگەڵ نەکرد، چونکە ئەوانە دەیانەوێ تەنها بگەڕێنەوە بۆ لای عوسمان، کاتێ شەو بەسەردا هـات _ پەنا بەخوا_ هێرشیان کردە سەر عوسمـان لەماڵەکەیداو لـەکۆتایی شـەودا کوشـتیان، لەکاتێکدا خەڵکی خەوتوون و لە حەجدا بوون و زۆربەی هاوەڵان لەمەککە بـوون، ئەمـە بوو پلانیان بۆ دانـابوو، بۆیـە ئـەویان کوشـت و سـتەمیان لێکـرد، لـەو کاتـەوە فیتنـەو دووبەرەکی و جیاوازی و کوشتار لەنێوان موسڵماناندا ڕوویدا و تاکو ئێـستا موسـڵمانان بەهۆی ئەوەوە دەناڵێنن.

مەبەسـت لـە: (فليس لأحد رخصة في شيء أحدثه مما لم يكن عليه أصحاب رسول الله (ﷺ).

ئەمە بنەمایە (ڕێسایە): ئێمە لـەکاتی دووبەرەکیـدا دەگەڕێینـەوە بـۆ سـەر ئـەوەی پێغەمبەرو (ﷺ) هاوەڵانی لەسەر بوون، هـەروەکو پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی کاتێ پرسیاری لێ کرا: کۆمەڵی ڕزگـابوو کـێن؟ فـەرمووی (من كان على ما أنا عليه اليوم وأصحابي) دەگەڕێنەوە بۆ ئەم بنەمایە.

**مەبەست لە:** (أو يكون يدعو إلى شيء أحدثه من قبله من أهل البدع فهو كمن أحدثه).

**هەر کەسێ کار بە بیدعە بکات وەکو ئەو کەسەیە بیدعەکەی داهێناوە، هەروەکو فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەلالەتی بۆ دەکات:** (من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه فهو رد) **لە ریوایەتێکی تردا هاتوە:** (من عمل عملا ليس عليه أمرنا فهو رد) **جا هەر کەسێ کار بە بیدعە بکات ئەوە (مبتدع)ە، هەرچەندە ئەو کەسەی دایهێناوە کەسێکی تر بێت.**

**مەبەست لە:** (فمن زعم ذلك أو قال به فقد رد السنة وخالف الحق والجماعة وأباح البدع وهو أضر على هذه الأمة من إبليس).

**ئەو کەسەی ڕەواج بەبیدعە دەدات و دوور دەکەوێتەوە لەسوننەتەکان ئەوە زەرەری زۆرترە لەسەر ئەم ئوممەتە لە ئیبلیس، چونکە خەڵکی دەزانن ئیبلیس دوژمنە، خوای گەورە ئێمەی لێ ئاگادار کردووەتەوە، بەڵام ئەمە زۆربەی خەڵکی نازانن دوژمنە، چونکە خۆی بە ئیسلام و عیلمەوە پەردەپۆش کردووە، خۆی بەخەیرو چاکە دەردەخات، جا ئەوە زیان بەخشترە لەئیبلیس کە دوژمنێکی ئاشکرایە، بۆیە دووڕووەکان ترسناکترن لەسەر موسڵمانان لەکافران، چونکە کافر دەزانرێ ئەوە کافرە بەڵام ئەوانە خۆیان بە ئیسلام دەردەخەن و بەنهێنی پلان بۆ موسڵمانان دادەنێن، لە ناو جەماعەتی موسڵماناندا، جا ئەوان ترسناکترن، بۆیە خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێ:** (هُمُ الْعَدُوُّ فَاحْذَرْهُمْ قَاتَلَهُمُ اللَّهُ أَنَّى يُؤْفَكُونَ (٤) المنافقون) **واتە: هەر ئەوانن دوژمن، دەسا ئێوەش هۆشیارو ئاگاداریان بن و خۆتان بپارێزن لێیان، خوا بیانکوژێ، لەناویان بەرێت، چۆن لەڕێی هەق لائەدرێن؟!).**

**﴿١٠٩﴾ نوسەر دەڵێت: (ومن عرف ما ترك أهل البدع من السنة وما فارقوا منها فتمسك به فهو صاحب سنة وصاحب جماعة وحقيق أن يتبع وأن يعاون وأن يحفظ وهو ممن أوصى به رسول الله (ﷺ).**

واتە: هەرکەسێ بزانێ کە بیدعەکاران وازیان لەچی سوننەتێك هێناوەو ئەوەی لێی جیابوونەتەوە، ئەو دەستی پێوە بگرێ ئەوە (صاحب السنه)یەو (صاحب الجماعه)یە حەقی خۆیەتی شوێنی بکەون و یارمەتی بدرێت و بپارێزرێ و ئەویش هەر ئەوەیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەصێتی بۆ کردووین.

ڕاڤە:

مەبەست لە: (ومن عرف ما ترك أهل البدع من السنة وما فارقوا منها فتمسك به فهو صاحب سنة وصاحب جماعة وحقيق أن يتبع وأن يعاون وأن يحفظ وهو ممن أوصى به رسول الله (ﷺ)).

واتە: لەو فەرموودەیەی دەفەرموێت: (هم من كانوا على ما أنا عليه اليوم وأصحابي) وەصێتی پێ کردووین لەگەڵ ئەواندا بین، لەگەڵ ئەم جەماعەتەدا، لەگەڵ ئەم کۆمەڵەدا، لەگەڵ ئەم گرووپەدا کە لەسەر ئەو ڕێگایە پێغەمبەری خواو(ﷺ) هاوەڵانی لەسەری بوون، بەڵام ئەمە پێویستی بە دوو کار هەیە:

یەکەم: عیلم: بەوەی فێری ئەو ڕێگایە ببین پێغەمبەرو(ﷺ) هاوەڵانی لەسەر بوون، بەڵام کەسی نەفام ئەمە نازانێ، ئەو وادەزانێ ئەوەی بەرهەڵستکار (مخالف) لەسەریەتی ئەوە ئەو ڕێگەیە پێغەمبەری خوای(ﷺ) لەسەر بووە لەکاتێکدا واش نییە.

ئەویتر: ئارامگرتن لەسەر دامەزراوبوون لەسەر ئەوەی پێغەمبەرو (ﷺ) هاوەڵانی لەسەر بوون، چونکە ئەو کەسەی دەست بە سوننەتەوە بگرێت ئەوا تووشی ماندووبوون و هەڕەشەو بەسووک سەیرکردنو نارەحەتی دەبێ لەلایەن خەڵکییەوە، بەڵام پێویستە لەسەری ئارام بگرێو لەسەر حەق لانەدات، چەنو چوونی لەسەر نەکات، دەست لە هیچ شتێکی هەڵنەگرێ، بۆیە لە فەرموودەدا هاتوە ئەو کەسەی دینەکەی دەگرێ لەکۆتا زەماندا، وەکو ئەو کەسە وایە سکڵی بەدەست گرتبێ یان وەکو پێکدادانو راوەشاندنی دڕکە، لەبەر ئەو نارەحەتییەی لەلایەن خەڵکییەوە تووشی دەبێ، تووشی ماندووبوون دەبێت، جا پێویستی بە ئارامگرتنە.

**﴿١١٠﴾ نوسەر دەڵێت: (واعلم أن أصول البدع أربعة أبواب يتشعب من هذه الأربعة اثنان وسبعون هوى ثم يصير كل واحد من البدع يتشعب حتى تصير كلها إلى ألفين وثمان مائة كلها ضلالة وكلها في النار إلا واحدة وهو من آمن بما في هذا الكتاب واعتقده من غير ريبة في قلبه ولا شكوك فهو صاحب سنة وهو الناجي إن شاء الله).**

**واتە: بزانە بناغەی بیدعەکان چوار دەرگایە (چوار بنەمایە): لەم چوارەوە حەفتاو دوو ئارەزووی لێ دەبێتەوە، ئەمجار هەر یەکێك لەوانە دەبێتە چەند لقێکەوە تاکو هەر هەمووی دەگاتە دوو هەزارو هەشت سەد هەر هەمووی گومڕایی یەو هەر هەمووی لەئاگردان تەنها یەکێکیان نەبێ! ئەویش ئەو کۆمەڵەن باوەڕیان هەیە بەوەی لەم کتێبەدا هەیە، باوەڕی پێی هەبێ بەبێ هیچ گومانێك لە دڵیدا، جا ئەوە کەسێکی سوننیە، هەر ئەویش دەربازی دەبێ -إن شاء الله-.**

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (واعلم أن أصول البدع أربعة أبواب يتشعب من هذه الأربعة اثنان وسبعون هوى ثم يصير كل واحد من البدع يتشعب حتى تصير كلها إلى ألفين وثمان مائة كلها ضلالة وكلها في النار إلا واحدة وهو من آمن بما في هذا الكتاب واعتقده من غير ريبة في قلبه ولا شكوك فهو صاحب سنة وهو الناجي إن شاء الله).

**(البدع): کۆی بیدعەیە، مەبەستیش لە بیدعە بریتییە لەوەی کە لە دیندا داهێنراوە بەبێ بەڵگە لە کیتاب و سوننە، ئەویش لەبەر ئەو فەرموودەیەی کە دەفەرموێت:** (من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه فهو رد) **لە ریوایەتێکی تردا هاتوە:** (من عمل عملا ليس عليه أمرنا فهو رد) **وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتوە:** (عليكم بسنتي و سنة الخلفاء الراشدين

المهديين من بعدي، تمسكوا بها، و عضوا عليها بالنواجذ، و إياكم و محدثات الأمور، فإن كل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة) **وە لە ریوایەتێکدا هاتووە:** (وكل ضلالة في النار)[٢٥٤].

**جا بیدعە: ئەوەیە کە هیچ بەڵگەیەکی نییە لەقورئان و سوننەتدا کە خاوەنەکانیان بانگەشەی ئەوە دەکەن لە خوا نزیکیان دەکاتەوە لەپەرستنەکان وقسەکان و کردەوەکان، بیدعەکە ڕەنگە:**

**(أصلی) بێت: بەوەی هەر لە بناغەوە تازە بێت و هیچ بناغەیەکی لەدیندا نەبێ.**

**ڕەنگە (إضافی) بێت، ئەویش بەوە دەبێ بنەمایەکی دروستی لەشەرعدا هەبێ بەڵام شتی نادروستی دەخەنە سەر، وەکو ئەوەی کاتێکی تایبەت بکات بۆ زیکرکردن بەبێ ئەوەی بەڵگەی هەبێ بۆ تایبەت کردنی، یان جۆرێك لەزیکر کە بەڵگەی لەسەر نەبێ، یان ژمارەیەك لەزیکرکردندا بەڵگەی لەسەر نەبێ، یان ڕۆژوویەك بەڵگەی لەسەر نەبێ.**

**بیدعەکان بەهەموو جۆرەکانیەوە:** (اضافی) **یان** (اصلی) **هیچ خەیریان تێدا نییە، هەمووی خاوەنەکەی لەخوا دوور دەکاتەوە و خاوەنەکەی لەگەڵ گاورەکاندا لێکچوونێکیان هەیە ئەوانەی کە (ڕەهبانیەت) یان داهێنا،** (وَرَهْبَانِيَّةً ابْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ) **رهبانیە: بیدعەیەو خوای گەورە لەشەرعەکەیاندا بۆی دانەناون، بەڵام ئەوان ئەنجامیان دا لەبەر ئەوەی لەخوا نزیکیان بکاتەوە** (إِلَّا ابْتِغَاءَ رِضْوَانِ اللَّهِ)الحديد/٢٧) **ئەوان مەبەستیان ئەوە بوو خوای گەورە لێیان ڕازی بێت، بەڵام ئەگەر لەشەرعی خوادا نەبوو ئەوا وەرناگیرێ، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:** (من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه فهو رد) **واتە: بۆ خۆی دەگەڕێتەوەو وەرناگیرێ، خاوەنەکەی تەنها ماندووبوونو گومڕایی دەست دەکەوێتو پاداشتی بۆ نانوسرێ، داوا لەخوا دەکەین بمانپارێزێت.**

---

٢٥٤ / سبق تخريج هذه الأحاديث .

مەبەستی نوسەر لێرەدا کە دەڵێت: (أن أصول البدع أربعة أبواب) _والله اعلم_ بناغەو بنەمای ئەو کۆمەڵ و گروپانەیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی پێداوین پەیدا دەبن، لەو فەرموودەدا کە دەفەرموێت: (ستفترق هذه الأمة على ثلاث وسبعين فرقة كلها في النار إلا واحدة) قالوا: من هي يا رسول الله؟ قال: من كان على ما أنا عليه اليوم وأصحابي).

ئەمە کۆمەڵی ڕزگاربووەکەیە لەسەر سوننەت مایەوە، هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (من يعش منكم فسرى اختلافا كثيرا فعليكم بسنتي وسنة الخلفاء) هەواڵی پێداین ئەم ئوممەتە دەبێتە چەند گرووپ و کۆمەڵێکەوە هەروەکو چۆن ئوممەتەکانی جولەکەو گاور لەپێش ئەوان بوونە چەند کۆمەڵێکەوە، ئەم هەواڵدانە لەڕووی ئاگادارکردنەوەیەو هاندانە بۆ دەستگرتن بەسوننەتەوە لەکاتی ڕوودانیدا، هەرگیز دەربازبوون نییە بەبێ سوننەت، هەرکەسێ واز لەسوننەت بهێنێ و لەگەڵ ئەو کۆمەڵانەدا بوو ئەوا دەچێتە ئاگرەوە، جا ئەو کۆمەڵانەی پەیدا بوون زۆرن، بەڵام بناغەو بنەماکەیان چوارن:

## کۆمەڵەی یەکەم: کۆمەڵ و گروپی (شیعە):

یەکەم شت ڕوویدا لەپاش کوشتنی عوسمان کاتێ (عبدالله بن سبأ)ی جولەکە چەندین فیتنەی نایەوە، لەناو موسڵمانانداو بانگی خەڵکی کرد بۆ شیعەگەرێتی بۆ (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) و ئەو (وەصی)یە لەپاش پێغەمبەری خواو(ﷺ) هاوەڵان ستەمیان لێ کردووەو خیلافەتیان لێی سەندووە، لەو کاتەوە شیعەگەرێتی دەستی پێ کرد، زانایان باسیان کردووە کەوا شیعە چەند گروپ و تاقمێکی زۆرن:-

### یەکەم گروپێکی شیعە: (المفضلة):

ئەوانەن فەزڵی عەلی دەدەن بەسەر هاوەڵانی تردا تەنانەت بەسەر ئەبو بەکر و عومەر و عوسمانیشدا، ئەوانە پێیان دەگوترێ (المفضلة) بەڵام تانە لەخیلافەتی

ئەبوبکرو عومەرو عوسمـان نـادەن، بـەڵکو دەڵـێن:- عـەلی چاکترە، ئەمـەش هەڵەیـە چونکە عەلی چوارەم خەلیفەی راشدی یەو لـە ئـەبوبکر وعومـەر چـاکتر نییـە تەنانـەت خۆیشی ئینکاری لەوە کردووە کە کەسێك فـەزڵی بـدات بەسـەر ئـەبوبکر و عومـەردا و هەڕەشەی کردووە لەو کەسەی وا بڵێت بەسزایەکی توند.

## گرووپی دووەم:

ئەوانـەی کـە دەڵـێن: عـەلی وەصـی پێغەمبـەری خوایـە(ﷺ)و ئـەو شایـستەترە بەخیلافەت، خیلافەتی ئەبو بکرو عومەرو عوسمان ستەم و داگیرکردن بووە، دەڵـێن:- خیلافەت هی (عەلی)یەو هەر ئـەویش (وەصـی)یـە لـەپاش پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) و هاوەڵان ستەمیان لێ کردوو و خیلافەتیان لێ زەوت کردو چەندین گومڕایی تر.

## گرووپی سێ یەم: شیعە زێدەڕەوەکان.

ئەوانەی دەڵێن: پێغەمبەرایەتی هی عەلی بووە بـەڵام جبریـل خیانـەتی لێ کـردووەو بە (محمد)ی داوە ئەگەر نا پێغەمبەرایەتیەکە لەئەصڵدا بۆ عـەلی بـووە، دەڵـێن: (خـان الأمين وصدها عن حيدره) مەبەست لە (الامين) جبریلـە و (فـصد الرسـالة عـن حيـدره) مەبەستی عەلییەو دای بە (محمد) (ﷺ).

## گرووپی چوارەم: لەوان توندترن: دەڵێن عەلی خودایە.

ئەوانەن عەلی کوڕی ئەبو تالیب سوتاندنی بە ئاگر، چەند چاڵێکی بۆکردن و ئـاگری تیادا کردەوەو بەزیندویی ئەوانی فڕێ دایە ناو ئاگرەکەوە، لەعەلی یەوە ڕیوایەت کراوە کەوا فەرموویەتی:

لما رأيت الأمر أمرا منكرا      أججت ناري ودعوت قنبرا[٢٥٥]

---

٢٥٥ / رواه الاعرابي و الآجري وابن عبدالبر وابن عساكر .

(قنبر) خزمەتکارەکەیەتی، جا بەئاگر ئەوانی سوتاند کاتێ گوتیان: (تۆ خـودای تـۆ خـودای) ئـیبن عـەباس وای دەبینـی کـەوا پێویـستە بەشمـشێر بکـوژرێن بـەئاگر نەسـوتێنرێن، چـونکە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: (لايعذب بالنار إلا رب النار)[٢٥٦] جا ئەو رێگر نەبوو لەکوشتنیان بـەلآم دەیفـەرموو: (أرى أن يُقتلوا بالسيف بدل النار)[٢٥٧] واتە: وادەبینم بەشمشێر بکوژرێن باشترە لەوەی بە ئاگر بسوتێنرێن.

کۆمەڵی دووەم: کۆمەڵی قەدەرییە:

ئەوانـەی ئینکـاری لەقـەدەر دەکـەن، ئەمانـەش لـەکۆتایی سـەردەمی هاوەڵانـدا دەرکەوتن، ئەوانیش دوو بەشن:

یەکەم: قدریە جبریە: زیادەڕەوەکان لەئیسپات کردنی قەدەردا.

دووەم: قدرية نفاة: ئەوانە نەفی قـەدەر دەکـەن، ئەوانـەش موعتەزیلـەن و ئەوانـەی ڕێچکەی ئەوانیان گرتـووە، ئەوانـەی دەڵـێن: بەنـدەکان خۆیـان فعلـی خۆیـان دروسـت دەکەن، خوای گەورە فعلـی بەنـدەکانی دروسـت نـەکردووە، بـەڵکو خۆیـان دروسـتیان کردووە، لەکاتێکدا نەیارەکانیان (جەبری)یەن دەڵێن: فعلـی بەنـدەکان فعلـی خودایـە، بەندەکان ناچارن لـەوەی دەیڵـێن و لـەوەی دەیکـەن ئـەوە هەڵبـژاردنی خۆیـان نییـە، موعتەزیلەکان دەڵێن: هەڵبـژاردنێکی سـەربەخۆیان هەیـە بۆیـە ئەگـەر بـەڕەهایی وتـرا (القدريە) ئەوە موعتەزیلەو ئەوانەی نەفی قەدەر دەکەن دەگرێتـەوە، جـا ئـەوان نـەفی قەدەر دەکەن و جەبرییەکان ئیسپاتی قەدەر دەکەنو زیادەڕەوی تیادا دەکـەن، تـاکو بڵـێن:_ بەنـدەکان ناچـارن، جـا ئەوانـە نـەفی قـەدەر دەکـەن و ئـەوانیتر زیـادەڕەوی لەئیسپاتکردنیدا دەکەن، بەهەموویان دەڵێن قەدەرییە، بوونە چەندین لق و پارچەوە.

---

٢٥٦ / صحيح : أخرجه أبو داود (٢٦٧٣) وأحمد (٣/٤٩٤) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (١٤١٢) .

٢٥٧ / تەماشای البخاری بکە (٢٨٥٤، ٦٥٢٤) .

## کۆمەڵی سێ یەم: کۆمەڵی خەواریج:

ئەوانەی دژی کار بەدەستانی موسڵمان دەردەچنو دەستی گوێڕایەڵی دادەماڵن، خەڵکی بەهۆی تاوانە گەورەکانەوە کافر دەکەن کە لە شیرکیش بچوکترە، خوێنی موسڵمانان حەلاڵ دەکەن، ئەوانەش زیادەڕەوانو توندڕەوانن لەدیندا، ئەوان دین و پەرستن و ترسیان لە خوا هەیە، ڕۆژوو دەگرن و شەونوێژ دەکەن و قورئان دەخوێننەوە بەلاّم بەبێ تێگەیشتن و بەبێ چاوڕوونی، بۆیە گومڕابوون_پەنا بەخوا_ دەستی گوێڕایەڵییان دامالّی و لەدژی ئەمیری ئیمانداران (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) دەرچوون، چەندین جەنگیان لەگەڵیاندا بەرپاکرد، خوای گەورە سەری خست بەسەریاندا، ئەوان بەردەوام لەدژی کاربەدەستان دەردەچن و خوێنی موسڵمانان حەلاڵ دەکەن، خەڵکی بەهۆی تاوانی گەورەوە کافر دەکەن کە لە شیرک کەمترە، پێیان دەگوترێ (الوعیدیە) چونکە کار بە ئەو ئایەتانە دەکەن هەڕەشەی تێدایە بەبێ ئەوەی جیاوازی بکەن لەنێوان تاوانی گەورەی شیرکو کوفرو تاوانی گەورەو سەرپێچییەکان، هەموو لای ئەوان بەکافر دادەنرێ و بەوەش ڕاناوەستن کە بەکافریان دەزانن بەڵکو خوێنی ئەوان حەلاڵ دەکەن و کوشتار لەگەڵ موسڵماناندا دەکەن و لەگەڵ کافراندا ناجەنگن، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە صیفەتی ئەواندا فەرموویەتی: (یقتلون أهل الاسلام ویدعون أهل الأوثان)[٢٥٨] هەرگیز باس نەکراوە کەوا خەواریج لەگەڵ کافراندا جەنگابن بەڵکو لەگەڵ موسڵماناندا دەجەنگن، ئەوانیش چەند گرووپ و تاقمێکن کە هەندێکیان لەوانی تر توندترن.

## کۆمەڵەی چوارەم: بەرانبەر کۆمەڵی خەواریج دەبێتەوە ئەوانیش (المرجئة)ن:

ئەوانەی نەفی ئەوە دەکەن کردەوەکان لە ئیمان بێت، دەڵێن: کردەوەکان ناچێتە ناو ئیمانەوە (بەشێك لەئیمان نییە) مرۆڤ ئیماندارە با کردەوەشی نەبێ،تەنانەت ئەگەر

---

٢٥٨ / متفق علیه : أخرجه البخاري (٤٠٩٤) ومسلم (١٠٦٤) .

هەموو کردەوەکانی واز لێ هێنا ئەوە هەر ئیمانداره، پێیان دەگوترێ (المرجئـه) لـه (الارجاء)ەوه هاتووه ئەویش دواخستنه، چونکه کارو کردەوەیان دواخست لەئیمان، ئەوانیش چەند کۆمەڵێکن:-

توندترینیان (الجهمية)ن:

ئەوانەی دەڵێن:- ئیمان تەنها بریتییه لە ناسین بەدڵ، ئەگەر بەدڵ ناسی ئەوه ئیمانداره با باوەڕیشی نەبێ.

کۆمەڵی دووەم له (المرجئة): (الاشاعرة)ن:

ئەوانەی دەڵێن:- ئیمان باوەڕبوون بەدڵەو قسەی زمان تێیدا بەشدار نییه و کردەوەی جەواریحیشی تێدا بەشدار نییه، بەسه بۆ ئەو تەنها بەدڵ باوەڕی هەبێ.

کۆمەڵەی سێ یەم: (الكرامية):

ئەوانەی دەڵێن: ئیمان بریتییه له گوتنی بەزمان با دڵیشی باوەڕی پێی نەبێ.

کۆمەڵەی چوارەم: (مرجئة الفقهاء):

ئەوانەی دەڵێن:- ئیمان بریتییه لەباوەڕبوون بەدڵ و گوتنی بەزمان هەرچەنده کردەوەی نەبێ.

هەر هەموویان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کەوا کردەوه لەئیمان نییه، بەلام له مەزهەبەکەیاندا جیاوازن لەکردەوەی دڵ و گوتنی زمان.

جا خەواریج: زیادەڕەوییان کرد لەوەی کردەوەکان بخەنه ناو حەقیقەتی ئیمانەوەو وتیان: هەرکەسێ واز لەکردەوه بهێنێ ئەوا بەڕەهایی کافر دەبێت وه(المرجئـه) بەپێچەوانەی ئەوانەوه زیادەڕەوییان کرد لەنەفی کردەوەکان لەحەقیقەتی ئیمان و وتیان هەرکەسێ بەڕەهایی وازی لەکردەوەکان هێنا ئەوا کافر نابێ.

بەڵام ئەهلی سوننەو جەماعە: سوپاس بۆخوا _خوای گەورە ڕێنمویی کردن بۆ حەق هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: (فَهَدَى اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا لِمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ مِنَ الْحَقِّ بِإِذْنِهِ وَاللَّهُ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ (٢١٣) البقرة)

ئەهلی سوننە دەڵێن: ئیمان بریتییە لەوتن بەزمان و باوەڕ بەدڵ و کردەوە بە جەواریح، بەگوێرایەڵی زیاد دەکات و بەسەرپێچی کەم دەکات، بەڵام لەناو ناچێت بەنەمانی کردەوەکان بەڕەهایی، هەروەکو خەواریجەکان دەڵێن هەروەها نامێنێ بەنەمانی کردەوەکان هەمووی هەروەکو (المرجئـە)ەکان دەڵێن، بەڵکو هەندێ لەکردەوەکان هەن واز لێهێنانی کوفرە، وەکو وازهێنان لە نوێژ، هەندێ لەکردەوەکان هەن وازلێهێنانی تاوانە گەورەکانە کە ناگاتە پلەی کوفر، جا ئەمە ڕوونکردنەوەیە ئەهلی سوننەو جەماعە لەسەری دەڕۆن سوپاس بۆ خوا، ئەویش کۆکردنەوەیە لەنێوان ئەو ئایەتانەی بەڵێنی تێدایە کە (مرجئـە) دەستی پێوەگرتووەو ئایەتە هەڕەشەکان کەخەواریجەکان دەستیان پێوە گرتووە، جا ئەهلی سوننەو جەماعە لەنێوان ئایەتە بەڵێنەکانو ئایەتە هەڕەشەکانیان کۆکردووەتەوە، هەندێکیان بەوانیتر تەفسیر دەکەنو هەندێکیان بەوانیتر (تقیید)دەکەن جا(متشابهە)کان دەگێڕنەوە بۆ (محکمـ)ـەکان و کار بەهەمووی دەکەن و دەڵێن: (آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا) آل عمران/٧).

ئەمە ئەو کۆمەڵانەن کە چەندین کۆمەڵی تری لێ بووەتەوە، هەرکەسێ دەیەوێ دەربارەی ئەوە زیاتر بزانێ ئەوا با ئەو کیتابانە بخوێنێتەوە باس لە گرووپ و تاقمو کۆمەڵەکان دەکەن وەکو: (الملـل والنحـل) ی شەهرستانیو (الفَـرْق بـين الفِـرَق)ی بەغدادیو (مقالات الاسلاميين واختلاف المصلين)ی ابی الحسن الاشعریو (الفصل فـی الملل و الاهواء والنحل)ی ئیبن حەزم، جا ئەوان هەموو ئەو کۆمەڵانەو لق و پارچەکانیان

باس کردووە، پێم خۆش نییە قوتابی زانستی سەرەتایی بچێتە ناو ئەو جیاوازییانەوە بۆ ئەوەی بیری تەشویش نەبێ، بەڵام کەسی زانا ئەوە ئاساییە بیخوێنێتەوە.

مەبەست لە: (وكلها في النار إلا واحدة).

هەموویان بە هەموو لقەکانییەوە لەئاگردان، چونکە شوێنی ئارەزوو کەوتن، وازیان هێنا لەوەی پێغەمبەرو (ﷺ) هاوەڵانی لە سەر بوون کە هەر ئەویش دەربازبوونە، بەڵام هەموویان لەئاگردان ئەوە ناگەیەنێ هەموویان کافرن، چونکە ئاگر ڕەنگە سەرپێچی کار بچێتە ناوییەوە هەرچەندە کافریش نەبێ، چوونە ژوورەوەیەکی کاتییە پاشان لەئاگر دەردەچێ، بەڵام ئەو کەسەی جیابوونەوەکەی بە هۆی شتێکی (مكفر)ەوە بێت ئەوا بە هەتا هەتایی لەئاگردا دەمێنێتەوە.

مەبەست لە: (وهو مَن آمن بما في هذا الكتاب واعتقد من غير ريبة في قلبه ولا شكوك).

ئەم کتێبەی بەردەستمان ئەویش (شرح السنة)ی بەربەهارییە، ڕوونکردنەوەی ئەوەیە لە کیتاب و سوننەدا هەیە، باسی بنەماکانی ئەهلی سوننەو جەماعەیە، ئەم کتێبە هەروەکو ناوی لێ ناوە: (شرح اصول اهل السنة والجماعة) لەکیتاب و سوننەوە ئەوەی پێشینی ئەم ئوممەتە لە سەری بووە وەرگیراوە.

مەبەست لە: (من غير في قلبه).

بەڵام ئەو کەسەی ئەوە دەردەخات کەوا ئیمانی بەبنەماکان هەیە بەڵام گومان و دوودڵی لەدڵیدایە، ئەمە نابێتە کەسێکی ئیماندار، بەڵکو دەبێتە کەسێکی _دوودڵ_ پەنا بە خوا، دەبێتە ئەهلی نیفاق، دەبێ ئەوەی بەزمانی دەیڵێت بەدڵی باوەڕی پێی هەبێ، جا ئەو _ئیمامی بەربەهاری_ ڕەحمەتی خوای لێ بێت مەبەستی تەزکیەکردنی کیتابەکەی خۆی نییە، وەکو هەندێ کەس واگومان دەبا، بەڵکو مەبەستی تەزکیەکردنی ئەو بنەمایانەی تێدایە کە لەبنەماکانی ئەهلی سوننەو جەماعەیە.

**مەبەست لە:** (فهو صاحب سنة وهو الناجي إن شاء الله).

**هەر کەسێ شوێنی کیتابو سوننە کەوت بەیەقینو ئیمانەوە ئەوە لەکۆمەڵی دەربازبووە، چونکە فەرموودەکەی پێغەمبەری خوای (ﷺ) بەسەردا جێ بەجێ دەبێ کاتێ پرسیاری لێ کرا دەربارەی کۆمەڵی دەربازبوو (ڕزگاربوو) فەرمووی:**_(من كان على ما أنا عليه وأصحابي) **لە ریوایەتێکی تردا هاتووە:** (من كان على مثل ما أنا عليه اليوم وأصحابي).

**﴿١١١﴾ نوسەر دەڵێت: (واعلم أن الناس لو وقفوا عند محدثات الأمور ولم يتجاوزوها بشيء ولم يولدوا كلاما مما لم يجيء فيه أثر عن رسول الله (ﷺ) ولا عن أصحابه لم تكن بدعة).**

واتە: بزانە ئەگەر خەڵکی لەسەر شتە داهێنراوەکان ڕاوەستان و بەسەریدا تێنەپەڕین و هیچ قسەیەکیان دروست نەکرد بەوەی هیچ ئەسەرێك لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) نەهاتبێت یان لەهاوەڵانەوە ئەوا بیدعە دروست نەدەبوو).

**ڕاڤە:**

**مەبەست لە:** (واعلم أن الناس لو وقفوا عند محدثات الأمور ولم يتجاوزوها بشيء ولم يولدوا كلاما مما لم يجيء فيه أثر عن رسول الله (ﷺ) ولا عن أصحابه لم تكن بدعة).

ئەگەر خەڵکی لێی ڕاوەستان و نەچوونە ناو ئەو باسانەوەو تەنها خەریکی سوننەبوون، لێی دەرنەچوون بەرەو بیدعە ئەوا دەرباز دەبوون، بەڵام هەرکەسێ لەسوننە تێپەڕێ و چەند قسەو باسێك دابهێنێ بەڵگەی نەبێ لەکیتابەکەی خواو سوننەتەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو لەگەڵ (مبتدع)ەکاندا دەبێ، لە گەڵ کۆمەڵە گومڕاکاندا دەبێ،جا هەرگیز دەربازبوون نییە ئیللا بە ئەم سوننەتە نەبێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێمەی لەسەر جێهێشتووە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ: (إني تارك فيكم ما إن تمسكتم به لن تضلوا بعدي: كتاب الله وسنتي)[٢٥٩] لە فەرموودەیەکی تردا هاتوە: (تركتكم على البيضاء ليلها كنهارها لا يزيغ عنها إلا هالك)[٢٦٠] ئەمە ڕێگای دەربازبوونە، سوننەتەکەی پێغەمبەری خوداو(ﷺ) ئەوەی خۆی و هاوەڵانی لەسەر بوون، ئەویش ناوەڕۆکی ئەم کتێبەیە کە دەیخوێنیتەوە، ئەویش ڕاڤەی ئەو باسەیە.

---

٢٥٩ / سبق تخريجه .

٢٦٠ / صحيح : أخرجه ابن ماجه (٤٣) وأحمد(١٢٦/٤) والحاكم في (مستدركه) (٣٣١) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع ) (٤٣٦٩) .

**﴿١١٢﴾ نوسەر دەڵێت: (واعلم أنـه لـيس بـين العبـد وبـين أن يكـون مؤمنـا حتـى يـصير كـافرا إلا أن يجحـد شـيئا ممـا أنزلـه الله أو يزيـد في كـلام الله أو ينقص أو ينكر شيئا مما قال الله عز و جل أو شيئا مما تكلم بـه رسـول الله (ﷺ) فاتق الله وانظر لنفسك وإياك والغلو في الدين فإنـه لـيس مـن طريـق الحق في شيء).**

**واتە: بزانە هیچ شتێك لەنێوان بەندەو ئەوەی ببێتە ئیماندار تاكو دەبێتە كافر ئـیللا نكۆڵی لە شتێك بكات خوای گەورە دایبەزاندبێ یان قسەكانی خوای گـەورە زیادبكـات، یان كەمی بكاتەوە، یان ئینكـاری لەشـتێك بكـات خـوا وتبێتـی، یـان پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) وتبێتی، جا لە خـوا بترسـە_ڕەحمـەتی خـوات لێ بێـت_ تەماشـای خـۆت بكـەو ئاگاداری زیادەڕەوی بە لە دیندا چونكە ئەوە بەهیچ شێوەیەك ڕێگای حەق نییە.**

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (واعلم أنه ليس بين العبد وبين أن يكون مؤمنا حتى يصير كافرا إلا أن يجحد شيئا مما أنزله الله).

**واتە: ئەوانەی ئیسلام پووچەڵ دەكەنەوە زۆرن، ڕەنگە كەسێك ببێتـە موسـڵمانێكی ئیسلام دروست و خاوەن ئیمانێكی ڕاست، بەڵام _پەنا بەخوا_ڕەنگە لەدینەكەی خۆی هەڵگەڕێتەوە بەئەنجامدانی یەكێك لـە هەڵوەشـێنەرەوەكانی ئیـسلام، ئەوانـەش زۆرن، كە چوار جۆر كۆیان دەكاتەوە: وتن (قسەكردن)، كردەوە، باوەڕ، گومان.**

**<u>یەكەم/ وتن (قسەكردن):</u>**

**وتنی وشەیەكی كوفر، ئەگەر وشەیەكی كوفری گـوتو ناچـار نـەبوو، ئـەوە كـوفری كردوە، خوای گەورە دەفەرموێت:** (وَلَقَدْ قَالُوا كَلِمَةَ الْكُفْرِ وَكَفَرُوا بَعْدَ إِسْلَامِهِمْ) التوبة/٧٤)

واتـە: خـۆ لـە واقعیـشدا قـسەی کـوفرو خـوا نەناسـیدا گوتبـوو و دوای راگەیانـدنی ئیسلامبونیشیان، دیسان گەرابوونەوە سەر کوفر).

وەکو ئەوەی داوا لەجگە لەخوا بکات، هاوار دەکاتە جگە لـە خـوا لـە شـتێکدا هـیچ کەسێك توانای لەسەر نییە لەمردووەکان و جگە لەوان تەنها خوا نەبێ، بۆیە بەوە کافر دەبێ، چونکە داوای لە جگە لـە خـوای کـردوە، یـان قـسەیەك دەکـات کـە گاڵتـەکردن بەدینی تێدایە، یان بەقورئان یان بەسوننەت، خوای گەورە دەفـەرموێت: (وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنْتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ (٦٥)التوبة) واتە: ئەگـەر لێیان بپرسیت ئەڵێن: بەڕاستمان نەبووەو بەڵکو تـەنها گاڵتـەو گـەپمان دەکـرد، پێیـان بڵێ: ئایا گاڵتەتان بەخواو ئایەتەکانی و پێغەمبەرەکەی کردبوو؟).

جا ئەو کەسەی گاڵتە بەسوننەت دەکات یان بەقورئان ئـەوا کـافر دەبێـت هەرچـەند بە گاڵتەشەوە بێت بەمەرجێ ناچار نەبووبێ، خوای گـەورە دەفـەرموێت: (مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِهِ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالْإِيمَانِ) النحل/١٠٦) واتە: هەرکەسێك پـاش بـڕوا هێنانی بەخوا، کافرو بـێ بـاوەڕ بێتـەوە مەگـەر کەسـێك زۆری لێکرابـێ‌و لەوکاتەیـشدا دڵنیابێ بەئیمان).

بەڵام ئەگەر کەسێك ئەوەی گوت بەویست و هەڵبژاردەی خۆی ئەوە کافر دەبێت.

دووەم/ کردەوە:

وەکو ئەوەی بۆ جگە لەخوا سەر ببڕێ، یان بۆ جگە لەخوا نزر بکات، یان بـۆ جگـە لەخوا سوژدە ببات، بۆ گۆڕێك سوژدە ببات.

سێ یەم/ یان باوەڕ بەدڵ:

وەکو ئەوەی باوەڕی وابێـت بەڕاسـتو دروسـتی کـوفرو ڕاسـت و دروسـتی ئـەوەی کافران لەسەرین، وەکو ئەوەی باوەڕی بەڕاست و دروستی ئەوەی جولەکـەو گاورەکـان لەسەرین لەپاش ڕەوانەکردنی (محمد) (ﷺ).

چوارەم/ یان: گومان:

وەکو ئەوەی گومان بکات لە قورئان ئایە ڕاستو دروستە یان ڕاستو دروست نییە؟ ئایە ئەم ئایەتە ڕاستە یان ڕاست نییە؟ ئەمە کافر دەبێت _پەنا بەخوا_ یان گومانی بوو لەوەی لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) هاتووە لەفەرمودە ڕاستو دروستەکان.

ئەمانە بنەماکانی هەڵگەڕانەوەن لە دین: وتن یان کردەوە یان باوەڕ یان گومان، ئەمجار لەم چوارەوە جۆرەکانی تری هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام دروست دەبێت کە زۆرنو زانایان باسیان کردوە، (شیخ الاسلام محمد عبدالوهاب) ئەوانەی کورت کردوەتەوە لەنامەیەکدا کە (دە) دانەی لەو هەڵوەشێنەرەوانەی باس کردوە، لە هەموویان گرنگترو ترسناك ترن، ئەگەر نا هەڵوەشێنەرەوەکان زۆرن لە (باب حکم المرتد) لە کتێبە فیقهییەکاندا باس کراوە.

مەبەست لە: (أو يزيد في كلام الله أو ينقص).

یەك ئایەت یان یەك پیتێك لەقورئان زیاد بکات یان یەك ئایەت یان پیتێك لە قورئان کەم بکات، ئەمە کافر دەبێت _پەنا بە خوا_ چونکە ئەوە قسەکانی خوای تەحریف کردووە، قسەکانی خوای گۆڕیوە، جا قورئان هەمووی حەقە، هەموو هەروەکو چۆن دابەزیوەتە سەر (محمد) (ﷺ) هەروەکو خۆیەتی، هیچ نەگۆڕاوە، ئەویش بەپاراستنی خوا پارێزراوە، هیچ کەسێك ناتوانێ بیگۆڕێ، بەڵام هەرکەسێ هەوڵی دا ئەوا کافر دەبێتو لەئیسلام دەردەچێ و هەرگیز قورئان ناگۆڕدرێ، چونکە بە پاراستنی خوا پارێزراوە.

مەبەست لە: (أو ينكر شيئا مما قال الله عز و جل أو شيئا مما تكلم به رسول الله (ﷺ)).

یان ئینکاری شتێك بکات لە قورئاندا هاتبێت، بڵێت: ئەمە بەکەڵکی ئەم سەردەمە نایەت، یان بە فەرموودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بڵێت: ئەمە بەکەڵکی سەردەمێك دێت ڕابوردووەو بەکەڵکی شارستانییەتی ئەمڕۆ نایەت، واتە قورئان و سوننەت، بەڵکو

ئەمە هی سەردەمی ڕابوردووەو سەردەمانێك ڕۆیشتووە، ئەمڕۆ بەکەڵکمان نایەت، ئەمە کافر دەبێت_ پەنا بەخوا_ زۆرن ئەوانەی دەڵێن: حوکمەکانی شەریعەت بۆ ئەم سەردەمە بەکەڵك نایەت و ناگونجێ، ئەمەش کوفرێکی ئاشکرایە، ئەگەر فەرموودەیەکی (صحيح) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) هات ئەوا دروست نییە ئینکاری لێ بکرێت یان بگوترێ: ئەمە بەکەڵکی ئەم سەردەمە نایەت.

مەبەست لە: (فاتق الله).

لەخوا بترسە شتێك لەم کارانە بێت بەدڵتداو ببێتە هۆی ئەوەی لەدینەکەت دەرچیت، لەخوا بترسە لەخۆتدا و تەزکییەی خۆت مەکە و تەئمین مەبە لە سەر دینەکەت.

مەبەست لە: (وانظر لنفسك).

تەماشای خۆت بکەو تەماشای خەڵکی مەکەو ئەوەی خەڵکی لەسەرە، تەماشای خۆت بکە، خوای گەورە دەفەرموێت: (يا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَيْكُمْ أَنْفُسَكُمْ لَا يَضُرُّكُمْ مَنْ ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ) المائدة/١٠٥) واتە: ئەی گەلی خاوەن باوەڕ! خەریکی پاکسازی دەروونی خۆتان بن ئەوسا کە بڕواتان هێناو ڕێتان دۆزییەوەو ئامۆژگاری خەڵکیشتان کرد، ئیتر خەڵکانی گومڕا بوو ناتوانن زیانتان پێ بگەیەنن هەرچەندە پیلان بگێڕن).

مەڵێ: ئەمە زۆربەی خەڵکی لەسەرە، بەڵکو تەماشای خۆت بکەو خۆت دەرباز بکە، بەڵام خەڵکی وازیان لێ بهێنە ئەگەر حەقیان نەویست و تۆ دامەزراو بە لەسەری و بەوە مەغرور مەبە کە خەڵکی لەسەرن.

مەبەست لە: (وإياك والغلو في الدين فإنه ليس من طريق الحق في شيء).

ئەمە لایەنێکی ترە، چونکە دین بە یەکێ لەم دووکارە مرۆڤی لێی دەردەچێ:-

- یان بەوازهێنان لێی، یان بە وازهێنان لەشتێکی‌و نەیەوێت.
- یان بەزیادەڕەوی‌و توندڕەوی.

جا دەرچوون لەدین ڕوودەدات: یان بە نەرم و نیانی وەیان بەتوندڕەوی، کەواتە ناوەندبوونت لەسەرە لەنێوان شل ڕەوی‌و توندڕەوی، ئەمەش ئەوەیە پێغەمبەر و هاوەڵانی لەسەر بوون، زیادەڕەوی لەدین خاوەنەکی لەدین دەردەکات، هەروەکو خەواریجی دەرکرد، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەربارەیان دەفەرموێت: (یمرقون من الدین، کما یمرق السهم من الرمیة)[٢٦١] جا زیادەڕەوی مرۆڤ لەدین دەردەکات:-

- یان دەرکردنێکی کامل بەرەو کوفر.
- یان دەرکردنێکی جوزئی بەپێی ئەوەی لێی دەوەشێتەوە.

ڕەنگە زیادەڕەوییەکە لەدینـدا لەپەرستندا بێت، وەکو زیادەڕەوی گاورەکان لە (رهبانیە)تدا، یان وەکو ئەوانەی هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) پرسیاری کارەکەیان دەکرد، کاتێ هەواڵیان پێدرا، وەکو ئەوەی کردەوەکەی پێغەمبەر (ﷺ) بەکەم بزانن بەڵام وتیان: پێغەمبەری خوا (ﷺ) خوای گەورە لەتاوانەکانی ڕابوردوی‌و داهاتووی خۆش بووە) واتە: ئەو پێویستی بە کردەوەی زۆر نییە، کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەوەی زانی بەتوندی لەوان تووڕە بوو، وتاری داو فەرمووی:- (أما والله إني لأخشاكم لله، وأتقاكم لله وإني أصلي وأنام) چونکە یەکێ لەوان وتی: من نوێژ دەکەم هەرگیز ناخەوم، دوەمیان وتی: من هەردەم بە ڕۆژوو دەبم، هەموو تەمەنی بە ڕۆژوو دەبێت، سێیەم وتی: من ژن ناهێنم، بە گەنجی دەمێنێتەوەو خۆی یەکلا دەکاتەوە بۆ خوا پەرستی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (أما والله إني لأخشاكم لله، وأتقاكم لله

---

٢٦١ / صحيح : سبق تخريجه .

وإني أصلي وأنام، وأصوم وأفطر، وأتزوج النساء،فمن رغب عن سنتي فليس مني)[٢٦٢] لە ریوایەتێکدا هاتووە یەکێکیان وتی: من گۆشت ناخۆم، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (وأنا آكل اللحم، ومن رغب عن سنتي فليس مني)[٢٦٣] مەبەستیان خەیر بوو،بەڵام تەنها نیەت بەس نییە بەڵکو دەبێ شوێنکەوتن لەگەڵ مەبەستدا ببێت، شوێنکەوتنی سوننەت لەگەڵ مەبەست و نیەتی پاکدا پێویستە هەبێ، بەڵام نیەتی پاك بەبێ شوێنکەوتن ئەوە هیچ سوود بەخاوەنەکەی ناگەیەنێ.

٢٦٢ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٤٧٧٦) ومسلم (١٤٠١) .

٢٦٣ / رواه مسلم (١٤٠١) .

**﴿١١٣﴾ نوسەر دەڵێت: (وجميع ما وصفت لك في هذا الكتاب فهو عن الله تعالى وعن رسول الله (ﷺ) وعن أصحابه وعن التابعين وعن القرن الثالث إلى القرن الرابع).**

**واتە: هەموو ئەوەی لەم کتێبەدا وەصفم بۆت کردووە هەموو ئەوانە لەخوداو پێغەمبەری خوداو (ﷺ) هاوەڵانو شوێنکەوتوانو لەسەدەی سێیەم تا سەدەی چوارەم هاتووە.**

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (وجميع ما وصفت لك في هذا الكتاب فهو عن الله تعالى).

**هەموو ئەوەی لەم کتێبەدا باس کراوە لە بنەماکانی بیروباوەڕ ئەوا لەقورئانو سوننەتەوە وەرگیراوە، دانەر هیچ شتێکی لەخۆیەوە نەهێناوە، بەڵکو ئەوەی پێشینی ئەم ئوممەتەی لەسەر بووە، هیچ قسەیەکی لەخۆیەوە دانەهێناوە، بەڵکو گێڕانەوەی ئەوەی لەقورئانو سوننەتو پێشینی ئەم ئوممەتەی لەسەر بووە، جا ئەو ڕێگا سەلامەتەکە وەصف دەکات، ئەو ڕێگایەی هەرکەسێ بیگرێتە بەر ئەوا دەربازی دەبێت بەئیزنی خوای گەورە.**

**مەبەست لە:** (وعن رسول الله (ﷺ)).

**چونکە ئەو پشتبەستراوە یان بە قورئانی پیرۆزەوە یان بە سوننەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ)، کەواتە ئەوە لەخواو لەپێغەمبەری خوداوەیە (ﷺ).**

**مەبەست لە:** (وعن أصحابه وعن التابعين).

**هەروەها ئەوەی لەم کتێبەدا باسکراوە لە سێ سەدە چاکەکەیە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ستایشی کردوون، فەرموویەتی:** (خيركم قرني، ثم الذين يلونهم، ثم الذين يلونهم)

واتە: باشترینی ئێوە ئەم سەدەیەی منە، ئەمجار ئەوانەی لە پاش ئەوان دێن، ئەمجار ئەوانەی لە پاش ئەوان دێن) راوی فەرمودەکە کە (عمران)ی کوری (حصین) دەڵێت: نازانم لەپاش سەدەکەی خۆی دوو سەدەی باسکرد یان سێ سەدە) پێی دەگوترێ سێ سەدە چاکەکە، ئەویش سێ سەدەیە یان چوار سەدەیە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێکردووین چاویان لێ بکەین، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ بِإِحْسَانٍ) التوبة/١٠٠) سەدە چاکەکان بریتییە لە شوێنکەوتوان‌و شوێنکەوتەی شوینکەوتووان، ئەوان شوێنی پێشینە یەکەمەکان دەکەوتن لەکۆچەران‌و پشتیوانان بە چاکە، واتە: بەجوانی، مەبەست لە: (الاحسان) ئیتقانە، واتە ڕێکوپێکی کە زیادەڕەویی‌و کورت ڕەوی تێدا نییە، دەبێ بە عیلمەوە بێت بەوەی لە سەری بوون، ئەمە (احسان)ە چەندین کەس بانگەشەی ئەوە دەکەن ئەوان لەسەر مەنهەجی پێشینن بەڵام بە(احسان)ەوە شوێنی ئەوان ناکەوێ، چونکە ئەو مەنهەجی سەلەف نازانێ، وا دەزانێ ئەم قسەیە یان ئەم کردەوەیە هی سەلەفە یان قسەی سەلەفە، کەچی نابێتە (احسان)، جا ئەگەر دەتەوێ لەسەر مەنهەجی سەلەف بێت ئەوا دەبێ فێری ڕێگاکەیان بیت، ئەم کتێبەش یەکێکە لەو کتیبانەی ڕێگای سەلەفت بۆ وەصف دەکات‌و ڕوونی دەکاتەوە.

مەبەست لە: (وعن القرن الثالث إلى القرن الرابع).

ئەو سەدانەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ستایشی کردوون ئەویش سێ سەدەیە! هاوەڵان، شوێنکەوتووان، شوێنکەوتەی شوێنکەوتووان، چوارەم لەپاش شوێنکەوتەی شوێنکەوتووانە، ئەگەر بڕوانیتە بوونی پێشەوایان‌و بوونی (الحفاظ) ئەوا دەیانبینی لەم سەدەیانەدان: چوار پێشەواکەی تێدایە، پێشەوا گەورەکانی تێدایە، ئەستێرە گەشاوەکان، هەموویان لەو چاخانەدان، ئەمەش پشت ڕاستکردنەوەی ئەو هەواڵەیە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (خيركم قرني، ثم الذين يلونهم، ثم الذين يلونهم).

**نوسەر دەڵێت:** (فاتق الله يا عبد الله، وعليك بالتصديق والتسليم والتفويض والرضى لما في هذا الكتاب، ولا تكتم هذا الكتاب احدا من أهل القبلة فعسى يرد الله به حيرانا عن حيرته، أو صاحب بدعة عن بدعته، أو ضالا عن ضلالته فينجو به، فاتق الله، وعليك بالأمر الأول العتيق، وهو ما وصفت لك في هذا الكتاب، فرحم الله عبدا ورحم والديه قرأ هذا الكتاب وبثه وعمل به ودعا إليه واحتج به فإنه دين الله ودين رسول الله).

**واتە: لەخوا بترسە ئەی بەندەی خوا، بەڕاست زانین‌و تەسلیم بوون و پێ سپاردن‌و ڕازی بوون لەسەر ئەوەی لەم پەرتووکەدا هەیە، ئەم کتێبە لە هیچ کەسێکی ئەهلی قیبلەی مەشارەوە، بەڵکو سەرسامێك لەسەرسامییەکەی بگێڕێتەوە، یان خاوەن بیدعەیەك لەبیدعەکەی، یان گومڕایەك لەگومڕاییەکەی و پێی دەربازبێت، لەخوا بترسەو پێویستە لە سەرت دەست بە کارە یەکەمە دێرینەکەوە بگرێت، ئەویش ئەوەیە لەم کتێبەدا وەصفم بۆت کردووە، ڕەحمەتی خوا لەبەندەیەك و ڕەحمەتی خوا لە دایك و باوکی ئەو کەسەی ئەم کتێبە دەخوێنێتەوەو بڵاوی دەکاتەوەو کاری پێ دەکات و بانگەوازی بۆ دەکات و بیکاتە بەڵگەی خۆی چونکە ئەوە دینی خواو دینی پێغەمبەری خودایە (ﷺ).**

**ڕاڤە:**

**مەبەست لە:** (فاتق الله يا عبد الله وعليك بالتصديق والتسليم).

**لەسەرتە بەڕاستی بزانی‌و هەر شتێك لەم کتێبەدا هاتووە بەدرۆی نەزانی، چونکە لەقورئان‌و سوننەتەوە وەرگیراوە، ئەوەی لەسەرتە تەسلیمی ببیت و دوودڵ نەبی لەوەرگرتنیداو شوێنی بکەوی‌و تەمبەڵی نەکەی.**

**مەبەست لە:** (والتفويض).

واتـە: هـیچ شـتێك لەخۆتـەوە دانـەهێنی، ئـەم (التفـویض)ە ئـەوە نییـە كۆمـەڵی (المفوضە)ی لەسەرە لە صیفاتدا.

مەبەست لە: (والرضی لما في هذا الكتاب).

چونكە لەبنەماو بناغەكانی ئەهلی سوننەو جەماعەیە، ئەمـەش مـەدحو تەزكییـەی كیتابەكەی نییە هەروەكو هەندێ لەوانەی ڕاڤەیان كردووە وادەزانن، بەڵكو هاندانـە بـۆ وەرگرتنی ئەوەی تێیدایە لەبنەما ڕاستەكان لەقورئانو سوننەوە، چونكە هـیچ شـتێكی لەخۆیەوە نەهێناوە یان شتێكی لەخۆیەوە داهێنابێ هەرگیز.

مەبەست لە: (ولا تكتم هذا الكتاب احداً من أهل القبلة).

واتە: ئەم كیتابە بڵاوكەرەوەو دابەشی بكە بەسەر (ئەهلی قیبلە)دا واتە موسـڵمانان بۆ ئەوەی سوودی لێ ببینن، چـونكە ئەمـە بەشـێكە لـە بڵاوكردنـەوەی زانـستی سـوود بەخش، لە ئامۆژگاری كردنی یـەكترە لەسـەر حـەق، هـەروەها بـەم شـێوەیە پێویـستە كتێبـە سـوود بەخـشەكان بڵاوبكرێنـەوە، بەتایبـەتی كتێبـە ڕەسـەنەكان، هەرچـەندە كیتابەكە كۆنتر بێت ئەوە لە حەق نزیكترە، چونكە لەسێ چاخە چاكەكەوە نزیكە.

مەبەست لە: (فعسى يرد الله به حيرانا عن حيرته).

ئەمــە ســوودی بڵاوكردنــەوەی كتێبــە ســوود بەخــشەكانە، ڕەنگـە سەرسـامێك لەسەرسام بوونەكەی خۆی بگێڕێتەوە یان گومڕایـەك لەگومڕاییەكـەی، چـونكە هەنـدێ كـەس نـەزانن، ئەگـەر حەقەكـەی بـۆ ڕوون ببێتـەوە ئـەوا شـوێنی دەكـەوێ ئەمـە ئـەو كەسەیە سوود لەبڵاوكرنەوەی كتێب دەبینێ، بەڵام كەسی لادەر ئـەو كەسـەی شـوێنی ئارەزووەكەی كەوتووە ئەو هەرگیز سوود لەكتێب نابینێ، بەڵكو ڕەنگـە زیـاتر تووشـی فیتنەی بكات.

**مەبەست لە:** (أو صاحب بدعة عن بدعته، أو ضالا عن ضلالته فينجو به).

**جا پاداشتت دەست دەکەوێ لە بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبەو نمونەی ئەمە، ئەمە تایبەت نییە بەم کتێبەوە، جا هەموو کتێبێکی سوود بەخش‌و کتێبی عەقیدە بەتایبەتی، پێویستە بڵاوبکرێتەوەو دابەش بکرێنە سەر خەڵکیدا لەجێی ئەوەی کتێبی گومرایی کتێبی بانگەواز بۆ گومرایی بەسەریاندا دابەش بکرێت، ئەم کیتابە بەسەریاندا دابەش بکرێت چونکە زۆربەی خەڵکی لەسەر نەفامین ئەگەر حەقیان بۆ ڕوون بکرێتەوە ئەوا وەری دەگرن و سوودی لێ دەبینن.**

**مەبەست لە:** (فاتق الله وعليك بالأمر الأول العتيق).

**واتە: دەست بەکارە یەکەمەکەوە بگرە، ئەویش ئەوەیە پێغەمبەرو (ﷺ) هاوەڵانی‌و سێ چاخە چاکەکە لەسەری بوون، (العتيق) واتە: کۆن (دێرین) ئەمەش ئاگادار کردنەوەیەکی تێدایە لەوەی تازە ڕوودەدات لەخراپەکاری و فیتنە، جا هەر کاتێ جیاوازی و دووبەرەکیت بینی و قسەی زۆرت بیست، ئەوا لەسەرتە تەماشا بکەی ئەوەی پێشینە چاکەکان لەسەری بوون و دەستی پێوە بگرە، چونکە ئەوە حەقە.**

**مەبەست لە:** (وهو ما وصفتُ لك في هذا الكتاب).

**واتە: ئەوەی باسی کردووە لە بنەماکانی بیروباوەڕی ئەهلی سوننەو جەماعەو ئاسانی کردووەو بەفراوانی قسەی تێدا کرد.**

**مەبەست لە:** (فرحم الله عبدا ورحم والديه قرأ هذا الكتاب وبثَّهُ وعمل به ودعا إليه).

**واتە: لە نمونەی ئەمە لە کتێبە سوود بەخشەکان، جا کتێبە سوودبەخشەکان پێویستە بڵاوبکرێتەوە دابەش بکرێت، ئەو کەسەی دابەشی دەکات‌و بڵاوی دەکاتەوە پاداشتی بڵاوکردنەوەی عیلمی دەست دەکەوێ، پاداشتی دەرکردنی خەڵکی لەتاریکییەوە بۆ ڕووناکی، زۆربەی خەڵکی کەوتونەتە نێو گومراییەوە، چونکە ئەم**

کتێبە رەسەنانەیان پێ نەگەیشتووە، بەڵکو کتێبی گومڕاکارانو کۆمەڵە گومڕاکانیان پێ گەیشتووە، وادەزانن ئەوە حەقە، جا ئەگەر ئەم کتێبە رەسەنانە بایەخی پێ بدرێتو بەسەر خەڵکیدا دابەش بکرێت ئەوا خوای گەورە بە هۆیەوە هیدایەتی ئەو کەسانە دەدات خۆی بیەوێ.

هەندێ لەوانەی راڤەی کتێبەکەیان کردووە رەخنە لەنووسەر دەگرن و دەڵێن: ئەمە تەزکیە کردنی کتێبەکەی خۆیەتی، ئێمەش دەڵێین:- نەخێر ئەمە تەزکیەی کتێبەکەی نییە، بەڵکو ئەوە هاندانە بۆ دەستگرتن بەمەنهەجی سەلەفەوە کە لەم کتێبەو کتێبەکانی تردا باس کراوە.

**نوسەر دەڵێت:** (فإنه من استحل شيئا خلاف ما في هذا الكتاب فإنه ليس يدين بدين، وقد رده كله كما لو أن عبدا آمن بجميع ما قال الله عز و جل إلا أنه شك في حرف فقد ردَّ جميع ما قال الله تعالى وهو كافر، كما أن شهادة: أن لا إله إلا الله، لا تقبل من صاحبها إلا بصدق النية وخالص اليقين، كذلك لا يقبل الله شيئا من السنة في ترك بعض، ومن ترك من السنة شيئا فقد ترك السنة كلها فعليك بالقبول، ودع عنك المماحلة واللَّجاجة فإنه ليس من دين الله في شيء، وزمانك خاصة زمان سوء فاتق الله).

واتە: هەرکەسێ شتێك حەڵاڵ بکات جیاواز بێت لەوەی لەم کتێبەدا هەیە، ئەوا بە هیچ دینێك دینداری نەکردوەو هەمووی ڕەد کردووەتەوە، هەروەکو ئەوەی کەسێك باوەڕی بەهەموو ئەوەی خوای گەورە فەرموویەتی هەیە بەڵام تەنها لەیەك پیتدا گومانی هەیە ئەوا هەموو ئەوەی خوای گەورە فەرموویەتی ڕەدی کردووەتەوە، ئەویش کافرە، هەروەکو شایەتیدانی: (لا اله الا الله) لەخاوەنەکەی وەرناگیرێ بەبێ ڕاستگۆیی نیەت و یەقینێکی دڵسۆز، هەروەها خوای گەورە لەسوننەتەوە هیچ وەرناگرێ بە وازهێنان لەهەندێکی، هەرکەسێ وازی لەبەشێکی سوننە هێنا ئەوا وازی لەهەموو

سوننە هێناوە جا وەرگرتنت لەسەرە، واز لەقاڵەقاڵ و یاخیبوون بهێنە، چونکە ئەوە بەهیچ شێوەیەك لەدینی خوادا نییە، بە تایبەتی سەردەمەکەی تۆ، سەردەمێکی خراپە، بۆیە لەخوا بترسە).

ڕاڤە/

مەبەست لە: (فإنه من استحل شيئا خلافَ ما في هذا الكتاب فإنه ليس يدين الله بدين).

واتە: هەر کەسێ لەمەنهەجی ئەهلی سوننەو جەماعە دەرچێت کە لەم کتێبەدا ڕوون کرایەوەو لە جگە لەم کیتابە لە بیروباوەڕی تەواو، ئەوا لەگەڵ گومڕاکانو بیدعەکاراندا دەبێ، لەگەڵ موعتەزیلەکاندا، لەگەڵ جەهەمییەکاندا، لەگەڵ کۆمەڵە گومڕاکاندا دەبێ، خوای گەورە دەفەرموێت: (فَمَاذَا بَعْدَ الْحَقِّ إِلَّا الضَّلَالُ فَأَنَّى تُصْرَفُونَ (٣٢) یونس) واتە: جا ئیتر بەدەر لەگومڕایی _پاش هەق و ڕاستی، کەهەر لەپەرستنی خوادایە_چی تر هەیە؟).

جا بۆیە دەبێ مرۆڤ لە پێشدا حەق بناسێ و ئەوەی سەلەفی ئەم ئوممەتەی لەسەر بووە، تەماشای زۆری مەزهەبەکان نەکات، زۆری قسەکان نەکات، بەڵکو تەماشای یەك شت بکات ئەویش ئەوەیە سەلەفی ئەم ئوممەتەی لەسەر بووە، هەروەکو ئیمامی مالیك فەرموویەتی: (إنه لا يصلح آخر هذه الأمة إلا ما أصلح أولها)[٢٦٤] واتە: کۆتای ئەم ئوممەتە چاك نابێت ئیللا بەوە نەبێ کە سەرەتاکەی چاك کرد)، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ بِإِحْسَانٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ) التوبة /١٠٠).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (فإنه من يعش منكم فسيرى اختلافا كثيرا، فعليكم بسنتي و سنة الخلفاء الراشدين المهديين، تمسكوا بها و عضوا عليها بالنواجذ و إياكم و محدثات

---

٢٦٤ / نقله عنه الشاطبي وابن عبدالهادي .

الأمور، فإن كل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار)[٢٦٥] واتە: هەركەس لەئێوە _لەپاش مـن_ بـژێت ئـەوا جیـاوازی و دووبـەرەكی زۆر دەبینـیٚ، جـا ئامۆژگاریتـان دەكـەم دەسـت بەسوننەت رێگاكەی منەوە بگـرن و دەسـت بـە سـوننەتو رێگـای جێنـشینە رێنمـویی كراوەكانەوە بگرن، توند دەستی پێوە بگرن، بـە ددانـەكانتان تونـد بیگـرن، ئاگـاداری كـارە نوێیـەكان(داهێنراوەكـان) بـن، چـونكە هـەموو داهێنراوێـك گومڕاییـەو هـەموو گومڕاییەك لە ئاگردایە).

جا ئەگەر كارەكانمان لیٚ تێكەڵ بوو، بانگەشەكان زۆر بوون ئـەوا سـوپاس بـۆ خـوا، ڕێگـا چـارە هەیـە، ئـەویش شـوێنكەوتنی كیتـاب و سـوننەو ئـەوەی پێـشینی ئـەم ئوممەتەی لەسەر بووە، هەموان بانگەشەی ئەوە دەكەن لەسەر كیتاب و سوننەن، چی شـتێك ئێمـە لـەوان جیـا دەكاتـەوە؟ ئـەوەی ئێمـە لـەوان جیـا دەكاتـەوە مەنهـەجی سەلەفە، چونكە سەلەف ئەوان بوون بەجوانی تێگەیشتن لـەكیتاب و سـوننەو لەسـەری ڕۆیشتن، جا ئێمە شوێنی سەلەفی صـالَح دەكـەوین، ئەمـە ئـەو جیاوازییەیـە لـەنێوان ئێمەو گومڕاكـانو كۆمەڵـە لـەڕیٚ لادەرەكاندایـە، بـەكار كـردن بـەو فەرموودەیـەی كـە دەفـەرموێت: (و ستفترق هذه الأمة على ثلاث وسبعين فرقة كلها في النار إلا واحدة) قالوا: ومن هي يا رسول الله (ﷺ)؟ قال: من كان على مثل ما أنا عليه اليوم وأصحابي)[٢٦٦] واتـە: ئوممەتەكەم دەبێتە حەفتا و سیٚ تاقم و فیرقەوە، هەمووی لە ئاگردایە تەنها یەكێكیان نـەبێت، فـەرموویان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) كـێن ئـەو كۆمەڵـە ڕزگـار بـووە؟ فەرمووی: ئەو ڕێگایەی ئەمڕۆ منو هاوەڵانمی لە سەرین).

---

٢٦٥ / سبق تخريجه .

٢٦٦ / سبق تخريجه .

حەق ڕوون و دیارو ئاشکرایە، ڕێگاکەش ڕوون و دیارە بۆ هەرکەسێ ڕزگاربوونی بوێت، خوای گەورە دەفەرموێت: (فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ مِنِّي هُدًى فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَى (١٢٣) وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنْكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى (١٢٤) طه) واتە: جا ئەگەر لەمنەوە ڕێنماییەکتان بۆ هات ئەوسا ئەوەی پەیڕەوی لەڕێنمایی منی کرد ئیتر نە لە دونیادا گومڕا ئەبێ و نە لە قیامەتیشدا بەدبەخت ئەبێ بەسزا (١٢٣)وە هەرکەسێکیش لەو قورئانەیەم ڕوو وەرگێڕێ ئەوە بێ گومان ژیانێکی سەختی دەبێ، هەرچەندە خاوەنی دونیایش بێ بەڵی مرۆڤ هەرکە پەیوەندی لە خوا بچڕا دڵی تەنگە، بچووکە، بێ ئارامە، هەرگێز تێرنابێ، وە لە ڕۆژی قیامەتیشدا بە کوێری حەشرو دادگایی ئەکەین (١٢٤).

مەبەست لە: (خلافا لما في هذا الكتاب).

واتە: جیاواز بێت لەگەڵ ئەوەی لەم کیتابەدا هەیە لەبنەماکانی عەقیدە کە لە قسەی نوسەر نییە، بەڵکو ئەوەی لەم کتێبەدا هەیە بریتییە لەقسەی خواو قسەی پێغەمبەرکەی (ﷺ) و قسەی سەلەفی صالح، ئەمە ئەوەیە لەم کتێبەدا هەیە.

مەبەست لە: (ليس يدين الله بدين).

چونکە ئەو لەسەر مەنهەجی گومڕاییە، هەر کەسێ لەکیتاب و سوننەو مەنهەجی سەلەف جیاواز بوو ئەوە لەسەر مەنهەجی گومڕاییە.

مەبەست لە: (كما لو أن عبدا آمن بجميع ما قال الله عز و جل إلا أنه شك في حرف).

دەبێ باوەڕمان هەبێت بە هەموو قورئان، بەو سوننەتەی پێغەمبەری خواو (ﷺ) هاوەڵانی لەسەر بووە هەر هەمووی، بەڵام کەسێك باوەڕ بەبەشێکی بکاتو باوەڕ بە بەشەکەی تری نەکات ئەوە کافرە بەهەمووی، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: (أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ فَمَا جَزَاءُ مَنْ يَفْعَلُ ذَلِكَ مِنْكُمْ إِلَّا خِزْيٌ فِي الْحَيَاةِ

الدُّنْيَا وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يُرَدُّونَ إِلَى أَشَدِّ الْعَذَابِ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ (٨٥)البقرة) واتــه: باشه ! چۆن ڕەوای هەقە باوەڕتان بەبەشێکی بەرنامەکەی تەورات هەبێ و بەبەشێکی تری کافربن و حاشای لێبکەن، دیارە هەرکەسێکتان کارو ڕەفتاری ئاوا بکاو، پەیمانی خۆی هەڵوەشێنێتەوە، هەر لەم ژیانی دونیایەدا ڕیسواو ڕەزیل دەبێ و لەڕۆژی قیامەتیشدا بەتوندی جەزرەبەو سزا دەدرێن هەرگیز خواش لەهیچ کارو کردەوەیەکی ئێوە بێ ئاگاو غافڵ نییە).

جا ئەو کەسەی کیتابو سوننە وەرناگرێت تەنها ئەوە نەبێ لە گەڵ ئارەزوویدا دەگونجێ و واز لەوە دەهێنێ لەگەڵ ئارەزووەکەیدا ناگونجێت ئەمە وەکو ئەهلی کیتابە، خوای گەورە دەفەرموێت: (أَفَكُلَّمَا جَاءَكُمْ رَسُولٌ بِمَا لَا تَهْوَى أَنْفُسُكُمُ اسْتَكْبَرْتُمْ فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ (٨٧) البقرة) واتە: کەی ئەمە ڕاست و ڕەوایە کە هەتا ئیستاش هەر کات پەیامبەریکتان بۆ هاتبی_کە پەیامەکەی لەگەڵ هەواو ئارەزووی ئێوەدا نەگونجابێ _نارەزاییتان دەربریوەو دەعیەو تەکەببورتان بەسەریاندا کردووەو باوەڕتان نەهیناوە؟! ئەوساش بوونەتە دوو دەستەوە: دەستەیەکتان باوەڕتان پێ نەکردن و بە درۆتان خستنەوەو دەستەیەکی تریشیانتان کوشتن).

ئەمە باسی کافرەکانی ئەهلی کیتابە ئەوان ئەوەیان لە پێغەمبەرانیان وەردەگرت لە گەڵ ئارەزوەکانیاندا بگونجایە، ئەوەی لەگەڵ ئارەزووەکانیاندا ناکۆك بێت و پێغەمبەرانیان هێنابێتی، ئەوا یان بەدرۆی دەخەنەوەو یان ئەو پێغەمبەرەیان دەکوشت کە هێناویەتی، چەندین پێغەمبەریان کوشت چونکە لەگەڵ ئارەزووەکانیاندا نەدەگونجا، خوای گەورە دەفەرموێت: (كُلَّمَا جَاءَهُمْ رَسُولٌ بِمَا لَا تَهْوَى أَنْفُسُهُمْ فَرِيقًا كَذَّبُوا وَفَرِيقًا يَقْتُلُونَ (٧٠) المائدة) واتە: کەچی هەر جارەی یەکێ لەو پەیامبەرانە، بەپێچەوانەی ئارەزووی ئەوان شتێکی بۆ هێنابان دەستەیەك لە پەیامبەرەکانیان بەدرۆزن دادەناو دەستەیەکیشیان هەر بە کوشتن شەهیدیان دەکردن).

ئەمە ڕێگای ئەوانە، جا هەر کەسێ ئەوە لەقورئان و سوننەت وەرگرێ کە لە گەڵ ئارەزووەکەیدا دەگونجێ و پشتگیری مەنهەج و ڕێگاکەی دەکات و ئەوەی لەگەڵ ئارەزوو و مەنهەجەکەیدا نەگونجێ ئەوا ڕەدی دەکاتەوە، ئەوە وەکو ئەوانە، ئیمانی بەهەندێ لەکیتابەکەی هێناوەو کوفری بەهەندەکەی تر کردووەو سوود نابینێ لەوەی کاری بەهەندێ لەکیتابەکە کردووە، چونکە ئەو بە هەمووی کافرە.

**مەبەست لە:** (فقد ردَّ جميع ما قال الله تعالى وهو كافر).

هەرکەسێ پیتێك لە قورئان ڕەد بکاتەوە ئەوە کافرە، بۆ نمونە لەئایەتی: (ق وَالْقُرْآنِ الْمَجِيدِ (١) ق) بڵێت: (ق) ئەمە لەقورئان نییە (وَالْقُرْآنِ الْمَجِيدِ) بەسە، وەکو ئەو کەسەی دەڵێت: (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ (١) الاخلاص) دەڵێین: (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) ئەو گوتی (قُلْ) ئەمە لە قورئان نییە، ئەمە کافرە_پەنا بەخوا_ چونکە وشەیەکی لەقسەکانی خوا ڕەد کردووەتەوە یان تەنها پیتێکی ڕەد کردووەتەوە.

**مەبەست لە:** (كما أن شهادة: أن لا إله إلا الله، لا تقبل من صاحبها إلا بصدق النية وخالص اليقين).

(لا اله الا الله) بریتییە لەوشەی (الاخلاص) وشەی تەقواو هۆکاری بتەوو قایمەو کلیلی بەهەشتە، بەڵام سوود بە خاوەنەکەی ناگەیەنێ ئیللا بەبوونی حەوت مەرج یان هەشت مەرج، زانایان لەم دوو دێڕە شیعرەدا فەرموویانە:

علمٌ يقينٌ وإخلاصٌ وصدقك      مع محبةٍ وانقيادٍ والقبول لها

ئەمە حەوت مەرجە.

وزيد ثامنها الكفران منك بما      سوى الإله من الأشياء قد ألها

هەرکەسێ لە یەکێ لەمەرجەکانیدا کەموکووری و ناتەواوی هەبێت ئەوا سوود لە (لا اله الا الله) وەرناگرێ:_

مەرجی یەکەم: عیلم بە ماناکەی و دژەکەی نەزانینە بەماناکەی.

مەرجی دووەم: یەقین بەوەی دەلالەتی بۆ دەکات و دژەکەی گومانە.

مەرجی سێ یەم: ئیخلاص (نیازپاکی) و دژەکەی هاوەڵ بڕیاردانە بۆ خوا.

مەرجی چوارەم: بەڕاستزانینو دژەکەی درۆکردنەو بەدرۆخستنەوەی ئەوەی دەلالەتی بۆ دەکات.

مەرجی پێنجەم: خۆشەویستی ئەوەی یەکتاپەرستی دەلالەتی بۆ دەکاتو دژەکەشی ڕق لێبوونی ئەوەی دەلالەتی بۆ دەکات.

مەرجی شەشەم: ملکەچ بوون بەوەی دەلالەتی بۆ دەکات و دژەکەشی پشت لێ کردنی ئەوەی دەلالەتی بۆ دەکات.

مەرجی حەوتەم: ڕازی بوونو وەرگرتنی ئەوەی دەلالەتی بۆ دەکاتو دژەکەشی ڕازی نەبوونی ئەوەیە دەلالەتی بۆ دەکات.

مەرجی هەشتەم: کوفر بەوەی جگە لەخوا دەپەرسترێ دژەکەی کوفر نەکردنە پێی.

ئەمە هەشت مەرجە پێویستە جێ بەجێ ببێت لەو کەسەی دەڵێت: (لا اله الا الله) چونکە تەنها وشەیەك نییەو بەزمان بگوترێ، (لا اله الا الله) چەند پایەیەکی هەیەو چەند مەرجێکی هەیە، پایەکانی دوو دانەن:_

یەکێکیان: نەفییە.

ئەویتر: ئیسپاتە (سەلماندنە).

جا تەنها نەفی بەبێ ئیسپات (سەلماندن) سوودی نییەو تەنها ئیسپات (سەلماندن) بەبێ نەفی سوودی نییەو ئەگەر وتت: (الله اله) ئەوا ئەمە بەس نییە، ئەگەر وتت: (لا اله) ئەمەش تەنها نەفییە چونکە بەیەکجاری نکوڵیت لەخوا کرد، ئەوا دەبێتە یەکێك

لەوانەی نکۆڵی لەبوونی خوا دەکەن بەیەکجاری و ماناکەی: لەگەردووندا هیچ خوایەك بوونی نییە.

بەڵام صۆفییەکان ئەوانەی دەڵێن: (الله الله) یان (هو هو) ئەمە قسەیەکی پووچەڵ و وڕێنە کردنەو هیچ سوودی نییە، بۆیە دەبێ بڵێیت: (لا اله الا الله) بەنەفی و ئیسپاتەوە، ئەویش مانای ئەو ئایەتەیە دەفەرمویت: (فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ) البقرة/٢٥٦)، جا (فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ) ئەمە نەفییە (وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ) ئەمە ئیسپاتە (سەلماندنە).

مەبەست لە: (وكذلك لا يقبل الله شيئا من السنة في ترك بعض).

هەروەکو چۆن ئیمان تەواو نابێ بەهەندێ لەقورئان و وازهێنان لەهەندێکی تر ئەگەر تەنها یەك ئایەتیش ببێت یان تەنها یەك پیت، هەروەها سوننەتیش ئیمان هێنان پێی تەواو نابێ ئیللا ئەگەر ئیمان بەهەمووی بهێنی، نابێ نکۆڵی لەهیچ شتێك بکات لەوە کە بە (صحیح)ی لەپێغەمبەری خوداوە (ﷺ) ڕیوایەت کراوە، چونکە ئەمە ماناو ناوەڕۆکی شایەتی دانی (محمد رسول الله) یە ئەویش کار بەسوننەتەکەی بکەیتو گوێڕایەڵی بێت و واز لەوە بهێنی نەهی لێ کردووە، ئەمە ناوەڕۆکی مانای شایەتیدانی (أن محمدا رسول الله) یە بەڵام ئەگەر شایەتی دا کە (محمد رسول الله) یە بەڵام باوەڕ نەکات بەوەی هێناویەتیو بەوەی لە فەرموودەکاندا وتویەتی، یان ڕەدی هەندێك لەفەرموودەکانی کرد کە (صحیح)ن چونکە لەگەڵ ئارەزووەکەیدا ناگونجێ، یان لەگەڵ مەنهەجەکەیدا ناگونجێ، ئەمە کافرە بەپێغەمبەری خواو(ﷺ) لەو کەسانەیە خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت: (كُلَّمَا جَاءَهُمْ رَسُولٌ بِمَا لَا تَهْوَى أَنْفُسُهُمْ فَرِيقًا كَذَّبُوا وَفَرِيقًا يَقْتُلُونَ (٧٠) المائدة) بۆیە پێویستە باوەڕ بەهەموو سوننەت بکەیت، ئەوەی لەگەڵ ئارەزووەکانتدا دەگونجێو ئەوەی لەگەڵ ئارەزووەکانتدا ناگونجێ ئەوەی لەگەڵ مەنهەجەکەتدا دەگونجێ و ئەوەی لەگەڵ مەنهەجەکەتدا ناگونجێ، دەبێ

مەنهەجەکەی خۆت لەسەر کیتاب و سوننە بنیات بنێیت، لەسەر ئارەزوو بنیاتی مەنێ، یان لەسەر قسەی فلان، یان لەسەر بەرنامەی حزبو یان کۆمەڵەی فلانی، لەسەر ئەوانە بنیاتی مەنێ، بەڵکو لەسەر کیتاب و سوننەو مەنهەجی پێشینە چاکەکان بنیاتی بنێ.

مەبەست لە: (ومن ردَّ من السنة شيئاً).

بۆ نموونە: موعتەزیلەکان و زانایانی ئەهلی کەلام ئەوانەی باوەڕیان بەفەرموودەی (ئاحاد) نییە دەڵێن: چونکە ئیفادەی عیلم ناکات بۆیە لەبیرو باوەڕدا وەری ناگرن، چەند یاسایەکی مەنتیق و عیلمی کەلام دەهێننو دەڵێن: _

چونکە مەنتیق وعیلمی کەلام دڵنیایی (یەقین) دەبەخشێت، چونکە چەند بەڵگەیەکی عەقڵین، بەڵام قسەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر هاتوو هەواڵەکە (ئاحاد) بوو ئەوا سوودی دڵنیایی ناگەیەنێ، فەرموودەیش سوودی یەقین ناگەیەنێ لای ئەوان هەرچەندە لە هەردوو کتێبی (صحیح) دا هەبێ، ئەمە گومڕاییە پەنا بەخوا، چونکە ئەوەی بە (صحیح)ی لەپێغەمبەری خوداوە (ﷺ) ڕیوایەت کرابێ ئەوا ئیفادەی عیلم دەکات و ئیفادەی یەقینیش دەکات چونکە قسەی ئەو کەسەیە دەربارەی وتراوە: (وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى (٣) إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى (٤) النجم) جا ئەوانە هەندێکی وەحییان بەدرۆخستەوە چونکە ڕەدی فەرموودە ئاحادەکان دەکەن لەبیرو باوەڕداو وەری ناگرن، ڕەدی هەندێکی وەحییان کرد کە خوای گەورە دایبەزاندووە ئەمە ڕێگایەکی گومڕاییە _پەنا بە خوا _.

مەبەست لە: (فقد ردَّ السنة كلها).

سوود لەوە نابینێ وەری گرتووە، تاکو هەمووی وەرنەگرێ.

**مەبەست لە:** (فعليك بالقبول، ودع عنك المماحلة واللجاجة).

(المماحلة) **واتە موجادەلە،** و(اللجاجة) **جیدال کردنە کە هیچ سوودێکی لێ نابینیێ و دەنگ بەرزکردنەوەیە لەپێناوی ئەوەی سەرکەویتە سەر نەیارەکەتدا ئەمە هیچ سودت پێ ناگەیەنێ.**

**مەبەست لە:** (فإنه ليس من دين الله في شيء).

**جیدال کردن بە** (باطل) **لەدینی خوادا نییە، خوای گەورە دەفەرموێت:** (مَا يُجَادِلُ فِي آيَاتِ اللَّهِ إِلَّا الَّذِينَ كَفَرُوا) غافر/٤) **واتە: هەر ئەوانە لەبارەی ئایەتەکانی خواوە ململانێ و دەمبازی ئەکەن _لەڕووی عینادەوە_ کافرو بێ باوەڕن) جیدالی تێدا دەکەن ئایە لەلایەن خوداوە هاتووە؟ یان لەلایەن خوداوە نییە؟ ئایە قورئان کەلامی خودایە یان نا؟ ئایە ئەوە دابەزیوە یان دروستکراوە؟ ئەمە هەمووی لەجیدال کردنە لەکیتابەکەی خوادا و دەمەقاڵەی بەتاڵە.**

**مەبەست لە:** (وزمانك خاصة زمان سوء فاتق الله).

**ئەمە لەکاتو سەردەمی نوسەردا، ئایە لەسەردەمەکانی پاش ئەودا چۆنە؟ لەکاتێکدا فیتنەکە توندترەو سەردەمەکەی ئەو -لەگەڵ ئەو هەموو فیتنەیە- زانایانی لێ بووە، بەڵام هەر کاتێ سەردەم درەنگتر بێت ئەوا زانایان کەم دەبنەوەو خراپە زۆر دەبێ جا ترسناکییەکە توندترە لەکۆتا سەردەمدا.**

**﴿١١٤﴾ نوسەر دەڵێت: (وإذا وقعت الفتنة فالزم جوف بيتك وفر من جوار الفتنة وإياك والعصبية وكل ما كان من قتال بين المسلمين على الدنيا فهو فتنة، فاتق الله وحده لا شريك له، ولا تخرج فيها ولا تقاتل فيها ولا تهوَ ولا تشايع ولا تمايل، ولا تحب شيئا من أمورهم، فإنه يقال: من أحب فعال قوم - خيرا كان أو شرا- كان كمن عمله، وفقنا الله وإياكم لمرضاته وجنبنا وإياكم معاصيه)**

واتە: ئەگەر فیتنە ڕوویدا ئەوا دەست بە بنی ماڵەکەی خۆتەوە بگرە، لە هاوسێتی فیتنە دوور بکەوە، ئاگادارو وریای دەمارگیری بەو هەر کوشتارێك لەنێوان موسڵماناندا لەسەر دونیا ڕوویداوە ئەوا فیتنەیە، بۆیە لەو خوایە بترسە کە تاك و تەنهایەو هاوەڵی نییە، تێیدا دەرمەچۆ، کوشتاریش مەکەو ئارەزووت بۆ لای کەس نەڕوات و لەگەڵ هیچ پارچەیەکدا مەبەو لامەدە، هیچ شتێك لەکاروباری ئەوانت لا خۆشەویست نەبێ، چونکە گوتراوە: هەرکەسێ کردەوەی کۆمەڵێکی خۆش بوێت _جا ئەگەر چاك بوو یان خراپ_ ئەوا وەکو ئەو کەسەیە کاری پێ کردبێت، خوای گەورە ئێمەو ئێوە تەوفیق بدات بۆ ڕەزامەندی خۆی و دوورمان بکاتەوە لەسەرپێچی کردنی.

ڕاڤە/

**مەبەست لە:** (وإذا وقعت الفتنة فالزم جوف بيتك).

ئەگەر فیتنە ڕوویدا ئەویش کوشتارە لەنێوان موسڵماناندا، ئەوا دەست بەماڵەکەی خۆتەوە بگرە، دەستو زمانت بگرە بۆ ئەوەی سەلامەت بن، ئەمە ئەگەر لە دەرچوونت لەماڵەکەت هیچ سوودێکی نەبوو و کەس لێت وەرناگرێ ئەوا دەست بەماڵەکەی خۆتەوە بگرە، بەڵام ئەگەر هاتوو بەدەرچوونت بۆ ناو خەڵکی و تێکەڵی

کردنیـان و بـانگ کردنیـان بـۆ لای خـواو ڕوون کردنـەوەی حـەق سـوودی هـەبوو ئـەوا دەرچۆ، ئەمەش پێی دەگوترێ: (الاختلاط والعزلـة) واتـە: تێکـەڵ بـوون و گۆشـەگیری ئایە کامیان باشترە؟ دەڵێین:– ئەمـە دەگۆڕێـت، ئەگـەر هـاتوو لـە تێکـەڵ بوونەکـەت سوودێك هەبوو و بانگ کردنی خەڵکی بۆ لای خواو ڕوون کردنەوەی حـەق ئـەوا تێکـەڵ بوونەکە چاکترە، ئەگەر هاتوو لەتێکەڵ بوونی خەڵك و بانگەواز کردنیان بێ سوود بـوو ئـەوا گۆشـەگیرییەکە چـاکترە، ئەمـەش بـۆ ئـەو کەسـەیە (عـیلم)ی هـەبێ، بـەڵام ئـەو کەسەی (عیلم)ی نییە ئەوا گۆشەگیرییەکەی چاکترە لە هەموو حاڵەتێکدا، بـۆ ئـەوەی تووشی فیتنە نەبێت لە کاتێکدا ئاگـای لـەخۆی نـەبێ‌و نازانێـت، جـا کەسـی بـێ عـیلم دەست بەماڵەکەی خۆیـەوە دەگرێـت، بـەڵام کەسـی زانـا هـەروەکو باسمـان کـرد ئـەوا باسەکە ڕوونکردنەوەی تێدایە.

مەبەست لە: (وإياك والعصبية).

واتە: دەمارگیرییەکی ناڕەواو سەرخستنی ڕاو بۆچوونی خۆت، یان کۆمەڵەکـەت کـە سەر بە ئەوی، حەق بکە مەبەست و ئامانجی خۆت، جا ئەگەر هاتوو لای خۆت بوو یان لای جگە لەخۆت بوو، یان جەماعەتەکەی خۆتو یان لە جەماعەتەکەی تـر بـوو، حـەق بکە ئامانجی خۆت، حەقیش شتە بزرەکەی ئیماندارە لـە هـەر کوێیـەك دۆزییـەوە ئـەوا وەری دەگرێ، بەڵام ئەو کەسەی دەمارگیری بۆ ڕاکەی خۆی بێـت و حـەق وەرنـەگرێ، ئەمە بەشێکە لەدینی نەفامی، لە دەمارگیری نەفامییـە، لـە ئیـسلام نییـە، جـا کەسـی موسڵمان بەدوای حەقدا دەگەڕێ و شوێنی حەق دەکـەوێ لەگـەڵ هـەر کەسـێکدا بێـت ئەمە موسڵمانی تەواوە، ئارەزووەکەی دەکاتە شـوێنکەوتەی ئـەوەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) هێناویـەتی هـەر وەکـو لـەو فەرموودەیـەدا هـاتووە کـە لـە (الاربعـین)دا هەیـەو ئیمامی النووی بە(صحيح)ی دەزانێ دەفەرموێت: (لايؤمن أحدكم حتى يكون هواه تبعا لما

جئت به)[٢٦٧] **ئەمیش لە لایەن ئەو ئایەتەوە پشت ڕاست دەکرێتەوە کە دەفەرموێت:** (كُلَّمَا جَاءَهُمْ رَسُولٌ بِمَا لَا تَهْوَى أَنْفُسُهُمْ فَرِيقًا كَذَّبُوا وَفَرِيقًا يَقْتُلُونَ (٧٠) المائدة) **واتە: کەچی هەر جارەی یەکێ لەو پەیامبەرانە، بەپێچەوانەی ئارەزووی ئەوان شتێکی بۆ هێنابان دەستەیەك لە پەیامبەرەکانیان بەدرۆزن دادەناو دەستەیەکیشیان هەر بە کوشتن شەهیدیان دەکردن).**

**مەبەست لە:** (وكل ما كان من قتال بين المسلمين على الدنيا فهو فتنة).

**کوشتار لەنێوان موسڵماناندا دروست نییە، چونکە خوێنی موسڵمان حەرامە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت:** (لايحل دمُ امرئ مسلم إلا بإحدى الثلاث: النفس بالنفس، والثيب الزاني، والتارك لدينه المفارق للجماعة)[٢٦٨] **واتە: خوێنی هیچ موسڵمانێك حەلاڵ نییە تەنها بە یەکێ لەم سێ شتە نەبێت: نەفس بەرانبەر بە نەفس و ئەو پیاوەی (یان ئەو ژنەی) هاوسەرگیری کردوەو زینا دەکات و ئەو کەسەی واز لە دینەکەی خۆی دەهێنێت و لە کۆمەڵی موسڵمانان جیا دەبێتەوە).**

**جا خوێنی موسڵمان پارێزراوە هەروەها خوێنی (المعاهد) ئەو کەسەیە لە نێوان ئەو و دەسەلاتداری موسڵماناندا پەیمان و ئەمان هەیە، یان لە نێوان ئەو و یەکێ لە موسڵماناندا ئەمان هەیە، جا ئەوە خوێنەکەی حەرام دەبێت (کوشتنی حەرامە) لە بەر ئەو پەیمان‌و ئەمانەی پێی دراوە، خوای گەورە دەفەرموێت:** (وَلَا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ) الاسراء(٣٣) **واتە: ئەو کەسە خوا خوێنی یاساغ کردووە، بەهەق نەبێ ئێوە مەیکوژن).**

---

٢٦٧ / ضعيف : سبق تخريجه .

٢٦٨ / رواه البخاری (٦٤٨٤) ومسلم (١٦٧٦) .

ئەو نەفسەی خوای گەورە حەرامی کردووە، نەفسی ئیمانداره یان نەفسی پەیمان پێدراوە(معاهد)ـە یا تەئمین کراو (مستأمن)ـە، ئەمە ئەو نەفسەیە خوای گەورە حەرامی کردووە، بۆیە نابێ بکوژرێن ئیللا بەحەق نەبێت، حەقیش ئەوەیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆی روون کردوینەتەوە بەیەکێ لەم سێ حاڵەتە:

- یان (قصاص) نەفسێك بەرانبەر نەفسێك.
- یان کەسێ زینای کردبێ و (محصن) بێت (واتە شووی کردبێ یان ژنی هێنابێ) ئەوا تاکو مردن بەرد باران دەکرێت.
- یان هەڵگەڕاوە لەدینەکەی دەکوژرێت لەبەر هەڵگەڕانەوەکەی.

ئەمانە خوێنی موسڵمان حەڵاڵ دەکات، جگە لەوانە ئەوا خوێنی موسڵمان حەرامە، ئەگەر هاتوو زۆردار هەبوو یان خەواریج دەرچوون لەدژی موسڵمانان یان ستەمیان کرد لە موسڵمانان، جا ئەوانە دەکوژرێن لەبەر نەهێشتنی خراپەیان نەك لەبەر کوفریان، بۆیە خەواریج دەکوژرێنو زۆردارو ستەمکاران دەکوژرێن ئەوانەی هەڵدەکوتنە سەر موسڵمانان و حەرامکراوەکان حەڵاڵ دەکەن ئەوا دەکوژرێن لەبەر نەهێشتنی خراپەیان، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی بەکوشتنیان کردووەو خوای گەورە فەرمانی بەکوشتنی ئەوانەی دەستدرێژی دەکەن، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ) الحجرات/٩) واتە: ئەگەر دوو دەستە لە باوەڕداران پێکەوە بەجەنگ هاتن جا بەهەرچی تواناتان هەیە ئاشتیان بکەنەوە جا ئەگەر دەستەیەکیان دەست درێژی کردە سەر دەستەکەی تر ئەوا ئێوەیش لەگەڵ ئەو کۆمەڵەیاندا بجەنگێن دەستدرێژی دەکات تا ناچار ئەبێ و ئەگەڕێتەوە بۆ بڕیارو حوکمی خوا).

خـوای گـەورە فـەرمانی کوشـتنی دەسـتدرێژکارانی داوە، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرمانی بەکوشتنی خەواریج داوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (فأينما لقيتموهم فاقتلوهم)[٢٦٩] واتـە: لـە هـەر کـوێ پێیـان گەیـشتن ئـەوا بیـانکوژن) لەبـەر نەهێـشتنی خراپەیان لە سەر موسڵمانان، ئەمە بە وردی باسی کوشتنی موسڵمانە، ئەصـل وایـە نەکوژرێن ئیللا لەکاتی دەستدرێژیدا نەبێ، یان لەحاڵەتی دەرچوون لە دژی موسڵمانان نەبێ، هەروەها ئەگـەر موسڵمانێك هەڵیکوتایـە سـەرت دەیـەوێت ماڵەکـەت ببـات یـان دەیەوێ بتکوژێت، یان دەیەوێ خراپە لەگەڵ کەس و کارتدا بکات ئەوا تۆ بەسووکترین و ئاسانترین شێوە لـەخۆت دووری دەکەیتـەوە جـا ئەگـەر لێـت دوور نەکەوتـەوە ئـیللا بەکوشتن نـەبێ ئـەوا دەیکوژیـت، خوێنـشی بـە فـیڕۆ دەچێت، جـا خـوێنی موسڵمان بەهەڵکوتانــە ســەرو زۆرداریو دەرچــوون و ڕێگــری حــەڵاڵ دەبــێ، ئەمەیــە خــوێنی موسڵمان حەڵاڵ دەکـات، ئـەویش لـە بـەر کوفرەکـەی نییـە، بـەڵکو لەبـەر نەهێـشتنی خراپەیەتی لەسەر نەفس و حورمەت یان لە سەر ماڵ، تەنانەت ماڵیش.. لێـی مەگـەڕێ ماڵەکەت ببات، بەرگری لێ بکەن ئەگـەر بەکوشـتنیش بـووە، هـەروەها تەعـەدا کردنـی گشتی لە موسڵمان یان لەسەر ئاسایشیان بە ڕێگری کردن یان زۆرداری یـان دەرچـوون لەدژی موسڵمانان.

مەبەست لە: (على الدنيا فهو فتنة).

واتە: ئەگەر هـاتوو کوشـتارەکە لـەنێوان موسـڵماناندا لـە پێنـاوی دونیـادا بـوو، لـە پێناوی ئاسایشدا نەبوو، یـان لـەپێناوی بـەرگری کـردن لـە حورمـەتی موسـڵمانان یـان لەسەروەت و سامانی موسڵمان، بەڵکو لەپێناوی دەست گرتن بەسـەر سـامان و بردنـی ساماندا بوو، ئەگەر دوو موسڵمان لەسەر پارە بـوو بەشـەڕیان، ئـەوا بکـوژو کـوژراو لـە

---

٢٦٩ / سبق تخريجه .

ئـاگردان، پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فەرموویـەتی: (إذا الْتَقَى الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا فَالْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِي النَّارِ) قالوا: يا رَسُولَ اللَّهِ هذا شأن الْقَاتِلُ فما بَالُ الْمَقْتُولِ؟ - واتە بۆ کوژراوەکە لـە ئاگردایـە - قال: (إنه كان حَرِيصًا على قَتْلِ صَاحِبِهِ)[٢٧٠] واتـە: نیـەتی ئـەوە بـوە هاوڕێکەی بکوژێ ئەگەر توانیبایـە، جـا بـووە یـەکێ لـە ئـەهلی ئـاگر _ پـەنا بـەخوا_ لەسەر نیەتی خۆیو حەڵاڵ کردنی خوێنی براکەی بوو بۆیە چووە ئاگرەوە.

مەبەست لە: (ولا تخرج فيها ولا تقاتل فيها) واتە: لەفیتنەدا.

مەبەست لە: (ولا تهوَ ولا تشايع ولا تمايل).

لایـەنگیری ئـەهلی فیتنـە مەکـە، یـان پـشتگیرییان بکـەیت یـان سـەریان بخـەیت و بەرگرییان لێ بکەیت، چونکە تۆیش هاوبـەش دەبیـت ئەگـەر بـەرگریت لـەوان کـردو ڕاو بۆچوونی ئەوانت بەڕاست زانی، هەرچەندە لەگەڵ ئەوانیشدا دەرنەچوویت، ئەوا تـۆیش بەشدار دەبیت لەتاوان و خراپەو دوژمنکاریدا، ئێستا خەڵکانێك هـەن پـشتگیری ئەوانـە دەکـەن تەقینـەوەو وێرانکـاری دەکـەنو نـاوی لێ دەنـێن: (الجهـاد فـی سـبيل الله) موسڵمانان و پەیمان پێدراوەکان (معاهـد)ەکـان دەکـوژن، وێـران دەکـەنو موسـڵمانان دەترسێننو دەڵێن –یـان ئـەو کەسـەی پـشتگیریان دەکـات–: ئەمـە جیهـادە لـەپێناو خوادا، بەرگرییان لێ دەکەن، جـا ئەوانـە حوکمیـان وەك ئەوانـە_پـەنا بـەخوا_چـونکە پشتگیریان دەکەن و ڕاکەیان بەڕاست دەزانن، جا مەسەلەکە ترسێکی گەورەی تێدایە، جا تۆ هاوبەشی لەگەڵ ئەواندا هەرچەندە لەگەڵ ئەوانـدا چـەکت هەڵنـەگرتبێ، بـەهۆی پشتگیری و بەڕاست زانینی ڕاکەیان، بەڵکو لەوە توندتر ئەوەیە کارەکەیان بـە (الجهـاد فی سبيل الله) وەصف دەکات.

---

٢٧٠ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٣١) ومسلم (٢٨٨٨) .

**مەبەست لە:** (فإنه يقال: من أحب فعال قوم - خيرا كان أو شرا - كان كمن عمله).

هەر کەسێك کردەوەی کۆمەڵێکی پێ خۆش بێت ئەوە وەکو ئەوەیە کارەکەی کردبێ،جا ئەگەر خەیرو چاکە بوو ئەوە وەکو پاداشتی ئەوانی دەست دەکەوێت‌و ئەگەر کارەکە خراپ بوو ئەوە وەکو تاوان‌و گوناهی ئەوانی دەست دەکەوێت _پەنا بەخوا_ بۆیە هاتووە دەربارەی ئەو کەسەی خۆزگە دەخوازێت وەکو ئەو زانایەی لێ بێت خەڵکی فێری خەیر دەکات ئەوا وەکو پاداشتی ئەوی هەیە، ئەو کەسەی خۆزگە دەخوازێت وەکو ئەو دەوڵەمەندەی لێ بێت ماڵەکەی لە پێناوی خوادا دەبەخشێ ئەوا پاداشتی وەکو ئەوە، بەپێی نییەتی، هەروەها بە پێچەوانەوە ئەو کەسەی خۆزگە بە تاوانبار (مجرم) و سەرپێچیکاران دەخوازێت ئەوا هاوبەشی ئەوان دەبێ لەتاواندا یان پشتگیری ڕاکەیان دەکات و بەڕاستی دەزانێ ئەوە وەکو ئەوانە، هەرچەندە کردەوەی وەکو کردەوەی ئەوان نەبێ، ئەمە تەنها لەبەر ئەوەی ڕاکەیانی بەڕاستزانی و لایەنگیری ئەوانی کرد.

بۆیە با مرۆڤ ئاگاداری خۆی بێ، بە هەلاکەتدا بچێ لەکاتێکدا ئاگای لەخۆی نییە لەم فیتنەو لەم خراپەکارییەداو هیچ قسە مەکە تەنها خەیر نەبێ ئەگەر نا بێ دەنگ بە.

**﴿١١٥﴾ نوسەر دەڵێت: (وأقِلَّ من النظر في النجوم إلا بما تستعين به على مواقيت الصلاة وَالهَ عما سوى ذلك فإنه يدعو إلى الزندقة).**

واتە: بەکەمی تەماشای ئەستێرەکان بکە (ئەستێرەناسی)، ئیللا ئەوە نەبێ پشتی پێ ببەستێ بۆ زانینی نوێژەکان، جگە لەوە وازی لێ بهێنە چونکە ئەوە بەرەو زەندیقی دەتبات.

**راڤە/**

تەماشاکردنی ئەستێرەکان دوو بەشە: –

بەشی یەکەم: ئیستدلال کردن پێی لەسەر ڕووداوە زەمینەکان ئەویش پێی دەگوترێ (علم التأثير) وەکو هەڵکردنی با و باران بارین و ڕوودانی نەخۆشییەکان و مردنی فلان یان ژیانی فلان ئەمەش (تنجيم)ەو حەرامە، ئەمەش وەکو کردەوەکەی قەومی (نمرود)ە کە بتیان دەپەرست لەسەر شێوەی ئەستێرەکان کێشابویان و دەیانپەرست، چونکە باوەڕیان وابوو ئەستێرەکان کاریگەرییان لەسەر ڕووداوەکان هەیە، ئەمەیان نەداوە پاڵ خوا، بۆیە بتیان دروست دەکرد لەسەر شێوەی ئەوان و دەیانپەرست جگە لە خوا، خوای گەورە خۆشەویستەکەی خۆی بۆ ڕەوانەکردن و ئینکاری لێ کردن و بانگی ئەوانی کرد بۆ یەکتاپەرستی خواو بەوانی گوت: (مَا هَذِهِ التَّمَاثِيلُ الَّتِي أَنْتُمْ لَهَا عَاكِفُونَ (٥٢) الانبياء) واتە: ئەم بت و پەیکەرە بێ گیانانە چین ئێوە هەردەم لەبەریان کەوتوون؟).

ئەم جۆرە (تنجيم)ە حەرامەو کوفرەو شیرکە، جا (التنجيم): هەروەکو (شيخ الاسلام ابن تيميه) دەفەرموێت: (بریتییە لە ئیستدلال کردن بەحاڵەتە فەلەکییەکان لەسەر ڕووداوە زەمینەکان)[٢٧١] ئەم (تنجيم)ـە حەرامە، هەروەکو ئێستا لە هەندێ

---

٢٧١ / مجموع الفتاوى (٣٥/١٩٢) .

گۆڤارەکاندا بڵاودەکرێتەوەو لەهەندێ لە ڕۆژنامەکاندا ئیلتزامیان نییە، لە لاپەڕەی تەنجیمو بەختەکان (بورجەکان)، خوێندنەوەی ناودەست و فنجان و لەشێوەی ئەوانە، هەموو ئەوانە لەکاروباری شەیتانەکانەو جادوو بازییە، ئەمەش کوفرە بەخوا، داوا لەخوا دەکەین بمانپارێزێ.

بەشی دووەم: ئەویش پێی دەڵێن: (علم التسيير)، بەوەی جێگەی مانگ بزانیێو ڕێڕەوی خۆر بزانیێ لەساڵەکەدا، بەمەبەستی زانینی کاتەکان، کاتەکانی کشتوکاڵیو کاتەکانی نوێژو کاتی نیوەڕۆ ئەو کاتەیە، کاتی عەسر ئەو کاتەیە، ئەمەش ئاساییە، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَقَدَّرَهُ مَنَازِلَ) واتە: مانگ (هەیڤ) (لِتَعْلَمُوا عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ) يونس/٥) واتە: چەند جێ و مەنزڵگەیەکیشی بۆ دیاری کردووە هەتا ئێوە ژمارەی ساڵەکان و حسابی مانگ و ڕۆژەکان بزانن).

خوای گەورە دەفەرموێت: (وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ آيَتَيْنِ فَمَحَوْنَا آيَةَ اللَّيْلِ وَجَعَلْنَا آيَةَ النَّهَارِ مُبْصِرَةً لِتَبْتَغُوا فَضْلًا مِنْ رَبِّكُمْ وَلِتَعْلَمُوا عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ وَكُلَّ شَيْءٍ فَصَّلْنَاهُ تَفْصِيلًا (١٢) الإسراء) واتە: ئێمە دیاردەی شەوو ڕۆژمان بەدوو بەڵگەو نیشانە لەسەر تاك و تەنیایيو دەسەڵاتی خۆمان نیشاندان ئینجا دیاردەی تاریکیمان بەسەر دیاردەی شەودا هێنا و دیاردەو نیشانەی ڕۆژیشمان(خۆر) بەئاشکراو بینراو سازاند بۆ ئەوە ئێوە بگەڕێن بەدوای ئەو ڕزقو ڕۆزییەدا پەروەردگارتان بەهرەوەرتان دەکاو دەیدا پێتان و تابشتوانن بەئاسانی ژمارەی ساڵەکان و حیسابی شەوو ڕۆژ چاك بزانن و بەڕاستی هەر شتێك کە ئێوە نیازتان پێی هەبێ لەدونیاو لەقیامەتدا ئێمە بەوردی شیمان کردۆتەوە بۆتان).

خوای گەورە دەفەرموێت: (يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْأَهِلَّةِ قُلْ هِيَ مَوَاقِيتُ لِلنَّاسِ وَالْحَجِّ) البقرة/١٨٩)

جا (عیلم التیسیر) ئاساییە، چونکە چەند سوودێکی تێدایەو بیروباوەڕی خراپی تێدا نییە، بەڵام (علم التأثیر) ئەویش ئیستدلال کردنە بەئەستێرەکان بۆ جگە لەوانە ئەوە حەرامەو شیرکە، ئیستدلال کردن بەبەختەکان و خەیرو چاکەو خراپە ئەمە شیرکە بە خوا، بۆیە (قەتادە) دەفەرموێت: (خوای گەورە ئەستێرەکانی بۆ سێ مەبەست دروست کردووە: بۆ ڕازاندنەوەی ئاسمان و ڕەجم کردنی شەیتانەکانو نیشانەکان بە هۆیەوە ڕێنمویی پێ دەکرێت، هەرکەسێ بۆ جگە لەو سێ مەبەستە بەکاری بهێنێ ئەوا گومڕایی یەو بەشەکەی خۆی بزرکردووە، تەکلیفی لەخۆی کردوە لەشتێکدا عیلمی پێی نییە)[٢٧٢].

جا خوای گەورە ئەستێرەکانی بۆ سێ سوود دروست کردووە:_

سوودی یەکەم: ڕازاندنەوەی ئاسمانەکان، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَزَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ)فصلت /١٢) واتە: نزیکترین ئاسمانیشمان بەچەندین چرا (ئەستێرە) ڕازاندەوە بۆتان).

سوودی دووەم: ڕەجمکردنی شەیتانەکان، خوای گەورە دەفەرموێت: (إِلَّا مَنِ اسْتَرَقَ السَّمْعَ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ مُبِينٌ (١٨)الحجر) واتە: بەڵام ئەوەیان بیەوێ گوێ بگرێ و شتێك لەهەواڵی ئاسمان بدزێ بۆ سەرگەردان کردنی خەڵکی شۆلە ئاگرێکی ڕووناك دوای ئەکەوێ، ئەگەر بەری بکەوێ دەیسووتێنێ).

سوودی سێ یەم: نیشانەن لەکاتی سەفەرکردندا ڕێنمویی پێ دەکرێت، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ النُّجُومَ لِتَهْتَدُوا بِهَا فِي ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ) الانعام/٩٧).

---

٢٧٢ / علقه البخاري في صحيحه (١١٦٨/٣) ووصله ابن جرير وابن ابي حاتم وابو الشيخ والخطيب وابن حجر وعبد بن حميد وعبدالرزاق وابن المنذر .

ئەمە سوودی ئەستێرەکانە، بەڵام ئەو کەسەی وادەزانێ و باوەڕی وایە کاریگەری هەیە لەڕووداوەکان، دەرکەوتنی فلان ئەستێرە ئەوە کاتی بەختەوەرییە، دەرکەوتنی دووەم کاتی بەدبەختییە، ئەمەش کوفرە بەخوای گەورە، خوای گەورە دەفەرموێت: (فَلَا أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ (٧٥) وَإِنَّهُ لَقَسَمٌ لَوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ (٧٦) إِنَّهُ لَقُرْآنٌ كَرِيمٌ (٧٧) فِي كِتَابٍ مَكْنُونٍ (٧٨) لَا يَمَسُّهُ إِلَّا الْمُطَهَّرُونَ (٧٩) تَنْزِيلٌ مِنْ رَبِّ الْعَالَمِينَ (٨٠) أَفَبِهَذَا الْحَدِيثِ أَنْتُمْ مُدْهِنُونَ (٨١) وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ (٨٢)الواقعة) واتە: سوێند بە جێ و شوێنی ئەستێرەکان (٧٥) وە ئەوەش ئەگەر بزانن سوێندێکی گەورەیە، چونکە دەلالەتی تێدایە لەسەر قودرەتی خوا(٧٦) بەراستی ئەوەی وەحیت بۆ کراوە قورئانێکی بەفەڕە(٧٧) لە نامەیەکی پارێزراودایە، واتە: (اللوح المحفوظ) (٧٨) کەس دەستی لێ نادات، فریشتەکان نەبێت (٧٩) لە لایەن پەروەردگاری جیهانەکانەوە دابەزێنراوەتە خوارەوە (٨٠) ئایا ئێوە هەر بەم قورئانە باوەڕ ناکەن؟؟ (٨١) ئێوە شوکرانەی ڕۆزیەکەتان دەگێڕن بەکوفرانی نیعمەت و ئەڵێن بەهۆی فلانە ئەستێرەوە باران دەبارێ! (٨٢).

واتە: ڕزق و ڕۆزی دەدەنە پاڵ ئەستێرەکان و کاتی هەڵاتن و ئاوابوونیان، پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی بەهاوەڵانی کرد نوێژی بەیانی لە(حديبيە)ی نزیک مەککە، نوێژی بەیانی بۆ کردن لە(حديبيە) لە پاش بارانێك شەو باریبوو ئەمجار لەنوێژەکەی بووەوەو فەرمووی: هەروەکو لەفەرموودەیەکی قودسیدا هاتوە: خوای گەورە فەرمووی: (أَصْبَحَ من عِبَادِي مُؤْمِنٌ وَكَافِرٌ، فَأَمَّا من قال: مُطِرْنَا بِفَضْلِ اللَّهِ وَرَحْمَتِهِ فَذَلِكَ مُؤْمِنٌ بِي وَكَافِرٌ بِالْكَوْكَبِ، وَأَمَّا من قال: بِنَوْءِ كَذَا وَكَذَا فَذَلِكَ كَافِرٌ بِي وَمُؤْمِنٌ بِالْكَوْكَبِ)[٢٧٣] جا باران لە کاریگەری ئەستێرەکانەوە نییە، هەڵاتن و ئاوابوونی، بەڵکو

---

٢٧٣ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٨١٠) ومسلم (٧١) .

باران بارین لە خواوەیە، هەر ئـەوە دەیبـارێنێ و ئەنـدازەی دیـاری دەكـات و ڕەوانـەی دەكات و دەیگرێتەوە ئەگەر ویستی لێ بێت، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَهُوَ الَّذِي يُنَزِّلُ الْغَيْثَ مِنْ بَعْدِ مَا قَنَطُوا وَيَنْشُرُ رَحْمَتَهُ) الشورى/٢٨).

خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ (٣٤)لقمان) واتە: بە ڕاستی زانیاریی هاتنی ڕۆژی قیامـەت هـەر لای خوایـە، جگـە لـەو كەسـێكی تـر نـازانێ قیامـەت كـەی دێـت و تـەنها ئـەویش بـاران ئـەبارێنێ لـە كـاتی دیـاریكراوی خۆیـدا، كەسـێكی تـر نـاتوانێ بـاران ببـارێنێ و ئـەویش ئـەزانێ چـی لـە منداڵدانەكاندایە، واتە: هەر لەو كاتەوە كە هێشتا ئاوە، خوا خۆی دەزانێ چییە: كـوڕە یان كچ، بەختیار و سەرفرازە، یان لاسار و بەدبەختە، بەژن و باڵای كورتە، یا.. هتـد و هیچ كەسێك — نە چاكەكار و نەخراپەكار — سەد لە سەد نازانێت سبەینێ چی دەكا لە چاك و لە خراپ و هیچ كەسیش نازانێ لە سەر كام زەوی ئەمرێ).

پێنج كار هەیە هیچ كەسێك نازانێ تەنها خوا نەبێ، لەوانە باران بارینـە هـیچ كەسـێ لێی نازانێ تەنها خوا نەبێ، جا هەر كەسێ بیداتە پاڵ جگە لەخوا ئەوە موشریكە.

**﴿١١٦﴾ نوسەر دەڵێت: (وإياك والنظر في الكلام والجلوس إلى أصحاب الكلام).**

**واتە: وریابەو دوور بکەوە لەتەماشاکردن لە عیلمی کەلام و دانیشتن لای (أصحاب الكلام).**

**ڕاڤە:**

**مەبەست لە:** (وإياك والنظر في الكلام).

**پێویستە کار بەکیتاب و سوننە بکرێتو ئەوەی پێشینە چاکەکانی لەسەربوون لەبیروباوەڕو کارکردن و ڕەوشتدا، ئەمە مەنهەجە سەلامەتەکەیە، هەرکەسێ وازی لە مەنهەجی پێشینە چاکەکان هێنا لەبیرو باوەڕو جگە لەوە، ڕۆیشت بۆ لای زانایانی کەلام ئەوانەی بیروباوەڕ بەیاساو ڕێساکانی مەنتیقو عیلمی کەلامو جەدەلو پێشەکییەکانو ئەنجامەکان دەسەلمێنن کە پێی دەڵێن: (براهين عقلية) ئەوا ئەمە گومڕاییە لە بیروباوەڕدا، گومڕاییە لە ئیستدلال کردندا، خوای گەورە دەوڵەمەندی کردین بەوەی پێویستمان بەعیلمی کەلامو جگە لەو نەبێ بەوەی دابەزاندووەتە سەر پێغەمبەرەکەی (ﷺ) لە کیتاب و سوننە، جا هیچ خەیرو چاکەیەك نییە ئیللا لە کیتاب و سوننەدا هەیە، چ جا لەبابەتەکانی بیروباوەڕدا هەر ئەوە بنەماو بناغەیە، جا ئێمە بیروباوەڕی خۆمان بنیات نانێین تەنها لەسەر بەڵگەکانی قورئان و سوننەت نەبێ، بنیاتی نانێین لەسەر مەنتیقو عیلمی کەلام، خۆ قسەی زانایان دەربارەی عیلمی کەلام ئاشکرایە، ئیمامی شافعی دەفەرموێت:** (حكمي في أهل الكلام أن يضربوا بالجريد والنعال، وأن يطاف بهم في القبائل، وأن يقال: هذا جزاء من أعرض عن الكتاب والسنة وذهب إلى علم

الكلام)[٢٧٤] واتە: حوکمی من لەسەر ئەهلی کەلام ئەوەیە کە لێیان بدرێت بە سەعافی دارەخورما و نەعل و بە نێو خێڵو هۆزەکاندا بسوڕێندرێنەوە و بگوترێت: ئەمە پاداشتی ئەو کەسەیە پشتی لە کیتاب و سوننە کردووە و رووی کردوەتە عیلمی کەلام).

جا عیلمی کەلام نەویستراوە، سەلەف بەوپەڕی ئاگادارکردنەوە خەڵکیان لێ ئاگادار دەکردەوە، هەرگیز ناکرێتە مەنهەجێك لە بیروباوەڕداو خەڵکی لەسەر بڕوات و واز لەکیتاب و سوننە بهێنرێ وەکو ئەوانەی دەڵێن:- جەستە و جەوهەر....هتد، دەڵێن: سەلماندنی صیفات مانای بوونی جەستە دەگەیەنێ، جەستەکانیش لەیەك دەچن، بۆیە لەترسی (تجسیم)دا ئەوان نەفی ناوو سیفەتەکانی خوا دەکەن، جەستە بریتییە لەجەوهەری تاکەکان و جەوهەری تاکیش بەخودی خۆی، بۆیە بیرو باوەڕی خۆیان لەسەر جەستەو پشکنین بنیات ناوە، جگە لەوانە لە خەیاڵاتی پووچەڵ، وازیان لەکیتاب و سوننە هێناوە، ئەمەش بەڕاستی گومڕاییەکی ئاشکرایە _پەنا بەخوا _ هیچ موسڵمانێك خۆی خەریك ناکات بەعیلمی جەدەلەوەو واز لە خۆخەریك کردن بەعیلمی کیتاب و سوننە بهێنێ ئیللا ئەو کەسەی خوای گەورە گومڕای کردووە، سەلەفی ئەم ئوممەتە لەسەر کیتاب و سوننە دەڕۆیشتن تاکو ئەو کاتەی کیتابە رۆمییەکان وەرگێڕدرانە سەر زمانی عەرەبی لەسەردەمی (مەئمون)داو عیلمی مەنتیق و عیلمی جەدەل پەیدا بوو، جا لەو کاتەوە لەناو ئوممەت خراپەکاری پەیدا بوو و زۆرێك لە خەڵکی بیروباوەڕی خۆیان لەسەر عیلمی مەنتیق و جەدەل بنیات نا.

مەبەست لە: (والجلوس إلى أصحاب الكلام).

وریا بە لە فێربوونی عیلمی کەلام و تەماشاکردن تێیدا، بۆ ئەوەی بە هۆیەوە تووشی فیتنە نەبێ و پێی سەرسام نەبێ و وریای دانیشتن بە لەگەڵ زانایانی عیلمی

٢٧٤ / رواه الهروي في ذم الكلام (٤/٢٤٦) رقم (٧٠٨) .

کەلامدا، لە گەڵ ئەهلی فەرمودەو ئەهلی عیلمدا دانیشەو لەگەڵ زانایانی کەلامدا دامەنیشە بۆ ئەوەی کاریگەریت لێ نەکەن‌و دوورت نەخەنەوە لەعیلمی کیتاب‌و سوننە چونکە دانیشتن لەگەڵ خراپەکاراندا کاریگەری دەبێ لەسەر ئەو کەسەی دادەنیشێ لەگەڵیاندا، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دانیشتن لەگەڵ چاکاندا شوبهاندوویەتی بە میسك فرۆش‌و دەفەرموێت: (فحامل المسك إما أن يحذيك) واتە: واتە: لەمیسکەکەی خۆیت دەداتێ.(واما أن تبتاع منه وإما أن تجد منه ريحاً طيبة) واتە: ماوەی دانیشتن لای ئەو، دانیشتن لەگەڵ خراپەکاراندا شوبهاندویەتی بە کوورەچی: (اما يحرق ثيابك واما تجد منه ريحا خبيثة)[٢٧٥] ئەمە نموونەی دانیشتنە لەگەڵ چاکان وخراپەکاراندا، زانایانی کەلام (علماء الکلام) لە مەجلیسە خراپەکانە بۆیە لەگەڵیاندا دامەنیشە چونکە ئەوانە بیروباوەڕت تێك دەدەن ودوورت دەکەنەوە لە کیتابەکەی خوداو سوننەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ).

---

٢٧٥ / متفق عليه : أخرجه البخاري (١٩٩٥) ومسلم (٢٦٢٨) .

**﴿١١٧﴾ نوسەر دەڵێت: (وعليك بالآثار وأهل الآثار وإياهم فاسأل ومعهم فاجلس ومنهم فاقتبس).**

**واتە: دەست بگرە بە فەرموودەو ئەهلی فەرمودەوەو پرسیار لەوان بکەو لەگەڵ ئەواندا دانیشەو لەوانەوە وەرگرە.**

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (وعليك بالآثار) **واتە: فەرموودەكان.**

(وأهل الآثار) **واتە: فەرموودەناسان.**

**(عليك) واتە دەستی پێوەبگرە، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت:** (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَيْكُمْ أَنْفُسَكُمْ) المائدة/١٠٥) **واتە: ئەی گەلی خاوەن باوەڕ! خەریکی پاکسازی دەروونی خۆتان بن) واتە: دەستی پێوە بگرن.**

**مەبەست لە:** (وإياهم فاسألْ).

**خوای گەورە دەفەرموێت:** (فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ (٤٣) النحل) **واتە: لە ئەهلی عیلم، ئەهلی قورئان ئەوانەی ڕاستەڕێیان گرتووەتە بەر، ئەهلی عیلم لەم ئوممەتە، ئەوە ئەوانەن پرسیاریان لێ دەکرێت.**

**مەبەست لە:** (ومعهم فاجلسْ ومنهم فاقتبسْ).

**خوای گەورە دەفەرموێت:** (وَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ وَإِمَّا يُنْسِيَنَّكَ الشَّيْطَانُ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ الذِّكْرَى مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ (٦٨)الانعام) **واتە: هەر کە ئەو موشریکانەت دیت خەریکن لە بارەی ئایەتو نیشانەکانی ئێمەوە خراپ دەدوێنو گاڵتە ئەکەن، ڕوویان لێ وەرچەرخێنەو خێرا هەستەوجێیان بهێڵە تا قسەکەیان ئەگۆڕنو واز لەو گاڵتەو مەسخەرە دێنن ئەگەر**

شەیتان ئەم ئامۆژگاریەشی لە بیر بردیتەوەو لە گەڵیان دانیشتیت جا دوای ئەوە هەر کە بە بیرت هاتەوە ئیتر دوای ئەوە نابیّ لە گەڵ ئەو خەڵکە ستەمکارە دانیشیّ بەڵکو دەبیّ زوو جێیان بهێڵی).

خوای گەورە دەفەرموێت: (وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ إِنَّكُمْ إِذًا مِثْلُهُمْ) النساء/ ١٤٠) واتە: خۆ بەڕاستی خوای گەورە لەم قورئانەدا بەئێوەی ڕاگەیاندووە کە هەر کات زانیتان و بیستان ئایەتەکانی خوا کەسانێك باوەڕیان پیّ ناکەن و گاڵتەیان پیّ دەکەن هەتا ئەو باسە ئەگۆڕن و دەچنە سەر قسەیەکی تر و واز لەو کارەیان دێنن ئێوە لەگەڵیان دامەنیشن ئەگینا ئێوەیش لەگوناە و تاوان وەك ئەوان دەبن).

ئەگەر لەگەڵ ئەواندا دانیشن ئەوا ئێوەش وەکو ئەوانن، جا با مرۆڤ ئاگاداری دانیشتن بێت لەگەڵ خراپەکارانو زانایانی گومڕایی، با دەست بگریّ بە مەجلیسی ئەهلی عیلمەوە، ئەهلی بیروباوەڕی تەواو، ئەهلی مەنهەجێکی سەلامەت، با لەگەڵ ئەواندا دانیشێت و سوود لەوانەوە وەرگریّ.

**﴿١١٨﴾ نوسەر دەڵێت: (واعلم أنه ما عُبد الله بشئ مثل الخوف من الله سبحانه وطريق الخوف والحزن والشفقات والحياء من الله تبارك وتعالى).**

واتە: بزانە خوای گەورە نەپەرستراوە بەشتێك وەكو ترس لە خوای گەورە ڕێگای ترس و خەم و بەزەیی و حەیا لەخوای گەورەوەیە.

ڕاڤە/

**مەبەست لە:** (واعلم أنه ما عُبد الله بشئ مثل الخوف من الله سبحانه).

پەرستن لەسەر سێ شت بەندە: ترسو تكا(ڕەجا)و خۆشەویستی (المحبە)، جا پەرستنی خوای گەورە نابێتە پەرستن ئیللا دەبێ ئەم سێ شتەی تێدا بێ:- ترس لەخوای گەورە، تكاكردنی ڕەحمەتی خوا، نابێت تەنها ترسەكە بێت تاكو ببێتە هۆی بێ ئومێدی لە ڕەحمەتی خوای گەورە، نابێت تەنها ڕەجاكە بێت تاكو ببێتە هۆی تەئمین بوون لەمەكری خوای گەورە، نابێت تەنها خۆشەویستی بێت بەبێ ترس و ڕەجا، بەڵكو دەبێ هەرسێكەی ببێت:- ترس و ڕەجاو خۆشەویستی خوای گەورە، بۆیە وتوویانە: (هەركەسێ خوای گەورەی پەرست تەنها بەترسەوە ئەوە (خارجی)ـە چونكە ئەمە ڕێگای خەواریجە، چونكە ئەوانە (أصحاب الوعيد)ن و هەر كەسێ خودای گەورەی پەرست تەنها بە ڕەجا ئەوە (مورجیئەیە) چونكە ئەمە ڕێگای مورجیئەیە كە لە خوای گەورە ناترسن، بەڵكو تەنها پشت بە ڕەجا دەبەستن، خوای گەورە دەفەرموێت: (أَفَأَمِنُوا مَكْرَ اللَّهِ فَلَا يَأْمَنُ مَكْرَ اللَّهِ إِلَّا الْقَوْمُ الْخَاسِرُونَ (٩٩) الاعراف) واتە: بڵێیت لەمەكرو هێزو دەسەڵات و سزای خوا دڵنیابن؟ خۆ مەگەر گەل و هۆزی زیانمەندان لەمەكرو تۆڵەی خوا دڵنیابن).

(هەرکەسێ خوای گەورەی پەرست تەنها بە خۆشەویستی ئەوە (صۆفییە))[٢٧٦] چونکە صۆفییەکان دەڵێن: (ئێمە خوای گەورە ناپەرستین بەتەماحی بەهەشتەکەی و ناپەرستین لەترسی ئاگرەکەی، بەڵکو تەنها لەبەر خۆشەویستی دەیپەرستین)[٢٧٧] ئەمەش گومڕاییە، چونکە دەبێ خوای گەورە بپەرسترێ بەترس و ڕەجاو خۆشەویستییەوە.

مەبەست لە: (وطريق الخوف والحزن والشفقات والحياء من الله تبارك وتعالى).

واتە: پێویستە لەسەرت شەرم لەخوای گەورە بکەیت، حەیاکردنش واتە لەسەرپێچیدا نەتبینێ، تۆ شەرم دەکەیت لەدروستکراوەکان لەشتێکدا بتبینن لایەق نەبێت، ئەی ئیتر چۆن لەخوا شەرم ناکەیت لە سەرپێچیدا بتبینێ، ئەمە شتێکی سەرسوڕهێنەرە لەمرۆڤەوە، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: (يَسْتَخْفُونَ مِنَ النَّاسِ وَلَا يَسْتَخْفُونَ مِنَ اللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمْ إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرْضَى مِنَ الْقَوْلِ) النساء/١٠٨) واتە: ئەو دووڕووانە تاوان لەمەردم ئەشارنەوەو شەرم دەکەن لێیان کەچی لەو خوا گەورەیە شەرم ناکەن بەمەرجێ هەموو وەختێ خوا لەگەڵیانەو ئاگاداریانە، بەتایبەتی ئەو دەمەی ئەوان بەشەودا قسانێکیان دەکرد کە هەرگیز (خوا) پێی ڕازی نییە).

بۆیە پێویستە لەسەرت سەرەتا لەخوا شەرم بکەیتو دوور بکەویتەوە لەسەرپێچی کردنی چونکە دەتبینێ.

---

٢٧٦ / تەماشای : مجموع الفتاوى (٢١/١٥) وشرح العقيدة الطحاوية لابن أبي العز (ص/٣٧٢) بکە .

٢٧٧ / تەماشای مدارج السالكين بکە : (٧٦/٢) .

**﴿١١٩﴾ نوسەر دەڵێت: (واحذر أن تجلس مع من يدعو إلى الشوق والمحبة ومن يخلو مع النساء وطريق المذهب فإن هؤلاء كلهم على الضلالة).**

واتە: ئاگادار بە لەوەی دابنیشی لەگەڵ ئەوانەی بانگەواز بۆ تامەزرۆیی و خۆشەویستی دەکەنو لەگەڵ ئەوانە لەگەڵ ئافرەتاندا دوو بەدوو دەبنەوەو ڕێگای ئەو مەزهەبە، چونکە هەموو ئەوانە لەسەر گومڕایین.

ڕاڤە/

مەبەست لە: (واحذر أن تجلس مع من يدعو إلى الشوق والمحبة).

ئەوانەش صۆفییەکانن، کاتێ ئاگاداری کردینەوە لەدانیشتن لەگەڵ زانایانی کەلامدا، ئاگادری کردینەوە لەدانیشتن لەگەڵ کۆمەڵێکی گومڕای تردا ئەوانیش صۆفییەکانن، ئەوانەی خوای گەورە دەپەرستن بەبیدعەو داهێنراوەکان کەلەلایەن خوداوە هیچ بەڵگەیەکیان نییە، واز لەسوننەت دەهێنن، بەڵکو بایەخ بەفەرموودە نادەن، بایەخ بە داواکردنی عیلم نادەن، ئاگاداری خەڵکی دەکەنەوە لە وەرگرتنی عیلم، دەڵێن:- (وەرگرتنی عیلم لە زیکرەکانت دەکاتو لەپەرستنت دەکات) ئەمەش گومڕاییە، چونکە هیچ پەرستنێك چاك نابێ، هیچ زیکرێك چاك نابێ ئیللا بەو شێوەیە نەبێ لە گەڵ کیتاب و سوننەدا بگونجێ، ئەوەش نابێ ئیللا بە داواکردنی عیلم نەبێ، بۆیە ئەوان گومڕابوون _پەنا بەخوا_ خۆیان دوور کردەوە لەعیلم و فێربوون، بەخەڵکیان گوت: (خۆتان بە زیکری خوداوە خەریك بکەن، بەپەرستنەوە خۆتان خەریك بکەن) ئەمەش خوودو ناوەڕۆکی گومڕاییە، چونکە پەرستن و زیکر ڕاست و دروست نابن ئیللا دەبێ لەسەر عیلمێکی ڕاستو دروست بێ و شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بێ، بەڵام ئەگەر هاتوو لەسەر عیلم و شوێنکەوتن نەبوو ئەوا دەبێتە گومڕایی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (من عمل عملاً ليس عليه أمرنا فهو رد) چۆن دەزانن ئەوەی پێغەمبەری خوای (ﷺ) لەسەر بووە بەبێ فێربوون؟ دەفەرموێت: (من أحدث في أمرنا

هذا ما ليس منه فهو رد) چۆن دەزانیّ ئەوە داهێنراوە ئیللا ئەگەر لە گەڵ سوننەتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بەرانبەری نەکەیتەوە؟ بۆیە لەپێش هەموویانەوە دەبیّ فێر ببیّ، دوور مەکەوە لەعیلم و فێربوونی عیلم، جا داواکردنی عیلم چاکترە لەپەرستنە سوننەتەکان (نوافل)ەکان، جا ئەو کەسەی دادەنیشێت بۆ ئەوەی مەسەلەیەکی عیلمی باس بکاو گفتو گۆی بکات ئەوا ئەو کەسە چاکترە لەو کەسەی هەموو شەوەکە هەڵدەستیّ شەونوێژ دەکات، بۆ؟

چونکە خوای گەورە لەسەر زانست و چاوڕوونی دەپەرستیّ و لەبەر ئەوەی کەسی زانا سوودی بۆ خۆی و جگە لەخۆی هەیە، بەڵام کەسی عابید هەموو شەوەکە شەونوێژ دەکات و ڕۆژەکە بەڕۆژوو دەبیّ ئەوا تەنها سوودی بۆ خۆی هەیە، سوودی بۆ خەڵکی نییە، کەواتە سوودەکەی تەنها بۆ خۆیەتی، جا ئەگەر تۆ فێر بوویت ئەوا سوودت بۆ خۆت و خەڵکیش هەیە، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (فضل العالم على العابد، كفضل القمر على سائر الكواكب)[٢٧٨] واتە: فەزڵی زانا بەسەر عابیدەوە وەکو فەزڵی (مانگ)ـە بەسەر هەموو ئەستێرەکانەوە) چونکە مانگ هەموو گەردوون ڕووناك دەکاتەوەو کاروانەکان بەهۆیەوە ڕیّ دەکەن و دەڕۆن، بەهۆیەوە خوای گەورە بەرووبوومەکان چاك دەکاتەوەو چەندین سوودی مەزنی تری هەیە، بەڵام ئەستێرەکان تەنها خۆی ڕووناك دەکاتەوە، ڕووناکییەکەی تەنها بۆ خۆیەتی، ئەمە ئەو عابیدەیە لەسەر حەق و شێوازی ڕاست خوای گەورە دەپەرستێت، ئەی ئەو عابیدە چۆنە خوای گەورە دەپەرستیّ لەسەر نەفامی؟ ئەمە ڕەنگە پەرستنەکەی گومڕایی بێت بگێڕدرێتەوە بۆ خۆی، کەواتە عیلم و فێربوونی عیلم پێویستە، بەو کەسانە مەغرور مەبە هانی خەڵکی دەدەن لەسەر زیکرو دەرچوونو شەونوێژی و ڕۆژوو دوور

---

٢٧٨ / صحيح : أخرجه أبو داود (٣٦٤١) والترمذي (٢٦٨٢) وابن ماجه (٢٢٣) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٦٢٩٧) .

دەکەونــەوە لــەعیلم و دانیـشتن لەمزگەوتەکانـدا بەمەبەسـتی فێربـوونی عـیلم لەسـەر دەستی زانایان.

مەبەست لە: (ومن يخلو مع النساء).

چونکە هەندێ لە صـۆفییەکان خۆیـان لەحـەرام ناپـارێزن، دەڵـێن: (ئێمـە تاوانمـان لەسـەر نییـە، ئێمـە لـەو کەسـانەین خـوا دەناسـین) سەرپێـچییەکان حـەڵاڵ دەکـەن و دەڵێن: (ئێمە حەرامبوونمان لەسـەر نییـەو (واجبـات)مـان لەسـەر نییـە، چـونکە ئێمـە گەیشتوینەتە خواو پێویستیمان بەپەرستن نییە) بۆیە نێربازی دەکەن و زینا دەکـەن و تێڕوانینی حەرام دەکـەن و دەڵـێن:- (لەمـەدا تاوانبـار نـابین، چـونکە ئێمـە تەماشـای ئایەتەکانی خوا دەکەین) دەڵـێن: (ئەمـە بەشـێکە لـە تەماشـاکردنی ئایەتـەکانی خـوا) شـەیتان ئـەو شـتەیان بـۆ دەڕازێنێتـەوە، لەگـەڵ لووسـکەدا (مـردان)دا دوو بـەدوو دەبنەوەو خراپەیان لێ دەوەشـێتەوەو وادەزانـن ئـەوان لەخۆشەویـستانی خـوان، هـیچ حەرەجێك نییە ئەگەر ئەوان ئەوە بکەن، تەماشاکە بەندە چۆن دەگاتە ئەو سنوورە - پەنا بەخوا - بۆیە لەگەڵ ئەواندا دامەنیشە.

مەبەست لە: (وطريق المذهب).

واتە ڕێگای مەزهەبی صۆفییەکان، ئەوان دەڵێن: (شـەیخێك بـۆ خـۆت دیـاری بکـە) واتە شەیخی تەریقەتێ لەسەر دەستی بڕۆیت، (ئەو کەسەی شـەیخی نییـە شـەیخەکەی شـەیتانە) بۆیـە پێویـستە شـوێنکەوتەی شـێخێك بـیو بەیعـەی پـێ بـدەیت لەسـەر تەریقەتەکەیو لێی دەرنەچیو چەندین زاراوەی پیـسیان هەیـە، بۆیـە دەبـێ خـۆتی لێ بپارێزی و ئاگاداری بی، چونکە ئەوانە بـانگی خـەڵکی دەکـەن بـۆ دەرچـوون لـە دینـی خوداوە بۆ دینی شەیتان _ پەنا بەخوا _.

مەبەست لە: (فإن هؤلاء كلهم على الضلالة).

ئەو صۆفییانە بەهەموویانەوەو زاناکانیان و موریدەکانیان و شێخەکانیان هـەموویان لەسەر گومڕایین، ئەو کەسانە نەبێ بەسوننەت کار دەکەن، جا ئەمە حەقەکەیە.

**﴿١٢٠﴾ نوسەر دەڵێت: (واعلم أن الله –تعالى- دعا الخلق كلهم إلى عبادته ومنَّ من بعد ذلك على من يشاء بالإسلام تفضلا منه).**

واتە: بزانە خوای پەروەردگار بانگی هەموو خەڵکی کردووە بۆ پەرستنی خۆیو لەپاش ئەوە منەتی خۆی ڕژاندووە بەسەر ئەوەی ویستی لێ بێ بە ئیسلام بە فەزڵ و منەتی خۆی.

ڕاڤە/

دانەر دەڵێت: (واعلم).

ئەی برای موسڵمان _ ئەی قوتابی زانست و زانیاری _ ئاگاداری ئەم کارە بە، ئەویش ئەوەیە خوای گەورە هەموو خەڵکی بۆ پەرستنی خۆی دروست کردووە: (وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ (٥٦) الذاريات/٥٦) واتە: مـن هـەر بۆیـە جنۆکـە و ئادەمیم دروست کردووە بم پەرستن و بمناسن).

ئەمە لەڕووی هەواڵ دانەوەو لەڕووی فەرمانیشەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ (٢١) الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ فِرَاشًا وَالسَّمَاءَ بِنَاءً وَأَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقًا لَكُمْ فَلَا تَجْعَلُوا لِلَّهِ أَنْدَادًا وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ (٢٢)البقرة) واتـە: ئـەی خەڵکینـە! تـەنها پـەروەردگاری خۆتـان بپەرستن ئێوەو پێشووەکانی ئێوەی لە نەبوون دروستکردووە چونکە ئاوا پەرستنێك هێزی پارێزگاری دروست دەکاو بەڵکو ئێوەش خۆ بپارێزن(٢١) خوایەکی وایە زەوی بۆ ئامادەکردوونو کردوویەتی بەڕایەخ تا بەئاسانی لەسەری بژینو بـەلای سەرووشتانەوە _وەك گومەزەیی و کۆشك _ئاسمانی ڕاگرتووە لەو حەوایشەوە ئاوێکی بۆ باراندن ئینجا بەو بارانە جۆرەها میوەو ڕۆزی بۆ فەراهەم هێنان و شینی کرد جا کەوابوو

ئێوەش بیپەرستن و هیچ جۆرە هاوبەشێکی بۆ دامەنێن دەخۆ خۆیشتان چاك دەزانن کە ئەو جۆرە بتانە هیچیان بەدەست نییە).

خوای گەورە دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ (١) الحج) واتە: ئەی خەڵکینە ! بەردەوام لە پەروەردگارتان بترسن و خۆ بپارێزن لە خەشمو رکی ئەو فەرمانەکانی بە چاکی جێبەجێ بکەن، چونکە بە راستی بوومەلەرزەو شۆکەی هاتنی رۆژی قیامەت و کاولبوونی دونیا کارێکی زۆر سامناك و گەورەیە).

خوای گەورە دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُمْ بِاللَّهِ الْغَرُورُ (٥)فاطر).

ئەم دواندنە بۆ هەموو خەڵکییە باوەڕداران و بێ باوەڕان، جنۆکەو مرۆڤەکان، خوای گەورە بەتاك دابنێن لەپەرستندا، لە گەڵ ئەودا هیچ کەسێك نەپەرستن جگە لەخۆی نەبێ، چونکە ئەوان هیچ پەروەردگارێکیان نییە تەنها (الله) نەبێ، زۆربەی بانگەکان لەسورەتە مەکییەکاندا (يَا أَيُّهَا النَّاسُ)ـە و زۆربەی سورەتە مەدەنییەکان (يا أيها الذين امنوا) هەرچەندە ڕەنگە کەمێك لەسورەتە مەکییەکان یان سورەتە مەدەنییەکان بەو شێوەیە نییە بەڵام عیبرەت بەزۆرییە، ئەم بانگانەش دەلالەتێکی ڕوون دەکات لەسەر ئەوەی عیبادەت تەنها دەبێ بۆ خوا بێت، خوای گەورەش فەرمانی بەهەموو خەڵکی کردووە، لەپێناو ئەوەدا دروستی کردوون، بۆیە لەوەدا هیچ کەسێکی تر حەقی ئەوەی نییە نەفریشتەکان و نە پێغەمبەران و نەپیاوچاکان و ئەولیاکان و نەجنۆکەو نەمرۆڤ و نە هەر دروستکراوێکی تر، عیبادەت حەقی خوایە لەسەر هەموو دروستکراوەکان.

جا بانگەوازکردن بۆ پەرستنی خوا گشتییە بەڵام ئەوانەی هەستاون بەم بانگەوازە ئەوانە بەندە تایبەتەکانن، زۆرێك لە خەڵکی پشتیان لە پەرستنی خوا کردووە، خەڵکێکی کەمن ئەوانە گوێیان بۆ ئەم بانگەوازو فەرمانە گرتووە، فەرمانی خوایان جێ بەجێ کردووە، بۆیە خوای گەورە ئەوانی هیدایەت داوە بۆ ئەوەو تەوفیقی داون،

بــەهۆی گــویٚ گــرتنو ڕووکردنـــە بانگەوازەکــەی خــوا، جــا هۆکارەکــەی لەلایــەن بەندەکەوەیــەو تــەوفیق لەلایــەن خوداوەیــە، جــا تــەوفیقی خــوا بنیــات نــراوە لەســەر هۆکارەکان لەلایەن بەندەکەوە، جا ئەگەر بەندەکە هۆکارەکەی ئەنجامـدا ئـەوا خـوای گەورە تەوفیقی دەداتو بۆی ئاسان دەکات، هەروەکو خـوای گـەورە دەفـەرمویٚت: (إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّى (٤) فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى (٥) وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى (٦) فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى (٧) وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَى (٨) وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَى (٩) فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَى (١٠) الليل) واتـە: بـێ گومـان کارو تێکۆشانی ئێوەش ئەی مرۆڤ هەروا جیاوازو جۆراو جۆرە (٤) ئینجا ئەوەی مـاڵ و سامانی خۆی لە بەر خوا بەخشی و لە نافەرمانی خوا خـۆی پاراسـت (٥)وە بـڕوای بـە پاداشتی چاکتر کرد (٦) ئەوا ئێمەش بێ گومان بۆ بەهەشت و بۆ کاری ئاسـان و چـاك ئامادە و ڕێنوێنی دەکەین، دەیخەینە سەر ڕاستە ڕێ (٧) وە ئـەوەش چـرووکی کـرد و خۆی بێ نیاز گرت (٨) و بڕواشی بە پاداشی چاکتر نەکرد لە لای خوا (٩) ئەوا ئێمەش کار ئاسانی بۆ دەکەین بۆ دژوارترین ڕێگە (١٠).

جا هیدایەت هۆکاری هەیەو گومڕایی هۆکـاری خـۆی هەیـە لەلایـەن بەنـدەوە، بۆیـە ئەمـە دەبـێ لێـی ئاگـاداربین، چـونکە کەسـانێك هـەن دەڵـێن:_ ئەگـەر خـوای گـەورە هیدایەتی بۆ نوسیبێتم ئەوا هیدایەت وەردەگرم، ئەگەر تەقدیری گـومڕایی بـۆم کردبـێ ئەوا گومڕا دەبم، ئەمەش قسەیەکی پووچەڵە، ئیحتیجـاج کردنـە بەقـەدەرەوە، ئـەوەی لەبیرچووە ئەنجامدانی هۆکارەکان لەلایەن خودی خۆیەوەیە، هەرگیز هیدایەتی دەست ناکەوێ بەبێ دەستگرتن بەهۆکارەکانەوە،چونکە تۆ ئەگـەر منـداڵت دەوێ ئـەوا دەبـێ ژن بهێنی، هۆکارەکە ئەنجام دەدەیت ئەویش هاوسەرگیرییە.

بەڵام ئەگەر بەگەنجی بمێنیتەوەو ژن نەهێنی ئەوا هـەرگیز منـداڵت نـابێ، هـەروەها ڕزقیش جا ئەگەر دابنیشی و کـار نەکـەیت و پـشت بەقـەدەر ببەسـتی ئـەوا هیـچت بـۆ نایـەت، بـەڵام ئەگـەر هەسـتای و کـارت کـردو هۆکارەکانـت گرتـە بـەرو بـەدوای ڕزقـدا

گەڕایت ئەوا خوای گەورە بۆت ئاسان دەکات، گیانلەبەران و باڵندەکان لەهێلانەو ماڵەکانیان نامێنن، بەڵکو بەیانیان بەسکی برسی دەردەچن و ئێواران بەتێری دەگەڕێنەوە[٢٧٩]، دەردەچێ بۆ گەڕان بەدوای ڕزق و ڕۆزیدا بۆیە دەبێ هۆکارەکان بگریتە بەر، هەروەها هیدایەتیش وایە بەبێ هۆکار دەستت ناکەوێ، گومڕاییش ڕوونادات بەبێ هۆکار لەلایەن بەندەکەوە، چونکە خوای گەورە ستەم لەکەس ناکات، جا ئەو کەسەی خەیری دەوێ ئەوا خوای گەورە چاکەی بۆ ئاسان دەکات و سنگی فراوان دەکاتەوە، ئەو کەسەش خراپەی دەوێ ئەوا خوای گەورە خراپەی بۆ ئاسان دەکات و بۆی ئامادەی دەکات لە پاداشتی حەزو ویستی خۆی، کەواتە با بەندەکان بەجوانی لەم بابەتە تێبگەن چونکە بابەتێکی زۆر وردە، بۆیە دەبێ هۆکارەکان ئەنجام بدەن بۆ هەموو کارێك، لەوانە ئیمان و هیدایەت وچوونە بەهەشت و دۆزەخەوە.

مەبەست لە: (ومنَّ من بعد ذلك على من يشاء بالإسلام تفضلا منه).

واتە: خوای گەورە منەتی کردووەتە سەر ئەوانەی ویستی لێ بێت بەئیسلام بەفەزڵی خۆی، بەڵام دەستکەوتنی فەزڵ لەلایەن خوداوە هۆکاری هەیە، دەست نەکەوتنی ئەو فەزڵە هۆکاری هەیە لەلایەن بەندەوە، بۆیە دەبێ تێبینی ئەوە بکرێ و مرۆڤەکان ئیحتجاج بەقەدەرەوە نەکەن وەکو ئەوانەی وتیان: (سَيَقُولُ الَّذِينَ أَشْرَكُوا لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا أَشْرَكْنَا وَلَا آبَاؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا) الانعام/١٤٨) ئەمەش ئیحتیجاج کردنە بەقەدەر هەروەکو ئیبلیس ئیحتجاجی پێ کرد، گوتی: (فَبِمَا أَغْوَيْتَنِي) الاعراف/١٦) ئیحتجاجی بە قەدەر کردو ئەوەی لەبیرچوو کەخۆی بەزل زانی لەفەرمانی خوا، خوای گەورە وێڵی کرد چونکە خۆی بەزل زانی و ڕازی نەبوو بۆیە بووە یەکێ لەبێباوەڕان، ڕازی نەبوو سوژدە ببات، هەروەکو خوای گەورە فەرمانی پێکرد، جا هیچ حوججەیەکی نییە لەوەدا، بەڵکو حوججەکە لەسەر خۆیەتی، چونکە ئەو بەدبەختییەی بەسەریدا هات بەهۆی سەرپێچییەکەی خۆیەوە بوو.

---

٢٧٩ / رواه الطيالسي وابن المبارك واحمد وعبد بن حميد والترمذي وابن ماجه والحاكم وابن حبان .

**﴿١٢١﴾ نوسەر دەڵێت: (والكف عن حرب علي ومعاوية وعائشة وطلحة والزبير -رحمهم الله أجمعين- ومن كان معهم لا تخاصم فيهم، وكِلْ أمرهم إلى الله تعالى، فإن رسول الله (ﷺ) قال: (إياكم وذكر أصحابي وأصهاري وأختاني) وقال: (إن الله تبارك وتعالى نظر إلى أهل بدر فقال: اعملوا ما شئتم فإني قد غفرت لكم).**

**واتە: وازهێنان لەباس کردنی جەنگی نێوان عەلیو مەعاویەو عائیشەو تەڵحەو زوبێر_ڕەحمەتی خوا لە هەموویان بێت_ هەموو ئەوانەی لەگەڵیاندا بوو و مشتومڕ مەکە لەواندا، کارو باسەکەیان بگێڕەوە بۆلای خوای گەورە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:** (إياكم وذكر أصحابي وأصهاري وأختاني) **هەروەها دەفەرموێت:** (إن الله تبارك وتعالى نظر إلى أهل بدر فقال: اعملوا ما شئتم فإني قد غفرت لكم)[٢٨٠].

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (والكف عن حرب علي ومعاوية وعائشة وطلحة والزبير -رحمهم الله أجمعين).

**ئەمە بنەمایەکی مەزنە، ئەویش ئەوەیە کەوا پێویستە لەسەر موسڵمان لەحەقی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە کۆچەران و پشتیوانانن ئەوانەی پشتگیری پێغەمبەری خودایان (ﷺ) کردو ئەویان پاراستو لەگەڵ ئەودا جیهادیان کردو سەروەت و سامانی خۆیان لەپێناوی ئەودا خەرج کردو گیانی خۆیان بۆ فیدا کرد، ماڵو وڵاتی خۆیان بەجێ هێشت و شوێنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەوتن، پێویستە فەزڵی ئەوان بزانرێ جگە لەوان ئەو فەزڵەی نییە، جا ئەوانە باشترینی سەدەکانن، هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:** (خيركم قرني، ثم الذين يلونهم ثم الذي يلونهم)

---

٢٨٠ / صحيح : سبق تخريجه .

جا باشترینی چاخەکان هاوەڵانە، ئەوانـەی هـاوڕێتی پێغەمبـەری خوایـان (ﷺ) کـردو هەستان بەسەرخستنی و بڵاوکردنـەوەی دینەکـەی و گەیانـدنی بەوانـەی پـاش خۆیـان هاتن لەم ئوممەتـە، بۆیـە ئـەو فەزڵـەیان دەسـتکەوت کـە هـیچ کەسێك لەجگـە لـەوان هاوتایان نابن بۆیە خوای گەورە ستایشی ئەوانی کردو لەوان ڕازی بوو هـەروەکو لـەزۆر ئایەتی قورئانی پیرۆزدا هاتووە:- خـوای گـەورە دەفـەرموێت: (لَقَدْ تَابَ اللَّهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ مِنْ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُ بِهِمْ رَءُوفٌ رَحِيمٌ (١١٧) وَعَلَى الثَّلَاثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُوا حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنْفُسُهُمْ وَظَنُّوا أَنْ لَا مَلْجَأَ مِنَ اللَّهِ إِلَّا إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ (١١٨)التوبة) ئـەمجار فـەرمووی: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ (١١٩) التوبة) واتە: خوا لەو کارەی پەیامبـەریش خـۆش بـوو وە لەکۆچـکەران و پـشتیوانانیش ئەوانـەیان کـە لەجەنگـە سـەختەکەی (تـەبووك)دا دوای پێغەمبەر کەوتن و پەیڕەوییان لێ کرد پاش ئـەوە خـەریك بـوو هێنـدێکیان دڵیـان لاڕێ بێت و نەچنە جیهادەکەوە پاشان دووبارە خوا تەوبـەی لێ وەرگـرتن چـونکە بەڕاسـتی خوا بەرامبەر بەوانە زۆر بە لوتفە، زۆریش لەگەڵیان بـەمیهرە (١١٧) خـوا تەوبـەی لـەو سێ کەسەش وەرگرت کە خۆیـان لـە غەزاکـە گرتـە دواوە، واتـە: لـە مەدینـە مانـەوەو نەچوونە جەنگی تەبووك تا لە خەفەتدا وای لێهات ئەم زەویە فراوانەیان لا تـەنگ بـوو، وە لە خەم و خەفەتدا لە گیانی خۆیان بێزار بوون، چونکە پەیامبەر بڕیاری دابوو نـابێ هیچ کەسێك تەنانەتی سڵاویشیان لێ بکات،هەتا فەرمانی خوا دێت! ! ئیتر زانییان کـە هیچ پەنایەکیان نەماوە، مەگەر هەر پەنا بە خوا بەرن، لە پاشان خوا ڕێنمایی تەوبـەی کردن، بۆ ئەوە تەوبە بکەن، ئیتر ئەوانیش تەوبـەیان کـردو خـوا بەخـشینی بـە ڕاسـتی تەنها ئەو خوایە قەبووڵکاری تەوبەو لێبووردەو زۆریش دلۆڤان و میهرەبانە (١١٨) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! لە نافەرمانی خوا پارێز بکەن و هەمیشە لـە گـەڵ دەسـتەی

راستان بن ئەوانە کە لە گەڵ پێغەمبەردا چوونە غەزا و بۆ ڕێی خوا بە ماڵ و بە گیان تێکۆشان (١١٩).

لە گەڵ ڕاستگۆیاندا بن، لە گەڵ ئەواندا، هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ بِإِحْسَانٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ (١٠٠) التوبة) واتە: لەدەستەی یەکەمی پێشەنگی کۆچەران و پشتیوانان و چاك پەیڕەوانی ئەوانیش خوا ڕازی بوو لێیان و ئەوانیش لەخوا ڕازی بوون بەدەر لەوەش چەندان باخ و بێستانی بۆ سازداون کە: بە بەردرەخت و کۆشکەکانییدا ڕووبار گەلێ دەچێت بەهەتا هەتاییش تێیدا ئەمێننەوە هەر ئەوەیشە دەسکەوت و سەرفرازی گەورەو بەنرخ).

خوای گەورە دەفەرموێت: (لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنْزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا (١٨) الفتح) واتە: بێ گومان خوا ڕازی بوو لەئیمانداڕەکان کاتێ _ لەژێر ئەو درەختە دا پێی دەڵێن (شجرة الرضوان) پەیمانیان لەگەڵ دەبەستیت ئەی موحەممەد جا خوا بەو ڕاستی و وفایەی لەدڵیاندا بوو بۆ پەیامەکەت ئاگاداربوو ئینجا لەکاتی پەیمانەکەدا ئارامی دابەزاندە سەریان و بەسەرکەوتنێکی نزیك پاداشتی دانەوە).

خوای گەورە دەفەرموێت: (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا) الفتح(٢٩) واتە: موحەممەد (ﷺ) ڕەوانەکراوو پەیامبەری خوایە ئەو کەسانەش لەگەڵ ئەون و شوێنی ئەو کەوتوون لەبەرامبەر بێ بڕواکانە ئازاو بەهێزن،لەناو خۆشیاندا میهرەبان و بەسۆز و دڵ نەرمن دەیان بینی هەردەم خەریکی ڕکوع و سوژدەن).

تاکو کۆتایی سورەتی (الفتح)، ئەمە دەربارەی هاوەڵان، خوای گەورە کاتێ باسی (الفئ)ی کردوە لە سورەتی (الحشر) فەرموویەتی: (وَمَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْهُمْ فَمَا أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ وَلَكِنَّ اللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُ عَلَى مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (٦) مَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاءِ مِنْكُمْ وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ (٧) لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا وَيَنْصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُولَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ (٨) الحشر) واتە: ئەوەی خوا گێڕایەوە بۆ پێغەمبەرەکەی لە دارایی جولەکەکانی (بەنی نەزیر) ئێوە هیچ ئەسپو وشترێکتان بۆتاو نەدابوو، واتە: هیچ زەحمەتێکتان نەکێشابوو، بەڵام خوا پێغەمبەرانی خۆی بەسەر هەر کەسێکدا حەز بکا زاڵ ئەکات بە بێ جەنگ و خواش دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیەو ویستی لە هەرشتێ بێت ئەیکات (٦) ئەوەی خوا گێڕایەوە بۆ پێغەمبەرەکەی لە (فەیئی) شارەکان بە بێ کوشتار ئەوە بۆ خوایەو بۆ پەیامبەرەکەی و بۆ خزمانی نزیکی و بۆ منداڵی بێ باوك و بۆ داماو و بێ نەوایان و رێبواران، بڕیارە بەو شێوەیە دابەش بکرێ نەك ببێتە سەرمایەی دەستەو دەستکردن لە ناو دەوڵەمەندەکانتانداو هەژارەکان لێی بێ بەش بن، وە هەرچی پەیامبەر پێی دان وەری بگرن، واتە:- بەچی فەرمانی پێ کردن بیکەن چ لەم دەستکەوتەدا و چ لە هەر شتێکی تردا جێبەجێی بکەن وە رێیشی لە هەر شتێ لێ گرتن ئێوەش دەستی لێ هەڵگرن، و خۆتان لە خەشم و غەزەبی خوا بپارێزن بە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی و وازهێنان لە قەدەغەکراوەکانی بە راستی خوا سەخت تۆڵەیە قاری لە هەر کەسێك گرت رزگاری نابێ (٧) ئەو فەیئو دەستکەوتەیە بۆ ئەو هەژارە دوورە وڵات و کۆچکردووانەیە لەخانووو سامانی خۆیان دەرکران داوای چاکەو ڕەزامەندی لەخوا دەکەنو یارمەتی خواو پەیامبەرەکەی دەدەن ئا ئەوانەن ڕاستگۆکان لەباوەڕو جیهادیاندا(٨).

ئەمجار باسی کۆچەران دەکاتو دەفـەرموێت: (وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِنْ قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (٩) وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ (١٠)الحشر) واتـە: ئـەو کەسـانەی نیشتەجێی (دار الهجـرة)و (دار الایمـان) بوون، واتە: پشتیوانان لە پێش کۆچی کۆچـەریەکان، کۆچـەریەکانیان خـۆش دەوێـنو بەشێك لە دارایی خۆیانیان ئەدەنیّو دڵخۆشیان دەکـەن، هـیچ شـتێکیان لـە دڵدا نییـە سەبارەت بەوەی بە کۆچەریەکان درا لە فەیئی بەنی نەزیر، چونکە پەیامبەری خوا لەو هەموو دەستکەوتە تەنها بەشی سێ کەسیانیدا، لە گەڵ ئەوەیشدا کەسێك نـەبوو پێـی ناخۆش بێت وئیساری کۆچەریەکان دەکەن بە سـەر خۆیانـدا لـە سـەروەت و سـاماندا، ئەگەر چی خۆیشیان نیازیـان پێـی هـەبیّو هـەژار بـن، هـەر کەسـێ لـە سـیفەتی رژدی دەروونی بپارێزیّ، واتە: هەرکەسـێ خـوا بپـارێزی لـە چـرووکی دەروونـی جـا ئەوانـەن بەرەوەکان (٩) ئەوانەش لەدوای ئەوانەوە هاتوون دەڵێن: ئـەی پەروەردگارەکـەمان ! لەئێمەو لەو برایانەمان پێش ئێمە باوەڕیان هێناوە خۆش ببەو هیچ بوغزو قینێك مەخە دڵمانەوە بەرامبەر بەو کەسانەی باوەڕیان هێناوە ئەی پـەروەردگاری ئێمـە !بەڕاسـتی تەنها ئەتۆی بەسۆزی میهرەبان (١٠).

ئەمـە هەڵویـستی موسـڵمانانە دەربـارەی هـاوەڵانی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ئـەوان دەڵێن: (رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا) وە (الغل) بریتییە لە رقو کینە، (رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ).

لەسوننەتدا چەندین فەرموودە هەیە لەوانە ئەو فەرموودەیەیە کـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دەفەرموێت: (لاتسبوا أصحابي فالذي نفسي بيده لو أن أحدكم أنفق مثل أحد ذهباً

ما بلغ مُدَّ أحدهم ولا نصيفه)[٢٨١] واتە: جنێو بە یارانی من مەدەن، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە ئەگەر یەکێ لە ئێوە بە ئەندازەی کێوی ئوحود ئاڵتون بکات بە خێر، ئەوا ناگاتە مشتی یەکێ لەوان و بە نیوەی مشتێکیش).

ئەگەر یەکێ لەپاشینەکان جگە لەهاوەڵان هەرچەندە لەشوێنکەوتووان بێت (التابعین) بەئەندازەی کێوی ئوحود لەئاڵتونی پوخت وساغ لە صەدەقە بدات لەپێناوی خوادا ئەوا لە پاداشتدا بەئەندازەی صەدەقەی مشتی یەکێ لەهاوەڵانی نابێ لە جۆ یان لەخورما یان نیوە مشتێکیش، کێوێکی ئاڵتون لە جگە لەهاوەڵان بەئەندازەی مشتێکی ئەوان نابێ، بۆ؟ لەبەر فەزڵی ئەوانە.

جا هەڵوێستی موسڵمان دەربارەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێز لێ گرتنیانەو داوای ڕازی بوون لەخوای گەورە بۆیان و چاولێکردنیانو شوێنکەوتنیانو بەرگری کردن لە شەرەفو ناموسی ئەوان، ئەمە هەڵوێستی موسڵمانە لەبەرانبەر هاوەڵانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، خۆشەویستی ئەوان بەشێکە لە خۆشەویستی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، جا هەرکەسێ پێغەمبەری خوای (ﷺ) خۆشدەوێ ئەوا با هاوەڵانی پێغەمبەری خوای خۆشبوێت، هەرکەسێ ڕقی لەهاوەڵان بێت ئەوە ڕقی لەپێغەمبەری خودایە (ﷺ) پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (من أحبهم فبحبي أحبهم)[٢٨٢] واتە: هەرکەسێ ئەوانی خۆشبوێت ئەوا بە خۆشویستنی خۆم ئەوم خۆشدەوێت).

ئەو مەسەلەی شەیخ ئاماژەی پێ کرد کەوا نەچینە ناو باسی ئەوەی لەنێوان هاوەڵاندا ڕوویدا، جا تاکەکانی هاوەڵان ئەوانیش وەکو مرۆڤەکانی تر هەڵە دەکەن، بەڵام نیەتی ئەوان پاك بووەو مەبەستیان چاك بوو، ئامانجیان باش بوو هیچ کەسێك

---

٢٨١ / صحيح : سبق تخريجه .

٢٨٢ / ضعيف: أخرجه الترمذي (٣٨٦٢) وأحمد (٨٧/٤) وضعفه الشيخ الألباني في (ضعيف الجامع) (١١٦٠) .

گومانی لەوەدا نییە ئەوەی تەنها گەردیلەیەك ئیمان لەدڵیدا بێت، هیچ کەسێك لەوان تۆمەتبار ناکرێت، بەڵام کاتێ فیتنەکە ڕوویدا_فیتنەش هیچ کەسێ دەسەڵاتی تێدا نییە داوا لەخوا دەکەین بمانپارێزێ_ فیتنەکە لەسەردەمی ئەواندا ڕوویدا بەهۆی ئەو کابرا چەپەڵەوە(عبدالله)ی کوڕی (سبأ) ئەوەی لەڕواڵەتدا موسوڵمانبوونی خۆی دەرخست، ئەمجار هاتو دەستی کرد بەتانەدان لە خەلیفەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) عوسمان، تانەی لێ دەدا، قاڵەقاڵی دەکردو خەڵکی لەسەر کۆدەکردەوەو ئەوانەی خراپەیان لاخۆشە، پاشاگەردەنییان پێ خۆشە، هەموو سەردەمێك لەو جۆرەی تێدایە، جا خەڵکی ئەگەر کەسێك بدۆزنەوە بەرەو خراپە سەرکردایەتیان بکات ئەوا لەدەوری کۆدەبنەوە ئیللا مەگەر کەسێك خوای گەورە ڕەحمی پێ کردبێت، چونکە ئەوان قاڵەقاڵ و تێکدان و تەشویشیان پێ خۆشە، حەز دەکەن قسە بەدەسەڵاتداران بکرێت، پێیان خۆشە کارەکان خراپ بکەن و یەکریزی تێکدەن، لەم جۆرە لەناو خەڵکیدا هەیە، جا ئەگەر یەکێکیان دۆزییەوە بانگی خەڵکی بۆ ئەوە بکات ئەوا لەدەوری کۆدەبنەوە، جا ئەوەی لەدەوری ئەم کابرای چەپەڵە کۆبووەوە ئەوا کۆبووەوە، موسوڵمان یەك ئوممەت بوون و لەژێر فەرمانی یەك خەلیفەدا بوون ئەویش عوسمان بوو، سێ یەم خەلیفەی ڕاشدی ئەم کابرا چەپەڵە کاری لێکردن‌و لەکۆتاییدا کارەکە بەکوشتنی عوسمان کۆتایی پێهات، خەلیفەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)و ئەمیری ئیمانداران‌و سێ یەم خەلیفەی ڕاشدی، جا کاتێ عوسمانیان کوشت، فیتنە لەنێوان موسڵمانانندا هەڵگیرسا، موسوڵمانان لەکوشتنی عوسمان لەنێوانیان خۆیاندا غیرەتیان جۆشی سەندو ویستیان تۆڵەی بسێننەوە لە بکوژانی، بەهۆی ئەوەوە جەنگی (الجمل) ڕوویدا لەنێوان هاوەڵاندا، ئەوانەی (قصاص)یان دەویست لە بکوژانی عوسمان لەشاری مەدینە دەرچوون، لەو کاتەدا بەیعە درابووە ئەمیری ئیمانداران عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب لەپاش عوسمان، بەیعە درا بە عەلی ئەویش چوارەم خەلیفەی ڕاشدی بوو داوایان لە

عەلی کرد تۆڵەی عوسمان لەوانە بسێنێتەوە، ئەو هاوەڵانەی لە مەدینە دەرچووبوون و دایکی ئیماندارانیان لەگەڵدا بوو ڕێککەوتن لەگەڵ عەلیدا ئەو بکوژانە تەسلیم بکات، بەڵام عەلی نەیتوانی ئەوان تەسلیم بکات، چونکە ڕۆچووبوونە ناو لەشکرەکەیو فیتنەیان دەگێڕا، عەلی لەگەڵ براکانیاندا تەڵحەو زوبێرو عائیشەو ئەوانەی هاتبوون بۆ مەدینە بەمەبەستی صوڵح کردن، جا کاتێ بکوژەکان هەستیان بە صوڵح کردنە کرد لەنێوان هاوەڵانی پێغەمبەری خواداو (ﷺ) وازهێنان لە جەنگ، فیتنەیان هەڵگیرساندو وایان دەرخست جەنگ هەڵگیرسا دەستیان بەتیر باران کردو هاواریان کرد لەنێو لەشکرەکەوە، جا هاوەڵان وایان زانی جەنگ هەڵگیرسا، بۆیە جەنگ بەرپابوو لەجەنگی (الجمل) بەبێ مەبەستی هاوەڵان، بەڵکو ئەوانە هەڵیان گیرساند هەر ئەوانە بوون، ئەوانەی عوسمانیان کوشت، ئەوەی لە هاوەڵان کوژرا لەم فیتنەدا ئەوا کوژراو لەم جەنگەداو کۆتایی پێ هات ئەمجار معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان هەستا لەشام و خەڵکی (شام)ی لەگەڵدا بوو داوای بکوژانی عوسمانیان دەکرد بۆ ئەوەی تۆڵەی بسێنن، بەڵام ئەو کۆمەڵە گومڕایە دیسان دەستیان کرد بە فێڵو هەڵخەڵەتاندن و هەڵگیرسانی فیتنە بۆیە جەنگی (صفین) بەرپا بوو لەنێوان عەلی و معاویەدا، هۆکارەکەشی ئەو گومڕاکەرانە بوون کە فیتنەیان هەڵدەگیرساند لەنێوان موسڵماناندا.

کارەکە بە کوشتنی عەلی کۆتایی پێ هات، خەواریج کوشتیان ئەوانەی لەدژی عوسمان دەرچوون، (عەلی)یان گەیاندە عوسمانو کوشتیان، مەبەستی ئەوان دادپەروەریو (ئینصاف) نەبوو بەڵکو مەبەستیان ڕقو تۆڵە سەندنەوە بوو، ویستیان مەعاویەو عەمری کوڕی العاصو عەلی کوڕی ئەبو تالیب بکوژن بەڵام خوای گەورە (معاویە)و (عەمری کوڕی العاص)ی دەرباز کردو قەدەری خوا وابوو عەلی بکوژرێ بۆیە شەهید بوو.

جا پێویستە لەسەر موسوڵمان واز لەو باسانە بهێنێ و نەچێتە ناو ئەو باسانەوە، باسی نەکات ئیللا لەڕووی ئیعتزارو داوای لێ خۆش بوون بۆ هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، بزانێ ئەوان (مجتهد) بوون ئەوانەی حەقیان پێکاوە ئەوا دوو پاداشتی هەیەو ئەوەی نەیپێکاوە ئەوا یەك پاداشتی هەیە، هێندە چاکەو فەزڵی مەزنیان هەیە ئەو هەڵانەی لە هەندێکیانەوە ڕوویداوە دایدەپۆشێ، چونکە ئەوانە هاوەڵانی پێغەمبەری خوان (ﷺ) هەروەکو لە فەرموودەیەکدا هاتووە: (ان الله أطلع على أهل بدر، فقال: اعملوا ما شئتم فقد غفرت لكم) واتە: خوای گەورە تەماشای ئەهلی بەدری کردو فەرمووی: هەرچی دەتانەوێ بیکەن ئەوا بیکەن من لێتان خۆشبوومە).

ئەوان لەهەموو حاڵەتێکدا خوای گەورە لێیان خۆشبووە، لێخۆشبوون بەشی ئەوانە، چ ئەوانەی پێکاویانەو ئەوانەی نەیانپێکاوە، چونکە ئەوەی هەڵەی کردووە بەمەبەستەوە هەڵەی نەکردووە بەڵکو لە ئیجتیهادەوە بووە، بۆیە پێویستە هەرگیز موسڵمان نەچێتە ناو ئەو باسەوە، کەسیان بە هەڵە نەژمێرێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەڵکو ئیعتزاریان بۆ بهێنێتەوەو داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکات و ڕەحمەتیان بۆ بنێرە، ئەوا دەبێتە یەکێك لەوانەی خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت: (وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ (١٠)الحشر).

چەند کاسێتێك لە هەندێ لەنەفامانەوە دەرکەوتووە ئەم باسانەی تێدا تۆمار کردووە، ئەوەی لەنێوان هاوەڵاندا ڕوویداوە، بەچەند کاسێتێك دەرکەوتووەو ئێستا لەبەردەستی خەڵکیدایە، جا ئەم کەسە:

- یاخود نەفامەو عەقیدەی نەخوێندووە.

- یان مەبەستێکی هەیە دەیەوێ ڕق و کینە بڵاو بکاتەوە بەرانبەر هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ).

جا با موسڵمانان ئاگاداری ئەو کاسێتانەو هاوشێوەکانیان بن، با ئاگادارو وریای فڕوفێڵی شیعە بن، جوێندان بەهاوەڵانی پێغەمبەری خواو(ﷺ) بەدوای عەیبەکانیاندا دەگەڕێن، جا با موسڵمان ئاگاداری ئەوە بێت، بۆ ئەوەی نەبێتە یەکێ لەوانەی بەهەلاکەتدا چوون _پەنا بەخوا_.

**﴿١٣٢﴾ نوسەر دەڵێت: (واعلم –رحمك الله- أنه لا يحل مال امرئ مسلم إلا بطيبة من نفسه، وإن كان مع رجل مال حرام فقد ضمنه، لا يحل لأحد أن يأخذ منه شيئا إلا بإذنه، فإنه عسى أن يتوب هذا فيريد أن يرده على أربابه فأخذت حراما).**

**واتە: بزانە –ڕەحمەتی خوات لێ بێ– ماڵی هیچ موسڵمانێك حەڵاڵ نییە ئیللا بەویستو ڕازیبوونی خۆی نەبێ، ئەگەر پارەیەکی حەرام لای کەسێك بوو ئەوا زەمانەتی کردوە، بۆ هیچ کەسێك حەڵاڵ نییە هیچ شتێکی لێ ببات ئیللا بە ئیزنی ئەو نەبێ، چونکە ڕەنگە ئەو کابرایە تەوبە بکات و بیەوێ ماڵەکە بۆ خاوەنەکەی بگێڕێتەوە ئەوا ئەو کاتە تۆ حەرامێکت بردووە.**

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (واعلم –رحمك الله- أنه لا يحل مال امرئ مسلم إلا بطيبة من نفسه).

**لەڕێزگرتنی موسڵمانان ڕێزگرتنە لە خوێن و ماڵەکەیانو ڕێزگرتنە لەشەرەفو ناموسیان، چونکە هەرکەسێ بووە موسڵمان ئەوا بەو موسڵمان بوونە خوێن و ماڵو سامانی پارێزراو دەبێ، بۆیە دروست نییە تەعەدا لە موسڵمان بکرێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:** (كل المسلم على المسلم حرام: دمه وماله وعرضه)[283] **لە وتاری حەجی ماڵئاوییدا فەرمووی:** (إن دمائكم وأموالكم وأعراضكم حرام عليكم كحرمة يومكم هذا – **واتە: ڕۆژی قوربانی**– في شهركم هذا – **واتە: مانگی ذي الحجة** – في بلدكم هذا)[284] **ئەویش مەککەی پیرۆزە، جا خوێن و ماڵ وشەرەفی موسڵمان حەرامە، بۆیە نابێو**

---

٢٨٣ / رواه مسلم (٢٥٦٤).

٢٨٤ / صحيح : سبق تخريجه .

دروست نییە تەعەدا لەماڵی موسڵمان بکرێت یان ببرێت ئیللا بە ویستو خوایشتی خۆی نەبێ، ئەگەر هەر ماڵێکی بەخشی ئەوە حەلاڵە بەڵام ئەوەی بەزۆر لێی دەبرێت یان بەخوایشتی خۆی نییە یا دەیدزێ یان خیانەتی لێ دەکرێ ئەوە حەرامە وەکو حەرامبوونی خوێنو شەرەفی، ئەمەش هەر وەکو ئەوەیە خوای گەورە دەفەرموێت: (وَلَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ) البقرة/١٨٨).

خوای گەورە دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلَّا أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ) النساء /٢٩) واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! ماڵو سامانی یەکتری لەخوتو خۆڕایی مەخۆن مەگەر لەڕێگەی سەداو بازرگانیو ڕەزامەندی نێو خۆتانەوە بێتو خۆتان مەکوژن چونکە بەڕاستی خوا دەربارەی هەمووتان دلۆڤانو میهرەبانە).

زۆرێك لەخەڵکی گوێ بەمە نادەن یان برا موسڵمانەکەی دەکوژێ بۆ ئەوەی ماڵەکەی ببات و یان ماڵەکەی دەدزێو یان ڕێگای لێ دەگرێو یان بەخیانەتو یان بەساختەکردن لە کڕینو فرۆشتندا، گوێ بەوە نادات جا ماڵەکەی دەبات بەناحەق و بەبێ خوایشتی خۆی، ئەمەش هەمووی حەرامەو یەکێکە لەتاوانە گەورەکان.

مەبەست لە: (وإن كان مع رجل مال حرام فقد ضمنه).

ئەگەر ماڵی برایەکی خۆی برد بە ناحەقی بەهەر جۆرێك بێت لەجۆرەکانی بردن ئەوا لەسەر ئەوە پاراستنی تاکو دەیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی، چونکە دەبێ زەوتکراوەکان(ئەوەی بە ستەم براوە) بگێڕدرێنەوە بۆ خاوەنەکانیان لە پێش مردن، ئەگەر نا خاوەنەکەی لەڕۆژی قیامەت تۆڵە لەستەمکارەکە دەکاتەوە، لەحەسەناتەکانی ئەو دەبەن، تاکو ڕەنگە تەنها یەك چاکەی نەمێنێ، ئەمجار لەتاوانەکانی ستەملێکراوەکان دەدرێتە ستەمکارەکەو فڕێ دەدرێتە ئاگرەوە _پەنا بەخوا_ جا ماڵی موسڵمان ئەگەر بەزۆر بردووتە یان بە مامەڵەیەکی حەرام یان بەدزی ئەوا لەسەر

تۆیەو دەبێ بیگێڕیتەوە یان لەدونیا یاخود لەقیامەت، جا ئاگاداری ئەوە بە، چونکە ئەوە لەئەستۆی تۆیەو دەبێ بیدەیتەوە یان لەدونیا و یاخود لەقیامەت، گەڕانەوەی لەدونیادا سووک وئاسانترە لەگەڕانەوەی ڕۆژی قیامەت.

**مەبەست لە:** (لا يحل لأحد أن يأخذ منه شيئا إلا بإذنه، فإنه عسى أن يتوب هذا فيريد أن يرده على أربابه فأخذت حراما).

**دروست نییە هیچ شتێك ببەی دەزانی ئەوە حەرامە یان لە کەسابەتی حەرامەوەیە لەبەر چەند هۆیەك:**

**یەکەم: تۆ دەزانی ئەوە حەرامە ئیتر چۆن حەلاڵی دەکەیت؟ لە کاتێکدا دەزانی ئەوە حەرامە، موڵکی ئەو کابرایە نییە.**

**دووەم: ئەگەر ئەم ستەمکارە تەوبەی کردو ویستی ماڵەکە بگێڕێتەوەو لەکاتێکدا تۆ لەئەوت بردووە ئەوا ئەو کاتە ناتوانێ بیگێڕێتەوە.**

**سێ یەم: تۆ دەبیتە شەریك و هاوبەشی ئەو لەتاوان و ستەمەکەدا.**

**﴿١٢٣﴾ نوسەر دەڵێت: (والمكاسب ما بان لك صحته فهو مطلق إلا ما ظهر فساده، وإن كان فاسدا يأخذ من الفساد ممسكة نفسه ولا تقول: اترك المكاسب وآخذ ما أعطوني لم يفعل هذا الصحابة ولا العلماء إلى زماننا هذا قال عمر بن الخطاب رضي الله عنه: (كسب فيه بعض الدنية خير من الحاجة إلى الناس)[٢٨٥]).**

**واتە: كەسابەتەكان ئەوەی بۆت ڕوون بووەتەوە لەدروستێتی ئەوە ڕەهایە، ئیللا ئەوە نەبێ فەسادەكەی دەركەوتووە، ئەگەر خراپ بوو ئەوەندە لەخراپەكە دەبات تەنها بۆ مانەوەی خۆی، مەڵێ: واز لەكەسابەت دەهێنم و ئەوە دەبەم پێم دەبەخشن، ئەمە هاوەڵان نەیانكردووە، هەروەها زانایان تاكو ئەم سەردەمە نەیانكردووە، عومەری كوڕی خەتتاب فەرموویەتی: كەسابەتێك كەمێك دەنائەتی (سووكیو نزمی) تێدا بێت چاكترە لەپێویستی دەستی خەڵكی).**

**ڕاڤە/ مەبەست لە:** (والمكاسب ما بان لك صحته فهو مطلق).

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:** (ان الحلال بيّن وإن الحرام بيّن وبينهما أمور مشتبهات لا يعلمهن كثير من الناس فمن أتقى الشبهات فقد استبرأ لدينه وعرضه)[٢٨٦] **جا حەڵاڵ ڕوون و دیارە وەردەگیرێت، چونكە ئەصڵ لەمامەڵەدا حەڵاڵ بوونە ئیللا ئەوە نەبێ حەرامبوونەكەی دیارە، هەروەها حەرامیش ئاشكرایە، خوای گەورە دەفەرموێت:** (حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ) المائدة/٣) **هەروەها قومارو مەی، ئەمە حەرامە بەدەقی قورئان، هەروەها دزی و خواردنی ماڵی خەڵكی بەناحەقی ئەمە حەرامێكی ئاشكراو ڕوونە.**

---

٢٨٥ / رواه ابن ابى الدنيا فى اصلاح المال (٣٢١) .

٢٨٦ / صحيح : سبق تخريجه .

ئەوەی (مشتبه)ـە نازانرێت ئایە ئەوە حەڵاڵە یان حەرامە لەبەر بوونی بەڵگەکانی لەدژی یەك، ئەمە لێی ڕادەوەستی تاکو ڕوون دەبێتەوە، ئەمە ئەو یاساو ڕێسایەیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دایناوە ئەویش یاسایەکی ڕوون و ئاشکرایە، ئەمەش مانای قسەی دانەرە کە دەڵێت: (إلا ما ظهر فساده).

مەبەست لە: (وإن كان فاسدا يأخذ من الفساد ممسكة نفسه).

ئەمە مەسەلەی زەرورەتە، ئەگەر مرۆڤ ترسا لەخۆی کە بەهەلاکەتدا دەچێ ئەگەر نەخوات، ئەوا دەستی دەکەوێ ئەوەندەی ژیانی بمێنێ دەیخوات هەرچەندە ئەگەر لەماڵی کەسێکی تر بێت، هەرچەندە ئەو ماڵە حەرام بێت، ئەگەر مردارەوەش بوو یان جگە لەوانە، دەخوات لێی لەبەر زەرورەت، بۆ ئەوەی نەمرێ، خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ بِهِ لِغَيْرِ اللَّهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ (١٧٣) البقرة) واتە: خوای گەورە تەنها هەر ئەمانەی لێ یاساغ کردوون: لاکی مردارەوە بوو،خوێنی ڕژاوو ڕەوان، گۆشتی بەرازیش و هەر ئاژەڵێکیش _کە بۆ سەربڕین _ ناوی غەیری خوای لێ هێنرابێ بەڵام هەرکەسێ لەبەر ناچاری و بێ ئارەزوو، هەر بەئەندازەی پێویست بخوات و زیادە خۆری نەکات هیچ تاوان و گوناهێکی ناگات، بەڕاستی خوا زۆر گوناحپۆش و دلۆڤان و میهرەبانە.

ئەوەندە لەحەرام دەبەیت ژیانت بمێنێ، ئەمجار لەوەی ماوە ڕادەوەستێ، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَقَدْ فَصَّلَ لَكُمْ مَا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلَّا مَا اضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ) الانعام/١١٩) جا لەکاتی زەرورەتدا حەرام نییە.

مەبەست لە: (ولا تقول: اترك المكاسب وآخذ ما أعطوني).

هەندێ لەخەڵکی دەڵێن:– من پشتم بەخوا بەستووە، من دادەنیشم بەمەبەستی پەرستن و وەرگرتنی زانست و زانیاری خەڵکی پێم دەبەخشن، ئەمە دروست نییە،

بـەڵكو دەبـێ بـەدوای ڕزق و ڕۆزیـدا بگـەڕێیت ئەوەنـدەی بەشـی خـۆت و خێـزان و منداڵەكانتو ئەوانەی لەماڵەكەتـدان بكـات، ئەمـەش بەشـێكە لـەعیبادەت، دامەنیـشەو چاوەڕێی خێرو صـەدەقەی خـەڵكی بكـەیت، بـەڵكو پێویـستە لەسـەرت بـەدوای ڕزق و ڕۆزیدا بگەڕێیت، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى)البقرة/١٩٧).

مەبەست لە: (لم يفعل هذا الصحابة ولا العلماء إلى زماننا).

ئەم كارەیان نەكردووە، ئەویش دانیشن لە گەڕان بەدوای ڕزقداو تەماشـای دەسـتی خەڵكی بكەن تەنها یەك هاوەڵیش لەهاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، لەكاتێكدا ئـەوان لەهـەموو كـەس زیـاتر لەخواترسـترو عابـدتر بـوون بـۆ خـوای گـەورە، بـەڵكو خـاوەن كاربوون تیایاندا هەبوو بەكشتوكاڵەوە خەریك بوو، تیایاندا هەبوو بازرگان بوو بەكڕینو فرۆشتنەوە خەریك بوو، لەوانە (ئەبو بەكر) و (زوبێری كوڕی عـەوام) و (عبـدالرحمن ی كوڕی عوف) و (عوسمانی كوڕی عەففان) خاوەنی پارە بوون دەیانكڕیو دەیانفرۆشت، لەكاتێكـدا باشـترین هـاوەڵان بـوون، لەهـەمان كاتـدا لـەپێناوی خـوادا دەیانبەخـشیو بەسامانی خۆیان لەشكریان ئامادە دەكردو وازیان لەگەڕان بەدوای ڕۆزیدا نەهێنا، ئەبو بەكر دەیكڕیو دەیفرۆشتو یارمەتی پێغەمبـەری خـوای (ﷺ) دەدا هـەر لـەو كاتـەوە خوای گەورە ڕەوانەی كرد لە مەككە، ئەو بەسامانەكەی یارمەتی ئەوی دەدا لەچـەندین هەڵوێـستی بەناوبانگـدا، نـانی هـەژارانی دەداو ئـەو كۆیلانـەی ئـازار دەدران ئـەوانی دەكڕیو ئازادی دەكـردن وەكـو بـیلالو جگـە لـەو، كەچـی وازی لـە كەسابەت نـەهێنا بڵێت: من دادەنیشمو خوا پەرستی دەكەمو من لەهاوەڵانی پێغەمبەری خودام (ﷺ).

مەبەست لە: (قال عمر بن الخطاب رضي الله عنه: كسب فيه بعض الدنية خير من الحاجة إلى الناس).

خاوەنی پیشەیەك بێت دەنائەتی تێدا بێت (سووكیو نزمی تێدا بێت) وەكو حیجامە (كەڵەشـاخ گـرتن) لەبەرانبـەر ئـەنجام دانیـدا پارەیـەك وەرگـری و بـۆ خـۆت خـەرجی بكەیت، ئەوە زۆر باشترە لەوەی داوا لەخەڵكی بكەیت و زەلیل بیت بەرانبەریان.

**﴿١٢٤﴾ نوسەر دەڵێت: (والصلوات الخمس جائزة خلف من صليت خلفه إلا أن يكون جهميا فإنه معطل وإن صليت خلفه فأعد صلاتك وإن كان امامك يوم الجمعة جهميا وهو سلطان فصل خلفه وأعد صلاتك وإن كان إمامك من السلطان وغيره صاحب سنة فصل خلفه ولا تعد صلاتك).**

واتە: پێنج نویژەکە دروستە لەپشتی هەرکەسێکەوە بیکەیت ئیللا مەگەر جەهەمی بێت چونکە ئەو (معطل)ە، جا ئەگەر نوێژت کرد لەپشتییەوە ئەوە نوێژەکەت دووبارە بکەرەوە، ئەگەر پێشنوێژەکەت جەهەمی بوو لەکاتێکدا ئەو دەسەڵاتدار بوو ئەوە نوێژ لە پشتییەوە بکەو نوێژەکەت دووبارە بکەرەوە، ئەگەر پێشنوێژەکەت دەسەڵاتداربوو یان جگە لەو خاوەنی سوننە بوو ئەوا نوێژ لەپشتییەوە بکەو نوێژەکەت دووبارە مەکەرەوە.

ڕاڤە/

مەبەست لە: (والصلوات الخمس جائزة خلف من صليت خلفه).

ئەمە مەسەلەی پێشنوێژییە لەنوێژدا، کێ دروستە بکرێتە پێشنوێژ؟ کێ پێشنوێژییەکەی دروست نییە؟

یەکەم: ئەگەر هاتوو پێشنوێژەکە سوڵتان بوو ئەوە لەپشتییەوە نوێژ دەکرێ، هەروەکو دێت بەبێ ئەوەی تەماشای هەندێ لەمومارەسەکانی بکرێت، کە سەرپێچی تێدایە یان موخالەفەیەك لەدین دەری ناکات، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی کردوە نوێژ لەپشتیانەوە بکرێت، لەبەر یەکخستنی ڕیزی موسڵمانان نەهێشتنی دووبەرەکی، جا هەرچەندە تاوان و سەرپێچی هەبوو بەمەرجێ نەگاتە حەدی کوفر ئەوا نوێژ لە پشتییەوە دەکرێ، لەپێناو یەکخستنی ڕیزەکان بەتایبەتی لەڕۆژانی هەینی و

جەژنەکاندا هەروەها لەفەرزەکانشدا، ئەگەر هاتوو دەسـەڵاتدارەکە جەهـەمی بـوو ئـەوا نوێژ لەپشتییەوە دەکەین و بەڵام نوێژەکەت دووبارە دەکەیتەوە.

دووەم: ئەگـەر هـاتوو پێـشنوێژەکە (فاسـق) بـوو دەسـەڵاتدار نـەبوو، ئەمـە جێـی جیاوازی زانایانە لەسەر دوو ڕا:_

ڕای یەکەم: هەنـدێ لـەزانایان مـەرجی (عدالـە)ی تێـدا دانـاوە، بۆیـە دروسـت نییـە لەپشت فاسقێکەوە نوێژ بکەیت تاوانێك لە تاوانە گەورەکان ئەنجام دەدا جگە لەشـیرك دەڵێن:– نوێژ لەپشتیەوە ناکرێت، چونکە ئەوە (عدل) نییە، بە پێشنوێژش دانانرێ.

ڕای دووەم: لەبەر ئەوەی ئـەو موسـڵمانەو نوێژەکـەی خـۆی بۆخـۆی تـەواوە، ئـەوا نوێژکردنیش لەپشتییەوە دروستە، بۆیە لەپشت هـەموو موسـڵمانێکەوە نوێـژ دەکـرێ، هەرچەندە هەندێ لەسەرپێچییەکانی هەبێ جگە لە شیرك و جگـە لـە کـوفر، جـا ئـەوە نوێژ لە پشتییەوە دەکرێت، ئەمەش لەڕواڵەتی قسەکەی نوسەردا دەردەکەوێت.

**﴿١٢٥﴾ نوسەر دەڵێت: (والإيمان بأن أبا بكر وعمر -رحمة الله عليهما- في حجرة عائشة مع رسول الله (ﷺ) قد دفنا هنالك معه فإذا أتيت القبر فالتسليم عليهما بعد رسول الله (صلى الله عليه و سلم) واجب).**

**واتە: باوەڕبوون بەوەی ئەبوبەکرو عومەر _ڕەحمەتی خوایان لێ بێ _لەژوورەکەی عائیشەدان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) لەوێ نێژراون، جا ئەگەر چوویت بۆ لای قەبرەکە ئەوە سەلام کردن لە هەردووکیان لەپاش پێغەمبەری خوا (ﷺ) واجیبە.**

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (والإيمان بأن أبا بكر وعمر -رحمة الله عليهما- في حجرة عائشة مع رسول الله (ﷺ).

**کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆچی دوایی کرد خەڵکی جیاواز بوون ئایە لەکوێدا بینێژن؟ ئایە لەگەڵ هاوەڵانیدا بینێژن لەبەقیع؟ یان چ بکەن؟ بۆیە باسی فەرموودەیەکیان کرد کە فەرموویەتی:** (أن النبي يُدفن حيث يموت)[٢٨٧] **واتە: پێغەمبەر لەو جێگەیە دەنێژرێت کە وەفات دەکات) لەو کاتەدا کێشەکە چارەسەر بوو، بۆیە لەو جێگەیەی وەفاتی کرد هەر لەوێدا نێژرا، لە ژوورەکەی دایکی ئیمانداران عائیشە، چونکە لەکاتی نەخۆشیدا لەماڵی عائیشە بوو.**

**لەلایەکی ترەوە ئەگەر قەبرەکەی بەرز بکرایەتەوەو لەبەقیع بنێژرایە ئەوا زیادەڕەوی ڕوویدەدا خەڵکی لەسەر گۆڕەکەی کۆدەبوونەوە، جا لەبەر پاراستنی لەماڵەکەی خۆیدا نێژرا، بۆیە کاتێ عائیشە باسی نەهی کردن لەزیادەڕەوی قەبردا**

---

٢٨٧ / رواه الترمذي والبغوي .

کردو جولەکەو گاورەکان زیادەڕەوییان کرد لە گۆڕی پێغەمبەرانیانداو کردویانەتە (اوثان) فەرمووی:

(لولا ذلك لأُبرز قبره ولكن خُشيَ أن يُتخذَ مسجداً)[٢٨٨] واتە: ئەگەر ئەوە نەبوایە ئەوا گۆڕەکەی بەرز دەکرایەوە بەڵام ترس لەوە هەیە بکرێتە (نوێژگە) مزگەوت).

جا حیکمەتی ناشتنی لەماڵەکەیدا ڕوون کردەوە، ئەو کاتە ماڵەکەی لەدەرەوەی مزگەوتەکە بوو، چونکە ژوورەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لەتەنیشت مزگەوتەکەوە لەڕووی ڕۆژهەلاتو باشوورەوە بوو، جا لەماڵەکەی خۆیدا نێژرا لەدەرەوەی مزگەوتەکە تاکو (وەلیدی کوری عبدالملك) ویستی مزگەوتەکە فراوان بکاتەوە، بۆیە ژوورەکەی کردە بەشێك لە مزگەوتەکە، هیچ شتێکی لێ نەگۆڕا، بەڵکو ئەو ژوورە کرایە ناو مزگەوتەکەی پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) بە بیانووی فراوان کردنی مزگەوتەکە، ئەگەر نا ئەو هەر لەژوورەکەی خۆیدایەو لەمزگەوتەکەدا نییە، ئەمجار کاتێ ئەبو بکر کۆچی دوایی کرد ئەویش لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) لەژوورەکەداو لەپشتییەوە نێژرا، وەکو ڕێزێك بۆ ئەوو تایبەتمەندییەکی تایبەت، چونکە لەژیانیدا بەردەوام لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بوو هەر بۆیەش لە گەڵیدا نێژراوە، ئەمجار کاتێ عومەر کۆچی دوایی کرد، ئەو کات عائیشە دەیویست خۆی لەگەڵ مێردەکەیدا پێغەمبەری خواو (ﷺ) باوکیدا بنێژرێ، بەڵام عومەر مۆڵەتی لە عائیشە وەرگرت بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەواندا بنێژرێ لەبەر خۆشەویستی پێغەمبەری خواو (ﷺ) خۆشەویستی بۆ ئەبو بەکر، ئەویش مۆڵەتی پێداو و پێش خۆی خست، بۆیە لەپشتی ئەبو بەکرەوە نێژرا، جا ئەمە سێ قەبرەکەیە: قەبری پێغەمبەری خودا (ﷺ) لەڕووی قیبلەوەیە، ئەمجار قەبری ئەبوبەکر، ئەمجار قەبری عومەر لە ژوورەکەی عائیشەدا، عائیشە کاتێ کۆچی دوایی کرد ئەوا لەبەقیع و لەگەڵ هاوەڵاندا نێژرا.

---

٢٨٨ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٤٢٥) ومسلم (٥٢٩) .

پێویستە باوەڕ بەوە بهێنین، چونکە زانینی ئەوەو زانینی قەبری پێغەمبەری خواو (ﷺ) قەبری هەردوو هاوڕێکەی سوودی بۆ موسڵمانان هەیە لەبەر ئەوەی سەلامیان لێ بکات و سەردانیان بکات و سەلام لە پێغەمبەری خواو (ﷺ) هەردوو هاوڕێکەی بکات، بۆ ئەوەی پاداشتی دەست بکەوێ، پاداشتی سەردان و سەلام کردن.

**مەبەست لە:** (فإذا أتيت القبر فالتسليم عليهما بعد رسول الله (ﷺ) واجب).

ئەمە ئەو بەرهەمو حیکمەتەیە لە زانینی ئەوەی ئایە پێغەمبەری خواو (ﷺ) هەردوو هاوڕێکەی ئەبوبەکرو عومەر لەکوێدا نێژراون، بەرهەمەکەی ئەوەیە سەلامیان لێ بکەیت ئەگەر سەردانی مزگەوتی پێغەمبەری خوات (ﷺ) کردو نوێژت تێدا کرد، بۆ ئەوەی بەو کارەت پاداشتی سەردانت دەست بکەوێ.

سەردانی پێغەمبەری خواو (ﷺ) هەردوو هاوڕێکەی لەبەر سەلام کردن لەوان و دوعاکردن بۆیان و داوای لێخۆشبوون بۆیان، نەك لەبەر زیادەڕەویو داواکردنی بەرەکەت، یان داوای جێ بەجێ کردنی پێویستییەکان لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، هەروەکو هەندێ لە خەڵەفاوەکان وادەزانن ئەوانەی ئازاری پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەدەن، بەڵکو ئەوە تەنها سەلام کردنە، سەلامیش بۆ ئەو کەسەیە لە سەفەرەوە هاتبێ ئیتر خەڵکی مەدینە بێت یان لەدەرەوەی مەدینە بێت، جا ئەو کەسەی لەسەفەر گەڕابێتەوە سەلامیان لێ دەکات کاتێ دەچێتە ناو مزگەوتەوە لەپاش سەفەرەکەی، سەلام کردنەکە دووبارە ناکاتەوە هەموو جارێ دەچێتە ناو مزگەوتەکەی پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) چونکە هاوەڵان ئەوەیان نەکردووە، وەکو کارکردنێك بەو فەرمودەیەی دەفەرموێت: (لاتجعلوا قبري عيداً)[٢٨٩] چونکە (عيد) ئەوەیە دووبارە دەبێتەوە، نەیکاتە خوو ڕەوشتێك هەرجارەی چووە ناو مزگەوتەکەوە بڕوات سەلام بکات لەپێغەمبەری

٢٨٩ / صحيح : أخرجه أبو داود (٢٠٤٢) وصححه الشيخ الألباني في (صحيح الجامع) (٧٢٢٦) .

خوداو (ﷺ) دوو هاوڕێکەی، ئەمە بیدعەیە، ئەمەش وەسیلەیەکە خاوەنەکەی بەرەو شیرك دەبات، قەبرەکەی بکرێتە (عید)ێك، بەڵکو ئەمە بۆ ئەو کەسەیە لە سەفەر دەگەڕێتەوە، ئەگەر (ئیبن عومەر) لەسەفەرێك بگەڕایەتەوە ئەوا دەهاتو ڕووی دەکرد لە پێغەمبەری خوداو (ﷺ) دەیفەرموو: (السلام عليك يا رسول الله ورحمة الله وبركاته) ئەمجار کەمێك بەرەو ڕۆژهەلأت دەڕواتو بەرەو لای ڕاستیو دەیگووت: (السلام عليك يا أبا بكر الصديق ورحمة الله وبركاته) ئەمجار کەمێك دوا دەکەوێت بەرەو لای ڕاست و دەیگوت: (السلام عليك يا عمر بن الخطاب ورحمة الله وبركاته) ئەمجار دەڕۆیشت[٢٩٠]، ئەگەر بیویستایە دوعای بکردایە ئەوا ڕووی لە قیبلە دەکردو دوعای دەکرد، ڕووی لەقەبرەکە نەدەکرد، بەڵکو ڕووی لەقیبلە دەکرد.

---

٢٩٠ / رواه عبدالرزاق وابن ابي شيبة والبيهقي .

**﴿١٢٦﴾ نوسەر دەڵێت: (والأمر بالمعروف والنهي عن المنكر واجب إلا من خفت سيفه وعصاه).**

**واته: فەرمان کردن بەچاکەو نەهی کردن لەخراپە واجیبە ئیللا بەرانبەر ئەو کەسەی لەشمشێرەکەی یان لە عەصاکەی بترسیت).**

**ڕاڤە/**

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت:** (من رأى منكم منكراً فليغيره بيده، فإن لم يستطع فبلسانه فإن لم يستطع فبقلبه)[٢٩١]، **ئەمەش هەروەکو ئەوەیە لە قورئاندا هاتووە، خوای گەورە دەفەرموێت:** (كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ (١١٠) ال عمران).

**هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:** (وَلْتَكُنْ مِنْكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (١٠٤) ال عمران) **واته: پێویستە هەمیشە کۆمەڵ و دەستەیەك لەئێوە ببێت ئەی موسڵمانان !مەردم بۆ ڕێی خێر و چاکە بانگ بکەن و فەرمان بەچاکە بدەن و ڕێ لەخراپە بگرن دیارە ئەوانەن سەرفرازو بەختیار).**

**هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:** (وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُولَئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ (٧١) التوبة) **واته: پیاوان و ژنانی باوەڕدار هەموو دۆستو خۆشەویست و یارمەتیدەری یەکن هەردەم فەرمان بەچاکە ئەدەن و لەخراپە ڕێگری ئەکەن و هەڵئەسن بەنوێژو و زەکات ئەدەن و ئیتاعەو ملکەچن بۆ فەرمانەکانی**

---

٢٩١ / رواه مسلم (٤٩) .

خواو پەیامبەرەکەی ئەو، بێ گومان خوا ئەوانە هەر دەخاتە بەر میهرەبانی و بەزەیی خۆی چونکە بێ گومان خوا زۆر دەسەڵاتدارە، کارزان و کار بەجێیە).

بە جیاواز لەگەڵ دووڕووەکاندا ئەوان بە پێچەوانەوە فەرمان دەکەن بەخراپەو نەهی دەکەن لەچاکە داوا لەخوا دەکەین بمانپارێزێ، خوای گەورە دەفەرموێت: (الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ بَعْضُهُمْ مِنْ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمُنْكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمَعْرُوفِ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ (٦٧)التوبة) واتە: پیاوو ژنی دووڕوو هەموو وەکو یەکن فەرمان بەخراپە دەدەنو ڕێ بەچاکە دەگرنو دەست لەماڵ بەختکردن بۆ ڕێی خوا دەقوچێنن).

(وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ) واتە: لەصەدەقەو بەخشین لەپێناوی خوادا، ئەوان دەست بڵاو ناکەنەوە لەبەخشین و چاکەدا، چونکە ئەوان باوەڕیان بەخوا نییە، چونکە سەروەتو سامان لای ئەوان لەهەموو شتێك خۆشەویستترە، بەجیاواز لەگەڵ ئیمانداراندا ئەوان نوێژەکانیان دەکەن و زەکاتی سامانەکەیان دەردەکەن، گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکەنو فەرمان دەکەن بەچاکەو نەهی دەکەن لەخراپە، ئەمیش لەپێناوی دامەزراندنی دینو پاککردنەوەی کۆمەڵگە لەخراپەکاری.

بەس نییە بۆ مرۆڤ بڵێت: من تەنها خۆمم لەسەرە، تەنها خۆی چاکسازی دەکاتو واز لەخەڵکی تر دەهێنێ، بەڵکو پێویستە لەسەری خەڵکی تریش چاك بکاتەوە تا لە توانایدایە، چونکە ئەمە لە ئامۆژگارییەو لەویستی چاکەیە بۆ خەڵکی، جا ئەوەی فەرمان بەبراکەی دەکات بەچاکەو نەهی دەکات لەخراپە، ئەمە کارێکی واجبە لەسەرت، یەکێ لەحەقەکانی ئەو لەسەرت ئەوەیە فەرمانی پێ بکەیت بەچاکەو ئەگەر کەمتەرخەمییەکت لێ بینی لەگوێڕایەڵیدا و نەهی لێ دەکەیت لەخراپە ئەگەر هەڵەیەکت لێ بینی، مەهێڵە بە هەلاکەتدا بچێت لەکاتێکدا دەتوانی ئاگاداری بکەیتەوە، نەك وەکو ئەهلی نیفاقو خراپەکاری دەڵێن: فەرمان کردن بەچاکەو نەهی کردن لەخراپە ئەوا چوونە ناو کاروباری خەڵکییە یان ویصایەتە بەسەر خەڵکییەوە، هەروەکو ئێستا

لەرۆژنامەکان و جگە لە رۆژنامەکان دەڵێن، ئەمە قسەی ئەهلی نیفاق و ئەهلی (باطل)ە، بەڵام ئەهلی ئیمان وادەبینن ئەمە بەشێکە لەئامۆژگاری بۆ براکانیان و لە دەرکردنیان لەزیانەوە بۆ قازانج، لە تاریکییەوە بۆ ڕووناکی،خوای گەورە دەفەرموێت: (وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ (٣) العصر).

هەروەها لوقمان دەڵێت: (يَا بُنَيَّ أَقِمِ الصَّلَاةَ وَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ وَانْهَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَاصْبِرْ عَلَى مَا أَصَابَكَ إِنَّ ذَلِكَ مِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ (١٧) لقمان) واتە: ئەی کوڕە بچکۆلەو شیرینەکەم! هەمیشە نوێژەکانت بەتەواوی و بەچاکی بەجێ بهێنە فەرمان بەچاکە بدەو ڕێ لە گوناه و خراپە بگرە لەسەر هەر ئەو بەڵاو نەهامەتییەی تووشت دەبێ خۆڕاگربە بێ گومان ئەو کارانە لەو کارە پەسەندو گرنگانەیە خوا دەیەوێت).

ئەم ئایەتە هەروەکو سورەتی (العصر)ە، کە مرۆڤ فەرمان بەچاکە بکات و نەهی لەخراپە بکاتو ئارام بگرێت لە لەسەر ئەوەی تووشی دەبێ لەو پێناوەدا، چونکە ئەوە لەپێناوی خوادایە، ئەوەش تووشی دەبێ لەلایەن خوداوە پاداشتی دەدرێتەوە.

ئاشکراشە زۆربەی خەڵکی ئەو کەسانەی فەرمان دەکەن بەچاکەو نەهی دەکەن لەخراپە گرانن لەسەریان و قسەیان پێ دەکەن غەیبەت و نەمیمەو جوێنیان پێ دەدەن، بەڵام ئارام دەگرن لەسەر ئەوە، چونکە ئەوان لەپێناوی خوادان، لە گوێڕایەڵی خوادان، لە پێناوی ڕزگارکردنی براکانیانن، ئەوە ئامۆژگاری نییە واز لەبراکەت بهێنی لەسەر کەمتەرخەمی لەعیبادەتداو چوونە ناو خراپەوە، لەکاتێکدا تۆ دەتوانی ئامۆژگارییان بکەیتو وریایان بکەیتەوەو ڕێنموییان بکەیت، ئەمە کەمتەرخەمییە بەرانبەر بەوان، لەکاتێکدا تۆ چاکەت بۆ ئەوان دەوێ و ڕزگاربونت بۆ ئەوان دەوێ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (لايؤمن أحدكم حتى يحب لأخيه ما يحب لنفسه)[٢٩٢]

٢٩٢ / متفق عليه : أخرجه البخاري (١٣) ومسلم (٤٥) .

جا ئەگەر تۆ خەیرو ڕزگاربوونت بۆ خۆت پێ خۆشە، با لەم شتەدا براکەشت وەکو خۆت بێت، تۆ فەرمانی پێ دەکەیتو ئامۆژگاری دەکەیت بەلام بەو ڕێگایەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێنمووی کردوویت لەم فەرموودەیەدا: (من رأى منكم منكراً فليغيره بيده)[٢٩٣] ئەگەر دەتوانێ بەدەستی بیگۆڕێت وەکو دەسەلاتدار یان ئەو کەسەی دەسەلاتدار دەسەلاتی پێداوە بۆ ئینکاری کردن بەدەست وەکو پیاوانی (الحسبه)، ئەوا بەدەستی دەیگۆڕێ و بەدەستی خراپەکە ناهێڵێ، هەروەها خاوەن ماڵ دەسەلاتی لەماڵەکەی خۆیدا هەیە، بەدەستی خۆی خراپە لەماڵەکەی خۆیدا دەگۆڕێ، چونکە ئەو شوانی ماڵەکەی خۆیەتی و بەرپرسیارە لەژێردەستەکەی، خوای گەورە دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنْفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ (٦) التحريم) واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! خۆتان و ژن و ماڵ و کەس وکارەکەتان بپارێزن لە ئاگرێك سووتەمەنییەکەی جەستەو لاشەی مرۆی کافر و بەردی گۆگردە، یان ئەو بەردانەن خەڵکی دەیپەرستن، مەبەست ئەوەیە کە زۆر بڵێسەدار و بە گڕ و گەرمە)

جا ئەهلی ماڵەکەت لەئەستۆی تۆدایە.

بەڵام ئەگەر دەستت نەبوو دەسەلاتت نەبوو، نە دەسەلاتی گشتی و نەتایبەتی ئەوا تۆ بەزمان ئینکاری لێ دەکەیت، ڕوونی دەکەیتەوە ئەوە حەرامەو ئەوە سەرپێچییە، یان ئەو کارە دروست نییە، ڕوونی دەکەیتەوە بە ئامۆژگاری بە وتارو بە دەرس وتنەوەو بە ئامۆژگاری نهێنی لەنێوان خۆت و براکەتدا، بۆی ڕوون دەکەیتەوە، لێی ئاگادار دەکەیتەوە چونکە ئەگەر ئامۆژگاری سوودی نەبوو، قسەکردن سوودی نەبوو لەگەڵیدا ئەوا ئەو کەسە ئاگادار دەکەیتەوە کە بتوانێ ئەو خراپەیە بەدەستی نەهێڵێ، پیاوانی (الحسبه)ی لێ ئاگادار دەکەیتەوە، هەیئەکان ئاگادار دەکەیتەوە، کار بەدەستان ئاگادار دەکەیتەوە، ئەمە بەشێکە لەئینکاری کردن بە زمان.

---

٢٩٣ / أخرجه مسلم (٧٨) .

بەڵام ئەگەر نەتتوانی بەزمان ئینکاری بکەیت وەکو ئەوەی ڕێگریت لێ بکرێت، ئەوا تۆ بەدڵت ئینکاری لێ دەکەیت، لەهیچ حاڵەتێکدا دان بەخراپەدا نانێیت، بەدڵت ئینکاری لێ دەکەیت، وەکو ئەوەی لەکۆڕی خراپەکاریدا دوور دەکەویتەوە و لەخراپەکاران دوور دەکەویتەوەو لەگەڵ ئەواندا دامەنیشە بۆ ئەوەی سەلامەت بیت.

ئەمە پلەکانی فەرمان کردن بەچاکەو نەهی کردن لەخراپەیە ئەمەش هەروەکو ئەوەی لەو ئایەتەدایە کە دەفەرموێت: (فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ) التغابن/١٦)، خوای گەورە دەفەرموێت: (لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا)البقرة/٢٨٦) ئەگەر بەم هەنگاوانەدا ڕۆیشتی ئەوا ئینکاریت لە (منكر) کردووەو سەلامەت بووی.

بەڵام ئەگەر ئینکاری لەخراپە نەکەیت نە بەدەست و نە بەزمان و نە بە دڵ ئەمە بەڵگەی نەبوونی ئیمانە هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (وليس وراء ذلك من الإيمان حبة خردل)[294].

ئەو کەسەی بەدڵ ئینکاری لە(منكر) ناکات ئەو ئەصڵەن ئیمانی نییە، بۆیە پێویستە ئینکاری لە (منكر) بکرێت، بەڵام بەو سیستەمەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێنمویی کردووین، هیچ کەسێك ئەو ئایەتە نەکاتە بیانوو کە دەفەرموێت:(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَيْكُمْ أَنْفُسَكُمْ لَا يَضُرُّكُمْ مَنْ ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ) المائدة/١٠٥) واتە: ئەی گەلی خاوەن باوەڕ! خەریکی پاکسازی دەروونی خۆتان بن ئەوساکە بڕواتان هێنا و ڕێتان دۆزییەوەو ئامۆژگاری خەڵکیشتان کرد، ئیتر خەڵکانی گومڕا بوو ناتوانن زیانتان پێ بگەیەنن هەرچەندە پیلان بگێڕن).

هەندێ لەخەڵکی وادەزانن ئەم ئایەتە دەلالەت دەکات لەسەر ئەوەی ئینکاری کردنی (منكر) پێویست نییە، ئەگەر مرۆڤ خۆی چاکساز کرد ئەوە خەڵکی تری لەسەر

---

٢٩٤ / سبق تخريجه .

نییە، بۆیە ئینکاری کردن لە (منکر)ناکات، فەرمان بەچاکە ناکات، ئەمەش لەگەڵ کیتاب و سوننەدا جیاوازە، ئەو ئایەتە پیرۆزە مانای ئەوە ناگەیەنێ هەروەکو (ئەبو بەکر الصدیق) ڕوونی کردووەتەوە کاتێ پرسیاری لێ کرا لەبارەیەوە فەرمووی: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد فەرمووی: (كَلَّا والله لَتَأْمُرُنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلَتَنْهَوُنَّ عن الْمُنْكَرِ وَلَتَأْخُذُنَّ على يَدَيْ الظَّالِمِ وَلَتَأْطُرُنَّهُ على الْحَقِّ أَطْرًا وَلَتَقْصُرُنَّهُ على الْحَقِّ قَصْرًا)[٢٩٥] جا مانای ئایەتەکە ئەوەیە ئەگەر تۆ فەرمانت بەچاکە کردو نەهیت لەخراپە کرد و بەقسەی تۆی نەکرد ئەوا پێویستە دەست بەخۆتەوە بگری، نەڵێی: منیش وەکو خەڵکی یان ئەمە شتێکەو خەڵکی لەسەریەتی،بەڵکو فەرمان بەچاکە دەکەیت و نەهی لەخراپە دەکەیت جا ئەگەر لێت وەرنەگرێ ئەوا لە هیچ شتێکی دینەکەت واز مەهێنە (تنازل)مەکەو زمان شیرینی لەگەڵیاندا مەکەو لەگەڵ ئەواندا بڕۆیت.

مەبەست لە: (إلا من خفت سيفه وعصاه).

ئەگەر لەوە ترسای کاتێ ئینکاری لە(منکر) دەکەیت دەکوژرێی، یان لێ دەدرێی ئەوا تۆ بۆ پلەی دووەم دەڕۆیت ئەویش ڕوونکردنەوەیە بەزمان، جا ئەگەر ترسای لەڕوونکردنەوە بە زمان، ئەوا بۆ پلەی سێ یەم دەڕۆیت، ئەمەش هیچ کەسێك ڕێگریت لێ ناکات، هیچ کەسێك ڕێگرت نییە بەدڵ ئینکاری لە(منکر) بکەیت، چونکە هیچ کەسێك نازانێ چی لەدڵەکاندا هەیە تەنها خوا نەبێ.

٢٩٥ / ضعيف : أخرجه أبو داود (٤٣٢٦) وضعفه الشيخ الألباني في (ضعيف الجامع) (١٨٢٢) .

**﴿١٢٧﴾ نوسەر دەڵێت: (والتسليم على عباد الله أجمعين) واتە: سەلام کردن لە هەموو بەندەکانی خوا.**

**ڕاڤە/**

**حەقی موسڵمانان لەسەر یەکتر بڵاوکردنەوەی سەلامە لەنێوان یەکتردا، خوای گەورە دەفەرموێت:** (وَإِذَا حُيِّيتُمْ بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ حَسِيبًا (٨٦) النساء) **واتە: کاتێ بە هەر جۆرێك چاك و چۆنی و سڵاوتان لێ بکرێ لەلایەن موسڵمانانەوە جا ئێوە بەجوانتر لەو چاك و چۆنی لەباوەڕداران بکەن، یان هەر هیچ نەبێت وەکو خۆی وەڵام بدەنەوە بەڕاستی خوا بەحسابی هەموو شتێك دەگاو لەگشت کەسێك دەپرسێتەوەو پاداشتی هەموو کارێکیش ئەداتەوە).**

**خوای گەورە دەفەرموێت:** (فَإِذَا دَخَلْتُمْ بُيُوتًا فَسَلِّمُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ (٦١) النور) **واتە: هەرکاتیش چوونە ماڵانێکەوە سڵاو لە خۆتان و یەکتری بکەن).**

**واتە هەندێکیان سڵاو لەوانیتر بکەن، چونکە ئیمانداران وەکو یەك نەفسن هەروەها وەکو یەك جەستەن، سڵاوکردن تەحیەی ئیماندارانە کاتێ بەخوای گەورە دەگەن، خوای گەورە دەفەرموێت:** (تَحِيَّتُهُمْ يَوْمَ يَلْقَوْنَهُ سَلَامٌ وَأَعَدَّ لَهُمْ أَجْرًا كَرِيمًا (٤٤) الاحزاب) **واتە: ئەو ڕۆژەش کە بە دیداری ئەو دەگەن ڕێز و تەحیەیان سەلامە بە سڵاو کردن لە لایەن خوای میهرەبانەوە پێشوازییان لێ دەکرێت و پاداشێکی زۆر چاکیشی بۆ ئامادە کردوون).**

**خوای گەورە سەلامیان لێ دەکات و ئەوانیش سەلام و کەلامی خوا دەبیسن و وەڵامی دەدەنەوە ودەڵێن:** (اللّهم أنت السلام ومنك السلام) **هەروەها ئەهلی بەهەشت تەحییەکەیان سەلامی تێدایە لە نێو یەکتردا،جا هەندێکیان بەسەلام کردن تەحییەی**

ئەوانی تر دەکەن لە بەهەشتدا، هەروەها لەدونیاشدا بەسەلام کردن تەحییە بۆ یەکتر دەکەن.

بڵاو کردنەوەی سەلام یەکێکە لەهۆکارەکانی چوونە بەهەشت بەئاسوودەیی، هەروەکو لەفەرموودەیەکدا هاتووە: (أن من أطعم الطعام و أفشى السلام وصلى بالليل والناس نيام، دخل الجنة بسلام)[٢٩٦] جا بڵاوکردنەوەی سەلام داواکراوە لەنێوان موسڵمانان‌دا، ماناکەی: پاڕانەوەیە بە سەلامەتی بۆ موسڵمانان، دەڵێن ماناکەی: ناوی خوا لەسەرتان، چونکە یەکێ لەناوەکانی خوا (السلام)ـە، جا ئەگەر وتت: (السلام عليكم) واتە: ناوی خوا لەسەرتان، ئەویش (السلام)ـە، جا ئەم وشەیە مەزنە بڵاو ببێتەوە لەنێوان موسڵمانان‌دا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (لاتدخلوا الجنة حتى تؤمنوا، ولا تؤمنوا حتى تحابوا، أفلا أدلكم على امر إذا فعلتموه تحاببتم؟ أفشوا السلام بينكم)[٢٩٧] واتە: هەرگیز ناچنە بەهەشتەوە تاوەکو باوەڕ نەهێنن، وە باوەڕ ناهێنن تاوەکو یەکترتان خۆش نەوێت، ئایا ڕێگایەکتان پێ بڵێم ئەگەر جێ بە جێ بکەن ئەوا یەکترتان خۆش بوێت؟ سەلام کردن لە نێوانتاندا بڵاو بکەنەوە).

جا بڵاوکردنەوەی سەلام خۆشەویستی لەدڵەکاندا دەڕوێنێ، ئەگەر تۆ موسڵمانێك پێت گەیشت و سەلامی لێ نەکردی، ئەوا لەناخی خۆتدا بەرانبەر بەو شتێك دروست دەبێ و دەڵێی: ئایە بۆ سەلامی لێ نەکردم؟ بەڵام ئەگەر سەلامی لێ کردی ئەوا ئەو شتە لەدڵتدا نامێنێ، پێی دڵ ئارام دەبێت و خۆشت دەوێ، ئەمەش پشت ڕاستکەرەوەی فەرموودەکەی پێغەمبەری خودایە (ﷺ) کە دەفەرموێت: (أفلا أدلكم على امر إذا فعلتموه تحاببتم؟ أفشوا السلام بينكم) جا بڵاوکردنەوەی سەلام کاریگەرییەکی مەزنی لەدەروونی موسڵمانان‌دا هەیە، تەنها ئەوە بەس نییە بڵێیت:-حياك الله، بەیانی

---

٢٩٦ / رواه أحمد والترمذي والدارمي وابن ماجه والحاكم و الضياء المقدسي وغيرهم .

٢٩٧ / أخرجه مسلم (٥٤) .

باش، ئێواره باش؟ ئەم وشانە پاشكۆی سەلامن، ئەگەر وتت: السلام علیكم ئەوا پاشان دەڵێیت: چۆنی؟ بەیانیت باش، ئا لەو شێوانە، هەروەها تەنها ئامارەكردن بەدەست بەس نییە چونكە ئەمە تەحییەی جولەكەیە[٢٩٨]، بەڵكو ئامارە كردنەكە بەدەست ئەگەر هاتوو موسڵمانەكە لێت دوور بوو، ئەوا ئەو كاتە سەلامی لێ دەكەیت بە وشەو بەدەستت ئامارەی بۆ دەكەی بۆ ئەوەی بزانێ تۆ سەلامی لێ دەكەیت بۆ ئەوەی وەڵامی سەلامەكەت بداتەوە.

---

٢٩٨ / تماشای (السنن الكبرى ) ي النسائي بكة (١٠١٧٢) .

**﴿١٢٨﴾ نوسەر دەڵێت: (ومن ترك صلاة الجمعة والجماعة في المسجد من غير عذر فهو مبتدع، والعذر: كمرض لا طاقة له بالخروج إلى المسجد، أو خوف من سلطان ظالم وما سوى ذلك فلا عذر لك).**

**واتە: هەرکەسێك واز لەنوێژی جومعەو جەماعەت بهێنێ لەمزگەوت بەبێ هیچ بیانوویەك ئەوە (مبتدع)ە، پاساوەکانیش بریتین لەنەخۆشی کە نەتوانێ دەرچێت بۆ مزگەوت یان ترسان لە دەسەڵاتدارێکی ستەمکار، جگە لەوانە ئەوا هیچ پاساوێکی نییە.**

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (ومن ترك صلاة الجمعة والجماعة في المسجد من غير عذر فهو مبتدع).

**چونکە ئەو دابڕاوە لەجەماعەتی موسڵمانان، دابڕان لەجەماعەتی موسڵمانان و (شذوذ) بیدعەیە، نوێژی جەماعەت واجیبو فەرزە لەسەر موسڵمان، لەمەش دڵنیاتر نوێژی جومعەیە، بۆیە پێویستە لەسەر موسڵمان کەوا ئامادەی جومعەو جەماعەت بێت لەگەڵ موسڵماناندا، نابێت لەجەماعەتی موسڵمانان لەنوێژدا دابڕێت لەجومعەو جەماعەت، چونکە نوێژکردن بەجەماعەت دەبێ بکرێت، نوێژی جەماعەت واجبەو فەرزە لەسەر هەموو موسڵمانێك و ئەو کەسەش وازی لێ بهێنێ ئەوا تاوانبار دەبێ، بەڵکو تەمێش دەکرێ، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:** (من سمع النداء فلم يجب فلا صلاة له إلا من عذر) قيل: وما العذر؟ قال: خوف أو مرض)[٢٩٩].

**کاتێ کابرای نابینا هات بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و بۆی باس کرد لە نێوان ئەوو مزگەوتەکەدا نارەحەتییەك هەیە کەسێ نییە دەستی بگرێو بیهێنێ و داوای لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد مۆڵەتی پێ بدات لە ماڵەکەی خۆیدا نوێژ بکات پێغەمبەری**

---

٢٩٩ / رواة ابو داود والدار قطني والحاكم والبيهقي وابن ماجه وابن حبان والضياء .

**خوا (ﷺ) پێی فەرموو:** (هل تسمع النداء؟ قال: نعم. قال: فأجب)[300] **جا ئەو کەسەی بانگ دەبیسێ بۆی نییە بەجێ بمێنێ و نەیەت: بۆیە فەرمووی:** (من سمع النداء فلم يجب فلا صلاة له إلا من عذر) **نوێژەکەی تەواو نییە،جا ئەو نەفییە دەڵێن: نەفی صیحەتەو دەڵێن:** (لا صلاة له) **واتە: نوێژەکەی بەکاملی بۆ نانوسرێ، کەواتە نەفی کەماڵە، ڕواڵەتی فەرموودەکە ئەوە دەگەیەنێ نوێژەکەی تەواو نییە ئیللا مەگەر پاساوێکی هەبێ ئەمەش بەڵگەیە لەسەر (واجب)بوونی نوێژی جەماعەت لەمزگەوتدا کاتێ بانگی بۆ دەکرێ، بۆیە (عبدالله بن مسعود) دەفەرموێت:** (من سَرَّهُ أَنْ يَلْقَى اللَّهَ غَدًا مُسْلِمًا فَلْيُحَافِظْ على هَؤُلَاءِ الصَّلَوَاتِ حَيْثُ يُنَادَى بِهِنَّ فإن اللَّهَ شَرَعَ لِنَبِيِّكُمْ (ﷺ) سُنَنَ الْهُدَى وَإِنَّهُنَّ من سُنَنِ الْهُدَى وَلَوْ أَنَّكُمْ صَلَّيْتُمْ في بُيُوتِكُمْ كما يُصَلِّي هذا الْمُتَخَلِّفُ في بَيْتِهِ لَتَرَكْتُمْ سُنَّةَ نَبِيِّكُمْ وَلَوْ تَرَكْتُمْ سُنَّةَ نَبِيِّكُمْ لَضَلَلْتُمْ وما من رَجُلٍ يَتَطَهَّرُ فَيُحْسِنُ الطُّهُورَ ثُمَّ يَعْمِدُ إلى مَسْجِدٍ من هذه الْمَسَاجِدِ إلا كَتَبَ الله له بِكُلِّ خَطْوَةٍ يَخْطُوهَا حَسَنَةً وَيَرْفَعُهُ بها دَرَجَةً وَيَحُطُّ عنه بها سَيِّئَةً وَلَقَدْ رَأَيْتُنَا وما يَتَخَلَّفُ عنها إلا مُنَافِقٌ مَعْلُومُ النِّفَاقِ وَلَقَدْ كان الرَّجُلُ يؤتي بِهِ يُهَادَى بين الرَّجُلَيْنِ حتى يُقَامَ في الصَّفِّ)[301].

**هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاوابوون لەگەڵ نوێژی جەماعەتدا، تەنانەت نەخۆشیش کە ناتوانێ ڕێ بکات لەنێوان دوو پیاودا دەیانهێنا تاکو لەنێو ڕیزەکەدا ڕادەوەستا چونکە دەیانزانی نوێژ جەماعەت واجیبە.**

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەصفی ئەوانەی کرد لە نوێژی جەماعەت دوا دەکەون بە نیفاق، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت:** (أثقل الصلوات على المنافقين: صلاة العشاء وصلاة الفجر)[302] **خوای گەورە شایەتی ئیمانی داوە بۆ ئەو کەسانەی مزگەوتەکان**

---

٣٠٠ / أخرجه مسلم (٦٥٣) .

٣٠١ / أخرجه مسلم (٥١٤) .

٣٠٢ رواه البخاري (٦٢٦) ومسلم (٦٥١) .

بەنوێژکردن ئاوەدان دەکەنەوە، خوای گەورە دەفەرمووێت: (إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللَّهِ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا اللَّهَ فَعَسَى أُولَئِكَ أَنْ يَكُونُوا مِنَ الْمُهْتَدِينَ (١٨) التوبة) واتە: بەڕاستی هەر بەو کەسە دەکەوێ مزگەوتەکانی خوا ئاوەدان بکاتەوە کە بڕوای بەخواو بەڕۆژیی دوایی هەیەو بەجوانی و دروست هەڵدەسێ بەئەنجام دانی نوێژو زەکات دەدات و لەخواش نەبێت لەهیچ کەسێ ترسی نییە بێ گومان بن ئەوانە_ ئەو کردەوە چاکانە دەکەن_ لەڕیزی شارەزا کراوان دان).

جا نوێژی جەماعەت کارێکی زۆر مەزنەو کەمتەرخەمی تیادا ناکرێ، یان ئاوڕ لەو کەسانە بدرێتەوە تەمبەڵی لێ دەکات، ئەگەر نا ئیتر بۆ مزگەوتەکان دروست کراون؟ ئەگەر نوێژی جەماعەت واجیب نییە بۆ مزگەوتەکان دروست دەکرێن و ئەو هەموو پارەی بۆ خەرج دەکرێتو بە بەخشین بنیات دەنرێـو پێشەواو بانگدەری بۆ دابین دەکرێ؟ ئایە لەبەر ئەوەی سوننەتە؟ نەخێر، ئەمە بەڵگەیە نوێژی جەماعەت واجبە، مزگەوتەکان تەنها بۆ سوننەتێك دروست نەکراون، بەڵکو لەبەر واجبێك دروست کراوە، بۆیە دەبێ ئاگاداری ئەوە بین، ڕوو وەرنەگێڕین لە قسەی زیادەی ئەو کەسانەی ئەو قسەو ڕایانە وەردەگرن لەگەڵ بەڵگەدا جیاوازە، کۆی دەکەنەوەو دەڵێن: ئەمە قسەی زانایانە، دەڵێین: قسەی زانایان دەپێکێ و هەڵە دەکەن، جا پێویستە شوێنی بەڵگە بکەوین، نەك شوێنکەوتنی قسەی خەڵکی.

مەبەست لە: (ومن ترك صلاة الجمعة).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (من تَرَكَ ثَلَاثَ جُمَعٍ تَهَاوُنًا بها طَبَعَ الله على قَلْبِهِ)[٣٠٣].

٣٠٣ / صحيح : أخرجه أبو داود (١٠٥٢) والنسائي (١٣٦٩) وأحمد (٣/٤٢٤) وصححه الشيخ الألباني في (المشكاة) (١٣٧١) .

هەروەها دەفەرموێت: (لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ عن وَدْعِهِمْ الْجُمُعَاتِ أو لَيَخْتِمَنَّ الله على قُلُوبِهِمْ ثُمَّ لَيَكُونُنَّ من الْغَافِلِينَ)[٣٠٤].

مەبەست لە: (والعذر: كمرض).

هەروەكو لەكۆتایی فەرموودەكەدا هاتووە، دەفەرموێت: (خوفٌ أو مرض) ئەو نەخۆشییەی مرۆڤ پەك دەخات لەڕۆیشتن بۆ مزگەوت یان دەترسێ نەخۆشییەكەی زیاد بكات لەسەری، یان شتێك بەری بكەوێ كاریگەری لەسەر زیادبوونی نەخۆشییەكە هەبێ، یان ترس لە دوژمن، یان ترسان لەدڕندەیەك، ترسێكی دڵنیایی نەك ترسنۆكی، بەڵكو ئەوە ترسێكی دڵنیایی بێت، لەڕێگادا دوژمنێك ڕێی لێ بگرێ یان دڕندەیەك ئازاری پێ بگەیەنێ، ئەوا ئەم كەسە پاساوی هەیە لەماڵەكەی خۆیدا نوێژ بكات، بەڵام ئەوەی لەئاسایشیدایەو پارێزراوە ئەوا هیچ بیانوویەكی نییە.

## ﴿١٢٩﴾ نوسەر دەڵێت: (ومن صلى خلف إمام فلم يقتد به فلا صلاة له).

واتە: هەركەسێ لەپشت پێشنوێژێكەوە نوێژی كردو ئیقتدای پێوە نەكرد ئەوا نوێژەكەی دروست نییە.

٣٠٤ / أخرجه مسلم (١٨٢٠) .

**﴿١٣٠﴾: (والأمـر بـالمعروف والنهـي عـن المنكـر باليـد واللـسان والقلـب بـلا سيف).**

**واتە: فەرمان کردن بەچاکەو نەهی کـردن لەخراپـە بەدەسـت و زمـان و دڵ نـەك بـە شیر(شمشێر).**

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (ومن صلى خلف إمام فلم يقتد به فلا صلاة له).

**چونکە ئەمە جیاوازە لەگەڵ ئەو فەرموودەیەی دەڵێـت:** (إنما جُعِلَ الإمام ليؤتم به)[٣٠٥] **بەڵام ئێستا گومڕاکانو تەکفیرییەکان لەگەڵ موسڵماناندا نوێـژ ناکـەن، ئەگـەر نوێـژیش بکەن ئەوە نیەتی نوێژکردن بەتەنها دەهێنن، ئەمەش بیدعەیەکی داهێنراوە، جا تۆ لـە گەڵ موسڵماناندا نوێژ دەکـەیتو گومـانی بـاش بـە موسـڵمانان دەبـەی، بۆیـە گومـانی خراپ بە پێشنوێژی مزگەوتەکان مەبە.**

**مەبەست لە:** (والأمر بالمعروف والنهي عن المنكر باليد واللسان والقلب بلا سيف).

**لە پێشدا ئـەوە ڕوون کرایـەوە کـە فـەرمان کـردن بەچـاکەو نـەهی کـردن لەخراپـەو ئەویش بەپێی توانایە، بەڵام ئەو قسەیە** (بلا سيف) **واتە: دروست نییـە چـەك بەرانبـەر بە سـوڵتان هـەڵگریو بڵێـت: ئەمـە بەشـێکە لـە فـەرمان کـردن بەچـاکەو نـەهی کـردن لەخراپە! ئەمە مەزهەبی خەواریجو موعتەزیلەیە کە دژی سوڵتان دەردەچنو دەڵـێن:- ئەم سوڵتانە فاسقە، ئەمـەش لـەئینکاری کـردن (منکـر)ە ! بـەڵام ئەمـە خـودی خـۆی (منکر)ە، چونکە دەرچوون لەدژی کاربەدەستان خۆی لەخۆیدا (منکر)ە، چونکە ئـەوە سەرپێچی پێغەمبەری خودایـە (ﷺ)، هـەروەها چـەندین زەرەرو زیـانی مـەزن لەگـەڵ خۆیدا دەهێنێ لەخوێن ڕشتنو تێکدانی ئەمنو ئاسـایشو تێکدانی یـەك ڕیزیـو چـەند**

---

٣٠٥ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٦٥٦) ومسلم (٤١٢) .

مەفسەدەی گەورەتر، کە لە ئارامگرتن لەسەر سەرپێچییەکەیو جیاوازییەکەی گەورەترە، چونکە سەرپێچییەکەیو جیاوازییەکەی تەنها زیانی بۆ خۆی هەیە بەڵام دەرچوون لەدژی بەشمشێر ئەمە زیانەکەی بۆ موسڵمانانە، ئەمەش مەزهەبی موعتەزیلەو خەواریجە.

جا بنەماکانی موعتەزیلە بریتین لە:-

یەکەم: فەرمان کردن بەچاکەو نەهی کردن لەخراپە، بەمەش دەیانەوێ لەدژی دەسەڵاتدار دەرچنو دەڵێن:- ئەمە بەشێکە لەفەرمان کردن بەچاکەو نەهی کردن لەخراپە.

دووەم : یەکتاپەرستی، ماناکەی: نەفی ناوو سیفەتەکان، چونکە سەلماندنی ناوو سیفەتەکان لای ئەوان شیرکە.

سێ یەم: دادپەروەری، ماناکەی: نەفی قەدەرە، دەڵێن: ئەگەر خوای گەورە سزایان بدات و خوای گەورە تەقدیری لەسەریان کردبێ ئەوە ستەمە لێیان دەکات.

چوارەم: منزلة بين المنزلتين، ئەویش ئەوەیە کەوا ئەو کەسەی تاوانی گەورە ئەنجام دەدات پێی ناگوترێ: کافر و پێی ناگوترێ: موسڵمان، بەڵکو ئەو لە (منزلة بين منزلتين) دایە (واتە: نە کافرە و نە موسڵمانە).

پێنجەم: جێ بەجێ کردن و تەنفیزی هەڕەشە، ئەویش بەکافر زانینی ئەو کەسەیە تاوانی گەورە ئەنجام دەدات کەلەخوار شیرکەوەیە.

**﴿١٣١﴾ نوسەر دەڵێت: (والمستور من المسلمين من لا يظهر منه ريبة).**

واتە: کەسی ئابرودار (عەیب داپۆشراو) لە موسڵمانان ئەو کەسەیە کە هیچ گومانی (تاوانی ئاشکرای) لێ دەرنەکەوتوە.

ئەصڵ لەموسڵماندا (عەدالەتە) و گومانی خراپ بەبرای موسڵمانی خۆتدا مەبە، خوای گەورە دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ وَلَا تَجَسَّسُوا وَلَا يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضًا أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَحِيمٌ (١٢) الحجرات) واتە: ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە! خۆتان لەزۆرێك لەگومان بردن بەیەکتر دووربگرن چونکە هەندێ لەو گومانانە مایەی گوناه و دووچار بونتانە لای خواو وەبەدوای عەیب و عاری یەکتر مەکەون و سیخوڕی مەکەن و لەپاشملە ناوی یەکتر بەخراپە مەبەن ئایا کەستان پێی خۆشە گۆشتی برای خۆی بەمردوویی بخوات؟! ئاشکرایە کەئەوەتان زۆر پێ ناخۆشە وەلەخوا بترسن بێ گومان خوا زۆر لێبوردەیە بۆ هەر کەسێك پەشیمان بێتەوە زۆریش میهرەبانە لەگەڵ بەندەکانی خۆیدا).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (اياكم والظن فإن الظن أكذب الحديث)[٣٠٦] واتە: قسەکردنی نەفس، پەنا بەخوا بگرەو گومانی باش بەبرایانی موسڵمانی خۆت ببە، ئەگەر دڵنیابوویت ئەم برایەت تێبینی لەسەرە ئەوا تۆ بەنهێنی ئامۆژگاری دەکەیتو هەڵەکەی بشارەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (ومن ستر مسلما ستره الله في الدنيا والآخرة)[٣٠٧] خەجاڵەتی مەکەو لەناو کۆڕو مەجلیسدا ناوبانگی بزڕێنیو باسی بکەیت، بەڵکو ئەوەی لەسەرتە ئامۆژگاری بکەیت بەنهێنی لەگەڵ سترکردنی.

---

٣٠٦ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٤٨٤٩) ومسلم (٢٥٦٣) .

٣٠٧ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٢٣١٠) ومسلم (٢٥٨٠) .

**﴿١٣٢﴾ نوسەر دەڵێت: (وكل علم إدعاه العباد من علم الباطن لم يوجد في الكتاب و السنة فهو بدعة وضلالة ولا ينبغي لأحد أن يعمل به ولا يدعو إليه).**

واتە: هەر علمێك بەندەكان بانگەشەی بۆ دەكەن لەعیلمی(باطن) لەكیتاب و سوننەدا نەبێ ئەوە ببیدعەو گومڕاییەو بۆ هیچ كەسێك نابێ كاری پێ بكاتو بانگەوازی بۆ بكات.

راڤە/

عیلمی (باطن) لای گرووی (الباطنية) لە كۆمەڵی (الاسماعيليه)و جگە لەوان ئەوانەی دەڵێن: دەقەكان (ظاهر)و (باطن)ی هەیە، جا (باطن)ـەكەی هیچ كەسێك نازانێ تەنها كەسە تایبەتەكان نەبێتو (ظاهر)ـەكە ئەوە بۆ خەڵكی عەوامە.

دەڵێن:- مەبەست لە نوێژ پاڕانەوەیە، جا هەركەسێ پاڕایەوە ئەوە نوێژی كردووە، مەبەست پێی پێنج نوێژەكەو نوێژە سوننەتەكان نییە.

دەڵێن: مەبەست لە زەكات پاككردنەوەو خاوێن كردنەوەی نەفسەو مەبەستی زەكاتی سەروەتو سامان نییە.

دەڵێن: مەبەست لەڕۆژوو شاردنەوەی نهێنیو شاردنەوەی مەزهەبەكەیانە، بۆیە پێیان دەگوترێ: (ڕێكخراوە نهێنییەكان).

دەڵێن: مەبەست لە حەج ڕۆیشتنە بۆ لای شێخەكانیان و مەبەست ڕۆیشتن نییە بۆ كەعبەی پیرۆز بۆ حەج و عومرە.

مەبەست لە: (وهو بدعة وضلالة).

واتە: وتن بەعیلمی (الباطن) لەدیندا بیدعەیە، گومڕابوونە لەحەق، عیلمیش پەیدا نابێ ئیللا بەفێربوون لەسەر دەستی زانا خواناسەکان نەبێ، بۆیە (إبن القیم) دەفەرموێت:_

والجهل داء قاتل وشفاؤه — أمران في التركيب متفقان

نص من القرآن أو من سنة — وطبيب ذاك العالم الرباني[٣٠٨]

ئەمە عیلمە، عیلم بەزەوق و ئیلهام نییەو عیلمی (باطن) نییە هەروەکو لای (الباطنية) هەیە، بەڵکو عیلم ئەوەیە لەلایەن خواو پێغەمبەرەکەیەوە (ﷺ) هاتووەو ئەوەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتوویانە، ئەمە عیلمە، بەدەر لەمانە ئەوە نەفامی و گومڕاییەو نەعیلمەو نەهیدایەتە.

مەبەست لە: (ولا ينبغي لأحد أن يعمل به ولا يدعو إليه).

بەڵکو پێویستە وریای ئەمە ببین، چونکە ئەوە هەڵەی صۆفییەکانە، ئەوانەی وا دەبینن عیلم لەکیتابو سوننەدا نییە، بەڵکو ئەمە بۆ عەوامی خەڵکییەو بۆ ئەوانەیە کە نازانن، بە ئەم عیلمە دەڵێن(شەریعە) بەڵام ئەوانەی خوا دەناسن ئەوا ئەهلی عیلمی (حەقیقە)تن.

---

٣٠٨ / الكافيه الشافيه .

**﴿١٣٣﴾ نوسەر دەڵێت: (وأيما امـرأة وهبـت نفـسها لرجـل فإنهـا لا تحـل لـه، يعاقبان إن نال منها شيئا إلا بولي وشاهدي عدل وصداق).**

واتە: هەرکاتێ ئافرەتێـك خـۆی پێـشکەش بـەپیاوێك کـرد ئـەوا بـۆی حـەڵاڵ نییـە، هەردووکیان سـزا دەدرێـن ئەگـەر هـەرکارێك بکـەن، ئـیللا بـەبوونی خاوەنەکـەی و دوو شایەتی عەدل و مارەیی نەبێ.

ڕاڤە/

هاوسەرگیری دروست نییە ئیللا بەچەند مەرجێك نەبێ:-

لەوانە: (الولی): ئەوەی عەقدەکەی بۆ دەکات، ئەویش کەسێکی نزیکە لە (عـصب)ی ئافرەتەکە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (لا نكاح إلا بولي وشاهدي عدل)[٣٠٩] جا دروست نییە خۆی عەقد بۆ خۆی بکات، بەڵکو دەبێ خاوەنەکەی عەقدەکەی بۆ بکات، ئەگەر خۆی بۆ خۆی عەقدەکەی کرد ئەوا ئـەو عەقـدە فاسـدە، ئەمـەش ڕای جمهـوری زانایانە، بەڵام لای حەنەفییەکان دروستە ئافرەت بۆ خۆی عەقد بکات و مەرجی (الولی) دانانەن بەڵام ئەم مەزهەبە جیـاوازە لەگـەڵ بەڵگـەداو لەگـەڵ ئـەوەی زۆربـەی زانایـانی لەسەرە، چونکە ئافرەت (قاصرە)یە ڕەنگە پەیوەست بێت بەکەسـێکەوە کەچـی بـۆی شـیاو نـەبێ‌و شـیاوی خێزانەکـەی نـەبێ، چـونکە ئـەو خـاوەن سـۆزێك‌و تێڕوانینێکـی بەپەلەیە، بۆیە کارەکە بۆ خاوەنەکەی دەگێڕدرێتەوە، خوای گـەورە لـە گـەڵ پیاوانـدا دواوە وفەرمویـەتی: (وَأَنْكِحُوا الْأَيَامَى مِنْكُمْ) النور/٣٢) ئەمـە لـە گـەڵ پیاواندایـە، جـا فـەرمانی بـەپیاوان کـردوە ئـەو کـچانەی مێردیـان نییـە بـە شـوویان بـدەن، لـە فەرموودەکەشـدا هـاتوە: (لا نكاح إلا بولي وشاهدي عدل)[٣١٠] لـە فەرموودەیـەکی تـردا

---

٣٠٩ / سبق تخريجه .

٣١٠ / رواه أحمد وأبو داود والترمذي والدارمي والطحاوي .

هاتوه: (أيما امرأةٍ نكحت بغير إذن وليها فنكاحها باطل باطل باطل)[٣١١] سێ جار، جا خاوەن بۆی دەبێتە بەرگرییەك دەیپارێزێ لەیاری پێکردن، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (إذا أتاكم) لە گەڵ خاوەنەکاندا دەدوێ‌و دەڵێت: (من ترضون دينه وأمانته فزوجوه)[٣١٢] خوای گەورە نەهی کردووە لە (العضل):- ئەویش بریتییە لەوەی کەوا خاوەنێك ڕێگربێت لەو کچەی (ئەم خاوەنیەتی) لەکەسێکی هاوکوفی خۆی و خۆی پێی ڕازییە، تەنها ڕازی بوون بەس نییە، بەڵکو دەبێت لەهەمان کاتدا (هاوکوف)ش بێت، دەبێ ئەو دووکارە هەبێ:- دەبێ هاوکوف بێت‌و دەبێت پێی ڕازی بێت، ئەو هاوکوف بوونە تەنها پیاوان دەزانن، خاوەن عەقڵەکان، ئافرەتەکان لێی نازانن، ئەوانەی خاوەن سۆزو نەفسی لاوازن.

مەبەست لە: (وايما امرأةٍ وهبت نفسها لرجل).

ئافرەتێك خۆی بەپیاوێك ببەخشێ ئەمە تایبەتە بەپێغەمبەری خوداوە(ﷺ)، خوای گەور دەفەرموێت: (وَامْرَأَةً مُؤْمِنَةً إِنْ وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِيِّ إِنْ أَرَادَ النَّبِيُّ أَنْ يَسْتَنْكِحَهَا خَالِصَةً لَكَ مِنْ دُونِ الْمُؤْمِنِينَ) الاحزاب/٥٠) چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) خاوەنی ئەم ئوممەتەیە.

مەبەست لە: (يعاقبان إن نال منها شيئاً).

جا ئەگەر بەبێ ئیزنی خاوەنەکی شووی پێکرد ئەوە لەیەك جیا دەکرێنەوەو لەسەر ئەوە سزا دەدرێن، چونکە ئەم عەقدە پووچەڵە.

---

٣١١ / سبق تخريجه .

٣١٢ / حسن : أخرجه الترمذي (١٠٨٤) وحسنه الشيخ الألباني في (المشكاة) (٣٠٩٠) .

**﴿١٣٤﴾ نوسـەر دەڵێـت: (وإذا رأيـت الرجـل يطعـن علـى أحـد مـن أصـحاب رسول الله (ﷺ) فاعلم أنه صاحب هوى وصاحب قول سوء لقول رسـول الله (ﷺ): (إذا ذكر أصحابي فأمسكوا)[٣١٣] فقد علم النبي (ﷺ) مـا يكـون مـنهم من الزلل بعد موته، فلم يقل فيهم إلا خيرا وقوله: (ذروا أصحابي لا تقولوا فـيهم إلا خـيرا) ولا تحدث بشيء من زللهم ولا حـربهم ولا مـا غـاب عنـك علمه ولا تسمعه من أحد يحدث به فإنه لا يسلم لك قلبك إن سمعت).**

واتە: ئەگەر کەسێکت بینی تانەی لەیەکێك لەهاوەڵانی پێغەمبەری خـوا (ﷺ) دەدا ئـەوا بزانــە ئــەوە شــوێنکەوتەی ئــارەزووە و خــاوەنی قــسەیەکی خراپــە، لەبــەر فەرموودەکــەی پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) کەدەفــەرموێت: (إذا ذكر أصحابي فأمسكوا) چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیزانی لەپاش مردنی ئـەو تووشـی هەڵـە دەبـن، بۆیـە لەچاکە زیاتر دەربارەیان هیچی نەگوتوە، ئەو فەرموودەیـەی دەڵێـت: (ذروا أصحابي لا تقولوا فيهم إلا خيرا) دەربــارەی هەڵــەکانیان هــیچ مــەگێڕەوە هــەروەها دەربــارەی جەنگەکانیانو ئەوەی کەزانینی لـەتۆوە نادیـارە، گـوێ لـەهیچ کەسـێك مـەگرە باسـی دەکات،چونکە دڵت هەرگیز سەلامەت نابێ ئەگەر تۆ ئەوەت بیست.

ڕاڤە/

لەنیشانەکانی گومڕاکارانو دووڕووەکان ئەوەیـە تانـە لـەهاوەڵانی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دەدەن چونکە ئەوان ڕقیان لێیانە، هەرکەسـێ ڕقـی لـەوان بێـت ئـەوا دووڕووەو ئیمان دەردەخـات و کـوفری شـاردوەتەوە، چـونکە (خۆشویـستنی ئـەوان ئیمانـەو ڕق

---

٣١٣ / سبق تخريجه .

لێبوونیـان دوورپوویــە)[٣١٤] هــەروەکو لەفەرموودەکــەدا هاتووە،چـونکە ئـەوان هــاوەڵی پێغەمبــەری خــوان (ﷺ) و ئامۆژگــاری کــردین چــاك بــین لەگەڵیانــدا ونــەهی کــردووە لەجوێنــدان پێیــان، چــونکە ئەوانــە بــوون پــشتگیریان کــرد لەپێغەمبــەری خــواو(ﷺ) لەگەڵ ئەودا کۆچیان کرد، پشتیوانی بوونو داڵدەیانــدا، ئەوانــەی کۆچــیان کــرد ئــەوان (المهاجرين)ن، ئەوانەی داڵدەیاندا و پشتیوانی بوون ئەوانە (الانــصار)ن، خۆشویــستنی هەموویان پێویستەو ستایشکردنو چاولێکردنیان، جـا هــەر کەســێ تانــەیان لێ بــدات و بەکەمیان بزانێ ئەوە بەڵگەیـە پێغەمبــەری خــوای (ﷺ) خــۆش نــاوێ، چــونکە ئەگــەر پێغەمبەری خوای (ﷺ) خۆش بویستایە ئەوا هاوەڵانیشی خۆش دەویست، بۆیــە هــیچ کەسێ ڕقی لەوان نییە ئیللا کەسێك نەبێ ڕقی لە پێغەمبەری خوایە (ﷺ)، هەرکەســێ ڕقی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بێت ئەوە (کافرە).

مەبەست لە: (فاعلم أنه صاحب هوى وصاحب قول سوء).

واتــە: هەرکەســێ جــوێن بــەهاوەڵان بــدات ئــەوا خــاوەنی ئــارەزووەو شــوێنکەوتەی ئارەزوەکەیەتی،خوای گەورە دەفــەرموێت: (وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِنَ اللَّهِ) القـصص/٥) خــاوەنی بیدعەیــە، خــاوەنی دوورپوویــە، هــەموو خراپەیــەکی تێــدا کۆبووەتەوە.

ئەو فەرمودەیەی کە دەفەرموێت: (اذا ذكر أصحابي فأمسكوا) پێویستە بێدەنگ ببین لەئاستی هاوەڵانی پێغەمبــەری خــواو (ﷺ) قــسەیان دەربــارە نەکــەین ئــیللا بەچــاکە نەبێو ستایشیان بکەینو نەچینە نێو باسی کاروباری ئەوانەوە.

---

٣١٤ / رواه البخاري (٣٥٧٣) ومسلم (٧٤) .

**مەبەست لە:** (فقد علم النبي (ﷺ) ما يكون منهم من الزلل بعد موته، فلم يقل فيهم إلا خيرا).

**پارێزراوی لە هەڵە (العصمه) بەنیسبەت ئیجماعی هاوەڵانەوەیە، جا ئەگەر ئیجماعیان لەسەر شتێ بوو ئەوا ئیجماعەکەیان (معصوم)ەو ئیجماعەکەیان بەڵگەیە، بەڵام ئەگەر جیاوازبوون ئەوا تەماشای ئەوەیان دەکرێت بەڵگەی پێیە وەکو زانایانی تر، بەڵام وەکو تاك ئەوە (معصوم) نین لە هەڵە، ڕەنگە هەندێ جار هەڵە بکەن، بەڵام خوای گەورە لەوان خۆش بووە، تایبەتمەندی کردوون بە هاوەڵبوون، جا هێندە فەزڵیان هەیە دەبێتە هۆی داپۆشینی ئەو هەڵانەی دەیکەن لەبەرچەند هۆیەك:**

**یەکەم: چونکە ئەوان (مجتهد)بوونەو مەبەستیان هەڵە نەبوە، بەڵکو ئیجتیهادی کردوەو حەقی نەپێکاوە،جا ئەو پاداشت دەدەرێتەوەو خوای گەورە لەهەڵەکەی خۆش دەبێت.**

**دووەم: هێندە فەزڵیان هەیە دەبێتە هۆی داپۆشینی ئەو هەڵانەی لەوان دەوەشێتەوە، چونکە خوای گەورە لەوان ڕازی بووەو تەماشای ئەهلی بەدری کردووەو فەرموویەتی:** (اعملوا ما شئتم فقد غفرتُ لكم)[315]**، خوای گەورە دەفەرموێت:** (لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ) الفتح/١٨) **هەروەها دەفەرموێت:** (لَقَدْ تَابَ اللَّهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ) التوبة/١١٧) **ئەمە گشتی یە، خوای گەورە تەوبەی لێ وەرگرتوون، خوای گەورە دەفەرموێت:** (إِنَّ الَّذِينَ تَوَلَّوْا مِنْكُمْ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ إِنَّمَا اسْتَزَلَّهُمُ الشَّيْطَانُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُوا وَلَقَدْ عَفَا اللَّهُ عَنْهُمْ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ (١٥٥) ال عمران) **ئەوان خوای گەورە لێیان خۆش بووە، ئەوان هەرگیز تانەیان لێ نادرێت.**

---

٣١٥ / رواه البخاري (٢٨٤٥) ومسلم (٢٤٩٤) .

**مەبەست لە:** (فقد علم النبي (ﷺ) ما يكون منهم من الزلل بعد موته) **پێغەمبەری خوا (ﷺ) غەیب نازانێ ئیللا ئەوە نەبێ خوای گەورە ئاگاداری کردووەتەوە، جا نوسەر دەڵێت:** (قد علم) **واتە ئەوەی خوای گەورە فێری کردوەو ئاگاداری کردوەتەوە، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەڵێت:** (فانه من يعش منكم فسيرى اختلافا كثيرا، فعليكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين المهديين من بعدي)[٣١٦] **واتە: هەرکەس لەئێوە _لەپاش من_ بژێت ئەوا جیاوازی و دووبەرەکی زۆر دەبینێ، جا ئامۆژگاریتان دەکەم دەست بەسوننەتو ڕێگاکەی منەوە بگرنو دەست بە سوننەتو ڕێگای جێنشینە ڕێنموییکراوەکانی پاش من بگرن).**

**خوای گەورە ئاگادری کردوەتەوە جیاوازی و دووبەرەکی ڕوودەدات، جا ڕێنمویی و ئامۆژگاری کردوون لەکاتی جیاوازیدا چی بکەن، ئەوانیش ئاوا بوون، هاوەڵان ئەگەر لەشتێکدا جیاوازییان هەبوایە ئەوا دەگەڕانەوە بۆ قورئان و سوننەت وجیاوازییەکەیان کۆتایی پێ دەهات و دەگەڕانەوە بۆ حەق** (فلم يقل فيهم إلا خيراً) **پێغەمبەری خوا (ﷺ) ستایشی ئەوانی کردوە لەگەڵ ئەوەی زانیویەتی لەپاش خۆی ڕوودەدات و چی دەکەن.**

**مەبەست لە:** (ذروا أصحابي، لا تقولوا فيهم خيراً).

ذروا: **واتە: واز لە هاوەڵانم بێنن لەقسەکردن پێیان و لەچاکە و خەیر نەبێ هیچی تر مەڵێن، لەوە (صحیح)تر فەرموودەی:** (لاتسبوا أصحابي فوالذي نفسي بيده لو أنفق أحدكم مثل أحد ذهباً ما بلغ مدَّ أحدهم ولا نصيفه)[٣١٧] **جا کردەوەیەکی کەم لە تاکەکانی ئەوانەوە چاکترو باشترە لەکردەوەیەکی مەزن و گەورە لەوانەی پاش خۆیان دێن، لەبەر ئەوەی لەپێش هەموو کەس موسڵمان بوون.**

---

٣١٦ / سبق تخريجه .

٣١٧ / رواه البخاري (٣٤٧٠) ومسلم (٢٥٤١) .

**مەبەست لە:** (ولا تحدث بشيء من زللهم ولا حربهم).

**ئەوەی لەوانەوە ڕوویداوە مەیگێڕەوە ئیللا لەڕووی بیانوو هێنانەوە نەبێ بۆیان.**

**مەبەست لە:** (ولا تسمعه من أحد يحدث به فإنه لا يسلم لك قلبك إن سمعت).

**گوێ لەو کەسانە مەگرە قسە بەهاوەڵان دەکەن لەمەجلیسەکانیاندا، یان لەوانەکانیاندا، یان لە هەر بوارێکدا، ئامادەی ئەو مەجلیسانە مەبە، بەردەوام مەبە لە گوێگرتن لێیان، بەڵکو وازی لێ بهێنەو لێی دوور بکەوە، بۆ ئەوەی شتێك نەچێتە دڵتەوەو ببێتە هۆی ئەوەی ڕقت لەهاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بێت و بەهەلاکەتدا بچیت.**

**﴿١٣٥﴾ (وإذا سمعت الرجل يطعن على الآثار أو يرد الآثار أو يريد غير الآثار فاتهمه على الإسلام ولا تشك أنه صاحب هوى مبتدع).**

واتە: ئەگەر کەسێکت بینی تانە لەئەسەر (فەرموودە) دەدات یان ئەسەر(فەرموودە) ڕەد دەکاتەوە یان جگە لەئەسەری دەوێت ئەوا تۆمەتباری بکە لەسەر ئیسلام، گومانت نەبێ ئەوە خاوەنی ئارەزووە(مبتدع)ە.

**﴿١٣٦﴾ (واعلم أن جور السلطان لا ينقص فريضة من فرائض الله التي افترضها على لسان نبيه (ﷺ) جوره على نفسه وتطوعك وبرك معه تام إن شاء الله تعالى يعني الجماعة والجمعة والجهاد معهم وكل شيء من الطاعات فشاركهم فيه فلك نيتك).**

واتە: بزانە ستەمی سوڵتان هەرگیز فەرزێك لە فەرزەکانی خوا کەم ناکاتەوە کە لە سەر زاری پێغەمبەرەکەی (ﷺ) فەرزی کردووە، ستەم کردن لەنەفسی خۆیەتی‌و چاکەی تۆ لەگەڵ ئەوا تەواوە (إن شاء الله) واتە جومعەو جەماعەت‌و جیهادکردن لەگەڵ ئەودا، هەموو شتێك لەگوێڕایەڵییەکان بەشدارییان لەگەڵدا بکەو ئەوا بەپێی نیەتەکەت بۆت دەنوسرێت.

ڕاڤە/

لەپێشدا باسی ئەمە کرا چیتر پێویستی بەدووبارەکردنەوە نییە.

**﴿١٣٧﴾ نوسەر دەڵێت: (وإذا رأيت الرجل يدعو على السلطان فاعلم أنه صاحب هوى وإذا رأيت الرجل يدعو للسلطان بالصلاح فاعلم أنه صاحب سنة إن شاء الله، يقول فضيل بن عياض: (لو كان لي دعوة مستجابة ما جعلتها الا في السلطان).**

قيل له: (يا أبا علي، فسر لنا هذا) قال: (إذا جعلتها في نفسي لم تعدني، وإذا جعلتها في السلطان صلح، فصلح بصلاحه العباد والبلاد)

فأمرنا أن ندعو لهم بالصلاح، ولم نؤمر أن ندعو عليهم وإن جاروا وظلموا لأن ظلمهم وجورهم على أنفسهم، وصلاحهم لأنفسهم وللمسلمين)

**واتە: ئەگەر کابرایەکت بینی دوعای لەسوڵتان دەکرد بزانە ئەوە خاوەن ئارەزووە، بەڵام ئەگەر کەسێکت بینی دوعا بۆ سوڵتان دەکات بەچاکسازی ئەوا بزانە خاوەنی سوننەتە (ان شاء الله)، (فضیل ی کوڕی عیاض) وتویەتی: (ئەگەر تەنها یەك دوعای وەرگیراوم بوایە ئەوە بۆ هیچ کەسێك نەمدەکرد تەنها بۆ سوڵتان نەبێ) پێیان فەرموو: ئەی باوکی عەلی ئەمە ڕوون بکەرەوە، فەرمووی: (ئەگەر دوعاکەم بۆ خۆم کرد ئەوە لە خۆم تێناپەڕێ، بەڵام ئەگەر بۆ سوڵتانم کرد ئەوا ئەو چاك دەبێ، بەچاك بوونی ئەو بەندەکان و وڵات چاك دەبێ).**

**جا فەرمانمان پێکراوە دوعای چاکسازییان بۆ بکەین، فەرمانمان پێ نەکراوە دوعایان لێ بکەین ئەگەر ستەمیان کرد، چونکە ستەمیان لەسەر خۆیانە، چاك بوونیان بۆ خۆیانو موسڵمانانە.**

**ڕاڤە/**

**ئەم دەستەواژەیە لەسەلەفەوە هاتووە:** (وإذا رأيت الرجل يدعو على السلطان فاعلم أنه صاحب هوى) **ئەمە ڕەوشتی خەواریجەو ڕەوشتی (معتزلە)یە، چونکە خەواریجو موعتەزیلە ئەوانەن دوعا لەدەسەڵاتدارانی موسڵمانان دەکەن، پێویست**

پێچەوانەکەیەتی بەوەی دوعای چاکسازیو تەوفیقیان بۆ بکات، چونکە چاکسازی ئەوان چاکی ئیسلام و موسڵمانانی تێدایە، جا ئەگەر دوعات بۆ ئەوان کرد ئەوا دوعات بۆ موسڵمانان کردووە،چونکە چاکبوونی دەسەلاتدار چاکییە بۆ ژێر دەستەکەی، ئەمە مەنهەجی سەلەفە، ئەویش دوعاکردنە بۆ دەسەلاتداران بە چاکسازی.

**مەبەست لە:** (وإذا رأيت الرجل يدعو للسلطان بالصلاح فاعلم أنه صاحب سنة إن شاء الله).

**ئەگەر بينيت دوعايان بۆ دەكات بۆ چاكسازی ئەوە بزانە خاوەنی سوننەتە، چونكە ئەمە ڕێگای سەلەفە لەگەڵ دەسەلاتداراندا.**

**مەبەست لە:** (يقول فضيل بن عياض).

**(الفضيل ی کوڕی عیاض) یەکێکە لەگەورە زانایان و یەکێکە لەخوا پەرست و زاهیدەکان، ئەم دەستەواژەیە دەڵێت:** (لو كان لي دعوة مستجابة ما جعلتها الا في السلطان).

**ئەمە بەشێکە لەئامۆژگاری، وەکو کارکردنێك بەو فەرموودەیەی کە دەفەرموێت:** (الدين النصيحة) قلنا: لمن يا رسول الله؟ قال: (لله ولكتابه ولرسوله ولأئمة المسلمين وعامتهم)[٣١٨] **لە بەشێك لە ئامۆژگاری کردن بۆ پێشەوایانی موسڵمانان دوعاکردنە بۆیان بە چاکسازی، هەروەها لە ساختەو غەشکردن لەوان دوعاکردنە لێیان.**

**مەبەست لە:** (فأمرنا أن ندعو لهم بالصلاح، ولم نؤمر أن ندعو عليهم وإن جاروا وظلموا).

**چونکە دوعاکردن لەوان دوعاکردنە لە موسڵمانان، چونکە ئەگەر کارەکە تێکچووو سوڵتان ڕووخا ئەوا خوێن دەڕێژرێت و ئەمنو ئاسایش نامێنێو خراپەکاری بڵاو دەبێتەوەو سنورەکان لەکار دەکەوێت، جا لەڕووخانی ئەودا چەندین خراپەکاری تر**

٣١٨ / صحيح : سبق تخريجه .

هەیە، بەڵام لەم سەردەمەدا هەرکەسێ دوعا بۆ سوڵتان بکات ئەوە تۆمـەتبار دەکرێـت لە لایـەن خـاوەن ئارەزووەکانـەوە بـە (مداهنـە) لەلایـەن حزبیـەکانو شـوێنکەوتەکانی خەواریجەوە، جا ئەو قسەیەی نوسەر لەسەریان جێ بـەجێ دەبـێ کـەوا ئـەوان لەگـەڵ سوننەتدا ناکۆکن و خاوەنی ئارەزوون بۆیە پێویستە ئاگاداری ئەوە ببین.

**﴿١٣٨﴾ نوسەر دەڵێت: (ولا تذكر أحدا من أمهات المؤمنين-رضي الله عنهن- إلا بخير).**

**واتە: باسی هیچ یەکێك لەدایكانی ئیمانداران مەکە ئیللا بەخەیرو چاکە نەبێ.**

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (ولا تذكر أحدا من أمهات المؤمنين إلا بخير).

دایکانی ئیمانداران: بریتین لەخێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، خوای گەورە ناوی لێ ناون دایکانی ئیمانداران لەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: (النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَاتُهُمْ) الاحزاب/٦) مەبەستی ئەوان دایکی ئیمانداران لەڕێزو حورمەتدا، حەرام بوونی خوازبێنیان لەپاش مردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، دایکی ئەوان نین لە نەسەبدا، بەڵکو لەڕێزو حورمەتدا،حەقی دایکێتیان هەیە لەسەر ئیمانداران چونکە ئەوانە خێزانی پێغەمبەری خوان (ﷺ)، بۆیە خۆشویستن و ڕێز لێ گرتنیان پێویستەو بەکەم نەزانینی یەکێ لەوانە، چونکە بەکەم زانینیان مەزهەبی (رافضە)کانە کە هەندێ لەخێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بەکەم دەزانن، ئەمەش تۆمەتبار کردنی خوای گەورەیە کەوا ئەو بۆ پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کەسانێکی هەڵبژاردووە بۆ ئەو ناگونجێن، تۆمەتبارکردنی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) کەوا ئەو دایکانێکی هەڵبژاردووە بۆ ئیمانداران شایستەی ئەوە نین، ئەمەش کوفرە بەخوای گەورە.

**﴿١٣٩﴾ نوسەر دەڵێت: (وإذا رأيت الرجل يتعاهد الفرائض في جماعة مع السلطان وغيره فاعلم أنه صاحب سنة إن شاء الله تعالى وإذا رأيت الرجل يتهاون بالفرائض في جماعة وإن كان مع السلطان فاعلم أنه صاحب هوى).**

**واتە: ئەگەر کەسێکت بینی بەردەوامە لەسەر فەرزەکان بەجەماعەت لەگەڵ سوڵتانو جگە لەو، بزانە ئەوە خاوەنی سوننەتە** (ان شاء الله تعالى)**، ئەگەر کەسێکت بینی کەم تەرخەمە لەجێ بەجێ کردنی فەرزەکان بەجەماعەت هەرچەندە لەگەڵ سوڵتانیش بێت بزانە ئەوە خاوەنی ئارەزووە.**

**ڕاڤە:**

**مەبەست لە:** (وإذا رأيت الرجل يتعاهد الفرائض في جماعة مع السلطان وغيره فاعلم أنه صاحب سنة إن شاء الله تعالى).

**واتە ئەگەر کەسێکت بینی پارێزگاری لەنوێژی جەماعەت دەکات لەگەڵ سوڵتان و لەگەڵ جگە لەودا، ئەمە بەڵگەیە ئەوە کەسێکی ئەهلی سوننەیەو ئەهلی ئیمانە، خوای گەورە دەفەرموێت:** (إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللَّهِ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ (١٨) التوبة/١٨) **پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی ئەو کەسەی کردووە دڵی پەیوەستە بە مزگەوتەکانەوە کەوا یەکێکە لەو حەوت کەسەی خوای گەورە دەیانخاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆیەوە، دەفەرموێت:** (ورجل قلبه معلق بالمساجد)[319] **جا هاتوچۆکردنی مزگەوتەکان بەمەبەستی جێ بەجێ کردنی نوێژی جەماعەت نیشانەی ئیمانەو نیشانەی ئەهلی سوننەیە، ئەو کەسەی واز لە نوێژکردن دەهێنێ لەگەڵ موسڵمانانداو وادەزانێ موسڵمانان لەسەر حەق نینو دروست نییە نوێژیان لەگەڵدا**

٣١٩ / رواه البخاري (٦٢٩) ومسلم (١٠٣١) .

بکرێت بێ گومان ئەم کەسە لە کۆمەڵی موسڵمانان جیابووەتەوە دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی‌و (ﷺ) موسڵمانان دەکات، بۆیە دەبینی ئەوانەی خاوەنی بیرۆکەی لارن نزیکی مزگەوتەکان ناکەونەوەو لەگەڵ موسڵماناندا نوێژ ناکەن،بەڵکو هەندێکیان حوکم بە پووچەڵکردنەوەی نوێژی موسڵمانان دەدەن، ئەمەش نیشانەی خراپەکاری‌و نیشانەی لادان‌و خراپی عەقیدەو دژایەتییەتی، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَنْ يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَى وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّى وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ وَسَاءَتْ مَصِيرًا (١١٥) النساء) جا پێویستە لەسەر موسڵمان لەگەڵ موسڵماناندا بێت، خوای گەورە دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ (١١٩) التوبة) موسڵمانان لەگەڵ موسڵماناندا دەبێ، خۆی جیا ناکاتەوەو خۆی تاك ناکاتەوە، لە گەڵ جەماعەتدا دەبێ، لادان و لە موسڵمانان خۆدوورە پەرێز گرتن، ئەمەش نیشانەی خراپەو ئارەزوو و خراپی بیرۆکەو لادانە.

مەبەست لە: (وإذا رأيت الرجل يتهاون بالفرائض في جماعة وإن كان مع السلطان فاعلم أنه صاحب هوى).

ئەگەر کابرایەکت بینی وازی لەنوێژی جەماعەت هێنا:-

ئەگەر لەگەڵ سوڵتاندا وازی لەنوێژ هێنا ئەوە خاوەن ئارەزووەو ئەویش یەکێکە لەموعتەزیلە یان لەخەواریج کە دەسەڵاتدارانی موسڵمانان بەکافر دەزانن بەسەرپێچی.

ئەگەر وازی لەجەماعەت هێنا لەگەڵ جگە لەسوڵتان ئەوە دوورپووە، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (أثقل الصلوات على المنافقين: صلاة العشاء وصلاة الفجر)[٣٢٠] جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دواکەوتن لەنوێژی جەماعەت بە دوورپوویی ژماردووە، تەنانەت (عبدالله ی کوڕی مسعود) دەڵێ: (ولقد رأيتنا وما يتخلف عنها إلا

٣٢٠ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٦٢٩) ومسلم (١٠٣١) .

منافق معلوم النفاق) جـا ئـەو كەسـەی لـە نوێـژی جەماعـەت دوا دەكـەوێ بـەبێ هـیچ بیانوویـەك، ئـەوە بەڵگەیـە لەسـەر دووڕوویی،چـونكە دووڕووەكـان لەنوێـژەكان دوا دەكەون بەتایبەتی لەشەواندا، چونكە شەوان هیچ كەسێك ئەوان نابینێ، بـەڵام بـە ڕۆژ ئەوا ئامادە دەبن چونكە خەڵكی دەیانبینێ، ئەوانیش ڕیایی دەكەن بەكردەوەكانیان و دوڕوویی دەكەن.

**﴿١٤٠﴾ نوسەر دەڵێت: (والحلال ما شهدت عليه وحلفت عليه أنه حلال وكذلك الحرام ما حاك في صدرك فهو شبهة).**

**واتە: حەڵاڵ ئەوەیە شایەتی لەسەر بدەیت و سوێندی لەسەر بخۆی حەڵاڵە، هەروەها حەرامیش، بەڵام ئەوەی گومانت لەسەری هەبێت ئەوە (شوبهە)یە.**

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (والحلال ما شهدت عليه وحلفت عليه أنه حلال).

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی:** (إن الحلال بيّن وإن الحرام بيّن، وبين ذلك أمور مشتبهات)[٣٢١] **لێرەدا حەڵاڵ هەیەو گومانی تێدا نییەو حەرام هەیەو گومانی تێدا نییە، بەشی سێ یەمیش هەیە گومانە، نازانرێ ئایا ئەوە حەڵاڵە یان حەرامە؟ ئەمەش کەس نایناسێت تەنها زاناکان نەبێ، زۆربەی خەڵکی نازانێ، ئەمەش حەقی خۆیەتی لێی بکۆڵێتەوە تاکو بزانی لەکام بەشە ئەوە، ئەگەر حەڵاڵ بوو ئەوە دەیبەیت و ئەگەر حەرام بوو ئەوە لێی دوور دەکەویتەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی:** (الإثم ما حاك في القلب وكرهت أن يطلع عليه الناس)[٣٢٢] **هەست دەکەیت دڵت لەسەری ئارام نییە، نەبوونی دڵنیایی لەناختدا بەڵگەیە ئەوە گومانی تێدایە، بۆیە پێویستە لە سەرت وازی لێ بهێنی،** (والحلال ما شهدت عليه وحلفت عليه أنه حلال) **واتە: لێی دڵنیا بیت، هیچ گومانت لێی نەبێ، تەنانەت بگاتە ئەو ڕادەیەی ئامادەی سوێندی لەسەر بخۆی حەڵاڵە، چونکە ئەوە ڕوونە، هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:** (الحلال بيّن).

**مەبەست لە:** (وكذلك الحرام).

**هەروەها حەرامیش دیار و ئاشکرایە دەقێك هەیە بۆ حەرام بوونی وەکو مرداربووەوەو مەی و گۆشتی بەراز، ئەمە حەرامەو دیارە، چونکە خوای گەورە حەرامی کردووە.**

---

٣٢١ / سبق تخريجه .

٣٢٢ / حسن : أخرجه أحمد (٤/٢٢٨) وحسنه الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب) (١٧٣٤) .

**﴿١٤١﴾ نوسەر دەڵێت: (والمستور من بان ستره والمهتوك من بان هتكه)**

**واتـــە: کەســـی ئـــابرودار (عـــەیب داپۆشـــراو) ئـــەو کەســـەیە کـــە داپۆشـــینەکەی ئاشکرایە(هەڵەکانی داپۆشراوە)، وە کەسی بـیٚ ئـابروو ئـەو کەسـەیە کـە ریسوایەکەی ئاشکرایە.**

**ئەصڵ لەموسڵماندا عەدالەتو خەیرو چاکەیە بۆیە گومانی خراپـی پـیٚ مەبـە، بۆیـە خـوای گـەورە دەفـەرموێت:** (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ) الحجرات/١٢) **پێغەمبـــەری خـــوا (ﷺ) فەرموویـــەتی:** (إياكم والظن فإن الظن أكذب الحديث)[٣٢٣] **بۆیە هیچ گومانیٚ بەموسڵمان مەبە تەنها خەیر نەبیٚ ئەگەر خیلافی ئـەوەی لیٚ دەرنەکـەوت، جـا ئەگـەر هەڵەیـەکت لیٚ بینـی ئـەوە لەسـەرتە بیـشاریتەوە** (من ستر مسلماً ستره الله في الدنيا والآخرة)[٣٢٤] **بـەڵام لەگـەڵ ئامۆژگاریـدا، هەڵـەکانی بـشارەوەو ئـابڕووی مەبـە، خـوای گـەورە دەفـەرموێت:** (إِنَّ الَّذِينَ يُحِبُّونَ أَنْ تَشِيعَ الْفَاحِشَةُ فِي الَّذِينَ آمَنُوا لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ (١٩)النور).

---

٣٢٣ / سبق تخريجه .

٣٢٤ / صحيح : سبق تخريجه .

**﴿١٤٢﴾ نوسەر دەڵێت: (وإذا سمعت الرجل يقول: فلان ناصبي، فاعلم أنه رافضي وإذا سمعت الرجل يقول: فلان مشبه أو فلان يتكلم بالتشبيه، فاعلم أنه جهمي، وإذا سمعت الرجل يقول: تكلم بالتوحيد واشرح لي التوحيد فاعلم أنه خارجي معتزلي، أو يقول فلان مجبر أو يتكلم بالإجبار أو تكلم بالعدل فاعلم أنه قدري، لأن هذه الأسماء محدثة أحدثها أهل البدع).**

واتە: ئەگەر گوێت لەکابرایەك بوو وتی: فلأن کەس (ناصبی)یە، بزانە ئەوە کەسێکی (رافضی)یە، ئەگەر گوێت لێ بوو کەسێك وتی: فلأن کەس (مشبهه)یە یان فلأن کەس قسە دەربارەی (تەشبیه) دەکات بزانە ئەوە جەهەمی یە، ئەگەر گوێت لێ بوو کەسێك وتی:دەربارەی یەکتاپەرستی قسەبکەو یەکتاپەرستیم بۆ ڕاڤە بکە بزانە ئەوە کەسێکی (خارجی معتزلی)یە یان وتی: فلأن کەس (مجبر)ـە یان قسە دەربارەی (الاجبار) دەکات یان قسە دەربارەی (العدل) دەکات بزانە ئەوە کەسێکی قەدەرییە چونکە ئەم ناوانە داهێنراون ئەهلی بیدعە دایانهێناوە.

ڕاڤە/

مەبەست لە: (وإذا سمعت الرجل يقول: فلان ناصبي).

(نواصب) ئەو کەسانەن ڕقیان لەئەهلی بەیتە، (روافض)یش ئەهلی سوننە تۆمەتبار دەکەن بەوەی ڕقیان لەئەهلی بەیتە، هەر کەسێ ڕقی لەئەهلی بەیت بێت ئەوە (ناصبی)یە.

مەبەست لە: (فاعلم أنه رافضي).

چونکە ئەمە مەزهەبی (روافض)ـە تەنانەت هاوەڵانیشیان بە (نواصب) ژماردووە چونکە هاوەڵان _بەباوەڕی ئەوان_ ڕقیان لەئەهلی بەیتەو خیلافەتیان لێ زەوت کردوون، ئابەو شێوەیە دەڵێن، جا ئەو کەسەی دەڵێت:_ هاوەڵان (نواصب)ن یان

ئەهلی سوننە (نواصب)ن ئەمە بەڵگەیە ئەو کەسە (رافضي)یە، ئەهلی سوننە ڕقیان لەئەهلی بەیت نییە،بەڵكو ئەوانیان خۆش دەوێت و ڕێزیان لێ دەگرنو ئامۆژگارییەکەی پێغەمبەر (ﷺ) لەواندا دەپارێزن، بەڵام زیادەڕەوییان تێدا ناکەن وەکو زیادەڕەوی (روافض)و نایانکەنە پەروەردگار لەجگە لەخوا، یان باوەڕیان وابێ ئەوان (معصوم)ن، هەروەکو شیعەکان باوەڕیان وایە پێشەواکانیان (معصوم)نو پێیان دەڵێن: (الائمة المعصومین) ئەهلی سوننە باوەڕیان بە (معصومیەتی) ئەوان نییەو زیادەڕەوییان تێدا ناکەن، بەڵکو لەپلەو پایەی خۆیاندا دایان دەنێن، ئەوانیان خۆش دەوێت لەبەر نزیکیان لەپێغەمبەری خوداوەو (ﷺ) ئەوانیان خۆش دەوێت لەبەر ئیمانەکەیان، جا ئەهلی سوننە ئەوانیان خۆش دەوێت لەبەر دوو مەبەست: ئیمان و نزیکیان لە پێغەمبەرەوە (ﷺ)، بەڵام ئەگەر نزیکییان هەبوو بەڵام ئیمانیان نەبوو ئەوا هیچ خۆشەویستیەکیان نییە، (ابو لهب) مامی پێغەمبەری خوایەو (ﷺ) لەئاگردایە، چونکە تەنها نزیکی لەپێغەمبەری خوداوە (ﷺ) بەس نییە ئیللا دەبێ ئیمانی لەگەڵدا بێت.

مەبەست لە: (وإذا سمعت الرجل يقول: فلان مشبه أو فلان يتكلم بالتشبيه، فاعلم أنه جهمي).

چونکە (جەهەمییەکان)و (موعتەزیلەکان)و (ئەشعەرییەکان)و (ماتریدیەکان) باوەڕیان وایە سەلماندنی سیفەتەکان (تەشبیهە)، بۆیە ئەوان ئەهلی سوننە -کە ناوو سیفەتەکانی خوا دەسەلمێنن- ناویان لێ دەنێن بە(المشبهە) چونکە سیفەتەکان دەسەلمێنن، یان ناویان لێ دەنێن بە (المجسمة) چونکە سەلماندنی سیفەتەکان لای ئەوان مانای سەلماندنی جەستەیە بۆ خوا، جەستەکانیش لەیەك دەچن،ئەمە قسەی ئەوانە، ئەگەر هەر کەسێکت بینی دەڵێت:_ فلان کەس (مشبهە)یە، فلان کەس (مجسمة)یە، بزانە ئەوە (جەهەمییە) یان (موعتەزیلەیە) یان قوتابی ژێر دەستی ئەوانە

لە گرووپەکانی تر، چونکە باوەڕیان وایە سەلماندنی سیفەتەکان بۆ خوا تەشبیهەو تەجسیمە.

**مەبەست لە:** (وإذا سمعت الرجل يقول: تكلم بالتوحيد واشرح لي التوحيد فاعلم أنه خارجي معتزلي).

چونکە (تەوحید) یەکێکە لەبنەماکانی (موعتەزیلە) تەوحیدیش لای ئەوان بریتی یە لەنەفی کردنی سیفەتەکان، لای ئەوان سەلماندنی سیفەتەکان شیرکە، نەفی کردنی سیفەتەکان تەوحیدە، گومانی ئەوە مەبە مەبەستی لە (تەوحید) ئەوەیە کە بەتاکدانانی خودایە لەپەرستندا، بەڵکو مەبەست لای ئەوان نەفی سیفاتە، چونکە سەلماندن لای ئەوان مانای شیرك دەگەیەنێ، بۆیە دەڵێن:– قورئان شیرکی لەگەڵ خۆیدا هێناوە، چونکە قورئان ناوو سیفەتەکان دەسەلمێنێ، ئەمە مەبەستی شەیخە، مەبەستی ئەو تەوحیدەیە لەسەر مەزهەبی موعتەزیلەیە، بەڵام ئەو تەوحیدەی لە سەر مەزهەبی ئەهلی سوننەو جەماعەیە کە ئەویش بەتاکدانانی خوایە لەپەرستندا، ئەگەر داوای ڕوونکردنەوەی ئەوەی کرد_کە ئەویش بەتاکدانانی خوایە لەپەرستندا و نەفی کردنی شیرکە– ئەمە ئاساییە، بەڵکو ئەوە داوایەکی چاك و پڕ خەیرە.

**مەبەست لە:** (أو يقول: فلان مجبر أو يتكلم بالإجبار أو يتكلم بالعدل فاعلم أنه قدري).

هەروەها لەبنەماکانی موعتەزیلە بریتییە لە (العدل) ئەویش نەفی (قەدەرە) چونکە ئەوان دەڵێن: ئەگەر قەدەرمان سەلماند ئەوە خوای گەورەمان بەستەمکار وەصف کردووە، چونکە خوای گەورە سزایان دەدات لەسەر شتێك خۆی تەقدیری کردووە لەسەریان، ئێمەش بەوان دەڵێین:– خوای گەورە سزایان نادات بەقەدەر بەڵکو سزایان دەدات لەسەر کاری خۆیان، لەسەر کوفرو شیرکی خۆیان، سزایان نادات لەبەر ئەوەی تەقدیری کردووە، بەڵکو سزایان دەدات لەبەر کردەوەو شیرك و سەرپێچی ئەوان، جا سزا لەسەر کردەوەکانە نەك لەسەر قەدەر، جا خوای گەورە پاداشتی هیچ کەسێك

ناداتەوە لەسەر ئەوەی تەقدیری کردووە ببێتە ئیماندار، تاکو بە فعلی ئیمان نەهێنێ و کار بە ئیمانەکەی نەکات، سزای هیچ کەسێك نادات تەنها لەبەر ئەوەی تەقدیری کردووە سەرپێچی ئەنجام بدات تاکو سەرپێچی ئەنجام نەدات و هۆکاری سزاکە ئەنجام نەدات، جا پاداشتو سزا پەیوەستن بە کردەوەی بەندەکانەوەو هەرگیز پەیوەست نین بەقەدەرەوە، جا ئەگەر کەسێکت بینی دەڵێت:- فلان کەس جەبرییە، بزانە ئەو کەسە موعتەزیلەیە، چونکە موعتەزیلەکان دەڵێن:- مرۆڤ ئازادە خۆی فعلی خۆی دروست دەکات، هیچ شتێك تەقدیری بۆ نەکراوە، دەڵێن : ئەو کەسەی خۆی کارەکەی ئەنجام داوە بەبێ ئەوەی خوای گەورە تەقدیری لەسەر کردبێ‌و وەصفی ئەو کەسانە دەکەن کە دەڵێن: فعلی بەندەکان بە تەقدیری خوایە_ وەصفیان دەکەن بە (جەبری).

مەبەست لە: (لأن هذه الأسماء محدثة أحدثها أهل البدع).

ئەهلی بیدعە دایانهێناوە لە شیعەو موعتەزیلەو جەهەمییەکان، بەڵام ئەهلی سوننە نەچوونەتە ناو ئەم باسانەوە ئیللا بە پێی قورئانو سوننە نەبێ، بۆیە ناوو سیفاتەکانی خوایان سەلماندووە، قەدەریان سەلماندووەو باوەڕیان پێ هێناوە، نەیانگوتووە: (اجبار) پێویست دەکات لەسەری، یان ستەم پێویست دەکات لە سەری، هەروەها نەیان گوتوە:_ سەلماندنی سیفەتەکان شیرك و لەیەکچواندنە، هیچ کەسێك ئەمەی نەگوتووە تەنها ئەهلی بیدعە نەبێ.

**﴿١٤٣﴾ نوسەر دەڵێت: (قال عبد الله بن المبارك: (لا تأخذوا عن أهل الكوفة في الرفض شيئا، ولا عن أهل الشام في السيف شيئا، ولا عن أهل البصرة في القدر شيئا، ولا عن أهل خراسان في الإرجاء شيئا، ولا عن أهل مكة في الصرف شيئا، ولا عن أهل المدينة في الغناء، ولا تأخذوا عنهم في هذه الأشياء شيئا).**

**واتە: (عبداالله ی کوڕی المبارك) فەرموویەتی: لە ئەهلی کوفەوە دەربارەی (الرفض) هیچ شتێك وەرمەگرنو لە ئەهلی شامەوە دەربارەی شمشێر (السیف) هیچ شتێك وەرمەگرن، لە ئەهلی بەصرەوە دەربارەی قەدەر هیچ شتێك وەرمەگرن و لە ئەهلی خۆراسانەوە هیچ شتێك دەربارەی (ئیرجاء) وەرمەگرن، لەئەهلی مەککەوە دەربارەی (الصرف) هیچ شتێك وەرمەگرن، لە ئەهلی مەدینەوە دەربارەی (الغناء) هیچ شتێك وەرمەگرن، لەوانەوە دەربارەی ئەو شتانە هیچ وەرمەگرن.**

**ڕاڤە/**

**ئەو قسەیەی (عبدالله ی کوڕی المبارك)ـە دەڵێت:** (لا تأخذوا عن أهل الكوفة في الرفض شيئا).

**چونکە زۆربەی شیعە لە کوفە پەروەردە بوون، بۆیە لە ئەوانەوە مەزهەبەکەیان وەرمەگرن، لەتانەدانی هاوەڵان و زیادەڕەوییان لە ئەهلی بەیتدا.**

**ئەمجار فەرمووی:** (ولا عن أهل الشام في السيف شيئا).

**ڕواڵەتی قسەکەی نوسەر وا دەردەخات زۆربەی خەواریج ئەهلی شامن، جا ئەو قسەیەی:** (في السيف) **واتە: دەرچوون لەدژی کار بەدەستانو کوشتنی موسڵمانان،**

بەڵام ئەم قسەیە تێڕامانێکی تێدایە، چونکە خەواریج لەعێراق بوون و لەشام نەبوون، یان مەبەستی جەنگەکەیان لەگەڵ عەلیدا بوو.

ئەمجار فەرمووی: (ولا عن أهل البصرة في القدر شيئا).

چونکە (ئیعتزال) لە بەصرەوە پەیدا بوو، هەروەها (تەصەوف)ش لەئەهلی بەصرەوە پەیدا بوو.

ئەمجار فەرمووی: (ولا عن أهل خراسان في الإرجاء شيئا).

چونکە ئیرجاء لە ناوچەی خوراسانەوە پەیدا بوو کە ئەویش یەکێکە لەناوچەکانی ولاتی فارس، ئەویش ولاتێکی فراوان بوو، ولاتێك بوو چەندین زانای تێدا بوو، ولاتێك بوو خەیرو بەرەکەتی زۆری تێدابوو، چەند ڕەوشت و ئاکاری جوانی تێدا بوو، بەڵام مەزهەبی ئیرجائی تێدا ڕووا، ئیرجائیش بریتییە لە: دەرکردنی عەمەل لە حەقیقەتی ئیمان، دەڵێن: ئیمان عەمەلی تێدا نییە، مرۆڤ ئیماندارە هەرچەندە هیچ کارێك نەکات چونکە ئەو بەدڵی باوەڕی هەیە، هەندێکیان دەڵێن: بەدڵ باوەڕی پێی هەیەو بە زمانی دەیڵێ، هەندێکیان دەڵێن: تەنانەت با بەدڵ باوەڕی پێی نەبێ لەبەر ئەوەی ئەو دەزانێ تەنها زانین دەیکاتە کەسێکی ئیماندار، جا (عەمەل) بەشێك نییە لە ئیمان لای هەموو گرووپەکانی مورجیئە، مرۆڤ ئیماندارە لای ئەوان هەرچەندە هیچ عەمەلێکی نەبێ، ئەمە مەزهەبی مورجیئەیە، ئەمەش مەزهەبێکی پووچەڵە، چونکە ئیمان بریتییە لە: وتن بە زمانو باوەڕ بە دڵو کارکردن بەجەواریح، ئیمان دروست نابێ ئیللا بەو سێ شتە نەبێ، چونکە هەرکەسێ بەدڵ باوەڕی بوو بەزمانی نەیگووت ئەوە کاری کافرانە، چونکە ڕاستی پێغەمبەریان دەزانی، جولەکەو گاورەکان ڕاستێتی پێغەمبەریان دەزانی، تەنها بەزانینیان یان بە باوەڕی دڵیان بەبێ ئەوەی بەزمانیان بیڵێن نەبوونە ئیماندار، هەندێکیان دەڵێن: وتن بەزمان بەسە هەرچەندە باوەڕی نەبێ، بەم قسەش

واپێویست دەكات دووڕووەكان ئیماندار بن، خوای گەورە نەفی ئیمانی لـەوان كـردووە، خوای گەورە دەفەرموێت: (يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِمْ مَا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ) الفتح/١١).

مەبەست لە: (ولا عن أهل مكة في الصرف شيئا).

الصرف: بریتیە لەفرۆشتنی نەقد بە نەقد، چونكە ئەوان لەوەدا نەرم و نیانن.

مەبەست لە: (ولا عن أهل المدينة في الغناء).

چونكە هەندێك لەوان گـۆرانی بەحـەڵاڵ دەزانـن، هـیچ تـاوانێكی لەگۆرانیـدا نـابینن، بۆیە لەوەدا شتیان لێ وەرناگیرێ.

﴿١٤٤﴾ نوسەر دەڵێت: (وإذا رأيت الرجل يحب أبا هريرة وأنس ابن مالك وأسيد بن الحضير فاعلم أنه صاحب سنة إن شاء الله وإذا رأيت الرجل يحب أيوب وابن عون ويونس بن عبيد وعبد الله بن ادريس الأودي والشعبي ومالك بن مغول ويزيد بن زريع ومعاذ بن معاذ ووهب بن جرير وحماد بن زيد وحماد بن سلمة ومالك بن أنس والأوزاعي وزائدة بن قدامة فاعلم أنه صاحب سنة وإذا رأيت الرجل يحب أحمد بن حنبل والحجاج بن المنهال وأحمد بن نصر وذكرهم بخير وقال بقولهم فاعلم أنه صاحب سنة).

واتە: ئەگەر کەسێکت بینی (ابو هريره) و(أنس ابن مالك) و(أسيد بن الحضير)ی خۆشدەوێ بزانە ئەوە لەسەر سوننەتە ان شاء الله، ئەگەر کەسێکت بینی (ايوب) و(ابن عون) و(يونس بن عبيد) و(عبد الله بن ادريس الأودي) و(الشعبی) و(مالك بن مغول)و (يزيد بن زريع)و (معاذ بن معاذ)و (وهب بن جرير)و (حماد بن زيد)و (حماد بن سلمه)و (مالك بن أنس) و(الأوزاعي) و(زائده بن قدامە)ی خۆشدەوێت بزانە ئەوە لەسەر سوننەتە، ئەگەر کەسێکت بینی (احمد بن حنبل) و(الحجاج بن المنهال) و(أحمد بن نصر)ی خۆش دەوێو باسیان دەکات بەچاکەو قسەکانی ئەوانی دەگوت بزانە ئەوە لەسەر سوننەتە.

ڕاڤە/

مەبەست لە: (وإذا رأيت الرجل يحب أبا هريرة...)

خۆشویستنی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەگشتی (واجب)ە، هەروەکو لەپێشدا باسکرا، ئەویش بەشێکە لە ئیمان، بەڵام هەندێ لە هاوەڵان هەن ئارەزوو پەرستان تانەیان لێ داون وەکو:-ئەبو هورەیرە کە ڕاوی فەرموودەکانە، چەندین

فـەرموودەی ڕیوایـەت کـردووە لـە پێغەمبـەری خـوداوە (ﷺ) ئـەوانیش پاراسـتنی سوننەتیان پیٚ ناخۆشە بۆیە ڕقیان لە (ئەبو هورەیرە)یە لەبەر بایەخدانی بە ڕیوایـەت کردنـی فـەرموودە، بـۆ ئـەم ئوممەتـە زۆرێـك لەفـەرموودەکانی پێغەمبـەری (ﷺ) پاراستووە، لەبەر ئەو هۆیە ڕقیان لێی دەبێتەوە.

(ئەنـەس ی کـوڕی مالیـك) خزمـەتکاری پێغەمبـەری خـوا (ﷺ)، (اسـیدی کـوری الحضیر) الانصاری، جا ئەوان ڕقیان لەوانەیـە، چـونکە پێیـان ناخۆشـە ئەوانـە هەنـدیٚ شت لەوانەی تایبەتمەندبوون بەچەند فەزڵێك هاوەڵانی تر ئەو فەزڵەیان نییە.

**مەبەست لە:** (وإذا رأيت الرجل يحب أيوب وابن عون ويونس بن عبيد وعبد الله بن ادريس الأودي والشعبي ومالك بن مغول ويزيد بن زريع ومعاذ بن معاذ ووهب بن جرير وحماد بن زيد وحماد بن سلمة ومالك بن أنس والأوزاعي وزائدة بن قدامة فاعلم أنه صاحب سنة).

چونکە ئەوانە سوننەتیان ڕیوایـەت کـردووەو لـە (حُفـاظ) ی فـەرموودەن و زانایـانی (الجرح والتعديل)ن جا ئەو کەسـەی ڕقـی لـەوان بێـت ئـەوا ڕقـی لـەکارە چاکەکانیانە، ئـەویش پاراسـتن و بایەخدانـە بەسـوننەت، بەسـەنەدەکانو ڕیوایـەت کـردن و ڕەد کردنەوەی فەرموودە هەڵبەستراوەکان، جا ئەوان ڕقیان لێیان نییە تەنها لەبەر ئـەوەی ئـەو کـارە پـیرۆزە دەکـەن، ئـەو کـارەی کـە بـە هۆیـەوە خـوای گـەورە سـوننەتەکەی پێغەمبەری (ﷺ) پاراست.

**مەبەست لـە:** (وإذا رأيت الرجل يحب أحمد بن حنبل والحجاج بن المنهال وأحمد بن نصر وذكرهم بخير وقال بقولهم فاعلم أنه صاحب سنة).

ئەوانە ئەو پێشەوایانەن تاقیکرانەوە لەسەر وتنی ئەوەی بڵێن: (قورئان مەخلوقـە) ئەوانیش ڕازی نەبوون ئـەو قـسەیە بڵـێن لەسـەردەمی (المـأمون والمعتـصم والواثـق)دا تاقیکرانــەوە بــەهۆی موعتەزیلــەوە، چــونکە موعتەزیلــەکان لــەدەوری خەلیفــەکان

کۆبوونــەوەو بوونــە دارو دەســتەی ئــەوان، بوونــە ڕاوێــژکاری ئــەوان و کاریگــەرییان لەسەریان هەبوو مەزهەبی ئیعتزالیان هاویشتە نێویانەوەو فەتوایان بـۆ دان بـۆ ئـەوەی زۆر لەخەڵکی بکەن بەوتنی ئەو قسەیە ئـەویش (قورئـان مەخلوقـە) بۆیـە بـەهۆی ئـەو کێشەیەوە فیتنەیەکی گەورە بەرپا بوو.

بەرامبــەر ئــەو کێــشەیە ئیمــامی ئەحمــەد ڕاوەســتا، ڕاوەســتانێکی پیاوانــە وەکــو چیایەکی سەرکەش، نەیانتوانی هیچ کاری لێ بکـەن، بـەڵکو بەرگـەی گـرت و ڕاوەسـتاو ئارامی گرت لەسەر ئازارو ئیهانەو بەندیخانە، تاکو خوای گەورە لەسەر دەستی ئەو ئەم دینەی سەرخستو بەهۆی ئەوەوە ئەو زەندیقانەی لەناو برد، هەندێ لـەزانایان کـوژران وەکو (احمد بن نصر)و (ابن نوح) و جگە لـەوان، چـەندین کـەس کـوژران ڕازی نـەبوون بڵێن قورئان مەخلوقە بۆیە کوژران، ئیمامی ئەحمەد سزادراو موعتەزیلە داوای کوشتنی ئەویان کرد، بەڵام خـوای گـەورە لەکوشـتن ڕزگـاری کـرد، دەسـتی خەلیفـەی پاراسـت لەکوشتنی ئەودا، بەڵام ئازارو سزایاندا ئەویش ئارامی گرت تـاکو خـوای گـەورە سـەری خست بە (المتوکل ی کوری المعتصم) جـا خـوای گـەورە بەهۆیـەوە میحنـەتی لەسـەر ئیمامی ئەحمـەد هـەڵگرت و ڕێـزی لێ گـرت و سـەربەرزی کـردو سـوننەتی دەرخـست و ئاشکرا کرد.

ئەمەش سوننەتی خوایە لە پاش تەنگانە خۆشی دێـت: (فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا (٥) إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا (٦) الشرح).

**﴿١٤٥﴾ نوسەر دەڵێت: (وإذا رأيت الرجل يجلس مع أهل الأهواء فاحذره وعرّفه فإن جلس معه بعدما علم فاتقه فإنه صاحب هوى).**

واتە: ئەگەر کەسێکت بینی لەگەڵ ئارەزوو پەرستاندا دادەنیشێ ئەوە ئاگاداری بکەرەوەو پێی بناسێنە، جا ئەگەر لەگەڵیدا دانیشت لەپاش ئەوەی زانی ئەوا خۆتی لێ بپارێزە، چونکە ئەوە خاوەنی ئارەزووە.

ڕاڤە/

مەبەست لە: (اهل الاهواء).

ئەو کەسانەن شوێنی حەزو ئارەزووەکانیان دەکەون و شوێنی قورئان و سوننەت ناکەون، بەڵکو شوێنی ئەوە دەکەون کە نەفسەکەیان حەزی لێیەتی، جا ئەگەر قورئانو سوننەت جیاواز بوو لەگەڵ ئارەزووەکانیاندا ئەوا واز لەقورئان و سوننەت دەهێنن، ئەوەی لەگەڵ ئارەزووەکانیاندا دەگونجا ئەوا وەری دەگرن نەك لەبەر ئەوەی باوەڕیان پێی هەیە، بەڵکو لەبەر ئەوەی لەگەڵ ئارەزووەکانیاندا دەگونجێو ئەمەش ڕێگای جولەکەیە، چونکە جولەکە گوێڕایەڵی پێغەمبەران دەبوون لەوەی لەگەڵ ئارەزوویاندا بگونجێ و ئەوەی لە گەڵ ئارەزووەکانیاندا نەگونجێ ئەوا لەگەڵ پێغەمبەراندا جیاواز دەبن، یان دەیانکوژن، یان بەدرۆیان دەخەنەوە هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: (كُلَّمَا جَاءَهُمْ رَسُولٌ بِمَا لَا تَهْوَى أَنْفُسُهُمْ فَرِيقًا كَذَّبُوا وَفَرِيقًا يَقْتُلُونَ (٧٠) المائدة).

دەربارەی دووڕووەکانی ئەم ئوممەتە فەرموویەتی: (وَإِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِنْهُمْ مُعْرِضُونَ (٤٨) وَإِنْ يَكُنْ لَهُمُ الْحَقُّ يَأْتُوا إِلَيْهِ مُذْعِنِينَ(٤٩) النور) واتە: کاتێکیش بانگ بکرێن بۆ لای بڕیارەکانی خواو پەیامبەرەکەی، تا لەنێوانیاندا داوەری بکەن کەچی دەستەیەکیان کت و پڕ ڕوو وەر ئەگێڕن و ئامادە نابن (٤٨) ئەگەر سوور

بزانن، ئەو سوود و قازانجە بۆ ئەوان دەبێ و بەوان دەدرێ بەپەلە دێنە لای و ملکەچی ئەبن و رازی دەبن بەبڕیاری پەیامبەر).

ئەمە ڕێگای ئارەزوو پەرستانە لەکۆن و تازەدا جا پێوەر بۆ حەق لای ئەوان ئەوەیە لە گەڵ ئارەزووەکانیاندا بگونجێ، ئەوەی لە گەڵ ئارەزوویاندا نەگونجێ ئەوا پووچەڵە، ئەمە ڕێگای ئەوانە، ئەم ڕێگایە هەر ئەو ڕێگایەیە گرووپە گومڕاکانی ئەم ئوممەتەی لەسەرە، چونکە ئەوان ئەوەی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتووە وەری ناگرن، بەڵکو ئەوەی لەقورئاندا هەیە وەری ناگرن، ئەوەی لەسوننەتدا هاتووە وەری ناگرن ئەگەر لەگەڵ گرووپ و ئارەزووەکانیاندا ناکۆك بێت، جا یاخود تەئویلی دەکەن، یان تەحریفی دەکەن، یان بەدرۆی دەخەنەوە، ئەمە ڕێگای ئەوانە، نوسەر دەڵێت: ئاگاداری ئەوانە بە لەگەڵیاندا دامەنیشە، چونکە کاریگەرییان لەسەرت دەبێ، ڕەنگە قەناعەت بەقسەی ئەوان بکەیت و بچیتە سەر قسەی ئەوان، بۆیە دوور بکەوەرەوە لەوان و لەگەڵ بیدعەکاراندا دامەنیشە، جا هەرچەندە بیدعەکە لە بیروباوەڕدا بێت وەکو جەهمەیی و موعتەزیلەکان و ئەوانیتر لەبیدعەکاران، یان بیدعەکە لەپەرستندا بێت، وەکو ئەوانەی خوای گەورە دەپەرستن بەنەفامی و گومڕایی، خوا پەرستی دەکەن و زوهد دەکەن، بەڵام بەبێ هیچ بەڵگەیەك و بەبێ هیچ هیدایەتێك، ئەمەش بەسەر صۆفییەکاندا جێ بەجێ دەبێت و ئەوانەی وەکو ئەوانن، ئەوانەی (مبتدعە)ن لەپەرستندا، یان بیدعەکەیان لەوە کەمترە، بیدعەکانیش جیاوازن، هەر هەمووی شەڕو خراپن هەرگیز نابێت نەرمونیان بین بەرانبەریان، ناگوترێت:- ئەم بیدعەیە سووکە، چونکە هەروەکو بڵێسەی ئاگر وایە، ئەگەر وازی لێ بهێنرێت دەورو بەری خۆی دەسوتێنێ، ئەگەر پەلەی لێ بکرێتو بکوژێتەوە ئەوا خەڵکی لەخراپەی پارێزراو دەبێ، بیدعە بەم شێوەیە، بۆیە پێویستە لەسەر موسڵمانان ئاگاداری (مبتدعە) بن و هەرگیز گومانی باشیان پێ نەبەن، یان مەغرور بن لەوەی لە ڕواڵەتیان دەردەکەوێ، دەڵێن ئەوانە خوا

پەرستن، ئەوانە تەوبەکارن، ئەوانە دڵی خەڵکی نەرم دەکەن، ئەوانە کەسانێکن خەریکی زیکرن، ئەوان سەرپێچیکارن تەوبە دەدەن، هەروەکو دەربارەی جەماعەتی (تەبلیغ) دەگوترێ، لەبەر ئەوەی ئەوانە (مبتدع) و صۆفین هەرگیز پێیان هەڵ مەخەڵەتێ.

**مەبەست لە:** (وإذا رأيت الرجل يجلس مع أهل الأهواء فاحذره).

ئەگەر کابرایەکت بینی لەگەڵ (مبتدعـە)دا دادەنیشێ ئەوا ئاگاداری بکەرەوە، چونکە دانیشتن لەگەڵ ئەوانەدا بەڵگەیە لەسەر خۆشویستنی ئەوان و دڵنەوایی کردنیان و ڕەنگە پێیان کاریگەر بێت، جا هەموو کەسێکیش لەگەڵ هاوڕێکەیدایە، هەرکەسێ لەگەڵ چاکەکاراندا دانیشت ئەوە بەڵگەی ئەوەیە چاکەو چاکەکارانی خۆش دەوێ، هەرکەسێ لەگەڵ خراپەکاراندا دانیشێ ئەوا بەڵگەیە خراپەو خراپەکارانی خۆش دەوێ، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ وَإِمَّا يُنْسِيَنَّكَ الشَّيْطَانُ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ الذِّكْرَى مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ (٦٨) الانعام) واتە: هەر کە ئەو موشریکانەت دیت خەریکن لە بارەی ئایەتو نیشانەکانی ئێمەوە خراپ دەدوێنو گاڵتە ئەکەن، ڕوویان لێ وەرچەرخێنەو خێرا هەستەو جێیان بهێڵە تا قسەکەیان ئەگۆڕنو واز لەو گاڵتەو مەسخەرە دێنن ئەگەر شەیتان ئەم ئامۆژگاریەشی لە بیر بردیتەوەو لە گەڵیان دانیشتیت جا دوای ئەوە هەر کە بە بیرت هاتەوە ئیتر دوای ئەوە نابێ لە گەڵ ئەو خەڵکە ستەمکارە دانیشێ بەڵکو دەبێ زوو جێیان بهێڵی).

خوای گەورە دەفەرموێت: (وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ إِنَّكُمْ إِذًا مِثْلُهُمْ إِنَّ اللَّهَ جَامِعُ الْمُنَافِقِينَ وَالْكَافِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا (١٤٠) النساء) واتە: خۆ بەڕاستی خوای گەورە لەم قورئانەدا بەئێوەی ڕاگەیاندووە کەهەرکات زانیتان و بیستان ئایەتەکانی خوا کەسانێك

باوەڕیان پێ ناکەن و گاڵتەیان پێ دەکەن هەتا ئەو باسە ئەگۆڕن و دەچنە سەر قسەیەکی تر و واز لەو کارەیان دێنن ئێوە لەگەڵیان دامەنیشن ئەگینا ئێوەیش لەگوناه وتاوان وەك ئەوان دەبن، دیارە خوای گەورەش لەڕۆژی قیامەتدا گشت دووڕوو بێ باوەڕەکان لەدۆزەخ کۆ دەکاتەوە).

فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کردووە لە گەڵ چاکەکاراندا دانیشێ، خوای گەورە دەفەرمویێت: (وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا (٢٨) الكهف)واتە: دان بە خۆت بگرە لە گەڵ ئەوانەی کە بەیانیانو ئێواران لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوەو دەیپەرستنو تەنیا ڕەزامەندی ئەویشیان دەوێ ئیتر داران یان نەدار بەهێزن یان بێ هێزن، هەرگیز چاوپشت لێیان کل نەکەیتو پشتگوێیان نەخەیت، بە مەبەستی ئەوە روو لە جوانیو زەرقو بەرقی ئەم دونیایە بکەیت).

خوای گەورە فەرمانی کرد بە پێغەمبەرکەی (ﷺ) لەگەڵ بیلال و عەممار و سەلماندا دانیشێ کە لە هاوەڵە هەژارەکان بوون و دانەنیشێ لەگەڵ گەورە پیاوانی قوڕەیش و ئەوانیتردا، چونکە پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە گەڵ ئەواندا دادەنیشت بە تەماحی ئەوەی ئیمان بهێنن دڵنەوایی دەکردن بەڵام خوای گەورە نەهی لێ کرد لەو کارەی چونکە ئەوان وتیان: ئەوانە لەخۆت دوور بکەرەوە تاکو ئێمە لەگەڵ تۆدا دانیشین و گوێت لێ بگرین، پێغەمبەری خواش (ﷺ) لەبەر ئەوەی سوور بوو لەسەر خەیرو چاکە ویستی بۆ ئەو هەژارانە مەجلیسی تر دابنێ، وەکو وەڵامدانەوەیەکی پیاو ماقوڵانی قورەیش بەتەماحی ئیسلام بوونیان، جا خوای گەورە نەهی لێ کرد ئەو کارە بکات لە پێش ئەوەی بیکات، فەرمووی: (وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَنْ ذِكْرِنَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطًا) الكهف /٢٨) واتە: بە گوێی ئەوە مەکە -کە لە بەر لاساری خۆی- دڵمان بێ ئاگا کرد لە یادی خۆمان بۆیە هەمیشە سەری کردۆتە دونیاو شوێنی هەواو

ئـارەزووی خـۆی کـەوتووەو وازی لـە فـەرمانی خـوای گـەورە هێنـاوەو هـەموو کـارو فەرمانێکی لەرادەو لە سنوور دەرچووە).

چونکە خوای گەورە زانی ئەوانە ئـەم دینـە وەرنـاگرن و ئیمـان نـاهێنن بۆیـە پێـی فەرموو: (وَلَا تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِمْ مِنْ شَيْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِمْ مِنْ شَيْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ الظَّالِمِينَ (٥٢) الانعام)

مەبەست لە: (وعرِّفه فإن جلس معه بعدما علم فاتقه فإنه صاحب هوى).

واتــە تــۆ ئامۆژگــاری دەکــەیت دوور بکەوێتــەوە لەتێکــەڵ بــوون و دانیــشتنی خراپەکاران، جا ئەگەر ئامۆژگارییەکەی تۆی وەرنەگرت ئـەوا لێـی بـە دووربـە، چـونکە ئـەو لەگـەڵ بیدعەکارانـدا دانیـشتووە لەکاتێکـدا عیلمـی هـەبووە نـەك دانیـشتووەو نەیزانیبێ.

**﴿١٤٦﴾ نوسەر دەڵێت: (وإذا سمعت الرجل تأتيه بالأثر فلا يريده ويريد القرآن فلا تشك أنه رجل قد احتوى على الزندقة فقم من عنده ودعه).**

**واتە: ئەگەر بیستت کابرایەك فەرموودەی بۆ دەهێنیتەوە کەچی نایەوێ و تەنها قورئانی دەوێ ئەوا هیچ گومانت نەبێ ئەو کەسە زەندەقەی تێدایە، بۆیە لای ئەو هەستەو وازی لێ بهێنە.**

**ڕاڤە/**

**کۆمەڵێك خەڵکی هەن پێیان دەگوترێت: (قورئانییەکان) بەباوەڕی خۆیان تەنها قورئان دەکەنە بەڵگەو سوننەت ڕەد دەکەنەوە، بزانە ئەوانە زەندیقن، چونکە کارکردن بەسوننەت کارکردنە بەقورئان، خوای گەورە دەفەرموێت:** (وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا) الحشر/٧)

**لە بەر ئەوە سوننەت تەفسیری قورئان دەکات و ڕوونی دەکاتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت:** (وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ) النحل/٤٤) **واتە: وا بۆ تۆش ئەم قورئانەمان دابەزاندە خوارێ بۆ ئەوەی بۆ ئەو خەڵکە ڕوون بکەیتەوە ئەوەی بۆیان دابەزێنراوە و بەشکو بیر بکەنەوەو ڕێنما ببن).**

**ئەو (قورئانییانە) پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی دەربارەی ئەوان داوەو فەرموویەتی:** (رب رجل شبعان على أريكته، يقول: بيننا وبينكم كتاب الله، فما كان فيه من حلال احللناه وما كان فيه من حرام حرمناه) **واتە: خەریکە وای لێ دێت کەسێکی تێر لەسەر قەنەفەکەی دانیشتوەو دەڵێت: نێوان ئێمەو ئێوە کیتابەکەی خودایە (قورئانە) (واتە: تەنها ئەم قورئانەمان بەسە) ئەوەی حەڵاڵ بوو تیایدا ئەوا حەڵاڵی دەکەین و ئەوەی حەرام بوو تیایدا ئەوا حەرامی دەکەین) ئەمجار پێغەمبەری خوا (ﷺ)**

فــەرمووی: (ألا وإني أوتيت القرآن ومثله معه)[٣٢٥] واتــە: خــوای گــەورە قورئــانی پــێ بەخشیوم و هاوشێوەکەی لە گەڵدایە (واتە: سوننەت).

خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى (٣)) واتـە: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) (إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى (٤)النجم) جـا فـەرموودەکان وەحـین لـە خـوداوە، هەرچـەندە وشەکانی لە پێغەمبەرەوەیە (ﷺ) بەڵام ماناکەی لە خوداوەیە.

جا ئەو کەسەی تەنها قورئان دەکاتە بەڵگە_بەبانگەشەی خۆی_ سـوننەت ناکاتـە بەڵگە، ئەوە کەسـێکی زەندیقـە واتـە: مونافقـە، مەبەسـت لـە زەنـدیق دووڕووە، ئەمـە مانای ئەو دەستەواژەیە: (قد احتوى على الزندقة).

مەبەست لە: (فقم من عنده ودعه).

لەگەڵیدا دامەنیشە، چونکە هەندێ کەس دەڵێن: ئەمە قورئان دەکا بە بەڵگـە، بۆیـە پێی مەغرور دەبن، لە کاتێکدا ئەو کاری بە قورئان نەکردووە، چونکە قورئان فـەرمانی کردووە بە وەرگرتنی سوننەت، کەواتە ئەم کەسـە قورئـانی نەکردوەتـە بەڵگـە، بـەڵکو دەیەوێ خۆی داپۆشێ و خەڵکی هەڵ خەڵەتێنێ.

---

٣٢٥ / سبق تخريجه .

**﴿١٤٧﴾ نوسەر دەڵێت: (واعلم أن الأهواء كلها ردية تدعو كلها إلى السيف، وأردؤها وأكفرها الرافضة والمعتزلة والجهمية فإنهم يردون الناس على التعطيل والزندقة).**

واتە: بزانە ئارەزووەكان هەمووی خراپن هەمووی بانگەشە دەكەن بۆ شمشێر، لە هەموویان خراپتر وكوفرتر (روافض)و (المعتزلە)و (الجهمیە)ن جا ئەوانە خەڵكی دەگێڕنەوە بۆ لەكارخستن (تعطیل) و (زەندەقە).

ڕاڤە/

مەبەست لە: (واعلم أن الأهواء كلها ردية).

الاهواء: ئەوەیە كە جیاوازە لە گەڵ قورئان و سوننەتدا لەمەزهەب و بۆچوون و بیرۆكەكان، جا ئەوەی لە گەڵ قورئانو سوننەتدا جیاوازە لەبۆچوونو مەزهەبەكانو بیرۆكەكانو حزبیەكانو جگە لەوانە ئەوانە هەموو لەئارەزووەوەیە، خوای گەورە دەفەرموێت: (فَإِنْ لَمْ يَسْتَجِيبُوا لَكَ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءَهُمْ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِنَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ (٥٠) القصص) واتە: خۆ ئەگەر وەڵامیان نەدایتەوە،ئەوە بزانە كە ئەوانە هەر پەیڕەوی لە ئارەزووی خۆیان ئەكەن، چ كەسێ گومڕاترە لەو كەسەی پەیڕەوی هەواو ئارەزووی خۆی كردووە، بێ ئەوەی هیچ ڕێنوێنێكی لەخواوە هەبێ..؟ بەڕاستی خواش ڕێنوێنی گەلی ستەمكار ناكات).

جا ئەمە واجبە لەسەر موسڵمان شوێنی ئەوە بكەوێت لە خواو پێغەمبەرەكەیەوە (ﷺ) هاتووەو شوێنی ئەوە نەكەوێ نەفسەكەی حەزی لێیەتی، یان فلان و فیسان دەیڵێت، پێویستە لەسەر موسڵمان قسەی خەڵكی بەراورد بكات لەگەڵ قورئان و سوننەتدا جا ئەوەی لەگەڵ قورئان و سوننەتدا دەگونجێ وەری دەگرێ و ئەوەی

لەگەڵ قورئان و سوننەتدا نەگونجێ ئەوا وازی لێ دەهێنێ، ئەمە خاوەنی حەقـە، بـەڵام ئەوەی لەگەڵ خەڵکیـدا دەڕوات بـۆ هـەر کـوێ بـڕۆن، دەبێتـە گەمژەیـەك هـەرگیز بـیر ناکاتەوە لەوەی ئەوان لەسەری دەڕۆن، ئەوەی ئەوان لەسـەری دەڕۆن تـاقی ناکاتـەوە تا ئەو کەسە خاوەنی ئارەزووەو شوێنی ئارەزووەکەی دەکەوێت.

مەبەست لە: (تدعو كلها إلى السيف).

واتە: ئارەزووەکان خەڵکی بەرەو فیتنە بانگ دەکەن،جا ئەو جەنگانـەی لـە نێـوان موسڵماناندا ڕوویداو بووە هۆی تێکچوونی یەکڕیزی موسڵمانان، هەر هـەمووی بـە هـۆی ئارەزوو پەرستانەوە ڕوویدا لـە موعتەزیلـەو خـەواریج و جگـە لـەوان، جـا ئەوانـە هـۆی فیتنەکان بوون، هیچ فیتنەیەك ڕووی نـەداوە ئـیللا لـەڕێگای ئەوانـەوە نـەبێ و بـەهۆی ئەوانەوە نەبێ..

کێ بوو ئەو کەسەی ئیمامی عوسمانی کوشت؟

کێ بوو ئەو کەسەی ئیمامی عەلی کوشت؟

کێ بوو ئاگری فیتنەی هەڵگیرساند لەنێوان موسڵماناندا لەپاش ئەوە ئـیللا ئـارەزوو پەرستان نەبێ؟

کـێ بـوون ئەوانـەی کـە (مـأمون)و ئەوانـەی پـاش ئـەو هـاتن هەڵخەڵەتانـد بـە تاقیکردنەوەی ئەهلی سـوننە تـاکو ئیمـامی (ئەحمـەدی کـوڕی حەنبـەل)یـان ڕاکێـشاو لێیانداو بەندیان کرد، ئیللا ئارەزوو پەرستان نەبێ؟

کێ بوو ئەو کەسـەی (شـیخ الاسـلام ابـن تیمیـە)ی بەنـد کـردو تـاکو لەبەندیخانـەدا کۆچی دوایی کرد ئیللا ئارەزووپەرستان نەبێ؟

بۆیە پێویستە لەسەرمان ئاگاداری ئەوانە بـین، چـونکە خراپـەیان لەکۆتایـدا بـەرەو تێکدانی یـەکڕیزی موسـڵمانان دەبـات، دەرچـوون لـەدژی کاربەدەسـتانی موسـڵمانانو

تێکدانی جەماعەتی موسڵمانان، بۆ ئەوەی ببنە پارچە پارچەو چەندین حزبەوە لەجیاتی ئەوەی ببنە یەك ئوممەت.

مەبەست لە: (وأردؤها وأكفرها الرافضة والمعتزلة والجهمية).

ئەوانە خراپترین ئارەزوو پەرستانن، لەسەرووی هەموویانەوە (رافضە)کان لە مەزهەبی شیعە، ناویان لێنرا (رافضە) چونکە (زیدی کوڕی علی کوڕی الحسین)یان ڕەدکردەوەو پێی ڕازی نەبوون کاتێ بانگیان کرد بۆ ئەوەی هاودەنگی ئەوان بێت لە جوێندان بە (ئەبو بەکر وعومەر) وتی: (نەخێر ئەبو بەکر و عومەر هەردوو وەزیری پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوون) کاتێ ئەو ڕازی نەبوو لە گەڵیاندا هاودەنگ بێت، وتیان: کەواتە ئێمە تۆ (رفض) دەکەین، بۆیە ناویان نرا (الرافضە).

(الجهمیە): شوێنکەوتوانی (الجهم ی کوڕی الصفوان)ن، لە پێشدا چەند جارێك باسمان کردووە.

(المعتزلە): شوێنکەوتوانی (عمروی کوڕی عبید) و (واصل ی کوڕی العطاء) لە مەجلیسەکانی (الحسن البصری) جیابوونەوەو لەڕێ لایاندا و عیلمیان لەزانایانی سوننەوە وەرنەگرت، بۆیە پێیان دەگوترێت (موعتەزیلە).

مەبەست لە: (فإنهم يردّون الناس على التعطيل والزندقة).

التعطیل: لەکارخستن: بریتییە لە نەفی کردنی ناوو سیفەتەکانی خوا.

الزندقة: بریتییە لە ڕەدکردنەوەی قورئان و سوننەت، لە جێی ئەوانە شوێنی حەزو ئارەزووکانیان دەکەون.

﴿١٤٨﴾ نوسەر دەڵێت: **(واعلم أنه من تناول أحدا من أصحاب رسول الله (ﷺ) فاعلم أنه إنما أراد محمدا (ﷺ) وقد آذاه في قبره).**

واتە: بزانە هەر کەسێ قسەی بە یەکێك لەهاوەڵانی (محمد) (ﷺ) کرد ئەوا بزانە ئەو کەسە مەبەستی (محمد)ە(ﷺ) و ئازاری ئەوی داوە لە گۆڕەکەیدا.

﴿١٤٩﴾ نوسەر دەڵێت: **(وإذا ظهر لك من إنسان شيء من البدع فاحذره فإن الذي أخفى عنك أكثر مما أظهر).**

واتە: ئەگەر لە هەر کەسێکەوە شتێکی بیدعەت بۆ دەرکەوت ئەوە ئاگاداری بە چونکە ئەوەی لێت شاردراوەتەوە لەوە زۆرترە بۆت ئاشکرابووە.

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (واعلم أنه من تناول أحدا من أصحاب رسول الله (ﷺ)).

واتە: هەرکەسێ جوێن بە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بدات و بە کەمیان بزانێ ئەوە جوێنی بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوە چونکە ئەوانە هاوڕێو هاوەڵو یارمەتی دەرو پشتیوانی ئەو بوون، جا ئەگەر تانەیان لێ بدا ئەوا تانەی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوە،چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆی ئەوانی کۆکردەوە، هەرئەویش بوو سەرکردایەتی ئەوانی دەکردو کاروباری ئەوانی بەڕێوە دەبرد، ئەمەش تانەدانە لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) کەوا ئەو هاوڕێتی کەسانی خراپی کردووە، ئەمەش تانەدانە لەپێغەمبەری خوا (ﷺ)، دەڵێن: (الجبت والطاغوت) مەبەستیان (ئەبوبەکرو عومەر)ە، ئەمەش تانەدانە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، چۆن دەبێ هەردوو هاوڕێ و هەردوو وەزیرەکەی (جبت و طاغوت)بن؟ کەواتە پێغەمبەری خوا (ﷺ) تێناگات و

نازانیٚ! ! داوا لەخوا دەکەین بمانپاریٚزیٚ، هەروەها پیٚغەمبەری خوا (ﷺ) ستایشی هاوەڵانی دەکردو مەدحی دەکردن، کەواتە ئەو حەقیقەتی ئەوانی نەزانیوە ! ! پیٚغەمبەری خوا (ﷺ) لە فەرموودەیەکی (صحیح) دا فەرموویەتی: (لا تسبوا أصحابي، فوالذي نفسي بيده لو أنفق أحدكم مثل أحد ذهباً، ما بلغ مدَّ أحدهم ولا نصيفه)[٣٢٦] واتە: جنیٚو بە یارانی من مەدەن، سویٚند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە ئەگەر یەکیٚ لە ئیٚوە بە ئەندازەی کیٚوی ئوحود ئاڵتون بکات بە خیٚر، ئەوا ناگاتە مشتی یەکیٚ لەوان و بە نیوەی مشتیٚکیش).

مەدحی ئەوان دەکات، کەواتە پیٚغەمبەری خوا (ﷺ) هەڵەی کرد لەمەدح و سەنای ئەواندا لەکاتیٚکدا ئەوان خراپەکارو (جبت و طاغوت)و بیٚ باوەڕن، ئەمە تانەدانە لە پیٚغەمبەری خوا (ﷺ)، بەڵکو ئەوە تانەدانە لەقورئان...

خوای گەورە دەفەرمویٚت: (لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ (١٨) الفتح).

خوای گەورە دەفەرمویٚت: (لَقَدْ تَابَ اللَّهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ (١١٧) التوبة).

خوای گەورە دەفەرمویٚت: (وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ بِإِحْسَانٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ (١٠٠) التوبة).

کەواتە ئەمە لەکەدارکردنی قورئانە کە مەدحی ئەوانی کردووە، جا هەرکەسیٚ یەك گەردیلە ئیمان لەدڵیدا هەبیٚ ئەوا جویٚن بەهاوەڵان نادات.

---

٣٢٦ / سبق تخريجه .

مەبەست لە: (فاعلم أنه إنما أراد محمدا (ﷺ) وقد آذاه في قبره).

هەرکەسێ جوێن بەهاوەڵان بدات ئەوا ئازاری پێغەمبەری خوای (ﷺ) داوە لە گۆڕەکەیدا چونکە ئەو ڕازی نابێ جوێن بەهاوەڵانی بدرێت، لە کاتێکدا خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّ الَّذِينَ يُؤْذُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا مُهِينًا (٥٧) الاحزاب) واتە: بەڕاستی ئەو کەسانەی ئازارو ئەزیەتی خواو پەیامبەرەکەی دەدەن خوا لەدونیاو لەقیامەتدا نفرینی لێ کردوون و لەمیهرەبانی خۆی دووری خستوونەتەوە سزایەکی زۆر سوککەری بۆ ئامادەکردوون).

جا هەر کەسێ جوێن بەهاوەڵان بدات ئەوا ئازاری خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) داوە، ئەمەش تایبەت نییە بە ئەو کاتەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ژیاندا بووە بەڵکو ئازاری دەدات لە کاتێکدا ئەو لە گۆڕەکەیدایە لە پاش مردنی، جا هەرکەسێ ئەوە بکات ئەوە نەفرەت لێکراوە (ملعونه): (لَعَنَهُمُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا مُهِينًا) داوا لە خوا دەکەین بمانپارێزێ.

**﴿١٥٠﴾ نوسەر دەڵێت: (وإذا رأيت الرجل رديء الطريق والمذهب فاسقا فاجرا صاحب معاص ظالما وهو من أهل السنة فاصحبه، واجلس معه، فإنه ليس تضرك معصيته).**

**واتە: ئەگەر کەسێکت بینی ڕێگاو مەزهەبی باش نەبوو، کەسێکی (فاسق)و (فاجر) بوو، خاوەنی سەرپێچیو ستەمکار بوو بەڵام ئەهلی سوننەیە ئەوە هاوڕێتی بکەو لەگەڵیدا دابنیشە، چونکە ئەو سەرپێچییەکەی زیانت پێ ناگەیەنێ.**

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (وإذا رأيت الرجل رديء الطريق والمذهب فاسقا فاجرا صاحب معاص ظالما وهو من أهل السنة فاصحبه) **هاوڕێتی کردنی کەسێکی (فاسق)ی سوننی هەرچەندە (فسق)و ئەنجامدانی سەرپێچی تێدا بێت و دانیشتن لەگەڵ ئەودا باشترە لەدانیشتن لەگەڵ کەسی (مبتدع)دا، چونکە کەسی سەرپێچیکار دەزانی ئەوە سەرپێچیکارە، تکای ئەوەی لێ دەکرێ تەوبە بکات بەجیاواز لەگەڵ کەسی (مبتدع) دا، ئەو وادەزانێ خۆی لەسەر حەقە بۆیە تەوبە ناکات، جا (مبتدع)ەکان بەزۆری تەوبە ناکەن چونکە ئەوان وادەزانن لەسەر حەقن ئەمەش مانای ئەوە نییە لەگەڵ سەرپێچیکاراندا دانیشی، بەڵکو مانای ئەوەیە دانیشتن لەگەڵ سەرپێچیکاراندا لە ئەهلی سوننە باشترە لەدانیشتن لەگەڵ (مبتدع)دا هەرچەندە ڕواڵەت و ڕووکەشیان خواپەرستی و چاکەکاربن، ئەمە مەبەستی نوسەرە، گومانیش لەوەدا نییە بیدعە خراپەو لای شەیتان خۆشەویستترە لەسەرپێچی، چونکە خاوەنی بیدعە تەوبەی لێ ناکات، بەجیاواز لەگەڵ سەرپێچیکاردا ئەوا ئەو تکای ئەوەی لێ دەکرێ تەوبەی لێ بکات، چونکە باوەڕی وایە ئەوە سەرپێچییەو شەرم دەکاتو ئاشکرای ناکات بەجیاواز لەگەڵ (مبتدع)دا.**

مەبەست لە: (وهو من أهل السنة فاصحبه).

واتە: بە مەرجێ لەئیسلام دەرنەچێ بەڵکو خاوەنی چەند تاوانێکی گەورەیە جگە لە شیرك‌و بیدعەی نییە، جادانیشتنی تۆ لەگەڵ ئەودا ئەوا سووکترە لەدانیشتن لەگەڵ (مبتدع)دا، هەرچەندە کابرای (مبتدع) تەقواو چاکسازی خۆی دەرخات، هەروەکو باسمان کرد مانای ئەوە نییە شەیخ پێت دەفەرموێ برۆ لەگەڵ سەرپێچیکاراندا دانیشە، بەڵکو ئەو بەراورد دەکات لەنێوان خراپەی دانیشتن لەگەڵ سەرپێچیکارو خراپەی دانیشتن لەگەڵ (مبتدع)دا، جا خراپەی دانیشتن لەگەڵ (مبتدع)دا توندترە لەدانیشتن لەگەڵ سەرپێچیکاردا، ئەی چۆنە لەگەڵ کەسێکی خاوەن سوننە دەستی گرتووە بەدینەکەیەوە دانیشی؟ ئەگەر دانیشتن لەگەڵ سوننەیەکی سەرپێچیکاردا باشتر بێت لەدانیشتن لەگەڵ (مبتدع)ـەدا، جا چۆنە بەدانیشتن لەگەڵ کەسێکی سوننی رێنمویی کراو دەستی بەدینەکەوە گرتبێ؟ ئەمە بە راستی (الجليس الصالح)ـە.

مەبەست لە: (فإنه ليس تضرك معصيته).

چونکە سەرپێچییەکەی لەسەر خۆیەتی ئەمە لەباسی بەراوردەوە، بەڵام کەسی(مبتدع) بیدعەکەی زیانت پێ دەگەیەنێ.

**نوسەر دەڵێت:** (وإذا رأيت الرجل مجتهدا في العبادة متقشفا محترقا بالعبادة صاحب هوى فلا تجلس معه ولا تسمع كلامه ولا تمشِ معه في طريق فإني لا آمن أن تستحلي طريقه فتهلك معه).

واتە: ئەگەر کابرایەکت بینی لە خواپەرستیدا زۆر هەوڵی دەداو وازی لە دونیا هێناوە و لە ناو عیبادەتدا سووتاو بێت بەڵام خاوەنی ئارەزوو بوو، ئەوا لەگەڵیدا دامەنیشەو گوێبیستی قسەکانی مەبە، لە رێگاشدا لەگەڵیدا رێ مەکە، چونکە من دڵنیا نیم رێگاکەی حەڵاڵ بکەیت‌و لەگەڵ ئەودا بەهەلاکەتدا بچیت.

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (وإذا رأيت الرجل مجتهدا في العبادة متقشفا محترقا بالعبادة صاحب هوى فلا تجلس معه ولا تسمع كلامه).

**هەرگیز مەغرور مەبە بەوەی کەسانی(مبتدع) دەری دەخەن لەخواپەرستی‌و زوهدو شەونوێژ کردن، لەبەر ئەوەی ئارەزوو و بیدعەی هەیە ئەوا هەرگیز نەرم‌و نیان مەبە لەگەڵیدا، دووربکەوە لێی ئەو پەڕی دوورکەوتنەوە، هەروەکو هەندێ لەسەلەف دەڵێن:** (اقتصاد في سنة خير من اجتهاد في بدعة)[٣٢٧].

**مەبەست لە:** (ولا تمشِ معه في طريق).

**ئەمە (عطف)ـە لە سەر ئەوەی پێشی هاتووە لە ئاگادارکردنەوە لە هاوڕێتی (مبتدع)ـەو دانیشتن لەگەڵیاندا، پێغەمبەری خواش (ﷺ) لەوە ئاگاداری کردینەتەوە، دەفەرموێت:** (اياكم ومحدثات الأمور)، (اياكم) **ئەمە ئاگادارکردنەوەیە، فەرموویەتی** (شر الامور محدثاتها)[٣٢٨] **جا بیدعە خراپترە لە سەرپێچی، کەسی (مبتدع)ش خراپترە لەسەرپێچیکار، بۆیە پێویستە ئاگاداری ئەم بابەتە بین،** (ولا تمشِ معه في طريق) **چونکە ئەو کارت لێ دەکات‌و تووشی بیدعەکەی خۆیت دەکات، تۆ گومانی باشت بۆی هەیە، چونکە ئەو خۆی بە خواپەرست‌و زاهید دەرخستووە، بۆیە بیدعەکەی دێت بۆت، ئەوەش زۆر ترسناکە، هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) نموونەی لەسەر هاوەڵی چاك هێناوەتەوە بەمیسك فرۆش، جا یان لەمیسکەکەی خۆیت پێ دەبەخشێ وەیان لێی دەکڕی وەیان بۆنێکی خۆشت دەست دەکەوێ چونکە تۆلای ئەو دانیشتووی، ئەگەر هیچت دەست نەکەوێ نە بەپێدان و نە بە فرۆشتن ئەوا تۆ هەر بۆنی میسك دەکەیت لە**

---

٣٢٧ / رواة الطبراني ومحمد بن نصر وابن بطة .

٣٢٨ / سبق تخريجه .

کاتێکدا تۆ لای ئەو دانیشتووی بەڵام هاوەڵی خراپ ئەوە وەکو ئاسنگەر وایە یان جل و بەرگەکەت دەسوتێنێ وەیان بۆنێکی پیس دێت بەسەرتدا [٣٢٩].

ئەمەش جێ بەجێ دەبێ بەسەر جەماعەتی (تەبلیغ)دا ئەوانەی خەڵکێکی زۆر ئەمڕۆ پێیانەوە مەغرور بووە، چونکە خواپەرستی و تەوبەدانی سەرپێچیکارانی لێ دەردەکەوێت هەروەکو دەڵێن، توندی کاریگەرییان بەسەر ئەوانەی هاوڕێتییان دەکەن، بەڵام سەرپێچیکاران دەردەکەن لەسەرپێچییەوە بۆ بیدعە، بیدعەش لەسەرپێچی خراپترە، سەرپێچیکارێکی ئەهلی سوننە باشترە لە خواپەرستێکی ئەهلی بیدعە، بۆیە دەبێ ئاگاداری ئەوە بین.

من ئەم قسەیەم نەگوتووە لەڕقی ئەو خەیرەی تیایاندایە -ئەگەر خەیریان تێدا بێت- بەڵکو ئەمەم گوت لەڕقی ئەو بیدعەیە، چونکە بیدعەکە خەیرەکە لەناو دەبات.

ئەو بیدعانەی لای جەماعەتی تەبلیغ هەیە کۆمەڵێك لەوانەی هاوڕێتییانی کردووەو ئەمجار تەوبەی کردووە لەهاوڕێتییان باسی کردووەو چەندین کتێبیان نوسیوە لەوریاکردنەوەی خەڵکی لێیان و ڕوونکردنەوەی بیدعەکانیان.

هەرچەندە شەیخ (محمدی کوری ابراهیم) لەسەرەتای کارەکەیانەوە مۆڵەتی بەهەندێکیان دا بۆ ئەوەی لە(المملکە)دا بانگەواز بکەن، چونکە کارەکەی ئەوانی لا ڕوون نەبوبوەوە، بەڵام کاتێ کارەکەی ئەوانی بۆ ڕوون بووەوە بەتوندی وەڵامی دانەوە، هەروەکو لە (مجموع الفتاوی)کەیدا هاتووە [٣٣٠]، ئەو مەرجی لەسەریان دانا بوو بۆ بانگەوازکردن بۆ یەکتاپەرستی بەڵام ئەوان مەرجەکەیان نەبردە سەر، هەروەها لەسەرەتادا شەیخ (ابن باز) وەسف و سەنای ئەوانی کرد چونکە کارەکەی لا ڕوون نەبوبووەوە، بەڵام کاتێ بۆی ڕوون بووەوە لەقسەکەی گەڕایەوە و فەرمووی: (هیچ

---

٣٢٩ / رواه البخاري (١٩٩٥) ومسلم (٢٦٢٨) .

٣٣٠ / (٢٢٧/١) .

کەسێك لەگەڵ ئەواندا دەرنەچێ ئیللا کەسێك بیەوێ بانگیان بکات بۆ حەق و یەکتاپەرستی و ئینکاری ئەوەیان لێ بکات ئەوان لەسەری دەڕۆن)[٣٣١] ئا بەم شێوەیەی فەرموو، هەرچەندە خاوەن بیدعە بانگەواز وەرناگرێت، هەروەها خاوەنی مەنهەج لە مەنهەجەکەی خۆی ناگەڕێتەوە کە بەیعەی شەیخەکانی لەسەر داوە.

**مەبەست لە:** (فإني لا آمن أن تستحلي طريقه فتهلك معه).

**ئەمە ئەنجامەکەیەتی ئەگەر لەگەڵ ئەواندا ڕێ بکەیت و دانیشی و حاڵی ئەوت بەدڵ بێت، جا بیدعەکەی دەگاتە تۆو تۆیش وەری دەگریتو بەهەلاکەتدا دەچیو دەبیتە کەسێکی (مبتدع)، جا ترسناکییەکە زۆر توندە لەلایەن (مبتدع)ەوە چەندیش زۆرن لەم سەردەمەدا، بەڵام دەبێ بزانین بیدعە چی یەو چۆنە، چونکە هەندێ کەس هەیە هەموو شتێك لای ئەو بیدعەیە، بیدعە چەند ڕێسایەکی خۆی هەیە، جا ئەگەر ئەوە جێ بەجێ بوو و دەرکەوت ئەوەی لەسەریەتی بیدعەیە ئەوا لەگەڵیدا دامەنیشەو هاوڕێتی مەکە.**

**نوسەر دەڵێت:** (رأى يونس بن عبيد ابنه وقد خرج من عند صاحب هوى، فقال: يا بني من أين خرجت؟ قال: من عند عمرو بن عبيد، قال: يا بني لأن أراك خرجت من بيت خنثى أحب إلي من أن أراك تخرج من بيت فلان وفلان ولأن تلقى الله يا بُنيّ زانيا فاسقا سارقا خائنا، أحب إلي من أن تلقاه بقول أهل الأهواء).

أفلا ترى أن يونس بن عبيد قد علم أن الخنثى لا يضل ابنه عن دينه وأن صاحب البدعة يضله حتى يكفره.

---

٣٣١ / مجموع فتاوى ومقالات متنوعة للشيخ عبدالعزيز بن باز (٢٩٦/٨) .

واتــه: (یـونس ی کـوڕی عبیـد) کوڕەکـەی خـۆی بینـی لای ئـارەزوو پەرسـتێکەوە دەرچوو فەرمووی:_ کوڕم لەکوێوە دەرچوویت؟ وتی: لای (عمرو ی کوڕی عبیـد)ەوە، وتـی: کـوڕم، ئەگـەر بتبیـنم لـەماڵی (نێرەموکێکـەوە) دەرچـیت پـێم خۆشـترە بتبیـنم لەماڵی فلان و فلانەوە دەرچی، کوڕەکەم، ئەگەر بگەیتە خواکەی خۆت وەکو کەسێکی زیناکاری فاسقی دزی خائین، پێم خۆشترە پێی بگەیت لەسەر قسەی ئارەزووپەرستان بیت).

ئایە نـابینی (یـونس ی کـوڕی عبیـد) زانیویـەتی کەسـێکی (نێرەمـووك) کوڕەکـەی گومڕا ناکات لە دینەکەیدا، بەڵام ئارەزوو پەرست گومڕای دەکات تاکو کوفر دەکات.

ڕاڤە/

مەبەست لە: (رأى يونس بن عبيد ابنه وقد خرج من عند صاحب هوى، فقال: يا بني من أين خرجت؟ قال: من عند عمرو بن عبيد -(عمروی کوڕی عبید) شەیخی موعتەزیلەکانـە) - قـال: يا بني لأن أراك خرجت من بيت خنثى أحب إلي من أن أراك تخرج من بيت فلان وفلان).

ئەم وشەیە(خنثی) ڕوون نییە، لەهەندێ نوسخەدا هاتووە (من بيت هيتـيّ) ئـەویش هەر ڕوون نییە، بەڵام مەبەستەکەی ئەوەیە لەگەڵ بیدعەکاراندا دامەنیـشە، جـا ئەگـەر تۆلای کەسـێکی سـوننییەوە دەرچـیت بـەڵام سەرپێـچیکارە ئـەوە سـووك و ئاسـانترە لـەوەی لای خـاوەن بیدعەیەکـەوە دانیـشی، ئەمـە ئەوەیـە یـونس کوڕەکـەی خـۆی لێ ئاگادار کردوەتـەوە، چـونکە ئـەو لای (عمـروی کـوڕی عبیـد) دانیـشتووە کـە گـەورەی موعتەزیلەکانـە، جـا ئـەو لای موسـڵمانێکی سـوننی دانیـشێ هەرچـەندە لەدینەکەیـدا نوقسانی هەبێ ئەوە ئاسانترەو زیانەکەی کەمترە لەدانیشتن لەلای (مبتدع)ێك.

لەوە گرنگتر فێربوونە، لای ئارەزوو پەرستان و بیدعەکاران فێر مەبە، بەڵکو لەسەر دەستی ئەهلی سوننە فێر بە، لەسەر دەستی زانایانی سوننە، زانایانی عەقیدەی تەواو، هەروەکو (محمدی کوڕی سیرین) فەرموویەتی: (إن هذا العلم دين فانظروا عمن تأخذون دينكم)[٣٣٢] واتە: (ئەم عیلمە دینە کەوابوو تەماشاکەن بزانن دینەکەتان لە چ کەسێکەوە وەردەگرن) جا ئەگەر تەنها دانیشتن لایان هێندە ترسناک بێت، چۆنە فێربوون لەسەر دەستی ئەو (مبتدعـ)انە؟؟!!

مەبەست لە: (ولأن تلقى الله يا بُنيّ زانيا فاسقا سارقا خائنا، أحب إلي من أن تلقاه بقول أهل الأهواء).

بەکوڕەکەی دەڵێت: (وەکو کەسێکی سەرپێچیکاری خاوەن تاوانی گەورە بمرێت جگە لەشیرك ئەوا تۆ چاوەڕوانی ڕەحمەتی خوا دەکەیت، خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَرَى إِثْمًا عَظِيمًا (٤٨)النساء).

تەنانەت هەرچەندە خاوەنی تاوانی گەورە سزا بدرێت لەئاگردا ئەوا ئاییندەی بۆ بەهەشتەو بە هەتا هەتایی لەئاگردا نامێنێتەوە، بەڵام خاوەنی بیدعە ڕەنگە بیدعەکەی بەرەو کوفر پەلکێشی بکاتو ببێتە لەوانەی تا هەتاهەتایی لەئاگردا دەمێنێتەوە، چونکە لەدیندا شتی تازەی داهێنا کە لە دیندا نییە، کەسی سەرپێچیکار نەیگوتووە سەرپێچییەکەی بەشێکە لە دین، جا لەسەر تاوانێکی گەورە بمرێت جگە لەشیرك سووكو ئاسانترە لەسەر بیدعە بمرێت، ئەمەش قسەیەکی زۆر ئاشکرایە.

مەبەست لە: (أفلا ترى أن يونس بن عبيد قد علم أن الخنثى لا يضل ابنه عن دينه وأن صاحب البدعة يضله حتى يكفره).

---

٣٣٢ / رواەمسلم في مقدمة صحيحه (١/١٤) .

ئەمە حیكمەتەكەیە كە لە گەڵ كەسی (مبتدعـ)دا دانانیشیٚ، بەڵام ئەگەر لای كەسێكی سوننی دانیشیٚ هەرچەندە كەم و كوورِی لەدین و ئیمانەكەیدا هەبیٚ، جا ئەو زیانەی لەئەنجامی دانیشتن لەگەڵ (مبتدع)دا دروست دەبیٚ سەختترو توندترە لەو زیانەی لە گەڵ كەسێكی سوننی سەرپێچیكاردا دروست دەبیٚ، چونكە خاوەنی بیدعە بانگت دەكات بۆ بیدعەكەیو بۆ جیاوازی كردن لەگەڵ كیتابو سوننەدا، بەڵام كەسی سەرپێچیكار لە كیتاب و سوننە دوورت ناكاتەوەو هانت نادا بۆ دووركەوتنەوە لەشوێنكەوتنی سوننە هەرگیز.

جا جیاوازی هەیە لەنێوان رێنماییەكانی ئەم و رێنماییەكانی ئەودا، ئەوپەرِی كاری ئەو تەنها جوانكاری كردنی ئەنجامدانی سەرپێچییەكە بەڵام هانت بدات بۆ دووركەوتنەوە لەسوننە ئەوا نەخێر، هەرگیز ئاگادارت ناكاتەوە.

دوورت ناكاتەوە لەسوننە بەڵكو رێز لەسوننە دەگرێتو بەمەزنی دەزانیٚ بەجیاواز لەگەڵ مبتدع دا ئەوا ئەو هەرگیز سوننە بەمەزن نازانیٚ.

**﴿١٥١﴾ نوسەر دەڵێت: (فاحذر ثم احذر أهل زمانك خاصة وانظر من تجالس وممن تسمع ومن تصحب فإن الخلق كأنهم في ردة إلا من عصم الله منهم).**

**واتە: ئاگاداربەو ئەمجار ئاگاداری کەسانی زەمانی خۆت بە بەتایبەتی، تەماشا بکە لەگەڵ کێدا دادەنیشی، ئەوانەی گوێبیستیان دەبی و ئەوانەی هاورێتییان دەکەیت، چونکە خەڵکی هەر دەڵێی لەهەڵگەڕانەوەدان ئیللا ئەوانە نەبێ خوای گەورە پاراستوونی.**

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (فاحذر ثم احذر أهل زمانك خاصة).

**چونکە لەکاتی دانەری ئەم کتێبەدا (بەربەهاری) فیتنەکان زۆر مەزن و گەورە بوون، بۆیە خەڵکی هەموو سەردەمێك ئاگاداردەکاتەوە خراپەی ئارەزوو و بیدعەی تێدا دەرکەوتووە، جا ئەو ئاگاداریان دەکاتەوە لێی، ئەمەش تایبەت نییە بەسەردەمی خۆیەوە، بەڵکو هەموو سەردەمێك خراپەکاری و ئارەزوو و بانگەوازی پووچەڵی تێدا بڵاو ببێتەوە ئەوە بەتوندی موسڵمان ئاگادر دەکاتەوە بۆ ئەوەی ئاگادارییەکەی وەرگرێ.**

**مەبەست لە:** (وانظر من تجالس وممن تسمع ومن تصحب فإن الخلق كأنهم في ردة إلا من عصم الله منهم).

**ئەمە لەسەردەمی خۆیدا هەروەها ئەمە دووبارە دەبێتەوە، جا ئەم کاتەی ئێمەو ئەوەی بەدوایدا دێت _والله اعلم_ توندترە چونکە هەرکاتێك زەمانە دوور بکەوێتەوە ئەوا فیتنەکانو خراپەکاری زۆر دەبن، سوننەت نامۆ دەبێتو ئەوانەی دەستی پێوە دەگرن کەم دەبنەوە، جا ترسەکە توندترە.**

**﴿١٥٢﴾ نوسەر دەڵێت: (وإذا رأيت الرجل يذكر ابن أبي دؤاد وبشر المريسي و ثمامة أو أبا هذيل أوهشاماً الفوطي أو واحدا من أتباعهم وأشياعهم فاحذره فإنه صاحب بدعة فإن هؤلاء كانوا على الردة، واترك هذا الرجل الذي ذكرهم بخير ومن ذكر منهم).**

واتە: ئەگەر کەسێکت بینی بەباشی باسی (ابن ابو دؤاد)و (بشر المريسى)و (ثمامة) یان (ابو هذيل) یان (هشام الفوطى) یان هەر یەکێك لە شوێنکەوتووانو جەماعەتی ئەوانی کرد ئەوا ئاگاداری بە چونکە ئەوە خاوەنی بیدعەیە، چونکە ئەوانە لەسەر هەڵگەڕانەوە بوون، واز لەو پیاوە بهێنە بەباش باسیان دەکات یان باسی یەکێك لەوان دەکات.

ڕاڤە/

**مەبەست لە:** (وإذا رأيت الرجل يذكر ابن أبي دؤاد وبشر المريسي و ثمامة أو أبا هذيل أو هشاماً الفوطي).

**ئەگەر کەسێکت بینی ستایشی خراپەکارانو زانایانی گومڕایی سەردەمی خۆی دەکرد وەکو ئەوانە کە بێچووی جەهەمییەکانن، بزانە ئەو کەسە فاسقەو کەسێکی خراپەکارەو کەسێکی گومڕایە، چونکە ئەو ستایشیان ناکات تەنها لەبەر ئەوەی ئەوانی خۆش دەوێو ڕێگای ئەوانی گرتۆتە بەر، ئەگەر کەسێکت بینی ستایشی ئەهلی سوننە دەکات وەکو (ئیمامی ئەحمەد)و (ابن مبارك) هەروەها ستایشی زانایانی شوێنکەوتوان دەکاتو ئەوانەی لەپاش ئەوان هاتوون بزانە ئەوا ئەو کەسە خاوەنی خەیرو چاکەیە، چونکە ئەو ستایشی ئەهلی سوننە ناکات تەنها لەبەر ئەوەی سوننەی خۆش دەوێتو دەستی پێوە گرتووە، ئەمەش دەرسێکمان پێدەدات کەوا هەندێ لەو برایانە یان هەندێ لە قوتابیانی عیلم ستایشی هەندێ لە (مبتدعە)کان یان خاوەنی**

ئارەزووەکـان و خـاوەنی بیرۆکـە لارەکـان دەکـەن، کەچـی تەماشـای بیرۆکـەکان و بۆچوونەکانیان ناکەن، لەلایەکی ترەوە قسە بەچاکەکاران دەکات، چاکەکاران بەکـەم دەزانیّو لەئاستیان کەم دەکاتەوە، چونکە لەئەوانەوە بەکەمزانینی ئـەمان دەبیـسیّ و باوەڕیان پیّ دەکات، بە راستی ئەمە ترسێکی زۆر گەورەیە، ئەگەر چاکەکاران زانایـان و ئەهلی سوننە بەکەم بزانیّ و خـاوەنی بیرۆکـە لارەکـان و بۆچـوونە لارەکـان سـتایش بکات ئەوە ترسـێکی زۆر گەورەیـە، هەرچـەندە لایـان دانەنیـشیّ، ئەمـەش ئاگادارمـان دەکاتەوە لەوەی زۆربەی خەڵکی تێکەوتووە ئەمڕۆ.

مەبەست لە: (ابن أبي دؤاد وبشر المريسي).

ئەو دووکەسە هەر ئەو دووکەسە بوون پێشنیاریان کـرد بـۆ مـەئمون سـزای ئیمـامی ئەحمەدو ئەوانیتر بدات لەزانایان تەنها لەبەر ئەوەی بڵێن قورئان دروستکراوە.

(ثمامة)ی کوڕی (الاشرس): ئەم کەسە یەکێکە لەسەرکردەی گومڕاکاران.

(وابوالهذيل) العلاف: یەکێکە لەگەورەکانی موعتەزیلە.

(هشام الفوطی): یەکێکە لە (مبتدعە).

مەبەست لە: (أو واحدا من أتباعهم وأشياعهم فاحذره).

ئەگەر بینیت ستایشی خراپەکاران و لەڕێ لادەران دەکات ئەوا ئاگاداری بە.

مەبەست لە: (فإن هؤلاء كانوا على الردة).

واتــە: هەنــدێکیان هەڵگــەراوەن لــە دیــن -(مرتــد)ن- ئــەوانیش پێــشەوای جەهەمییەکانو موعتەزیلەکان ئەوانەی بە ئەنقەست لەگەڵ قورئان و سـوننەتدا نـاکۆك بوون، ئەوانە گومان لەکوفریاندا نییە، بەڵام ئەو کەسەی تەنها لاساییان دەکاتەوە ئەوا حوکمی گومڕایی بەسەردا دەدرێت، حوکمی کوفری بەسـەردا نادرێـت تـاکو بـۆی ڕوون

نەکرێتەوە، بەڵام پێشەواو بانگەوازکارانیان ئەوان دەزانن ئەوە گومڕاییە لە سەرین، بۆیە حوکمی هەڵگەرانەوەیان بەسەردا درا.

**مەبەست لە:** (واترك هذا الرجل الذي ذكرهم بخير).

هەرگیز مەغرور مەبە بەستایشی ئەم کابرایە، کە ستایشی ئەوان دەکات، ڕەنگە گومڕاکاران هەندێ سیفاتی باشیان تێدا بێت، بەڵام تەماشای ئەو گومڕاییەی ئەوان بکە تیایدان، بۆیە بە سیفەتێك لەسیفەتەکانی خەیر مەغرور مەبە، کەچی لەو هەموو سیفەتە خراپە بێ ئاگا بێت، ئەمەش دانایییەکی گەورەیە، چونکە هەندێ کەس دەڵێن: فلان کەس چاکەی تێدایە، هەرچەندە کەسێکی لار بێت، جا ئەوە خەیری تێدا نییە، هەرچەندە کەسێکی خاوەن سوننەت خراپەی تێدا بێت ئەوا دەستی پێوە بگرە چونکە ئەوە کەسێکی خاوەن سوننەتە.

**﴿١٥٣﴾ نوسەر دەڵێت: (والمحنة في الإسلام بدعة وأما اليوم فيمتحن بالسنة، لقوله: (إن هذا العلم دين فانظروا ممن تأخذون دينكم)[٣٣٣] وقوله: (لا تقبلوا الحديث الا ممن تقبلون شهادته) فتنظر فإن كان صاحب سنة له معرفة صدوقا كتبت عنه وإلا تركته.**

واتە: (تاقیکردنەوە)ی خەڵکی لە ئیسلامدا بیدعەیە، بەڵام ئەمڕۆ بەسوننەت تاقیدەکرێتەوە لەبەر ئەو گوتارەی کە دەفەرموێت: (بزانن ئەم عیلمە دینە کەواتە تەماشاکەن بزانن دینەکەتان لە چ کەسێکەوە وەردەگرن) وە ئەو گوتارەی کە دەڵێت: (فەرموودە لەهیچ کەسێکەوە وەرمەگرن ئیللا لەو کەسانەوە نەبێ شایەتییەکەی وەردەگرن) بۆیە تەماشا دەکەین ئەگەر هاتوو کەسەکە خاوەنی سوننەت بوو شارەزاو ڕاستگۆ بوو ئەوا فەرموودەی لێوە دەنووسین ئەگەر نا وازی لێ دەهێنێ.

ڕاڤە/

مەبەست لە: (والمحنة في الإسلام بدعة وأما اليوم فيمتحن بالسنة).

ئەصڵ لەموسڵماندا خەیرو چاکەیەو گومانی باش پێدا بردنە، بەمەرجێ جیاوازی ئەوەی لێ دەرنەکەوێ، ئەمە بنەمایە،جا نووسەر دەڵێت:- لەبەر ئەوەی ئەو موسڵمانە لەخەیرو چاکە زیاتر لێی دەرنەکەوتووە ئەوا ئێمەش خەیرەکەی لێ وەردەگرین، تەنانەت کەسی دووڕووش (منافق)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕواڵەتی دووڕووەکانی وەرگرت (ئەوەی لێیانەوە دەردەکەوت) و نهێنی و شاراوەکەیانی گەڕاندەوە بۆ لای خوا، چونکە هیچ شتێکی جیاواز لەوانەی لێ دەرنەکەوتووە ئەوا گومانی باشی پێ دەبەین، بەڵام ئەگەر ڕقی بەرانبەر بەسوننەتی لێ دەرکەوتو بەرانبەر بەئەهلی سوننە، ئەوا ئەو کاتە وریای بە (ئاگاداری بە) ئەمە مانای ئەو قسەیەیە کە دەڵێت: (والمحنة في الإسلام بدعة) واتە هەر موسڵمانێك خراپەی لێ دەرنەکەوت ئەوا تاقی مەکەرەوە.

---

٣٣٣ / ثبت هذا الكلام عن محمد بن سيرين في مقدمة (صحيحه) .

مەبەست لە: (وأما اليوم).

واتە: لەسەردەمی ئەودا ئەوا خەڵکی بەسوننەت تاقی دەکرانەوە،چونکە گرووپ و کۆمەڵە گومڕاکان زۆر بوو بوون بانگەشەی ئیسلام دەکەن، بۆیە پێویستە بزانرێت کێ لەسەر سوننەتە، تەنها بەوە مەغرور نەبێ بانگەشەی ئیسلام دەکەن.

جا هەرکەسێ ئەهلی سوننەی خۆش بوێت ئەمە بەڵگەیە ئەهلی خەیرو چاکەیە، ئەو کەسەی ئەهلی بیدعەی خۆش بوێت ئەوە بەڵگەیە ئەو کەسە لە خراپەکارانە.

مەبەست لە: (إن هذا العلم دين فانظروا عمن تأخذون دينكم).

فێر بوون دەبێ لەسەر دەستی زانایانی ئەهلی سوننە بێت، نابێت لەسەر دەستی زانایانی بیدعە بێت.

مەبەست لە: (لا تقبلوا الحديث الا ممن تقبلون شهادته).

واتە: ئەوانەی ڕیوایەتی فەرموودە دەکەن لێیان وەرمەگرن ئیللا ئەوانە نەبێ شایەتییان لێ وەردەگرن لای داوەر، چونکە کەسانی (ضعیف) زۆربوون لە ڕیوایەتدا، درۆ زۆر بووە لەڕیوایەتدا، ئەمە لەحەقی ئەو کەسانەدا لەزانستی فەرموودە دەزانن، بەڵام ئەوانەی وا نین ئەوا دەگەڕێینەوە بۆ کتێبە (صحيح)ەکانی فەرموودە.

مەبەست لە: (فتنظر فإن كان صاحب سنة له معرفة صدوقا كتبت عنه وإلا تركته).

ئەمە ڕوونکردنەوەی ئەو دەستەواژەیە کە دەڵێت: (إن هذا العلم دين) تەماشاکە ئەو کەسەی لەسەر دەستی فێر دەبیو ڕیوایەتی فەرموودەی لێوە دەکەیت جا ئەگەر بینیت خاوەنی سوننەتەو ڕاستەڕێی گرتووە ئەوا فەرموودەی لێوە بگێڕەوە و لێوەی بنوسە، بەڵام ئەگەر جیاوازی ئەوە بوو ئەوا فەرموودەی لێ وەرمەگرە، چونکە کەسانێك هەن فەرموودە لەپێغەمبەری خوداوە (ﷺ) دەگێڕنەوە لەهەمان کاتدا درۆزنن، چەند زۆرن ئەوانەی فەرموودە لەسەر زاری پێغەمبەرەوە (ﷺ) بە درۆوە دادەنێن، ئەمە لەڕووی ڕیوایەتی فەرموودەوە بەسەنەدەوە، بەڵام لەڕووی گواستنەوەی فەرموودەوە ئەوا بگەڕێوە بۆلای کتێبە (صحيح)ەکانی سوننە.

**﴿١٥٤﴾ نوسەر دەڵێت: (وإذا أردت الإستقامة على الحق وطريق أهل السنة قبلك، فاحذر الكلام وأصحاب الكلام والجدال والمراء والقياس والمناظرة في الدين، فإن استماعك منهم وإن لم تقبل منهم يقدح الشك في القلب، وكفى به قبولا، فتهلك، وما كانت قط زندقة ولا بدعة ولا هوى ولا ضلالة إلا من الكلام والجدال والمراء والقياس وهي أبواب البدع والشكوك والزندقة).**

واتە: ئەگەر دەتەوێت دامەزراو بیت لەسەر حەق و ڕێگای ئەهلی سوننەی پێش خۆت، ئەوا ئاگادری (کەلام)بەو ئاگاداری خاوەنی (کەلام) و(جیدال) و(میراء)و (قیاس) و(مناظرە)بە لە دیندا، چونکە گوێ گرتنت لێیان هەرچەندە لێیان وەرنەگری ئەوا گومانو دوودڵی لەدڵتدا دروست دەکات، بەسیەتی ئەو وەرگرتنە (کەمە)، ئەوا بەهەلاکەتدا دەچیت، هەرگیز زەندەقەو بیدعەو ئارەزوو گومڕایی پەیدا نەبووە ئیللا لە ڕێگای (کەلام) و(جیدال)و (میراء) و(قیاس)ەوە نەبێ، ئەویش دەرگاکانی بیدعەو گومان و زەندەقەیە.

ڕاڤە:

مەبەست لە: (وإذا أردت الإستقامة على الحق وطريق أهل السنة قبلك، فاحذر الكلام وأصحاب الكلام).

لەفیتنەکانی گومڕاکاران ئەوەیە ئەوان (عیلمی کەلام)و (جەدەل)و (عیلمی مەنتیق)یان هێناوەو کردوویانەتە بەڵگەو دەلیل لە بیروباوەڕەکانیاندا پشتیان پێ دەبەست، وازیان لەقورئان و سوننەت هێنا، چونکە ئەو دووانە ـبەڕای ئەوانـ سوودی یەقین نابەخشێ، بەڵگەکانی مەنتیق و عیلمی کەلام لای ئەوان بەڵگەی

یەقینیو بەڵگەی یەکلایین، بەو شێوەیە خراپە هاتە نێو موسڵمانانەوە لەڕێگای زانایانی (کەلامو جەدەلو مەنتیق)ەوە، ئەوانەی پشت بەیاساو ڕێساکانی مەنتیق و عیلمی کەلام دەبەستنو دەیکەنە بەڵگەو دەلیل، پشت بە قورئانو سوننەت نابەستن، چونکە قورئان و سوننەت بەقسەی ئەوان یەقین نابەخشێ، بەڵام ئەم یاسایانە بەلای ئەوان یەقین دەبەخشێ و ناوی لێ دەنێن بەڵگەکان.

مەبەست لە: (والجدال والمراء والقياس والمناظرة في الدين).

باسو بابەتەکانی دین دروست نییە بکرێتە جێگای وەرگرتن و ڕەدکردنەوەو جیدالو ئازادی ڕاو بۆچوون هەروەکو دەڵێن، بکرێتە نێو ڕۆژنامەو گۆڤارەکانەوە بۆ ئەوەی قسەی لەسەر بکرێت، چونکە باس و بابەتەکانی دین ڕێزی لێ دەگیرێ تەنها باسی ئەوەی تێدا دەکرێ قورئان و سوننەت دەلالەتی لەسەر دەکەن هەرگیز جیدالی تێدا ناکرێ، ئەمە یاساو ڕێساو مەنهەجی سەلامەتە، ئەمەش بەشێکە لەباوەڕبوون بەخواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ)، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت:- (مَا يُجَادِلُ فِي آيَاتِ اللَّهِ إِلَّا الَّذِينَ كَفَرُوا فَلَا يَغْرُرْكَ تَقَلُّبُهُمْ فِي الْبِلَادِ (٤) غافر) ئەوانەی لە قورئاندا جیدال دەکەن، ئایە ئەوە کەلامی خوایە یان کەلامی بەشەرە؟ ئایە ئیفادەی یەقین دەکات یان ئیفادەی ناکات؟....یان....یان....هتد، ئەمە بەشێکە لە جیدال کردن لە ئایەتەکانی خوادا، واتە وەکو ئەوە وایە ئەوان سیقەیان بەئایەتەکانی خوا نییە تاکو جیدالی تێدا دەکەن، یان فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە(معصوم)ەو هەرگیز لەخۆوە قسە ناکات، (وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى (٣) النجم) هەروەکو ئەوەی جێگای گومانو وەرگرتنو وەڵامدانەوەیە، باس و بابەتەکانی دین تێروانینی (مناظرە)ی تێدا نییە بەڵکو باس و بابەتێکی سابتو نەگۆڕن، دەبێ تەسلیمی ببین، هیچ گومانی تێدا نییەو تاکو بخرێتە بەر باس و لێکۆڵینەوە هەروەکو دەڵێن.

**مەبەست لە:** (فإن استماعك منهم وإن لم تقبل منهم يقدح الشك في القلب).

**واتە: گوێگرتن لەجیدال لەکاروباری دیندا لە ئەوانەوە هەرچەندە باوەڕیان پێ نەکەیت، کاریگەری لەسەر دڵت دەبێ‌و لەئایندەشدا کەمتەرخەمی تێدا دەکەیت، چونکە (اذا كثر الامساس قلَّ الاحساس) هەروەکو دەڵێن، پێش ئەوەی ئەو کەناڵە ئاسمانیانە دەرکەوێت‌و ئەو جیدالانەی تێدا بلاوبکرێتەوە لەدین و عەقیدەدا ئەو کاتە موسڵمانان لەم وڵاتەدا لەسەر عەقیدەیەکی سەلامەت بوون، هیچ گومان و خەیاڵیان نەبوو، هیچ کەسێك جورئەتی ئەوەی نەدەکرد قسە لەو مەسەلە دینیانە بکات، بەڵکو لەو مەسەلانەدا دەگەڕانەوە بۆلای زانایان، بەڵام ئێستا کاروباری دین بووەتە جێگای جیدال و وەرگرتن و ڕەدکردنەوەی وئازادی ڕادەربڕین هەروەکو دەڵێن، بەهۆی ئەم کەناڵە ئاسمانییانەوە، جا کارەکە زۆر ترسناکە، یەکێك لەوان دەڵێت: ئەم مەسەلەیە جیاوازی تێدایەو زانایان ئەوەمان لێ دەشارنەوە، ئەمەش گومان دەخاتە دڵی خەڵکییەوە، زانایان جیاوازی دەزانن، بەڵام بۆ خەڵکی ڕوونی ناکەنەوە بەڵکو لەنێوان خۆیاندا ڕوونی دەکەنەوەو لەنێوان خۆیاندا لێکۆڵینەوەی تێدا دەکەن‌و باسی دەکەن، چونکە ئەوان ئەهلی ئەوەن، بەڵام ئەوان باسی بکەن بۆ خەڵکی‌و لەسەر مینبەرەکان و لەئێزگەکاندا و بڵێن: مەسەلەکە جیاوازی تێدایەو چەند قسەو بۆچوونێکی تێدایە، ئەمە گومان دەخاتە ناو دینەوە، بۆیە دروست نییە.**

**مەبەست لە:** (وما كانت قط زندقة ولا بدعة ولا هوى ولا ضلالة إلا من الكلام والجدال والمراء والقياس).

**چونکە بوار بۆ خەڵکی دەکاتەوە بۆ جیدال لەکارو باری دیندا،** (والقياس) **مەبەستی قیاسی فاسدە، بەڵام قیاسی ڕاست و دروست ئەوە یەکێکە لەبنەماکانی بەڵگەکان جا قیاس سێ جۆری هەیە:-**

یەکەم: قیاس الأولى/ وەکو ئەوەی بڵێین: هەموو (کمال)ێك کە(نەقص)ی لەگەڵدا نەبێ ئەوا خوای گەورە لە پێشترە بۆی، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَلَهُ الْمَثَلُ الْأَعْلَى فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ (٢٧) الروم) واتە: وەسفی هەرە بەرز لەئاسمانەکان و زەویدا هەر شایانی ئەوە).

دووەم: قیاس التمثیل/ وەکو ئەوەی بڵێین: سیفەتەکانی (خالق) وەکو سیفەتەکانی (مخلوق)ە هەروەکو گرووی(الممثلة) دەیڵێن ئەمەش (باطل)و پووچەڵە.

سێ یەم: قیاس العلة / ئەمەش یەکێکە لەبەڵگەکانی (اصول الفقه) لەمەسەلە فیقهییەکاندا بەکار دەهێنرێت،ئەمەش ڕای کۆی زانایانەو لایان پەسەندە.

**﴿١٥٥﴾ نوسەر دەڵێت: (فالله الله في نفسك، وعليك بالآثار وأصحاب الأثر والتقليد فإن الدين إنما هو بالتقليد، يعني: للنبي (ﷺ) وأصحابه رضوان الله عليهم أجمعين ومَن قبلنا لم يدعونا في لبسٍ، فقلّدهم واسترح ولا تجاوز الأثر وأهل الأثر).**

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (فالله الله في نفسك، وعليك بالآثار وأصحاب الأثر والتقليد).

**مەبەستی بە (التقليد) لێرەدا شوێنکەوتنە، نەك ئەو (تقليد)ەیە لای (المتأخرين) هەیە، بەڵکو مەبەست لێی: شوێنکەوتن و چاولێکردنی زانا چاکسازەکانە، خوای گەورە دەفەرموێت:** (وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ بِإِحْسَانٍ) التوبة/١٠٠)، **خوای گەورە دەفەرموێت:** (وَاتَّبَعْتُ مِلَّةَ آبَائِي إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ) يوسف/٣٨) **ئەمە شوێنکەوتنە، ئەو (تقليد)ەی بە مانای شوێنکەوتن دێت ئەوە شتێکی باشە، بەڵام تەقلیدی کوێرانە کە بە بێ بەڵگەیە ئەوە نەویستراوە، جا (تەقلید) دوو جۆرە:-**

**١_ تەقلیدێك بەمانای شوێنکەوتنی حەق دێت، ئەمەش شتێکی باشە.**

**٢_ تەقلیدێك بەبێ بەڵگەو بەبێ هیچ زانیارییەك دەربارەی ئەوەی ئەم چاوی لێ دەکات لەحەق و ناحەق ئەمەش کارێکی خراپەو نەویستراوە.**

**مەبەست لە:** (وعليك بالآثار) **واتە: دەست بەسوننەت و فەرموودەکانەوە بگرە.**

**مەبەست لە:** (فإن الدين إنما هو بالتقليد، يعني: للنبي (ﷺ) وأصحابه رضوان الله عليهم أجمعين).

**ئەمە مانای شوێنکەوتنە.**

مەبەست لە: (وَمَن قبلنا لم يدعونا في لبسٍ).

لەپێش ئێمە لەسێ سەدە چاکەکەوە و پێشەوایان لەگومان و شاردنەوەدا بەجێی نەهێشتوون بەڵکو ئەم دینەیان بۆ ڕوون کردوونەتەوەو بنەمایان بۆ داناوینو ڕوونیان کردووەتەوە بۆیە ئەوەی لەسەرمانە شوێنیان بکەوینو لەسەر مەنهەجەکەیان بڕۆین،چونکە کەمتەرخەمییان نەکردووە لە ڕوونکردنەوەی ئەم دینەداو بکرێتە بنەما، نەفی کردن لە بیدعەو ئەو خەڵتەی پێوەی لکاوەو نوێیان کردەوەو ڕوونیان کردەوە ڕەحمەتی خوایان لێ بێت.

مەبەست لە: (فقلِّدهم واسترح).

تەکلیف لەخۆت مەکە چونکە کارەکەت بۆ کراوەو ئامادەکراوە، جا تۆ لەسەر حەقی ئەگەر لاسایی ئەوان بکەیتەوە.

مەبەست لە: (ولا تجاوز الأثر وأهل الأثر).

تێمەپەڕە لەفەرموودەو فەرموودەناسان چونکە ئەوان لەسەر حەقن، هەر ئەوانیش کۆمەڵە ڕزگاربووەکەن، کاتێ پرسیار کرا لە ئیمامی ئەحمەد: کۆمەڵە ڕزگاربووەکە کێن؟ فەرمووی: ئەگەر ئەهلی فەرموودە (شوێنکەوتوانی فەرموودە) نەبن نازانم کێن)[٣٣٤].

---

٣٣٤ / رواه الحاكم في علوم الحديث (١) والخطيب في شرف أصحاب الحديث (ص/٢٥) .

**﴿١٥٦﴾ نوسەر دەڵێت: (وَقِفْ عند متشابه القرآن والحديث ولا تقس شيئا).**

**واتە: لەئاستی (متاشابهەکان)ی قورئان و فەرموودەدا ڕاوەستەو هیچ شتێك (قیاس) مەکە.**

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (وقف عند متشابه القرآن والحديث ولا تقس شيئا).

**خوای گەورە دەفەرموێت:** (هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلَّا اللَّهُ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ (٧) رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ (٨) رَبَّنَا إِنَّكَ جَامِعُ النَّاسِ لِيَوْمٍ لَا رَيْبَ فِيهِ إِنَّ اللَّهَ لَا يُخْلِفُ الْمِيعَادَ (٩) آل عمران) **واتە: هەر ئەو خوایە ئەم کتێبە (قورئان)ی دابەزاندە سەرت هەندێکی (تەئویل) هەڵناگرن و ماناو مەبەستەکانیان موحکەم و ڕۆشن و دامەزراوو ماك و بناغەن بۆ ئایەتەکانی ترو ئەوی تریشی(موتەشابیهە) و لێك چوون، ئینجا ئەوانەی لەدڵیاندا لادان و چەوتی هەیە هەر لەموتەشابیهەکان دەگەڕێن و هەرلەوان پەیڕەوی دەکەن بەمەبەستی گێرە شێوێنی و لادانی خەڵکی لەڕێگای ڕاست و خوڵقاندنی گومان بۆیان وەیان هەر چۆنێك دڵیان حەزبکا مانایان بکەن و تەفسیری بۆبکەن لەکاتێکدا تەفسیرو لێکدانەوەی مانا ڕاستەکەیان خوا نەبێ کەسێکی تر نازانێ ئەوانەش کە لەزانستدا ڕۆچوو و دامەزراوو زۆر زانان دەڵێن: ئێمە باوەڕمان بە (متشابهە) هەیە هەردوو بەشەکەی قورئان(محکمو متشابهە) لەلایەن پەروەردگارمانەوەیە خۆ لەڕاستیدا تەنها خاوەن بیرو پیاوە زیرەك و دڵ وشیارەکانن، بەوردیی بیر ئەکەنەوە سودی لێ وەردەگرن و لەم حەقیقەتە**

تێدەگـەن (٧) ئـەو ژیـرو تێگەیـشتوانە دەڵـێن: پـەروەردگارمان ! دوای ئـەوەی هیدایەتتداین و ڕێنماییت کردین، دڵەکانمان لە ڕێی هەقی خۆت لامـەدە، هـەتا بکەوینـە شوێنی فیتنە خوازەکان. وە لە لای خۆتەوە ڕەحمەتمان پـێ ببەخـشەو دڵمـان لەسـەر هـەق دابمەزرێنـە بـە راسـتی هـەر ئـەتۆی بەخـشندە و بەخـشێنەری هەرەمـەزن (٨) پەروەردگارمان! بەراستی هەر تۆ کۆکەرەوەی خەڵکیت (بۆ پاداشتو تۆڵە) بـۆ ڕۆژێك کە بۆ هاتنی گومانێك نییە بە راستی خوا لە بەڵێنو وەعـدەکانی خـۆی لانـاداو پـەیمان ناشکێنێ (٩).

خـوای گـەورە هـەواڵی پێـداوین قورئـانی دابەزانـدووەو ئایـاتی(محکمـات)ی تێدایـە ماناکـەی ڕوون و ئاشـکرایەو لەتەفـسیرکردنیدا پێویـستی بـە هـیتر نییـەو ئایـاتی (متشابهات)ی دابەزاندووە لە تەفسیرکردنیدا پێوستی بەجگە لەخۆیـەتی لەکیتابەکـەی خواو سـوننەتی پێغەمبەرەکـەی (ﷺ)، ئـەویش وەکـو (المطلـق والمقیـد) و(المجمـل و المـبین)و (الناسـخ و المنـسوخ) هـەموو ئەوانـە لەکـەلامی خـوادا هەیـە، لـە قـسەکانی پێغەمبەرەکەیـدا (ﷺ) هەیـە، جـا لـەڕێ لادەران ئایـەت و فـەرموودە (متـشابهە)کـان وەردەگرنو واز لە(محکم)ەکان دەهێنن چونکە فیتنەیان دەوێو دەڵێن: ئێمـە کـەلامی خـــواو پێغەمبەرەکـــەی (ﷺ) دەکەینـــە بەڵگـــە، لەکاتێکـــدا لایـــەکیان وەرگرتـــووە کە(متشابە)و ئەو لایەکەی تری وازی لێ دێنن کە تەفسیری دەکات و ڕوونی دەکاتـەوە، (تقیـد)ی دەکـاتو ڕوونـی دەکاتـەوە، بـەڵام ئەوانـەی شـارەزای تـەواون لەعیلمـدا و دامەزراون تێیدا دەڵێن: (كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا)جا (متشابهەکان) دەگێڕنەوە بۆ(محکم)ـەکان ئەویش تەفسیری دەکاتو ڕوونی دەکاتەوە بۆیان، بۆیە بەهەموو قورئان کار دەکـەن و بە هەموو سوننەت کاردەکەن و دەڵێن: (كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا).

بەڵام لەڕێ لادەران لایەکی وەردەگـرن و واز لـە لایەکـەی تـری دەهێـننو دەڵـێن:- ئەمە لە قورئاندایە، بەڵێ راستە ئـەوە لەقورئاندایـە بـەڵام ئـەوە لـەخودی خۆیـدا ڕوون

نییەو پێویستی بە ڕوونکردنەوەیە، خوای گەورە خۆی لەئایەتێکی تردا ڕوونی کردووەتەوەو پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەچەندین فەرموودەی (صحیح)دا ڕوونی کردووەتەوە جا کەلامی خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەگێڕنەوە بۆ یەکتر، هەندێکی ئەوانیتر تەفسیر دەکات، هەندێکی ئەوانیتر پشت ڕاست دەکاتەوە، هەندێکی ئەوانیتر ڕووندەکاتەوە، ئەمە ڕێگای زاناکانە، بەڵام لەڕێ لادەران هەندێکی قورئان وەردەگرن و واز لەهەندەکەی تری دەهێنن، ئەمەش لەهەموو کاتو شوێنێکدا هەیە، هەندێکیان بە ئەنقەست دەیکاتو گومڕاکردنی خەڵکی دەوێ، هەندێکیان بە نەفامی دەیکەن چونکە خۆی بەزانا دەزانێو کەچی نازانێ، (علم الاصول)ی نەخوێندووە، هەروەها (علوم القرآن) و (علوم الحدیث)و (المصطلح)و (اصول الفقه)یان نەخوێندووە، ئەم بابەتانەی نەخوێندووە، ئەوپەڕی ئەم مەسەلەیە ئەوەیە ئەو کەسە زۆر دەخوێنێتەوەو زۆر لەبەر دەکات بۆیە وادەزانێ زانایە، ئەگەر ئەو زۆر بخوێنێتەوەو زۆر لەبەر بکات، بەڵام بنەماکانی عیلم و ڕێساو یاساکانی لانەبێ، چونکە ئەو لەسەر دەستی ئەهلی عیلم فێر نەبووە، ئەم کەسە لەسەر نەفامییەو لەهەمان کاتدا گومڕایە، چونکە ئەو ڕێگایەی لەسەری دەڕوات ڕێگای گومڕاییە، بابەت و کارەکانی دین و بابەتەکانی ئەحکامی شەرعی پێویستی بە عینایەتە، پێوستی بە فێربوونە، پێویستی بە وەرگرتنییەتی لەسەر دەستی ئەهلی عیلم، جا ئەوان لەنێوان دوو کاردان:-

یان لایداوەو دەزانێ هەڵەیەو بەڵام گومڕاکردنی دەوێتو دەڵێت: ئەمە ئایەتەو ئەمە فەرموودەیەو منیش لەقورئان و فەرموودەوە بەڵگە دەهێنمەوەو خەڵکی هەڵدەخەڵەتێنێ.

بەڵام کەسی نەفام نازانێ ڕێگاکانی بەڵگە وەرگرتن چۆنە، ڕێگای تێگەیشتنی دەقەکان نازانێ، ئەم بابەتە نازانێ، چونکە ئەو فێر نەبووە لەسەر دەستی ئەهلی عیلم بەڵام تەنها لەسەر کاغەزەکان فێر بووە.

جا کارەکە زۆر ترسناکە، بۆیە پێویستە لەسەر قوتابیانی زانستو زانیاری بایەخ بەم کارە بدەن و بەجوانی و حەقیقی لەسەر دەستی ئەهلی عیلم خۆیان فێر بکەنو لەسەر دەستی چاوڕوونەکان ئەگەر ئەوان هیدایەت و خەیریان دەوێ، ئەگەر نا مەسەلەکە زۆر ترسناکە، کارەکە تەنها خۆیان ناگرێتەوە، بەلام جگە لەخۆیان دەگرێتەوە ئەوانەی چاویان لێ دەکەن و شوێنیان دەکەون، جا بەڵگەکانی شەرع بە یەکترەوە بەستراون، حوکمە شەرعییەکان بە یەکترەوە بەستراون، ئەو کەسەی ئەو پەیوەندییەی نێوانیان ببچڕێت ئەوا ئەو شتەی بچڕاندووە کە خوای گەورە فەرمانی بەگەیاندنی کردووە، دەبێتە یەکێك لەو کەسانەی خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت: (وَيَقْطَعُونَ مَا أَمَرَ اللَّهُ بِهِ أَنْ يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ أُولَئِكَ لَهُمُ اللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوءُ الدَّارِ (٢٥) الرعد) پەنا بەخوا.

مەبەست لە: (ولا تقس شيئا) مەبەستی (قیاس)ی پووچەڵە.

بۆ نمونە خوای گەورە دەفەرموێت: (وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنْكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنْفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا) البقرة/٢٣٤) لەو ئایەتەی پاش ئەو هاتووە دەفەرموێت: (وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنْكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا وَصِيَّةً لِأَزْوَاجِهِمْ مَتَاعًا إِلَى الْحَوْلِ) البقرة/٢٣٤) عیددەی ئەو کەسەی پیاوەکەی مردووە داینراوە بەساڵێکی تەواو، کام لەم دوو ئایەتە وەردەگرێت؟ زانایان لەنێوان هەردوو ئایەتەکەدا (جمع)یان کردووە، کەوا ئایەتە دواییەنەکە لەسەرەتاوە بووە، ئەو کەسەی مێردەکەی دەمرێت دەبێت یەك ساڵی تەواو لەماڵەکەیدا بمێنێتەوەو لەعیددەدا بێت، ئەمجار خوای گەورە سووکی کردەوەو ئەو ئایەتەی دابەزاند کە فەرموویەتی: (وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنْكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنْفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ) واتە: گەیشتنە چوار مانگ و دە ڕۆژ، (فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِي أَنْفُسِهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ (٢٣٤)) تاوانی نییە ئەگەر لەعیددەکەی دەرچوو ئەوا شوو بکات چونکە عیددەکەی تەواو بووە.

خوای گەورە فەرمانی کردووە بەبڕینی دەستی دز و دەفـەرموێت: (وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا) المائدة/٣٨)

کام لەدوو دەستی دەبڕدرێتەوە؟

لەچی جێگایەکەوە دەبڕدرێت؟

ئەو مەبلەغە چەندە دەستی لەپێناویدا دەبڕدرێت؟

هەموو ئەمانە لەقورئاندا نییە، بەڵکو ئەمـە لەسـوننەتی پێغەمبـەردا (ﷺ) هـاتووە کـەخوای گـەورە ڕوونکردنـەوەی قورئـانی گرتووەتـە ئەسـتۆی، ئـەویش ئـەوەی ڕوونکـردەوە کەئـەو دەسـتەی دەبڕدرێـت دەسـتی ڕاسـتەو و برینەکەشـی دەبێـت (مفصل)ی دەستەوەوە بێت، نابێت ببڕدرێت ئیللا مەگەر نیسابی دزییەکە بگاتـە سـێ درهەم یان چارەکە دینارێك، جا سوننەت قورئانی ڕوونکردووەتەوە.

خوای گەورە فەرمانی بەئەنجامدانی نوێژ کردووە...

چەند نوێژە؟

کاتەکانی کەیە؟

ژمارەی ڕکاتەکانی چەندە؟

کێ ئەمەی ڕوونکردەوە؟

ئەو کەسە پێغەمبـەری خودایـەو(ﷺ) لەسـوننەتدا ڕوونـی کردووەتـەوە، سـوننەت قورئـان تەفـسیر دەکـات و ڕوونـی دەکاتـەوە، دەلالـەتی بـۆ دەکـات، جـا مەسـەلەکە پێویستی بەعیلمە، پێویستی بە چاوڕوونییە، پێویستی بەتێگەیشتنە لەدینی خوادا.

**هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت:** (لا ترجعوا بعدي كفارا يضرب بعضكم رقاب بعض)[٣٣٥] **ئەمە بەڵگەیە هەر کەسێ کەسێکی ئیماندار بکوژێت دەبێتە کەسێکی کافرو لەدین دەردەچێت،بەڵام خوای گەورە دەفەرموێت:** (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالْأُنْثَى بِالْأُنْثَى فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ) البقرة/١٧٨) **کەسی بکوژی بەبرای کوژراو ناوناوە لەو ئایەتە کە دەفەرموێت:** (مِنْ أَخِيهِ) **واتە: کوژراو، ئەمەش دەلالەت دەکات بکوژ لەئیسلام دەرناچێت، برایەتی ئیمانی بەردەوامەو دەمێنێ، کەواتە مەبەست بەکوفر لەو فەرموودەدا:** (لا ترجعوا بعدي كفارا) **کوفری بچووکە خاوەنەکەی لەئیسلام دەرناکات، هەروەها ئەو ئایەتەی کەدەفەرموێت:** (وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا) الحجرات/٩) **لەئیمانداران، دەلالەت دەکات بەهۆی کوشتاری نێوان ئیماندارانەوە ئیمان ناڕوات و لەناو ناچێت، بەڵکو ئەمە تاوانێکە لەتاوانە گەورەکان و کوفری بچووکە ئەمجار فەرمووی:** (إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ) **ئەوانەی کوشتار دەکەن بەبرا ناوی بردوون، بۆیە پێویستە لەم بابەتانە بکۆڵینەوەو بەجوانی لەدینەکەی خوا تێبگەین، عیلم لەسەرچاوەو هەڵگرانییەوە وەرگرین.**

**هەروەها چۆن لەقورئاندا ئایاتی (متشابهات) هەیە بەو شێوەیە لە فەرموودەکانیشدا (متشابهات) هەیە، هەندێکیان دەگێڕدرێتەوە بۆ هەندەکەی تر، جا هەندێکیان هەندەکەی تر ڕوون دەکەنەوە، هەندێکیان هەندەکەی تر تەفسیر دەکەن.**

٣٣٥ / متفق عليه : أخرجه البخاري (١٢١) ومسلم (٦٥) .

**﴿١٥٧﴾ نوسەر دەڵێت: (ولا تطلب من عندك حيلة ترد بها على أهل البدع فإنك امرت بالسكوت عنهم ولا تمكنهم من نفسك أما علمت أن محمد بن سيرين مع فضله لم يجب رجلا من أهل البدع في مسألة واحدة ولا سمع منه آية من كتاب الله عز و جل، فقيل له، فقال: أخاف أن يحرفها فيقع في قلبي شيء)[٣٣٦].**

واتە: داوا مەکە لەخۆتەوە ڕێگایەك بدۆزیتەوە بۆ وەڵامدانەوەی ئەهلی بیدعە، تۆ فەرمانت پێکراوە بێدەنگ بیت دەربارەیان (بەرانبەریان)، زاڵیان مەکە بەسەر خۆتدا، ئەی نازانی محمدی کوڕی سیرین لەگەڵ ئەو هەموو فەزڵەیدا وەڵامی کابرایەکی ئەهلی بیدعەی نەدایەوە لەیەك مەسەلەداو گوێبیستی ئایەتێك لەکیتابەکەی خوا نەبوو لەئەوەوە، پێیان گوت، ئەویش فەرمووی:- لەوە دەترسم تەحریفی بکات و لەدڵمدا جێگیر بێت.

ڕاڤە/

مەبەست لە: (ولا تطلب من عندك حيلة ترد بها على أهل البدع).

ئەگەر ویستت وەڵامی ئەهلی بیدعە بدەیتەوە، ئەوا بەنەفامییەوە (نەزانینەوە) وەڵامیان مەدەرەوە چونکە ئەمە بەڵاکە لەسەر بەڵاکە زیاد دەکات، بۆیە بەعیلمەوە نەبێ وەڵامیان مەدەرەوە، ئەگەر عیلمت پێ بوو و ئامادەییت تێدا بوو بۆ وەڵامدانەوەیان ئەوا وەڵامیان بدرەوە ئەگەر نا ئەوا مەچۆ ناو ئەو مەیدانەوە، نەوەك ئەوەی خراپی دەکەیت زۆرتر بێت لەوەی چاکی دەکەی، بە ئارەزووی خۆت وەڵامیان

٣٣٦ / رواة الدارمي والفريابي وابن وضاع وابن بطة .

مەدەرەوە یان ئەوەی لە بیرۆکەتدا بێت، وەلآمیان مەدەرەوە ئیللا بەعیلمەوە نەبێ ئەگەر نا ڕاوەستە.

مەبەست لە: (فإنك امرت بالسكوت عنهم).

ئەگەر عیلمت پێ نەبوو ئەوا بێ دەنگ بە، بەڵێ، ئەو ڕێگایەی ئەوانی لەسەرە ڕقت لێی بێ و بەدڵت ئینکاری لێ بکە بەلآم لەگەڵیاندا مەچۆرە ناو وەلآمدانەوەوە بەبێ عیلم جا ئەوەی خراپی دەکەی لەوە زۆر ترە چاکی دەکەیت.

مەبەست لە: (ولا تمكنهم من نفسك).

چونکە ئەگەر بەنەفامییەوە وەلآمیان بدەیتەوە ئەوا زاڵیان دەکەیت بەوەی ئەوان وەلآمی تۆیان داوەتەوەو سەردەکەون بەسەرتدا، ئەو هەلآنەی تۆ کردووتە باسی دەکەنو تۆ دەبیتە کەسێکی هەڵەکار، بەلآم ئەگەر بە بەڵگەو عیلمەوە وەلآمت دایەوەو ئەوا ئەوان ناتوانن وەلآمت بدەنەوە.

مەبەست لە: (أما علمت أن محمد بن سيرين مع فضله لم يجب رجلا من أهل البدع في مسألة واحدة).

محمدی کوڕی سیرین یەکێکە لەگەورە شوێنکەوتووان (كبار التابعين)و یەکێکە لە زانا بەناوبانگەکان،لەگەڵ ئەوەشدا نەچووە نێو باسو وەلآمدانەوە لەگەڵ ئەو پیاوەدا، چونکە وادەبینێ وەلآمدانەوەی ئەو کابرایە سوودی نییە، چونکە پرسیارەکەی پرسیارێکی عیلمی نییە بەڵکو پرسیاری خۆبەزلزانە، ئەمەش لەحیکمەتەوەیە، چونکە مەبەستی خراپەکارانو ڕواندنو وروژاندنی خراپەیە، ئەو کاتێ هەستی بەمەکردو ئەوان لەپرسیارەکەیاندا ڕێنموییان ناوێ و حەقیان ناوێت، بەڵکو تەنها تەشویشیان دەوێت بۆیە بەرانبەریان بێ دەنگ بوو وازیان لێ هێنا، شاعریش دەڵێت:

إذا نطق السفيه فلا تجبه		فخير من إجابته السكوت[٣٣٧]

---

٣٣٧ / رواه إبن أبي الدنيا في كتاب (الصمت وآداب اللسان) (ص/٣٠٢) عن الشاعر المؤمّل .

**مەبەست لە:** (ولا سمع منه آية من كتاب الله عز و جل).

**ئەگەر کەسێك وتی: ئایەتێکت بۆ دەڵێم یان دەمانەوێ بگەڕێین بەدوای ماناکەیدا، لەکاتێکدا ئەو ماناکەی دەزانی و ئەو مەبەستی ڕێنمویی کردن نییە ئەوا وەڵامی نادرێتەوەو ئایەتی بۆ تەفسیر ناکرێت.**

**مەبەست لە:** (فقيل له، فقال: أخاف أن يحرفها فيقع في قلبي شيء).

**ئەگەر بواری پێ بدرێت ڕەنگە شتێك لە گومانەکەی بچێتە دڵی (ابن سيرين)ەوە جا ئەویش داخستنی ئەم دەرگایەی دەوێت.**

**﴿١٥٨﴾ نوسەر دەڵێت: (وإذا سمعت الرجل يقول: إنا نحن نعظم الله، إذا سمع آثار رسول الله (ﷺ)، فاعلم أنه جهمي، يريد أن يرد أثر رسول الله (ﷺ) ويدفعه بهذه الكلمة، وهو يزعم أنه يعظم الله وينزهه إذا سمع حديث الرؤية[٣٣٨]، وحديث النزول[٣٣٩]، وغيره أفليس قد رد أثر رسول الله (ﷺ) إذ قال: إنا نحن نعظم الله أن ينزل من موضع إلى موضع فقد زعم أنه أعلم بالله من غيره، فاحذر هؤلاء، فإن جمهور الناس من السوقة وغيرهم على هذا الحال، وحذر الناس منهم).**

واتە: ئەگەر گوێت لەکەسێك بوو وتی: ئێمە خوا بەمەزن دەزانین -کاتێ باسی فەرموودەکانی پێغەمبەری (ﷺ) بۆ بکرێت- ئەوا بزانە ئەو کەسە جەهەمییە، دەیەوێ فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕەد بکاتەوە بەو وشەیە، لەکاتێکدا ئەو بانگەشەی ئەوە دەکات دەیەوێ خوای گەورە بەمەزن بزانێ و بەپاکی ڕابگرێ کاتێ فەرموودەی بینینی خوای گەورەو فەرموودەی دابەزین و جگە لەوە ببیستێ، ئایە ئەو فەرموودەکانی پێغەمبەری خوای (ﷺ) ڕەد نەکردووەتەوە کاتێ دەڵێ: ئێمە خوای گەورە بەمەزن دەزانین لە جێگایەکەوە دابەزێتە جێگایەکی تر، جا ئەو بانگەشەی ئەوەی کردووە ئەو شارەزاترە دەربارەی خوا لەجگە لە خۆی.

بۆیە ئاگاداری ئەوانە بە، چونکە زۆربەی عەوامی خەڵکی و جگە لەوان لەسەر ئەو حاڵەتەن، ئاگاداری خەڵکی بکەرەوە لێیان.

---

٣٣٨ / سبق تخريجه .

٣٣٩ / سبق تخريجه .

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (وإذا سمعت الرجل يقول: إنا نحن نعظم الله، إذا سمع آثار رسول الله (ﷺ)، فاعلم أنه جهمي).

**چونکە کەسی جەهەمی ئەگەر گوێی لەفەرموودەی سیفات بێت وەکو فەرموودەی دابەزین و فەرموودەی بینینی خوای گەورە لەلایەن ئیماندارانەوە، دەڵێت: ئێمە خوای گەورە بەمەزن دەزانین، واتە: ئێمە بەگەورەی دەزانین لەو جۆرە فەرموودانە، چونکە لای ئەو مانای لێکچوونی خوای گەورە بەدروستکراوەکانی دەکات، ئەمەش بە کەمزانینی خوای گەورەیە، جا لای ئەو فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بەکەمزانینی خوای تێدایە و لێکچوونی تێدایە، جا ئەو نایەوێ خوای گەورە بەمەزن بزانێت مەزنێتییەکی ڕاستی، بەڵام ئەو ئامانجێکی هەیە بە وتنی ئەو وشەیە، ئەو دەیەوێ کار بەو فەرموودانە نەکات.**

**مەبەست لە:** (يريد أن يرد أثر رسول الله (ﷺ) ويدفعه بهذه الكلمة).

**واتە: بە وتنی وشەی** (نعظم الله) **جا ئەوە وشەیەکی حەقە بەڵام ناحەقی لێی دەوێ (مەبەستی ناحەقە) مەبەستی بەوتنی ئەوە وەلآمدانەوە فەرموودە** (صحيح)**ەکانی سیفاتە، کە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) پێمان گەیشتووە، چونکە ئەو وادەزانێ بە کەمزانینی خوای تێدایە.**

**مەبەست لە:** (فقد زعم أنه أعلم بالله من غيره).

**واتە: ئەو زیاتر دەزانێ دەربارەی خوا لەپێغەمبەرەکەی (ﷺ)، ئایە لەپاش ئەم کوفرە کوفری تر هەیە؟ پەنا بەخوا.**

**مەبەست لە:** (فإن جمهور الناس من السوقة وغيرهم على هذا الحال).

السوقة: **واتە عەوامی خەڵکی،ئەگەر وشەی** (نعظم الله) **ببیستین ئەوا قسەی جەهەمی وەردەگرن بەڕواڵەتی چونکە ئەوان مەبەستی نازانن.**

**﴿١٥٩﴾ نوسەر دەڵێت: (وإذا سألك أحد عن مسألة في هذا الباب وهو مسترشد فكلمه وأرشده، وإذا جاءك يناظرك فاحذره، فإن في المناظرة: المراء والجدال والمغالبة والخصومة والغضب، وقد نهيت عن جميع هذا جداً، وهو يزيل عن طريق الحق، ولم يبلغنا عن أحد من فقهائنا وعلمائنا أنه ناظر أو جادل أو خاصم).**

واتە: ئەگەر کەسێك پرسیاری لێ کردی دەربارەی ئەم بابەتو مەسەلەیە لەکاتێکدا ئەو کەسێکی (مسترشد)بوو (واتە: داوای ڕێنمویی دەکات) ئەوا قسەی لەگەڵ بکەو ڕێنمویی بکە، ئەگەر هات بۆلات بۆ (مناظرە) ئەوا ئاگاداری بە، چونکە لە(مناظرە)دا: دەمەقاڵەو جیدال و زاڵبوون و ڕکەبەرایەتی و تووڕەبوون هەیە، تۆش دەربارەی هەموو ئەوانە نەهیت لێ کراوە ئەوەش خەڵکی لەسەر ڕێگای حەق لادەدات، لە هیچ زانایەك لەزانایانمانو فەقیهێك لە فوقەهاکانمانەوە نەهاتووە هەرگیز (مناظرە) یان جیدال یان ڕکەبەرایەتی کردبێ.

ڕاڤە:

مەبەست لە: (وإذا سألك أحد عن مسألة في هذا الباب وهو مسترشد فكلمه وأرشده).

کەسی پرسیارکار دەبێتە دوو بەشەوە:-

بەشی یەکەم: پرسیارکارێکی (مسترشد) واتە ڕێنمویی دەوێت، ئەمە حەقی هەیە لەسەرت وەڵامی بدەیتەوە و بۆی ڕوون بکەیتەوەو هانی بدەیت.

بەشێکی تر: پرسیارکارێکی لاسارو ڕق ئەستوور گومان دەخاتە دڵی خەڵکییەوە، ئەوا ئەو کەسە وریای بەو لەگەڵیدا مەچۆرە نێو ئەو مەیدانەوە، چونکە ئەگەر تۆ وازت

لێ هێنا ئەوا کارەکە یەکلا دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر لەگەڵیدا چوویتە ناو مەسەلەکەوە ئەوا کارەکە خراپتر دەبێت، جا ئەو دەیەوێت فیتنەکە بجوڵێنێ.

مەبەست لە: (في هذا الباب) واتە: باسی ناوو سیفەتەکان.

مەبەست لە: (وإذا جاءك يناظرك فاحذره).

ئەگەر مەبەستی (مناظرە)و (مجادلە) بوو ئەوا وازی لێ بهێنە، مەچۆرە ناو باسەکەیەوە، چونکە ئەو گومڕایی دەوێتو هەڵ خەڵەتاندنی دەوێت.

مەبەست لە: (فإن في المناظرة: المراء والجدال والمغالبة والخصومة والغضب).

بۆیە کاتێ کابرایەك هاتە ژوورەوە بۆلای ئیمامی مالیك، کاتێ ئەو لەمەجلیسی خۆیدا بوو، وتی: خوای گەورە دەفەرموێت: (الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى (٥) طه) چۆن ئیستوای کردووە؟ مالیك سەری داخست تاکو لەشەرمی خوای گەورەدا ئارەقەی کرد، ئەمجار سەری بەرزکردەوەو فەرمووی:

(ئیستواکەی ئاشکرایەو چۆنییەتیەکەی نەزانراوە، باوەڕ بوون پێی واجبەو پرسیارکردن دەربارەی بیدعەیە و من تۆ نابینم ئیللا کەسێکی فیتنەی)[340].

بۆیە فەرمانی کردو ئەو کابرایەیان دەرکرد، چونکە ئەو مەبەستی فێربوون نییە بەڵکو مەبەستی لێکچواندنە لەسەر خەڵکیو نەفی کردنی ئیستوایەو تەفسیرکردنییەتی بە تەفسیرێکی ناڕاست.

---

٣٤٠ / رواه عثمان الدرامي وأبو نعيم واللالكائي والصابوني والبيهقي وابن قدامة .

**مەبەست لە:** (ولم يبلغنا عن أحد من فقهائنا وعلمائنا أنه ناظر أو جادل أو خاصم).

**واتـە: ئـەم جـۆرە (مخاصـمە)ی نـەکردووە مەبەسـت تیایـدا ورووژانـدنی فیتنـەو دروسـتکردنی گومـان لـەدڵی خـەڵکی داو بڵاوکردنـەوەی ئـاژاوە و سـەرلێتێکدان، هـیچ یەکێك لەپێشەوایان و زانایان و پێشینی ئـەم ئوممەتـە، چـووبێتە نـاو ئـەو مەیدانـەوە، بەڵکو ڕێنمویی ئەو کەسانە دەکەن ڕێنموییان دەوێ نەك پرسیارکارێکی لاسار سـوودی نـاوێ، بـەڵکو تـەنها ورووژانـدنی فیتنـەو جیـدالو (منـاظرە)ی دەوێ، دینـیش ڕوون و ئاشکرایە سوپاس بۆ خوا، خـوای گـەورە دەفـەرموێت:** (مَا يُجَادِلُ فِي آيَاتِ اللَّهِ إِلَّا الَّذِينَ كَفَرُوا) غافر/٤) **قورئانیش ئاشکراو ڕوونە، هیچ جیدالی تیادا نییە، ئیمانمان پێی هەیـەو ئەوەی ئەو هێناویەتی دەیسەلمێنین، باوەڕمان پێی هەیـە بـە(لفـظ)و مانـاو کـاری پـێ دەکـەین هـەروەکو ئـەوەی هـاتووە لـەخواو پێغەمبەرەکەیـەوە (ﷺ)، ئەمـە واجبـی سەرشانمانە.**

**نوسەر دەڵێت:** (قال الحسن البصري: الحكيم لا يماري ولا يداري حكمته ينشرها إن قبلت حمد الله وإن ردت حمد الله)

وجاء رجل إلى الحسن فقال: (أنا أناظرك في الدين) فقال الحسن: أنا قد عرفت ديني فإن ضلَّ دينك فاذهب فاطلبه).

**واتە: حەسەنی بەصری فەرموویەتی: کەسی دانا جیدالی بـێ سـوود ناکـاتو نـەرمی نوانـدن لـە گـەڵ کـەس ناکـات (لـە سـەر حیـسابی دینەکـە) ئـەو حیکمەتەکـەی خـۆی بڵاودەکاتەوە، ئەگەر وەرگیرا ئەو سوپاسی خوا دەکات و ئەگەر ڕەدکرایەوە ئـەوا هـەر سوپاسی خوا دەکات).**

**کابرایەك هات بۆلای حەسەنو وتی: من (مناظرە)ت لە گەڵدا دەکەم دەربارەی دین، حەسەن فەرمووی: من دینەکەی خۆم زانیوە،جا ئەگەر تۆ دینەکـەی خـۆت بزرکـردووە ئەوا برۆ بەدوایدا بگەڕێ.**

راقه/

مەبەست لە: (قال الحسن البصري: (الحكيم لا يماري ولا يداري).

الحسن البصری: (الحسن کوڕی ابی الحسن البصری)یە پێشەوایەکی بەناوبانگە لەشوێنکەوتووانە، دەڵێت:

(الحكيم): ئەو کەسەی خاوەنی حیکمەتە، حیکمەتیش بریتی یە لە: دانانی هەرشتێك لە جێگای خۆیدا، هەروەها (الحكيم) بەمانای فەقیهیش دێت، جا (الحكيم) دوو مانای هەیە:

مانای یەکەم مەبەستی دانانی هەرشتێکە لەجێگای خۆیدا، مەبەستی هەروەها (فەقیهە) چونکە حیکمەت بریتییە لە(فیقە)و زانینی مەبەستی خواو پێغەمبەرەکەیەتی(ﷺ).

(لا يمارى): واتە جیدال ناکات جیدالێکی نەزۆك مەبەست لێی سوود وەرگرتن نەبێ.

(ولا يدارى) واتە: نەرمی نانوێنێ بەرانبەر ئەهلی ناحەق و تەسلیمیان نابێت.

مەبەست لە: (حكمته) واتە: عیلمەکەی.

مەبەست لە: (ينشرها، إن قبلت حمد الله)؟

ئەمە داواکراوەو ئەگەر لێی وەرنەگیرێ ئەوەی لەسەربووە کردوویەتیو حوججەکەی گەیاندوە.

(حمد الله) چونکە ئەو ئیقامە حوججەی کردوەو حوججەکەی گەیاندووەو ئەوەی لەسەری بووە گەیاندوویەتی، هیدایەتدانی دڵەکانش بەدەست خوایە.

**مەبەست لەو قسەیەی حەسەن:** (أنا قد عرفت ديني، فإن ضلّ دينك فاذهب فاطلبه).

**ئـەم وشـەیە بەڕاسـتی حیکمەتـە، کـاتێ وتـی:- مـن (منـاظرە)ت دەکـەم لەدینـدا، حەسەن گوتی:** (انا اعرف دینی) **واتە: مـن لەگومانـدا نـیم تـاکو (منـاظرە)و (مجادلـە)ت لەگەڵ بکەم، بەڵام تۆ ئەگەر دینەکەت لا نییە ئەوا بڕۆ بەدوایدا بگەڕێ.**

**نوسەر دەڵێت:** (وأعلم أن الدين هو التقليد، والتقليد لأصحاب رسول الله)

**واتە: بزانە دین بریتییە لە (تەقلید) لاسایی کردنەوە، لاسایی کردنـەوەش دەبـێ بـۆ هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بێت.**

**ڕاڤە/**

**لەپێشدا ڕاڤەی ئەمە کرا.**

**نوسەر دەڵێت:** (وسمع رسول الله (ﷺ) قوما على باب حجرته يقول أحدهم: ألم يقل الله كذا؟ ويقول الآخر: ألم يقل الله كذا؟ فخرج مغضبا فقال: (أبهذا أمرتكم؟! أم بهذا بعثت إليكم؟! أن تضربوا كتاب الله بعضه ببعض؟!)[٣٤١] فنهاهم عن الجدال.

**واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) گوێی لە کۆمەڵێك بـوو لـەپێش ژوورەکەیـدا یـەکێکیان دەیگوت: ئایە خوای گەورە وای نەفـەرمووە؟ ئـەویتر دەڵێـت: ئایـە خـوای گـەورە وای نەفەرمووە؟ ئەویش بەتووڕەییەوە دەرچووە دەرەوەو گوتی: ئایە بەمە فەرمانم پێتان کردووە؟ یان بۆ ئەمە بۆتان ڕەوانە کراوم؟ کیتابەکەی خوا بەیـەکتردا بـدەن)؟! بۆیـە نەهی جیدالکردنی لێ کردن.**

---

٣٤١ / حسن : أخرجه أحمد (١٧٨/٢) وحسنه الشيخ الألباني في (المشكاة) (٢٣٧) .

ڕاڤە/

(المنـاظره) لـە شـتێکی شـاراوەدا دەکرێـت نازانرێـت حـەق لای کێیـە، جـا ئەمـە (مناظره)ی تێدا دەکرێت لەبەر ئەوەی حەق ئاشـکرا بێـتو ڕوون ببێتـەوە لەگـەڵ کـام دوو کۆمەڵدایە یان لەگەڵ کام دوو پیاودایە، بـەڵام کـاتێ حەقەکـە ئاشـکرا بـوو و ڕوون بوەوە ئەوا بە (المناظره) ڕازی نابین، چونکە (المنـاظره) دەیـەوێت کاریگـەری لەسـەر حەق بێت و خەڵکی لەحەق لادات.

مەبەست لە: (أبهذا أمرتكم...).

ئەمە فەرموودەیەکی مەزنـە، کـاتێ پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) گـوێی لەکۆمـەڵێك بـوو موجادەلە لەقورئانـدا دەکـەنو ئایەتـە (متـشابه)کـان وەردەگـرنو دەیکەنـە حوججـە، هەموو ئەو ئایەتە وەردەگرێ و دژی ئایەتەکەی ترە، دەڵێن:

(ألم يقل الله كذا؟) ئایە خوای گەورە وای نەفەرمووە؟

ئەمجار ئەویتر دەڵێت: (ألم يقل الله كذا؟) ئایە خوای گەورە وای نەفەرمووە؟

جـا ئەمـە ڕێگـای لـەڕێ لادەرانـە،خوای گـەورە دەفـەرموێت: (هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ (٧)ال عمران) بۆیە فەرمووی: (أبهذا أمرتكم؟!) ئایە بە ئەمە فـەرمانم پێتـان کردووە؟ پێغەمبەری خـوا (ﷺ) نـەهی لەمـە کـردووە، فـەرمووی: (لا تضربوا كتاب الله بعضه ببعض؟!) کیتابەکەی خوا هـەرگیز بەیـەکتردا نادرێـت و هـەرگیز دژ بەیـەکی تێـدا نییە، ئەگەر کەسی زانا خوای گەورە تەوفیقی بـدات بـۆ تێگەیـشتنی، بـەڵام ئـەوە لای کەسی نەفامە وا دەزانێ دژ بە یەکی تێدایەو دەیدات بەیەکدا، ئـەو کەسـەی بنـەماکانی عیلمی (صحيح)ی لا نییە.

**نوسەر دەڵێت:** (وكان ابن عمر يكره المناظرة، ومالك بن أنس ومن فوقه ومن دونه، إلى يومنا هذا، وقول الله عز و جل أكبر من قول الخلق، قال الله تعالى: (وما يجادل في آيات الله إلا الذين كفروا))

وسأل رجل عمر بن الخطاب فقال: (ما (والناشطات نشطا)؟ فقال: لو كنت محلوقا، لضربت عنقك[٣٤٢].

وقال النبي (ﷺ): (المؤمن لا يماري ولا أشفعُ للمماري يوم القيامة فدعوا المراء لقلة خيره)[٣٤٣].

**واتە:(ئیبن عومەر) حەزی لە(مناظرە) نەدەکرد، وە(مالك ی کوڕی ئەنەس) و ئەوانەی سەرووی ئەو و ئەوانەی خوارەوەی ئەو تاکو ئەمڕۆ، ئایەتی خوای گەورە گەورەترە لەقسەی خەڵکی، خوای گەورە دەفەرموێت:** (مَا يُجَادِلُ فِي آيَاتِ اللَّهِ إِلَّا الَّذِينَ كَفَرُوا (٤)غافر).

**کابرایەك پرسیاری کرد لە (عومەری کوڕی خەتتاب) فەرمووی:** (وَالنَّاشِطَاتِ نَشْطًا (٢)) **چییە؟ فەرمووی: ئەگەر سەرت تاشراو بوایە، ئەوا لەگەردنتم دەدا).**

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: کەسی ئیماندار جیدالی بێ سوود ناکات و لەرۆژی قیامەتدا شەفاعەتی بۆ ناکەم، بۆیە واز لە (میرا) بهێنن لەبەر کەمی خەیرەکەی).**

**ڕاڤە:**

**مەبەست لە:** (وكان ابن عمر يكره المناظرة).

**واتە: مەبەستی ئەو (مناظرە)یە کە مەبەست تێیدا تەشویش کردنە بەسەر خەڵکی یەوە، هەر یەکەو دەیەوێ ڕای خۆی سەرخات، ئەو حەقی ناوێت بەڵکو دەیەوێ ڕاکەی**

---

٣٤٢ / رواه الدارمي (١٤٤) .

٣٤٣ / رواه الطبراني وابن حبان والآجري وابن بطة قال الهيثمي : (وفيه كثير بن مروان وهو ضعيف جدا) .

خۆی سەرخاتو زاڵ بێت بەسەر نەیارەکەیدا، ئەم جۆرە (مناظرە) نەویستراوە، بەڵام ئەگەر مەبەست تێیدا گەیشتن بەحەق بێتو زانینی حەق بێت لای هەر کەسێ بێت، ئەمجار بگەڕێنەوە بۆلای حەق ئەوا شتێکی داواکراوە.

مەبەست لە: (ومالك بن أنس ومن فوقه ومن دونه، إلى يومنا هذا).

واتە ڕقیان لە(مناظرە)یە هەرچەندە ڕەنگە هەندێ جار پێویست بێت بەڵام مرۆڤ لە کاتی خۆشیدا ناچێتە نێو (مناظرە)وە ئیللا لەکاتی پێویستدا نەبێ، ئەگەر ئامادەیی تێدا بوو هەروەها لە ئارەزووەوە دوور بوو، مەبەستی تەنها سەرکەوتنی خۆی نەبێ بەڵکو مەبەستی دەرکەوتنی حەق و ڕوونکردنەوەی حەقە، جا ئەگەر لای خۆی بێت یان لای نەیارەکەی بێت، ئەم (مناظرة)یە راستو دروستە، بۆیە لە ئیمامی شافعی یەوە هاتوە کەوا فەرمویەتی: لە گەڵ هیچ کەسێکدا (مناظرة)م نەکردوە ئیللا پێم خۆش بووە حەقەکەی لای ئەوەوە دەرکەوێت بۆ ئەوەی سوودی لێ ببینم)، چونکە ئەو مەبەستی ئارەزوو و سەرخستنی خۆی نییە، بەڵکو مەبەستی دەرخستنی حەقەو ڕوونکردنەوەی حەقە، جا ئەگەر لای خۆی بێت یان لای جگە لە خۆی بێت.

مەبەست لەو ئایەتە: (مَا يُجَادِلُ فِي آيَاتِ اللَّهِ إِلَّا الَّذِينَ كَفَرُوا (٤)غافر).

موجادەلە کردن لەئایەتەکانی خوادا مانای ئینکاری لێ کردنییەتی، ئەویش بەوە دەبێ ئایەتەکان بدرێت بەیەکدا، هەندێکیان بەرنگاری هەندەکەی تر بکاتەوە ئەوە کاری بێ باوەڕانە، بۆیە کاتێ گوێیان لێ بوو پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە نوێژەکانیدا دەیفەرموو: (یا رحمن یا رحیم) گوتیان: تەماشای بکەن ئەو بانگەشەی ئەوە دەکات تەنها یەك خوای هەیە کەچی دەڵێت: یا رحمن یا رحیم، لەخەڵکی تێکیان دەدا کەوا (رحمن) خودایەکی جودایە و (رحیم)ش خودایەکی ترە، بۆیە خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموێت: (قُلِ ادْعُوا اللَّهَ أَوِ ادْعُوا الرَّحْمَنَ أَيًّا مَا تَدْعُوا فَلَهُ الْأَسْمَاءُ

الْحُسْنَى (١١٠) الاسراء) واتە: پێیان بڵێ: لە نزاو دوعاكانتاندا ئەر ناوی پیرۆزی (الله) بەرنو یان هاوار بە هەر یەكێ لە سیفەتە پیرۆزەكانی ئەو بكەن، بۆ نمونە: وەكو (الرحمن) هەر یەكەو قەبووڵە، جا ئێوەش بەهەر ناوو سیفەتێكەوە، لەو ناوو سیفەتانە بۆ خۆی دیاری كردون دەتوانن داوای لێ بكەنو هاواری بۆ بەرن چونكە ناوی پیرۆزی خوا زۆرن ئەم دوانەیش (الله، الرحمن) هەر لەوانن ).

مەبەست لە: (وسأل رجل عمر بن الخطاب).

ئەو كابرایە ناوی (صبیغ ی كوڕی عِسل) بووە، ناوبانگی بەجیدال دەركردبوو، لەسەردەمی (عمر) دا پرسیاری لێ كرد دەربارەی (وَالنَّاشِطَاتِ نَشْطًا (٢)النازعات) چییە؟ لەكاتێكدا ئەو پێویستی بەوە نییە، ئەوەی پێویست بوو لەسەری پرسیاری لێ بكات دەربارەی دینەكەی و دەربارەی عەقیدەكەی، بەڵام پرسیاركردن دەربارەی (وَالنَّاشِطَاتِ نَشْطًا) ئەمە ئاسانەو لەكیتابەكانی تەفسیردا هەیە، پێویست بەوە ناكات لەسەری ڕاوەستی، ئەوەی پێویستە لەسەری پرسیاری لێ بكات لەشتێك لەوە گەورەترو زیاتر پێویستی پێی هەبێ، جا خۆ دەرخستن لەپرسیاركردندا نابێ (طالب العلم) خۆی پێوەی خەریك بكات و مامۆستاكەشی خەریك بكات، بەڵكو پێویستە لەمەسەلە گەورەو گرنگەكان پرسیار بكات.

مەبەست لە: (لو كنت محلوقا).

واتە سەرت تاشراو بوایە، چونكە ئەوە سیفەتی خەواریج بوو ئەوان لەو جۆرە پرسیارە دەكەن، جا ئەگەر نیشانەكەی ئەوان لەتۆدا بوایە ئەوا ئازارتم دەدا، جا ئەم پرسیارە لە جۆری پرسیارەكانی خەواریجە، چونكە ئەوان پرسیار دەكەن دەربارەی شتێك پێویستیان پێی نییە.

**مەبەست لە:** (لضربت عنقك).

**واتـە: دەمكوشـتی، چـونكە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فـەرمانی كـردووە بەكوشـتنی خەواریج، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دەفـەرموێت:** (فأينما لقيتموهم فاقتلوهم، ولئن أدركتهم لأقتلنَّهم قتل عادٍ) **ئەم خیتابە بۆ دەسـەلأتدارانەو بـۆ هـەموو كەسـێك نییـە، بۆیـە چـەك لەگەڵ خۆتدا هەڵمەگرەو هەر كەسێ بە خەواریج تۆمەتبار بكەیت ئـەوا بیكـوژی، ئەمـە پاشاگەردەنییە، ئەوەی دەكوژێت كار بەدەستانەو عومەریش كاربەدەست بوو.**

**مەبەست لە:** (المؤمن لا يماري ولا أشفعُ للمماري يوم القيامة فدعوا المراء لقلة خيره).

**میراء: بریتییە لەجیـدالێكی بـی سـوود، دەبێتـە هـۆی گومـان، كـاتی خـۆی خـەریك دەكات بەبێ سوود، میراء و مجادلەو مناظرة هەمووی یەك مانای هەیە.**

(المؤمن لا يماري) **واتە: لە نیشانەكانی كەسی ئیماندار ئەوەیە خۆی بەدوور بگرێت لـە میرائێك سوودی تێدا نییە.**

(ولا أشفعُ للمماري يوم القيامة) **بەڕاسـتی ئەمـە هەڕەشـەیەكی تونـدە لـەو كەسـەی (میراء) دەكات هەروەها ئاگاداركردنەوەی تێدایە لە(میراء)كردن.**

(فدعوا المراء لقلة خيره) **هەنـدێ لـەزانایان لەكتێبـەكانی عەقیـدەدا كـە بـە هـۆنراوە نوسیویانە فەرموویانە:**

فلا مراء وما في الدين من جدل وهل يجادل إلا كلُّ من كفر

**﴿١٦٠﴾ نوسەر دەڵێت: (ولا يحل لرجلٍ مسلم أن يقول: فلان صاحب سنة، حتى يعلم منه أنه قد اجتمعت فيه خصال السنة، فلا يقال له صاحب سنة حتى تجتمع فيه السنة كلها).**

واتە: حەڵاڵ نییە بۆ هیچ کەسێکی موسڵمان بڵێت: فلأن کەس خاوەنی سوننەتە تاکو نەزانێ ئاکارەکانی سوننەتی تێدا کۆبووەتەوە، پێی ناگوترێ خاوەنی سوننە تاکو هەموو سوننەی لا کۆ نەبێتەوە.

ڕاڤە:

تەزکییەی هیچ کەسێك مەکەو مەدحی مەکە ئیللا بە زانستەوە نەبێ (زانیارییەوە نەبێ) بۆ ئەوەی خەڵکی بەمەدحەکەی تۆ بۆ ئەو کەسە مەغرور نەبێ لەکاتێکدا واش نییە، بەڵام ئەگەر لێی کۆڵایتەوەو لەڕێگاکەیو لەعیلمەکەیو لە سەقامگیرییەکەی ئەوا ئەو کات تەزکییەی دەکەیت، بەڵام هەستی بەمەدح کردنو تەزکیەکردنیو لەکاتێکدا تۆ دەربارەی هیچ نازانی ئەوا ئەم تەزکییە زۆر ترسناکە خەڵکی بەم کەسە مەغرور دەکەیت، خۆزگە ئەو کەسانەی تەزکییەی خەڵك دەکەن ڕادەوەستان لەو کارە، تەزکییەی هیچ کەسێك ناکەن ئیللا ئەو کەسانە نەبێ مەرجەکانی تەزکییەیان تێدایە، چونکە تەزکیەکردن شایەتی دانە، جا ئەگەر تەزکییەکە ڕاست نەبێ ئەوا دەبێتە (شهادة زور).

مەبەست لە: (قد اجتمعت فيه خصال السنة).

ئاکارەکانی سوننەت بریتییە لەعەقیدەو لە عیلم و لە کارو کردەوەو لەشوێنکەوتنی سەلەفی (صالح)، بەڵام ئەو تەنها یەك ئاکاری تێدایە ئەوا حوکم مەدە بەسەریدا ئەو کەسە ئەهلی سوننەیە هەر بەپشت بەستن بەتەنها یەك ئاکار یان بە یەك شت، جا چۆنە ئەگەر کەسێك هیچ ئاکارێکی تێدا نەبێ؟

**﴿١٦١﴾ نوسەر دەڵێت: (قال عبد الله بن المبارك: أصل اثنين وسبعين هوى أربعة أهواء، فمن هذه الأربعة الأهواء تشعبت الاثنان وسبعون هوى: القدرية والمرجئة والشيعة والخوارج).**

**واتە: (عبدالله ی كوڕی المبارك) دەفەرموێت: بنەمای هەفتاو دوو ئارەزووەكە چوار ئارەزووە، جا لەم چوار ئارەزووەوە هەفتاو دوو ئارەزووەكەی لێ بووەتەوە: (القدرية والمرجئة والشيعة والخوارج).**

**ڕاڤە:**

**مەبەست لەو قسەیەی (عبدالله ی كوڕی المبارك):** (أصل اثنين وسبعين هوى أربعة أهواء، فمن هذه الأربعة الأهواء تشعبت الاثنان وسبعون هوى: القدرية والمرجئة والشيعة والخوارج).

**ئەمە دانەر لەسەرەتای پەیامەكەیدا باسی كردووەو لەوێ ڕاڤەمان كرد.**

**مەبەست لە: (الاهواء).**

**چونكە ئەوەی بووەتە هۆی جیاوازیو ناكۆكییان ئارەزووە، هەر كۆمەڵەو شوێنی ئارەزووی خۆی كەوتوە، جا ئەگەر شوێنی حەق بكەوتایەن ئەوا نەدەبوونە هەفتاو سێ كۆمەڵەوە، چونكە ئەو كەسەی شوێنی حەق بكەوێت ئەوا ئارەزوو نایكاتە چەند كۆمەڵێكەوە، هەر یەكەیان سواری ئارەزووەكەی بووە، خوای گەورە دەفەرموێت:** (فَتَقَطَّعُوا أَمْرَهُمْ بَيْنَهُمْ زُبُرًا كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ (٥٣) المؤمنون) **واتە: لەناو خۆیاندا كارو فەرمانی ئایینەكەیان پچڕ پچڕ كردو بوونە چەند گرووپ و دەستەیەكەوە، هەر گرووپەش ڕێگاو ڕێبازێكی بۆ خۆی هەڵبژارد! هەموو دەستەو گرووپێك بەو بەرنامەیەی لایانە خۆشحاڵ و دڵخۆشن).**

هەر یەکەیان شوێنی ئارەزووەکەی کەوتووە، ئارەزووەکانش هەرگیز تەواو نابن، بەڵام حەق یەك دانەیەو دابەش نابێت، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا) تەنها یەك ڕێگا (فَاتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ (١٥٣) الانعام) جا ئەو کەسەی لەڕێگای ڕاست دەرچێت ئەوا دەکەوێتە ناو ئەو ڕێچکە جیاوازانەوە هەرگیز کۆتایی نایەت.

مەبەست لە: (القدرية).

ئەوانەی قسە دەربارەی قەدەر دەکەن، چونکە باوەڕ بەقەدەر یەکێکە لەشەش ڕوکنەکەی ئیمان: (أن تؤمن بالله وملائكته وكتبه ورسله واليوم الآخر وتؤمن بالقدر خيره وشره)[٣٤٤] بەوەی خوای گەورە:

تەقدیری کردوەو لە (اللوح المحفوظ)دا و....

نوسیویەتی و....

ویستی لێ بووەو گەرەکی بووەو....

هێناویەتییە بوون...

ئەمە مەزهەبی ئەهلی سوننەو جەماعەیە، باوەڕ بە قەزاو قەدەر بەم چوار مەرتەبەیە، ئەوانەی نەیارن لەسەر دوو کۆمەڵن:

کۆمەڵی یەکەم: (القدرية النفاة): ئەوانەی نکۆڵی لەقەدەر دەکەن و دەڵێن: هەریەکەو خۆی کارو کردەوەکانی خۆی دروست دەکات، خوای گەورە تەقدیری لەسەر نەکردووە، بەڵکو خۆی و بەسەر بەخۆیی ئەنجامی داوە، ئەمەش قسەی موعتەزیلەکانو ئەوانەی هاوڕای ئەوانن.

٣٤٤ / صحيح : سبق تخريجه .

کۆمەڵەی دووەم: (القدرية المجبرة): ئەوانەی زیادەڕەوی دەکەن لە سەلماندنی قەدەرداو دەڵێن: بەندە هیچ هەڵبژاردنێك و هیچ ویستو کارێکی بەدەست نییە، بەڵکو کاری خوایە لەودا، ئەو هەروەکو پەڕێکە بەویستی با دەجولێتەوە، هەروەکو مردوویەکە لەبەر دەستی ئەو کەسەدایە دەیشۆرێ ناچارەو هەڵبژاردنی بەدەست نییە، ئەوانە پێیان دەگوترێ: (المجبرة)، زیادەڕەوییان کرد لەسەلماندنی قەدەردا _پەنا بەخوا _ تەنانەت هەر هەڵبژاردنو کارێکی بەندەکەیان لێ داماڵی و کردیانە ئەوەی ناچارە بۆ ئەنجامدانی کارەکانی، نوێژ ناکات بەهەڵبژاردنی خۆی، زینا ناکات بەهەڵبژاردنی خۆی، زەکات نادات بەهەڵبژاردنی خۆی، ڕیبا وەرناگرێ بەهەڵبژاردنی خۆی، بەڵکو ئەو ناچارە هەموو کەسێك لای ئەوان ناچارە، ئەمە قسەی (الجبرية)یە.

مەبەست لە: (المرجئة).

ئەمە لەباس و بابەتی ئیماندایە، ئیمان هەر وەکو ئەهلی سوننەو جەماعە پێناسەیان کردووە بریتییە لە:

وتن بەزمان و باوەڕ بوون بەدڵ و کارکردن بەئەندامەکان، بەگوێڕایەڵی زیاد دەکاتو بەسەرپێچی کەم دەکات.

مورجیئەکان دەڵێن: کارو کردەوەکان بەشێکی ئیمان نین، جا ئەگەر کەسێ بەدڵ باوەڕی هەبوو هەرچەندە وازی لە هەموو کارەکان هێنابێت، ئەگەر نوێژیش نەکاتو ڕۆژوو نەگرێو هیچ کارێك نەکات دەچێتە بەهەشتەوە، ئیمانیش لای ئەوان زیاد ناکاتو کەم ناکات، چونکە لەدڵیدایە، جا ئیمانی (ئەبو بەکر) و خراپترین کەس لای ئەوان وەکو یەکە چونکە لە دڵدایە.

مەبەست لە: (الشيعة).

ئەوانەن بانگەشەی ئەوە دەکەن گوایە ئەوان ئەهلی بەیتیان خۆش دەوێ، لایەنگری عەلی و نەوەکەی دەکەن و باوەڕیان وایە ئەوان ستەمیان لێ کراوەو مافیان خوراوە،

خیلافەتیش لەپاش پێغەمبەر(ﷺ) بۆ عەلی بووە، عەلی وەصی پێغەمبەری خوایەو (ﷺ) هاوەڵان ئەو خیلافەتەیان لێ سەندووەو لێ زەوت کرد، جا ئەوان ستەمکارو تاغوتن، ئەمە باوەڕی ئەوانە _پەنا بەخوا_

مەبەست لە: (الخوارج).

ئەوانەن دژی کاربەدەستان بەشمشێر دەردەچن، ئەگەر هەڵەیەکیان لێ دەرکەوت و نەگەیشتە ڕادەی کوفر، لە گوێڕایەڵی دەردەچن و موسڵمانان بەتاوانی گەورە کافر دەکەن لە خوارووی شیرکەوەیە، جا مەزهەبەکەیان لەدوو شت پێك هاتووە:_

یەکەم: دەرچوون لەدژی کار بەدەستانی موسڵمانان و گوێڕایەڵی نەکردنیان.

دووەم/ بەکافر زانینی ئەو کەسانەی تاوانە گەورەکان ئەنجام دەدەن کە لە خوارووی شیرکە، حوکم بەسەر زیناکاردا دەدەن بەوەی کافرە، بەسەر دزدا کافرە، ئەو کەسەی ریبا دەخوات کافرە، ئەمە مەزهەبی خەواریجە ئەمەشە مەزهەبێکی توندو زیادەڕەوە پەنا بە خوا، شمشێر لەدژی موسڵمانان هەڵدەگرن، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (يقاتلون أهل الايمان ويدعون أهل الأوثان)[٣٤٥] لە مێژوودا نەهاتووە خەواریج کوشتاریان لەگەڵ بێ باوەڕاندا کردبێ، بەڵکو ئەوان هەرگیز و هەردەم کوشتار لەگەڵ موسڵماناندا دەکەن.

**نوسەر دەڵێت:** (فمن قدم أبا بكر وعمر وعثمان وعليا على جميع أصحاب رسول الله (ﷺ) ولم يتكلم في الباقين إلا بخير ودعا لهم فقد خرج من التشيع أوله وآخره).

واتە: جا هەر کەسێك ئەبو بەکرو عومەر و عوسمان و عەلی پێشخست بەسەر هەموو هاوەڵانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) و قسەی بەئەوانیتر نەگوت ئیللا بەچاکە نەبێ و دوعای بۆ کردن، ئەوا لە(التشيع) دەردەچێت لە سەرەتاو کۆتاییەکەی.

---

٣٤٥ / سبق تخريجه .

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (فمن قدم أبا بكر وعمر وعثمان وعليا على جميع أصحاب رسول الله (ﷺ) ولم يتكلم في الباقين إلا بخير ودعا لهم).

**ئەمە مەزهەبی ئەهلی سوننەو جەماعەیە بە جیاواز لەگەڵ شیعەدا، جا ئەهلی سوننەو جەماعە ئەبوبەکر پێش دەخەن‌و ئەمجار عومەرو ئەمجار عوسمان‌و ئەمجار عەلی، کەچی شیعە دەڵێن: عەلی خەلیفەیە لە پاش پێغەمبەری خواو (ﷺ) ئەو سێ خیلافەتەکە پووچەڵەو ئەبوبەکرو عومەر بە کافر دەزانن.**

**مەبەست لە:** (ولم يتكلم في الباقين) **لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ).**

(إلا بخير) **و ستایش کردنی ئەوان** (ودعا لهم) **لەجیاتی ئەوەی لەعنەتیان لێ بکەن هەروەکو چۆن شیعە لەعنەتیان لێ دەکەن، یان زەمیان بکەن هەروەکو هەندێ کەس دەیکات، زەمی هەندێ لەهاوەڵان دەکات یان قسەیان پێ دەکات، هەرچەندە پێویستە پێچەوانەی ئەوە بێت، پێویست وایە ستایشیان بکرێت‌و مەدحی ئەوان بکرێت، نەچیتە نێو باسی ئەوانەوەو بەهەڵەیان بزانی، چونکە خوای گەورە لەوان ڕازی بووەو لەزۆرێك لەئایەتەکاندا مەدحی ئەوانی کردووە، پێغەمبەری خواش (ﷺ) لەوان ڕازی بووە، ئەو کەسەی بە هاوەڵان قسە بکات یان بە یەکێکیان قسە بکات ئەوا دەبێتە یەکێك لەگومڕاکاران، دەبێتە نەیاری خواو پێغەمبەرەکەی(ﷺ) لەحەقی هاوەڵاندا، بۆیە هەرگیز دروست نییە بچیتە نێو باسی حەقی هاوەڵانەوە نە بە تاکەکانیان و نە بە جەماعەتیان ئیللا بەخەیرو چاکە نەبێت، لەبەر ئەو تایبەتمەندییەی هەیانە بەسەر ئەم ئوممەتەوە، ئەوان باشترین سەدەن، چاکترین سەدەن بە شایەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دەفەرموێت:** (خيركم قرني)[٣٤٦] **واتە ئەو سەدەیەی پێغەمبەری خوای (ﷺ)**

---

٣٤٦ / سبق تخريجه .

**تێدایە، ئەوان باشترینی سەدەکانن** (ولم يتكلم في الباقين) **نە بە تاکیان و نە بە کۆمەڵیان** (إلا بخير).

**مەبەست لە:** (فقد خرج من التشيع أوله وآخره).

**هەرکەسێ چوار خەلیفەکە بەو ڕیزبەندییەی هەیانە پێش بخات و ستایشی هاوەڵانی تر بکات ئەوا ئەو قسەیە مەزهەبی ئەهلی سوننەیەو بەریئە لە (تشيع).**

**نوسـەر دەڵێـت:** (ومن قال: الإيمان قول وعمل يزيد وينقص فقد خرج من الأرجاء أوله وآخره.

ومن قال: الصلاة خلف كل بر وفاجر، والجهاد مع كل خليفة، ولم ير الخروج على السلطان بالسيف، ودعا لهم بالصلاح فقد خرج من قول الخوارج أوله وآخره.

ومن قال: المقادير كلها من الله عز و جل، خيرها وشرها يضل من يشاء ويهدي من يشاء فقد خرج من قول القدرية أوله وآخره وهو صاحب سنة.

**واتە: هەرکەسێ بڵێ: ئیمـان وتـن و کردەوەیـە، زیـاد دەکـات و کـەم دەکـات، ئـەوا لەئیرجاء دەچێتە دەرەوە سەرەتاو کۆتاییەکەی.**

**هەرکەسێ بڵێ: نوێژکردن لەپشت هەموو چاکو خراپێکەوە دروستەو جیهـاد لەگـەڵ هەموو خەلیفەیەکداو دەرچوون نابینێ لەدژی سوڵتان بەشمشێر و دوعای چاکسازییان بۆ بکات، ئەوا لەقسەی خەواریج دێتە دەرەوە سەرەتاو کۆتاییەکەی.**

**هەرکەسێ بڵێ: تەقدیرەکان هەموو لەخواوەیە، چاکەو خراپەی، هەرکەسـێ ویـستی لێ بێ ئەوا گومڕای دەکاتو هەرکەسێ ویستی لێ بێ ئەوا هیدایەتی دەدا ئـەوا لەقـسەی (قەدەری)یەکان دەردەچێت سەرەتاو کۆتاییەکەی، ئەویش خاوەنی سوننەیە.**

ڕاڤە/

**مەبەست لە:** (ومن قال: الإيمان قول وعمل يزيد وينقص فقد خرج من الأرجاء أوله وآخره).

**کاتێ باسی ئەوەی کرد مورجیئە یەکێکن لە بنەماکانی کۆمەڵە گومڕاکان ئەمجار مەزهەبی ئەهلی سوننەو جەماعەی ڕوون کردەوەو ئەو دژی مەزهەبەکەی ئەوانە، چونکە ئەهلی سوننە وا دەبینن ئیمان بریتییە لەوتن و کردەوەو باوەڕ، زیاد دەکات و کەم دەکات، هەروەکو چۆن چەندین بەڵگەی لەسەر هاتووە لەقورئان و سوننەتی پێغەمبەردا (ﷺ) بەجیاواز لەگەڵ مەزهەبی مورجیئە کەوا دەبینن: کردەوە بەشێك نییە لەحەقیقەتی ئیمان.**

**مەبەست لە:** (ومن قال: الصلاة خلف كل بر وفاجر، والجهاد مع كل خليفة، ولم ير الخروج على السلطان بالسيف، ودعا لهم بالصلاح).

**ئەو کەسە بەرییە لە کۆمەڵی خەواریج، چونکە ئەو باسی چوار کۆمەڵەکەی کرد، جا هەر کەسێ دەستی گرت بەگوێڕایەڵی کاربەدەستانی موسڵمانانەوەو دەرنەچێ دژی ئەوان بەهۆی هەڵەیەکەوە کردبێتیان لە خوار کوفرەوە بێت یان سەرپێچییەك تێی کەوتبێ لە خوار کوفرەوە بێت ئەوا مەزهەبی ئەهلی سوننەو جەماعەیە، ئەویش نوێژکردنە لەپشت کاربەدەستانی موسڵمانانەوەو جیهادکردنە لەپێناوی خوادا لەگەڵ ئەواندا و دوعاکردن بۆیان بەچاکسازی و تەوفیق، ئەمە مەزهەبی ئەهلی سوننەو جەماعەیە، جەماعەت کردن لەگەڵ کاربەدەستاندا، جا هەرکەسێك لەشتێك لەوانەدا جیاواز بوو ئەوا ئاکارێك لەگومڕایی تیادایە لە ئاکارەکانی خەواریج.**

**مەبەست لە:** (والجهاد مع كل خليفة).

**ئەگەر فەرمانی بەجیهاد کرد ئەوا پێویستە هاوشانی جیهاد بکرێت.**

ئەمــە پێویــستە: بیــستن و گوێڕایــەڵی، نوێــژکردن لەپــشتیانەوەو جیهــادکردن لەگەڵیانداو دەرنەچوون لەدژیان بە کوشتار هەروەکو خەواریج دەیکەن، ئەمە مەزهەبی ئەهلی سوننەو جەماعەیە دەربارەی کاربەدەستان، بە پێچەوانەی ئەوەی خەواریج و موعتەزیلە دەیڵێن.

مەبەست لـە: (ومن قال: المقادير كلها من الله عز و جل، خيرها وشرها يضل من يشاء ويهدي من يشاء فقد خرج من قول القدرية أوله وآخره).

هــەموو شــتێك ڕوودەدات ئــەوا لەقــەدەری خوادایــە، کــوفرو ئیمــان، سەرپێــچیو گوێڕایەڵی، هەژاری و دەوڵەمەندی، نەخۆشیو لەشساغیو جگە لەوانـە، هـەموو شـتێك لە گەردووندا ڕوودەدات ئەوا بەقەزاو قـەدەری خـوا ڕوو دەدەن، هـیچ شـتێك لـە قـەزاو قەدەری خـوا دەرناچـێ، ئەمـە مەزهـەبی ئـەهلی سـوننەو جەماعەیـە بـەجیاواز لەگـەڵ کۆمەڵی قەدەریەدا بەهەردوو بەشەکەیانەوە: النفاة والمجبرة.

مەبەست لە: (يضل من يشاء).

خوای گەورە هیچ کەسێك گومڕا ناکات ئیللا هۆکاری گومڕایی ئەنجام دابـێ، ئـەو کـات خـوای گـەورە گـومڕای دەکـات، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: (فَلَمَّا زَاغُوا أَزَاغَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ) الصف/٥) لە قورئاندا نەهاتووە باسـی بەهەلاکـەت بـردن یـان گـومڕاکردن یـان سزا ئیللا باسی هۆکارەکەی کـردووە لەلایـەن بەندەکانـەوە، خـوای گـەورە بـەهۆکارێك لەبەندەکانـەوە تەقـدیری لەسـەر کـردووە، بۆیـە دەڵـێین:_ هەرکەسـێ ویـستی لێ بـێ گومڕای دەکات بە دادپەروەری خـۆی، دادپـەروەری دەسـەپێنن بەسـەر گومڕاکارانـدا، وەکـو هیدایــەت کــارانی لێ ناکــات، خــوای گــەورە دەفــەرموێت: (أَفَنَجْعَلُ الْمُسْلِمِينَ كَالْمُجْرِمِينَ (٣٥) مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ (٣٦)القلم) واتە: ئایا موسڵمانان وەك تاوانبـاران لێ دەکەین؟! (٣٥) چیتانە حوکم و بڕیاری وا ئەدەن..؟ چونکە هیچ کات نابێ چاککارو خراپکار چوون یەك مامەڵەیان لەگەڵ بکرێ (٣٦).

بە فەزڵی خۆی هیدایەتی هەرکەسێ بدات ئەوا دەیدات.

**﴿١٦٢﴾ نوسەر دەڵێت: (وبدعة ظهرت هي كفر بالله العظيم ومن قال بها فهو كافر بالله لا شك فيه، من يؤمن بالرجعة ويقول: علي بن أبي طالب حي وسيرجع قبل يوم القيامة ومحمد بن علي وجعفر بن محمد وموسى بن جعفر ويتكلمون في الإمامة وأنهم يعلمون الغيب فاحذرهم فإنهم كفار بالله العظيم، ومن قال بهذا القول).**

واتە: بیدعەیەك پەیدا بووە ئەویش كوفرە بەخوای گەورە، هەركەسێ بیڵێت ئەوا بەبێ گومان محمد بن علي) محمدی كوڕی عەلی كوڕی الحسين الباقر، (وجعفر بن محمد) جەعفەری كوڕی محمدی كوڕی عەلی كوڕی الحسين ئەویش (جعفر الصادق)ە، (وموسى بن جعفر) موسای كوڕی جەعفەری الكاظم ی كوڕی جەعفەری الصادق، بۆیە (الرافضة)ەكان بەخۆیان دەڵێن (الموسويه) وە (الموسويه) لە بەر خۆدانە پاڵ موسای كازمە.

مەبەست لە: (ويتكلمون في الإمامة وأنهم يعلمون الغيب).

باوەڕیان وایە ئیمامەكان غەیب دەزانن، ئەوان ئەو شەرعەی بیانەوێ دایدەڕێژن و ئەو شەرعەی بیانەوێ نەسخی دەكەنەوە، چونكە خوای گەورە ئەوەی خستووەتە ئەستۆی ئەوان.

(وأنهم) واتە: پێشەواكانیان (يعلمون الغيب) ئایە هیچ كەسێك غەیب دەزانێ جگە لەخوای گەورە؟

مەبەست لە: (فاحذرهم فإنهم كفار بالله العظيم).

هەركەسێ بانگەشەی زانینی غەیبی كرد یان باوەڕی وابێت كەسێك غەیب دەزانێ_ئیللا ئەو كەسە نەبێ خوای گەورە فێری كردووە لە پێغەمبەران_ ئەوا كافرە،

خوای گەورە دەفەرموێت: (عَالِمُ الْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ أَحَدًا (٢٦) إِلَّا مَنِ ارْتَضَى مِنْ رَسُولٍ..(٢٧) الجن) ئەمە تایبەتە بەپێغەمبەرانەوە، لەبەر بەرژەوەندی ئوممەت و بانگەواز بۆ لای خواو ببێتە موعجیزەیەك بۆیان بەڵام جگە لە پێغەمبەران ئەوا خوای گەورە هیچ شتێکی غەیبی بۆ ئاشکرا ناکات.

**﴿١٦٣﴾ نوسەر دەڵێت: (قال طعمة بن عمرو وسفيان بن عيينة – رحمهما الله-: من وقف عند عثمان وعلي فهو شيعي، لا يُعدَّل ولا يُكلَّم ولا يُجالس، ومن قدَّم عليا على عثمان فهو رافضي، قد رفض آثار أصحاب رسول الله (ﷺ)، ومن قدم الأربعة على جميعهم، وترحم على الباقين وكف عن زللهم، فهو على طريق الاستقامة والهدى في هذا الباب.**

واتە: (طعمه ی کوڕی عمرو) و (سفيان ی کوڕی عيينه) –ڕەحمەتی خوایان لێ بێ– دەفەرموون: هەرکەسێ لەئاستی عوسمانو عەلیدا ڕاوەستا ئەوا شیعەیە، نابێ تەعدیل بکرێت و نابێ قسەی لەگەڵدا بکرێ و نابێ لەگەڵیدا دانیشی، هەرکەسێ عەلی پێش عوسمان خست ئەوا (رافضي)یە، چونکە فەرموودەکانی هاوەڵانی پێغەمبەری خوای (ﷺ) ڕەد کردووە، هەرکەسێ ئەو چوارەی پێش هەموویان خستو ڕەحمەتی بۆ ئەوانیتر ناردو وازی لەباسکردنی هەڵەکانیان هێنا، ئەوا لەسەر ڕێگای سەقامگیرییەو هیدایەتە لەم باسەدا).

ڕاڤە:

هەرکەسێ لەئاستی عوسمان و عەلیدا ڕاوەستاو وتی:– خیلافەت هی (عەلی)یەو هی عوسمان نییە ئەوا کەسێکی شیعەیە، ئەی چۆنە ئەو کەسەی دەڵێت: خیلافەت بۆ ئەبوبەکر و عومەر نییە هی عەلی یە هەر ئەویش وەصی یە؟!

مەبەست لە: (لا يُعدَّل لا يُكلَّم ولا يُجالس).

ئەوە شیعەیەو دەبێ بەرائەتی لێ بکرێ (لا يُعدَّل) حوکم نادرێت بەعەدالەت بوونی (لا يُكلَّم) قسەکردنی ڕێزو گوێگرتنو ڕازی بوون (ولا يُجالس) چونکە زەرەرو زیانی بلاودەبێتەوە بەسەر ئەوانەی لەگەڵیاندا دادەنیشێ، چونکە بانگەوازکارانی گومڕایی کاردەکەنە سەر ئەوانەی لەگەڵیاندا دادەنیشن و ئەوانەی هاوڕێتیان دەکەن.

مەبەست لە: (ومن قدَّم عليا على عثمان فهو رافضي).

واتە لەخیلافەتدا، بەڵام لەمەسەلە چاکترینیان ئایە کامیان چاکترە؟ ئەو مەسەلەیە زانایان تێیدا جیاوازن، هەندێکیان دەڵێن عەلی چاکترەو هەندێکیان عوسمان بەچاکتر دەزانن، بەڵام خیلافەت ئەوا هەرکەسێ عەلی پێش عوسمان بخات ئەوا دەبێتە گومڕاکاران،چونکە هاوەڵان لەکاتێکدا (عەلی) خۆیشی لەناویاندا بووە هەموویان ئیجماعیان لەسەر پێشخستنی عوسمان کردووە.

مەبەست لە: (قد رفض آثار أصحاب رسول الله (ﷺ)).

ناویان لێ نرا (الرافضة) چونکە بە (زەیدی کوڕی عەلی) یان گوت: چی دەڵێی دەربارەی ئەبو بەکر و عومەر؟ گوتی: خۆشیانم دەوێ و پشتیوانیان لێ دەکەم (موالاتم بۆیان هەیە) چونکە ئەوان وەزیری باپیرم پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوون. وتیان: کەواتە (رفض)ت دەکەین، بۆیە ئەویان (رفض) کردو ئەوانیش ناونران بە (الرافضة) چونکە (زیدی کوری عەلی) یان (رفض) کرد.

مەبەست لە: (ومن قدم الأربعة على جميعهم) واتە: هەموو هاوەڵان.

(وترحم على الباقين): لەهاوەڵان هەروەکو لەسەرەتای قسەکە باسی کرد.

مەبەست لە: (وكف عن زَلِلهم).

وازی هێنا لەباسکردنی ئەو هەڵانەی لە هەندێکیانەوە ئەنجام دراوە، چونکە ئەوان وەکو تاك (معصوم) نین، ڕەنگە هەندێ هەڵە لەهەندێکیانەوە ڕوو بدات، بەڵام هێندە

فـەزڵیان هەیـەو هێنـدە ئیمانیـان هەیـە دەبێتـە هـۆی داپۆشـینی هەڵـەکانیان، هێنـدە هاوڕێتی پێغەمبەری خوایان (ﷺ) هەیە هەڵە کەمەکانیان دادەپۆشێ.

**مەبەست لە:** (فهو على طريق الاستقامة والهدى في هذا الباب).

هەرکەسێ باوەڕی لەهاوەڵانـدا ئـاوا بێـت ئـەوا لەئـەهلی هیدایەتـە، چـونکە ئـەوەی خوای گەورە پێشی خستووە ئـەمیش پێـشی دەخـات و دوعـای ڕەزامەنـدی لـەخوا بـۆ ئەوانیتر دەکاتو بەدوای هەڵەکانیاندا ناکـەوێ ئـەوا دەبێتـە ئـەهلی سـوننەو جەماعـە، چونکە ئەمە مەزهەبی ئەهلی سوننەو جەماعەیە لەهاوەڵانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ).

**﴿١٦٤﴾ نوسەر دەڵێت: (والسنة أن تشهد أن العشرة الذين شهد لهم رسول الله(ﷺ) بالجنة أنهم من أهل الجنة لا شك فيه)**

**واتە: لەسوننەتدا هەیە شایەتی بدەیت ئەو دە کەسەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) شایەتی بەهەشتی بۆ داون ئەوان لەئەهلی بەهەشتن بەبێ هیچ گومانێك.**

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (والسنة أن تشهد أن العشرة[٣٤٧] الذين شهد لهم رسول الله (ﷺ) بالجنة أنهم من أهل الجنة لا شك فيه).

**لەسوننەتدایە شایەتی بدەیت بەو کەسانەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) شایەتی بەهەشتی بۆ داون ئەوانیش دە کەسەکەن: چوار خەلیفەکەو (طلحة)و (الزبير) و(سعد بن ابی وقاص) و (سعید بن زید بن عمرو بن نفیل) ئامۆزای عومەری کوڕی خەتتاب و (ابو عبیدە بن الجراح) و (عبدالرحمن بن عوف) ئەوانە پێغەمبەری خوا (ﷺ) شایەتی بەهەشتی بۆ داون ئەوا ئێمەش شایەتی بەهەشتیان بۆ دەدەین لەسەر شایەتی دانەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ).**

**مەبەست لە:** (لا شك فيه).

**هەرکەسێ گومانی هەبێ یەکێك لەو دە کەسە لەئەهلی بەهەشت نییە ئەوا کافر دەبێت، ئەی ئایە ڕات چۆنە کەسێك لەعنەت لە ئەبو بەکرو عومەر بکات و وەصفی ئەوان بکات بە(صنم)؟**

---

٣٤٧ / صحيح : سبق تخريجه .

**﴿١٦٥﴾ نوسەر دەڵێت: (ولا تفرد بالصلاة على أحد إلا لرسول الله (ﷺ) وعلى آله فقط).**

**واتە: هیچ کەسێك تایبەتمەند مەکە بە صەڵاوات دان تەنها پێغەمبەری خوا (ﷺ)و ئالی پێغەمبەر (ﷺ) نەبێت.**

**ڕاڤە:**

**مەبەست لە:** (ولا تفرد بالصلاة على أحد إلا لرسول الله (ﷺ) وعلى آله فقط).

**(الصلاة) لەزمانەوانیدا واتە پاڕانەوە (الدعاء) بەڵام (الصلاه) لەشەرعدا بریتیە لەو پەرستشەی کە بە (تکبیر) دەست پێ دەکات و بە(التسلیم) کۆتایی پێ دێت، هەستان و کڕنۆش و سوژدەو دانیشتن و خوێندنەوەی قورئان و (تکبیر) و (تسبیح) ی تێدایە، کەواتە چەند کردەوەو قسەیەکە، بە(تکبیر) دەست پێ دەکات و بە (تسلیم) کۆتای پێ دێت، ئەمە نوێژە (الصلاه)ە لە شەرعدا.**

**جا ئەگەر (آل) و (اصحاب) پێکەوە هاتن ئەوا (آل) بریتییە لەنزیکەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و (اصحاب) هەموو هاوەڵان ڕەنگە هیچ خزمایەتییەکی پێغەمبەری خوای (ﷺ) نەبێ و ڕەنگە هەبێ.**

**بەڵام ئەگەر (آل) بەتەنها هات ئەوا هاوەڵانش دەگرێتەوە چونکە (ال) بۆ دوو شێوە دەگوترێت:_**

**- وتنێك مەبەست لێی نزیکەکانی پێغەمبەرن (ﷺ)، ئەوانیش ئەوانەن (صدقە)یان بۆ حەرامە.**

- وتنێك مەبەست لێی شوێنكەوتوانییەتی پێیان دەگوترێ: (آل) وەكو (آل فرعون) واتە: شوێنكەوتوانی فیرعەون و (ال محمد) واتە: شوێنكەوتووانی محمد(ﷺ).

بەڵام صەلاوات ناردن بەسەر جگە لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) بەتەنها وەكو هاوەڵێك یان موسڵمانێك بەتەنها ئەوا دروستە بەمەرجێ نەبێتە دروشمێك، دەڵێی: (اللهم صل علی فلان) ئەمە دروستە بەمەرجێ نەكرێتە دروشمێك هەروەكو لای (الرافضة) هەیە، بەڵام صەلاوات دان لەسەر جگە لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) هەندێ جار ئەوە ئاساییە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (اللهم صل على آل ابي أوفى)[٣٤٨] خوای گەورە بەوە فەرمانی پێكردووە، خوای گەورە دەفەرموێت: (خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ (١٠٣) التوبة) واتە: دوعایان بۆ بكە (إِنَّ صَلَاتَكَ سَكَنٌ لَهُمْ).

مەبەست لە: (وعلى آله فقط) آلە: مەبەست پێی شوێنكەوتوانی ئەوە.

**﴿١٦٦﴾ نوسەر دەڵێت: (وتعلم أن عثمان بن عفان قُتل مظلوما ومن قتله كان ظالما).**

واتە: بزانە عوسمانی كوڕی عەففان بە (ستەملێكراو)ی كوژرا و ئەوەی كوشتی ستەمكارە.

٣٤٨ / / متفق عليه : أخرجه البخاري (١٤٢٦) ومسلم (١٠٧٨) .

**﴿١٦٧﴾ فمن أقر بما في هذا الكتاب وآمن به واتخذه إماما ولم يشك في حرف منه ولم يجحد حرفا واحدا فهو صاحب سنة وجماعة كامل قد اكتملت فيه الجماعة ومن جحد حرفا مما في هذا الكتاب أوشك في حرف منه أو شك فيه و وقف فهو صاحب هوى.**

**واته: هەركەسێ دان بەوەدا بنێت لەم كتێبەدا هەیەو بیكاتە پێشەنگی خۆیو لەیەك (پیت)دا گومانی نەبێو نكوڵی لەیەك پیتی نەكات، ئەوا خاوەنی سوننەو جەماعەیە، بەتەواوی جەماعەتی تێدا كامل بووە، هەركەسێ نكوڵی لەپیتێك بكات لەوەی لەم كتێبەدا هەیە، یان گومانی لەپیتێكی هەبێ یان گومانی بوو وەستا، ئەوا خاوەنی ئارەزووە.**

**ڕاڤە:**

**مەبەست لە:** (وتعلم أن عثمان بن عفان قتل مظلوما ومن قتله كان ظالما) **ئەمە لەپێشدا ڕوون كرایەوە.**

**مەبەست لە:** (فمن أقر بما في هذا الكتاب وآمن به واتخذه إماما ولم يشك في حرف منه ولم يجحد حرفا واحدا فهو صاحب سنة وجماعة).

**ئەوەی لەم كیتابەدا هاتووە بریتییە لەباوەڕی ئەهلی سوننەو جەماعە، نەیگوت: ئەو كەسەی باوەڕی نەبێ بەوەی من گوتومە بەڵكو وتی: هەركەسێ باوەڕی نەبێ بەوەی لەم كیتابەدا هەیە ئەویش بنەماكانی ئەهلی سوننەو جەماعەیە– هیچ خاڵێك لەسەر نوسەر نییە لەم قسەیەدا هەروەكو هەندێ لەخوێنەران تێبینیان كردوە– چونكە لەم كتێبەدا بنەماكانی ئەهلی سوننەو جەماعەی تێدا تۆمار كردووە، جا**

هەرکەسێ ئینکاری لەشتێکی بکات یان ئینکاری بکات ئەوا بێ گومان کەسێکی گومڕایە.

مەبەست لە: (فهو صاحب سنة وجماعة كامل قد اكتملت فيه الجماعة).

چونکە باوەڕی هێناوە بەوەی ئەهلی سوننەو جەماعەی لەسەرە ئەوەی لەم کتێبەدا باسکراوە، ئەگەر باوەڕی وەکو باوەڕی ئەهلی سوننەو جەماعە وابێ ئەوا دەبێتە یەکێك لەوان، هەرکەسێ ئینکاری لەشتێك لە باوەڕی ئەهلی سوننەو جەماعە بکات ئەوا دەبێتە یەکێك لە (المبتدعة).

**﴿١٦٨﴾ نوسەر دەڵێت: (ومن جحد أو شك في حرف من القرآن أو في شيء جاء عن رسول الله (ﷺ) لقي الله تعالى مكذبا فاتق الله واحذر وتعاهد إيمانك).**

واتە: هەرکەسێ نکۆڵی بکات یان گومانی هەبێت لەپیتێك لەقورئان یان لەشتێك لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) هاتبێ ئەوا دەگاتە خوای گەورە وەکو کەسێکی بەدۆرخەرەوە (مکذب) بۆیە لەخوا بترسەو وریابەو دەست بەئیمانەکەتەوە بگرە.

ڕاڤە/

مەبەست لە: (ومن جحد أو شك في حرف من القرآن أو في شيء جاء عن رسول الله (ﷺ)).

هەرکەسێ گومانی هەبێت لەشتێك لەقورئان هەرچەندە پیتێك بێت لەقورئان ئەوە کافرە، چونکە باوەڕی بە خوای گەورە نییە، یان گومانی هەبوو لەشتێك لەو قسەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە بە جێگری لەئەوەوە هاتبێ، وەکو ئەوەی بڵێت: هەرچەندە ئەم فەرموودەیە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) ڕیوایەت کرابێ بە (صحیح)ی بەڵام من باوەڕم بە ناوەڕۆکەکەی نییە، یان گومانم هەیە یان دەوەستم، ئەوە باوەڕی بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) نییە، چونکە پێویستە باوەڕێکی یەکلایی بەقسەکانی خواو قسەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بکرێت، دەبێ مرۆڤ دوو دڵ نەبێ یان ڕاوەستێ لە شتێکدا لەو بابەتە، بەڵکو باوەڕ بە هەموو قورئان بهێنێ، باوەڕی بەوە هەبێ بە(صحیح)ی لەپێغەمبەری خوداوە (ﷺ) هاتبێ، هەموو ئەوانەی لە خواو پێغەمبەرەکەیەوە (ﷺ) هاتبێ گومانی نەبێ‌و تێیدا ڕانەوەستێ، ئەمە ڕێگای ئیماندارانە: باوەڕهێنان‌و بەڕاست زانینی ئەوەی لە کیتابەکەی خواو سوننەتی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) هاتبێ.

**مەبەست لە:** *(فاتق الله واحذر وتعاهد إيمانك)*.

واتە: لەخوا بترسە گومانێك بێتە ناختدا لە قسەكانی خوای گەورەدا، یان گومانێك لە قسەكانی پێغەمبەری خوادا(ﷺ)، یان گومانێ لەبیرو باوەڕی ئەهلی سوننەو جەماعە هەبێ، بەدوای ئیمانەكەتدا بگەڕێ (بەدوادا چوونی ئیمانەكەت بكە) نەوەك شتێك لەو جۆرەی تێ بكەوێ.

**﴿١٦٩﴾ نوسەر دەڵێت: (ومن السنة أن لا تطيع أحدا في معصية الله ولا الوالدين والخلق أجمعين ولا طاعة لبشر في معصية الله ولا يحب عليه أحدا واكره ذلك كله لله تبارك وتعالى).**

**واتە: لە سوننەتدایە نابێ گوێڕایەڵی هیچ کەسێك بکەی لەسەرپێچی خوادا، نەدایكو نەباوك و نەهەموو خەڵکی، گوێڕایەڵی هیچ مرۆڤێك نابێ بکرێت لەسەرپێچی خوادا، لە سەر ئەوە هیچ کەسێکی خۆش نەوێو ڕقت لەهەموو ئەوانە بێت لەبەر خوای گەورە.**

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (ومن السنة أن لا تطيع أحدا في معصية الله).

**ئەمە بنەمایەکە لەبنەماکانی ئەهلی سوننەو جەماعە لەو فەرموودەوە وەریگرتووە دەفەرموێت:** (لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق)[349] **وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت:** (إنما الطاعة بالمعروف)[350] **جا هەرکەسێ فەرمانی بە سەرپێچی کرد ئەوا گوێڕایەڵی مەکە لەو سەرپێچییەدا هەرچەندە ئەو کەسە باوکت بێت یان دایکت یان نزیکترین کەست بێت یان دەسەڵاتدار بێت یان سوڵتان، خوای گەورە دەربارەی جوولەکەو گاورەکان دەفەرموێت:** (اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ) التوبة/٣١) **واتە: (لەبری خوا مەلاو ڕەبەنەکانی خۆیانیان کردە خوا و فەلەکانیش عیسای کوڕی مەریەمیان کردە خوا) کاتێ گوێڕایەڵی ئەوانیان کرد لەسەرپێچیدا.**

---

٣٤٩ / سبق تخريجه .

٣٥٠ / سبق تخريجه .

**مەبەست لە:** (ولا الوالدين والخلق أجمعين).

**خوای گەورە دەربارەی دایك و باوك دەفەرموێت:** (وَوَصَّيْنَا الْإِنْسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًا عَلَى وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ (١٤) وَإِنْ جَاهَدَاكَ عَلَى أَنْ تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا وَاتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ (١٥)لقمان) **واتە: (ئێمە دەربارەی باوكو دایك بە مرۆڤمان راگەیاندو ئامۆژگاریمان كرد كە هەمیشە رەفتاری چاكەیان لە گەڵ بكەن، بە تایبەتی لە گەڵ دایكیدا، دایكی بە پێستی سك هەڵیگرتووە بە لاوازی لەسەر لاوازی تا لە داوێنی بەربۆتەوە، هاتۆتە ئەم جیهانە، شیر برینەوەشی دوو ساڵی خایاند، كەوایە (ئەی مرۆڤ !) بەردەوام سوپاسی من بكە لە سەر نیعمەتەكانم و سوپاسی باوك و دایكیشت بكە لە سەر ئەو هەموو ئەزیەت و ئازارە لە پێناوی تۆدا چێشتوویانە، گێرانەوەشتان هەر بۆ لای منە دوای زیندوو بوونەوە (١٤) خۆ ئەگەر هەوڵیشیانداو پێیان داگرت لەسەر ئەوە كە شتێك بكەی بەشەریك و هاوبەشم، كە هیچ بەڵگەو زانیارییەكت پێ نییە ئەوسا گوێڕایەڵیان مەكە وە لەدونیادا لەگەڵ هەردووكیاندا بەشێوەیەكی چاك و پەسەند هاوەڵی بكە وە بەردەوام هەر ڕێگەی ئەوە بگرە بەرەو من ڕێگەی گرتۆتە بەر و گەڕاوەتەوە بۆ لام لەپاشا هەمووتان هەر بۆلای من دەگەڕێنەوە، ئینجا لەو كارو كردەوەیەش لەدونیادا كردوتانە ئاگادارتان دەكەم (١٥)).**

**خوای گەورە دەفەرموێت:** (وَوَصَّيْنَا الْإِنْسَانَ بِوَالِدَيْهِ حُسْنًا وَإِنْ جَاهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ (٨) العنكبوت).

**جا گوێڕایەڵی هیچ كەسێك ناكرێت لەسەرپێچی خوادا هەر كەسێك بێت ئەو دروستكراوە (ئەو كەسە) هەرچەندە ئەو كەسە نزیكترین كەست بێت وەكو دایك و باوك، ئەی جگە لەوان دەبێ چۆن بێت؟**

**مەبەست لە:** (ولا يحب عليه أحدا واكره ذلك كله لله تبارك وتعالى).

**واتە: سەرپێچیت خۆش نەوێ یان ئەو کەسەت خۆش بوێت فەرمانی پێ دەکات بەڵکو ڕقت لێی بێ، ڕقت لەسەرپێچی بێتو لەسەرپێچی کاران و ئەوانەش فەرمانی پێ دەکەن، ئەویش لەبەر ئەو فەرموودەیەی کە دەفەرموێت:** (من رأى منكم منكرا فليغيره بيده، فإن لم يستطع فبلسانه، فإن لم يستطع فبقلبه وذلك أضعف الإيمان)[351] **جا ڕقت لە سەرپێچی و سەرپێچیکاران بێت، ئەمەش لەئیمانەوەیە.**

٣٥١ / سبق تخريجه .

**﴿١٧٠﴾ نوسەر دەڵێت: (والإيمان بأن التوبة فريضة على العباد أن يتوبوا إلى الله عز و جل من كبير المعاصي وصغيرها)**

**واتە: باوەڕ بەوەی تەوبە فەرزە لە سەر بەندەکان، دەبێ تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا لەتاوانە گەورەو بچووکەکان.**

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (والإيمان بأن التوبة فريضة على العباد).

**پێویستە باوەڕت هەبێ بەوەی تەوبە فەرزە، تەوبەکردن لەتاوانەکان فەرزە، خوای گەورە دەفەرموێت:** (وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ (٣١) النور) **واتە: (ئەی باوەڕداران! هەمووتان بەرەو لای خوا بگەڕێنەوەو پەشیمان ببنەوە بەشکو گشتتان هەم لەدنیاو هەم لەقیامەت، ڕزگارو بەختیار ببن).**

**دەفەرموێت:**(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا تُوبُوا إِلَى اللَّهِ تَوْبَةً نَصُوحًا عَسَى رَبُّكُمْ أَنْ يُكَفِّرَ عَنْكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ) التحريم/٨) **واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! بگەڕێنەوە بۆ لای خوا بە تەوبەو گەڕانەوەیەکی ئیجگاری، واتە: بە شێوەیەك، ئیتر جارێکی تر نەگەڕێنەوە سەر ئەو تاوان و گوناهانە، دڵنیابن – ئەگەر تەوبەی ئاوا بکەن – پەروەردگارتان لە گوناهەکانتان خۆش دەبێت).**

**خوای گەورە دەفەرموێت:**(وَمَنْ لَمْ يَتُبْ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ (١١) الحجرات).

**بۆیە پێویستە لەسەر موسڵمان تەوبە بکات لەگوناهەکان و تاوانەکانی و بەردەوام نەبێ لەسەری یان سووربێ لەسەری یان کەمتەرخەمی تێدا بکات و بڵێت: ئەمە سووك و ئاسانە، بەکەمی نەزانێ چونکە ئەوە سەرپێچییە، بەڵکو پەلە بکات لە تەوبەکردن، خوای گەورە دەفەرموێت:** (وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ وَمَنْ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا اللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَى مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ (١٣٥) أُولَئِكَ جَزَاؤُهُمْ

مَغْفِرَةٌ مِنْ رَبِّهِمْ وَجَنَّاتٌ) ال عمران) واتە: هەر کارێکی دزێوو نەشیاو دەکەن یان ستەم لەخۆ بکەن بەتالووکەو بەپەلە خوا یاد دەکەنەوەو داوای لێبوردنی گوناهەکانیانی لێ دەکەن جا دەبێ _بێجگە لەخوا _ کێ گوناهان بپۆشێ؟ جا ئەوانە لەسەر تاوان و گوناحێ زانیویانە هەڵەیە، سوور و بەردەوام نین، خۆشیان ئەزانن کەسووربوون لەسەر گوناح کارێکی زۆر خراپ و ناپەسەندە (١٣٥) ئەوانە پاداشتیان لای پەروەردگاریان بەخشین و لێبووردنەو چەند باخێکی بەهەشتە (١٣٦)).

خوای گەورە ستایشی ئەوانی کردو بەڵێنی پێدان، خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّمَا التَّوْبَةُ عَلَى اللَّهِ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ السُّوءَ بِجَهَالَةٍ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِنْ قَرِيبٍ فَأُولَئِكَ يَتُوبُ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا (١٧) وَلَيْسَتِ التَّوْبَةُ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ السَّيِّئَاتِ حَتَّى إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ إِنِّي تُبْتُ الْآنَ) النساء) واتە: بەڕاستی خوا تەوبە تەنها لەو کەسانە وەردەگرێ کە بەنەفامی و نەزانی خراپە دەکەن پاشان لەماوەیەکی نزیکدا پەشیمان دەبنەوەو تەوبە دەکەن ئا ئەوانە خوا تەوبەیان لێ وەردەگرێو خوایش هەمیشە زاناو کارجوانە (١٧) تەوبەو پەشیمانی بۆ ئەوانە نییە کە بە درێژایی تەمەنیان خەریکی گوناح و تاوانن تا لەکاتی گیانەڵاو مردندا دەڵێ: بێ گومان لەو کارانەم پەشیمانم).

ئەگەر گەیشتە سەرەمەرگ و مردن ئامادەبوو ئەوا تەوبە وەرناگیرێ، هەرچەندە مرۆڤ هێشتا زیندوو بێت بەڵام تەوبەکەی لەسەرەمەرگدا لێ وەرناگیرێ بۆیە پێویستە پەلە بکرێت لەتەوبەو دوای نەخات هەر ئەو کاتەی تاوان دەکات و تەوبە بکات بەدوایداو بگەڕێتەوە بۆ لای خوا، مرۆڤیش پارێزراو نییە لەهەڵە (معصوم) نییە بەڵکو هەڵە دەکات، کەمتەرخەمی دەکات، تاوان دەکات، بەڵام خوای گەورە بە رەحمەتی خۆی دەرگای تەوبەی کردوەتەوەو بانگی تۆی کردووە بۆی، پەیمانی پێداوی لەتاوانەکانت خۆش بێت ئەگەر بەڕاستی تەوبە بکەیت، تەنانەت کەسی کافریش ئەگەر تەوبە بکات ئەوا خوای گەورە تەوبەکەی لێ وەردەگرێ، خوای گەورە دەفەرموێت: (قُلْ

لِلَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ يَنْتَهُوا يُغْفَرْ لَهُمْ مَا قَدْ سَلَفَ) الانفال/٣٨) واته: (بەبێ باوەڕەكانیـان بلّـێ: ئێستایش ئەگەر دەست لەبێ دینیو جەنگ هەڵبگرنو موسڵمان بـن، لـه هەرچی ڕابردوویانه چاوپۆشی دەكرێ).

لەكوفرو شیركو كوشتنی گیانەكانو جگه لەوانـه، ئەگەر تەوبـه بكـەن ئـەوا خـوای گەوره تەوبەیان لێ وەردەگرێ، لە فەرموودەیەكدا هاتووه: (التوبة تجب ما قبلها)[٣٥٢] جا كەسی موسڵمان پێویستی به تەوبەیه، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەهـەموو ڕۆژێكدا سـەد جار تەوبەی دەكردو داوای لێ خۆش بوونی دەكرد، دەفەرموێت: (أيها الناس توبوا إلى الله فإني أتوب إلى الله في اليوم أكثر من سبعين مرة)[٣٥٣] واتـه: ئـەی خەڵكینـه تەوبـه بكـەنو بگەڕێنەوه بۆ لای خوا، من له ڕۆژێكدا زیاتر له حەفتا جار تەوبه دەكەم).

هاوڕێكانی لەمەجلیسێكدا دەیانژمارد (استغفر الله، استغفر الله) زیاتر له سەد جـار[٣٥٤]، له كاتێكدا ئەو پێغەمبەری خودایه (ﷺ)، ئـەی چۆنه ئەگەر كەسێكی تـر بێـت؟ جا ئێمه پێویستیمان بەتەوبەو گەڕانەوەیه بۆ لای خوا، مرۆڤیش پارێزراو (معصوم) نییـەو تاوان ئەنجام دەدات، كەمتەرخەمی لێ دەوەشێتەوه، هەڵه دەكات، بۆیـه پێویـستی بـه تەوبەیه، سوپاس و ستایش بۆ خوای گەوره دەرگای تەوبەی بۆ كردینەتـەوه پـەیمانی پێداوین لێمان وەرگرێ و هەموو تاوانەكانمان بسڕێتەوه.

---

٣٥٢ / قال الشيخ الألباني في (الصحيحة ) (١٤١/٣) : لا أعرف له أصلا .

قلت : إنما الوارد عن النبي (صلى الله عليه وسلم ) : (الهجرة تجب ما قبلها ) أخرجه أحمد (٢٠٥/٤) .

٣٥٣ / أخرجه البخاري (٥٩٤٨) .

٣٥٤ / رواه أبو داود والترمذي وابن ماجه والنسائي وابن حبان .

**﴿١٧١﴾ نوسەر دەڵێت: (ومن لم يشهد لمن شهد له رسول الله (ﷺ) بالجنة فهو صاحب بدعة وضلالة شاك فيما قال رسول الله (ﷺ)).**

**واتە: هەرکەسێ شایەتی نەدات بەو کەسەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) شایەتی بەهەشتی بۆ دابێ، ئەوە کەسێکی خاوەن بیدعەو گومڕایەو گومانی هەیە لەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی.**

**ڕاڤە/**

**مەبەست لە:** (ومن لم يشهد لمن شهد له رسول الله (ﷺ) بالجنة فهو صاحب بدعة وضلالة).

**شایەتیدان بەبەهەشت یان بە ئاگر لای ئەهلی سوننەو جەماعە ڕوونکردنەوەی تێدایە:-**

**جا هەرکەسێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) شایەتی بۆ دابێ بەبەهەشت یان بەئاگر ئەوا ئێمەش شایەتی بۆ دەدەین چونکە پێغەمبەری خوا(ﷺ):** (وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى (٣) إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى (٤) النجم).

**بەڵام کەسێك بەڵگە نەهاتبێ کەوا ئەو کەسە لە بەهەشتدایە یان لە ئاگردایە، ئەوا ئێمە شایەتی بەهەشت یان ئاگری بۆ نادەین، بەڵکو تکاو ڕجامان هەیە بۆ چاکەکاران و دەترسین لە دەرئەنجامی تاوانباران، ئەمە وەکو تاکەکان.**

**بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ئەوا ئێمە باوەڕمان وایە ئیمانداران لەبەهەشتدان و بێ باوەڕان هەموویان لەئاگردان، لەڕوانگەی گشتی یەوە، بەڵام لەڕووی تاکەکانەوە ئەوا پێویستی بە ڕوونکردنەوەیە جا ئێمە بۆ هیچ کەسێك جەزمی بەهەشت یان ئاگر ناکەین ئیللا بەبەڵگەیەك لەقورئان و سوننەت نەبێ.**

جـا پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) شـایەتی بـۆ کۆمـەڵێك لـەهاوەڵان داوە کـەوا ئـەوان لەبەهەشتدان بۆیە ئێمەش دڵنیاین لە بەهەشتدان بەخودی خۆیان ئەوانیش: – ئـەو دە کەسەی شـایەتی بەهەشـتیان بـۆ دراوە (العـشرە المبـشرە):_ چـوار خەلیفەکـە، ئـەبو بەکرو عومەرو عوسمان وعەلیو (طلحة) و (الزبير) و (سعد بن ابی وقاص) و (سـعيد بـن زيد بن عمرو بن نفيل) و (ابو عبيده الجراح) و (عبدالرحمن بن عوف) ئەوانە پێغەمبەری خـوا (ﷺ) شـایەتی بەهەشـتی بـۆ داون، ئێمـەش باوەڕمـان بـەوە هەیـە، یـەکلای دەکەینەوە ئەوانە خـودی خۆیـان لـە بەهەشـتدان، باوەڕمـان وایـە هـاوەڵان هـەموویان لەبەهەشتدان ئەوانە لەسـەر هـاوەڵبوون مـردوون و هەڵنەگەڕاونەتـەوە، چـونکە خـوای گـەورە فەرموویـەتی: (لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ الفتح/١٨) واتە: (بێ گومان خوا ڕازی بوو لەئیماندارەکان کاتێ لەژێر ئەو درەختە دا پێی دەڵێن: (شجرة الرضوان) پەیمانیان لەگەڵ دەبەستیت).

خوای گەورە فەرموویەتی: (وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ بِإِحْسَانٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ (١٠٠) التوبة) واتـە: (لەدەسـتەی یەکـەمی پێـشەنگی کۆچـکەران و پشتیوانان و چاك پەیڕەوانی ئەوانیش خوا ڕازی بوو لێیان و ئەوانیش لەخوا ڕازی بوون بەدەر لەوەش چەندان باخ و بێستانی بۆ سازداون کە: بە بـەردرەخت و کۆشـکەکانییدا ڕووبار گەلێ دەچێت بەهـەتا هـەتاییش تێیـدا ئەمێننـەوە هـەر ئەوەیـشە دەسـکەوت و سەرفرازی گەورەو بەنرخ).

جـا هـاوەڵانی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) هـەموویان لەبەهەشـتدان بەشـایەتی خـوای گـەورە بۆیـان، بەتایبـەتی ئـەو دە کەسـەو ئەوانـەی (بيعـة الرضـوان)و بەشـداربووانی جەنگی (بدر) ئەوانەی فەزڵی تایبەت دەربارەیان هاتووە، ئەوانەی لەپێش ڕزگـارکردنی مەککە باوەڕیان هێنـاوەو بەخـشیویانە پلـەیان بـەرزترو زۆرتـرە لەوانـەی بەخـشیویانە

لەپاش رزگارکردنی مەککە و جەنگاون، جا ئەوانەی لەپێش رزگارکردنی مەککە موسڵمان بوون ئەوانە باشترن لەوانەی لەپاش رزگارکردنی مەککە موسڵمان بوون، هاوەڵان لەنێوان خۆیاندا جیاوازیان هەیە بێ گومان، بەڵام هەموویان خوای گەورە لێیان ڕازی بووە، هیچ کەسێك تانە لەهاوەڵێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) نادات ئیللا کەسێك لە ئارەزوو پەرستان و بیدعەکاران نەبێ لەخەواریج و (الرافضة)و جگە لەوان، جا ئەو کەسەی تانە بدات لەچوار خەلیفە ڕاشدییەکە: ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان وعەلی و بەستەم وەسفیان بکاتو وەسفی ئەبوبەکرو عومەر بە دوو بتەکەی قورەیش بکاتو ئەوان بتو تاغوتن، ئەوانە گومڕاییەکەیان گەورەترو مەزنترە لەجوولەکەو گاورەکان،چونکە جوولەکەو گاور ئەو قسانە بەهاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناڵێن لەکاتێکدا ئەوان جوولەکەو گاورەکان، ئەوانە بانگەشەی ئیسلام دەکەن و ئەو قسە خراپ و بۆگەنە دەڵێن.

ئەگەر بەجوولەکە بگوترێ: باشترین کەسی ئێوە کێ یە؟

ئەوا دەڵێن: هاوەڵانی موسایە.

ئەگەر بەگاورەکان بگوترێت: باشترین کەسی ئێوە کێ یە؟

ئەوا دەڵێن: هاوەڵانی عیسایە.

ئەگەر بەو رافیضانە بگوترێ: خراپترین کەسی ئێوە کێ یە؟

ئەوا دەڵێن: هاوەڵانی پێغەمبەری خوایە (ﷺ).

داوا لە خوا دەکەین بمانپارێزێ، چونکە ئەم مەسەلەیە زۆر ترسناکە.

**﴿١٧٢﴾ نوسەر دەڵێت: (قال مالك بن أنس: (من لزم السنة وسلم منه أصحاب رسول الله (ﷺ) ثم مات كان مع النبيين والصديقين والشهداء والصالحين وإن كان له تقصير في العمل).**

وقال بشر بن الحارث: (السنة هي الإسلام والإسلام هو السنة).

وقال فضيل بن عياض: (إذا رأيتُ رجلا من أهل السنة فكأنما أرى رجلا من أصحاب رسول الله (ﷺ) وإذا رأيتُ رجلا من أهل البدع فكأنما أرى رجلا من المنافقين).

وقال يونس بن عبيد: (العجب ممن يدعو اليوم إلى السنة وأعجب منه المجيب إلى السنة)[٣٥٥].

**واتە: مالیکی کوڕی ئەنەس دەڵێت: (هەرکەسێ دەست بگرێت بەسوننەتەوەو هاوەڵانی پێغەمبەری (ﷺ) لێ سەلامەت بێ و ئەمجار بمرێت ئەوا لەگەڵ پێغەمبەران و صدیقەکان و شەهیدان و پیاو چاکاندایە، هەرچەندە کەمتەرخەمی هەبێ لە کردەوەکانیدا).**

**بشری کوڕی الحارث دەفەرموێت: (سوننەت ئیسلامەو ئیسلامیش سوننەتە).**

**(فضیل ی کوڕی عیاض) دەڵێت: (ئەگەر کەسێك ببینم لەئەهلی سوننە هەروەکو ئەوەیە کەسێك لەهاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەبینم، ئەگەر کەسێك ببینم لەبیدعەکاران ئەوا هەروەکو ئەوەیە کابرایەك ببینم لەدوو ڕووەکان).**

**(یونس ی کوڕی عُبید) دەڵێ: (سەیرە کەسێك ئەمڕۆ بانگەواز دەکات بۆ سوننەت و لەوە سەیرتر ئەوەیە کەسێك وەڵامی سوننەت دەداتەوە).**

---

**٣٥٥ / رواه أبو نعيم وابن بطة واللالكائي .**

**ڕاڤە/**

**١/ قسەکەی مالیکی کوڕی ئەنەس:** (من لزم السنة وسلم منه أصحاب رسول الله (ﷺ) ثم مات كان مع النبيين والصديقين والشهداء والصالحين).

**هەرکەسێ دەست بەسوننەتەوە بگرێ، واتە: سوننەتەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، بەزانستو کردەوەو باوەڕەوەو لەسەر ئەوە بمرێت، هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێی سەلامەت بن، تانەیان لێ نەدات یان لە هیچ یەکێ لەوان ئەوا لەگەڵ پێغەمبەرانو (صدیقەکان)و شەهیدەکان و پیاوچاکاندا دەبێ، چونکە ئەو کەسە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەیەتی (ﷺ)، خوای گەورە دەفەرموێت:** (وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَئِكَ رَفِيقًا (٦٩) النساء) **واتە: (هەرکەسێکیش بەر فەرمانی خواو ئەم پەیامبەرە بێ دەبێتە هاوڕێی ئەو کەسانە خوا چاکەو بەهرەی خۆی بەسەرا ڕشتوون لەپەیامبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدانی ڕێگەی خواو صالحان و کارچاکان دیارە ئەمانە چ هاودەم و هاوڕێیەکی چاك و بێ وێنەن).**

**مەبەست لە:** (وسلم منه أصحاب رسول الله (ﷺ)).

**بەکەمیان ئەزانێ و تانەیان لێ بدات، خوای گەورە دەفەرموێت:** (وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ) **واتە: هاوەڵان لە کۆچەران و پشتیوانان** (وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ (١٠)الحشر) **واتە: (ئەوانەش لەدوای ئەوانەوە هاتوون دەڵێن: ئەی پەروەردگارەکەمان ! لەئێمەو لەو برایانەمان پێش ئێمە باوەڕیان هێناوە خۆش ببەو هیچ بوغزو قینێك مەخە دڵمانەوە بەرامبەر بەو کەسانەی باوەڕیان هێناوە ئەی پەروەردگاری ئێمە ! بەڕاستی تەنها ئەتۆی بەسۆزی میهرەبان).**

بۆیە (شیخ الاسلام ابن تیمیة) لە (العقیدة الواسطیة)دا دەفەرمویّت: (لە بنەماکانی ئەهلی سوننەو جەماعە ئەوەیە: سەلامەتی دڵ و زمانیانە بەرانبەر هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)[٣٥٦]) ئەمجار باسی ئەم ئایەتەی کردووە: (وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا) ئەمە پاراستنی زمانە (وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا) ئەمە پاراستنی دڵەکانە بەرانبەر هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ).

مەبەست لە: (وإن كان له تقصير في العمل).

هەرچەندە کەمتەرخەمی تێدا هەبێ لەکردەوەکانیدا، ئەوا خوای گەورە لەو کەسانەی ویستی لێ بێت خۆش دەوێ، خوای گەورە دەفەرمویّت: (إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ) النساء /٤٨) واتە: (بێگومان هەرگیز خوا لە دانانی هاوبەش بۆی نابوورێ و لە خوار شیرکەوە لە هەر گوناهێك دەبوورێ بۆ هەر کەسێك خۆی بیەوێت).

٢/ قسەکەی (بشری کوڕی الحارث): (السنة هي الإسلام والإسلام هو السنة) ئەم دەستەواژەیە لەسەرەتای کتێبەکەدا باسکرا.

٣/ قسەکەی (فضیل ی کوڕی عیاض): (إذا رأيتُ رجلا من أهل السنة فكأنما أرى رجلا من أصحاب رسول الله (ﷺ)).

چونکە ئەو شوێنەکەوتەی ئەوانە، چونکە هەرکەسێ شوێنیان بکەوێ ئەوا دەبێتە یەکێك لەوان، ئەویش هەروەکو ئەوەیە مالیك فەرمووی: (أولئك مع الذين أنعم الله عليهم) جا هەرکەسێ شوێنیان بکەوێ ئەوا لەوان دەبێ.

دەڵێت: (وإذا رأيتُ رجلا من أهل البدع فكأنما أرى رجلا من المنافقين).

---

٣٥٦ / ص/٤٠ .

ئەگەر کابرایەکت بینی لەبیدعەکاران و ئارەزوو پەرستان ئەوانەی جیاوازن لەگەڵ ئەهلی سوننەدا ئەوا هەروەکو ئەوەیە کابرایەکت لەدووڕووەکان بینیبێ ئەوانە بەڕواڵەت بانگەشەی ئیسلام دەکەنو لەناخەوە بێ باوەڕن هەڵخەڵەتاندنیان دەوێ جا ئارەزوو پەرستانو بیدعەکاران لێکچوونێکیان تێدایە لەگەڵ دووڕووەکاندا چونکە ئەوانیش بەڕواڵەت ئیسلام دەردەخەن بەڵام بیدعە دەکەن و شوێنی سوننەت ناکەون، ئەمە سیفەتی دووڕووەکانە.

٤/ قسەکەی (یونس ی کوڕی عبید): (العجب ممن يدعو اليوم إلى السنة وأعجب منه المجيب إلى السنة).

سوننەت نامۆ بووە، نامۆیە ئەو کەسەی بانگەوازی بۆ دەکات، لەوە نامۆتر کەسێك کاری پێ بکات، گومان لەوەدا نییە سەردەمانێك دێت سوننەت لە ناو ئەهلەکەیدا نامۆ دەبێ، هەرچەند زەمانە دوا بکەوێ ئەوا سوننەت نامۆتر دەبێو سوننەکان نامۆ دەبن، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (بدأ الاسلام غريبا، وسيعود غريبا كما بدأ، فطوبى للغرباء) قالوا: من الغرباء يا رسول الله؟ قال: الذين يصلحون إذا فسد الناس) وفي رواية: يصلحون ما أفسد الناس)[٣٥٧] واتە: ئیسلام بە نامۆیی دەستی پێکرد و جارێکی تر بە نامۆیی دەگەڕێتەوە هەروەکو چۆن دەستی پێکرد، بۆیە موژدە بۆ نامۆکان، وتیان: ئایە نامۆکان کێن ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ فەرمووی: ئەوانەی چاکەسازی دەکەن ئەگەر خەڵکی خراپ بوون) لە ریوایەتێکی تردا هاتوە: چاکسازی دەکەن ئەوەی خەڵکی خراپی کردوە).

ئەوانە نامۆکانن لەدوا سەردەمدا ئەگەر خەڵکی خراپ بوون ئەوا ئەوان دەست بەسوننەتەوە دەگرن، ئارام دەگرن لەسەر ئەو ئازارەی تووشیان دەبێو ئارام دەگرن

٣٥٧ / سبق تخريجه .

**لەسەر نامۆبوون لەنێو خەڵکیدا، چونکە ئەوانەی جیاوازن لە گەڵیاندا زۆرن، جا ئەوان لەنامۆبووندا دەژین لەنێو خەڵکیدا.**

**نوسەر دەڵێت:** (وكان ابن عون يقول عند الموت: (السنة السنة وإياكم والبدع) حتى مات.

وقال أحمد بن حنبل: (مات رجل من أصحابي فَرُئِيَ في المنام فقال: قولوا لأبي عبد الله: عليك بالسنة فإن أول ما سألني ربي عز و جل عن السنة).

وقال أبو العالية: (من مات على السنة مستورا فهو صديق، الاعتصام بالسنة نجاة).

**واتە: ئیبن عەون لەکاتی مردندا دەیفەرموو: (دەست بە سوننەتەوە بگرن، دەست بە سوننەتەوە بگرن، دووربکەونەوە لەبیدعە) تاکو مرد.**

**ئەحمەدی کوڕی حەنبەل فەرموویەتی: (یەکێك لەهاوەڵانم کۆچی دوایی کرد، لەخەودا ئەویان بینیبوو، وتی: بەباوکی عبداللە بڵێن: دەست بەسوننەتەوە بگرە، چونکە یەکەم شت خوای گەورە پرسیاری لێ کردم سوننەت بوو).**

**(ابو العالیە) دەڵێ: هەرکەسێ لەسەر سوننەت بمرێت (جیاوازی ئەوەی لێ دەرنەکەوێت) ئەوا کەسێکی (صدیق)ـە، دەست گرتن بە سوننەتەوە ڕزگار بوونە).**

**ڕاڤە/**

**١/ قسەکەی (ئیبن عەون):** (السنة السنة).

**واتە: دەست بەسوننەتەوە بگرن، ئەو وشەیە (السنە) (منصوب)ە لەسەر (الاغراء) واتە: دەست بەسوننەتەوە بگرن.**

**مەبەست لە:** (وإياكم والبدع).

(اياكم) **وریاکردنەوەیە،** (والبدع) **ئەوەی لە گەڵ سوننەتدا جیاوازە، ئامۆژگاری بە ئەمە دەکرد لەکاتی مردندا، ئەمە لە بابەتی ئامۆژگاری ئوممەتە.**

٢/ قسەکەی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل: (مات رجل من أصحابي فَرُئِيَ في المنام فقال: قولوا لأبي عبد الله: عليك بالسنة فإن أول ما سألني ربي عز و جل عن السنة).

ئەم کابرایە یەکێکە لە هاوەڵانی ئیمامی ئەحمەد، ئیمامی ئەهلی سوننە، ئەو کەسەی ئازاری گرت لەتاقیکردنەوەکە، ئەو کابرایە لەخەودا بینرا، ئامۆژگاری ئەو کەسەی کردووە خەوەکەی پێوەی بینیوە کەوا هەواڵ بە ئیمامی ئەحمەد بدا بەوەی دەست بەسوننەتەوە بگرێتو دەڵێت: (إن أول ما سألني ربي عز و جل عن السنة) ئەم قسەیە هاندانی تێدایە بەدەستگرتن بە سوننەتەوەو ئارام گرتن لەسەری.

٣/ قسەکەی (ابو العاليه): (من مات على السنة مستورا فهو صديق).

الصديق: ئەو کەسەیە زۆر ڕاستگۆیەو ئەویش پلەیەکە لە پاش پێغەمبەران دێت، جا پلەو پایەی(الصديق) پلەو پایەیەکی بەرزە، مەبەستیش لێی دەست گرتنە بە ڕاستگۆییەوە لە قسەو کردەوەکانیدا، جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆی ڕوون کردینەوە (الصديق) کێ یە؟ فەرمویەتی: (لا يزال الرجل يصدق ويتحرى الصدق)[٣٥٨] لەخۆیدا ڕاست دەکات، بەدوای ڕاستیدا دەگەڕێ لەوەی خەڵکی دەیڵێ، هەموو ئەوەی دەیبنێ بڵاوی ناکاتەوە، هەموو ئەوەی دەگوترێ، بەڵکو دڵنیا دەکاتەوە، بەدوای ڕاستیدا دەگەڕێ، چونکە ئەو لەخودو ناخی خۆیدا ڕاستگۆیە هەرگیز هەواڵ نادات و قسە ناکات ئیللا ئەوەی ڕاستە، ئەمە (صديق)ە.

مەبەست لە: (مات على السنة).

واتە: دەستی گرتووە بە ئیسلامەوە، مەبەست لەسوننە ئیسلامە، ئیسلامیش سوننەتە، هەرکەسێ لەسەر ئەوە بمرێ بە(مستور)ی هیچ شتێکی لێ دەرنەکەوتبێ جیاواز بێت ئەوا بە (صديق)ی دەمرێت.

---

٣٥٨ / متفق عليه : أخرجه البخاري (٥٧٤٣) ومسلم (٢٦٠٧) .

مەبەست لە: (الاعتصام بالسنة نجاة).

واتــە: دەســتگرتن بەســوننەتەوە ڕزگاربوونــە لــە ســزاو فیتنــەو ســزاکان، بۆیــە پێغەمبەری خــوا (ﷺ) فەرموویــەتی: (فإنه من يعش منكم فسيرى اختلافا كثيرا، فعليكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين)[٣٥٩] واتــە: هەرکــەس لــەئێوە _لــەپاش مــن_ بــژێت ئــەوا جیــاوازی و دووبــەرەکی زۆر دەبینــێ، جــا ئامۆژگاریتــان دەکــەم دەســت بەســوننەت ڕێگاکەی منەوە بگرن و دەست بە ســوننەتو ڕێگــای جێنــشینە ڕێنمــویی کراوەکانــەوە بگرن).

خوای گەورە دەفەرموێت: (وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا) ال عمران/١٠٣) واتــە: (بەتێکڕا گشتتان دەســت بەڕشــتەی ئــایینی خــوا و قورئانەکەیــەوە بگــرن و قــەت لێــی نەترازێن).

خــوای گــەورە دەفــەرموێت: (وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ (١٥٣) الانعام) واتــە: (ئــەم هێڵــە شاســتەیە بەرنامــەو ڕێبازەکــەی منــە، دەسا ئێوەیش ئەی ئیمانداران! هەمیشە شوێنی بکــەون و هــەر بــەودا بــچن مەکەونــە شوێنی ڕێچکەکانی تر، ئەوسا لەشارێگەکەی خوا بترازێن و پەڕاگەندە ببن ئەوانە گشت وەسیەت و ڕاسپاردەو ئامۆژگــاری خــوان، دەســا بــەڵکو ئێــوەیش بیانپــارێزنو سنوور شکێنی نەکەن).

ئەمە ئامۆژگاری خواو پێغەمبەرەکەیەتی (ﷺ) ئەویش دەستگرتنە بەسوننەتەوە.

نوسەر دەڵێت: (وقال سفيان الثوري: (من أصغى بإذنه إلى صاحب بدعة خرج من عصمة الله ووكل إليها)[٣٦٠] يعني إلى البدع،

---

٣٥٩ / سبق تخريجه .

٣٦٠ / رواه أبو نعيم وابن بطة .

وقال داود بن أبي هند: (أوحى الله تبارك وتعالى إلى موسى بن عمران: لا تجالس أهل البدع فإن جالستهم فحاك في صدرك شيء مما يقولون أُكببت في نار جهنم)[٣٦١].

وقال الفضيل بن عياض: (من جالس صاحب بدعة لم يعط الحكمة)[٣٦٢].

وقال الفضيل بن عياض: (لا تجلس مع صاحب بدعة فإني أخاف أن تنزل عليك اللعنة)[٣٦٣].

وقال الفضيل بن عياض: (من أحب صاحب بدعة أحبط الله عمله وأخرج نور الإسلام من قلبه)[٣٦٤].

وقال الفضيل بن عياض: (من جلس مع أصحاب بدعة في طريق فجز في طريق غيره)[٣٦٥].

**واتە: (سفيان الثورى) فەرموويەتى: (هەركەسێ بە گوێیەكانی گوێی لەخاوەن بیدعە بگرێ ئەوا لەپارێزراوی خوا دەردەچێ و پێی دەسپێردرێ) واتە بۆ بیدعەكە.**

**(داود) ی كوڕی (ابو هند) دەڵێ: خوای گەورە وەحی كرد بۆ موسای كوڕی عمران: لەگەڵ بیدعەكاراندا دامەنیشە، جا ئەگەر لەگەڵیاندا دانیشتی و شتێكت بە سنگدا هات لەوەی دەیڵێن ئەوا دەچیتە ناو ئاگرەوە).**

**(الفضیل كوڕی عیاض) دەڵێ: هەركەسێ لە گەڵ خاوەن بیدعەیەكدا دابنیشێ ئەوا چیتر (حیكمەتی) پێ نابەخشرێ.**

---

٣٦١ / رواه الآجري وابن بطة .

٣٦٢ / رواه اللالكائي وابن بطة والبيهقي .

٣٦٣ / رواه اللالكائي وابن بطة والهروي .

٣٦٤ / رواه اللالكائي وابن بطة والهروي وابو نعيم وابن الجوزي .

٣٦٥ / رواه ابن بطة وابو نعيم وابن الجوزي .

(الفضیل کوڕی عیاض) دەڵێ: لەگەڵ خاوەن بیدعەدا دامەنیشە، چونکە لەوە دەترسم لەعنەتت بەسەردا داباریٚ).

(الفضیل کوڕی عیاض) دەڵێ: هەرکەسێ خاوەن بیدعەی خۆش بویٚ، ئەوا خوای گەورە کارەکەی پووچەڵ دەکاتەوە و روناکی ئیسلام لە دڵی دەردەکات).

(الفضیل کوڕی عیاض) دەڵێ: هەرکەسێ لەگەڵ خاوەنی بیدعەدا لەڕێگادا دانیشێت ئەوا لەڕێگایەکی ترەوە بڕۆ).

ڕاڤە/

١/ قسەکەی سفیان الثوری: (من أصغى بإذنه إلى صاحب بدعة خرج من عصمة الله).

لەپێشدا باسی هەڵاتن لەخاوەن بیدعەی کردو دانەنیشتن لەگەڵیانداو هاوڕێتی نەکردنیان،جا هەرکەسێ هاوڕێتی ئەوانی کردو گوێی لەقسەکانیان گرت و ئینکاری لێ نەکردن، ئەوا لەگەڵ ئەواندا بەهەلاکەتدا دەچێ، بۆیە دروست نییە بۆ تۆ لەگەڵ ئەهلی بیدعەدا دانیشی و گوێ لەقسەکانیان بگری و بڵێیت: من کەسێکی ئیماندارم و ئیمانەکەم بەهێزەو شارەزای عەقیدەم و کارم تێ ناکەن، ئەمە مەغرور بوونە، ڕەنگە مرۆڤ تووشی فیتنە بێت، جا دوورکەوتنەوە لێیان و گوێ نەگرتن لەقسە پووچەڵەکانیان پارێزگارییە، بەڵام ئەگەر گوێت لێیان گرت ئەوا شایەنی ئەوەی لەگەڵیاندا تووشی فیتنە ببی.

مەبەست لە: (ووكل إليها) يعني إلى البدع).

چونکە هەرکەسێ پشت بەخوا ببەستێ ئەوا خوای گەورە دەیپارێزیٚو هەرکەسێ گوێی لەبیدعە گرت ئەوا شایستەی ئەوەیە توشی فیتنە ببێت، تەوکیل دەکریێ بۆی (واتە: بۆ بیدعە) و لەپارێزگاری خوا دەردەچێ.

٢/ **قسەکەی (داودی کوڕی ئەبو هیند)**: (أوحى الله تبارك وتعالى إلى موسى بن عمران: لا تجالس أهل البدع فإن جالستهم فحاك في صدرك شيء مما يقولون أُكببت في نار جهنم).

**ئەمە لە موساوە ڕیوایەت کراوە، (أن الله أوحى إليه: لا تجالس أهل البدع) ئەمە لەکاتێکدا ئەو (کلیم الله)یە، خوای گەورە نەهی لێ دەکات لەگەڵ ئەهلی بیدعەو جیاوازکاراندا دانیشێ، چونکە ئەگەر دانیشێ لەگەڵیاندا ئەوا کاریگەر دەبێ پێیان، ئەی چۆنە بۆ کەسێکی تر؟**

**مەبەست لە**: (فحاك في صدرك شيء مما يقولون).

**ئەمە ترسەکەیە، ئەگەر تۆ لەگەڵیاندا دانیشتیو گوێت لە قسەکانیان گرت ئەوا ناخت خوتخوتە دەکات یان ڕەنگە شتێك لەوانە لەناختدا خوتخوتە بکات، بۆیە پشت بەهێزی باوەڕت یان عیلمەکەت مەبەستە، چونکە ئەوان درۆیان هەیەو ساختەیان هەیەو قسەی ڕەنگاو ڕەنگیان هەیەو چەندین شێوازیان هەیە، بۆیە پێویستە لەسەرت ئاگادریان بیت، خوای گەورە دەفەرموێت:** (وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ وَإِنْ يَقُولُوا تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ) **بۆیە ئاگاداریان بە** (هُمُ الْعَدُوُّ فَاحْذَرْهُمْ قَاتَلَهُمُ اللَّهُ أَنَّى يُؤْفَكُونَ (٤) المنافقون) **واتە: (هەرکە دەیان بینیت لەش و قەلاّفەتیان سەر سامت دەکاتو ئەگەر قسەیش بکەن _لەقسەزانیدا_گوێ بۆ قسەکەیان دەگریت دەڵێی تەختەداری هەڵپەسێرراون وادەزانن هەموو قسەو دەنگێك بۆ سەر ئەوانە هەر ئەوانن دوژمن، دەسا ئێوەش هۆشیارو ئاگاداریان بنو خۆتان بپارێزن لێیان، خوا بیانکوژێ، لەناویان بەرێت، چۆن لەڕێی هەق لائەدرێن؟!)**

**بۆیە هەرگیز نەرمونیان نەبی لەگەڵ ئەهلی بیدعەداو گوێیان لێ بگری یان لەگەڵیاندا دانیشی.**

٣/ **قسەکەی (الفضیل ی کوڕی عیاض)**:- (من جالس صاحب بدعة لم يعط الحكمة).

واتە: مەحرومو بیٚ بەش دەبیٚ لەحیکمەت، حیکمەتیش بریتییە لە: تێگەیشتن لەدینی خوا، جا ئەو کەسەی لەگەڵ ئەهلی بیدعەدا دادەنیشیٚ ئەوا تێگەیشتن لە دینی خوای لەسەر حەرام دەبیٚ وەکو تولّەیەك.

٤/ قسەکەی (الفضيل کوڕی العیاض):- (لا تجلس مع صاحب بدعة فإني أخاف أن تنزل عليك اللعنة).

چونکە خاوەن بیدعە سزاو توورەییو لەڕی لادانی دادەبارێتە سەر، ترسی ئەوە هەیە تۆیش تووشی شتێکی لەو جۆرە ببیت کە ئەو تووشی بووە، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ وَإِمَّا يُنْسِيَنَّكَ الشَّيْطَانُ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ الذِّكْرَى مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ (٦٨)الانعام).

بە ئیمانداران دەڵێت: (وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ إِنَّكُمْ إِذًا مِثْلُهُمْ إِنَّ اللَّهَ جَامِعُ الْمُنَافِقِينَ وَالْكَافِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا (١٤٠) النساء) واتە: (خۆ بەڕاستی خوای گەورە لەم قورئانەدا بەئێوەی ڕاگەیاندووە هەرکات زانیتان و بیستان ئایەتەکانی خوا کەسانێك باوەڕیان پیٚ ناکەن و گاڵتەیان پیٚ دەکەن هەتا ئەو باسە ئەگۆڕن و دەچنە سەر قسەیەکی تر و واز لەو کارەیان دێنن ئێوە لەگەڵیان دامەنیشن ئەگینا ئێوەیش لە گوناه و تاوان وەك ئەوان دەبن، دیارە خوای گەورەش لەڕۆژی قیامەتدا گشت دووڕوو بیٚ باوەڕەکان لەدۆزەخ کۆ دەکاتەوە).

ئەمەش وریاکردنەوەو ئاگادارکردنەوەی تێدایە لەدانیشتن لەگەڵ گومڕاکاران و ئارەزوو پەرستانداو دانیشتن لەگەڵیانداو هاوڕێتی کردنیانو گوێگرتن لەقسەکانیانو خوێندنەوەی کتێبەکانیان، پێویستە لەسەرت لەو کارانە دوور بکەویتەوە، خواش پشتو پەنامانە، هەرکەسیٚ ئەمڕۆ ئەوە بکات پێی دەڵێن: وشکو داخراوە (منغلق)و (متحجر)، گومانی لەخەڵکی هەیە، تا کۆتایی ئەو جۆرە قسانە.

**٥/ قسەکەی (الفضیل کوڕی عیاض):** (من أحب صاحب بدعة أحبط الله عمله).

**شایەنی ئەوەیە خوای گەورە کردەوەکانی پووچەڵ بکاتەوە، بەڕاستی ئەمە هەڕەشەیەکی توندە بەتایبەتی ئەگەر بیدعەکە (مکفرە) بێت (واتە ببێتە هۆی ئەوەی خاوەنەکەی کافر بکات) ئەوا ئەو کاتە ڕەنگە قسەو کوفرو شیرکەکانیان بەباش بزانێ و کردەوەکانی پووچەڵ ببێتەوە، ئەمەش لەبابەت و باسی ئاگادار کردنەوەیە، جا با موسڵمان بە خۆی سەرسام نەبێ، یان گومانی هەبێ ئەوان کاری تێ ناکەن، چونکە مرۆڤ مرۆڤە.**

**٦/ قسەکەی (الفضیل کوڕی عیاض):** (من جلس مع أصحاب بدعة في طريق فجز في طريق غيره).

**تەنانەت لەڕێگاشدا، ئەگەر لەڕێگایەك ئەوت بینی ئەوا لەگەڵیدا مەڕۆ، لە ڕێگاو سەفەردا هاوڕێتییان مەکە، چونکە کارت تێ دەکەن، جا کوان ئەوانەی دەچن بۆلای (المبتدعه) و هاوڕێتییان دەکەن بەبیانووی ئەوەی بانگەوازیان دەکەن؟!**

**نوسەر دەڵێت:** وقال الفضيل بن عياض: من عظم صاحب بدعة فقد أعان على هدم الإسلام، ومن تبسم في وجه مبتدع فقد استخف بما أنزل الله (عز و جل) على محمد (ﷺ)، ومن زوج كريمته من مبتدع فقد قطع رحمها، ومن تبع جنازة مبتدع لم يزل في سخط من الله حتى يرجع)[٣٦٦].

وقال الفضيل بن عياض: (من جلس مع صاحب بدعة ورثه العمى)[٣٦٧].

---

٣٦٦ / رواه بنحوه : ابو الفتوح الطائي وابو نعيم وابن الجوزي .

٣٦٧ / رواه الدينوري و اللالكائي وابو الفتوح الطائي .

وقال الفضيل بن عياض: (آكلُ مع يهودي ونصراني ولا آكل مع مبتدع، وأحب أن يكون بيني وبين صاحب بدعة حصن من حديد)[٣٦٨].

وقال الفضيل بن عياض: (إذا علم الله عزو جل من الرجل أنه مبغضٌ لصاحب بدعة، غفر له، وإن قل عمله، ولا يكن صاحب سنة يمالئ صاحب بدعةٍ إلا نفاقاً، ومن أعرض بوجهه عن صاحب بدعةٍ، ملأ الله قلبه إيماناً، ومن انتهر صاحب بدعة آمنه الله يوم الفزع الأكبر، ومن أهان صاحب بدعة رفعه الله في الجنة مائة درجة، فلا تكن صاحب بدعة في الله أبداً)[٣٦٩]

انتهى والله أعلم وصلى الله وسلم على نبينا محمد.

**واتە: (الفضيل كوڕی العياض) دەڵێ: هەركەسێ خاوەن بيدعەيەك (بيدعەچييەك) بە مەزن بزانێت ئەوا يارمەتی دەدات بۆ ڕووخانی ئيسلام، هەركەسێ بە ڕووی (مبتدع)ێكدا پێكەنی (بزەی كرد) ئەوا بە سووك تەماشای ئەوەی كردووە دابەزيوەتە سەر (محمد)دا (ﷺ)، هەركەسێ كچەكەی خۆی دا بە (مبتدع)ێك ئەوا پەيوەندی خزمايەتييەكەی بچڕاندووە، هەركەسێ شوێن جەنازەی (مبتدع)ێك بكەوێ ئەوا بەردەوام لەتووڕەبوونی خوادايە تاكو دەگەڕێتەوە).**

**(الفضيل كوڕی العياض) دەڵێت: هەركەسێ لەگەڵ خاوەن بيدعەيەكدا دابنيشێ ئەوا تووشی كوێرەوەری دەكات.**

**(الفضيل كوڕی العياض) دەڵێت: (لەگەڵ جوولەكەو گاوردا نان دەخۆم بەڵام لەگەڵ (مبتدع)دا ناخۆم، پێم خۆشە لەنێوان من و خاوەن بيدعەدا قەڵايەكی ئاسنين هەبێت).**

**(الفضيل كوڕی العياض) دەڵێت: ئەگەر خوای گەورە زانی كەسێك ڕقی لە خاوەن بيدعەيە ئەوا لێی خۆش دەبێ، هەرچەندە كردەوەكانی كەم بێ، كەسێكی خاوەن**

---

٣٦٨ / رواه اللالكائي وابن بطة ببعضه والهروي وابو نعيم .

٣٦٩ / رواه وابن بطة وابو نعيم بنحوه .

سوننەت لایەنگیری خاوەن بیدعە ناکات ئیلا دووڕوویی یە، هەرکەسێ ڕوو لە خاوەن بیدعە وەرگێڕێ ئەوا خوای گەورە دڵی پڕ دەکات لەئیمان، هەرکەسێ تووڕە بێت لە خاوەن بیدعەیەك (پێیاهەڵشاخی) ئەوا خوای گەورە لەڕۆژی قیامەت دڵنیاو بێ ترسی دەکات، هەرکەسێ خاوەن بیدعەیەك ریسوا بکات ئەوا خوای گەورە لەبەهەشتدا سەد پلە بەرزی دەکاتەوە، بۆیە لەبەر خوا هەرگیز خاوەنی بیدعە مەبە.

تەواو بوو

والله اعلم وصلى الله وسلم على نبينا محمد (ﷺ)....

ڕاڤە/

١/ قسەکەی (الفضیل کوڕی العیاض): (من عظم صاحب بدعة فقد أعان على هدم الإسلام).

چونکە بیدعە دژی ئیسلامە، جا ئەگەر تۆ هانی (مبتدع)ێکت دا ئەوا یارمەتیت داوە بۆ ڕووخانی ئیسلام، چونکە ئیسلام سوننەتەو سوننەتیش ئیسلامە، هەروەکو لەپێشدا باسکرا، بۆیە پێویستە لەسەر مرۆڤ ئەهلی بیدعە بەمەزن نەزانێ و مەدحیان نەکات و ستایشیان نەکات، ئێستا _ هەروەکو دەیبیسن_لەمەدحی بێ باوەڕان و جوولەکەو گاورەکان و ستایش کردنیان و ئەوان خاوەنی پێشکەوتن و شارستانین و ئێمە دواکەوتوین تا کۆتایی ئەو قسانەی دەیڵێن، ئەمە لەتوندترین دووڕوویی یە پەنا بەخوا.

مەبەست لە: (ومن تبسم في وجه مبتدع فقد استخف بما أنزل الله (عز و جل) على محمد (ﷺ).

چونکە کەسی (مبتدع) جیاوازە لەوەی خوای گەورە دایبەزاندووەتە سەر (محمد) (ﷺ) جا ئەگەر بەڕوویدا پێکەنی (بزەی کرد) ئەوا ئەو کاتە جیاواز دەبێ لەوەی لە

قورئـان وسـوننەتدا هـاتوە، لـە دوورکەوتنـەوە لێیـان و ڕق لێ بوونیـان و ڕازی نـەبوون لێیان، چونکە پێکەنین بەدەمیانەوە بەڵگەیە لەسـەر ڕازی بـوون و نـەرم و نیـان بـوون لەگەڵیاندا.

مەبەست لە: (ومن زوج كريمته من مبتدع فقد قطع رحمها).

پێویستە لەسەر ئەو کەسەی خاوەنی کـچێکە:_ کـچی خـۆی یـان خوشـك یـان ئـەو کەسەی ئەم خاوەنی نیکاحی ئەوە (نیکاحی ئەو بەدەسـتی یـەتی) پێویـستە لەسـەری هاوکوفێکی باشـی بـۆ هەڵبـژێرێ، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دەفـەرموێت: (إذا أتاكم من ترضون دينه وأمانته فزوجوه، إن لم تفعلوا تكن فتنة في الأرض وفساد كبير)[٣٧٠] واتـە: ئەگـەر کەسێك هات بۆ لاتان (بە مەبەسـتی خـوازبێنی) لـە کاتێکـدا لـە دیـنو سـپاردەی ڕازی بوون ئەوا ژنی پێ بـدەن، جـا ئەگـەر نەیکـەن ئـەوا فیتنەیـەكو فەسـادێکی گـەورە لـە زەویدا پەیدا دەبێت) جا ئەگەر یەکێك دیاری نـەکات لـەدین و ئەمانەتەکـەی ڕازی بێـت ئەوا فەسادێکی گەورە ڕوو دەدات، نەوەك بیـدا بەکەسـێکی دووڕوو یـان ئـەهلی بیدعـە ئەوا لەگەڵیاندا گومڕا دەبێ، تۆ بویتە هۆکاری ئەوە.

دەڵێت: ومن تبع جنازة مبتدع لم يزل في سخط الله حتى يرجع).

ئەگەر ئەوان مردن ئەوا شوێنی جەنازەیان مەکەوە، چـونکە ئـەوان سـزاو تـووڕەیی خوا بەسەریاندا دادەبەزێ و ئەوەی تووشی ئەوان ببێ ئەوا تووشی تۆش دەبێ.

٢/قسەکەی (الفضیل کوڕی العیاض): (من جلس مع صاحب بدعة ورثه العمى) واتـە: کوێر بوون لەچاوڕوونی و کوێر بوونی دڵ.

٣/قسەکەی (الفضیل کوڕی العیاض): (آكل مع يهودي ونصراني ولا آكل مع مبتدع).

---

٣٧٠ / سبق تخريجه .

چونکە جوولەکەو گاور دەزانرێ و دەناسرێن کەوا خاوەنی دینێکو میللەتێکی جیاوازن لەدینەکەمان، ئەویش لە ئەهلی کیتابە، بەلام کەسی(المبتدع) بانگەشەی ئیسلام دەکات، بەلام جوولەکە یان گاور بانگەشەی ئیسلام ناکەن، تۆش دەزانی ئەوە جوولەکەیە یان گاورە بەلام کێشەکە لەو کەسەیە بانگەشەی ئیسلام دەکا، متمانەی پێ دەکەی، لەگەڵیدا دادەنیشی و بەرەو خراپە ڕات دەکێشێ، جا مەترسی ئەو توندترە لەمەترسی دوژمنێکی ئاشکرا بە دوژمنایەتی.

**مەبەست لە:** (وأحب أن يكون بيني وبين صاحب بدعة حصن من حديد) **واتە: ڕێگری دەکات لەتێکەڵ بوون.**

**٤/ ئەو قسەیەی فضیل:** (إذا علم الله عز و جل من الرجل أنه مبغض لصاحب بدعة غفر له وإن قل عمله)

چونکە ئەمە لەدۆستایەتی و دوژمنایەتییە (الولاء والبراء) دۆستایەتی بۆ ئەهلی ئیمان و دوژمنایەتی لەدوژمنانی خوا، ئەمەش بنەمایەکە لەبنەماکانی عەقیدە.

**مەبەست لە:** (ولا يكن صاحب سنة يمالئ صاحب بدعة إلا نفاقا).

ئەگەر خاوەن سوننەیەك لایەنگیری خاوەن بیدعەیەکی کرد ئەوا جۆرێکە لەجۆرەکانی دووڕوویی.

**مەبەست لە:** (ومن أعرض بوجهه عن صاحب بدعة ملأ الله قلبه إيمانا). **چونکە ئەمە لەدوژمنایەتییە.**

**مەبەست لە:** (ومن انتهر صاحب بدعة آمنه الله يوم الفزع الأكبر)

هەر کەسێ بەقسە ڕیسوای بکات، ئینکاری لێ بکات ئەوا خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا پاداشتی دەداتەوە، لە ڕۆژی قیامەت بەپاداشتێکی باش، چونکە ئەو ئینکاری

لە (منكر) كردووە، بەلاَم ئەگەر ستایشی كردو مەدحی كرد ئەوا ئەمە جۆرێكە لەدووڕوویی، جۆرێكە لەدۆستایەتی لە گەڵ دوژمنانی خوادا.

**مەبەست لە:** (ومن أهان صاحب بدعة رفعه الله في الجنة مائة درجة).

پێویستە ڕێز لەئەهلی بیدعە نەگیرێ لە مەجلیسەكاندا یان مەدح بكرێن یان بەهەر جۆرێك لەجۆرەكانی ڕێزگرتن، چونكە خوای گەورە ئەوانی ریسوا كردووە، ئەمە هەر لەدۆستایەتی و دوژمنایەتییە.

**مەبەست لە:** (فلا تكن صاحب بدعة في الله أبدا).

پێویستە لەسەرت دوور بكەویتەوە لەبیدعەو بەهیچ شێوەیەك نەرم و نیان نەبی لەگەڵیاندا هەرگیز، بۆ ئەوەی پارێزگاری بكەیت لەدینەكەت و سوننەتی پێغەمبەرەكەت (ﷺ)..

**وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين.**

# ناوەڕۆك